# خانەی چاپو بلاوکردنەوەی ئارام

150

ناپلیۆن

نووسینی:

ئ .چ. تارلە

وەرگێڕانی بۆ فارسی:

محەمەد قازی

وەرگێڕانی بۆ کوردی:

عومەر ڕەسوڵ خدر ( شینکی )

چاپی سێیەم

سلێمانی.................................................................2009

**خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئارام**

**خاوەنی: ئارامی مەلا محەمەد**



07701918565
07501241518

**کتێب:** ناپلیۆن

**بابەت:** مێژوویی

**نووسینی:** ئ. ج. تارلە

**وەرگێڕانی بۆ فارسی:** محەمەد قازی

**وەرگێڕانی بۆ کوردی:** عومەر رەسوڵ خدر (شینکی)

**نەخشەسازی و بەرگ:** نێوەندی ئارام

**کۆمپیوتەر:** ودفا صلاح

**سەرپەرشتیاری چاپ:** ئارام مەلا محەمەد

**تیراژ:** 1000 دانە

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە (837)ی ساڵی (2006)ی پێدراوە

**نرخ:** (6000) دینار.



# پێشەکی

مێژووی مرۆڤ وگۆڕانکارییەکانی کۆمەلایەتی تەنها بەتیۆری ورێنماییەکان وەرنەچەرخاون، بەڵکو ئیرادەی بەهێزی پێشەوایان وسەرکردە مەزنەکان (پشتبەستوو بەقۆناغێکی مێژوویی) ئەمەی فەراهەمکردووە، چوون رەوشی مێژوو زەمینە بۆگۆڕان خۆشدەکات.

پێداویستی سەردەم پیاوی مەزن دروستدەکات بۆدرێژەدان بەبەرەپێشچوونی رەورەوەی مێژوو.

لەدایکبوونی قۆناغی سەرمایەداری ولەناوچوونی قۆناغی فیودیالی، سوپا سالارو لێوەشاوەیەکی وەك ناپلیۆن بۆناپارتی هەڵکەواندووەو ناوبراویش هەلگری ئەوپەیامە مێژوویەبووەو شەڕی جیهانی یەکەمیش درێژبۆوەو تەواوکەری ئەو پەیامەیە. (لەئەورووپادا)

ئەگەر بڵێین: هەموو شەڕەکان بۆچەسپاندنی ئیرادەی لایەنێکە– یان

بۆجێگیربوونی رەوشێکی تازەی مێژوویە، هەڵەنییە، بەلام بۆچوونێکی تاك لایەنەو یەك ئاراستەییەو مافی تەواوی خۆی پێنادرێت،

راستی بۆدەربڕینی ئەمەو پراوپڕ بەخۆی، دەبێ بڵێین: پێداویستی رەورەوەی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییەو گۆڕانی قۆناغەکان گەیون وبۆئەمەش رابەرێکی مەزن ئەوپەیامەی گەیاندووە.

بەدووبارە چاپکردنەوەی ئەم کتێبە، ئەوەی دەمەوێت ئاماژەی بۆبکەم تەنها ئەوەیە: بەئاگابوون لەمێژوویی جیهان وسەرکردە مێژووییەکانی، وەك: ئەسکەندەرو ئانیبال و سۆڤرۆڤ و سیزارو ناپلیۆن و..، بەرچاومان روونتردەبێت ودەبێتە دەروازەیەکی باش بۆ زیادبوونی ئاستی وشیاری تاکەکەسەکان وهیوادارم ئەم پەرتوکە سوودبەخشبێت.

شینکی

# چەند دێڕێك دەربارەی تارلە

نۆژن – یان بەگوتەی زمانی روسی ئایڤگنی چیکتورڤیچ تارلە، مێژوو نووسێکی بەناوبانگی سۆڤیەتییە[1] لەسالی(1875) لەنیکلایف، چاوی بەدنیا هەڵهێناوەو لەسالی(1955) لەمۆسکۆ مردووە.

ناوبراو پسپۆر بووە لەمێژووی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتی شۆڕشی فەرەنساو ئیمپراتۆری یەکەم[2]

تێزی دکتۆراکەی لەبواری مێژوویيدا کتێبێکی بەپێزی گەورەی دووبەرگییە بەناوی (چینی کرێکاری فەرەنسا لەرۆژگاری شۆڕشی مەزندا) کەلەماوەی سالانی (1909–1911) نووسیویەتی‌و دواتر ئەوکتێبەی لەسالی(1928)دا لەگەڵ نووسینێکی نایابی تری بەناوی(چینی کرێکاری فەرەنسا لەسەرەتای رۆژگاری بەرهەمی پیشەسازیدا) بڵاوکردۆتەوە.

تارلە، چەند کتێبێکی تری دەرکردوون بەناوەکانی (گەمارۆی خاکی)[3] لەدووبەرگدا (1913–1914)و (دوای ناپلیۆن–1936)و (ژرمینالو پرەریال–1937).

ناوبراو زۆرینەی کاتەکانی خۆی بۆ نووسینەوەی مێژووی روسیا تەرخانکردووەو لەوبوارەشدا چەند کتێبێکی باشی هەن بەناوەکانی: شەڕی کریمە (1941–1943)و

( ناودارانی جەنگی روس‌و سیاسەتی پیترسی گەورە –1949).

دووکتێبی پربەهای تری ئەو یەکێکیان ئەم کتێبەیەو ئەوی تریشیان دەربارەی ژیانی (تالیران)ەو بەئومێدی ئەوەی بەم زووانە چاپ بکرێت.

تارلە ئەندامی ئەنجومەنی فەرهەنگی سۆڤیەت بووە، سەبارەت بەژیانی ناپلیۆن‌و تالیران کتێبی بێژمار لەلایەن نووسەرو مێژوونووسانی ولاتانی خۆرئاوا نووسراون، بەلام گرنگی کتێبەکانی تارلە لەوەدایە لەشیکارو لێکدانەوەکانیدا بێکینەو زانایانە دیاردە مێژووییەکان دەخاتەروو وبەتێروانینێکی جوان ئەم دوو[4] کەلە پیاوە مێژووییانە دەناسێنێت.

**محمدی قازی**

---

[1] - سۆڤیەت: مەبەست روسیای فدرالی ئەمڕۆیە. ئەوکاتەی وەرگێر محەمەدی قازی ئەم کتێبەی کردووە بەفارسی سۆڤیەت ماوە،

[2] - ئیمپراتۆری یەکەم، واتە: ناپلیۆن (و کوردی ).

[3] - گەمارۆی خاکی: مەبەست لەگەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیایە کەدواتر لەدەقی کتێبەکەدا ئاوا نووسراوە. (و- کوردی ) .

[4] - مەبەستی لە:( ناپلیۆن و تالیران )ە



# دیاجە

ئەو پیاوەی من دەمەوێت ژیانی باسبکەم وکەسایەتی ئەونیشانبدەم، یەکێکە لەسەرسوڕهێنەرترین دیاردەکانی مێژووی جیهان وسەیرنییە دەربارەی ئەو کتێبی بێژمار نووسراین وبنووسن وپێویستیشە هەر بنووسن.

کوشتاری جیهانی سالانی(1914–1918) بووەهۆی دووبارە سەرنجدانەوەی ئەو[5] کەبەپێشەنگی سەربازی هەموو سەدەو سەردەمەکان هەژماردەکرێت، فەرماندە نالێوەشاوەکانی وەك ( نیول و مولتکەی فەرەنسی و فالکنهاینی ئەڵمانی و فرنچ و هی، بریتانی و رنن کمپف و یانوچکەی ڕوسی وهیتریش زۆرن کەخەڵك کەسایەتییەکی دەقگرتوو وکورت بینی وەك: لودندورۆف– یان فۆش–یان ئالکسیف[6] بەچاوی کەسانی خاوەن سەلیقەو کارامەی لەشکرکێشی وفەرماندە سەیردەکەن، نوکلی لەوەناکرێت زۆرجار هەموو ئەوسەرکردە بێتوانایانە ڕابەرایەتی ملیۆنەها سەربازیان کردووەو ئەوەیان سەلماندووە کەجەنگ ولەدەستدابوونی سوپای گەورە ناتوانێت سەرکردەیەکی مەزن ولێوەشاوەی سەربازی دروستبکات، وەك چۆن، مەرمەڕییەکانی کارار[7]. لەداهێنانی دەسترەنگینی کەسانی وەك: فیدیاس [8]. و مایکل ئانژە[9]. دوای شەڕی جیهانی یەکەم، پەی بەو ڕاستیەبرا کەکەسانی سەرکردەی سەربازی مەزنی وەك: ئانیبال[10]و [11] سوڤرۆڤ و[12] وسیزارو لەسەرووی هەمووشیانەوە ناپلیۆن کەسەرداری هەموو سەردارانە، بوونە جێگای سەرنجدانی دوژمن بۆئەوەی ئیرادەی خۆی بەسەردا بسەپێنێ، مل پێ کەچکردنی ئەوبەشێوەیەکی دڵنیایی و بۆهەمیشەو دروستکردنی مێژووی ئەو وڵاتە تێشکاوە بەمەیلی خۆی، یان ئەگەر لەسەرتادا ئەمەت بۆمەیسەر نەبوو بەلانی کەمەوە کاریگەری لەسەر مێژووی ئەو وڵاتە جێبێڵە– یان وەك ناپلیۆن دەڵێت: دوژمنکاری وئامانج لەپشت شەڕو هێرشبردن وپێشڕەوی وهەڵمەتەکانەوە هەبوو، داگیرکردنی بێ قازانج، واتە سەرکەوتنی بێ کەڵك، ئەمەش هیچ دەسکەوتێکی سیاسیی ڕاستەوخۆی لێنەدەکەوتەوەو بەکەڵکی ناپلیۆن نەدەهات.

لەتایبەتمەندییەکانی ڕۆژگاری مێژوونووسی ئایدیالی وبەتایبەتی قوتابخانەی (سەروەری نووسان)دا یەکێك لەڕاکانیان ئەوەبوو، ناپلیۆن ڕۆڵی سەرهەڵدانی سەردەمێکی مێژوویی جیهانی نییە، ئەو ڕۆژگارەی کەتایبەت بەخودی ئەو بوو بەخەیاڵی خۆی واتای ئەخلاقی وگرنگییەکەی بەگشتی لەڕەورەوەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتییەوە پێی بەخشیبوو، ناپلیۆن دوای لەناوبردنی

---

[5] - ئەو مەبەست لە: ناپلیۆنە.(و- کوردی)

[6] - هەموو ئەمانە فەرماندەی کومناو وهیچ لەباراندانەبوویی شەڕی جیهانی یەکەم بوون،

[7] - یەکێکە لەشارەکانی ئیتالیاو لەنزیکییەوە کانزایەکی سپی جوان هەیە،

[8]- گەورەترین پەیکەرتاشی ئەغریقیەو لەئەسینا لەدایك بووە(431)پێش میلادی، هەموو جوانکاریە بەردینەکانی (مەرمەر)ی پەرستگای پارتنون، لەلایەن ئەوەوە دروستکراون.

[9] - مایکل ئانژە: نیگارکێش وپەیکەرتاش وتەلارسازو شاعیرێکی ئیتالیە(1475-1564) ناوبراو لەڕەسەنایەتی و کاملی هونەری وەرگێڕکردندا، کەسێکی سەرسوڕهێنەرە، شاکارە هونەرییەکانی ئەو لەرووی هەمەجۆری و گەورەیی، هاوتایان نییە، لەکارە بەناوبانگەکانی ئەو، تابلۆ کێشراوەکانی لەبن میچی کومبەدی کڵێسای سن بی یر، هەروەها پەیکەرەکانی داود وموساش لەرۆمدا دەستکردی ئەمن.

[10] - ئانیبال: فەرماندەیەکی سەربازی کارتاژیە(خاکی تونسی ئەمڕۆ) کەڕۆمیەکانی لەچەند شەڕێکدا تێکشکاندو سەرئەنجام شکستی خواردوو خۆی کوشت (247-183) پێش میلاد،

[11] - سەردارێکی ڕوسیە (1729-1800) لەسالی(1794)دا ڕاپەڕینی پۆلۆنیای دامرکاندەوەو لەئیتالیادا شەڕی لەگەڵ هێزەکانی کۆماری فەرەنسادا کرد، ئەم فەرماندە سەربازیە بەکەسێکی بەتواناو ئازا بەناوبانگە.

[12]- سیزار - یان قەیسەر سەرکردەو فەرمانڕەوایەکی گەورەی ڕۆمییە(101-44)پێش میلاد، یەکێکە لەسەرکردە مێژوویەکان و یەك لەدوای یەك دوژمنەکانی خۆی تێکشکاندوون و زۆر خاکی تازەی بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆم زیادکردووە.(و- فارسی).



شۆڕشی فەرەنسا، هەموو یادو یادەوەریی و شوێنەوارێکی ئەوی ڕەشکردنەوە، ئەو لەسێپتەمبەری ساڵی (1800)دا بێبەزەییانە کەوتە وێزەی ژاکوبنەکان [٩٣]. ئەمەش لەبەر ئەوەنەبوو ئەوانە بۆکوشتنی ئەو، بۆمبێکی دانراویان لەڕێگاکەیدا تەقاندەوە،(چونکە ناپلیۆن زوو لەوەگەیشت ئەمانە دەستیان لەم کارەدا نەبووە) بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەبوو ئەمانە کۆماریخوازبوون ونامادەنەبوون لەبەرخاتری تۆمارکردنی شانازی سەرچاوەگرتوو لەنیشتمان پەرستی و باق وبریقی دەسەلاتدارییەتی سەربازی خیانەت لەشۆڕشبکەن.

لەڕووی سیاسییەوە ناپلیۆن هەرچی ئەرکبوو بۆبرەوای پیشەسازی و بازرگانی بیکات، ئەنجامی دەدا، ئەو سیاسەتی ناوخۆ ودەرەکی خۆی، بەگشتی بەجۆرێك بەڕێوەدەبرد بەرژەوەندییەکانی ئەوچینە پارێزراو دەستبەربکات.

ئەوپیاوە سەرکوتکەرە هەموو بیرۆکەی ئازادی خوازانەی لەناوپانتایی ئیمپراتۆریەتییەکەیدا دەم لەکوتکرد، بەدرێژایی فەرمانڕەوای کردنەکەی مەسەلەی ئازادی بەپەراوێزبوونی ڕەهاو بێ دەنگی سپێردرابوو، دەیویست هەموو شتێك بۆخۆی سەرافەتی بکات وفەرمانی بەهەموو کەس دەکرد، تەنانەت هەتا ئەوناستەی لەناو دەربارەکەیدا زۆرینەی کاربەدەستانی گەورەی وڵات ومیرو سەردارەکان، بەفەرمانی ئەو سەرجێی هاوسەرەکانیان دەکرد، ئەگەر ناپلیۆن بەپێویستی زانیبا ژنەکانیشیان تەلاق دەدان، شەڕە یەك لەدوای یەکەکانی، فەرەنسایان شەلالی خوێن کردبوو،لەساڵی(1814و1815)، گوندی وامەبوون کەپیاوانی (15 بۆ70) ساڵی تێدانەبوون[٩٤]. ناپلیۆن بەتوندوتیژی دژی ڕۆحی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران دەبۆوە، تەنانەت بۆخۆشی جارێکیان لەم بارەوە گوتبووی(هیچ هۆکارێك نییە هەتا کرێکاران منیان خۆشبوێت– من ئەوانم بەهەژاری وبەدبەختی کەوتنە بەردەست وەربە هەژاری وبەدبەختیش هێشتمنەوە) لەوگوتەیەی خۆی ئەوەی بیرچووبوو کەهیچ کەس وەك ئەو بەدروستکردنی دەفتەرچەی کارکردن، کرێکارانی بەشێوەیەکی ڕەها لەتوانای بەرەنگاریکردن لەبەرژەوەندییەکانیان، لەبەرامبەر خاوەن کارەکاندا بێبەش نەکردووە، شازادە ڤیازمسکی دۆستی پوشکین[٩٥]، کەلەم بەتەمەنتربوو ولەڕۆژگاری ناپلیۆندا ژیابوو، دەڵێت (بەدرێژایی سەردەمی ئیمپراتۆری یەکەم، ترس ولەرزو جەنجاڵی، باڵی بەسەر ئەورووپادا کێشابوو، کەس نەیدەزانی سبەی خۆیی و وڵاتەکەی چیان بەسەردێت، ئایا ناپلیۆن خۆی سازکردووە بۆپێکهەڵپرژان وهەڵمەتبردنەسەر شوێنێك یان نا ؟

ئالبرواندال، ستایشکەری پرشەیدایی ناپلیۆن، لەستایشکردنی ئەو ئیمپراتۆرییە گەورەی کەقارەمانە خۆشەویستەکەی ناپلیۆن بەدەستی هێناوە، زاراوەیەکی ژیرانە بەکاردەهێنرێت ودەڵێت(سنوورە شەپۆلینییەکان) هەرچەندە ئەم زاراوەیە لای خوێنەر زۆر ڕوون وئاشکرانەبێت، بەلام بەدوو نموونەکەی پێشتر مەعلوم دەبێت، بۆچ ئەو بارودۆخە ناهەموارو خوێناویە لەئەورووپادا

---

[13] - ئەندامانی یانەی وەرزشکای بەناوبانگی شۆڕش، کەکۆبوونەوەکانی خۆیان لەکەرەکێکی کۆنی ژاکوبنەکانی سنت ئونورەی پاریس ئەنجامدەدا، ژاکوبنەکان توندڕەوترین شۆڕشیەکان بوون وهەتا دواهەناسە لایەنگری کۆمیتەی ڕزگاری میللی وکەسایەتی ڕوبسپیریان دەکرد.(و- کوردی)

[14] - تێدانەبوون: مەبەستی لەوەیە کە(15 بۆ70)ساڵی بۆ خزمەتی سەربازی گیراون،(و- فارسی)

[15] - پوشکین(1799-1837) شاعیرێکی بەناوبانگی ڕوسیەو خاوەنی شاکاری،ئوجین ئونیکین و سواری زیوین و...

(و- کوردی)



بیووە فەرمانڕەواو ترس و لەرز سێبەری کردبوو، بۆیەش سنوورەکان شەپۆل بوون، چونکە ناپلیۆن نەك هەرلەکاتی شەڕدا، بەڵکو لەوکاتانەی شەڕیش لەئارادانەبوو، بەفەرمانێکی خۆی ئەو وڵاتانەی حەزی کردبا دەیخستنەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی، پەیماننامەکان، بەلای ناپلیۆنەوە هیچ بەهایەکیان نەبوو، بەهۆی ئەو تالآن وبڕۆیەی سوپای فەرەنسا دەیکرد، ناپلیۆن قازانجی زۆری بۆفەرەنسا دەستەبەرکردبوو، بەجۆرێك قەرزدارنەبوو،(بەبەراورد لەگەڵ بریتانیادا کەبەهۆی قەرزداربوونی لەڕۆژگاری حوکمڕانی ئیمپراتۆری فەرەنسا لەسەری کەڵەکەبیوون، بۆماوەی چل ساڵ توانی بیانداتەوە) مێژوونووسانی نیشتمان پەرستی فەرەنسی زۆر بەمەدەنازن وئاگایان لەوەنییە ئەمە تەنها بەهۆی تالآن وبڕۆ وڕێگریە بێپێشینەکانەوە بەدەست هاتبوو کەدژ بەو وڵاتە ژێردەستانەی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن دەکران، خوێنەری کتێبەکەی من زۆرجار لێم دەپرسن: ئایا دەتوانرێت بەشەڕەکانی ناپلیۆن بگوترێت(جەنگەکانی ئیمپریالیستی) چونکە ئێستا ئیمپریالیست بەوچەمکەی کەئێمە ئەمڕۆ دەیزانین لەسەرەتای سەدەی نۆزدەشدا هەبووە، بگوترێت؟) بەڵێ دەبێ وپێویستە ئەم ناوەش بەوجەنگانە بگوترێت و دروستە، چونکە شەڕەکانی ئیمپریالیستی لەگەڵ چۆنیایەتی ومانای شەڕەکانی ناپلیۆندا کۆکەو یەك ئاراستەییە.

(لینین)یش زۆرجار ئاماژەی بەوەکردووە، لەموداخەلە بەناوبانگەکانی خۆی کەسەبارەت بەئاشتی(برست لیتوسك)[16] بوو دەڵێت ( شەڕە ئیمپریالیستییەکانی ناپلیۆن چەند ساڵ درێژەی کێشاو سەردەمێکی دیاریکراوی بەخۆیەوەگرت و لەناکۆکییەکانی لەگەڵ بزوتنەوە ئازادیخوازە میللییەکاندا ڕایەڵەیەکی گەورەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئیمپریالیستیدا دروستکرد) دواتر دەڵێت ( لێرەدا مەبەستم لەئیمپریالیسم بەشێوەیەکی گشتی لەتالآن وبڕۆکەرو چەتەو دزەکانە کەوڵاتانی تریان ڕووتاندبۆوە، جەنگی ئیمپریالیستیش لێرەدا بەمەبەستی، جەنگی ئیمپریالیستی جەنگێکە کەدزەکانی دەریایی بەدابەشکردنی تالآنکردن بەدەست هاتووە).

ملکەچ کردنی سیاسی و تالآن وبڕۆ، تاکە ڕێگایەکبوو کەداگیرکەری فەرەنسی لەبەرامبەر دەوڵەتە تێشکاوەکاندا دەیکرد.

دەبوا برژوازی گەورە [17] حوکمڕانی ئەورووپای کۆیلە لەڕووی[18] ئابوورییەوە بگرێتەدەست، ئەم سەرمایەدارانە هاوکاری ناپلیۆنیان دەکرد هەتا دەسەڵاتی ڕەهای خۆی بەسەر فەرەنساو ئەورووپادا بسەپێنێت، ئەوەبوو سیستمی ئیپریالی ناپلیۆن، ئەمە لایەنێکی ئەوپیاوە مەزنەبوو بۆزاڵی و بەهێزی، ئەگەر بمانەوێت لێرەدا کۆتایی بەمەش بهێنین دەبێ ئامازە بەچەمکی ئەو ناپلیۆنە مەزنەش بکەین لەڕووی مێژووییەوە، ئینجا ئەو ڕاستییە بێ چەندو چوونەی هەرەسهێنانی ئەورووپای میرو شانشینیمان لاڕوون دەبێتەوە، دووکەسی دامەزرێنەرانی فەلسەفەی دیالیکتیك: دەربارەی ئەڵمانیا دەڵێن (کەئەمە سەبارەت بەهەموو ئەورووپاش ڕاستە).

---

[16] - برست لیتوسك: شارێکە لەبلاڕوسیاو لەبرواری(3/ی مارسی 1918، پەیماننامەی ئاشتی نێوان ئەڵمانیاو سۆڤیەت لەویندا مۆرکرا

[17] - برژوازی گەورە -- مەبەستی نووسەر لەسەرمایەدارەو بەدرێژایی کتێبەکەش دەڵێت: برژوازی گەورەو بچوك: دیارە بەمانای سەرمایەدارو وردە برژوا بەکاری دەهێنێت.(و-کوردی)

[18] - لەڕووی ئابوورییەوە: مەبەستی نووسەر لێرەدا تەنها ئابوری نییە، بەڵام ئەو وەك سەرەتا سەیری دەکات بۆلەناوچوونی ڕژێمە کۆنەکانی ئەورووپای ئەوکات.



( ئەگەر ناپلیۆن ئەلمانیای لەچنگداما بایەوە، ئەوا دەیتوانی ئەو سی چل ڕاپەرینەی خەلك[19]. کەناویان لەخۆیان نابوو باوکی خۆشەویستی[20] باوکی خۆشەویستی میللەت لەناوبەرێت.

دەستکاکانی قانونگوزاری وئیداری فەرەنسا دەبووە بناغەیەکی پتەوی یەکێتی ئەڵمانیاو ئیمەی لەشەڕی ئەنگی(33) ساڵەی ...... ئەنجومەنی فیدرال ڕزگاردەکرد، دەرکردنی دووسێ فەرمان لەلایەن ناپلیۆنەوە بەس بوو بۆئەوەی بۆ هەمیشە ڕزگارمان بووبا لەئابڕو چونەکانی بێکاری سەدەکانی ناوەڕاست[21]، ناپلیۆن زەبری کورچك بڕی لەسیستمی فیودالی وەشاندن، بەجۆرێك ئیتر فیودالی نەیتوانی هەرگیز ڕاست بێتەوە، ئەمەیە ئەوشاکارە مەزنەی کەلەڕووی چەمکی مێژووییەوە بەناوی ئەوەوەیە ( ناپلیۆن ).

ناپلیۆن لەڕووی مێژووییەوە دیاردەیەکە بێ هاوتاو لەهیچ کات و زەمانێکدا دروست نابێتەوە ، چونکە جارێکی تر ئەو بارودۆخەی کە لە فەرنساو ئەورووپای سەردەمی ناپلیۆندا هەبوو دووبارە نابێتەوە .

مەسەلەی بنچینەیی ئەوەیە کەنیشاندان و شیکارکردنی ژیان و کارەکانی یەکەم ئیمپراتۆری فەرەنساو دەستکەوت بەرجەستەکردنەکانی وەك کەسێکی مەزنی مێژوویی سەرکردەیەکی لێوەشاوە دەمێننەوە،خوێنەر بەبێ بونی زانیاری لەسەر مێژووی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن ،هیچ لەمێژووی ئەورووپای ساڵانی ( 1815– 1848) یش تێناگات.

هەرچەندە خوێنەر زانیاری کەمیشی لەسەر ناپلیۆن هەبێت دەتوانێت بەم کتێبە لێتێگەیشتنێکی باشی دەست بکەوێت ، ئەم کتێبە جیایە لەمێژوونوسانی بڕوازی و ستایشکەرەکانی ناپلیۆن ، هۆکەشی ئەوەیە من ویستوومە بەشێوەیەکی واقیعی باس لەو پیاوە مەزنە مێژووییە بکەم و گرنگی بەلایەنی چەمکی مێژوویی ئەوبدەم .

گنتس، ڕۆژنامەنووسێکی نەمساوی ودوژمنی قەستەسەری ناپلیۆنە، دەڵێت (ئەو یەکێکە لەدیاردە سەرسوڕهێنەرەکانی سروشت) ئەم باوەڕە ڕێگرنەبوو لەبەردەم ئەوەدا بۆئەوەی لەودیاردەدە سەرسوڕهێنەرە سروشتییە بکۆڵێتەوە، ناپلیۆن – یان وەك پوشکین دەڵێت (جێبەجێکەری شوم وپەیامە ڕەشەکانی مێژوو) تەنها لەو ڕووەوە بۆتەجێگای سەرنجی من، بزانم چۆن ڕۆڵی مێژوویی خۆی گێڕاوە.

ئەم کتێبە نووسینێکی لامسەللایی وبێ بنەمانییە، بەڵکو لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی بێلایەنانەو ناوەڕۆکی کورتکراوەی ئەو بەڵگە بڵاونەکراوانەیە کەلەئەرشیفەکاندا ماونەوەو بڵاونەبوونەوە، بەدەستهێنانی ئەم سەرچاوانە لەکاتی گەڕان بۆسەرچاوە بۆنووسینەوەی دوو کتێبی تریەوە بەناوەکانی (گەمارۆی خاکی) و(هەلومەرجی چاپەمەنییەکان لەسەردەمی ناپلیۆندا) وەگیرم کەوتوون.

**هەتا هەندێك لەم دیکۆمێنتانە ، بۆ یەکەمجار لەئەرشیفەکاندا دۆزراونەوە. شایانی باسە هەموو ئەوسەرچاوە دیکۆمێنتیانەی لەسەر ناپلیۆن هەبوون و نووسراون خوێندومنەوە.**

---

[19] - دروستبونی چەند ڕاپەرینێکی خەڵکبووە دژبە دەسەڵاتداریەتی ناپلیۆن لەئەڵماندا.

[20] - بەبنەماڵەی پاشای پرۆسیان کوتووە.(و-کوردی)

[21] - مەبەست لەوشتانەیە کەئەو کات باو بووەو هەتا سەردەمی ناپلیۆنیش هەر لەئەڵماندا ماون. هەموو جۆرە پاکتاوێك و ئابوری میرو شانشینی و دەسەڵاتداریەتی پیرو ڕۆحانیەکان ... و) (و- فارسی)



# لاویتی ناپلیۆن بۆناپارت
## (1)

له(1769/8/15) لەشاری ئاژاکسیۆی دوورگەی کرسدا، خاتوو لتیسیا بۆناپارتی کابانوی یەکێ لەنەجیبزادەکانی ئەوشارە کەتەمەنی نۆزدە ساڵان بوو ولەدادگای شاردا پیشەی پارێزەری دەکرد، لتیسیا تەنها لەدەرەوەی ماڵەکەیدابوو ولەپڕ هەستیکرد ژانی منداڵبوون گرتوویەتی وبەپەلە چووە ماڵێ وپاش کەمێ لەژوورێکی چۆڵیدا کوڕێکی بوو، بەم جۆرە بنەماڵەی شارل بۆناپارتی پارێزەری دادگای شارە بچوکەکەی ئاژاکسیۆ یەکێکی تری زیادکرد، شارل بڕیاریدا رۆڵەکانی لەسەر شێوەی دابونەریتی کرسیان پەروەردەنەکاتو بەشێوازی فەرەنسییانە تەربییەتیان بدات، کاتێ ناصلیۆن کەمێ گەورەبوو، توانی لەسەرخەرجی دەوڵەت لەیەکێك لەقوتابخانەکانی سەربازی فەرەنسی وەبەرخوێندن بنێت، چونکە ئەو خێزانە خاوەنی منداڵیتربوونو نەیاندەتوانی خەرجی قوتابخانەی بکێشن.

دوورگەی کرس دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ سەربە ولایەتی جنوای ئیتالیایی بوو کەبە رابەرایەتی یەکێ لەکۆلاکەکانی ئەوشارە بەناوی پائولی شۆرشیان دژی پاتریارکال کردو ئەمانە لەساڵی(1755)دا دەسەڵاتدارەکانی دوورگەی کرسیان تێکشکاند، بەکورتی ئەو راپەرینە کەلەلایەن ئەرستوکراتو گوندنشینەکانو جوتیارو پێکهاتەکانی تری خەڵك پێکهاتبوو دژی سەرکوتکەرانو دەسەڵاتدارانی بیگانەی ئەو ناوچەیە بوون، واتە راپەرینی گەلێك بوو دژبە دەسەڵاتدارانی سەرکێشی کۆماری جنواییەکان ورزگاربوون لەباجو سەرانەو ئیدارەکردنی ئەوان، ئەو راپەرینە بەسەرکەوتووی کۆتاییهاتو دوورگەی کرس لەساڵی(1755) بەدواوە لەژێر رابەرایەتی پائولی وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆی لێهات، بەڵام پاشماوەکانی بنەماڵەی پاشایەتی کۆنی(پاتریارکال) یەکان – بەتایبەت لەناو ئەو دوورگەیەدا، هەرچی هێزو توانایان مابوو بەکاریان دەهێنا، ئەوبنەماڵانە زۆرجار شەڕی خوێناویان دروستدەکردو گۆبەندیان دەنایەوە، تۆڵە سەندنەوەکانی (واندتا)، کەببووە باو، کارەساتی دڵتەزێنی لێدەکەوتەوە.

لەساڵی(1768)دا کۆماری جنوا مافی خۆی لەدوورگەی کرس کەبەشێوەیەکی پراکتیکی ئەومافەی نەمابوو بەلویسی پازدەهەمی پاشای فەرەنسا فرۆشتو لەبەهاری ساڵی(1769)دا هێزەکانی فەرەنسا سەربازەکانی پائولی[1] تێکشکاند. ئەم رووداوە لەمانگی یۆنیۆی ساڵی(1769)دا روویدا، واتە سێ مانگ پێش لەدایکبوونی ناپلیۆن.

ئیتر لەومێژووە بەدواوە دوورگەی کرس بوو بەملکی رەهای فەرەنسا.

---

[22] - پائولی: ئەو رابەرەیە کەسەرکردایەتی شۆرشی رزگاری کردوو سەربەخۆی ئەو دوورگەیەی راگەیاند.



بۆیـە منـداڵی نـاپلیۆن لەڕۆژگارێکـدا بەسەردەچـوو، هەتاکاتەوکاتـەش تامـەزرۆی سـەربەخۆیی سیاسـی ئـەو نواخۆشـە لەدەستچووەبوو کەلەناو خەڵکی دوورگەکەدا هەرحەسرەتی مابوو.

بەڵام ئیستا هەندێ لەفیوداڵو برژواکانی شار لەدڵی خۆیاندا دەیانگوت: ئایا لەجێگای تۆکەری‌و زۆرو کینـەو خزمـەتکردنی بەزۆر، بەئەمەکی لەبەرامبەر فەرەنسادا باشترنییە؟ شارل بوناپارتی باوکی ناپلیۆن لایەنگری فەرەنسابوو، بـەڵام نـاپلیۆنی بچوک هەرناسۆری رابەرەکەیانی پائولی دوورخراوەی دەخواردو رقی لەداگیرکەری فەرەنسی بوو، ناپلیۆن هـەر لەوسـەردەمێ منداڵییەوە کەسێکی بێتۆتکەو سەربزێوبوو، دواتر کاتێ باسی سەردەمی منداڵی خۆی دەکرد، دەیگوت: لەمنداڵیدا نەچووەتە ژێر باڵی هیچ کەسێکەوە، شەرانگێزو ئاشوبچی بووەو لەکەس نەترساوە، لەمنداڵانی داوەو سەروچاوی بریندارکردوون وهەموو منداڵە وردکە لێی ترساون، بەتایبەت براکەی جۆزێف لەبەردەستانیدا زەلیلبووە، چونکە ناپلیۆن لێیداوەو گازی لێگرتـوونو پێشنەوەی جۆزێفیش خۆی بگەیەنێتە دایکی‌و شکایەتی لێبکات، نـاپلیۆن زووتـر چـۆتە لای دایکی‌و بەگریانـەوە شـکایەتی لەجۆزیف کردووە بەوەی لێی دەدات، بەمجۆرە وەك خۆی دەڵێت جارێکیتر فرتو فێڵ بەفریای کەوتۆتەوە، ئەگـەرنا دایکی لێتسیا لێیخۆش نەدەبوو ولەپای ئەوکردەوەو شەرانەی تەمبێی دەکرد، نـاپلیۆن منـداڵێکی کەڵـەیی بـووە. دایکی خۆشی دەویستو بەوجۆرە وەك خوشكو براکانی ئاوا گەورەبوو، ئەوخێزانە بەقەناعەتەوە دەژیـانو زۆر زەحمـەتو کێشمەکێشمی ژیانیان نەدەکێشا، باوکیان بەرووکەش پیاوێکی میهرەبانو خۆبەزل نەزان بـوو، سەرپەرشـتیکەری راسـتەقینەی منداڵـەکان لتیسیا بوو کەژنێکی زۆر جدی‌و خاوەن ئیرادەو بەکاربوو وتەربیەت دانی منداڵەکان لەئەستۆی ئەودا بوو، ناپلیۆن شەیدایی بۆکارەکەیی‌و رێکوپێکی لەدایکییەوە بۆجێمابوو.

پێگەی ئەودوورگە دابراوە لەدنیاو بەوردانیشتوانە دڕەو دواکەوتووەی وچیانـشینی‌و شەڕوشـۆڕە بێکۆتاییـەکانی بنەماڵـەی (کلانەکان) وتۆڵە سێنەرانەیانو شەڕ لەدژی داگیرکەرانی فەرەنسی، کاریگـەری قـوڵو بـەتینی کردەسـەر هەسـتو نەسـتی ناپلیۆنی منداڵ.

لەساڵی(1779)دا باوکی ناپلیۆن، توانی هەردوو کوڕەکەی بنێرێت بۆ فەرەنساو لەقوتابخانـەی ئـوتن بخـوێنن، لەبـەهاری هەمان ساڵدا ناپلیۆن کەئەوکات تەمەنی دەساڵان بوو، بەهۆی بـورس .... دەولـەتی گوازرایـەوە بـۆ ئـەکادیمیای (بـری بـن) کەکەوتبۆ خۆرهەڵاتی فەرەنسا.

نـاپلیۆن لەقوتابخانـەی بـری بـن– یـش هەرقوتابیـەکی مـۆنو مڵـچبوو، چـونکە کـەوتبۆ پـەژارەو غەمگینییـەوە، زوو رقـی هەڵدەستاو درەنگیش هێور دەبۆوە بۆیە کەمتر تیکەڵاوی کەسانی دەکرد ، گوێی بەکەس نەدەدا دۆستایەتی‌و خۆشەویستی بۆکەس دەرنەدەبڕی، بەهۆی کورتە باڵایی‌و تەمەنی کەمییەوە تەنها بەخۆی پشتبەستبوو، هاوتەمەنەکانی خۆی تـەگبیریان لێکرد بوختانێکی بۆهەڵبەستن، ئازاری بدەنو گاڵتە بەشێوە قسەکردنە کرسیـەکەی بکـەن، بـەڵام نـاپلیۆنی بـچوك بەچـەند شەڕێکی سەرکەوتوو لەگەڵ ئەوانەدا تێی گەیاندەن ئەم جۆرەشتانە بێ مەترسی نین.

لەخوێندندا زیرەك بوو، بەجۆرێك مێژووی یۆنانو رۆمی تەواو فێربوو وعاشقی ماتماتیكو جوگرافیاش بوو، ئەو مامۆستایانەی ئەکادیمیا سـەربازیەکەش کەتـەواو لەوزانسـتە سـەلیقەیان نـەبوو، نـاپلیۆن بەخوێندنـەوەی کتێبـی تـر زیـاتر زانیارییـەکانی بەرفراوان دەکردن، ئیتر رۆژ بەرۆژ زیاتر خەریکی خوێندنەوە دەبوو، هەستی نیشتمان پەرستانەی ئەو سەبارەت بەدوورگـەی



کرس رەفیقە فەرەنساییەکانی توشی سەرسوڕمان کردبۆوەو واقی دەوڕماندن، لەوڕۆژانەدا بەلای ناپلیۆنەوە فەرەنسییەکان داگیرکەربوونو دەستیان بەسەر زاپەدگاکەیدا گرتووە، چونکە لەلایەکی ترەوە دووری ئەو لەنیشتمانەکەی وتاکە پەیوەندی ئەو لەگەڵ کەسو کارو نیشتمانەکەیدا لەڕێگای نامەوەبوو وبنەماڵەکەیان نەیدەتوانی لەکاتی پشوی هاویندا بیگێڕنەوە لای خۆیان، لەساڵی(1784) قۆناغی یەکەمی بەسەرکەوتویی تەواوکردو لەتەمەنی (15) ساڵیدا چوو لەکۆلێژی سەربازی پاریس بۆپەروەردەکردنی ئەفسەر، دەستی بەخوێندنکرد، مامۆستای پلەیەك لەوکۆلێژەدا وانەیان دەگوتەوە، هەرنەوەندە بەسە بڵێین (مونسس)[٢٣]ی ماتماتیك زانی بەناوبانگو(لاپلاسی)[2] بیرمەندی پسپۆڕی زانستی ئەدگار (ئاكار)ناس، ئەو مامۆستایانەبوون کەدەرسیان لەوێدا دەگوتەوە، ناپلیۆن بەوپەڕی تامەزرۆییەوە دەرسەکانی دەخوێندنو کتێبی تریشی بۆ زیادکردنی زانیارییەکانی دەخوێندنەوە، لەوێدا هەموو کەرەستەیەکی خوێندنو مامۆستای بەتوانای هەبوون، بەڵام لەماوەی خوێندنی ساڵی یەکەمیدا ناپلیۆن توشی بەدبەختییەك بۆوە، لەکۆتایی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (1784)دا باوکی بەنەخۆشی شێرپەنجەی گەدە، واتە بەهەمان ئەو نەخۆشییەی کەدواتر ناپلیۆنیشی پێمرد، مرد، بنەماڵەکەیان بێکاسبکار مایەوە، براگەورەکەشی جۆزێف کەسێکی ناشایستەو خۆپەرست بوووهیچ ئومێدی لێنەدەکرا، ئەوخوێندکارە تەمەن شازدەساڵە چاودێری کردنی دایكو خوشكو براکانی گرتە ئەستۆو دوای یەك ساڵ لەماوەی خوێندنی لەکۆلێژدا، لەساڵی(1785)دا بەپلەی سەرهەنگ، چووە ناوسوپای فەرەنسییەوەو بوو بەلێپرسراوی پایەگای سەربازی شاری ولانس.

ئەوئەفسەرە گەنجە بەسەنگەساری لەوشارەدا دەژیاو لەبەر ئەوەی زۆربەی موچەکەی خۆی بۆدایکی دەناردەوە تابەرێوە بچن، بۆخۆی خۆراكو پێداویستی مەمرەمەژی دەکردو دەخواردو کەمترین گەرانو گەشتی بۆخۆی بەرەوا نەدەزانی، لەڕیزی ئەوخانوانەی کەئەو هۆدێکی تێدا بەکرێ گرتبوو دوکانێکی کتێب فرۆشی لێبوو وناپلیۆن دوای ئەرکەکانی سەربازی هەمووکاتەکانی خەریکی خوێندنەوەی کتێب بووخاوەنی ئەو کتێبخانەیەش بەزەحمەت کتێبی وێدەدان، ناپلیۆن حەزی لەکۆڕو کۆبوونەوەو قەرەباڵغی نەبوو، جگەلەمەش جلو بەرگەکانی بەجۆرێ هەژارانەبوو حەزی نەدەکرد کەمێکیش تێکەڵاوی خەڵکبێت، بەوپەڕی تامەزرۆو شەیداییەوە خەریکی خوێندنەوەبوو، دواتر ماتماتیكو جوگرافیاو گەشت نامەی دوخوێندنەوە، لەبواری فەلسەفیشدا زۆری دەخوێندەوەو لەو ڕۆژگارەدابوو کەبەرهەمی نووسەرە کلاسیکییەکانی وەك: ڤۆلتێرو ڕۆسۆ ودالامبرو مابلیو ڕینال و..هتری خوێندنەوە.

حوکمی ڕۆژگار لەسەرئەوەبوو (سەرەتای نیشانەکانی بێزاری پێشەوایانی شۆڕشی بورژوازیو فەلسەفەکەیان) ئەمەش بەیەکێك لەتایبەتمەندییە دیارەکانی ناپلیۆن هەژماردەکرێت، دروست لەو کاتێکدا لەناو دڵی ئەودا سەری هەڵداوە، بەهەر جۆرێکبێت ئەوسەرهەنگە شازدە ساڵە لەوڕۆژگارەی سەرقاڵی خوێندنەوەبوو لەوباوەرەدا نەبوو دەوروزەمانە ئاسان بگۆردرێت، ئەو لەبەهاری تەمەنیدا دەستی بۆهەر کتێبێك دەبرد تالێیەوە وزەی هونەری خۆی پێزیادبکات سەرکەوتوانە لەناوەرۆکی کتێبەکان دەگەیشتو کاریگەری دەکردەسەر.

---

[٢٣] - مونیر - (1746 -1818) ماتماتیك زانی گەورەی فەرەنسیو داهێنەری هەندەسەی دسکریپتیو ویەکێکە لەدامەزرێنەرانی قوتابخانەی پولیتکنیك .



کتێبی ئەدەبیشی دەخوێندەوەو بەشاکارەکانی ڤرترو گۆتە سەرسامبوو، نووسینەکانی ڕاسین وکرنی و مۆلێرو شیعرە بەرەنگارییەکانی ئوسیانی ئینگلیزی سەدەکانی ناوەڕاستی دەخوێندەوە کەلەو ڕۆژگارەدا باوی بوو, لەڕاستیدا نووسینەکانی ناوبراو(ئوسیانی) کۆمەڵێ شیعری خەیاڵئامێزبوون ، دوای ئەوەی ئەو کتێبانەی دەخوێندەوە خەریکی خوێندنەوەی تێزە ماتماتیکیی وکتێبە سەربازیەکانیش بەتایبەتی سەبارەت بەتۆپخانەکانی دەخوێندەوە.

لەمانگی سبتمبەری ساڵی(1786)دا داوای مۆڵەتییەکی سەربازی دوور ودرێژیکردو گەڕایەوە شاری ئاژاکسیۆ هەتا کەمێ خێزانەکەی لەڕووی ئیدارییەوە ببوژێنێتەوە، باوکی دوای مردنی ملکێکی خەراپۆکەی لەدوای خۆی جێهێشتبوو، ناپلیۆن جوامێرانە کاروبارەکانی ڕێکخستنەوە، دواتر مۆڵەتی سەربازیەکەی بێ موچە وەرگرتن تاساڵی(1788) درێژکردەوەو کاروبارەکانی خێزانەکەی هێنایەوە سەرباری ژیانی تائاستێکی باش باشکردن, کاتێ لەساڵی(1788)دا گەڕایەوە فەرەنساو چۆوە سەربازگەی ئوسون، ئەمجارەیان خانوی بەکرێ نەگرت ولەناو سەربازگەکەدا جێگیربوو ودووبارە بەهەمان گرۆتینی پێشوو دەستیکردەوە بەخوێندنەوە, بەتایبەت ئەو کتێبانەی دەربارەی بواری سەربازی سەدەکانی ناوەڕاست بوون, جارێکیان لەگەڕەکێکی شاردا لەژێر داروپەردوێدا گۆڤارێکی کۆنی دەستکەوت کەکۆمەڵێ لەیاساو ڕێساکانی ژوستینین–ی تێدا بڵاوکرابوونەوە، ئەو نەك هەر خوێندنییەوە، بەڵکو نزیکەی (15) ساڵ دوای ئەو مێژووە, لەنووسینەوەی ڕێساکانی قانونی مەدەنیدا لەخوێندنەوەی دیژستدا گەورەترین یاسا ناسەکانی توشی سەرسوڕمانکردەوە، ناپلیۆن هێزێکی لەبیرنەچوونەوەی باشی هەبوو.

توانای لەکارە سەختەکانی فکریدا سەرەتایەی سەرهەڵدانیانبوو، بەپێی گوتەی خودی ناپلیۆن کەدەڵێت: هەموو ئەوکارانەی ڕووبەڕووم دەبونەوەو دەمویست ئەنجامیانبدەم، ماوەیەکی دوورو درێژی لەناو مێشکی خۆمدا بیرم لێدەکردنەوەو پلانم بۆدادەڕشتن، پێشبینی هەموو لایەنەکانیشم دەکردن.

لەئوسوندا، زۆرجار قەڵەمی بەدەستەوە دەگرت و وتاری سەبارەت بەهاویشتن و گرنگی تۆپ لەشەڕەکاندا دەنووسین وبەشی تۆپخانەی سەربازی ببووە ڕشتەی ئەو, لەنێوان ئەو پەڕەکاغەزانەی کەناپلیۆن هەتا ئێستاش ماون، چەند نووسینی ئەدەبی ویاداشتی سەبارەت بەمەسەلەی فەلسەفەو سیاسەت و..هیتر دەکەونە بەرچاو وزۆرینەی کاتەکانیش بیرۆکەکانی بۆوبەرامەتی لیبرالیزمی پێوەدیاربووە, هەندێ جاریش چەند نووسینێکی ڕەنگدانەوەو کاریگەری ئەندێشەی جان جاك ڕۆسۆیی پێوەدیاربوون, هەرچەندە ناتوانرێت ناپلیۆن لەپەیڕەوانی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی، ڕۆسۆ هەژماربکرێت, لەوساڵانەدا هێڵێکی دیاروبەرچاو لەڕۆحیەتی ناپلیۆن دەکەوێتە بەرچاو، ئەویش زاڵبونی تەواوی عەقڵیەت وئیرادەی بەهێزیەتی بەسەر هەوەس ونەستەکانیدا، هەمیشە تێر بەسکی خۆی نانی نەدەخوارد، لەدۆستایەتی کردنی خەڵك وئاشنایەتی ژنان بەدووربوو, خۆی لەهەموو جۆرە ڕابواردن وگەشت وگەڕانێك دەپاراست, بەشێوەیەکی ماندو نەناسانە کاری دەکرد, ئایا ئەو بەوەی وەك یەك ئەفسەری شارێکی ژێردەستە سەیریان دەکرد؟ یەك ئەفسەری هەژاری خەڵکی کرس وکەسێکی نەجیبزادەی دەستکورت, بەم ژیانەی ڕازی ببوو؟ پێشنەوەی ناپلیۆن بواری هەبێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوەو بتوانێت نەخشە بۆئایندەی خۆی داڕێژێت, ئەو تەلارە لەرزییەوەو تێکڕووخاو سەرئەنجام شۆڕشی فەرەنسا هەڵگیرسا.



## ( 2 )

یاداشت نووسان ومێژوو نووسانی زۆر، کەژیانی ناپلیۆنیان نووسیوەتەوەو دەیانەوێت سوورین لەسەر ئەوەی ناوبراو ژیری سەرووی مرۆیی هەبووەو کەرامەتی پێغەمبەری هەبووە، دەیانەوێت ئەمە نیشانبدەن ئەوگەنجە ئەفسەرە بیست ساڵە لەسەربازگەی ئوسوندا پێشبینی شۆڕشی(1789)ی کردووە.

لەڕاستیدا هەموو ڕووداوەکان زۆر بەئاسایی هاتن و تێپەرین, ناپلیۆنیش بەهۆی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە توانیویەتی درك بەسەرکەوتنی برژوازی بکات بەسەر سیستمی فیودیالی سەرکوتکەردا, لەدوورگەی کرسدا ئەرستۆکراتەکا هیچ کاتێ تەنانەت لەسەردەمی ڕژێمی جنوایشدا خاوەنی ئەونیمتیازو مافەنەبوون کەئەرستۆکراتەکانی فەرەنسایی هەیانبوو، ئەم گەنجە نەجیبزادە کرسییەی کەخەڵکی دورگەیەکی دواکەوتوویی ئیتالیایی تازەهاتووە ژێر دەستی فەرەنسا بوو, بەهیچ جۆرێ ئومێدی لەدڵدانەبوو ولەناو گڕو پریشکی ئاگردا بەوخێرایە ناو وناوبانگی بڵاوبێتەوەو بدرەوشێتەوە, بەتێڕوانینی ئەو شۆڕشی بەباشی وێنادەکرد، ئەمەشبوو کەدواتر توانای لێوەشاوەیی تاکەکەسی دەتوانێت بەپلە و پاکانی کۆمەڵایەتیدا هەڵکێرێت، ناپلیۆنی گەنجی ئەفسەری تۆپخانە، هاتنە گۆڕەپانی ڕووداوەکان وخۆی بەدیار خست.

ئەو بیری لەکاری بەکردەوە دەکردەوە، باشترین کەڵك کەلەشۆڕشی وەرگرتبا چی بوو؟

ئەم پرسیارە دوولایەنی هەبوو, یەکەم لەدورگەی کرس ودووەمیش لەفەرەنسادا, زیادەڕەوی کردن لەهەستی نیشتمان پەروەری ئەودا ئاستێکی دیاریکراوی هەبوو, ئیتر ئەوهەمان ئەوسەرهەنگە لەهجە کرسییە نەمابوو کەلەحەوشەی قوتابخانەی (بری بن)دا بەگژ قوتابییەکانی قوتابخانەکەیدا بچێەوە، ئەو لەوە گەیشتبوو فەرەنسا چییەو کرسیش چی، دەیتوانی بەراوردی ئەم دوو شوێنانە بکات ونەیانخاتە هاوتایەکەوە, بەڵام مەسەلەکە بەلای ئەوەوە ئەوەبوو ئەوکارەی دەیتوانی لەدورگەی کرسدا بەدەستی بهێنێت لەفەرەنساشدا گیری بکەوێت، چونکە تازە شۆڕش بەرپاببوو، ئەم دۆخە نوێیە زۆر یاریدەدەرنەبوو، دوو مانگ ونیو دوای ڕزگارکردنی باست– ی، ناپلیۆن داوای مۆڵەتی کردو گەڕایەوە دوورگەی کرسی زادگای, ئەونووسینە ئەدەبیانەی کەناپلیۆن نووسینی، لەساڵی(1789)دا بوو کەچەند پەڕاوگێکبوون دەربارەی مێژووی دورگەی کرس, دەستنووسەکەی دایە رینال وناوبراو پێی باشبوو، بەتایبەت لەڕووی ئەوەوە کەلایەنێکی میللی بەخۆیەوە گرتبوو, پێشنەوەی ناپلیۆن لەزادگاکەیدا خەریکی کاری سیاسیبێت حەزی لەبوارێ ئەدەبی بوو، هەرکە گەڕایەوە کرس، ڕاستەوخۆ خۆی بەلایەنگری پائولی گەڕاوە لەتاراوگە نیشانداو پاش ماوەیەك ئەم دوانە لەڕووی سیاسییەوە لێکدابڕان, پائولی دەیویست دورگەی کرس لەدەست داگیرکەری فەرەنسا ڕزگاربکات, بەڵام بەلای ناپلیۆنەوە پێشکەوتنی دورگەی کرس وبەرەوپێشچوونی خۆشی مەسەلەیەکی بنچینەیی بوو, دوای چەند مانگێ مانەوەی لەکرسدا گەڕایەوە سەربازگەکەی خۆی وبرا بچوکەکەی ( لویس )یشی لەگەڵخۆیدابرد، تاکەمێ خەرجی ماڵەوەیان کەمتر بێتەوە، ئەو دوو برایە لەسەربازگەی ئالانسدا کەتازە بۆئەو شارە گوازرابۆوە نیشتەجێ بوون، ئیتر دەبوا ناپلیۆن و براکەی بەومووچە سەربازییە کەمە ژیابان کەوەریدەگرت وخەرجی



خوێندنی لویسی براشی لێدابا, زۆرجار ئەو دووبرایە ئەوەندە مافوت وبێ پارە دەبوون نانی وشکیان دەخوارد، بەڵام ناپلیۆن هەربە جدی و بەردەوام خەریکی خوێندنەوەبوو، بەتایبەت کتێبەکانی بواری سەربازی, لەسبتمبەری ساڵی(1791)دا ناپلیۆن خۆی نەقڵکرد بۆدورگەی کرسی زایەدگای خۆی، بەڵام ئیتر هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ پانولی-دا نەمابوو, چونکە پانولی خەباتی بۆڕزگارکردنی دورگەی کرس دەکرد لەدەست فەرەنسا، ناپلیۆنیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبوو، لەکۆتایی مانگیئیبریلی ساڵی(1791)دا ڕۆخانییەکان وهەندێك لەلایەنگرانی پانولی شاڵاویان کردەسەر سەربازەکانی ناپلیۆن لەکرسداو ناپلیۆن فەرمانیدا تەقە لەمانە بکەن , بەڵام چونکە بێ فەرمانی فەرماندەی گشتی سوپای فەرەنسا تەقە لەوانەکرابوو، بەفەرمانی سەربازی بانگهێشتی وەزارەتی بەرگریکراو لەمانگی مایۆدا خۆی گەیاندەوە پاریس، بەڵام بەهۆی ڕووداوو جەنجاڵییەکانی شۆڕش مایەوە، ئەوگەنجە(23) ساڵە هیچ ڕۆڵێکی لەشاڵاوکردنی خەڵك بۆسەر کۆشکی تویلری وسەرنگونکردنی حکومەت نەبوو وتەنها وەك یەك بینەری سادە ڕووداوەکانی دەبینی, ڕاستی ناپلیۆن بەهاوەڵی(بوری ین) ڕۆژانە دەچوونە سەر بەرزاییەکان تاسەیری ئەو خەڵکەبکەن کەهێرش دەکەنەسەر کۆشکی پاشایەتی وناپلیۆن بەبرادەرەکەی گوت : وەرە بابەدوای ئەوخەڵکە زەلیل وبێسەرو بەرانە بکەوین, کاتێ ( لویسی شازدەهەم ) کەلەم ڕاپەڕینە هەڕەشە ئامێزانە سەرسام بوو, بەکڵاوە سورەکەی سەرییەوە هاتەبەرهەیوانی کۆشك وبەدەست ڕاوەشاندن سەلامی لەخەڵکەکە کرد، ناپلیۆن بەرقەوە گوتی: چەند یاوێکی بێ غیرەتە، چۆن، بۆ ڕێگادەدات ئەو پۆخڵەواتانە بێنەناو کۆشکەوە، باشتروابوو چوارسەد پێنج سەد کەسی بەگوللە تۆپ ماشتبانەوە، ئینجا ئەوانیتر چاکدەبوون(من ئەو قسەیەی کەناپلیۆن بەلویسی پاشای گوت وەك خۆی نەم نووسیوەتەوە چونکە شایستە نەبوو).

ڕۆژی (1792/7/10) ئەو ڕۆژەی هێرشکرایەسەر کۆشکی لویسی شازدەهەم ولەلایەن شۆڕشیانەوە گیردرا، دووبارە ناپلیۆن لەکوچەکانی شاردا دەکەوتەوە بەرچاو وهەمان وشەی درێوی بەپاشا دەگوت و خەڵکەکەشی بەبەرەڵاو بێسەرەوبەرە ناودەبرد، بەڵێ ناپلیۆن کەڕۆژی دەهەمی مانگی یۆلیۆی ساڵی(1792) بەشداری هێرشکردنەسەر کۆشکی لەگەڵ خەڵکداکرد، نەخەڵکەکەش پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد ڕۆژێکبێت ئەوکوڕە ئەفسەرە باڵاکورتە باڵتۆکۆنە، ببێتە ئیمپراتۆری ڕەهای فەرەنساو ئەمڕۆ لایەنگری جمهوریە، سبەی ئەو لەناوی دەبات, ناپلیۆن بۆی دەرکەوت وتەواو بڕوای بەوەبوو کەتۆپخانە کاریگەری تەواوی هەیەو دەتوانێت شاڵاوی خەڵك تەفروتونا بکات, دووبارە ناپلیۆن گەڕایەوە دورگەی کرس ولەوکاتانەدا پانولی جیاخواز خۆی تەسلیمی بریتانیاکردبوو, دوای تێکهەڵچوون وڕووبەڕوو بونەوەیەکی مەترسیدار ناپلیۆن توانی پێشنەوەی سوپای بریتانیا ئەو دورگەیە داگیربکات بەخێزانەکەیەوە هەڵبێت بۆفەرەنسا, ئەمە لەمانگی ئۆگۆستی(1793) دا ڕوویداو پێشنەوەی ناپلیۆن و خێزانەکەیان هەڵێن ماڵ وملکەکەیان لەلایەن لایەنگرانی پانولییەوە تالان وبڕۆکرا, ئیتر ساڵانی نەهامەتی و سەنگەساری دەستپێکرد، هەرچەندە ناپلیۆن پلەی سەربازی بۆسەرتیپ بەرزبۆوە بەڵام دەبوایە بەوموچە کەمەی دایکی وحەوت خوشك وبراکەی بەخێوبکات، سەرەتا لەشاری تولون بوون دواتر چوون لەشاری مارسیدا نیشتەجێبوون وبەمەمرە مەژی دەژیان، ژیانی ئەوانە مانگ لەدوای مانگ خراپترو گرانتر دەبوو ودەستکورتی تەنگەی پێهەڵدەچنین وهیچ ئومێدێك لەئاسۆوە بەدی نەدەکرا، لەپڕکاری سەربازی بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گۆڕا, لەخوارووی فەرەنسادا ڕاپەڕینێکی دژە شۆرش بەرپابوو، لایەنگرانی پاشا لەتۆلۆندا کرێکارو کارمەندانی دەوڵەتیان گرتبوون وکوشتبوون وئەو کەمیە



سەربازیانەی بریتانیاش کەلەدەریای سپیدابوون هاوکاری سەربازی ئەوخەڵکە ڕاپەڕیوەیان کردبوو, سوپای شۆڕش ناوچەی تۆلۆنی لەوشکانییەوە گەمارۆدا, ئەو گەمارۆ سەربازیەش لەژێر فەرماندەی کەسێکدابوو بەناوی کارتو, ئەو فەرماندە سەربازیەی شۆڕش کەڕاپەڕیوەکانی خوارووی فەرەنسای سەرکوتکردبوو, یەکێ بوو لەئاشناکانی بۆناپارت وخەڵکی دوورگەی کرس بوو وناوی (سالی چتی) بوو وهەمان ئەوکەسەبوو کەلەگەڵ ناپلیۆندا دژی ئاپولی ببونەوە.

ناپلیۆن لەسەربازگێکی نزیك تۆلۆنـدا چاوی بەهاونیـشتمانیەکەی کـەوت وباسـی لەدوورخـستنەوەو تێکـشکاندنی سـوپای بریتانیاکرد,(سالی چتی) ئەوی بەفەرماندەیّ تۆپخانە دانا بۆتێکشکاندنی ڕاپەڕیوان, ئەوهێرشەی لەڕۆژانی سەرەتادا دەستی پێکرد، تێکشکا، چونکە لەژێر فەرماندەیی(دونە) دابوو وناکۆکبوو لەگەڵ بۆچوونی ناپلیۆنـدا ولەسـاتەوەختێکی ناگونجـاودا ناوبراو(دونە) پاشەکشەی کرد, ناپلیۆن لەوبڕوایەدابوو ئەگەر ئەوپاشەکشەیە لەوکاتەدا نەبوایە ئەوا سەرکەوتوویی بەنسیب گەلی فەرەنسا دەبوو, ناپلیۆن زۆر داوای لەفەرماندە سەربازیەکانی باڵاکرد ڕێگـای پێبـدەن ئەونەخـشە سـەربازیە دابڕێژێت، بەڵام ئەوان باوەڕیان بەوکورە لاوە بێگانەیە نەدەکرد, تاسەرئەنجام (دوگمیە)ی فەرماندەی تازە ڕێگای بەئەودا نەخشەکەی خۆی بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە, ناپلیۆنیش دوای ئەوەی تۆپەکانی جێگیرکردو تۆپبارانکردنێکی خەست وسامناك وگیانی خۆی خستە مەترسیەوە لەتەپۆلکەی ئاگیت توانی بگاتەسەر لێوارێکی کـەمی دەریـاو هێـرش بکاتەسـەر سـوپایی دەریـایی بریتانیا.

لەڕۆژی(17)ی بێنایەردا کۆماری خوازەکان کەژمارەیان(7) هەزار کەس دەبوو، هێرشیانکردەسەر ئەوشارەو دوای شەڕێکی خوێناوی تێکشکان وپاشەکشەیان کردەوە, بەڵام بەهۆی هێزە سەربازەکانی تۆپخانەی نـاپلیۆن وهێنـانی لۆجـستی، تـوانی ئەوشەرە لەتێکشانەوە بۆسەرکەوتن بگۆڕێت، لەبەرەبـەیانی ئـەو ڕۆژەدا لایـەنگرانی پاشـا دەستەدەسـتە هـەڵاتن وشـاریان جێهێـشت وبریتانیاییـەکانیش ڕێگایانـدان بـچنەناو کەشـتییەکانیانەوەو پەنایانـدان، تۆلـۆن کەوتـەوە ژێردەسـەڵاتی کۆماریخوازەکان وسوپای شۆڕش هاتەوەناو شارو کەشتییەکانی بریتانیاش لەڕۆخی دەریا دوورکەوتنەوەو هەڵاتن, بەهۆی ئەم سەرکەوتنە درەوشاوەیە ژنرال (دوتیل) ڕاپۆرتێکی بۆ وەزارەتی بەرگری لـەپاریس نـاردو تێیـدا ڕایگەیانـدبوو کەشایـستەیی ولێوەشاوەیی ناپلیۆن لەگوتن نایەت، ئەولەو ڕاپۆرتەدا جگەلـەوەی ئامـاژەی بـەوەکردبوو کـەزانیاری سـەربازی ئەوهاوتایـە لەگەڵ ژیریەکەیدا، خاوەنی کەسایەتییەکی گەورەشە، هەروەها لەدرێژەی ئەو ڕاپۆرتەدا نووسیبووی، مـن باسـی ئەفـسەرێك دەکەم کەنـەزیری دەگمـەنن ویـەك لەهەزارنییـە، هـەروەها داوای لـەوەزیری بـەرگری کردبـوو چـاودێری ئـەم ئەفـسەرەبکات بۆباشکردن وچاکسازی کۆماری, لەوڕۆڵەی کەناپلۆن گێڕای بەبـەردەوام تۆپبـارانکردن وهێرشـکردن لەسـاتەوەختی گونجـاو هەستیاردا، بـەلای هەموانـەوە دانـایی ونەبەردییـەکی مـەزن بـوو, ئـەم هونـەری شـەڕە کەیەکـەمین نەبـەردی نـاپلیۆن بـوو وسەرکەوتنی بەدەست هێنا لە(17)ی دیسەمبەری ساڵی (1793)دابوو، لەسەرکەوتنی تۆلۆن– ەوە هـەتا (18)ی یۆنیـۆی ساڵی(1815)وشەڕی واترلو– ئەم سەرکەوتنە لەسەر زمانی خەڵکبوو وماوەی(22) ساڵ هەتا ڕۆژگـاری شـەڕەکانی ئـازادی خوازی میللی لەئەورووپادا باسی لێوەدەکراو تابەئەمڕۆش ئەوشەڕانە لەمەنهەجی وانەی مێژوودا دەخوێنرێت.

ناپلیۆن لەژیانیدا نزیکەی شەست شەڕی گەورەو بچوکی کردن, زۆر زیاتر لەوشەڕانەی کەئەلکسەندەری گەورەو (1)ئانیپال وسیزارو سقۆرۆف کردویانن, هەرچەندە بەبەراورد لەگەڵ شەڕەکانیدا شەڕی تۆلـۆن هـیچ نـەبوو، بـەڵام ئەوشـەڕە بـەردەوام



شوێنێکی تایبەتی هەبوو لەداستانەکانی ناپلیۆندا، چونکە ئەوشەڕە سەرنجی هەموو لایەکی بۆلای ئەوئەفسەرە گەنجە ڕاکێشاو بۆیەکەم جار لەپاریسدا پەیان بەبوونی ئەوبرد, کۆمیتەی ڕزگاری میللی بەوەی خیانەتکارەکانی تۆلۆن ڕەتێندرابوون وکەشتییەکانی بریتانیاش هەڵاتبوون بۆڕۆخەکانی میسر زۆر دڵشادبوون, گۆڕانکارییە نوێکان ئەوەیان نیشاندەدا کەدژ شۆڕشییەکانی لایەنگری پاشایەتی لەسەرتاسەری خوارووی وڵاتدا سەرکوتکراون وتێکشکێندراون، قەڵاتی تۆلۆن سەبارەت بەدژە شۆڕشییەکان ئەوەندە سەخت وئاسێ بوو کەس باوەڕی نەدەکردو بەڕاستی نەدەزانی لەلایەن گەنجێکی نەناسراو بەناوی ناپلیۆنەوە ڕزگارکراوە، لەبەختی ناپلیۆن کەسێك لەهۆردووی سەربازدابوو کەلەفەرماندە(سالی چتی) ناودارتربوو – ئەوکەسەش ئوگوستن روبسپیری برا بچوکی ماکزیمیلین بوو, کەلەڕزگارکردنی شاردا بەشداری کردبوو وراپۆرتێکی لەسەر ئەوشەڕە بۆپاریس ناردبوو، لەسەر بریاری ئەو لەڕۆژی(14/1/1794)دا ناپلیۆن بۆناپارت پلەی سەربازی بەرزدەکرێتەوە بۆسەر لەشکر, ناوبراو لەوکاتەدا تەمەنی (24) ساڵبوو کەهەنگاوی یەکەمی نا.

( 3 )

سەرکەوتن لەشەڕی تۆلۆندا لەسەردەستی ناپلیۆن. لەڕۆژگارێکدابوو کەگروپی مونتانیارییەکان تەواو بەسەر ئەنجومەنی کنوانسیوندا زاڵبوون, لەڕۆژگارێکدابوو کەکلوپ ژاکوبنەکان نفوزێکی زۆریان هەبوو لەپایتەخت وشارەکانی تری فەرەنسادا و شۆڕش زاڵبوو بەسەر دوژمنانی ناوخۆ کەلایەنگرانی شانشینی وژیروندنەکان وکەشیشەکان بوون وبەسەر سەختی سەرکوتیان دەکردن، تەنانەت بەسەختی دوژمنانی دەرەکیشیان بەرپەرچ دەدایەوە، لەم نەبەردە ناوخۆییەدا، ناپلیۆن بۆناپارت ناچاربوو چاولەناو ئەوهەموو جەماوەرەدا بکاتەوە کەدەیانتوانی هەموو شتێکی پێبدەن وبەیەکێ هەڵیبژێرن، چونکە لەوڕۆژانەدا شارە سەرکێشی کەرەکانی خوارووی وڵات ئەوەیان لاڕوون ببۆوە ئیترهیچ ئومێدێك نییە بۆ هەڵشلاخانەوەو دژایەتی کردنی حکومەتی کۆماری، لەسەرەتای هاویندا کۆمیسیۆنی شۆڕش لەخوارووی وڵاتدا– بەتایبەت ڕۆبسپیر لەژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی ناپلیۆندا، خۆیان بۆهێرشکردنەسەر(پیەمون)و خۆرهەڵاتی ئیتالیا سازکرد، هەتالەوێوە هەڕەشە لەنەمسا بکەن، کۆمیتەی ڕزگاری میللی دوودڵبوو وکارنولەوکاتەدا لەگەڵ ئەم پلانەدانەبوو،ناپلیۆن ئومێدی ئەوەی هەبوو لەڕێگای ئوگوستن روبسپیرەوە بتوانێت بەئارەزووی خۆی بکات، واتە بۆداگیرکردنی ئیتالیا جلی جەنگی لەبەربکات وبەکەوێتەکار، حکومەتی فەرەنسی، کۆماریخوازەکان بەوەناشنانەببوون کەوێنای ئەوەبکەن ڕووبەڕووی شەڕی دەرەکی ببنەوە بەوەی وڵاتە ئەورووپیەکان دەستیان لەکاروباری ناوخۆی فەرەنسا وەردەدا, ئەوان لەحاڵەتی بەرگریکردندابوون وبەس، جاچجای هەڵمەتبردن کەغیرەتی دەویست، چارەنوس وای هێنایەپێش ناپلیۆن لەساڵی(1794)دا نەخشەکەی خۆی بخاتە جێبەجێکردنەوە، یەك پێشهاتی سیاسی مەسەلەکەی هەڵگێرایەوە، روبسپیر بەمەبەستی ئەوەی نەخشەی هێرشکردنەسەر ئیتالیای بەبراکەی بڵێت ولەئەنجومەنی ڕزگاری میللیدا بەرگری لەمەبکات گەڕابۆوە بۆ پاریس ولەوکاتەشدا ناپلیۆن بەنهێنی چووبوو بۆ ژەن بۆئەوەی تاوتوێی دۆخەکە بکات وزانیاری زیاتری دەستبکەوێت و دوای ئەمە گەڕابۆوەو لە (نیس )دا بەچاوەڕوانی مابۆوە، لەپڕ هەواڵێك لەپاریسەوە هات –کەئەك هەرتەنها سەبارەت بەم شارۆچکەیەی خوارووی وڵات تەنانەت بەلای خەڵکی پاریسیشەوە شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، ئەم هەواڵە سەر سوڕهێنەرەش ئەوەبوو ماکزیمیلین روبسپیر وبراکەی ئوگوستن وسن ژوست وکوتن– یان دەستبەسەر کردوون وبەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بەجیۆتین ملیان پەڕاندوون ، دوای

ئەوەی بێدادگاییکردن ئەمانەیان کوشتوون، لایەنگرەکانیشیان گرتوون وڕاوەدونراون ودەستیانکردووە بەگرتنی ئەوکەسانەش کەلایەنگر–یان گومانی ئەوەیان لێکراوە سەربە سیستمی حوکمی پێشوو بووبن.

دوای ئیعدامکردنی ئەمانە ناپلیۆن هەستیکرد هەڕەشەی جددی کەوتۆتەسەر، لەماوەی کەمتر لەدووهەفتە بەسەر ڕووداوەکەی(1794/7/27)دا، ناپلیۆنیان دەستگیرکردو لە(1794/8/10)دا بردیان بۆقەلاتی ئانتیب، دوای ئەوەی ناوبراو(14) ڕۆژ زیندانی کرا، ئازادیانکرد چونکە هیچ بەڵگەیەك لەدۆسیکانی ئەودا نەبوو ببێتە بەهانە بۆلەناوبردنی.

لەڕووداوەمەترسیدارەکەی(ترمیدوری)دا زۆر لەوکەسانەی لایەنگری روبسپیریزمی بوون کوژران،دەکرا ناپلیۆن خۆی بەبەختەوەر بزانێت بەوەی ڕزگاری بوو لەجیوتین، دوای ئەوەی ناپلیۆن لەزیندان ئازادکرا هەستیکردکاتیگۆڕانهاتووەوڕێگای رەوپێشچوونی ئەو کەبەباشی کرابۆوە گەیشتۆتە بنبەست، دەسەلاتدارانی تازە گومانیان لەئەوهەبوو، جگەلەمەش زۆرشتیان سەبارەت بەئەو نەدەزانی، سەرکەوتنەکەی تۆلۆن بەناوبانگی سەربازی ئەوتۆی بۆئەو دەستەبەر نەکردبوو.

هەرچۆنێکبێت سەرکەوتنەکەی تۆلۆن ئیتر بەفەرامۆشی ولەبیرچوونەوە سپێردرابوو وبەهای پلۆانی سەرەتایی نەمابوو، ئەهامەتیەکی تر ڕوویکردە ناپلیۆن، ئەویش ئەوەبوو کۆمیتەی ڕزگاری میللی ترمیدوری فەرمانی بەناپلیۆن کرد بۆسەرکوتکردنی یاخیبوانی ولایەتی (واند) بکەوێتەڕێ وبەرەو ئەوشارە بڕوات، کاتێ ژنرال ناپلیۆن گەیشتە پاریس پێیانگوت ئەویان بەفەرماندەی تیپێکی پیادە داناوە، لەکاتێکا ئەو ئەفسەری تۆپخانەبوو ونەیدەزانی لەگەڵ تیپی پیادەی سەربازیدا خزمەتبکات, دوای ئەوەی ناپلیۆن شێوە ناڕەزایی خۆی لای ئوبری کەیەکێکبوو لەئەندامانی کۆمیتەی باڵا، دەربڕی، دەستی لەخزمەتی سەربازی کێشایەوە.

ناپلیۆن توشی ڕۆژگارێکی سەخت وناهەموار بۆوە، ئەو ژنراله ئیستقالەکردووە تەمەن (25) سالە کەلەگەڵ لێپرسراوەکانیدا تێکهەڵچووبوو و بێهیچ موچەو سەرچاوەیەکی بژێوی هاوین وپایزی سالی (1794)و زستان وبەهاری سالی(1795)ی بەدەستکورتی ومەینەتییەوە لەپاریسدا بەسەربرد، وەك ئەوەی هەموو ئەویان بیرچووبێتەوە، سەرئەنجام لەمانگی (8ی سالی1795 )دا وەك ژنرالی تۆپخانە دەفتەری نەخشەدانانی کومیتەی ڕزگاری میللی، کەدەستەی بالای گشتی سوپابوو وفەرماندەی گشتی سوپای کۆماری لەئەستۆدابوو ولەلایەن ( کارنو )نەوە ئەوکۆمیتە باڵایە دامەزرابوو، ناپلیۆن وەرگیرا.

موچەکەی کەمبوو وزۆرینەی کات بۆنانخواردن دەچووە مالی (پرنو) کەلەلای ئەوخێزانە ناوبراو زۆر خۆشەویستبوو، بەلام بەدرێژایی ئەوماوەیەی دەستی لەکارکێشابۆوە بۆجارێکیش ناپلیۆن لەوەپەشیمان نەبوو کەبەفەرماندەی سەربازی پیادەنەچووە بۆشەڕ، بۆیەش بۆگەڕاندنەوەی بۆسەر کارەکەی پەنای بۆ هیچ لێپرسراوێکی حکومی وکاربەدەستانی شۆڕش نەبردو هۆی گەرانەوەشی تەنها ئەوەبوو جارێکیتر بەخت بۆوە هاوەڵی.

کۆمارییەکان بۆ ڕوو بەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنەکانی هاوتای شاری تۆلۆن پێویستیان بەبوونی پیاوێکی وەك ناپلیۆن بوو.

سالی(1795) یەکێ بوو لەوسالانەی کەزۆر گۆڕانکاری لەمێژووی شۆرشی فەرەنسادا ڕوویدا، شۆرشی برژوازی کەرژێمی حکومەتی رەهای پاشایەتی وفیودالی لەناوبردبوو، لەتۆی ترمیدوردا خۆی لەبەهێزترین چەکی خۆی بێبەری کرد، واتە دکتاتۆری ژاکوبن، برژوازیەت گەیشتبۆ دەسەلات وتوانا، لەڕێگای گەڕانەوەیدابوو بەکەرەستەو شێوازی تازە بۆجێگیرکردنی زیاتری دەسەلاتی خۆی وگرێنتی مانەوەی، لەماوەی زستانی سالانی(1794– 1795)دا کنوانسیونی ترمیدوری بەردەوام

لایەنگری ڕاسترەوەکانی دەکرد, بەمانا سیاسییەکەی،پاشگەزبوونەوەی بزۆوازی لەهاوینی(1794)، واتە ڕێك دوای لابردنی دەسەلاتی دکتاتۆری ژاکوبن.

بزۆوازیەتی[24] هیچ کاتێ بەبارتەقای ئەوپایزە بەهێزو کارامەنەبوو، بەلام لەپایزی ساڵی(1794)یشدا باڵی ڕاستی کنوانسیون مابووی بتوانێت بەرووهەڵماڵاوی وبێترس ڕاکانی خۆی دەربڕێت وبەشێوەی پراکتیکی بیخاتە حاڵەتی جێبەجێکردنەوە، لەوساڵە ترسناکە قات وقریەدا کەچینی کرێکار (پرولیتاریا) بەردەوام کێشەی بێکاری ونەبوونی ببوە وێردی سەرزمانیان وبرسییەتی تەواو تەنگەی بەخەڵك هەڵچنیبوو، دایکان لەبرسییەتیدا دوای خنکاندن- یان کوشتنی ڕۆڵەکانیان خۆشیان دەکوشت, بەڵام هەندێ لەدانیشتوانی ناوەندی شار بەشێوەیەکی خێرا دەوڵەمەند ببوون وببونە خاوەنی کۆشك وتەلارو بانك وبازاڕی بۆرسە بەدزی لەدەوڵەت وگەندەڵی ئیداری، دوو ڕاپەڕین لەوناوچانەی کەکرێکارو هەژاری تێدا دەژیان دژی کنوانسیون سەریهەڵدا وخۆپیشاندانێکی چەکداری مەترسیداریان کرد، یەکێکیان لە(12)ی ئیبریل ودووەمیشیان لە(20)ی مایۆی سالی( 1795 )دا بوو، ئەمانە ڕاستەوخۆ هێرشیان کردەسەر بارەگای سەرەکی کنوانسیون،بەڵام تێکشکێندران, ئەوتێکشکاندنە سامناکەی مانگی مایۆ وچەککردنی ئەمانە هیچ جۆرە چالاکییەکی بەکۆمەڵی ئەمانەی نەهێشت،ئەمە واینیشاندەدا جارێکیتر بزۆوازی لایەنگری شانشینی کەلەدڵی بزۆوازیەتی کۆندا[25] مردبوو، ووزابۆوە، ئەوانە وایان لێکدەدایەوە ئیتر نۆبەی ئەوان هاتووە، بەهەڵەدا چووبوون، دوای تێکشکانی چینی پرۆلیتاری لایەنگری شانشینی کەلەگەڵ کۆنەپەرستە بزۆاو فیودیالەکاندا دەیانویست شانشینی بگەڕێتەوە، توشی نائومێدی گەورەبوونەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی برای لویسی شازدەهەم ملی بەجیوتین پەراندرابوو، لایەنگرانی شانشینی نەدەیانویستو نەباوەڕیشیان دەکرد لەسالانی(1789-1795)دا چ کار نەخشەیەك ئەنجام درابوون، نەیاندەزانی ئیتر قۆناغی فیودالی [26] بەسەرچوو وناتوانێت بگەڕێتەوەو قۆناغی سەرمایەداری دەستی پێکردووەو ئەو قۆناغە سەردەمێکی جیاوازی لەنێوان ڕۆژگاری کۆن‌و نوێدا دروستکردووە کەبەهیچ کلۆجێك بەیەکەوە نابەسترێتەوە، بۆیە بیرۆکەی گەڕانەوەی ئەمانە بۆسەردەسەلات بەشتێکی سەیرو سەمەرە دیاربوو، لەلەندەن‌و کوبلنس[27] ومیتو[28] وهامبورگ وڕۆم، واتە لەهەموو ئەوشوێنانەی پەناهەندەی فەرەنسی تیدابوون – بەردەوام ئەوە لەناو ئەوخەوڵکەدا دەگوترایەوە کەپێویستە هەموو ئەوانەی دەستیان لەشۆڕشدا هەبوو بەوپەڕی سزا بگەیەندرێن.

دوای ڕووداوەکەی مانگی مایۆ، کوشتاری ئەورۆژە، هەموولایەنگرانی شانشینی دەیانگوت خۆشبەختانە چەتەو ڕێگرەکانی بەناو شۆڕشکەر لەناوخۆیاندا بەگژیەکتریدا چوونەوەو ئیستا کاتی ئەوەهاتووە لایەنگرانی شانشینی هەڵمەتیان بکەینەسەر وخاوەخاو نەکرێت و دەبێ هەردوو لایەنی- ترمیدوری‌و مونتانیارییەکان لەسێدارەبدرێن، بیرۆکەی گەمژانەی ئەوانە کەگیرانەوەی مێژووبوو، هەموو نەخشەکانی ئەمانی فەشەل پێدەهێناو خەیاڵ پڵاوبوو، دزی‌و خۆپەرستی‌و درندەیی‌و تابڕوچوون‌و دەستدرێژی‌و هەرچی شتی خراپ کەوێنای دەکرێت بەکەسانی وەك: تالیران[29] وفرورن[30] وبواسی دانگلاس[31]

---

[24] - بزۆوازیەت مەبەست لەباڵی ڕاستی کۆمۆنەی پاریسە کەبزۆوازیەکان لەکنوانسیونی بەڕێوەبردنی دەولەتدا حوکمیان بەدەست بوو. (و- فارسی)

[25] - مەبەست لەبزۆوانی کۆن – واتە ئەو بزۆوازیەی کە لەژێر سایەی شانشینی‌ولەقۆناغی فیودالیدابوون.

[26] - فیودالی: قۆناغی دەرەبەکایەتی.

[27] - کوبلنس – شارێکە لەئەڵمانیا و لەساڵی 1792دا پەناهەندە فەرەنسیەکان لەدەست شۆرش هەڵاتبون ولەوێدا دەژیان.

[28] - میتو- یان بلکاوا -- یەکێکە لەشارەکانی لیتوانی‌ولویسی هەژدەهەم دوای هەلاتنی لەساڵی 1798- ساڵی 1857 لەوێدا دەژیا.

[29] - تالیران (1767- 1825).



وباراس [32] دەگوترا کەکۆتاییان بەکارەساتە نوێکەی ترمیدۆرو دیکتاتۆریەتی ژاکوبین‌و کارەساتی مانگی مایۆ هێنابوو، شتێکی پڕاوپڕ بەپێستی خۆی بوو وحەق بوو، بەڵام ناحەق ئەوەبوو ئەمان بەبێ بەزەییانەو بێغیرەتانە تاوانی لایەنگری سیستمی شانشینیان دابووە پاڵ ئەمانە، کاتێ لایەنگرانی سیستمی شانشینی بەپەلە خۆیان ئامادەو پرچەککرد، بۆ شەرو هەندێك لەوپەناهندانە لەژێر پارێزگاری ویلیام پیت–ی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا لەشێوە دورگەی کیبرون[33] کۆبوونەوەو رابەرانی کنوانسیونیش دەستبەجێ لەشکرێکیان لەژێر فەرماندەی ژنرال هش[34]دا سازکرد، بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەوانەدا، دوای ئەوەی شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا، سوپای کۆماری توانی تێکیانبشکێنێت و(750) دیل لەمانە گوللەباران بکەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوتێکشکانەشدا لایەنگرانی شانشینی خۆیان بەدۆڕاو نەدەزانی وئێستا دوومانگ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێنەپەڕیبوو کەئەمانە لەناو پاریسدا جموجۆڵیانکردوو چەکیان بەدەستەوەگرت.

ئەم ڕووداوە لەکۆتایی سێتەمبەرو سەرەتای ئۆکتۆبەردا ڕوویدا – یان بەپێی ساڵنامەی شۆڕش لەنیوەی مانگی (واندەمیر)ی ساڵی چوارەمدا ڕوویدا.

لەو ڕۆژانەدا کنوانسیون یاسای بنچینەیی تازەی دارشتبوووبەپێی ئەو قانونە پێنج کەس بەڕێوەبەری ئەنجومەنی جێبەجیکردن بوون، بەم جۆرە ئەنجومەنی یاسادانان بریتیبوو لەدوو ئەنجومەن یەکێکیان ئەنجومەنی(500) کەسی بوو، ئەوی تریشیان ئەنجومەنی پیران بوو، کنوانسیون ئامادەبوو ئەو دەستورە تازەیە بخاتە حالەتی جێبەجێکردنەوەو خۆشیان لەدەسەلات دووربکەونەوە، بەڵام بەهۆی ئەو ڕووداوو پێشهاتانەی کەبرژوازییەکان ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزدەبوون‌و زیاتر تینیان دەهێنا بۆگرتنەوە دەستی دەسەلاتی شانشینی بۆیە کنوانسیون لەترسی ئەوەی ئەمانە لەڕێگای خۆپاڵاوتن بۆئەنجومەنی(500) کەسی و دەرچونیان، ئەنجومەنی کنوانسیون بریاری لەسەرئەوە دەرکرد کەپێویستە بەپێی ئەوبریارە تازەیە دبوا دوو لەسەر سێی نوێنەرانی (500) کەسی دوو لەسەر سێی نوێنەرانی ئەنجومەنی پیران لەلایەن کۆمیتەی کنوانسیونەوە پەسەند بکرێن وباقیەکەیتر لەخەڵکانیتر بن.

بەڵام ئەمجارەیان لایەنگرانی سیستمی شانشینی تەنها نەبوون، بۆیە بارودۆخی کنوانسیون لەمانگی واندەمیردا زۆر مەترسیداربوو.

ژمارەیەکی زۆر لەچینی برژواو ئەشرافەکان‌و خاوەن کۆگاو وردەبرژواکان دژی ئەوبریارە هەڵسانەوە کەئەولو بیرۆکەی راستیان هەبوو، لەهەندێ بەشی شاری پاریسدا لەپڕ لەمانگی ئۆکتۆبەردا دژبە کنوانسیون ڕاپەڕین، هەندێك لەلایەنگرانی شانشینی کەخەونی زێرینیان بەگەڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتییەوە دەبینی، لەخۆشیاندا تۆتکەیان لەکەوڵی خۆیاندا نەدەگرت،

---

[30] - فرون (1774 -1852).

[31] - بواسی(سەرۆکی ئەنجومەنی کنوانسیونی ترمیدوری.

[32] - باراس (1755-1829) ئەندامی کنوانسیون، هەموو ئەمانەی سەرەوە ئەندامی کنوانسیون بوون‌و دژی روبسپیر بوون.

[33] - کیبرون- شێوە دورگەیەکی بچوکەو کەوتۆتە خۆرئاوای فەرەنسا وسەربەویلایەتی موربیهان-ە ویەناییەرە فەرەنسییەکان ویستیان لەو دورگەیەدا جێگیربن بەپاڵپشتی بریتانیا، بەڵام هەموویان بەدەستی سوپای کۆماری کوژران وپەرتەوازەکران. (و- کوردی).

[34] - سەرکردەیەکی فەرەنسیە (1768-1797).



کۆماریخوازە پارێزگارەکانی وبرژوازییەکانی پاریسیش، کەسەرانی شۆرش زیاد لەئاستی خۆی کەوتبوونەپێش، بەلای شانشیندا دەیانشکاندەوە، لەبرواری(29)ی سبتمبەردا هەواڵێکی مەترسیدار گەیشتە کنوانسیون ئەویش ئەوەبوو چەند لەبازارەکانی پاریس دەستیان بەسەرداگیرابوو وئەمەش زەنگێکی مەترسیداری لێدەدا، بەراستی دەبوا کنوانسیون بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەم دۆخە پشت بەچی ببەستێت؟ دوای چەککردنی کرێکارانی ناوچەکانی پاریس وئەوشەرە دژوارەو داپڵۆسین‌و تێکشکاندنی ژاکوبیە کودەتاچیەکان، ئیتر کنوانسیون نەیدەتوانی پشت بەیارمەتییەکانی سوپای میللی ببەستێت.

کرێکارانی پاریس گەورەترین دوژمنەکانی خۆیان لەناو کنوانسیوندا دەبینی وهەرگیز لەوبروایەدا نەبوون‌و ساردببونەوە لەوەی بۆخاتری پاراستنی سێ لەسەرچواری ئەندامانی کنواسیون لەئەنجومەنی (500)کەسیدا بجەنگن‌و بەرگریان لێبکەن، هەتا ئەندامانی کنوانسیونیش بەگومانبوون لەوەی چینی بروليتاريا بەرگریان لێبکات،تەنانەت نەفرەتیشیان لێدەکەن وکنوانسیون لیشیان دەترسا، ئەوەی دەمایەوە سوپابوو، بەڵام لەم لایشەوە بارودۆخەکە زۆرباش نەبوو، راستە سەربازان هەمیشەو لەهەموو شوێنیکدا بێ دوودڵی لەگەڵ ئەو هەلاتووە خائینانەدا دەجەنگان، (واتە دژە شۆرشیەکان) لەهەر شوێنێکیشدا توشی دەستەو تاقمەکانی لایەنگری شانشینی دەبوونەوە هەرلەبیشەڵێنەکانی نرماندییەوە هەتا تەپۆڵکەکانی واندەو شێوە دورگەی کیبرون لەبەلجیکاو سەرسنوورەکانی ئەڵمانیا، لێیان دەهاتنەدەستو تەقەیان لێدەکردن، لەگەڵ ئەمەشدا بزوتنەوەی (واندەمیر) دروشمی گەراندنەوەی بنەماڵەی بوربنی نەدەدا، بەڵکو خەڵکی هاندەدا بۆ دەسەلاتداریەتی میللی کەبەهۆی دانانی یاساکانی کنوانسیون لەباربرابوو وپرۆپاگەندەی هەڵبژاردنی ئازادی دەکرد بۆهەڵبژاردنی نوێنەرانی راستەقینەی گەل لەلایەن هاولاتییانەوە، خۆنەگەر سەربازەکانیش بەتەواوی مانا کۆماریخوازبووبن‌و فریوی دروشمەکانی واندەمیریان خواردبێ – خۆفەرماندە سەربازییەکان لەدۆخێکی خراپدا دەژیان.

بۆنموونە: با ژنرال مینو[35] فەرماندەی پادگاکانی پاریس، باس بکەین کەرۆژگارێ بەیەك هەڵمەتی سەربازی توانی شارۆچکەی سنت ئەنتوان – بخاتەوە ژێر رکێفو لەماوەیەکی کورتدا لەوشارۆچکەدا خێمەی سەربازی هەڵبداتو کرێکاران پۆلپۆل بۆژێر جیوتین بنێرێت تاملیان بپەرێنن، هەمان ئەو ژەنەراله دەیتوانی دووبارە ئەوکارە بکاتەوە، کاتێ سوپاکەی ئەو لەبەرەبەری خۆرئاوابوونی رۆژی (14)ی مایۆدا دوای سەرکەوتنیان بەسەر کرێکاراندا بەریز دەرۆیشتن‌و تیپی مۆسیقای سەربازی لەپێشیانەوە بەسەرشەقامەکانی پایتەختدا دەهاتن، خەڵك لەم بەراوبەری شەقامەکانەوە بەجلوبەرگی ئاڵوواڵاوە چەپڵە رێزان‌و شادیو خۆشیان دەردەبری ولەکانی دڵیانەوە هاواری شادیان دەکرد، ئەوکات بیرۆکەیەك– یان باشتروایە بڵێین‌ئ ئامانجێك لەنێوان ئەوان‌و سەربازەکاندا هەبوو، مینو دەیتوانی لەورۆژەدا خۆی بەنوێنەری دەوڵەمەندو ئەرستۆکراتەکان بزانێت لەدژی هەژارو برسییەکان.

ئەم هەستکردنە بەباشی لەئەودا بەدی دەکراو چێژی تایبەتی پێدەبەخشی، بەڵام ئیستا چۆن بە چ بەهانەیەك بچێت گوللەبارانی ئەوکەسانە بکات کەلەمەوبەر هاواری شادیان بۆئەو دەکێشاو گۆشتو خوێنی ئەم لەگەڵ ئەواندا یەك ببوو، ئەگەر جیاوازیەك لەنێوان ئەندامانی تری کنوانسیونی ترمیدوریو ژنرال مینودا هەبوبێت، ئەوەبوو مینو بەلای راستیدا دەشکاندەوە،

---

[35] - مینو: سەرلەشکرێکی فەرەنسیە (1750-1815) پیاوێکی زۆر ئازابووە، بەڵام کەسایەتیەکی ناشایستەی هەبووە. (نووسەر).



لایەنی میانرەوەکان زۆر پارێزگارانەتر بوون لەکنوانسیون، ژنرال مینوش ئامادەنەبوو لەبەرخاتری ئەمە تەقەو کوشتو کوشتار لەمانە بکات.

شەوی (12-ی واندەمیری) چواری ئۆکتۆبەر سەرانی کنوانسیونی ترمیدوری لەهەموولایەکەوە گوێبیستی هاتوهاواری خەڵك بوون کەلەسەر شەقامەکانەوە بەرزدەبۆوە ، ئەو خۆپیشاندەرانە بەکەیفو شادیەوە هاواریان دەکردو پڕۆپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە کنوانسیون وازی لەشەرکردن هێناوەو لەوانەیە شەری ناوشارەکان نەکاتو قانونە تازەکان ئیلغا کراونەوەو هەڵبژاردنی ئازاد دەکرێت . تاکە بەڵگەش کەبۆ ئەم پڕوپاگەندانەیان دەهێنایەوە نەك هەر قابلی بەرپەرچ دانەوە نەبوو بەڵکو زۆر لەشتێکی واقعی دەچوو : دەیانگوت یەکێك لە فەرماندەکانی سەربازی ناوەند (ناوچەی لوپلونیە) کەناوی (دلالو)یە چۆتە لای جنرال مینوو ناوبراو ئامادە بووە شەڕ لەگەڵ دژ شۆڕشەکاندا بکات، هەروەها دەیانگوت سەربازەکان گەراونەتەوە سەربازگەکانیانو شار لەدەستی دژ شۆڕشبەکاندایە ، بەلآم ئەم شادمانیە زۆر درێژەی نەکێشا ، کنوانسیون بریاری شەری دا ، لەشەوی پێنجی ئوکتۆبەردا جنرال مینو لەکارەکەی دەرکراو ئینجا راستەوخۆ دەستگیرکرا، ئینجا کنوانسیون بریاری دا باراس بەفەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی پاریس دابنرێتو دەبوا لەهەمان شەودا ناوبراو دەستبەکاربێت بۆ لێدانی دژ شەرشیەکان ، هەربەبیستنی ئەمە ، دژ شۆڕشیەکان سامیان لێنیشتو کشو ماتی باڵی کێشاو ئەوانە لە لاچەپەكو کۆڵانەکانی شاردا دەستە دەستە کۆبونەوەو دەوروبەری بارەگای کنوانسیونیان بەشێوەیەکی پەرت گرت ، تاسبەی ئامادەی شەربن، هەندێك لەئەندامانی کنوانسیون گومانیان لەسەرکەوتنیان نەبوو بەلآم وەو هەلومەرجە کەمێ پەرتی کردبوون .

هاوچەرخەکانی پارسی بەچاوی پۆخڵەواتەوە سەیری ناوبراویان دەکرد، ئەو پیاوێکی ئەهلی ڕابواردنو بەدمەستو بەرتیلخۆرو شەیدای عەیشو نەیشبوو، کەسێکی بێویژدانو ناکەس بەچەو پارەپەرستبوو ولەم رووەوە لەهەموو ئەندامانی کنوانسیونی تێپەراندبوو، ئەمە خۆی لەخۆیدا شتێکی کەم نەبوو، بەلآم ئەو (باراس) کەسێکی بەجەرگو کارامە وبەهۆشبوو، باراس هەستیکرد ئەم راپەرینە مەترسی گەورەی بۆسەر حکومەتی کۆماری هەیەو لەوانەیە دەوڵەت بگەرێنێتەوە سەردەمی حوکمرانی شانشینیونەمەش هەرەشەیەکی گەورەبوو بۆسەر خودی خۆشی، ئەو ئەرستۆکراتانەی وەك خۆی کەلایەنگری کۆماری بوون باش دەیانزانی لایەنگرانی سیستمی شانشینی چەند رقو کینەیان لەبەرامبەر ئەواندا لەدڵ گرتووە، لەسەر ئەم بنەمایە دەبوا بێدرەنگی دەستبکات بەشەڕ، باراس کەسێکی سەربازی نەبوو ودەبوا کەسێ بۆ ئەمکارە دابنێت، ناوبراو لەپڕ ئەوەی بەخەیاڵدا هات کەلەم دواییانەدا چەندنجارێك کۆنە ئەفسەرێك بەکۆڵتیکی کۆنەوە سەردانی کردبوو، ئەوەی باراس سەبارەت بەوسەرتیپە دەیزانی ئەوەبوو کەسێکی بێکارەو لەگەمارۆدانی تۆلۆندا ئازایەتی نیشاندابوو. بەلآم دواتر رووبەرووی نەهامەتی هاتۆتەوەو ئێستا بەموچەیەکی کەم لەپایتەختدا بەنامرادی دەژێت، باراس فەرمانیدا بگەرێن ناپلیۆن بدۆزنەوەو بیهێننە لای، ئەویان هێناو باراس پێشنیاری ئەوەی بۆکرد، ئایا ئامادەیە سەرکوتی ئەو خەڵکە دژە کۆماریانە بکات؟

ناپلیۆن داوایکرد تاچەند دەقیقەیەك مۆڵەتی پێبدات بیربکاتەوە، پاش کەمێ بێنەوەی ئەوەبگرێتە بەرچاو داخوا بەرژەوەندی هاوتەریبە لەگەل ئەوەی بەرگری لەکنوانسیون بکات-یان نا، راستەوخۆ رازی بوو، چونکە دەیزانی ئەوە ئیمتیازێکی باشەو هەلێکی رەخساوە، تاکەمەرجیشی ئەوەبوو کەس دەست لەپلانو نەخشە سەربازییەکەی ئەو وەرنەداتو گوتی: کاتێ من شمشێرم راکێشا هەتا ئارامیوئاسایش بۆشار نەگەرێنمەوە، نایخەمەوە کالانەکەی، دوای ئەمە راستەوخۆ



بەجێگری باراس دانراو پاش وەرگرتنی زانیاری لەسەر بارو دۆخەکەو توانای ئەودژە کۆماریانە، بۆی دەرکەوت کنوانسیون مەترسی گەورەی لەسەرە، بەڵام پلانی دارێژراوی ناپلیۆن بەکارهێنانی تۆپخانەبوو دژ بەمانە، پاشئەوەی ناپلیۆن بەسەختی ئەمانەی تێکشکاند، بەبرادەرەکەی (دوك دابرانتس)ی گوتبوو هەڵەی دژە کۆمارییەکان لەبەرێوەبردنی سوپاکەیاندابووەو ئەگەر من سەرکردایەتی ئەودژە کۆماریانەم کردبا لەماوەیەکی کەمدا کنوانسیۆنم بەئاسمانێ هەڵدەبردوو تەفروتوونام دەکرد. بەم جۆرە (13)ی سبتمبەر رۆژێکی مێژوویی بوو لەژیانی ناپلیۆنداو زۆر لەوداستانەی بەناوبانگتربوو کەلەشەری تۆلۆنـدا کردی.

لەوکاتەی دژە کۆمارییەکان هێرشیان بەرەو بارەگای کنوانسیۆن برد، تۆپخانەی ناپلیۆن دەسـتیکردبە تۆپبارانکردنیـان، کوشتنو برین، بەتایبەت لەبەردەم کلیسای(سنروشن)دا کەپەناگاو کەلوپەلی ئەوان لەوێدا بوو، کارەساتێکی خوێناوی گەورەی تێدا روویدا.

هێرشکەرەکان دەیانتوانی سەرەتا بەخێرایی تۆپەکان بخەنەژێر دەسەڵاتی خۆیان، بەڵام کەمێ دوای دەستپێکردنی شەرەکە ئەم هەلەیان لەدەستدا، چونکە ئەوانە هەربەتفەنگ بەرپەرچی تۆپـەکانیان دایـەوەو هەڵمـەتیان نەبردەسـەر تۆپخانەکـە، بەرەبەری نیوەڕۆیە شەڕ کۆتایی هات، هێرش بەرەکان جگەلەوەی سەدان لاشەی کوژراویان لەگۆرەپانەکەدا جێهێشتبوو، لەهەموو لایەکەوە هەلاتبوونو بریندارەکانیشیان لەگەڵخۆیاندا بردبوونو لەماڵەکانی خۆیان خزابوون، هەرچەندە دەشیانتوانی ئەوڕۆژە لەپاریس بڕۆن. شەو باراس بەگەرمی پێشوازی لـەناپلیۆن کـردوو دوای ئـەوەی دەسـتی لەکارەکـەی کێـشابۆوە پێشنیاری بەکنوانسیۆن کردبوو ناپلیۆن بکەنە فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکانی ناوخۆ، ئەوەی لەلای باراسو ئەندامانی کنوانسیون بووەجێگای سەرنج سەبارەت بەوکورە مۆن وملـچ وخـوێن سـاردوو هێمنـە، زوو نەخـشەدانانو جێبـەجێکردن وتۆپبارانکردنی دژە کۆمارییەکان بوو لەناوەراستی شاردا، سەبارەت بەشـەری ناوشـارەکان و سـەرکوتکردنی راپـەیوان، ناپلیۆن بوو بەسەرمەشقی ئەم کارەو دوای ئەویش نیکولای یەکەم هەمان کـاری دووبـارەکردەوە لـە(14)ی دێـسەمبەری ساڵی(1825)دا, تاکەجیاوازیش لەنێوان ئەم کارەی ناپلیۆن و تزاری روسیدا ئەوەبوو، ئەمـەی دووەمیـان پروپاگەنـدەی ئەوەی دەکرد دژی ئەمجۆرە کارە درندانەیە وترس وزاری واسیلچیکۆفهەست ونەستی ئەوی لەخشتەبردووە, بەڵام ناپلیۆن هیچ کاتێ نەکەوتەبیری ئەوەی پاساو بۆئەم کارەی بێنێتەوە– یان بیخاتە مل کەسێکیتر, دژە کۆمارییەکان زیاتر لە(24) هەزار چەکداریان هەبوو وژمارەی سەربازەکانی ناپلیۆنیش تەنها شەش هەزار کەس بوو، جگەلە پەنابردن بۆتۆپخانە هیچ رێگاچارەیەکیتر نەبوو، بۆیە ناپلیۆن هانای بۆ تۆپەکان بردو هێنانیە مەیدان, لەوکاتەدا ئـەو نەبەدرییـە گـەورەیـەی ئـەو بەهێراشەکی وبەهەرنرخێك کەبوو دوژمنی تێکشکاند، ناپلیۆن کاتی بەفیرۆنەدەداو لەو رۆژە رەشـەدا گۆرەپـانی بـەردەم کڵێسای سن روش–ی بەخوێنی دژە کۆمارییەکان سور هەڵگەراندبوو, بێبەزەیی لەکاتی شەرکردندا یەکێ بوو لەخەسڵەتەکانی ناپلیۆن.

لەناو کەسایەتی ئەو پیاوەدا دووشت کاریان لەسەردەکرا, یەکێکیان فەرمانەکانی مێشك وئەوی تریشیان فەرمانی دڵ, نەك واوێنابکرێت ناپلیۆن خاوەنی دڵێکی هەستیارنەبووە, ئەو بەباوەڕی خۆی خاوەنی دڵێکی بەخشندەو میهرەبان بووە، بەڵام بەپێی قسەی خۆی کەبە( رویدرر)ی برادەری گوتووە، هەرلەتافی لاوییەوە هەوڵیداوە ژێی سۆزو بەزەیی لەناو دڵی خۆیدا



کوێریکاتەوەو ئێستا ئەوژێیە دەنگی لێوەنایەت، هەرچۆنێکبێت هەرکاتێ باس لەشەڕ دەکرا ناپلیۆن نەك هەر ئەوژێیەی دەنگی لێوەنەدەهات، بەڵکو هیچ کاریگەرییەکیشی لەسەرنەدەبوو لەبەرامبەر دوژمنەکانیدا.

رۆژی سێزدەهەمی واندەمیری رۆڵێکی گەورەی لەبەرەنگاری ناپلیۆندا گێرا، گرنگی مێژووی تێکشکاندنی دژە کۆمارییەکان لەم چەند خاڵەدایە،

1- ئومێدی سیستمی شانشینی کەپێیانوابوو بەم زووانە دێنەوە سەرکار، تێکشکاندن کەزۆر لەتێکشکانەکەی کیبری کاریگەرتربوو.

2- چینی برژوازی شاری لەوەدڵنیاکردەوە کەبۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات نەکەونە پەلەقاژەو بەزۆری چەك پەنانەبەن، جگەلەمەش ئەمانە وردەبرژوازی شارو دێهاتییەکانیان فەرامۆشکردبوو کەلەگەڕانەوەی حوکمی شانشینی دەترسان ولایەنگری کۆماریخوازەکان بوون، هەموو کەسێك دەیزانی وردەبرژوازییەکان وئەوانەی تازەگی زەویان پێدرابوو وئەو زەویانەش لەملکی فیودیاڵەکانی سەردەمی پاشانشینی ستاندرابۆوەو درابۆ ئەمانە، دژی گەڕانەوەی سیستمی پاشایەتی بوون، بۆیە ئەمانە بەچاوی رقەوە سەیری دژە کۆمارییەکانیان دەکرد.

3- بۆ جارێکیتر ئەوە سەلمێندرایەوە کەشەڕەکانی دژبەگێڕانەوەی حوکمی شانشینی لەناو رۆحیەتی سوپادا ریشەی داکوتاوەو دژی سوپاش دەجەنگن، راستەوخۆ-یان ناراستەوخۆ کاریگەری خۆی هەبوو، چەمکی مێژوویی رووداوەکەی(13-ی واندەمیری بەوجۆرەبوو.

بەڵام سەبارەت بەخودی بۆناپارت، بۆیەکەمجار نەك هەر تەنها وەك شەڕەکەی تۆلۆن لەناو کۆڕو کۆمەڵە سەربازییەکاندا دەنگی دایەوە، بەڵکو ناوی ئەو لەناوهەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگای فەرەنسیدا دەنگی دایەوەو بووە وێردی سەرزمان، دوای ئەوە هەموو لایەك بەچاوی پیاوێکی شایستەو کارامەو ئازا سەیریاندەکرد، ئەو سیاسەتمەدارانەی کەبۆ یەکەمجار دیرکتوریان پێکهێنا، واتە: واندەمیری ساڵی چوارەم، سەرەتا پەنایان بۆباراس بردو دواتر درکیان بەوەکرد هەرکاتێ بیانەوێت سەرکوتی دژە کۆمارییەکان بکەن، دەبێ پەنابۆ بۆناپارت ببەن وپشت بەئەوببەستن، بەڵام ناپلیۆن بۆناپارت هەوایەکی تری لەبن کلێشەی دابوو، ئەو شەیدای شەڕی دەرەکی بوو وئارەزووی فەرماندەیی یەکێ لەلەشکرەکانی کۆماری فەرەنسای لەکەللەدابوو، ئێستا بەوەی پەیوەندی باشی دۆستانەی لەگەڵ باراسدا هەبوو دەستگەیشتنی بەوئامانجەی زۆر بەدوور نەدەزانی، لەماوەی شەو ورۆژێکدا بارودۆخی ناپلیۆن تەواو گۆڕانکاری بەسەرداهات، ئێستا ئەوفەرماندەی پادگاکانی پاریسەو جێگای گرنگیپێدانی باراسی بەڕێوەبەری بەتوانای دیراکتوریەو پاڵێوراوی پۆستی فەرماندەی گشتی سوپایە، ماوەیەك دوای ئەو بەرزبوونەوە لەپڕ ناپلیۆن ئاشنایەتی لەگەڵ هاوسەرە بێوژنەکەی ژنراڵ دوبوهارنە ( کەلەرۆژگاری شەڕێکی دژواردا لەسێدارەدرابوو) پەیداکردو عاشقی بوو.

جۆزفین، شەش ساڵ لەناپلیۆن گەورەتربوو ولەژیانی خۆیدا زۆر رووداوی عەشقەتی وسەوداسەری بینیبوو وهەستی عاشقانەی تایبەتی لەبەرامبەر ناپلیۆندانەبوو، ئەوەی ببووە جێگای سەرنجی ئەو لایەنی ماددی بوو نەك عەشقبازیکردن لەگەڵ ناپلیۆندا، چونکە ناوبراو دوای شەڕەکەی(13-ی سبتمبەر ببووە کەسێکی دیارو ناسراو وخاوەن پایەیەکی بەرز، ناپلیۆن لەژێر کاریگەری هەواو هەوەسیدا دەستەوبەجێ خوازبێنی جۆزفینی کردو کردی بەهاوسەری خۆی، جۆزفین پێشتر



پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ باراسدا هەبوو وئەم هاوسەرییەتییە بووەهۆی ئەوەی لەماڵی بەهێزترین کەسایەتی کۆماریخوازەکاندا دەرگا بۆ ناپلیۆن بکەوێتە سەرپشت.

نزیکەی (200) هەزار کتێب لەسەر ناپلیۆن نووسراون و ئاماری ئەمە لەلایەن کیرشاینن-ی پسپۆری بەناوبانگی کتێب ناسی وزۆر لەشارەزایانی هونەری نووسینەوەی مێژووو نووسانە کەدەربارەی پەیوەندی ناپلیۆن وجۆزفین نووسیویانە، تائکید لەسەرئەوە دەکەنەوە، بۆ ئەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین دەڵێم: نەجۆزفین ونەماری لویزی نەمساوی ژنی دووەمی ناپلیۆن ونەمادام رموزاو[٣٦]

نەمادموزال ژرژ[٣٧] و نەکنتس والوسکا[٣٨] ونەهیچ یەك لەئافرەتەکانیتر لەرۆژگاری خۆیاندا پەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵ ناپلیۆندا هەبووەو نەتوانیویانەو نەهەرگیز پرپاگەندەی ئەوەشیان نەکردووە کەتوانیبیان کاریگەریان لەسەر ناپلیۆن هەبووبێت، هەتا نەیانتوانیوە کەمێکیش پەی بەوکەسە سەرکەش وتورەو سەرچڵەبەرن،

ناپلیۆن نەیتوانی مادام دوستال[٣٩] ی ناودار هەتا پێشئەوەی ناکۆکییە سیاسییەکانی ئەو لەگەڵیدا رقی هەڵبستێنن درك پێبکات، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی کارکردنی ژنان لەبواری سیاسەتدا بەشتێکی زیادانەی دەزانی وبەهۆی ئەوەی دوستالیش سەروکاری لەگەڵ سەیاسەتدا هەبوو، ناپلیۆن حەزی نەدەکرد ئاشنایی لەگەڵدا پەیدابکات، ملکەچی وگوێڕایەڵی بۆئیدارەی ئەو(ناپلیۆن) یەکێکبوو لەوسیفەتە پێویستیانەی کەدەبوا مەعشوقەو ژنەکانی کربایان وئەوانەی ناکۆکی ئەمەشبوون لەدڵی خۆی دەبردنە دەرێ وبەهای بۆ دانەدەنان، جگەلەمانەش لەبەر سەرقاڵی وزۆری کارەکانی ناپلیۆن، کاتی ئەوەی نەبوو دەربارەی جۆش وخرۆشەکانی هەست ونەستی دڵی بۆماوەیەکی دووردرێژ کاتی بۆتەرخان بکات، ئەمجارەیان لە(9-ی مارسی1796)دا ناپلیۆن بۆناپارت ژنی هێناو دوای دوو ڕۆژ ماڵئاوایی لەبووکەکەی کردوو بەرەو مەیدانی شەڕ کەوتەرێ وسەردەمێکی درێژخایەن وخوێناوی لەمێژووی ئەوروپادا سەری هەڵدا.

---

[36] - کومتیسی دی رموزا ( 1785 – 1821 ) یەکێکە لەژنەکانی (درباری) کەیاداشتی سەرنج ڕاکێشی سەبارەت بەدرباری ناپلیۆن وخۆی نووسیونەوەو نامەیەکیشی سەبارەت بەپەروەردەکردنی ژنان نووسیوە.

[37] - ژرژ ( 1787-1867 ) یەکێکە لەونەکتەرە ژنانەی کەرۆڵی ترازیدیو ڕۆمانسی گێراون وبۆتە جێگای سەرنجی ناپلیۆن. (و-فارسی)

[38] - کنتسی والوسکا (1815-1868 ) ژنێکی جوانی پۆڵەندی بووەو پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ ناپلیۆندا هەبووەو لەئەنجامی ئەو پەیوەندییە ناشەرعیە منداڵێکی بووەو بەناوی کنت ئەلکسندەر والوسکی وکەسێکی ڕۆژنامەنووس وسیاسەتمەداری لێدەرچووەو لەسەردەمی ناپلیۆنی سێیەمدا گەیشتە پلەی وەزیری. (و- فارسی)

[39] - دوستال( 1763-1824) وەزیری لویسی شازدەهەم بوو وئەدیبێکی بەتوانابووە. کتێبێکی بەناوبانگی سەبارەت بەئەڵمانیا هەیە، ئەوژنە بیرۆکەی ئازادیخوازانەی هەبووەو ناپلیۆن ئەوی لەکارو باری دەوڵەتی دەرکردا نووسەر).



# شـــەڕە كـانی ئیتـالیا

(1797 -1796)

(1)

لەوكاتەوەی ناپلیۆن ئەوداستانەی تۆماركردوو لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی تێكشكاند، بووەجێگای سەرنج و چاودێریكردنی باراس وهەموو سەرانی حكومەت، ناپلیۆن هەوڵیدەدا لێپرسراوانی دەوڵەت بگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی كەبەرپەرچدانەوەی هاوپەیمانانی تازەی دەوڵەتان دژ بەفەرەنساو شەڕلەدژی بەرەی ئیتالیاو نەمسا بەزەرووری بزانن وبۆئەمەش سەرووی ئیتالیا داگیربكرێـت، لەڕاسـتیدا هاوپەیمانیـەتی تـازەی دژی فەرەنـسا دروسـتنەكرابوو، بـەڵكو هـەمان ئەوهاوپەیمانییـەبوو كەلەساڵی(1792)دا دروستكراو لەساڵی(1795)دا پـروس بەئاشـتی كردنـی تـاك لایـەنی لەگـەڵ حكومـەتی فەرەنسادا كەلەشاری بالدا ڕێككەوتن، لەو بەرەیە هاتبۆدەرێ، بەڵام نەمساو بریتانیاو ڕوسیاو شانشینەكانی ساردنی ودوسیسیل وهەندێ لەحكومەتە هەرێمییەكانی ناوخۆی ئەڵمانیا– ورتمبرگ و باویرو بادو.. هیتر، مابوون، كەدژی كۆماریخوازەكانی شۆڕشی فەرەنسابوون ودەسەڵاتدارانی فەرەنسا دەیانزانی هەموو ئەمانە دژی ئەون وشەڕێ ڕاستەقینە لەبەهارو هـاوینی ساڵی(1796)دا دەستپێدەكات و پێویستە لەخۆرئاواو باشووری خۆرئاوای ئەڵمانیاوە دەستپێبكرێت وفەرەنسییەكان هەوڵبدەن لەوڕێگایەوە خۆیان بگەیەننە دوژمنی سەرەكیان كەنەمسابوو.

دیركتوار، بۆ ئەم مەبەستە باشترین هەڵبژاردەی لەشكری خۆیان كۆكردەوەو خستیانە ژێر فەرماندەی باشترین ئەفسەرەكانی جەنگی ولەسەرووی هەموشیانەوە ژنرال مۆرو سوپا سالاری گشتی بوو، باشترین كەلوپەل سەربازیان بۆئەو سوپایە دابین كردبوو وهیچ درێغییەكیان نەكردبوو وحكومەتی فەرەنسا ئومێدی تەواوی بەولەشكرەهەبوو، سەبارەت بەبۆچوونەكانی ژنرال بۆناپارتیش بەهێرشكردنەسەر سەروی ئیتالیا، لەلایەن حكومەتەوە گرنگی پێدرا، ئەمەش وەك تاكتیكێكی سەربازی بۆئەوەی ئەم كارە ببێتە گومڕاكردنی ئامانجی سەرەكی سەبارەت بەنەمساو فێننا هێزەكانی خۆی دابەشبكات ونەزانێت ئامـانجی سەرەكی سوپای فەرەنسی كوێیە، بڕیاردرا بۆ سەرقاڵكردن وسەرلێشێواندنی نەمساو هاوپەیمانەكانی، واتە پاشای ساردنی، سی چل هەزار سەرباز كەلەخوارووی وڵاتدا جێگیركرابوون بۆئەو مەبەستە بەكاربهێنرێن وشەڕیان پێبكەن، كاتێ ئەوپرسیارە هاتەپێش كێ بەفەرماندەی ئەم سوپایەی خوارووی وڵات دابنرێت، كـارنۆ، دانـانی نـاپلیۆنی بۆئـەو پۆسـتە پێبـاش بـوو، لێپرسراوانی تری دەوڵەتیش ڕاستەوخۆ بەو پێشنیارە ڕازیبوون، فەرمانی دانانی ناپلیۆن بەفەرماندەی لەشكری خوارووی وڵات لەبەرواری(23–ی فبرایری ساڵی(1796)دا دەرچوو، فەرماندەی تازە لە(11–ی مارسی هەمان ساڵدا، بەرەو خوارووی وڵات كەوتەڕێ هەتا بچێتە گەڵ لەشكرەكەیەوە، ئەم شەڕەی ناپلۆن كردی بۆهەمیشە لەمێژوودا ناوی ئەوپیاوەی بەدرەخشان وشانازییەوە تۆماركردوو هێشتەوە، لەساڵی (1796)دا نـاوی نـاپلیۆن لەسەرتاسـەری ئـەوروپادا دەنگی دایـەوەو ئـیتر لەلاپەڕەكانی مێژوودا بۆهەتا هەتایە بەنەسراوەیی مایەوە، سڤۆرۆف، كەسەردارێكی سەربازی ڕوسییەو لەگەرمەی شەڕەكانی ئیتالیادا سەبارەت بەناپلیۆن دەڵێت: زۆر بەخێرایی بەرەوپێشدەچێت– كاتی ئەوەهاتووە پێش لەوپیاوە بگرین، سڤۆرۆف



یەکەم کەسبوو کەئەو هەورە تۆفاناویەی ناسی، ئەو هەورەی[40] ماوەیەکی دوورو درێژ ئەورووپای بەگرمەو نرکەو هەورە بروسکەی خۆی وێرانکرد. فەرماندە سەربازییە باڵاکانی دەوڵەت فەرماندەی ئەم لەشکرەی خوارووی وڵاتیان قبوڵنەکردبووە، چونکە ئەولەشکرە لەبارودۆخێکی زۆر خراپدابوو وزیاتر لەڕەوە ئەسپێکی لەپولاواز دەچوو کەلاکەی سەریانبێت، دزی ودەستبڕی وبێسەروبەرەیی باڵی بەسەر لەشکرەکەدا کێشابوو، بەجۆرێ تەنانەت لەساڵانی کۆتایی حکومەتی کنواسیۆنیشدا( ترمیدوری) بەو شێوەیە نەبووە، ڕاستە پاریس بودجەیەکی کەمی بەولەشکرە دەدا، بەڵام ئەوبودجە کەمەش بەزوویی دەدزراو تەقس ونەقسدەکرا، چل وسێ هەزار سەرباز لەناو شاری نیس ودەوروبەریدا بوون ومەعلوم نەبوو ئەو هۆردووە سەربازیانە چ دەخۆن و چ لەبەردەکەن.

پاش چەند کاتژمێرێك لەگەیشتنی ناپلیۆن هەواڵی ئەوەیان پێڕاگەیاند کەئەفسەرێك فەرمانی بەسەربازەکانی کردووە بچن لەپێگەیەکی سەربازیدا بگەێن، بەڵام سەربازەکانی سەرپێچیان لەفەرمانەکەی کردووە، چونکە هەموویان پێخواس بوون، خراپی باری دارایی ئەم لەشکرە پەراوێزو لاچەپەککراوە هاوتابوو لەگەڵ بێسەروبەرەیی وناشایستەییان, ئیتر سەربازەکان لەوزەیاندا نەمابوو چونکە بەچاوی خۆیان دەیانبینی گەندەڵی ودزینی موچەکانیان لەلایەن لێپرسراووکانیانەوە دەکرێت وئەمانیش لەوپەڕی سەنگەساری وڕەنجدا دەژین.

پرکێشەترین لێپرسراویەتی لەچاوەڕوانی ناپلیۆندابوو، کێشەی ئەو تەنها لەوەدانەبوو نەهێڵێ سەربازەکانی ڕووت وڕەجاڵ وبرسی بن, بەڵکو دەبوا لەکاتی بەرەوپێشچوونی بۆشەڕ ئەم پێداویستیانەی بۆ سەربازەکانی دابین کردباو ڕێکیخستبانەوە، چونکە ئەو نەیدەویست خاوەخاوە لەشەڕکردن بکات، لەوانەبوو بەهۆی ئەمەوە توشی ناکۆکی بێتەوە لەگەڵ فەرماندەی یەکە سەربازییەکاندا کەکەسانی وەك: ئاوژرو وماسناو سروریە، بوون، چونکە ئەوئەفسەرانە پێشینەی زۆریان هەبوو وکەسانی بەتەمەن بوون و دەمێکبوو لەناو سوپادا خزمەتیان دەکرد، ئەگەر کەسێکی وەك مۆروی فەرماندەی گشتی سوپای فەرەنسا فەرمانی پێکردبان ئەوا ملکەچی فەرمانەکەی دەبوون، بەڵام ئێستا گەنجێکی (27) ساڵە بەناوی ناپلیۆن بۆتە لێپرسراویان وبەزەحمەت مل بۆفەرمانەکانی دەنێن و وەك سوکایەتی پێکردن بەخۆیان سەیری دەکەن، ئەگەری ئەوەهەبوو لاساری ودەمەتەقێ لەنێوان ئەمان وناپلیۆندا ڕوویدات.

لەناو سەربازگەکاندا پڕوپاگەندەیەك دەمبەدەم دەگوازرایەوە بەوەی گوایا ناپلیۆنی کورتەبنە دوای تێکهەڵچوونی دەمەقالەی لەگەڵ ( ئاوژرو)ی باڵابەرزدا، ناوبراو کەمەری ئەوی گرتووەو پێی گوتووە(تۆ قسەی نابەجێتکردن، کارێکی وامەکە ناچارم بکەیت دەست بۆکاریتر بەرم، باڵا پەیژەییەکەی تۆ ڕیگرنابێت لەبەردەم ئەوەی دەستبەجێ گوللەباران بکرێیت) لەڕاستیدا ناپلیۆن هەر لەهەمان سەرەتاوە لەهەموو لایەکی گەیاند کەلەناو لەشکرەکەی خۆیدا بەرگەی هیچ سەرپێچی وناکۆکییەك ناگرێت وهەرکەسێك بیەوێت سەرپێچی بکات بێگوێدانە پلەوپایەی سەربازی تێکیدەشکێنێت وپۆتی دەشکێنێ، لەو ڕاپۆرتە سەرمۆرانەی کەناپلیۆن بۆدیرکتواری پاریسی دەناردن، بەبێ هیچ شیکردنەوەیەك دەینووسی(پێویستە لێرەدا گوللەباران بکرێت).

---

[40] - ئەو هەورەی – مەبەست لەناپلیۆن بۆناپارتە.



ناپلیۆن کەوتە تەقەلای نەهێشتنی گەندەڵی ئیداری ودزی، سەربازەکان هەرزوو هەستیان بەمەکرد، ئەو دەستەی لەسێدارەدانی سەربازی کەبەتفەنگ جێبەجێدەکرا- زوو کاریگەری لەسەر ڕێکخستنەوەو هاتنەوە سەرباری سەربازی جێهێشت، بەڵام خۆخەریککردنی ئەو بەڕێکخستنەوەی سەربازەکانی کاتی زۆری دەویست ئەگەر هەتائەوکاتە تەواو ئەم کارەی ئەنجام دابا، وەك: ئەوەوابوو دەست لەشەڕو نەبەردییەکەی پێشی هەڵگرێت، بۆیە بڕیاریدا لەیەکەم خوتبەی بۆسەربازەکانی کەبەپێچەوانەی بۆچوونەکان بوو.

سەبارەی بەوەی ناوەڕۆکی ئەم گوتارەی، بەو جۆرەی لەمێژوودا نووسراوەو لە چ کات وساتێکدا گوتراوە، زۆر باس وخواسی لێوەکراوەو تابەئەمڕۆش یاداشت نووسەرەوەکانی ناپلیۆن گومانیان لەوەنییە تەنها چەند ڕستەی سەرەتایی ئەوگوتارەی ناپلیۆن جێگەی ئیعتباریانەو ئەوەکەی تری کۆمەڵی ڕستەبەندی ئەدەبی بوون- کەدواتر پێیەوە لکێندراون، سەبارەت بەو چەند ڕستەی سەرتاش من تائکید لەسەرئەوە دەکەمەوە ناوەڕۆکی بەکەڵکی ئەمە بریتییە لەم چەند وشەیە(سەربازەکان ئێوە برسی ورووت ورەجاڵن .. من ئێوە بۆ دەشتاییە پڕ نیعمەتەکانی جیهان دەبەم).

لەهەمان ئەو هەنگاوانەی سەرەتادا ناپلیۆن لەوبڕوایەدابوو دەبێ هەرشەڕێك خەرجی شەڕی دواتر بۆ سەربازەکانی دابین بکات، هەر سەربازێکیش قارەمانیەتی وبەتوانایی لەشەڕی سەرووی ئیتالیادا بنوێنێت بیکاتە جێای سەرنجی خۆیی وخۆشی بوێت، دەبوا بەبێ چاوەڕەوانی پێداویستیە سەربازەکانی تەواوبکات وئەوانی نیشاندابا کەپێویستە سەربازەکانی پێداویستیەکانیان لە دوژمن بەدەست بهێنن و کەموکورییەکانی سەربازی پڕبکاتەوەو، سەرداری لاو لەگەڵ قسەکانی خۆیدا ئامارەی بەم خاڵەکرد. ناپلیۆن هەمیشە دەیتوانی لەنێوان سەربازەکاندا هەژمون وچۆنیەتی خۆی بپارێزێت وسامی خۆی لەناو ڕۆحیەتی سەربازەکانیدا بپارێزێت، ئەو چیرۆکانە ساختەن کەسەبارەت بەهەستەکانی ناپلیۆن و عەشقبازییەکانی نووسراون، خودی ناپلیۆن جارێکیان بەڕاشکاوی لەنێوان سەربازەکانیدا گوتویەتی: ئەو مەعشوقانەم وەك: گۆشتی دەم[41] لولەی تۆپێك وان.

لێرەدا مەسەلەی عشق لەئارادانییە. ئەو بەسەختی چاودێری سەربازەکانی دەکردو دەیتوانی ئەم مەسەلەیە لەلای سەربازەکانی بەدڵسۆزی وخۆشەویستیان نیشانبدات، بەڵام لەڕاستیدا ئامانجی ئەو تەنها ئەوەبوو ئامادەباشی بۆشەڕکردن لەبەردەستدابێت.

ناپلیۆن لەساڵی(1796)دا لەیەکەم سەفەری بۆشەڕکردن لەبەرچاوی سەربازەکانی تەنها ئەفسەرێکی تۆپخانەی شایستەبوو ودووساڵ وشتێك لەمەوبەر لەشەڕی تۆلۆندا لێوەشاوەیی خۆی نیشانداو ئازایەتی نواندووەو ئەو سەرتیپەش بووە کەلەمانگی سبتمبەردا ڕاپەڕیوان ولایەنگرانی سیستمی پاشایەتی لەپاریس تێکشکاندن وبەلولەی تۆپەکانییەوە بەستنەوە، هەرلەبەر ئەمەشە کراوەتە فەرماندەی لەشکری خوارووی وڵات ولەمەوپاتر هیچیتر نییە.

هەتا ئەوکاتەش ناپلیۆن ئەوکەسایەتییە پێویست ودەسەڵاتی ڕەهای سەربازەکانی نەبوو، بۆیە دەیویست بەوشەڕەی لەپێشیدابوو بەوتاڵان وبڕۆیەی لەسەروی ئیتالیادا چاوەڕوانی دەکات، سەبازەکانی ببوژێنێتەوەو کاریگەری خۆی لەناودڵی ئەوانەدا جێبکاتەوە، ڕۆژی نۆیەمی مانگی ئیبریل، ناپلیۆن بەخۆیی ولەشکرەکەیەوە بەئالپدا تێپەڕی، ژنرال دومینی،

---

[41] - دەم لولەی تۆپ: مەبەستی لەوپارچە گۆشتەی دوژمنە کەبەریووەو بەلـــولەی تۆپێکەوە نوساوە.



بەرەچەڵەك سویسری وپسپۆر لەبواری بەڕێوەبردنی سوپاو تاکتیکی سەربازی ونووسەری بەناوبانگی مێـژووی شـەڕەکانی ناپلیۆن، کەسەرەتا لەگەڵ لەشکرەکەی ناپلیۆندا خزمەتی کردوەو دواتر حزمەتی دەوڵەتی ڕوسیەی کردوەو, دەڵێت: ناپلیۆن لەهەمان ڕۆژانی سەرەتادا کارامەیی وتوانای خۆی بۆسەرکردایەتی کردنی لەشکر نیشاندا، ڕێگایەکی سەختبوو بەڵام کورتی ونزیکی لەنێوان ئەلب ودەریادا گرتەبەرو بەتەنگەبەری(کرنیش)دا تێپەڕی لەکاتێکدا لەشکرەکەی لەژێر مەترسی تۆپخانەکانی سوپای دەریـایی بریتانیـادابوو، ئەمە یـەکێ لەخەسـڵەتەکانی نـاپلیۆنی بەدەرخـست، ئـەم بێپەرواییـەو ئـەم ئازایەتییـە سەرکەشانەی ئەو لەتای فەرماندە سەربازەکانی ڕۆژگاری خۆی وەك: لان وموراو نی وژنرال میلورادوفیچ و فەرماندە تازەکانی تری وەك سکوبلف،ئەوی نەهێنایەپێش، چونکە نـاپلیۆن لەوبڕوایـەدابوو دەبـێ فەرمانـدەی لەشـکر لـەکاتی شـەڕکردنداو هەتائەوکاتەی نەبێتە پێویستییەکی ڕاستەقینە، نابێ گیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە، چونکە لەوانەیە مەرگی سەرلەشکر ببێتەهۆی نانەوەی ترس لەدڵی سەربازەکاندا، ئەمشە ببێتەهۆی پاشەکشەو تێکشکانی لەشکرەکە، بەڵام لەلایەکی ترەوە لەوبڕوایەدابوو لەکاتی شەڕکردندا دەبێ لەژێر بڵێسەی چەکی دوژمندا هێرشبەرێت ودوودڵی وگومانی لەبەرەوپێشچوون نەبێت بۆشکاندنی دوژمن.

خۆشبەختانە ناپلیۆن توانی لەپێنجی مانگەوە هەتانۆی مانگی ئیبریلی ساڵی(1796)دا لەتەنگەبەری کرنیش بپەڕێتەوە، هەرکەگەیشتە خاکی ئیتالیا نەخشەی شەڕکردنی دارشت، لەبەرامبەر ئـەودا لەشـکرەکانی نەمساوی وپیـەمونی هـەبوون، کەبەسەر سێ دەستەدا دابەسش ببوون و ژن– یان لە ژێر دەستدابوو، یەکـەم تێکهەڵـچوونی سـوپاکەی لەگـەڵ لەشـکری نەمساوی ئارژانتودا لەناوچەی مونتەنتدا ڕوویدا، ناپلیۆن بەکۆکردنەوەی لەشکرەکەی، سەربازەکانی بولیۆی خـافڵگیرکرد کەبەشی خوارەوەی ڕێگای سەرەکی ژنیان گرتبوو، لەپڕ هێرشی کردەسەر ناوچەرگەی سـوپای دوژمـن ولـەماوەی چـەند کاتژمێرێکدا شکستی بەلەشکری نەمساوی هێنا، بەڵام ئەو یەکە سەربازییە تەنها بەشـێکی سـوپای نەمـسابوو، دوای ئـەو سەرکەوتنەو کەمێ پشودان بەسەربازەکانی ناپلیۆن جارێکیتر سوپاکەی دەنگدایەوەو درێژەی بەبەرەوپێشچونەکەیدا، دوو ڕۆژ دواتر، هێزەکانی پیەمونی لەنزیك ملزیمودا تێکشکاند، ئەنجامی شەڕی ئەو ڕۆژە لەدەستدانی پێنج لیوابوو ومەیـدانی شەرش داپۆشراو لەکەلاکی سەربازەکانی دوژمن وجێمانی چەك وتەقەمەنی زۆرو(13) تۆپ بوو، ناپلیۆن بـواری ئەوینـەدا دوژمن خۆی ئامادەبکاتەوەو لەشکر ڕێکبخەنەوەو ڕاستەوخۆ کەوتەدوایان.

بەپێ بۆچوونی مێژوو نووسان سەرکەوتنەکانی بۆناپارت شەش سەرکەوتن بوون لەماوەی شـەش ڕۆژدا کەڕاسـتی بەیـەك شەڕی گەورە هەژماردەکرێت، بنەمای تاکتیکـە سـەربازییەکانی نـاپلیۆن لەوشـەش ڕۆژەدا ئاشـکرابوو، ئـەویش ئـەوەبوو هێزەکانی کۆدەکاتەوەو بەشێوەی یەك پارچەیی بەرەو ئامانجێك ئاراستەیان دەکاتەوە، بێئەوەی پەنابۆ مانۆڕی ئالوزو بلۆز بەرێت، یەکێ لەولایەنانەی کەبووەهۆی مەزنی ناپلیۆن ئەوەبوو، پێکەوە بەستنی هونەری سیاسی وهونەری سەربازی بوو بەشـێوەی یـەك هونـەری لێکجیانـەبۆوە، ئـەو کەلـەماوەی هەفتەیەکـدا سـەرکەوتن لـەدوای سـەرکەوتنی بەدەسـتهێناو بەرەوپێشدەچوو، بیری لەوەدەکردەوە پێویستە پیەمون، واتە دەوڵەتی پاشایی ساردنی بەهەر شێوەیەکبێت بـەم زووانـە ئاشتی یەکلایەنەی لەگەڵدابکات وناچاری بکات بەمەو هەرسوپای نەمساوی لەبەرامبەردا بمێنێتەوە، دوای سەرکەوتنێکی تری بەسەر پیەمونییەکان لەشاری موندوویداو خۆبەدەستەوەدانی ئەوشارە، ناپلیۆن داوای لەسەرداری پیەمونی بەناوی (ڤیکتۆر)



کرد دانووستانی ئاشتی لەگەڵ بکات وپەیماننامەی ڕێککەوتن لەبەرواری(28–ی ئیبریلدا بەسترا، مەرجی ڕاگرتنی ئەوشەڕە زۆر بەگران لەسەر ئەودەوڵەتە تەواوبوو، (ڤیکتۆر ئامدەی) پاشای پیەمون دووقەڵای هەرێ باشی خۆی وچەند شوێنێکی تری دانە ناپلیۆن، دواین قەراری ڕێککەوتنەکە لەبەرواری (15–ی مایۆی ساڵی(1796 )دا لەپاریس مۆرکرا، بەپێی ئەو ڕێککەوتنە دەبوا دەوڵەتی پیەمون ڕێگا بەهیچ لەشکرێك جگەلە سوپای فەرەنسا نەدات بەناوخاکەکەیدا تێپەڕێت و هیچ هاوپەیمانییەکی سەربازیش لەگەڵ هیچ دەوڵەتێکدا نەبەستێت، هەروەها ناوچەی نیس وهەموو خاکی ناوچەی ساڤوا بخرێتەسەر خاکی فەرەنسا، دەبێ دەوڵەتی پیەمون پەیمانی ئەوەشبدات هەموو خۆراکی لەشکری فەرەنسای سەرخاکی ئەو وڵاتە دابین بکات، ئینجا نۆبەی نەمساوییەکان هات، دوای ئەوەی ناپلیۆن سەرکەوتنی تازەی وەدەستهێنان ئەمانەی بەرەو ڕووباری (پۆ) پاشەکشەپێکردو ناچاری کردن بەرەو خۆرهەڵاتی ئەو ڕووبارە بکشێنەوەو هەر بەگورجی بەدوایانەوەبوو، ترس وسام لەئیتالییەکان نیشتبوو دوك پارم[42]کەشەڕی لەگەڵ فەرەنساییەکاندا نەبوو بوو بەیەکەم قوربانی ئەم پێشڕەویەی ناپلیۆن، ناپلیۆن باوەڕی بەگفتەکانی دوك پارم نەبووەو بێلایەنی ئەوی بەڕەسمی نەناسی وباجی ساڵانەی دوو ملیۆن فرانکی زێڕی بەسەردا سەپاندو داوای لێکرد(1700) سەر ئەسپی بۆ ئامادەبکات.

لەو کاتانەی ناپلیۆن بەرەوپێشدەچوو بۆ ڕاوەدوونانی لەشکری دوژمن، گەیشتە گوندێکی بچوك بەناوی لودی ولەوێدا بەهێواشەکی لەڕووباری (ئادا) پەڕییەوە، لەوکاتەدا یەك یەکەی سەربازی نەمساوی کەپێکهاتبوو لەدە هەزار سەرباز خۆیان بۆ جەنگ سازکردبوو، لەڕۆژی(10– ی مایۆدا شەڕی بەناوبانگی لودی دەستی پێکرد، لەوشەڕەشدا دەبوا ناپلیۆن وەك پەڕینەوەی لەتەنگەبەری کرنش گیانی خۆی بخاتەمەترسییەوە، لەوکاتەدا کەتێکهەڵچونێکی خوێناوی لەنزیك پردەکە ڕوویدا، فەرماندەی گشتی لەشکر کەوتبۆ ژێر گوللەبارانی خەست وناو بڵێسەی ئاگری دوژمن وبەخۆیی وتیپێکی نارنجۆك هاوێژەوە هێرشی کردەسەر دوژمن، بیست تۆپی نەمساوی لێکلێك گوللەیان دەهاویشتن ودەورووبەری پردەکەیان بەمانای وشە دەکێڵا، نارنجۆك هاوێژان کەناپلیۆن پێشەنگیان بوو پردەکەیان گرت ودوای تێکشکاندنی نەمساوییەکان (2000) کوژراو و(15) تۆپیان لێجێمابوون، ناپلیۆن بێپەرادان دوای دوژمن کەوت ولە(15–ی مایۆدا گەیشتە شاری میلانۆ، ڕۆژێك پێش ئەم مێژووە، ناپلیۆن نامەیەکی بۆپاریس ناردوو تێیدا نووسیبوو ئیتر ولایەتی لمباردی[43] لەژێر دەسەڵاتدارییەتی کۆماری فەرەنسادایە، لەمانگی حوزەیراندا یەك سەرلەشکری فەرەنسی بەناوی مورا بەفەرمانی ناپلیۆن شاری لورنی داگیرکردو لەهەمان ئەو ڕۆژانەدا ژنرال ئۆژرو خەریکی دەستبەرداگرتنی بولنی بوو، ناپلیۆن لەنیوەی مانگی حوزەیراندا بەتەواوەتی ئەوشارەی داگیرکردو ئینجا نۆرەی شاری تسکان هات، هەرچەندە ئەم ولایەتە بێلایەنی خۆی لەشەڕدا ڕاگەیاندبوو، بەڵام ناپلیۆن هەر دەوری ئەوشارانەی دەگرتن ونەوەی بەکەڵکی شەڕو سەربازەکانی هاتبا بەتاڵانی دەبرد، تەنانەت تابلۆی هونەرمەندەکانی سەردەمی ڕێنیسانسیشی بەزۆر دەبردن، ناپلیۆن بەسەرنجەوە لەدانیشتوانی ئەو شارانەی دەڕوانی ولەهەر شوێنێکدا ڕاپەڕین وبەرهەڵستکاری دژی ئەو کرابا بەتوندترین شێوە بەچەك بەرپەرچی دەدانەوە، لەکوکۆدا کەنزیك فرار– بوو خەڵك پێنج

---

42 - پارم: ولایەتێکە لەسەروی ئیتالیا کەلەساڵی( 1545 )دا دامەزراوە، پایتەختەکەی دۆك بووە کەلەنزیك زێەکی ڕووباری پۆدابووە، ئەم شارە لەڕووی بینای مێژوی ودێرین کۆشکی جوان ومۆزەخانەی ڕەنگینی تێدابوون .(نووسەر).

43 - لمباردی: ناوچێکە کەوتۆتە دامێن کێوەکانی ئەلپ ولەڕووی پیشەسازییەوە زۆر دەوڵەمەندەو مەرکەزی ئەوناوچەیەش شاری میلانە- کەنزیکەی یەك ملیۆن ونیو ژمارەی دانیشتوانەکەیەتی.(نووسەر).



سەربازی سواری ناپلیۆنیان کوشتبوون، ناپلیۆن فەرمانی ڕەشەبکوژی شاری دەرکرد، سەربازانی فەرەنسی ملی چەند سەد کەسیان بەشمشێر پەڕاندو دەستیانکرد بەتالآن وبرۆ وهەموو ئەوانەی گومانیان لێدەکرا کوشتیانن، ئەم کردەوە دڕندانەیە بۆشوێنەکانی تریش بڵاودەبۆوەو لەشوێنی تریشدا ئەم بێرەحمیە دەکرا، ناپلیۆن پێداویستی تۆپخانەکانی خۆی بەوردەستکەوتانەی کەلەنەمساوی و ولایەتەکانی تری ئیتالیا دەستی دەکەوتن نۆژەن دەکردنەوەو بەهێزتری دەکردن، هێرشی کردەسەر قەلآتی سەربازی مانتو کەیەکێکبوو لەوپێگە سەربازیانەی لەڕووی پێگەی سروشتی وسەنگەربەندی وقایمییەوە بەسەختترین قەلآتەکانی ئەورووپا هەژماردەکرا.

تازە ناپلیۆن گەمارۆی قەلآتی ناوبراوی دابوو کەبیستی لەشکرێکی نەمساوی سی هەزار کەسی لەژێر فەرماندەی فوورمسدا کەسەردارێکی سەربازی زۆر جددی وشایستەبوو، بەڕێگاوەیە بۆیارمەتیدانی گەمارۆدراوەکانی مانتو، ئەم هەواڵە دڵی دوژمنانی فەرەنسای خۆشکرد، لەلایەکی ترەوە ڕۆحانییە کاسۆلیکییەکان وئەرستۆکراتە نیوە فیوداڵەکانی سەروی ئیتالیا کەنەفرەتیان لەداگیرکردنی سوپای فەرەنسابوو لەداگیرکردنی سەرووی ئیتالیاو هەزاران گوندو شارنشینی کەلەدەست کوشت وبڕییەکانی ژنرال ناپلیۆن هەلآتبوون، بەوهەواڵە هەڵبڕابوونەوەو هەتا ولایەتی پیەمونیش کەبەناچاری پەیمانی ئاشتی لەگەڵ فەرەنسادا بەستبوو، دەیتوانی لەپشتەوە دەستبەشەڕبکات وڕێگای پەیوەندی لەشکری بەفەرەنسا بگرێت. ناپلیۆن (16) هەزار سەربازی بۆ گەمارۆدانی قەلآتی مانتو دانابوو وتەنها(29) هەزار سەربازی بەدەستەوەمابوون وچاوەڕوانی ئەوەیدەکرد لەفەرەنساوە هێزی سەربازی بۆ بنێرن، ناپلیۆن یەکێك لەباشترین فەرماندە سەربازییەکانی خۆی بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی فوورمسر نارد، بەلآم فوورمسر تێکیشکاند، ناچار ژنرال ناپلیۆن فەرماندەیەکی تری بەناوی ئاوژۆر بۆ شەرکردن لەگەڵ لەشکری فوورمسر نارد، ئاوژۆریش خۆی ڕانەگرت وپاشەکشەی کرد، هەلومەرجی سوپای فەرەنسی کەوتبۆ بارودۆخێکی ناهەموارەوەو ناپلیۆن شێوازێکی جەنگی تایبەتی گرتەبەر کەبەبڕوای شارەزایانی کلاسیکی سەربازی پێشەوایی کردنی سوپاو بەتێڕوانینی شارەزایانی سەربازی تازەش ئەم هونەرە بەسبوو: وەك ژومینی دەڵێت:(ناوبراو شانازییەکی هەمیشەیی بەنسیب بوو) هەرچەندە ناپلیۆن لەسپێدەی ژیانی سەربازی دوورو درێژی دابوو، ئەگەر کوژراباش فوورمسر کەشەیدای سەرکەوتنی بەسەر دوژمنە مەترسیدارەکەی لەکلێشەی سەریدا دەکوڵی، گەمارۆی قەلآتی مانتۆی تێکشکاند، بەلآم لەهەمان کاتدا ئاگادارکرایەوە لەشکری بۆناپارت هێرشی کردۆتەسەر سوپای پشتیان کەهێڵی پەیوەندی نێوان سوپاکەی ومیلانۆ بوو ولەسێ قۆڵەوە هەڵمەتی بردونەتەسەر، واتە: لەلاناتۆ وسالو وبرەچیاوە تێکیشکاندون، لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە فوورمسر لەشەڕی قەلآی مانتۆ گەڕایەوە دواوەو دوای چەند وردە شەڕێك لەڕێگای گەڕانەوەیدا سەرئەنجام لەنزیکی کاستی لیونەدا ڕووبەڕووی لەشکری ناپلیۆن بۆوەو دوای چەند مانۆڕێکی سەربازی لەشکری فەرەنسا لەپشتەوە ڕاماڵی سوپای نەمسایانکردو تێکیانشکاندن، پاش پاشەکشەکردنی لەشکری فوورمسر وهەلآتنیان بەدۆڵی ئادیژەداو وەرسوڕانەوەیان سەرئەنجام سوپای نەمسا چۆوەناو قەلآی مانتۆ ولەلایەن لەشکری ناپلیۆنەوە گەمارۆدران، ئەمجارەیان دەوڵەتی نەمسا نەك بۆ یاریدەدانی گەمارۆدراوانی لەشکرەکەی خۆی لەناوقەلآتی مانتۆدا بەپەلە لەشکرێکی تازەی لەژێر فەرماندەی ئال وینزیدا، کەوەك فوورمسر وئارشیدوك شارل، یەکێکبوو لەباشترین سەردارانی سەربازی ئیمپراتۆری، سازکرد. ناپلیۆن بۆشەڕکردن لەگەڵ ئال وینزیدا(28500) سەربازی بەڕێ خست و(8300) سەربازیشی بۆدرێژەدان بەگەمارۆی قەلآتی مانتۆ جێهێشت، هێزی



یەدەکی ئەو تەنها نزیکەی (4) هەزار کەس بوو، زۆرجار بۆناپارت دەیگوت: ئەو فەرماندە سەربازیانەی کەیەکە سەربازییە تازەکانیان بۆشەڕی سبەی ئامادەدەکەن هەمیشە تێکدەشکێن، ئەو پشتی بەلەشکری یەدەك نەدەبەست چونکە شەڕەکانی درێژخایەن بوون، لەشکری ئال وینز لەڕووی پەرداخییەوە لەلەشکری فەرەنسا باشتربوون ولەدرێژەی شەڕەکاندا چەند ئەفسەری پلەبەرزو یەکەی سەربازی لەناچوووبوون، ناپلیۆن فەرمانیدا یەچنچەو چەند شوێنێکیتر چۆڵبکرێت، هەموو لەشکرەکەی لەدەوری خۆی کۆکردەوە هەتائامادەی زەبروەشاندنێکی گورچك بڕی بکات، لە( 11- ی ئۆکتۆبەری ساڵی- 1796 )دا لەنزیك ئارکل شەڕێکی سەخت وخوێناوی تاخۆرئاوی ڕۆژی حەڤدەهەمی یێنایەری درێژەی کێشا، نەمساوییەکان کەژمارەیان زیاتربوو بەشێوەیەکی سەرسەخت دەجەنگین، ئیمپراتۆری هابسبروگ باشترین سوپاییانی خۆی ناردبوون بۆئەم شەڕە، یەکێك لەشوێنە ستراتیژییەکانی ئەوشەڕە پردی ئارکل بوو، سێ جار لەشکری فەرەنسی هێرشیان بۆئەو پردەکرد، بەلام تێکدەشکانەوەو پاشەکشەیان دەکردو زیانی زۆریان لێدەکەوت، ناپلیۆن وەك هەمان قارەمانیەتی کەچەند مانگ لەمەوپێش لەلودیدا نواندی هێرشی بەنارنجۆك وتۆپکردوو بۆخۆی کەوتە پێش تیپێکی لەشکرەکەو هێرشی برد، زۆر لەسەربازەکانی ناپلیۆن کوژران ودوای سێ ڕۆژ شەڕ، لەشکری ئال وینز کەوتە پاشەکشەکردن وبەرەو داوە هەلات، دوای یەك مانگ ونیو ئینجا نەمساوییەکان توانیان جارێکیتر لەشکرەکەیان ڕێکبخەنەوەو بۆ تۆڵەسەندنەوە خۆیان ئامادەبکەنەوە، شەڕی یەکلاکەرەوە لەناوەڕاستی مانگی یێنایەر ڕوویدا، واتە ڕۆژانی (14و15و16)ی ساڵی_1797) لەشکری ناپلیۆن لەشەڕێکی خوێناوی نزیك ریویلیداو لەدژی شکری نەمسا کەهەموو کۆببۆوە شەڕی کردو تێکیشکاندو ئال وینزیش لەگەڵ پاشماوەی سەربازەکانیدا هەلات، دوای پازدە ڕۆژ لەومێژووە سەربازە گەمارۆدراوەکانی ناوقەلاتی مانتو خۆیاندا بەدەستەوەو ناپلیۆن بەوپەڕی مهرەبانییەوە ڕەفتاری لەگەڵ ڤوروومسری دڵڕاوداکرد، دوای گرتنی قەلاتی مانتو ناپلیۆن بەرەو سەروو سوپاکەی بەڕێ خست و هەڕەشەی جددی خستەسەر هابسبۆرگ، پاش ئەوەی ئارشیدۆك شارل کەلەسەرەتای بەهاری ساڵی(1987)دا بۆشەڕی سەربازی بانگهێشتکرابوو، دوای چەند شەڕێگ لەگەڵ لەشکری ناپلیۆندا تێشکاو بەرەو ڕۆخەکانی ڕووباری برەنر هەلات ولەوێشدا بەزیانلێکەوتنێکی زۆرەوە پاشەکشەی کردوو تێی تەقاند، لەڤێنینادا پروپاگەندەی ئەوەبلاوبۆوە کەزێڕو گەنجینەی پاشا بەپەلەدەپێچنەوەو هەتا لەشوێنێکی باشدا بیشارنەوە، پایتەختی نەمسا کەوتبۆ ژێر هەڕەشەی سوپای فەرەنسا(ئانیبال گەیشتۆتە دەم دەروازەکانی) ناپلیۆن لەتیرەوە ئەمڕۆ سبەی دەگاتە ڤێننا، ئەو پروپاگەندانە لەناوهۆشی کەسانی ئەو ڕۆژگارەدا کەلەوپایتەختە دێرین وپڕنازەدا دەژیان مابۆوە، تێکشکانی باشترین فەرماندەکانی نەمساوی، پەرتەوازەبوونی تەواوی سوپای ولات، لەدەستدانی سەرتاسەری ئیتالیای سەروو وئەو هەڕەشەیەی کەسێبەری بەسەر پایتەختی نەمساداکردبوو، ئاکامی شەڕێکی یەك ساڵەبوو کەناپیلۆن بۆ یەکەمجار ساڵێ لەمەوبەر لێپرسراویەتی لەشکرێکی فەرەنسی گرتبۆ ئەستۆ، ناوی ناپلیۆن لەهەموو ئەورووپادا دەنگی دابۆوەو ببووە وێردی سەرزمان.



(2)

دوای تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی لەشکری ئارشیدۆك شارل، دەسەڵاتدارانی ڤیێنا هەستیان بەمەترسی درێژەدانی شەڕکرد، لەسەرەتای مانگیئیبریلی ساڵی1797)دا ناپلیۆن بەڕەسمی هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کەفرانسوای ئیمپراتۆری نەمسا داوای ئاشتی کردن دەکات، جێگای ئاماژە بۆکردنە خودی ناپلیۆنیش ئاسانکاری بۆنەمساوییەکان دەکرد، بۆ ئاشتی کردن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا فشارەکانی بۆسەر لەشکرە تێکشکاوەکەی ئارشیدۆك شارل زیاددەکردو ئەوە وەك پەیامێکبوو بۆئەوەی پێی بڵێ ئاشتی دەکات، هەموو لایەك ئاگاداری ئەونامە سەیرەن کەناپلیۆن دوای لەبەرچاوگرتنی کەرامەتی تێکشکاوەکان نووسیبووی هەرکاتێ ڕووبەڕووم ببنەوە بەشەڕ، ئەوا زیاتر سەربازەکانمان بەرەوپێشتردەچن وبۆ ئارشیدۆك شارلیشی نووسیبوو: بۆ کەممان مرۆ کوشتوون، چەند ڕەنج وسەنگەساریم توشی مرۆڤەکان کرۆدتەوە؟

دیرکتوار ڕازیبوو لەسەر ئاشتی کردن لەگەڵ نەمساداو لەبیری ئەوەدابوو کێ بەنوێنەر بنێرێت بۆدانوستان، بەڵام لەوکاتەی کەسێکیان بەناوی کلارك بۆ هۆردووی سەربازی ناپلیۆن نارد تانوێنەری فەرەنسا بێت، ناپلیۆن پەیمانی وازهێنانی لەلئوبن بەستبوو، واتە لەوکاتەدا حسابی خۆی بەسەری ڕم یەکلایی کردبۆوە، پاپی شەشەم، دوژمنی سەرسەختی شۆڕشی فەرەنسا، لەوەی ژنرال ناپلیۆن فەرماندەییەکەی بەسەرکوتکردنی لایەنگرانی سیستمی پاشایەتی بەئیمان لەڕۆژی(13–ی هەمان مانگدا کردبوو، پاپ ئەوی بەکافرو لەدین وەرگەڕاو ناوبردبوو، پاپ یارمەتی دەوڵەتی نەمسای دەدا دژی فەرەنسا، هەرکە فەرماندەی نەمساوی ڤورومسر قەڵاتی مانتوی بە(13) هەزار سەربازو سەدان تۆپ وچەکیتر تەسلیمی لەشکری فەرەنساکرد، ناپلیۆن توانی کەلك لەوهێزەی کەبۆ گەمارۆدانی قەڵاتی ناوبراو دانیابوو وەربگرێت وبەرەو دەوڵەتی پاپ بەرەوپێش ببات، هێزەکانی پاپ لەیەکەم شەڕیاندا تەفرو توونابوون وپەرتەوازەو شلۆقبوون وبەشەپرێوی هەڵاتن، ئەو شەڕە دووسەعاتی نەخایاند کەیەکێ لەفەرماندەکانی ناپلیۆن بەناوی ژونو ئەو لەشکرەی پاپی تێکشکاند، ئیتر شارەکان یەك لەدوای یەك خۆیاندا بەدەستەوە، ناپلیۆن و لەشکرەکەی هەرچی کەکەمێ بەهای هەبوا لەزێڕو زیو وئەڵماس و.. پەردەی نەخشەدارو تابلۆ وشتیتر، تالانکرد، لەتالانکردنی شارەکان وشتەکانی ناو کڵێساکان وەك چۆن لەسەرووی ئیتالیادا کردیان، ماڵ وسامانێکی زۆر زۆریان دەستکەوت، دەوڵەمەندو ڕۆحانییەکان وخاوەن پلەو پایەکانی دەوڵەت لەپەشۆکاوی وزەندەق چوونیاندا بەپەلەپرووزاوان بەرەوناپلی هەڵاتن، پاپی شەشەم نامەیەکی پاڕانەوە ئامێزی بەبرازاکەیدا کاردینال ماتیدا بۆ ناپلیۆن نارد، ناپلیۆن بەڕوو خۆشییەوە ناوەڕۆکی ئەم نامەیەی قبوڵکردوو لەووەفدەی گەیاند تاکەمەرجی ئاشتیکردنی خۆبەدەستەوەدانی بێمەرجە، لەبەرواری (19–ی فبرایەری ساڵی–1797)دا پەیماننامەی ئاشتی لەتولنتینودا مۆرکرا، کەبەپێی ڕێککەوتنەکە دەبوا پاپ زۆرینەی ولایەتە دەوڵەمەندەکانی مەملەکەتی خۆی بداتە فەرەنساو سێ ملیۆن فرانکی زێڕیش بدات وجوانترین تابلۆی نیگارکێشان وپەیکەرەکان تەسلیم بکات، دەبوا ئەم شتانە لەگەڵ مۆزەخانەکەیدا بدات، بۆناپارت هەموو ئەمانەو ئەوشتانەی کەلەشارەکانی میلان وبولونی ومدن و پارم و پلزانس ولەشوێنەکانی تردا بەتالان برابوون، ناردنی بۆ پاریس، پاپ تەواو خەجڵاو وتۆقیبوو وهەموو مەرجەکانی قبوڵکردن و تەنانەت زیاتریش، لەبەرئەوەی ناپلیۆن هیچ گرنگی بەپاپ وڕەزامەندی ئەونەدەدا، بۆ چ ناپلیۆن ئەوکارەی کەچەند ساڵ دواتر ناچاربوو ئەنجامی بدات لەم کاتەدا نەیکرد؟ بۆچی ڕۆمی نەگرت وپاپی دەستگیرنەکرد؟ یەکەم لەبەرئەوەبوو مەسەلەی ئاشتی کردن لەگەڵ نەمسادا هەرلە ئارادابوو، ئەگەر لەمەزیاتر



فشاری بۆپاپ هێنابا لەوانەبوو کاسۆلیکەکانی ئیتالیای ناوەڕاست وخواروو بوروژێنێت وبەهۆی ئەمەوە پشتی سوپاکەی خۆی بکەوێتە مەترسییەوە، جگەلەمەش ئێمە دەزانین لەماوەی ئەو شەڕە سەرەتاییە سەرکەوتووەی ئیتالیاو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی بەسەر سوپای ئیمپراتۆریەتی نەمسادا ژنرال لاو شەوانە لەبەر تریفەی مانگدا هەتابەرەبەیان لەبەردەم چادرەکەی خۆیدا دەهات وچوو بۆیەکەم جار ئەم پرسیارەی لەخۆی کرد: ئایا بەردەوامبێت لەگرتنی دەوڵەتان و تێکشکاندنی سوپاکەیان بۆخاتری دیرکتوار، واتە لەبەر خاتری کۆمەڵێ مل ئەستووری خۆلێسەرەوە؟

ساڵەکانی بەهێواشی بەسەرچوون، ئاوەکان بەهێواشی بەژێر پردەکاندا ڕۆیشتن، خوێن دەرژا، هەتا ناپلیۆن ئەوبیرۆکەی ئەم شەوەی بێنێتەدی وئاشکرای بکات، بەڵام ئەو وەڵامەی ئەمڕۆ بەخۆی دایەوەو لەساڵی (1797 )دا بەوسەرداره سەرکەوتووە تەمەن (28) ساڵە ئیتر پاپی شەشەمی وەك پیرەمێردێکی پەککەوتەو تۆقیوو وگەمەی دەستی خۆی سەیرنەدەکرد، بەڵکو پاپی شەشەم پێشەوای ڕۆحی ملیۆنەها هاوڵاتی فەرەنسیش بوو، هەرکەسێکیش ویتسبای هێزی خۆی بەسەر ئەومیللەتەدا بسەپێنێ دەبوا حسابی لەسەر باوەڕی خورافیاتی[٤٤] ئەمانەکردبا، ناپلیۆن کڵێسای وەك یەك کەرەستەی پۆلیسی دەزانیو کەکەڵك وەرگرتن لەئەو بۆبەڕێوەبردنی زۆرینەی هاوڵاتیان زۆر ئاسانبوو، بەبۆچوونی ئەو بەتایبەت کڵێسای کاسۆلیك لەم ڕووەوە تەواو بەکەڵکبوو، هەرچەندە بەداخەوە ئەو کڵێسایەبەردەوام پروپاگەندەی ئەوەی کردبوو ودەکرد کەڕۆڵی سیاسی سەربەخۆ وجیا بەڕێوەدەبات، ئەم پروپاگەندەیەش بەمانا بەرفراوانەکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو ڕێکخستنەکانی تەواو سەربە پێشەوای ڕۆحانی بوو، بەڵام سەبارەت بەپلەی خودی پاپ، بۆچوونی ناپلیۆن ئەوەبوو ئەو پلەیە لەسەرئەنجامی گەمە سیاسییەکان وئایۆنییەکانەوەبوو کەبەدرێژایی دووهەزار ساڵە هەیەو ئەسقەفییەکانی ڕۆم لەسەردەمی خۆیاندا بەکەڵك وەرگرتن لەبارودۆخی ناوخۆو مێژووی وابەستە بەژیانی سەدەکانی ناوەڕاست ئەمەیان داهێناوە، بەڵام ئایا ئەم فرت وفێڵ وکەڵەکەبازیە چۆن توانیویەتی بگۆڕدرێت بەیەك هێزی سیاسی وتەواو بێتەجددی، ئەمە شتێکبوو ناپلیۆن تەواو درکی پێکردبوو.

پاپ: ملکەچ ودەستەوەستان لەڤاتیکاندا مابۆوە ئەمە لەحاڵێکدابوو کەئاوەدانترین وبەپیتترین ملك و ماڵی خۆی لەدەستدابوو.

بۆ ناپلیۆن پێی نەنایە ڕۆم؟ هەرکەکاری پاپی یەکلایی کردەوە، بەخێرایی گەڕایەوە ئیتالیای سەروو هەتا خەریکی دانوستانی ئاشتی بێت لەگەڵ نەمسای دۆڕاو لەشەڕدا، سەرەتا پێویستە ئەوە بخەینەڕوو کەناپلیۆن کارەکانی وابەستە بەئاشتی کردنی (لئوبن )و دواتر کاروبارەکانی وابەستە بەڕێککەوتنی (کامپوفرمیو)ی بۆخۆی ئەنجامداو بەشێوەیەکی گشتی لەبەڕێوەبردنی هەموو دانوستانە سیاسییەکاندا بەهەمان تواناو ئیرادەو بەهێزی خۆی لەدانیشتنەکانی ئاشتیدا بێ ئەوەی حساب بۆکەسی تر بکات، دەکرد، بۆ ئەم شتەوابوو؟ بۆئەو بەوسادەییە لەم کارانەدا سەرکەوتوو دەبوو؟ سەرەتا بەپێی پەندێکی پێشینە کەدەڵێت ( لێپێچینەوە لەگەڵ سەرکەوتواندا ناکەن ) سەردارانی کۆماری، باشترینی ئەمانە بۆ نمونە: مورۆ بوو کەلەهەمان ساڵی(1796)دا لەگەڵ کراتەکاندا لەدەم ڕووباری ڕندا شکستی خوارد، لەکاتێکدا لەشکری ڕن بۆدرێژەدان



بەمانەوەی داوای لەپاریس کردبوو پارەی بۆبنێرن، لەکاتێکا ناپلیۆن فەرماندەیی لەشکرێکی شرو بێ سەرووبەرەی گرتەدەست وفیداکاری وسەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنابوو، داوای دینارێکی لەناوەند نەدەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە ملیۆنەها سکەی زێڕو شاکاری هونەری دەناردەوە پاریس، جگەلەمانەش ئیتالیای داگیرکردو لەشکرەکانی نەمسای یەك لەوای یەك تێکشکاندن ودەوڵەتی‌نەمسای ناچارکرد داوای ئاشتی بکات لەگەڵ فەرەنسادا، شەڕی سەرکەوتووی ریوڵیو گرتنی مانتو وداگیرکردنی مەملەکەتی پاپ و... ، هێزی ئەوی بەشێوەیەکی بنبڕ دیارخستبوو ومەزنی ئەوی نیشاندەدا.

(3)

لێوبن، یەکێکە لەشارەکانی ولایەتی ستیری نەمسا کە(250 ) کلیۆمەتر لەڤێنناوە دوورە، بۆ گرێنتی مانەوەی ئەو شوێنانەی لەئیتالیا داگیری کردبوون، واتە ئەو ناوچانەی کەتائەوکاتە گرتبوونی وئەو شوێنانەی کەداواشی دەکردن خستنیەژێر فەرمانڕەوایی خۆی، لەبەرەی جەنگی سەروو، واتە فەرەنسا لەگەڵ ئەڵمانیادا، باری سوپای فەرەنسی زۆرباش نەبوو وناپلیۆن دەیویست لەخواروودا ئاشتی بکات هەتا ئەگەر بەشێوەی کاتیشبێت، هەتابتوانێت بەهاواری سوپای فەرەنساوە بچێت لەبەرەی ئەڵمانیادا، لەگەڵ ئەوەشدا باش دەیزانی نەمساوییەکان تاسەر ئێسکانیان بەرگری لەخۆیان دەکەن، ئەگەر زانیان مەترسییەکە تائەو ئاستەیە ئاشتی تێدانییەو وڵاتەکەیان داگیردەکرێت، بۆیە ویستی کۆتایی بەشەڕەکە بهێنێت وئاشتی بکات، دەبوا ئەوە بە چ تێهەڵێنێتەوە؟

لەکۆیوە بۆکوێ، ڕاستە شۆڕشی کۆماری بێلایەنی خۆی ڕاگەیاندبوو، بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدابوو هیچ بەهانەیەك نەدات بەدەستەوە بۆڕێگا خۆشکردن بەهاوسێکانی هەتابێن خاکەکەی داگیربکەن، بەڵام ناپلیۆن خۆی بەوجۆرە شتانەوە ناڕەحەت نەدەکردو بەتەنگ ئەمەوەنەبوو، بۆیە هەرکە یەکەم بەهانەی دەستکەوت، ناپلیۆن تیپێکی سەربازی بەرەو نیز بەڕێ خست، تاکوپێش ئەم کارەشی لەلێوبندا ڕێککەوتن نامەیەکی لەگەڵ دەوڵەتی نەمسادا بەم مەرجانەی خوارەوە مۆرکردبوو، بەپێی ئەو ڕێکەوتنە دەبوا نەمسا بەشی چەپی ڕووباری ڕن وهەموو خاکی ژێر دەستەی ئیتالیایی خۆیان، کەدواتر ناپلیۆن داگیری کردبوو، بدرێتە فەرەنسا، لەبەرامبەریشدا نیز بدرێتەوە نەمسا، لەڕاستیدا ناپلیۆن بیرۆکەی ئەوەی لەکەللەدابوو نیز دابەش بکات، خودی ئەوشارەی کەلەسەر چەند دورگەیەکی بچوك دروستکراوەو سەربە نەمسابوو وبەشەکەی تری ئەوشارەش کەوتبۆ سەر رۆخی دەریا، دەدرایە کۆماری تازە دروستکراوی سیزالپین وناپلیۆن بڕیاریدابوو هەموو ئەوخاکەی داگیری کردبوو لەسەرووی ئیتالیادا بخاتەژێر دەسەڵاتدارانی ئەودەوڵەتە تازەیەی کەبەناوی سیزالپین–ەوە بوو، ئەم کۆمارە تازەیە بێگومان بەشێکبوو لەفەرەنسا، تەنها هەندێ شتی تەشریفاتی مابوو کەخەبەردانبوو بەپەرلەمان وسەرۆك کۆماری نیز، وڵاتەکەیان کەهەر لەدامەزراندنییەوە واتە لەنیوەی سەدەی پێنجەمەوە تائێستا سەربەخۆبووە، ئیتر بوونی هێزی دەرەکی بەرەسەردانابێت.

ژنرال ناپلیۆن وای حەزدەکرد بتوانێت لەڕەوشە سیاسییەکانی خۆی سەرئەنجامێکی باش بەدەست بهێنێت، ناپلیۆن بۆدروستکردنی ئەودەوڵەتە سەرخۆییەی ودانانی پلانەکانی باسی نەکردوەو بەنهێنی هێشتبوونییەوە، ناپلیۆن لەبەهانەیەك دەگەڕا بۆداگیرکردنی نیزو لەنامەیەکیدا بۆسەرۆك کۆماری نیزی بەم شێوەیە نووسیوە:(پێت وایە کوشتاریەکەی



لژیونیەکانی[٤٥] سەرووی ئیتالیا کەتۆ ماندەریانی بێدەنگەی لێدەکرێت ؟ تۆڵەی خوێنی برا سەربازەکانی فەرەنسیت لێدەکەمە) ئەم تانەو تەشەرە ئامازەکردن بوو بەکوژرانی یەك ئەفسەری فەرەنسی لەکەنداوی لیدو، بەڵام ڕاستی پێویستی بەبەهانە هێنانەوە نەدەکردو مەسەلەکە ئاشکرابوو.

ناپلیۆن فەرمانی بەژنرال باراکە دیلیەگرد نیز داگیربکات، لەمانگی یۆنیۆی سالی– 1797)دا کارەکە کۆتاییهات وئەو کۆمارە دوای سێزدە سەدە سەربەخۆیی بوونی وبوونی مێژوویەکی دێرین، ئیتر وڵاتێك بەوناوە بوونی نەما، بەم جۆرە ئەو پارووە چەورو نەرمە کەوتەدەست ناپلیۆن هەتادابەشی بکات، ئەمە تەنها  شتێکبوو بۆبەستنی ئاشتی لەگەڵ نەمساوییەکانداو باری ئەوانی لەنگکردبوو، بەڵام چارەنوس وایهێنا داگیرکردنی نیز خزمەتێکی تری چاوەڕواننەکراو بەناپلیۆن بکات.

شەوێك لەشەوەکانی مانگی مایۆی سالی–1797)دا پۆستەچی سەربازی پەیامێکی سەربازی لەلایەن ژنرال برنادوت– ەوە بۆناپلیۆن هێنابوو کەناوبراو بەفەرمانی لیپرسراوانی بالا (تریست)ی داگیرکردبوو ولەودواییانەدا ببووە ئەندامی ستادی فەرماندەی گشتی سوپای فەرەنسا، ئەوکات ناپلیۆن لەمیلانۆدابوو وناوەڕۆکی بروسکەکە ئەوەبوو پێویستە ساکێکی بچوکی دەستی کەلای کەسێکە بەناوی کنت دانترگ و.. ناوبراو یەکێکە لەلایەنگرانی سیستمی پاشایەتی ولەترسی فەرەنسییەکان لەنیزەوە هەڵاتووە بۆتریست ولەوێش گرفتاری دەستی برنادوت بووە کەتازە ئەوشارەی هێنابۆ ژێر رکێفی خۆی، ئەم جانتایەی دەستی دەستکەوتووە کەبەڵگەی سەرسوڕهێنەری تێدابوون وباسی ڕووداوەکانی پاریسی تێدانووسرابوونەوەو ئێمە لێرەدا ئامازە بەناوەڕۆکەکەی دەکەیین، دەستەی سەرمایەداری گەورە[٤٦] ، برژوازیەتی سەرکێش ئەرستۆکرات وفیودالەکان میکرۆبی شۆڕشی واندەمیری سالی(1795)بوون وبەتۆپەکانی ناپلیۆن لەناو نەچوون وئەگەری ئەوەش نییە لەناوبچن، تۆپەکانی ناپلیۆن تەنها توانیبووی ستادی فەرماندەی گێرەشێوێن ولایەنگرانی ڕژێمی شانشینی لەناوبەرێت، بەشێك لەبرژوازیەت هەتاپێش ڕووداوەکەی واندەمیریش دەستیان لەدژایەتی کردنی دیرکتوارییەکان  بەردابوو، کاتێ لەبەهاری سالی(1795)دا کودەتاکەی بابوف[٤٧] ئاشکرابوو وتارمایی ڕاپەڕینێکی تازە لەلایەن کرێکاران ومەترسی دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکانی مانگی مایۆ وردەوردە خەریکبوو دەهاتنەئاراو توێژەکانی وردەبرژوازی شارو کۆلاکەکانی دێهات ولایەنگرانی سیستمی شانشینی شکستخواردووی مانگی واردەمیری دووبارە ورەیان کەوتبۆوەبەروو سەربزێویان دەکرد، بەڵام کەرەتەش وەك هاوینی سالی(1795) لەکیبرونداو مانگی واندەمیری لەپاریس توشی هەڵەببوونەوە، ئەم جارەشیان پەیان بەوواقیعە نەبردبوو ئەگەر زەویدارانی تازە بیانەوێت دەتوانن یەك هێزی پۆلیسی گەورەی بەتوانا بۆ پاراستنی مڵکەکانیان دروستبکەن، ئەگەر برژوازیەتی تازە پێگەیشتوو کەلەپای فرۆشتنی سامانی دەوڵەتەوە دەوڵەمەند ببوون ئامادەبوون بۆ پاراستنی

---

[45] - لژیون: یەکەی دابەشکردنی سوپای ڕۆمی بووەو بەگشتی پێکهاتووە لەسێ هەزار سەرباز.(و- کوردی)

[46] - لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان (سەرمایەدارو برژوا) دیارە نووسەر مەبەستی لەسەرمایەدارو وردە برژوایە.

(و- کوردی).

[47] - فرانسوا ئامیل بابوف(1760-1797) کودەتاچییەکی فەرەنسییە لەدژی دیرکتوارەکان وداخ لەدڵێکی گەورەبووە دژبە کۆمۆنیستەکان، ناوبراو پێشنەوەی بیەنەبەر جوتین بۆیەڕاندنی ملی بەخەنجەرەکەی خۆی کوشتووە.

(و- فارسی).



بەرژەوەندییەکانیان پشتگیری یەك حکومەتی سەرکوتکەری ڕەهابکەن، تەنانەت حەزیاندەکرد یەك دیکتاتۆر بێتە سەرکورسی دەسەلات.

تەنها سەرمایەدارانی شارودێهات لایەنگری گەڕانەوەی بنەماڵەی بوربنەکان بوون، چونکە بوربنەکان تەنها پاشای ئەرستۆکراتەکان بوون نەك برژوازەکان، دوای ئەمەش فیودالیزم دەگەڕایەوەو مەسەلەی داواکردنی گەڕاندنەوەی ملکەکانیان دەکردەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا لایەنگرانی سیستمی شانشینی لەهەموو لایەنەکانیتر دژی شۆڕش یەکگرتوو وڕێکخراوتربوون ویارمەتی دەرەکی باشیان بۆدەهات و ڕۆحانییەکانیش لایەنگری ئەمانەبوون، جارێکیتر ئامادەکاریان بۆ ڕووخاندنی دیرکتوارەکان کردەوەو لەبەهارو هاوینی ساڵی(1797)دا ڕۆڵی سەرکردایەتی کردنی دژە کۆمارییەکانیان گرتەدەست، هێواشهێواش شۆڕشی کۆماری بەرەو لاوازبوون دەچوو، چونکە لەهەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پێنج سەت کەسدا ئیمتیازی ئاشکرا بەوکەسانە دەدرا کەکۆنە پەرست ولایەنگری ڕژێمی شانشینی بوون، هەتا لەناو خودی دیرکتواریشدا کەببووە جێگای هەڕەشەی دژە کۆمارییەکان گومان دوو دڵی بوونی هەبوو.

بارتلمی وکارنو، هەردوکیان دەستەی بەڕێوەبەرێتی دەوڵەت بوون ، دژی هەر دەستپێشخەرییەکی شەڕو توندو تیژی بوون، سێ کەسیتر کەئەوانیش دەستەی کارگێڕی بەڕێوەبەری دەوڵەت بوون، واتە: باراس و رۆبل ولاروە لیرلپو، بەردەوام لەگەڵ یەکتردا خەریکی نەخشەو پلان دانان بوون ، بەلام بۆ ڕێگاگرتن لەوزەبرەی کەلەڕێگادابوو، هیچ دەستپێشخەری ونەخشەیەکیان نەبوو، یەکێك لەوشتانەی ببووە هۆی گرژی وناڕەزایەتی باراس و دوو هاوکارەکەی تری، ئەوەبوو نەیاندەویست بێ شەڕ دەست لەدەسەلاتی خۆیان هەڵگرن، تەنانەت ئامادەبوون دەست لەژیانی خۆیان بشۆن وبەهەر ئامرازێکبێت شەڕبکەن.

ژنرال پیشگرو[٤٨] کەسێکی بەناوبانگ بوو وهۆڵەندای داگیرکردو لەساڵی(1795)دا لەڕیزی ناکۆکانی شۆڕشی کۆماری بوو وبەسەرۆکی ئەنجومەنی پێنج سەت کەسی هەڵبژێردرابوو وببوە سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان، پاڵێوراوی گرتنەدەستی سەرۆکایەتیش بوو لەدژی سێ بەڕێوەبەرەکانی دەوڵەت، ئەم ناوە بەسێ بەڕێوەبەرەکانی دەوڵەت دیرکتوارەکان دەگوترا: واتە باراس و لاروەلیلپۆ وروبل.

بارودۆخی هاوینی ساڵی(1797) بەم شێوەیەبوو، ناپلیۆن لەگەڵ شەڕکردنی لەئیتالیادا، بەوردی چاودێری ئەو ڕووداوانەی دەکرد کەلەپاریسدا دەهاتنەپێش وبەئاشکرا دەیزانی کۆماری لەژێر هەڕەشەدایە، ناوبراو کۆماری خۆشنەدەویست، چونکە زۆری نەبرد بەدەستی خۆی کۆماری لەناوبرد، بەلام ئەوهەرگیز لەوە بێئاگانەبوو لێگەڕێت ئەم بیرۆکەی لەناوبردنی کۆماری بەقازانجی کەسێك بشکێتەوەو حسابی لەسەر کاتی گونجاو پێشهاتی باشدەکرد.

پێشتر وەلامی ئەم پرسیارەی خۆی دابۆوە کەمەجبورنییە لەپێناو دەستەیەك کارڕێکخەردا بجەنگێ وخاکیتر داگیربکات، وەلێ حەزی ئەو بەداگیرکردنی خاکی ترو سەرکەوتوویی دژی کەسانی شەرمەزار کەمنەبوو، ئەویش وەك بەڕێوەبەرانی دیرکتوار بوونی سەردارێکی لایەنگرو سەرلەڕێگای پاشایەتی وەك پیشگروی لەبەرچاودەگرت، کەهەوڵی کودەتای دەدا بەسەر

[٤٨] - پیشگرو: ژنراڵێکی فەرەنسیە(1761-1804)



شۆڕشی کۆماری فەرنسادا، ئەگەری ئەوەهەبوو ئەم ناوە[49] لەساتەوەختێکی دیاریکراودا سەربازانی فەرەنسی فیروبدات وگومرایان بکات، چونکە سەربازەکانی بەنیاز پاکی پیشگرو باوەڕیان بەکۆماریخوازی ئەو هەبوو بۆیەدوای دەکەوتن، بێئەوەی بزانن ئەو بەرەوکوێیان دەبات.

ئێستا لێرەدا بۆماندەردەکەوێت کاتێ ئەو جانتایە لە(تریست)دا بەدەست کەسێکەوە بەناوی کنت دانترگ، گیراوەو بەپەلە بۆ ناپلیۆنیان ناردبوەو ناپلیۆنیش لەناو ئەوجانتایەدا بەڵگەی حاشاهەڵنەگری سەبارەت بەخیانەتی پیشگرو بەردەست کەوتوون کەبەنهێنی گفتوگۆی لەگەڵ (فوش بورل) کردووەو ناوبراو یەکێکبووە لەبەکرێگیراوەکانی (پرنس دوکندە)[50]، ئەم بەڵگانە شاهیدی ڕاستەقینەبوون سەبارەت بەوپەفتارە فریودەرانەی پیشگرو کەلەدەمێکەوە بەناو خزمەتی کۆماری دەیکردن.

تەگەرەیەکی بچوك هاتەپێش و بووەهۆی ئەوەی ئەم بەڵگانە بۆماوەیەکی کەم دوابکەون ونەگەنە تەدەست باراس: لەیەکێك لەوبەڵگانەدا نووسرابوو: مون گایان، کەبەکرێگیراوێکی تری پرنس دوکندە بوو، نووسیبووی چووم بۆناو لەشکری ناپلیۆن لەئیتالیاو هەوڵمداوە لەگەڵ ئەودا گفتوگۆ بکرێت ونەویش بێتەناو دانوستانەکان، هەرچەندە لەو بەڵگەنامەیەدا جگەلەم چەند ڕستە هیچە چیتر نەنووسرابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناپلیۆن ئەم چەند دێڕەی وابەستەبەخۆی لابرد، هەتاکاریگەری ئەم بەڵگانە لەسەر پیشگرو کەم نەبێتەوە: بۆیە فەرمانیدا(دانترگ)[51] بهێننەلای وفەرمانی بەئەودا دەستبەجێ ئەوسەندە بنووسێتەوەو ئەم چەند دێڕەی سەرەوە کەسەبارەت بەخۆی بوو لابیات ولەخوارەوەش ئیمزای بکات .ئەگەرنا لەسێدارەی دەدات، دانترگ، ئەوەی ناپلیۆن فەرمانی پێکرد جێبەجێیکردوو ماوەیەك دوای ئەمە ئازادکرا، هەرچەندە بەڕووکەش گوایا ناوبراو هەڵاتووە.

ئینجا ئەوبەڵگانە نێردران بۆ پاریس ودرانەدەست باراس، ئەم بەڵگانە سێ بەڕێوەبەرەکانی دەستەوەستانکرد، سەرەتا بێئەوەی ناوەڕۆکی ئەوبەڵگانە ئاشکرابکەن، چەند لەشکرێکی جێگای متمانەیان بۆپاریس بانگهێشت کردەوەو ئینجا چاوەڕوانی لەشکری ئورژو بوون کەناپلیۆن بەپەلە ناردبووی بۆپاریس هەتایارمەتی سێ بەڕێوەبەرەکانی دەوڵەت بدات، جگەلەمانەش ناپلیۆن پەیمانی دابوو بۆ پڕکردنەوەی خەزێنەی دیراکتوار کەلەتەنگژەیەکی مالی خراپدابوو، سێ ملیۆن فرانکی زێڕ بنێرێت کەلەتالآن وبڕۆی شەڕە سەرکەوتووەکانی ئەم دواییە وەدەستهاتبوو، سەعات سێی بەرەبەیانی(4–ی سێپتەمبەری ساڵی1797, باراس فەرمانیدا دووکەس لەبەڕێوەبەرانی دەوڵەت کەگومانیان لێدەکرا دەستگیر بکەن، بارتلمی دەستگیرکرا، بەڵام کارنو توانی هەڵبێت، زۆر لەلایەنگرانی گومانلێکراوی سیستمی پاشایەتی دەستگیرکران ولەئەنجومەنی (500) کەسی وئەنجومەنی پیرانیشدا زۆرکەسیان دەستبەسەرکردن وبەبێ دادگایی کردن دووریان خستنەوە بۆ گویان[52] کەئومێدی گەڕانەوە لەوشوێنە زۆر کەمبوو.

---

[49] - فرانسوا – فەرماندەی هێزەکانی – رن و موزل، بەهۆی تینوێتی بۆدەسەڵاتی دژی دیرکتوار وەستایەوەو دواتر لەگەڵ جورج کادودالدا دژی ناپلیۆن کودەتای کرد، کاتێ دەستیان کەیشتە ئەو ودۆزیانەوە بینیان بەبۆینباغەکەی خۆی خنکاندووە. (و- فارسی)

[50] - لویسی: جوزیف پرنس دوکندە (1736-1818) لەساڵی( 1792 ) لەفەرەنسا هەڵاتوومو دژی شۆڕشی فەرەنسی بووەو لەشکرێکی بەناوی خۆیەوە لەکوبلابلتس – لەلێوار زێی رندا پێکهێناوە بۆشەڕکردن لەگەڵ کۆماری فەرەنسادا.(و- فارسی)

[51] - ئەو بەکری کیراوەیە کەجانتای بەڵکەکانی سەر پیشکرو پێوەگیراوە(و- کوردی)

[52] - کۆیان: دورگەیەکە لەلایەن فەرەنساوە داگیرکراوەو کەوتۆتە سەروی کیشوەری ئەمریکای باشورو بەهۆی دووری و خراپی کەش وهەواکەی مەحکومەکانیان بۆ ئەو دورگەیە ناردووە.



ئەو ڕۆژنامە گومانلێکراوانەی بەلای سیستمی پاشایەتیدا دەیانشکاندەوە داخران، زۆر کەسیان لەپاریس وشارەکانی تری فەرەنسادا دەستبەسەرکرد، لەبەرەبەیانی(8–ی سیبتەمبەردا بڵاوکراوەو دروشمی گەورەیان بەهەموو دیوارەکانی پاریسەوە هەڵواسی وناوەڕۆکی ئەمانە دەقی ئەوبەڵگانەبوون کەناپلیۆن بۆ باراسی ناردبوون.

پیشگرو سەرۆکی ئەنجومەنی (500) کەسی دەستبەرسەرکران ویەکسەرە بۆدورگەی گۆیان دوورخرانەوە، کودەتای(4–ی سبتمبەر بچوکترین بەرەنگاری بوونەوەی تێدا ڕوونەدا، توێژی سێیەم کەلەدیرکتوارەکان زیاتر ڕقیان لەلایەنگرانی سیستمی شانشینی دەبۆوە بەوزەبرەی لەهەوادارانی بوربنەکاندرا شادمانبوون، ئەمجارەیان دانیشتوانی گەرەکە دەوڵەمەندەکان لەکۆلانەکاندا هەتاو نەیبردن، چونکە دەرسێکی ترسناکیان لەدەست ناپلیۆن لەمانگی واندەمەریدا[53] وەرگرتبوو، کەبەتۆپەکانی سەرکوتی کردبوون، هەر لەبیریانمابوو، دیرکتوار سەرکەوت وکۆماری ڕزگاری بوو، ژنرال ناپلیۆنیش لەهۆردوی سەربازی دورەدەستی خۆی لەئیتالیا(کەدووساڵ دوای ئەم مێژووە بۆخۆی دژیان وەستایەوە) پیرۆزبایی لەدیرکتوارکرد، بەڕزگارکردنی کۆماری،(حەوت ساڵ دواتر خودی ناپلیۆن دیرکتواری لەناوبرد).

(4)

ناپلیۆن لەلایەکی تریشەوە لەسەر کەوتنەکەی کۆماری دڵخۆشبوو، بۆیە بڕیاری ئاگربەستی مانگی مایۆی ساڵی(1797) کەلەگەڵ نەمساوییەکاندا مۆری کردبوو وەك شێوە پەیمانێکبوو نەیویست بیشکێنێت، لەکۆتایی هاویندا حکومەتی فەرەنسا لەپڕ هێزو تواناو غیرەت نواندنی نیشانداو هەڕەشەو گوڕەشەی دەکردن، بۆناپارت باش دەیزانی ئەم گۆڕانە لەکێوە سەرچاوەی گرتووە: نەمساش وەك هەموو دەوڵەتە سەرکوتکەرەکانی تری ئەورووپا، لەچاوەڕوانی ئەو ئای وئۆین و پلانانەدابوون کەلەپاریسدا خەریکی ڕوودان و ڕوویاندەدا، لەئیتالیادا ڕۆژانە چاوەڕوانی ڕووخانی دیرکتوارەکان وکۆتایهاتنی کۆماری و گەڕانەوەی بوربنەکان وچارەسەرکردنی ئەوکێشانەی بەهۆی داگیرکردنی خاکی وڵاتەکەیان لەلایەن فەرەنساوەیان دەکرد.

18–ی سبتمبەر بەتێکشکانی لایەنگرانی سیستمی پاشایەتی وئاشکرابوونی خیانەتکاری پیشگرو، کۆتایی بەچاوەڕوانی کردنی ئەمانەهێنا، ئیتر ناپلیۆن لێرەودوا سیاسەتەکەی گۆڕی وبەجددی سوربوو لەسەر ئەوەی دانوستانی ئاشتی لەگەڵ نەمسادابکات، دەوڵەتی نەمسا، کوبنتسلی سیاسەتمەداری ژیری بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ناپلیۆندا نارد، بەڵام کوبنتسل توشی هاوتایەکی بوو کەزۆر لەخۆی سیاسەتمەدارترو زۆرزانتر بوو، دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ و پڕقۆرت وپێچ، کوبنتسل ڕاپۆرتێکی بۆ وڵاتەکەی خۆی ناردوو لەدەقی ئەونامەیەدا نووسیبووی: بەدەگمەن توشی پیاوی وەك ناپلیۆن فرتوفێڵ بازو دەغەل بۆتەوە، هەروەها لەونامەیەدا زۆر بەجددی باسی تواناو ئاستی وشیاری سیاسی ناپلیۆنی کردبوو وگوتبووی وشیاری سیاسی ئەو لەئاست توانای سەربازیدایە، ناپلیۆ لەیەکێك لەدانیشتنەکاندا بۆئاشتی کردن لەگەڵ نەمسادا، بەتوڕەیی ودەنگێکی بەرز هاواریکرد،(ئیمپراتۆرییەکەی ئێوە پیرو پەککەوتەیەو ئێوە خووتان پێوەگرتووە لەسایەی ئەودا بخەون،

[53] -واندەمەری: واتە مانگی سیبتەمبەر(ئەیلول) کەبەتەقویمی شۆڕشی فەرەنسی دەیکردە ساڵی چوارەم.(و- فارسی)



دەڵێی لەبیرت چۆتەوە کەفەرەنسا سەرکەوتوویەو ئێوە دۆڕاو و...، ئەوەت بیرکردەوە تۆ ڕووبەڕووی کەسێك دانیشتووی کەنارنجۆك هاوێژەکانی چوارلا جوغزیان بەدەوریدا کێشاوە..)

ئینجا مێزێکی سێ پێچکەیان هێنا کەتاقمێکی قاوە خواردنەوەی زۆر بەنرخی لەسەربوو ودیاری کاترینی ئیمپراتۆری ڕوسیابوو، دابوویە سیاسەتمەداری نەمساوی وئێستاش ئەوهێناویەتی وبەدیاری دەیدات بەناپلیۆن، ئەوتاقمە کەوتەسەر زەوی هۆڵەکەو بوو بەهەزار پارچە، کوبنتسل لەڕاپۆرتەکەی خۆیدا نووسیویەتی:(وەك شێت[5] هەڵسوکەوتی دەکرد).

سەرئەنجام پەیمانی ئاشتی لە(170ی تۆکیۆبەری ساڵی– 1797) لەشارۆچکێك بەناوی کامپوفرمیو لەنێوان حکومەتی کۆماری فەرەنساو ئیمپراتۆریەتی نەمسادا مۆرکرا.

هەموو ئەوشتانەی ناپلیۆن داوای دەکرد، جگەلەو شوێنانەی کەلەئیتالیاو هەندێ خاکی ئاڵماندا داگیرکرابوون بەدەستی هێنان، ونیزیش جکومەتی کۆماری فەرەنسا دای بەنەمسا لەبری ئەوەی ئەو خاکەی کەلەلیوار دەریای رندا لەدەستیدابوو وەری بگریتەوە، ناپلیۆنیش ئەمەی پێناخۆش نەبوو.

هەواڵی ئاشتی کردن لەگەڵ نەمسادا بووەهۆی خۆپیشاندانی خۆشی خەڵك، وڵات بەم سەرکەوتنانەی چاوەڕوانی زیندووکردنەوەو بوژانەوی بازرگانی وپیشەسازی لێدەکرا، ناوی ناپلیۆن کەوتبۆسەر هەموو زمانێك، هەموو لایەك پەیان بەوڕاستییەبرد، ئەو شەڕەی سەردارانی سەربازی لەشەڕی رندا تێکشابوون ناپلیۆن بەتەنها لەئیتالیادا بردبوویەوە، زنجیرەیەك ستایشکردنی بەردەوامی ڕەسمی وشێوە ڕەسمی وتایبەتی چ لەڕێگای بڵاوکراوەکان و چ بەسەرزارەکی، بەشان وباڵی ناپلیۆن هەڵادەگوتراو ئاماژە بەدلێری وئازایەتی ئەدەکرا.

لاروە لیرلیۆ، لێپرسراوی دیرکتوار، لەیەکێ لەگوتارەکانیدا هاوی کردوو گوتی: تەنها ڕۆحی بەهێزی ئازادی توانیویەتی ورەوەبەر لەشکری ئیتالیای فەرەنسا بنێت وناپلیۆن سەربخات وئەو خۆشبەختی فەرەنسای دەستەبەرکرد، لەوماوەیەدا ناپلیۆن هەموو کاتەکانی خۆی بۆڕێکخستنی کۆمارە تازەکەی ژێر دەستی خۆی تەرخانکردبوو، واتە: کۆماری سزالپین، ئەو هەندێ لەوهەرێمانەی وەك لمباردی خستەژێر دەسەڵاتداریەتی ئەم کۆمارە تازەیە.

بەشێکی تری ئەوخاکانەی داگیریشی کردبوون خستیەسەر فەرەنسا، ئەمانەی کەدەشمانەوە لەمانەش ڕۆم، هەرلەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایە کۆنەکانیدا هێشتەوەو لەژێر چاودێری فەرەنسادابوون، ناپلیۆن بەڕووکەش کۆماری سزالپینی دایە دەست دەسەڵاتی ئەنجومەنێکی پێکهاتوو لەنوێنەرانی چین وتوێژەکانی میللەت وئەوانە حکومەتیان دەکرد، بەڵام لەڕاستیدا هەموو دەسەڵاتێك لەژێر داگیرکەرە فەرەنساوییەکاندابوو کەدەستەیەك کۆمیسار بۆئەو ئامانجە ناردرابوونە کۆماری ناوبراو، ئەو دروشمانەی (ئازادکردنی میللەتان)و ( کۆماری برایەتی) و...هتر، بەلای ناپلیۆنەوە شتی بێ مانابوون، ئەو گومانی لەوەنەبوو ئەگەری ئەوەهەبێت لەئیتالیادا تەنانەت ڕێژەیەکی کەمیش لەخەڵکی ماندوو وشپرزە باوەر بەودرەشمانە بهێنن ئەومیللەتانەی خاکەکەیان داگیرکراوو، بەیانێکی ڕەسمی لەئەورووپادا بڵاوبۆوەو بەپێی دەقی ئەو بڵاوکراوەیە نووسرابوو، ئێستا میللەتی ئیتالیا خەریکی لابردن ودورخستنەوەی ئاموری چەند سەت ساڵەی ئەفسانەو ستەم و زۆرەو چەکی

---

[5] – مەبەستی کوبنتسلی سیاسەتمەداری نەمساوی لەناپلیۆنە.



بەدەستەوەگرتووەو بەیارمەتی ڕزگارکەرەکانی فەرەنسی بەخێرایی لەبەرەوپێشدان، بەڵام لەڕاستیدا ناپیلۆن لەڕاپۆرتە نهێنییەکانی خۆیدا کەبۆ بەڕێوەبەرانی دیرکتواری دەنارد، دەینووسی: ئەگەر وێنای ئەوەدەکەن یەك میللەتی پەرپوتی خورافاتی و تەمبەڵ وبێغیرەت بگەیەندرێتە شوێنێك بەرەوپێشببرێت، بەهەڵەداچوون.

لەناو لەشکرەکەی ناپلیۆندا یەك سەربازی ئیتالیایی نەبوو، جگەلەو هەزارو پێنج سەت کەسە بەرەڵایەی کەلەشەقام ودالانەکانی شاردا کۆکرابوونەوەو تەنها کاری تالان وبڕۆیان پێدەکردن، دواتر ناپلیۆن لەڕاپۆرتەکانی دەینووسی: تەنها بەڕەفتاری ژیرانەی پشتبەست بە(گوێ کێشانی توڕەییانە) دەتوانرێت ئیتالیامان لەژێردەستدا بمێنێتەوە، ئیتالیاییەکان لەمەوبەر ئەمەیان بینیبوو وتێگەیشتبوون کەئامانج لەگوێچکە ڕاکێشان چییە، بۆناپارت، دانیشتوانی شارەکانی بیناسکو وپاوی وخەڵی وچەند گوندێکی نزیك سەربازگەکانی خۆی لەئیتالیادا سەرکوتدەکردن وبەبێ بەزەییانە تەمبێی دەکردن، لەهەموو ئەم شتانەدا کردارەکانی ناپلیۆن لەیەك سیاسەتەوە سەرچاوەی گرتبوو وهیچ کاتێکیش چاوی بەوڕەوشەی خۆیدا نەخشاندەوە. ئەو هەرگیز بەتوندوتیژی بێبنەما ڕەوایی نەدەدا، بەڵام لەکاتی پێویستدا بۆملکەچکردنی وڵاتانی ژێردەستەی خۆی پەنای بۆ توندوتیژی و زەبرو زەند دەبرد.

ناپلیۆن هەر شوێنێکی لەئیتالیادا داگیرکرد، مەسەلەی نیوەکاری وسەرانەی کڵێساو ناوەندەکانی مەزهەبی لەباج وەرگرتن نەهێشت، لەماوەی ئەوساڵ ونیوەی لەئیتالیادا بەسەری برد(لەبەرهاری سالی 1796- بۆ کۆتایی پایزی ساڵی- 1797) سەرکەوتووبوو لەدانانی قانون وڕێسای باری کۆمەڵایەتی وماف ولەگەڵ ڕەوشی شۆڕشی کۆماری فەرەنسادا نزیکی کردەوە، لەبەرامبەردا هەرشوێنێکی تری ئیتالیای داگیردەکرد، چی تابلۆی هونەری ومۆزەخانەو ملیۆنەها فرانکی زێڕی بۆدیرکتوار لەپاریس دەناردەوە، ئەو خۆی وفەرماندە سەربازییەکانیشی فەرامۆش نەکرد، چونکە هەموویان لەوشەڕە بەباخەڵی پڕەوە گەڕانەوە، بەهۆی بوونی ئەو زەبروزەنگە دڕندانەیەیی دژی هاوڵاتیانی ئیتالیادەکرا، ناپلیۆن پەی بەوەش بردبوو هەرچەندە میللەتی ئیتالیا دەستەوەستان وبێزیبك بوون، گومانی لەوەنەبوو دەبوا خەرجی سوپای داگیرکەری فەرەنساش بدەن، چون ڕۆژێکدێت کەللەیی بن ودژی هەڵگەڕێنەوە، بۆیە ناپلیۆن بۆ ڕێگاگرتن لەمە باشترین چارەی ئەوەبوو پەنابەرێت بۆسیاسەتی زۆرو ستەم وسەرکوتکردن ونەمەشی بەشتێکی ڕەوادەزانی لەبەرامبەر ئیتالیاییەکاندا، ئەو حەزی نەدەکرد ئیتالیا جێبێڵێت، بەڵام دوای ئاشتی کردنی(کامپوفورمیو) سەرانی دیرکتوار بەشێوەیەکی زۆر میهرەبان، بەڵام پێداگرتن لەسەرئەوەی بگەڕێتەوە پاریس وبێتە فەرماندەی سوپایەك کەدەبوا دژی بریتانیا بکەوێتەشەڕ، ناپلیۆن ماوەیەکبوو هەستی دەکرد دیرکتوار وردەوردە ترسیان لێپەیداکردووە، ناپلیۆن لەگەڵخۆیدا دەدواو بیری لەوەدەکردەوە کەئەوانە هەرەچەندە بەمن هەڵادەڵێن، دەزانم ئیرەیم پێدەبەن، بەڵام ناتوانن من فریوبدەن، ئەوان بەپەلەمنیان بەلێپرسراوی لەشکری دژی بریتانیا داناوە، هەتا لەئیتالیا بمهێننەدەرێ کەنەك هەرسەردار بەڵکو دەسەڵاتی ڕەهاشم هەیە تێیدا).

ناپلیۆن لە(7-ی دیسەمبەری ساڵی1797)دا گەیشتەوە پاریس، دیرکتوار سێ ڕۆژ دوای ئەومێژووە بەوپەڕی شکۆمەندیەو ڕێزەوە ئاهەنگێکی میوانداریان لەسەرشەرەفی سەرکەوتنەکانی ئەو لەکۆشکی کوکسامبۆرگدا سازکرد، خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆشکدا کۆببونەوە بەتلیلیی وهاتوهاواری شادی وچەپڵەڕێزانەوە پێشوازیان لەناپلیۆن کرد، ئەو گوتانەی



پێشکەشکران لەلایەن باراس وهاوکارەکانی ئەو وتالیران وەزیری دەرەوەی فەرەنسا(کەپیاوێکی زیرەك بەلام گەندەڵبوو ولەهەموو کەس باشتر ناوبراو دەیتوانی درك بەئاینده بکات) بوون.

هەروەها کەسایەتییە ڕەسمییەکانی تری دەوڵەت وتاریان گوت وبووەهۆی چەپڵەڕێزان وسەماو خۆشی دەربڕین، بەلای ئەوسەرداره کەنجە تمەن (28) ساڵەوە، کەتەواو ئارامبوو ووەك ئەوەی ئەرکی سەرشانی جێبەجێکردبێت، هیچ جێگای سەرسوڕمانی نەبوو، ئەو هیچ کاتێك دڵی بەوچەپڵەڕێزان وخزانی خەڵك نەدەکرایەوە، چونکە دوای ئەو ڕۆژە لای ئەو کەسانەی لێی نزیکبوون گوتی(ئەگەر منیش ببەنە بەردەم جیۆتین[55] خەڵك بەهەمان زەوق وشەوقەوە لەسەر ڕێگاکەمدا ڕادەوەستن).

هەرکە ناپلیۆن گەیشتە پاریس خەریکی ئەوەبوو نەخشەیەکی تازەی شەڕکردن داڕێژێت وقەناعەت بەدرکتوار بکات لەسەر ئەم پلانە سەربازییەی ڕازیبکات، ئەو سەبارەت بەبریتانیا پێی وابوو، هەڕەشەکردن لەبریتانیا لەسەرخاکی میسردا باشترو کاریگەرترە نەك لەسەر دەریای مانش، چونکە هێزی دەریایی بریتانیا لەسەردەریای مانیش لەهێزی دەریایی فەرەنسا بەتواناترە، لەسەر ئەوبنەمایە پێشنیاری ئەوەیکرد بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی نزیك وپێگەی باش وخستنە مەترسی دەسەلاتدارییەتی بریتانیا لەسەر هند، پێویستە میسر داگیربکرێت، لەهاوینی ساڵی(1798)دا مەسەلەکە یەکلایی بۆوەو ئاشکرابوو، زۆر کەس لەئەوروپادا لەخۆیان دەپرسی، ناپلیۆن بۆناپارت شێت نەبوبێت؟ لەدوورەوە لەبەرچاوی کەسانی ساویلکە ئەم مەسەلەیە شتێکی خەیاڵی بوو وئومێدی دێرینەی بڕژوازییەتی شۆڕشی کۆماری بوو، تەنانەت یەکێ بوو لەوئاواتانەی دەوڵەتی فەرەنسای پێش شۆڕشی کۆماریش، ئەو پلانەی ناپلیۆن لەلایەن دیرکتوارەوە پەسەندکرا.

---

[55] - جیۆتین: پەراوێزی پێشوو.



# داگیرکردنی میسرو لەشکرکێشی بۆسەر سوریا

(1799 -1798)

(1)

لەشکرکێشی بۆسەر میسر، دووەمین شەڕی گەورەی ناپلیۆن بوو، کەڕۆڵێکی گەورەی لەمێژووی ژیان و سەرکەوتنەکانی ئەودا تۆمارکردو فەرەنسای گەیاندە پێگەیەکی تایبەتی، برژوازییەکانی شاری مارسی و هەموو شارەکانی تری خواروی فەرەنسا، پەیوەندی بازرگانی باشیان لەگەڵ شانینەکانی خۆرهەڵاتی ئەوروپا [٥٦] وسوریاو میسرو دورگەکانی دەریای سپی ناوەڕاست وپۆناندامەبوون، ئەم برژوازیانە لەدێر زەمانەوە ئارەزووی قایمکردنی پێگەی سیاسی فەرەنسا لەسەرئەو دەوڵەتانەبوو کەپەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵیاندامەبوو، چونکە بێسەرەو بەرەیی بارودۆخی ئیداری لەو وڵاتانەدا ئەوەی هەڵدەگرت ودەویست هەمیشە بازرگانی لەژێرچاودێری هەژمونێکی بەهێزتردابێت وبازرگانان بتوانن لەکاتی پێویستدا داوای یارمەتی لەو زلهێزە بکەن.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا پروپاگەندەو مقۆمقۆی سامانی زۆری سروشتی وڵاتانی سوریاو میسر دوونەوەندەی پێشوو زیادیکرو لەوشوێنانەدا کۆمپانیای بازرگانی ووەبەرهێنان دامەزران، دیپلوماتییەتی فەرەنسا لەدەمێکەوە نفوزی کردبوو لەناوئەو وڵاتانەی کەکەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، واتە چاوی تەماعی تێبڕیبوون، هەروەها دەسەڵاتدارانی فەرەنساش دەمێکبوو چاویان بڕیبۆ میسر کەخاکەکەی کەوتبۆ سەردەریای سپی ناوەڕاست ودەریای سوور لەوێشەوە لەدوورتریان دەڕوانی ودەیانویست لەمیسرەوە رکەبەریێ سیاسی وبازرگانییەکانیان لەهندستان و ئەندەنوسیادا بخەنەژێر هەڕەشەوە، لایب نیتسی [٥٧] فەیلەسوفی بەناوبانگ، لەسەردەمی خۆیدا راپۆرتێکی بۆ لویسی چواردەهەم ناردووەو لەناو دەقی ئەو راپۆرتەدا گوتویەتی(میسر داگیربکە هەتا پێگەی هۆڵەندییەکان لەسەرانسەری ئاسیادا لەباربچێت)

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا، ئیتر هۆڵەندییەکان لەناو هاوکێشەکە چونەدەرێ وبریتانیاییەکان بوونە دوژمنی سەرەکی، بۆیە کاتێ ناپلیۆن ئەمەی بەفەرماندە سەربازییەکانی لەشکرەکەی گوت، هەموویان سەریان لەوشێتییەی ئەو سوڕمابوو، نەیاندەزکانی مەسەلەکە چییە، دواتر لەوەی تالیران وەزیری دەرەوەی فەرەنسای ئەوکات بەرگری لەنەخشەکەی ناپلیۆن کرد، ئەبووە جێگای سەرسوڕمانی دەسەڵاتدارانی فەرەنسا، هەرکە ناپلیۆن (ونیزی) داگیرکرد فەرمانی بەیەکێ لەفەرماندە سەربازییەکانیدا دورگەکانی ئایونین [٥٨] داگیربکات، گرتنی دورگەکانی ناوبراویش هەربە ئامانجی گرتنی میسربوو لەئایندەدا ئێمە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرمان بەدەستەوەن تائکید لەسەرئەوە دەکەنەوە، ناپلیۆن لەسەرکەوتنەکانی لەئیتالیادا هەمیشە لەبیری داگیرکردنی میسردابووە، لەمانگی ئۆکۆستی ساڵی (1797)دا لەتۆردووی سەربازییەکەیەوە بۆپاریسی بەم جۆرە دەنووسی(کاتی ئەوەهاتووەو هەستدەکەم بۆنابووتکردنی بریتانیا پێویستە دەست بەسەر میسردا بگرین) ناپلیۆن بەدرێژایی

---

[56] - مەبەست لەشێوەی دوورکەی بالکانە. سوریا: ئەوکات پێکهاتووە لەلوبنان وهەندێك لەخاکی عراق وئوردون...

[57] - فەیلەسوفێکی بەناوبانکی ئەڵمانیە(1644-1716) و لەفەیلەسوفە ئایدیالیستەکانەو بنەمای فەلسەفەکەی لەسەر کەشییە.(نوسەر)

[58] - دورکەکانی ئایونین: کەوتونەتە خۆرئاوای یۆنان کەڕۆژکارێ لەژێر دەسەڵاتدارێتی ئیتالیاو دواتر بریتانیادابوون وئێستاش بەشێکن لەخاکی یۆنان.(و- فارسی)



شەڕەکانی ئیتالیای لەڕەخساندنی کاتدا خەریکی کتێب خوێندنەوەبوو وفەرمانیدا کتێبەکەی ولنە[59] کەدەربارەی میسربوو وچەند پەرتوکێکی وابەستەبە ئەوەی بۆبهێنن وهەموو ئەمانەی خوێندنەوە، ئەو بۆداگیرکردنی دورگەکانی ئایونین ئەوەندە جێگای گرنگی بوو تەنانەت لەنامەیەکیدا بۆدیرکتوار دەڵێت (ئەگەر کشانەوەمان بخرێتە هەڵبژاردنەوە باشتر وایە دەست لەئیتالیا هەڵگرین و ئەم دورگانە لەژێر دەستی خۆماندا بهێڵنەوە).

تەنانەت پێش ئاشتی کردنیش لەگەڵ نەمسادا ناپلیۆن سوربوو لەسەرئەوەی دەبێ دورگەی مالتە داگیربکرێت، هەموو ئەو پێگە دەریاییانەی دەریای سپی ناوەڕاست بۆخۆسازکردنی داگیرکردنی میسر پێویست بوو، دوای پەیمانی ئاشتی کامپوفرمیو لەگەڵ نەمسادا مەسەلەی شەڕ بەڕیایی کۆتایهات ودوژمنی سەرسەخت وبنەڕەتی فەرەنسا بریتانیابوو، ناپلیۆن هەموو هەوڵ وتوانایەکی خستەگەڕ هەتا دیرکتوار ڕازیبکات چەند کەشتی ویەك لەشکری پێبدەن هەتا میسر داگیربکات، بەردەوام ئەو بیری لەداگیر کردنی خۆرهەلات دەکردەوەو هۆشـی ئـەو لەوڕۆژانـەدا وەك مێشکی ئەلکسەندەری مـەزن وشمارلمـانی و سـیزار و...پیاوە مێژوویەکانیتر سەرقاڵی ئەمەبوو، ماوەیەك دوای ئەمە لەکاتی ڕۆیشتنی بەسەر بیابانە خۆڵینەکەی خاکی میسردا، کەلەگەڵ جەنگاوەرەکانی خۆیدا دەڕۆیشت وبەگاڵتەجاڕییەوە گوتی (داوای لێبوردن دەکەم کەدرەنگ هاتمەدنیاوە، خۆزگە لەو ڕۆژگارەدا ژیابام کەئەلکسەندەری مەکادۆنی دوای داگیرکردنی ئاسیا خۆی بەکوڕی جوپیتیر[60] بەمیللەت ناساندو هەموو خەڵکی خۆرهەلات باوەڕیان بەو پروپاگەندەیەی ئەوکرد) دواتر درێژەی بەقسەکەی داو بەشێوەیەکی جددیتر گوتی (ئەورووپا هێلانەی مشکی کوێرە، هەرگیز ئیمپراتۆریەتی گەورەو ڕاپەڕینی مەزن جگەلە ئاسیا لەهیچ شوێنێکی تردا بوونیان نەبووە) ئومێدەکانی ئەو لەگەڵ ئەوەشـدا کەلەگـەڵ پێداویستیو فاکتـەرەکانی سـەردەمەکەیدا دەهاتـەوە لـەڕووی بەرژەوەنـدی تاکەکەسی خۆشییەوە بەکەڵکبوو، لەڕاستیدا هەرلەوشەوەی لەئیتالیادا لەبەردەم خێمەکەیەوە شەونخونی کردبوو لـەدڵی خۆیدا ئەم پرسیارەی کردو گوتی: بۆ دەبێ خزمەتی دەستەیەك کەسی دەلالبکات و ولاتان داگیربکات، تێڕوانینی گۆڕابوو حەزی بەگرتنەدەستی دەسەلاتی ڕەهای فەرەنسا دەکرد، ناپلیۆن ئەوکاتانەی خەریکی ئاشتی کردن بوو لەگـەڵ نەمـساو فەرمان لەپاریسەوە بۆئەو دەنێردران ودەسەلاتەکانی ئەویان سنووردارده‌کرد، بەڕاشکاوی بەشاندی فەرماندە سەربازییەکانی خۆی دەگوت (ئیتر من گوێڕایەڵی دەسەلاتدارەکانی ولاتی خۆم نیم).

بـەلام ڕووخانـدنی دیرکتـوار لەسـالانی (1797 و1798)دا کـاتی نـەهاتبوو وشـتێکی نـەگونجاوبوو، چـاوەڕوانکردن ودانبەخۆداگرتن بۆهاتنەپێشی هـەل شـتێکی لـەباربوو، چـونکە ئەوکاتـەش دیرکتـوار تـەواو بـێ متمانـەو دەسـت لەپـچك بەردراونەبوو، ناپلیۆن تەواو پشتی بەلەشرەکەی خۆی دەبەست، بەلام تائەو کاتەش نەببووە کەسێکی تەواوخۆشەویستی هەموو لەشکرەکەی، وەلێ ئەگەر کاتەکانی خۆی هەر لەچاوەڕوانی لاوازبوونی دیرکتوارداباو خەریکی دەستبەسەرداگرتنی خـاکی ولاتـانی تـرو ولاتـی ئەهرامـەکان نـەکردباو بەشـوێن پێـی ئەلکـسەندەری مەزنـدا هـەنگاوی نـەناباو هەڕەشـەی لەبەرژەوەندییەکانی بریتانیای ناپەسەند نەکردبا چی کردباو چۆنی بەسەربردبا؟

---

[59] - کنت ولنە(1757-1820) نووسەرو ئەکادیمی فەرەنسی ونووسـەری کتێبی وێرانەکان(یان بیرۆکە دەربارەی کودەتاکانی ئیمپراتۆرەکان وکتێبەکەی تری دەربارەی میسربووو.(نووسەر)

[60] - جوپیتیر(خوای خواکان) زیوس وبیرۆن- یشی پێدەکوترێت، بەپێی ئەفسانەکانی- یۆنانی ورۆمی وئاسیاوی.(و- کوردی).



سەبارەت بەمە پشتیوانیکردنی تالیران لەناپلیۆن بەپلەی یەك پێویستبوو، بەشێوەیەکی گشتی ناتوانین دەم لەو بڕوایەی تالیران بکوتین، بەڵام ئەگەری بەدەستهێنانی خاکێکی دەوڵەمەندو ئاوەدانی وەك میسر، لەڕووی ئابوورییەوە زۆر سودمەندبوو ولەتێڕوانینی ئەوەوە شتێکی لۆژیك وبنەرەتی بوو، تەنانەت تالیرانی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا، پێش پێشنیارکردنی ناپلیۆن بۆئەمەش، راپۆرتێکی بۆسەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی فەرەنسا ناردبوو، ئەم پیاوەئەرستۆکراتە بەهۆی تینویەتی بۆدەسەڵات خزمەتی شۆڕشی کۆماری دەکرد، لەزۆر شوێندا هەرکە بواردەهاتەپێش یەکسەرە باسی ئومێدی ئەو توێژەو بازرگانەکانی فەرەنسایی دەکرد، بەتایبەت بازرگانی کردن لەگەڵ خۆرهەڵاتدا، ئارەزووی دڵی تالیرانیش کەدەیویست خۆی لای ناپلیۆن شیرین بکات ولەگەڵ ڕاکانی ئەودابێت، چونکە ئەوسیاسەتمەدارە بیرتیژە پێشبینی ئەوەی کردبوو ناپلیۆن پیاوی خاوەن دەسەڵاتی ڕەهای ئایندەی فەرەنسادەبێت ئەمان لەناودەبات.

ئەوەی ڕاستی بێت ناپلیۆن وتالیران بۆ ڕازیکردنی دیرکتوار بۆدانی کەشتی وسەرباز وخەرجی، زۆر زەحمەتیان نەدی، چونکە بەپلەی یەك ولەهەمووشیان گرنگتر ئەوەبوو دیرکتواریش بەهۆی بەڵگەی ئابووری سیاسی وسەربازییەکان کەلەمەوبەر باسمانکردن، وێنای باشی دەستبردن بۆئەم کارەیان بەشێکی باش دەزانی، ئەگەری دووەمیش لەشکرکێشی بۆ شوێنێکی ئاوا دوور، گرنگییەکی کەمی هەیە بەتایبەت باراس ڕایوابوو مەترسی دەکەوێتەسەر لەشکرەکەیان وداگیرکردنی میسر ئەوە ناهێنێت.

ئەو کەسایەتییە ناودارو خۆشەویستەی کەناپلیۆن بەدەستی هێنابوو کەمێ لاڕێی کردبوو ودیرکتوارەکانیش باش دەیانزانی ئەوکەمتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانە، بۆ ناپلیۆن تەنها بۆخۆی دانوستانی ئاشتی کامپوفرمیوی لەگەڵ نەمساوییەکاندا نەکردبوو بێ ئەوەی گوێبداتە ڕاوبۆچوونەکانی پاریس خۆی چۆنی پێخۆشبوو ئاوا ڕێکەوتنی ئاشتی لەگەڵ نەمسا نەکرد؟

لەمەراسیمی(10-ی دێسمبەری ساڵی،1797)دا کەلەسەر شەرەفی ئەوبوو، ڕەفتاری ناپلیۆن وەك کەسێکی ئازاو قارەمان نەبوو بەوەی دڵشادو کامەرانبێت لەوسەرکەوتنانەی بۆ وڵاتەکەی بەدەستی هێناون، بەڵکو هەڵسوکەوتی وەك یەك ئیمپراتۆری ڕۆمی بوو کەپەرلەمانتارە ئەڵقەلەگوێکانی پیرۆزبایی لێدەکەن، چونکە ناوبراو ئەمەی وەك ئەرکی تەواو سادەی دەزانی، بەکورتی شێوازی ڕەفتارو ئادگارەکانی نیگەرانی نیشاندەدا، بۆیە باشتروابوو بچێت بۆشەڕی میسر، چونکە ئەگەر لەپاریسدا مابایەوە باش نەبوو، بۆیە پێشتر باراس وهاوکارەکانی خۆیان بۆئەمە سازدابوو[61]، و هەرزوو بڕیاری ئەم لەشکرکێشییە دەرکراو ناپلیۆن لە(5-ی مایۆی ساڵی-1798)دا بەڕەسمی بوو بەفەرماندەی گشتی ئەو لەشکرەی بۆداگیرکردنی میسر دەنێردرا، ناپلیۆن بێ وەدرەنگخستن پێداویستییەکانی سەفەرەکەی و هەڵبژاردنی سەربازو ڕێکخستنەوەی کەرەستەکانی شەڕو سەردانکردنی کەشتییە جەنگییەکانی کرد، دووبارە وەك گڕوتینی ئەوکاتەی کەخۆی بۆشەڕی ئیتالیا سازکرد، سەرلەنوێ تازەبۆوە، چونکە ئەو لەگەڵ ئەوەشدا خەریکی خۆپێچانەوەو دەست بردن بۆشەڕێکی دیژوارو مەترسیدار بوو، ئاگای لەوردە کارەکانیش هەبوو، بەواتایەکیتر پەل وپۆی دارەکەی دەبینێن ودەیزانی ئاراستەکانی چۆنن، ئەو ئاگاداری پروپاگەندەکان وگواستنەوەی هێزەکانی نلسن[62] وسیاسەتی ئەو ڕۆژگارەی دنیابوو، سازکردنی پێداویستی وکەرەستەو

---

[61] - سازکردبوو: مەبەست لەوەیە ناپلیۆن لەپاریسدا مەترسی بۆسەر دەسەڵاتداران پەیدادەکرد.(و- کوردی)

[62] - نلسن:(1758-1805) ئەفسەری دەریاوانی سوپای بریتانیابووەو لەدووشەڕی دەریایی ئابوقیرو ترافالگاردا، هێز دەریایی ناپلیۆنی تێکشکاندو لەشەڕی ترافالگاردا کوژراو تەرمی ئەو لەوست مینستردا نێژراوە.(و- فارسی)



ئەوکەشتیانەی بتوانن سەربازەکانی بەسەردەریای سپی ناوەڕاستدا بگەیەننە سەر وشکانی ئەوبەری[II] ، ئەو سەربازانەی کەلەشەڕی ئیتالیا بەشداریانکردبوو هەڵی بژاردن، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوکەسانەی لەخۆی نزیکبوون ولەو ڕۆژانەدا ببوونە جێگای گرنگی پێدانی تایبەتی ئەو، بۆ نموونە: دەیزانی فلان سەرباز ئازاو گوێڕایەڵە بەڵام زۆر مەی دەخواتەوە، ئەم سەربازەشیان زۆر وشیارو تەردەست وبەزەبرو زەنگە، بەڵام چوون حەزی لەڕابواردنە زوو ماندوو دەبێت، ئینجا سەرکەوتوانە فەرماندەکانی هەڵبژاردن، شتێکی بەڵگەنەویستە دەبێ بۆداگیرکردنی میسرو بڕینی بیابانێکی بێ ئاو وسێبەرو گەرمای(50) پلەیی، سەربازی دلێرو خۆراگر هەڵبژێرێت.

لەڕۆژی(19–ی مایۆی ساڵی– 1798)دا هەموو شتێك ئامادەبوو، کەشتییە جەنگییەکانی ناپلیۆن لەبەندەری تۆلۆندا لەنگەریانگرت، (350) کەشتی جەنگی گەورەو بچوك وبەلەم کە(30) هەزار سەرباز بەتۆپ وچەکەکانیانەوە ئامادەبوون وهیچ چاویان لەوەنەدەترسا لەڕێگادا ئەگەری ئەوەهەیە توشی سوپای دەریایی نلسن ببن و ببنە ئامانجی تۆپەکانی ولەدەریای سپیدا نقومبن، هەموو ئەورووپا دەیزانی فەرەنسا خەریکی شەڕێکی دەریاییە، بریتانیاش ئاگاداری ئەوەبوو کەلەهەموو بەندەرەکانی خوارووی فەرەنسادا جموجۆڵی سەربازی هەیەو ژنرال ناپلیۆن بۆتە لێپرسراوی ئەم لەشکرکێشییە، بەڵام ئایا ئەم لەشکرکێشییە بۆ سەرکوێ یە؟

ناپلیۆن بەوریاییەوە پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە، دەیەوێت لەتەنگەبەری جەبەل تارق تێپەڕێت و بەدەوری ئیسپانیادا وەرسوڕێتەوەو سوپاکەی لەسەرخاکی ئێرلەندادا پیادەبکات، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشت، نلسنی بەهەڵەدابردو ناوبراو لەدەم تەنگەبەری جەبەل تاریقدا بۆسەی بۆ ناپلیۆن نایەوەو لەهەمان کاتدا سوپای فەرەنسا یەکسەرە بەرەو دورگەی ماڵتەچوو.

دوورگەی ماڵتە هەرلەسەدەی (16)وە لەژێر دەسەڵاتی نەتەوەیەکدابوو بەناوی شوالیە، هەرکە لەشکری فەرەنسا نزیکی ئەو دوورگەیە بۆوە دانیە بەرتۆپ و پێشنیاری ئەوەی بۆدەسەڵاتدارانی ئەو دورگەیەکرد خۆیان بدەن بەدەستەوە، دوای خۆبەدەستەوەدانی ئەودورگەیە ناپلیۆن بەبەشێك لەخاکی فەرەنسای لەقەڵەمدا، دوای چەند ڕۆژێك بەرەومیسر چارۆکی کەشتییە جەنگییەکان هەڵدران، دورگەی ماڵتە کەوتبۆ نیوەڕێگای نێوان میسرو فەرەنسا، ناپلیۆن لەڕۆژی(10–ی یۆنیۆ گەیشتە ئەودورگەیەو ڕۆژی (19–ی هەمان مانگ ئەوێی جێهێشت، لەشکری ناپلیۆن بەیاریدەی ئاراستەی با ڕۆژی(30–ی یۆنیۆ گەیشتە ڕۆخی دەریایی میسرو نزیك شاری ئەلکسەندەریەو ڕاستەوخۆ فەرمانیدا سەربازەکانی پیادەبن، هەلومەرجێکی مەترسیداربوو، هەرکە ناپلیۆن گەیشتە ئەلکسەندەرییە، هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە(48) سەعات لەمەوبەر کۆمەڵێ کەشتی جەنگی بریتانی هاتوونە ئەم بەندەرەو هەواڵی ناپلیۆنیان پرسیوە، بەڵام کەس لەوبەندەرەدا هەواڵی ناپلیۆنیان نەزانیوە، هەرکە نلسن هەواڵی داگیرکردنی ماڵتەی لەلایەن فەرەنسییەکانەوە بیست، زانی ناپلیۆن بەهەڵەیدا بردووەو زوو بەرەومیسر کەوتەڕێ وتا نەهێڵێت سەربازەکانی فەرەنسا لەسەرخاکی میسر دابەزن، بەڵام ئەم پەلەکردنەی نلسن بەزیانی خۆی تەواوبوو، دوای ئەوەی نلسن زانی ناپلیۆن بەئامانجی چوون بۆمیسر ماڵتای جێهێشتووە جارێکیتر بەهەڵەداچۆوە چونکە کاتێ لەئەلکسەندەریەدا بەئەویانگوت هەرگیز ناوی کەسێکمان نەبیستووە بەناوی ناپلیۆن، فریوخواردوبۆوە، دواتر نلسن کەوتە



گومانی ئەوەی دەبێ ناپلیۆن بەرەو قستەنتینیە چووبێ وبە پەلەپروزاوان ئاراستەی چارۆکەی کەشتییە جەنگییەکانی بەرەوئەوێ گۆڕی.

ئەم هەڵپەو پەلەپەلەی نلسن کردی لەشکری فەرەنسای لەمەترسی پاراست، هەر ئەمەشبووە هۆی ئەوەی سوپای فەرەنسا لەماوەی شەوو ڕۆژێکدا هەمووی لەکەشتییەکان دابەزێت وکەرەستەکانی جەنگیش بخرێنەسەر زەوی، واتە لەشەوی(20–ی یۆلیۆدا هەموو یەکەسەربازییەکانی ناپلیۆن لەنزیك مارابۆ کەگوندێکی سەر دەریایی میسری بوو دابەزاند.

(2)

هەرکە ناپلیۆن جارێکیتر خۆی لەناو سەربازە بەئەمەکەکانیدا دییەوە ئیتر لەهیچ نەدەترساو هەلومەرجەکەش لەڕووی پێگەی سەربازییەوە لەباربوو، ئینجا یەکسەرە لەشکرەکەی خۆی بەرەو ئەلکسەندەرییە خستەڕێ، ئەوکات میسر لەژێر دەسەلاتدارییەتی عوسمانی هەژماردەکرا، بەلام لەڕاستیدا سەرانی دەسەلاتدار لەوێدا واتە(نی)بیەکان یەك سوپای سواری گەرۆکیان هەبوو وخاوەنی باشترین زەوی وزاربوون، ئەم ئەشرافە فیودالیانە باجیاندەدا بەپاشاکانی قستەنتینیەو لەژێر ڕکێف وگوێڕایەڵی ئەوان بوون، بەلام بەکردەوە زۆر گوێیان بەفەرمانەکانی قستەنتینیە نەدەدا، عەرەبەکان کەپیکهاتەی سەرەکیدانیشتوان بوون، خەریکی بازرگانی بوون ودەوڵەمەندی گەورەی تێدابوون، هەروەها خەریکی پیشەی مانیفاکتورەش بوون وئەوانی تریان خەریکی کاروان وباربەری وکشتوکاڵکردن بوون، قوتبییەکان، واتە پاشماوە ڕەسەنەکانی میللەتی ئەوخاکە کەلەپێش ڕزگارکردنی میسرەوە ئەمانە لەدەست عەرەبەکانی میسردا کەوتبوونە ژێر زوڵم وستەمیان، قوتبیەکان بەبەدبەختترین هاولاتی ئەو ولاتە هەژماردەکران، عەرەبەکان ناوی قوتبیەکانیان نابوو جوتیارو بەعەرەبە هەژارەکانیشیان هەردەگوت جوتیار، ئەم چینی کرێکار وجوتیارانە کەهەندێ کاسبکاریش لەدەوری یەکتری کۆببوونەوەو جۆرە پەیوەندییەکی هاوبەشیان هەبوو، چونکە هەموویان لەدەست دەستکورتی وهەژاری و زۆر وستەمدا یەکسان بوون، ولاتی میسر بەڕووکەش سەر بەدەسەلاتدارییەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو، ناپلیۆن بۆ ڕزگارکردنی ئەوخاکە هاتبوو وچەندین جار دووپاتی دەکردەوە کەشەڕی لەگەڵ پاشادانییەو تەنها دەیەوێت ئاشتی لەنێوان ئەوانەدابکات، هەر بۆئازادکردنی عەرەبەکان هاتووە کەلەژێر زوڵم وزۆری خاوەندارییە دەسەلاتدارە فیودالەکاندا دەناڵێنن و ئەمانە توندوتیژیان لەسەر میللەت زۆرە.

باسی قوتبیەکانی نەدەکرد، سەرەتا هێرشی کردەسەر شاری ئەلکسەندەرییە کەئەوکات شارێکی پڕ جموجۆڵی بازرگانی وئاوەدان بوو ولەماوەی چەند سەعاتێکدا خستیەژێر ڕکێفی خۆی، هەرچەندە ئەوەی دووپات دەکردەوە کەدەیەوێت گەلی میسر لەدەست زۆرو ستەم ڕزگار بکات، بەلام دەسەلاتداریەتی حوکمڕانی فەرەنسای بەسەر ئەوشارەدا سەپاند، ناپلیۆن بەشێوازی جۆراوجۆر قەناعەتی بەعەرەبەکان دەکرد کەئەو ڕێز لەقورئان وئیسلام دەگرێت، بەلام ئامۆژگاری ئەوەی دەکردن دەبێ سەربزێوی و سەرپێچی نەکەن، دەنا توندترین سزادەدرێن، دوای ئەوەی ناپلیۆن چەند ڕۆژێکی لەئەلکسەندەرییەدا بەسەربرد بەرەو خواروو کەوتەڕێ ولەپانتایی بیاباندا دیارنەما، یەکە سەربازییەکانی ئەو لەگەرماو بێ ئاویدا کاتیان بەسەردەبرد، کاتێ گوندنشینەکان ئەو سوپایەیان دەبینی لەترساندا لەماڵەکانی خۆیان هەڵدەهاتن وپیسی وژەهریان لەبیری ئاوەکانیاندەکرد، دەسەلاتدارانی دەوڵەت وردەوردە پاشەکشەیان دەکردو جارجارەش هێرشیان دەکردەسەر لەشکری



فەرەنسی ودواتر هەڵدەهاتن، سەرئەنجام لەڕۆژی(20-ی یۆلیۆی ساڵی-1798)دا لەنزیك ئەهرامەکانی میسر ڕوویەڕووی هێزە سەرەکییەکەی شانشینی میسر بۆوە، ناپلیۆن پێش شەڕکردنەکە بەسەربازەکانی خۆی گوت: چل سەدە مێژووی ئەوئەهرامە سەرکەشانە نیگەرانی ئێوەیە.

شەڕەکە لەنێو ماڵەکانی گوندی ئانبابەو ئەهرامەکان دەستی پێکرد، هێزەکەی میسری تێشکان وبەشێك لەتۆپخانەکانی خۆیان لێجێما کەنزیکەی (40) تۆپ بوون، بەرەو خواروو هەڵاتن، چەند هەزار کەلاکیان لەدوای خۆیان جێهێشت، دوای ئەم شەڕە یەکسەر ناپلیۆن قاهیرەی داگیرکرد، دانیشتوانی ئەوشارە ترسیان لێنیشتبوو وبەبێ دەنگی وکش وماتیەوە ملیان بۆ لەشکری فەرەنسانا، خەڵکی ئەوشارە هەرگیز ناوی ناپلیۆنیان نەبیستبوو، تەنانەت نەیاندەزانی ناپلیۆن کێیەو بۆچی هاتووەو شەڕی لەگەڵ کێدایە.

شاری قاهیرە لەئەلکسەندەریە دەوڵەمەندتربوو، ناپلیۆن هەندێ خۆراکی باشی بۆسوپاکەی دابینکرد، چونکە سەربازەکان لەشەکەتی ئەوسەفەرە دوورودرێژە شەپرێوببوون، خەڵکی ئەوشارە زەندەقیان چووبوو، بۆیە ناپلیۆن لەگوتەیەکیدا بۆخەڵك کەبۆ زمانی عەرەبی تەرجەمە دەکرایەوە، داوای لەخەڵککرد ئارامبن، بەڵام لەهەمان ئەوکاتانەدا فەرمانی دابوو گوندی(عەلقەم ) کەکەوتبۆ نزیك قاهیرەو بەگومانی ئەوەی دانیشتوانی ئەو گوندە چەند سەربازێکی فەرەنسیان کوشتووە، بۆ دەرسدارانی کەسانیتر، گوندەکە تالان وبڕۆکراو سەربازە فەرەنسییەکان ئاگریان لەماڵەکان بەردا، ئەمەش زیاتر عەرەبەکانی زراو بردووترکرد، ناپلیۆن لەم جۆرە بڕیارە دڕندانەیە نەلەئیتالیاو نەلەمیسرو نەشەڕەکانی دواتریشی دوودڵی نەبوو وئەمەبە ڕەوشتێکی سیاسی تایبەت بەئەو هەژماردەکرا، سەربازەکانی ئەو بەچاوی خۆیان دەیانبینی چۆن ناپلیۆن خۆشی دەوێن وهەر کەسێك دەست لەئاستی ئەواندا بەرزبکاتەوە، ناپلیۆن توندترین سزای دەدات بۆبەرگریکردن لێیان.

هەرکە ناپلیۆن لەقاهیرەدا جێگیربوو جۆی خەریکی ڕێکخستنەوەی ئیداریکرد، من لێرەدا نامەوێت باسی وردەکارییەکانی ئەمەبکەم، چونکە زۆر پێویست نییە، بۆیە سەرەکی ترین لایەنی سیستمی ناپلیۆنی دەخەمەڕوو:

یەکەم: دەبوا لەهەموو شارو شارۆچکەو گوندێکدا دەسەڵات لەژێر دەستی فەرماندەی سەربازگەکانی فەرەنسیدابا.

دووەم: لەگەڵ فەرماندە فەرەنسییەکاندا لێژنەیەك لەکەسانی میسری کەلەلایەن خۆیەوە هەڵدەبژێردران و جێگای متمانەی ئەوبوون هەبوو بۆمشوەرتکردن.

سێیەم: دەبوا مەزهەبی ئیسلام تەواو ڕێزی لێگیراباو مەلاو مزگەوتەکان پارێزراوبان.

چوارەم: دەبوو لەقاهیرەشدا ئەنجومەنێك کەپێکهاتبوو لەنوێنەرانی ئەوشارەو شارەکانیتر هەبێت ولەژێر دەسەڵاتداریەتی فەرماندەی گتشی سوپادابا: واتە خۆی.

هەروەها دەبوو خەراج و باجی دەرامەت بەجۆرێ داهاتی هەبێت خەرجی سوپای فەرەنسی دابین بکات، بۆئەمەش سەرانی ناوخۆیی یارمەتی ئەنجومەنەکەیان داباو پارێزگاری لەبازرگانی وملکداریەتی تاکە کەسەکان کرابا، هەموو ئەو دەرامەتەی کەخاوەن زەوییەکانی ناوخۆ لەجوتیارانیان دەستاند لابرا، ملك ومالی(نی)یە یاخی بووەکان کەبەرەو خوارووی وڵات هەڵاتبوون وشەڕیاندەکرد، بووبە ملکی خەزنەی دەوڵەتی فەرەنسی ودەستیان بەسەرداگیرا، ناپلیۆن دەیوسیت وەك ئیتالیا



شانیشینی تایفی دروستبکات ، ئەمە زۆر شتێکی باشبوو، چونکە هەرئەو خاوەنداریيەتیانە شەڕیان دژی سوپای فەرەنسا دەکرد.

ئەو دەیویست پشت بەبرژوازی وخاوەن ملکە عەرەبەکان ببەستێت، بەڵام سەبارەت بەچینی جوتیار کەبرژوازی وخاوەن زەوییەکان دەیانچەوساندنەوە، ناپلیۆن هیچ کاتێ ئامادەنەبوو پارێزگاریان لێبکات و لەسێبەرێ خۆیان گرێت، هەموو ئەو پێداویستیانەی بۆ حوکمکردنی دیکتاتۆرێك زەمینەیان بۆ خۆشکرابوو، گرتبوویە دەست خۆی وببووە گرێنتی بۆ رێکخستنەوەو درێژەدان بەسیستمی برژوازی، پێویستە ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کەئەو پارێزگاریکردنەی ناپلیۆن لەئاینی ئیسلام، تەنانەت گەیشتە ئاستێ ئەنجومەنی کەشیشەکانی ڕوسی بەیانێکی بوێرانەیان دەرکردوو لەدەقەکەیدا ناپلیۆنیان بەدژی مەسیح هەژمارکردبوو وئەو پارێزگاری کردنەی ئەو لەمیسریشدا بەبەڵگەی ئەمە هێنابۆوە، دوای ئەوەی ناپلیۆن دەسەڵاتی خۆی وسیستمی سیاسی نوێی بەسەر میسردا سەپاند، خۆی بۆ ئامادەکردنی شەڕێکیتر دەپێچایەوە، ئەویش داگیرکردنی سوریا بوو.

بڕیاریدا ئەو ئەندێشمەندانەی لەفەرەنساوە لەگەڵخۆیدا هێنابوونی لەمیسر جێیان بێڵێت، ناپلیۆن زۆر ڕێزی بۆ زاناو داناکانی ڕۆژگاری خۆی دانەدەنا، بەڵام ئاگاداری ئەو بیرۆکە سیاسی وئابووریی و سەربازییانەی کەشارەزایان دەیانسختەڕوو هەبوو، بۆیە ئەو ئەندێشمەندانەی بۆ ئەم سەفەرە لەگەڵخۆیدا هێنابوون، زۆر بەوریاییەوە چاودێری دەکردن، هەتا لەوگوتە بەناوبانگەی کەبەزمان ئەوەوە بڵاوبۆتەوە ،گوایا لەسەرەتای شەڕێکی لەگەڵ پاشایەکدا گوتویەتی(کەرو بیرمەندەکان بخەنە ناوەندەوە[□□] بەم جۆرە ناپلیۆن گیانی بیرمەندەکانی دەپاراست وەك چۆن چوارپێ بارکێشەکان کەلەکاتی شەڕا گرنگییەکی یەکجار زۆریان هەیە، دیارە ئەم گوتەیە(چوارپاو ئەندێش مەندان) پێکەوە گوتنی ناشایستەیە، بەڵام لەگوتەی سەربازیدا کورتکردنەوەی ڕستەی فەرمانە، جێگای ئاماژە بۆکردنە هێنانی ئەوزانایانە لەلایەن ناپلیۆنەوە بۆمیسر، بووە هۆی ئەوەی دەروازەکانی ئەو سەرزەمینە دێرینەو ئەم شارستانیەتیەی کەلانکەی مرۆڤایەتییە بەڕووی زانستدا بکاتەوە.

(3)

هەتا پێشئەوەی لەکشرکێشی بکاتەسەر سوریاش، زۆرجار ناپلیۆن دەگەیشتە ئەوڕایەی عەرەبەکان بەهیچ جۆرێك دڵیان بەودروشمانەی (ئازادی لەچنگ سیستمی پاشایەتی) خۆشنەبووە کەچەندین جار ناوبراو لەگوتارەکانیدا دەمی لەمە دەکوتا، فەرەنسییەکان بەهۆی دانانی ئەو ڕەوشە کاریگەرەو لەهەمان کاتیشدا گرتنی باجی زۆر لەدانیشتوان، ئازوقەیەکی زۆریان کۆکردبۆوە، بەڵام پارە بەهەمان ئاسانی بەدەست نەدەهات، بۆیە بۆئەو مەبەستە ڕێگای تریان گرتەبەر، ژنرال کلیبر کەناپلیۆن بەفەرماندەی گشتی شاری ئەلکسەندەریەی دانابوو، فەرمانیدا سەید محمد الكريم، کەموفتی پێشووی ئەوشارەو زۆریش دەوڵەمەندبوو بەبەهانەی خیانەتکردن لەفەرەنساو لایەنگری شانشینی دەستبەسەریکردو ناردیان بۆ قاهیرەو بەئەویانگوت، ئەگەر دەتەوێت گیانی خۆت ڕزگاربکەیت ئەوا دەبێت (300) هەزار فرانکی زێڕ بدەیت، لەبەدبەختیدا سید محمد الكريم باوەڕی بەچارەنوس قەدەرهەبوو وگوتی: ئەگەر چارەنوسم ئەمەی لێنوسرابێ لەوسەعاتەدا بمرم، هیچ شتێك



ناتوانێت ڕزگارمبكات، من پارەی خۆم لەبەلاش نادەم، ئەگەر چارەنوسیش وابێ بەزیندویی بمێنمەوە لەم حالەتەشدا بۆپارەی خۆم بدەم؟

ناپلیۆن فەرمانیدا سەری لەلاشەی جیابكەنەوەو تەرمەكەی لەبەرزاییەكی قاهیرەدا بەدار هەڵواسن و لەتەكیدا بنووسن (ئەمەیە سزای خائینەكان وپەیمان شكێنەكان).

هەموو ئەشراف ودەوڵەمەندەكان داوایان لەسەرداری فەرەنسی كرد تەرمی محمد الكریم بنێژرێت، بەڵام كەڵكی نەبوو، بۆیە سەرئەنجام دەوڵەمەندە عەرەبەكان تەواو زەندەقیانچوو وهەرچی داوایان لێكرابا دایانداو لەماوەی چەند ڕۆژێكدا (4) ملیۆن فرانكی زێڕ كۆكرایەوەو خرایە سندوقی سەربازی فەرەنسی لەكۆتایی مانگی ئۆكتۆبەری ساڵی (1798 )دا ڕاپەڕینێكی جەماوەری لەقاهیرەدا ڕوویداو چەند سەربازی فەرەنسی كوژران وئەوانە بۆماوەی سێ ڕۆژ لەناو كۆڵانەكانی شاردا بەرگریان لەخۆیانكرد، سەركێشتییەكی زۆر ترسناكبوو، جگەلەوەی ئەو جوتیارانەی لەسەركوتكردنی ڕاپەڕینەكەدا كوژران، تاچەند ڕۆژێك دەستە دەستە (12) تا ( 30) كەس لەدەستبەسەرەكانیشیان دەهێنان ودەیانكوشتن.

ڕاپەڕینی قاهیرە لەناو شارۆچكەو گوندەكاندا دەنگی دایەوە، لەگوندەكانی نزیك قاهیرەش ڕاپەڕین دەستی پێكرد، هەركە ناپلیۆن بیستی ڕاپەڕین بەرپابووە دەستبەجێ فەرمانی بە(كروازیە )[65] دا بۆ شوێنی ڕووداوەكە بچێت وئەو گوندانە ئابلۆقەبدات وپیاوەكان بەشمشێر ملیانبپەڕێندرێت وژن و منداڵەكانیش بەدیل بگرن وبۆ قاهیرەیان بهێنن وماڵەكانیشیان بسوتێنن.

ئەو فەرمانەی ناپلیۆن بێ كەموزیاد جێبەجێكرا، هەندێك لەوژن و منداڵانەی كەبەزۆر ناچاركرابوون ڕێگایەكی دووروودرێژ بەپێ ببڕن لەڕێگادا گیانیان لەدەستدابوو، چەند كاتژمێرێك دوای ئەوكوشت و كوشتارە، چەندین گونییەیان لەوڵاخان باركردبوو وهێنایان بۆ گۆڕەپانی گەورەی شاری قاهیرەو گونیەكانیان كردنەوەو كەللەسەری پیاوەكانی ئەو گوندە یاخیانەیان هەڵڕشتن، بەپێی گوتەی گەواهی بینینی ئەو ڕووداوە، ئەم كردەوە بێ بەزەییە تاماوەیەك خەڵكی چاوترساو تۆقیوكرد، لەوكاتەدا دەبوا بۆناپارت دووشتی مەترسیدار لەبەر چاوبگرێت:

یەكەم: مانگێ دوای هاتنی بۆ میسر، هێزە دەریاییەكانی نلسن، لەكەنداوی ئابوقیردا هەندێ كەشتی جەنگی فەرەنسی تێكشكاندبوون وفەرماندەی دەریایی فەرەنسی بەناوبانگ( بروئس)یش لەو شەڕەدا كوژرابوو وپەیوەندی نێوان ئەو وسوپایەی كەلەمیسردا دەجەنگی بۆماوەیەكی زۆر لەگەڵ فەرەنسادا نەما.

دووەم: ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئیتر باوەڕی بەو پروپاگەندەیەی ناپلیۆن نەمابوو كەدەیگوت ئەوشەڕی لەگەڵ (باب عالی)دا نییەو تەنها بۆئەوە هاتووە بۆ میسر تامیرنشینەكان تەمبێ بكات بەوەی هەڵسوكەوتی خراپیان لەگەڵ بازرگانەكانی فەرەنساداكردووە، بۆیە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەشكرێكی توركی ڕەوانەی سوریاكرد، ناپلیۆن بۆشەڕكردن لەگەڵ لەشكری توركیدا بەرەوسوریا كەوتەڕێ، ئەوبۆ زامنكردنی پشتی خۆی تەنها باوەڕی بەزەبرو زەنگ هەبوو وبەباشترین ڕەوشی دەزانی، شەڕی سوریا بەتایبەت بەهۆی كەمی ئاوەوە زۆر دیژواربوو، شارەكان یەك لەدوای یەك تەسلیمی ناپلیۆن دەبوون، یەكەم شار

---

65 - كروازی: ناوی فەرماندەیەكی سەربازی سوپاكەی ناپلیۆنە.(و- كوردی)



کەخۆی دابەدەستەوە شاری (العریش )بوو، دوای تێپەڕینی سوپای فەرەنسا لەشێوە دورگەی سویس هێرشی کردەسەر شاری (یافا )و لە(14–ی مارسی ساڵی (1799)دا گەمارۆی ئەوشارەدرا، بۆماوەیەك شاری یافا خۆی نەدابەدەستەوەو ناپلیۆن پەیامێکی بۆئەوشارە ناردوو گوتی: باشتر وایەبەڕێگای خۆشی خۆیان بدەن بەدەستەوە، دەنا ئەگەر لەڕێگای سەربازییەوە دەست بەسەر شارەکەیاندا بگیردرێت ئەو هەموویان دەکوژرێت، لەگەڵ ئەوەشدا شاری یافا تەسلیم نەبوو، لەڕۆژی(16–ی ئیبریلدا، ناپلیۆن فەرمانی هێرشکردنی دەرکردو هەرکە سەربازەکان چوونە ناوشارەوە دەستیانکرد بەتاڵان وبڕۆو کوشتن و قڕکردنی هاوڵاتیان وهەر کەسێکیان دەست کەوتبا ملیان بەشمشێر دەپەڕاند، هەرکە تاڵان و کوشت و کوشتاری شار تەواوبوو وکەمێ هێوربۆوە، هەواڵیان بەناپلیۆندا نزیکەی (4) هەزار سەربازی تورك کەلەپەشە کوژیەکەدا ڕزگاریان بووەو زۆرینەشیان خەڵکی لوبنانن لەشوێنێکدا سەنگەریان بەچواردەوری خۆیانداکردووەو بەرگری دەکەن، کاتێ سەربازەکانی فەرەنسا داوایان لێکردوون خۆیان بدەن بەدەستەوە ئەوانە لەوەڵامدا گوتویانە بەمەرجێ خۆمان تەسلیم دەکەین کەپەیمانمان بدەیێ نامانکوژن، ئەگەرنا تادوایین دڵۆپەی خوێنمان بەرگری لەخۆمان دەکەین، فەرماندە فەرەنسییەکە پەیمانی پاراستنیانی پێدابوون ودوای ئەمە سەربازەکان هاتوونە دەرێو چەکەکانیان لەسەر زەوی داناوەو دواتر سەربازە فەرەنسییەکان دیلەکانیان لەعەمبارێکدا زیندانی کردوون، کەناپلیۆن ئەمەی بیست زۆر تورەبوو، بەڕای ئەو پەیماندان بەو سەربازە تورکانە کارێکی سەرشێتانەبوو وگوتی: ئاخر من چی لەمانە بکەم؟ ئازوقەم هەیە بیدەمە ئەمانە– یان کەشتی هەتا ئەوانە ڕەوانەی میسر– یان فەرەنسایان بکەم؟ ئەوە چ چەپکە گوڵێکبووە کەبۆم بەئاودادراوە[٦٦] ؟

لەڕاستیدا کەشتی نەبوو ئەم چوار هەزار تورکە بگوازێتەوە میسر، ناپلیۆن سەرەتا پلانە دڕندانەکەی خۆی هێشتەوەو دوای سێ ڕۆژ فەرمانیدا ئەم چوار هەزار سەربازە تورکە بکوژن، هەموو ئەو سەربازە دیلانەیان هێنانە لێوار دەریاو کێکرایان کوشتن..

یەکێك لەئەفسەرە فەرەنساییەکان دەڵێت: ئەوەی ئێمە بینیمان لەوکارەساتە، خوایە کەس نەیبینێت.

چەند ڕۆژێك دوای ئەمە ناپلیۆن هێرشی کردەسەر قەڵاتی (ئاکر) یان وەك فەرەنسییەکان دەڵێن قەڵاتی ( سن ژان داکر) تورکەکان بەوشوێنەیان دەگوت عکا، خاوەخاوکردن شتێکی گونجاونەبوو چونکە نەخۆشی تاعون هەڕەشەی لەسەربازەکانی فەرەنسایی دەکردو مانەوە لەشاری یافادا، کەتەرمی زۆر لەهاوڵاتیانی ئەو شارە لەماڵ وسەریان و ژێر زەمین وباغەکان و .. هیتردا بۆگەنیان کردبوو، مەترسییەکی گەورەی دروستکردبوو، گەمارۆدانی عەکا دوومانگ درێژەی کێشاو سەرئەنجام لەشکری فەرەنسا شکستی خوارد، ناپلیۆن تۆپخانەی قەڵات شکێنی نەبوو، ئەفسەرێکی بریتانی بەناوی سیدنی سمیس، فەرماندەیی عەکای دەکرد، بریتانییەکان لەڕێگای دەریاوە خۆراك وچەك وتفاقیان دەگەیاندە قەڵاتە سەربازییەکە.

سەربازی تورکیش لەوێدا ڕێژەکەیان زۆربوو، دوای چەند هێرش کردن، فەرەنسییەکان نائومێد بوون و لە(20–ی مایۆی ساڵی–1799)دا دەستیان لەگەمارۆدانەکەیان هەڵگرت، کەنزیکەی(3) هەزار سەربازیان تێداکرد بەقوربانی وبەرەو میسر گەڕانەوە، پێویستە لێرەدا ئەوە وەبیر بهێنینەوە، ناپلیۆن تادوا ڕۆژەکانی ژیانی داخ وکەسەری لەم تیشکانەی دەخوارد، عکا

---

[٦٦] –مەبەست لەو ڕستەیە ئەوەیە: ئەمە چ دیارییەکە بۆمنیان هێناوە.(و- کوردی)



دواخالی داگیرکردنی خۆرهەلات بوو کەچارەنوسی تەنها ئەوەندە رێگای پێدابوو، چونکە ناپلیۆن بەتەمابوو بۆماوەیەکی دووروردرێژ لەمیسردا بمێنێتەوە، فەرمانی بەئەندازیارەکانیدا لەوئەخشانە بکۆڵنەوە کەسەبارەت بەکەناڵی سویس لەکۆنەوە کراون و نەخشەی خۆشیان بۆئەو مەبەستە بکێشن.

هەموومان ئەوە دەزانین ناپلیۆن نامەیەکی بۆپاشا میسور[67] نارد کەئەو کاتە لەگەڵ بریتانیادا لەجەنگدابوو[68]، تێیدا پەیمانی یارمەتیدانی دابۆیە، دەیویست پەیوەندی لەگەڵ پاشای ئێراندا ببەستێت، هۆی تێکشکانی ناپلیۆنیش ئەوەبوو یارمەتی لۆجستی لەپشتەوەنەبوو وبەرەوپێشچوونیشی کێشەکەی ئاڵۆزتردەکرد، چونکە نزیکی مانگی یۆلیۆ ببوو و بەرگەگرتنی گەرمای ئەو ناوچایەش تاقەت پروکێن بوو، ناپلیۆن بۆ تەمبێ کردنی ئەوشوێنانەی کەلەسوریادا داگیری کردبوون، کوشتن وبرینی خەڵکەکەی بەشێوەیەکی درندانەکردوو دەستی نەپاراست، لەپاشەکشەکردنی ناپلیۆن وگەڕانەوەیدا بۆمیسر زۆر لەسەربازە فەرەنسییەکان توشی تاعون بوون وئەوانەی ئەم نەخۆشیەشیان دەگرت، جێیان دەهێشتن، بریندارەکانیشیان لەگەڵخۆیاندا دەبردن، بۆناپارت فەرمانیدا هەموو سەربازە سوارەکان ئەسپەکانیان بدەنە بریندارەکان، لەوکاتەدا مەیتەری تایبەتی ناپلیۆن گوتی گەورەم کام ئەسپی بەڕێزت بدەم بەبریندارەکان؟ بەو قسەیە ناپلیۆن توڕەبوو وبەو قەمچیەی لەدەستیدابوو تێی سرەواندو گوتی: بۆهەی کەر لەفەرمانەکەی من نەگەیشتیت گوتم: هەموو واتە منیش دەبێ بەپێ برۆم وئەسپەکەم بدە بەبریندارێك، برۆدەی لاچۆ لەبەر چاوم گومبە.

بۆیە سەربازەکانی ناپلیۆن لەبەر ئەم خەسڵەتانەی بوو کەئاوا خۆشیاندەویست ولەرۆژگاری پیریاندا هەمیشە دەمیان بەو میهرەبانییەی ئەو هەڵدێنایەوە، لەرۆژی(14–ی یۆلیۆی– 1799)دا لەشکری ناپلیۆن گەیشتەوە قاهیرە، ئێستا ناپلیۆن تەواو پشووی نەدابوو کەهەواڵی ئەوەگەیشت لەشکرێکی تورك هاتۆتە بەندەری ئەبوقیرو بەنیازە میسر ئازادبکات، لەدەست فەرەنسا، بۆیە ناپلیۆن یەکسەرە سوپاکەی بەرەو دلتای نیلی سەرو دەنگدا، لە(25–ی یۆلیۆدا هێرشی کردەسەر لەشکری تورك وتەفرو توناي کردن و(15) هەزار سەربازی تورکی لەناوبرد، ناپلیۆن فەرمانیدابوو هیچ کەس لەمانە بەدیل نەگیردرێت وبیانکوژن، ئەم لەم بارەوە بەم جۆرە نووسیویەتی(ئەمە یەکێکبوو لەوشەڕە جوانانەی کەبەدرێژایی تەمەنی خۆم نەمدیوە، لەچل هەزار سەربازی دوژمن تاکێکیان رزگاری نەبوو)

ئیتر سەرکەوتوویی فەرەنسییەکان بۆساڵانی داهاتوو تەواوجێگیربوو، ژمارەیەکی زۆرکەم لەسەربازەکانی تورك پەنایان بۆکەشتیە جەنگییەکانی بریتانیا بردبوو، چونکە تائەوکاتەش دەریا لەژێر کۆنترۆڵی بریتانیادابوو، بەڵام میسر رۆژ بەرۆژ زیاتر دەکەوتەژێر دەسەڵاتی ناپلیۆن.

لەو رۆژانەدا رووداوێکی چاوەروان نەکراو هاتەپێش کەکەس پێشبینی نەدەکرد، ناپلیۆن چەند مانگبوو پەیوەندی لەگەڵ فەرەنسادا پچرابوو، بەرێکەوت رۆژنامەیەکی بەردەست کەوت وتێیدا نووسرابوو لەوکاتەی ئەوخەریکی داگیرکردنی میسربووە، نەمساو بریتانیاو روسیاو شانشینی ناپول، هاوپەیمانیەکیان بەستووەو دژی فەرەنسا وەستانەوەو سڤۆرۆف[69] یش

---

67 – میسور: مەبەست لەفتحعلی پاشای قاجارە.

68 – لەسەر خاکی ئێستای باکوری هند، لەگەڵ بریتانیادا کەوتبۆشەڕ، واتە شای ئێرانی ئەوکات میسور.(و- فارسی)

69 – سڤۆرۆف: فەرماندەیەکی سەربازی روسی بەناوبانگە.(و- کوردی)



فەرەنسییەکانی لەئیتالیادا تێکشکاندووەو کۆماری سزالپین- یشی لەناوبردوەو ئێستا بەرەو کێوەکانی ئەلب لەبەرەوپێشچووندایەو هەڕەشەی جددی لەسەر فەرەنسا پەیداکردووە، لەفەرەنساشدا خۆپیشاندان وبێسەروبەرەیی حوکمڕانی دەکات ودیرکتواریش لەهەڵوەشانەوەدایەو بۆتەجێگای ڕق وکینەی زۆرینەی خەڵك.

ناپلیۆن دوای خوێندنەوەی ئەمە لەبەرخۆیەوە گوتی:

(ئەی قوڕبەسەران، ئیتالیاتان لەدەستداوە، بەری هەموو سەرکەوتنەکانی من بەفیڕۆچوو، پێویستە من دەستبەجێ بڕۆم) فەرماندەی گشتی لەشکری میسری دایە ژنرال کلیبرو فەرمانیدا بەنهێنی چوارکەشتی بۆ ئامادەبکەن، ئینجا (500) سەربازی هەلبژاردەی خستەناو ئەوکەشتیانەوە لە(23-ی ئۆگۆستی سالی-1799)دا بەنیازی فەرەنسا کەوتەڕێ، لەکاتێکا ناپلیۆن یەك لەشکری بەتواناو ئامادەو سیستمێکی ئیداری ومالی ڕێکوپێك، کەخۆی دروستی کردبوو ودانیشتوانێکی ملکەچ و تۆقیوی میسری لەدەستدابوو، دایەدەست فەرماندەیی کلیبرو بۆخۆی گەڕایەوە فەرەنسا.



( 18/ی برومری - 1799 )

(1)

ناپلیۆن بەکێشانی نەخشەیەکی پتەو وجێگیر بۆلەسەر کارلابردنی دیرکتوار و گرتنەدەستی دەسەڵات، لەمیسرەوە بەرەو فەرەنسا گەڕایەوە، هێرشکردنە سەر کۆماری وکۆتاپێهێنان بەوشۆڕشەی کەدەساڵ لەمەوبەر دەسەڵاتی گرتبۆوەدەست، هەرچەندە ئەو لەزۆر شوێنی وەك شەرەکانی تۆلۆن و واندەمیرو ئیتالیا ومیسر، گیانی خۆی خستبۆ مەترسییەوە، ئەو مەترسیانە زیاتر لەوکاتەدا بەدیاردەکەوت کەناپلیۆن میسری جێهێشت وبۆفەرەنسا گەڕایەوە، لەماوەی ئەو (47) ڕۆژەی کەناپلیۆن بەدەریای سپی ناوەڕاستدا گەڕایەوە، فەرەنسا زۆر مەترسی لەپێشەوەبوون جگەلە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای دەریایی بریتانیدا، بەپێی گوتەی ئەوانەی شاهیدی ئەمەبوون ناپلیۆن بەدرێژایی ئەو سەفەرە هێمن وپارێزگاری لەئارامی خۆی دەکرد، لەبەرەبەیانی ڕۆژی(8- ی ئۆکتۆبەردا کەشتییەکانی ناپلیۆن لەدەراوی مرەژوسدا لەنگەریانگرت، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونبوونمان لەڕووداوەکانی نێوان(8-ی ئۆکتۆبەر، کەناپلیۆن هاتە فەرەنسا هەتا(9)ی نۆڤەمبەری هەمان ساڵ: واتە: ئەو(30) ڕۆژەو گرتنەدەستی دەسەڵاتدارییەتی فەرەنساو ڕووخاندنی دیرکتوار، لێرەدا ئەو دۆخە کەمێ ڕوون دەکەینەوە کەلەو ماوەیەدا هاتبوونەپێش، دوای کودەتای(18-ی برومری، ساڵی پێنجەمی 1797 )ودەستبەسەرکردنی پیشگرو، واپێشبینی دەکرا باراس وهاوەڵەکانی ئەو بەپشتگیری کردنی ئەو هێزەی لەوڕۆژەدا لایەنگریان کردن، ئەم هێزانەش بریتی بوون.

یەکەم: لەشکری تازەی ملکدارەکانی شار کەبەفرۆشتنی سامانی میللی وحکومەت وکڵێساکان وپەناهندەکان دەوڵەمەندبیبوون، ئەمانە بەوەی زۆرینەبوون لەگەڕانەوەی بنەماڵەی بوربن دەترسان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەونیان بەبوونی یەك ڕژێمی جێگیرو بەتواناو درێژخایەنەوە دەبینی.

دووەم: بوونی لەشکرێك کەزیاتر سۆزو وابەستەییان لەگەڵ جوتیارەکاندا هەبوو وتەنها وێناکردنی گەڕانەوەی حکومەتی پێشو وسەرکوتکەر کەلایەنگری سەرۆك عەشیرەت وئەشرافەکانبوو، دەیتوانی ئەمانە لەباریەرێت و بۆ ڕاپەڕین هەڵیانگێڕێتەوە، بەڵام لەماوەی ئەو دووساڵەی کەلەنێوان کودەتای سبتمبەرو پایزی ساڵی (1799) بەسەرچوو، مەعلومبووکە دیرکتوار ئیتر پشتیوانی چین وتوێژەکانی کۆمەڵگای لەدەستداوەو برژوازی گەورەش خەونی بەیەك کەسی دیکتاتۆرەوە دەبینی کەبتوانێت بازرگانی بژێنێتەوە، پیاوێك گەشەبە پیشەسازی وبەرەوپێشچوونی بدات، پیاوێك ئاشتی سەرکەوتوانە بۆ فەرەنسا بهێنێتەدی ولەناو خۆی ولاتیشدا ئاسایش وقانون سالاربێت، تەنانەت وردە برژوازو گوندنشینەکان کەزەویان وەدەست کەوتبوو ودەوڵەمەند ببوون، هەروا بیریان دەکردەوە، بەلای ئەمانەی سەرەوە گرنگنەبوو دیکتاتۆر چ کەسە، گرنگ ئەوەیە لەبوربن-ەکان نەبێت، بەڵام کرێکارەکانی پاریس دوای ئەوەی بەکۆمەڵ چەککران وبەشێوەیەکی بێ بەزەییانە لەمانگی مایۆی ساڵی (1795)دا سەرکوتکران، دوای دەستبەسەرکردنی بابوف لەساڵی(1796)داو دواتر لەسێدارەدانی وگرتنیلایەنگرانی بابوف لەساڵی(1797 )و بینینی سیاسەتە چەوتەکانی دیرکتوار کەلایەنگرو پارێزەری بەرژەوەندی برژوازیەت ودزو خائینان بوون، ئەو کرێکارانە خەریکبوو لەبرساندا دەمردن و بێ کاریش تەواو تەنگەی پێهەڵچنیبوون وبژێوی ڕۆژانەیان بەنیوەناچڵیش دەستنەدەکەوت و وەك ڕۆژگاری پێش شۆڕشی کۆماری نەفرەتیان لەدزو سودخۆرەکان دەکرد، دیارە بەم حاڵە ئەو کرێکارانە ئیتر هیچ بەرگریەکی کەمیشیان لەدیرکتوار نەدەکرد، بەڵام ئەو



کرێکارانەی لەگوندەکانەوە ڕوویان دەکردە پاریس وشارەکانیتر هیچ دروشمێکیان نەبوو تەنها دەیانگوت (ئێمە حکومەتێکمان دەوێت نانمان بداتێ).

دەزگا پۆلیسییەکانی دیرکتوار ئەم ناڕەزاییانەیان بۆ سەروتری خۆیان بەرزدەکردەوەو بەڕاپۆرت دەیانگەیاندە کاربەدەستانی حکومەت، دیرکتوار هەرلەوکاتەی دەسەڵاتی گرتبۆدەست ئەوەی سەلماندبوو ناتوانێت سیستمێکی بۆرژوازی بەوجۆرە دابمەزرێنێت وبیخاتەژێر جێبەجێکردنی قانونییەوە، بۆ ماوەیەکی دووردرێژ بیهێڵێتەوە، دیرکتوار لەڕوێکی تریشەوە بێ توانایی خۆی وەدیارخستبوو، شەوق وچالاکی سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن لەئیتالیادا ورەی خستبۆدڵی پیشەکارانی ئاوریشم، واتە داگیرکردنی ئیتالیا مەوادەخامەکانی پیشەسازییەکەی ئەمانەی بێ دڕێغی خستبۆدەست ئەمانە، دوای گەیشتنی سڤۆرۆف بۆ ئیتالیا: واتە ساڵی (1799) جارێکیتر وڵاتی ئیتالیای لەدەست فەرەنسییەکان دەرهێنایەوە، پیشەکارانی مانیفاکتورە نائومێدیان لێنیشتەوە، تەنانەت ئەمە کاریگەری لەسەر هەموو بۆرژوازیەتی فەرەنسی جێهێشت، بەتایبەت ئەوکاتەی بینیان فەرەنسا کەوتۆتە پەرێشانی لەدەست هاوپەیمانە ئەورووپییەکان[70] ئەو ملیۆنەها فرانکە زێڕانەی ناپلیۆن لەساڵانی(1796–1797) لەئیتالیاوە بۆ حکومەتی فەرەنسی ناردبوو کەوتۆتەدەست، دزو سودخۆرەکانی دەوڵەت، تێشکانی فەرەنسییەکان لەبەرامبەر سڤۆرۆف لە(نووی)دا، کە(ژوبەر)ی فەرماندەی گشتی هێزەکانی فەرەنسا لەوشەڕەدا بەکوشتچوو، ئەمە بووەهۆی ئەوەی هاوپەیمانان هەڕەشەی جددی بخەنەسەر سەروەری فەرەنسا.

هەموو ئەم هۆکارانەبوون کەتوێژی بۆرژوازیەتی شارو گوندەکان بۆیەکجارەکی ڕووله دیرکتوار وەرگێڕن، بەڵام کەبمانەوێت باسی سوپابکەین، بێهودەییەکی سەخت دایگرتبوو، تەنانەت ئەو یادگارییەی کەناپلیۆن چووبوو بۆ میسر بەزیندویی مابۆوەو سەربازەکان بەئاشکرا هاواریاندەکردو سکاڵایان لەوەدەکرد، بەهۆی دزی کردنەوە کەببوە شتێکی گشتی، لەبرساندا هەڵدێن وبەردەوامیش دەیانگوت بەبێ هۆ بۆ کوشتارگامان دەنێرن، ڕاپەڕینی لایەنگرانی شانشینی کەتا ئەوکاتەش وەك ئاگری بن کایە دەسوتا، لەپڕ کڵپەی لێهەڵساو سەردارانی گروپی شوان[71] ، واتە جۆرج کادودال وفروتەو لاروس ژاکلن ، دووبارە لەولایەتەکانی بریتانی ونرماندی، ڕاپەرینیانکردبوو، لەهەندێك شوێندا لایەنگرانی شانشینی بوێرانە لەسەر بەرزایی وکێوەکاندا هاواریاندەکرد( بژی سڤۆرۆف، بمرێ کۆماری)[72]

لەو ڕۆژانەدا هەزاران سەربازی هەڵاتوو ئاوارەی زادگای خۆیان ببوون وبەسەرگەردانی مابوونەوە، بەهۆی باری خراپی ئیداری حکومەت وتەنگژەی بازرگانی وخراپی پیشەسازی، ڕۆژ بەڕۆژ گرانی زیاتر تینی دەهێناو باری سەختی ژیانی هاوڵاتیانی گرانتردەکرد، هەتا دوای ئەوەی (ماسنا)[73] لەپایزی ساڵی (1799)دا لەنزیك زوریخ لەشکری روسی تێکشکاند، کەلەژێر فەرماندەی کورساکفدابوو، دواتر لەشکرێکیتر لەژێر فەرماندەی سڤۆرۆفدا لەلایەن ئیمپراتۆریەتی روسییەوە نێردرا، ئەم سەرکەوتنەش کەمێ پارمەتی دریکتوارییەکانی نەداو نەتیوانی ئابڕووی ئەمانە بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی باروبۆخی ناوەڕاستی ساڵی (1799) کەفەرمانڕەوایی فەرەنسای دەکرد بخەینە بەرچاو ولەچەند ڕاستەیەکدا کورتی بکەینەوەو ئەم چەند خاڵەی

---

[70] – هاوپەیمانە ئەورووپییەکان: مەبەست لەئەڵمان وبریتانیاو نەمساو روسیایە... دەنا فەرەنساش بەشێکە لەوڵاتانی ئەورووپی.(و- کوردی).

[71] – شوان: کۆمەڵێ لەلایەنگرانی سیستمی شانشینی بوون ولەخۆرئاوای فەرەنسا، لەولایەتەکانی واندەو برتانی ونرماندابوون دوای شۆڕش کۆماری، ئەمانە دژی حکومەت یاخیبوون وراپەرینیانکردوەو یەکێ لەرابەرەکانی ئەمانە ناوی فروتە- یەو لەساڵی(1800)دا بەفەرمانی ناپلیۆن لەسێدارەدراوە.

[72] – مەبەست لەفەرەنسایە. (و- فارسی)

[73] –ماسنا: فەرماندەیەکی سەربازی فەرەنسییە. (و- فارسی)

خوارەوە دەخەینەڕوو: دیرکتوار بەلای زۆرینەی چینی دەوڵەمەندەوە ڕێکخراوێکی بێهودەو ناشایستەبوو وزۆر لەمانە مانەوەی دیرکتواریان بەزیان هەژماردەکرد، بەچینی چەوساوەشەوە، دیکرکتوار نومونەی حکومەتی دزو ملنەستورو سود خۆرانبوو، ڕژێمی دزو جەردەکانی بردنی سامانی دەوڵەتبوو، حکومەتێکی ستەمکەرو قۆڕبوو سەبارەت بەکرێکارو دەستکورتەکان، بەلام لەتێڕوانینی سەربازەکانەوە، دیکرکتوار دەستەیەك کەسی ڕەزیل وگومانلێکراوبوون کەئەمان بێ پێلاو ونان دەهێڵێتـەوە، ئەوەی ناپلیۆن لەماوەی چەند مانگێکدا بەدەستی هێناو داگیریکرد کەوتەوە دەست دوژمن، ئیتر لێرەوە زەمینە لەباربوو بۆدیکتاتۆری.

(2)

لەڕۆژی(13-ی ئۆکیۆبەری ساڵی (1799)دا دیرکتوار نامەیەکی بۆ ئەنجومەنی (500) کەسی نـاردو تێیـدا نووسـرابوو، بەوپەڕی شادییەوە پێتان ڕادەگەیەنین کەناپلیۆن بۆناپارت گەڕاوەتەوە فەرەنساو لە(مرەژوس) لەکەشتی دابەزیوە، لەنێوان تۆفانێك لەچەپڵەڕێزان ودەربڕینی شادی وهات وهاواری پڕمۆنجاو، هەموو نوێنەرەکانی میللەت کەبەپێوە ڕاوەستابوون، ئەم گەڕانەوەی ژنرال ناپلیۆنیان بەهاواری شادی دەربڕی و پیرۆزباییانکرد، کۆبوونەوەکەی (پەرلـەمان) دواخـرا، ئـەو ئەنـدام پەرلەمانانەی کەوتبوونەسەر شەقامەکانی ناوشار هەموویان ئەو هەواڵەیان بڵاودەکردەوە، بەپێی گێرانەوەی ئەوکەسانەی لەوڕۆژگارەدابوون، بەپر شاری پاریس لەخۆشیاندا، (دیوانە)[٧٤] وشەیدای ئەو ناوەبوو، لەسەر شانۆکان لەهۆڵەکاندا لەسەر شەقامەکاندا جگەلەناوی ناپلیۆن هیچی ترت گوێلێنەدەبوو، هـەواڵی ئـەوەی کـەهاولاتیانی خـواروو ناوەڕاستی فەرەنسا پێشوازی شکۆمەندانەیان لەناپلێۆن کردبوو، پەیتاپەیتا دەگەیشتە پاریس، جوتیارەکان کارەکانیان جێدەهێشتو بـەپیر ناپلیۆنەوە دەچوونو وەك باشترین سەردارێ کۆماری سڵاویان لێدەکرد.

هیچ کەس تەنانەت خودی ناپلیۆنیش وێنای ئەوەی نەدەکرد پێشوازی ئاوا پڕشکۆ ومەزنی لێبکرێت و ئەو هەموو هاوڵاتیانە ڕاخزێن، لەمەش سەیرتر کاتێ لەپاریسدا هەواڵی گەیشتنەوەی ناپلیۆن بۆسەر خاکی وڵات بڵاوبۆوە، سەربازی پادگاکـانی پایتەخت، لەسەر بازگەکەنیان هاتبوونەدەرێو بەڕێورەسمی سەربازیو بەلێدانی مارشی سەربازی ڕژابوونەسەر شەقامەکانی شار، بێ ئەوەی مەعلومبێت کێ فەرمانی بەئەوانە دابوو- یان ئایا فەرمانی لەوجۆرە دراوە- یان ئەم سەربازانە لەخۆیانەوە دەستپێشخەری ئەوەیان کردووە؟

لە(14-ی ئۆکتۆبەردا ژنرال ناپلیۆن بۆناپارت گەیشتەوە پاریس، تەمەنی دیرکتوار کەمتر لەسێ هەفتەی بەبەرەوەمابوو، بەلام نەباراس کەمەحکوم بەمەرگی سیاسی بوو، نەلێپرسراوانی تری دیرکتوار، کەدواتر یارمەتی ناپلیۆنیاندا بـۆ ناشـتنی ڕژێمەکەی خۆیان، لەوکاتانەدا پێشبینی ئەویان نەدەکرد کۆتاییان ئەوەندە نزیکبۆتەوە ومەسەلەی هاتنەسەرکاری ڕژێمی سەربازی نەك هەفتە بەڵکو ڕۆژو سەعاتی ماون.

---

[74] - دیوانەبوو: مەبەست لەوەیە لەخۆشیاندا بێ سەروبەربی روویداوبوو بەشادمانی هەرمەکی شەیدایانە).
(و-کوردی)



هاتنەوەی ناپلیۆن لەخوارووی وڵاتەوە هەتاپاریس، بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەوەی نیشاندەدا کەهەموولایەك بەچاوی رزگارکەر سەیری دەکەن، لەهەموو لایەکەوە دروشم کێشان‌و گوتارو دەمەتەقێ لەسەر باس‌و خواسی ناپلیۆن بوو، شارو گوندنشینەکان بەوپەری شەوق‌و زەوقەوە بۆ سەردان‌و دیداری ناپلیۆن دەچوون، سەربازو ئەفسەرەکان بەتامەزرۆیی‌و شەیداییەوە پێشوازیان لەسەردارەکەی خۆیان دەکرد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاتی ئەوەنەهاتبوو ناپلیۆن تەواو لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیابێت، چونکە دەبوا زانیاری لەسەر بارودۆخی پایتەخت ورای گشتی شارهەبوایە، سەربازگەکانی پاریس کەتازە میسری داگیرکردبوو وبەسەربەرزی‌و سەرکەوتویی گەڕابۆوە، شانازیان دەکرد، واتە ئەوسەردارەی کەسیستمی شانشینی میسری تێکشکاندبوو ولەشکری تورکی تەفروتونا کردبوو، ئەوسەردارەی پێش ئەوەی بگەڕێتەوە وڵاتەکەی دواین زەبری سەربازی خۆی لەدوژمنان وەشاندبوو، بەوپەری شکۆمەندییەوە پێشوازی لێکرا، ناپلیۆن هەستی کرد لەچینی سەرەوەی کۆمەڵگادا، بەتایبەتی پاڵپشتێکی توندو تۆڵی هەیە، هەرلەو ڕۆژانەدا ئاشکرابوو کەچینی بۆرژواو دەوڵەمەندە تازە پێگەیشتووەکان لەدیرکتوار بێزارن‌و دژو ناکۆکن، چونکە لەبەڕێوەبردی سیاسەتەکمانی ناوخۆ ودەرەکیدا بەناشایستەو بێ توانایان دەزانین، هەروەها لەناخی دڵیشیانەوە لەلایەنگرانی سیستمی شانشینی دەترسان، بەڵام لەهەموو ئەمانە زیاتر لەچینی کرێکار زەندەقیان چووبوو کەدیرکتوار تازە زەبرێکی تری لێوەشاندبوونەوە. بۆ ڕوونەکردنەوەی زیاتری ئەمە پێویستە ئاماژە بەوەبکەین لە(13–ی ئۆکۆستدا، سیەیس[٧٥] ، لەسەر خواستی بۆرژوازیەت، دواین سەنگەری لایەنگرانی ژاکۆبن [٧٦]ییەکانی لەناوبرد، واتە:(کۆمەڵەی لایەنگرانی ئازادی‌و یەکسانی) ئەویش بەهەڵوەشاندنەوەی هەردوو ئەنجومەنی پیران‌و پەرلەمان کەئەمانە لەودوو ئەنجومەنەدا کەپێکهاتبوو لە(5) هەزار ئەندام، نزیکەی (250) کورسیان هەبوون.

بەوەی ناپلیۆن لێوەشاوەترین کەس بوو کەبتوانێت مەترسی راسترەو وچەپڕەوەکان، بەتایبەت چەپەکان دووربخاتەوەو ڕێگریانبکات، ئاشکرابوو لەوپێنج ئەندامەی دیرکتوار تەنانەت یەکێکیان ئامادەنەبوو ولەتوانایدانەبوو ئەگەر ناپلیۆن کودەتای کردبا، ئەوان بچوکترین بەرەنگاریان کردباو لەدەستیش هاتبا، کەسایەتی سوکەڵەی وەك : گوهیە ومولن‌و روژەدوکو، هەتا لەگەڵ یەکتریدا ناکۆك بوون‌و هیچ دەسەڵاتێکیشیان نەوو، ئەوانەیان تەنها بۆئەوە کردبۆ ئەندامی دیرکتوار هەتا لەهەندێ بڕیاردا کەسیەیس‌و باراس دەریاندەکرد، ئەمانە نەوێرن بڵێن لەل ورای خۆشیان دەربڕن.

لەسەر ئەم بنەمایە تەنها سیەیس‌و باراس دەمانەوە. سیەیس کەلەسەرتای شۆرشدا کتێبێکی بەناوبانگی لەسەر چینی سێیەم[٧٧] بڵاوکردەوە ناوبانگی دەرکردبوو، لەراستیدا ببووە بیرمەندو نوێنەری چینی بۆرژوازی فەرەنساو تائەوکاتەش هەمان ڕۆڵی هەرمابوو.

---

[75] - (ئامانوئل جوزێف -(1748 – 1836) کەشیش‌و سیاسەتمەداری بەناوبانگی فەرەنسییەو خاوەن تیۆرێکی بەناوبانگەو دامەزرێنەری کلوپ ژاکوبنەکانەو ئەندامی ئەنجومەنی دامەزرێنەران بووە لەکنوانسیون‌و ئەنجومەنی (500)کەسی، دواتر لەدیرکتوار جیابۆوەو لەسەردەمی حکومەتی کنسولیدا یەکێ بووە لەسێ کنسولەکان‌و ئەندامی ئاکادیمیای فەرەنساش بوو.(و- فارسی)

[76] - لایەنگرانی ئازادی‌و یەکسانی (مەبەست لەکۆمۆنیە – چەپەکان).(و- فارسی)

[77] - چینی سێیەم: چینێکی -خەڵکی ئاسایی بوون کەدوای ئەشرافەکان‌و روحانیەکان – بڕیاریان بەدەست دەکەیشت، دوای شۆرشی کەورەی فەرەنسا، واتە ئەنجومەنی ئەشراف‌و رۆحانیەکان‌و چینی سێیەم بووبە ئەنجومەنی میللی– ئەنجومەنی(کنوانسیون)(و- فارسی)



لە(9–ی ترمیدوردا [78] ئەو بەهاوەڵی چینی برژوازی، دیکتاتۆریەتی شۆڕشی ژاکۆبنیەکانی بەرگەگرت ولەگەڵ هەمان چیندا لەناوچوو ولەمانگی ئایاریشدا دیکتاتۆرانە دژی شۆڕشی چینی سێیەم وەستایەوەو بەشداری لەسەرکوتکردنیانداکرد، هەرچەندە ئەو یەکێکبوو لەو پێنج ئەندامانەی دیرکتوار، بەڵام دیراکتواری بەناشایستەی دەزانیو هەموو ئومێدێکی بەگەرانەوەی ناپلیۆن بوو، لەهەمان کاتیشدا لەتێروانینی چۆنیەتی کەسایەتی ناپلیۆندا بەهەڵەداچووبوو ودەیگوت (ئێمە پێویستمان بەشمشێرێکە) بەساویلکانەش وایدەزانی ناپلیۆن دەبێتەهەمان ئەو شمشێرەی ئەو وێنای دەکاتو بۆخۆی دەبێتە سەرۆکی رژێمەتازەکە، ئیستا لامان روون دەبێتەوە ئەوبەهەڵەداچوونە بۆ سیەیس چ ئاکامێکی لێدەکەوێتەوە.

بەڵام سەبارەت بەباراس، ئەو پیاوێکبوو لەکانزایەکی ترو کەسایەتییەکیترو بیرکردنەوەیەکیتر، کەزۆر جیاوازی لەگەڵ سیەیسدا هەبوو.

بێ گومان بارس لەسیەیس ژیرتربوو، چونکە ئەو وەك سیەیس خۆی بەکەسێکی لەخۆرازیو خۆبەزلزانو سیاسەتمەدار نەدەزانی.

باراس ئەو ئەفسەری پێش شورشو ئەندامی حزبی مونتانیابوو، لەسەردەمی شۆڕشدا پیاوێکی بوێرو بەدرەوشتبوو، کەسایەتییەکی سەرچڵو دەستی لەرابواردنو تاوانکردن نەدەپاراستو سنووری نەبوو، ئەو یەکێ بوو لەکودەتا چییەکانی پەرلەمانو رووداوەکەی(9–ی ترمیدوری) ئەندامی باڵای حکومەتی کۆنەپەرستی ترمیدوریو بەڕێوەبەرو میکانیزمی سەرەکی رووداوەکەی(18–ی فروکتیدوریش[79] بوو.

هەمیشە لایەنگری بەکارهێنانی هێزو دەستکەوتی ماددی بوو، بەپێچەوانەی ئەوانیتر بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی سڵی لەسەرەنێزەش نەدەکردەوە، چونکە پێش (9–ی ترمیدریش بەڕێکخستنی هێرش کردنەسەر روبسپیر ئەوەندە تەردەستبوو ودەیزانی لە چ ساتەوەختێکدا هێرش بکاتەسەر دوژمن، هەروەها دووساڵ دواتریش هەر ئەو ئازایانە هێرشی کردەسەر لایەنگرانی سیستمی شانشینی، ئەو لەسەردەمی ڕژیمی دڕندەییدا، لەرۆژگاری رۆبسپێردا بیرۆکەکانی خۆی نەدەشاردەوە، بەپێچەوانەی سیەیس کەکاتێ لێیان پرسی تۆلەسەردەمی دەسەڵاتداریەتی روبسپیردا چیتدەکرد لەوەڵامدا گوتی: من تەنها دەژیامو بەس).

باراس دەمیکبوو پردەکانی پشت سەریەوەی خراپکردبوون، ئەو تەواو ئاگاداری ئەوەبوو ژاکوبنەکانو لایەنگرانی سیستمی شانشی چ نەفرەتو کینەیەکیان لێیەتی، بۆیە بەهیچ کلۆجێ بەزەیی بەم دوو دەستەیەدا نەدەهاتەوە، چونکە دەیزانی هەریەك لەم دووانە سەریکەونو دەسەڵات بگرنەدەست لەناوی دەبەن، پێی ناخۆشنەبوو یارمەتی ناپلیۆنیش بدات کەلەبەختی ئەو لەمیسرەوە بەساغو سەلامەتی گەرابۆوە، هەتا لەوڕۆژە تەنگژاویانەی پێش کودەتای(برومر)یش سەردانی ژەنەرال ناپلیۆنی کردوو، دواتر وەفدی ناردنەلای هەتا دانوستان بکەنو تامەزرۆی ئەوەبوو پلەو پایەیەکی لەحکومەتی ئایندەدا پێبدرێت، بەڵام پاش ماوەیەك ناپلیۆن هاوکاریکردن وئەو وباراسی بەشتێکی نەشیاو هەژمارکرد، هەڵبەتا نەك لەبەر ئەوەی

---

[78] - مانگی ترمیدور: دەکاتە (27-ی یۆلیۆی 1794) ئەو رۆژەی کەروبسپیر لەژێر پشتگیری فراکسیونەکانی ئەنجومەن و بەپشتیوانی کۆمۆنی پاریس، بەدەستی ئەنجومەنی میللی روخێندراو کۆتایی بەسەردەمانی دڕندەیی هاتو پاریسیش لەلابردنی ئەورۆڵی سەرەکی گیرا. (و-فارسی)

[79] -(18-ی فروکتیدور) واتە : مانگی سێتمبر. (و-کوردی)



ناوبراو کەڵکی نەبوو، چونکە لەورۆژگارەدا سیاسەتمەداری ئاوا بوێرو وردبین‌و ژیرو پلەوپایە بەرز کەم بوون‌و وەلانانی کەسانی ئاوا حەیفبوو، باراس کارێکی وایکردبوو خەڵك تەنها نەفرەت‌و رقیان لەئەو بوو، دزی‌و داوێن پیسی‌و گەندەڵی‌و سەروکار لەگەڵ سود خۆراندا بەئاشکرا دەیکردوو باراس ببووە نموونەیەك لەگەندەڵی‌ودزیکردنی دیراکتوار لای خەڵك، بەپێچەوانەی پاراس ناپلیۆن سیەیسی خستەژێر سایەی خۆی‌و چاودێریکرد، چونکە ئەم ناوبانگێکی باشتروسەنگین تری لەباراس هەبوو ولەبەرئەوەی لێپرسراوی یەکەمی دیرکتواریش بوو، دەیتوانی بۆنەوکارەی ناپلیۆن هەوڵی بۆدەدا رووی قانونی هەتاکە بەروکەشیشبێت پێبدات، ناپلیۆن سیەیسی وەك باراس بەشێوەیەکی کاتی هێشتەوە، بەتایبەت دەبوا سیەیس ماوەیەك دوای کودەتاکە بمابایەوەو هەتا ئەوکاتیش کەڵکی دەبوو، لەوکاتانەدا دووپیاو بەناوی تالیران وفوشە هاتنەلای ناپلیۆن کەلێرەدا دوا باسی ئەو دووکەسایەتییە دەکەین ورۆڵی ئەوان سەبارەت بەناپلیۆن دەخەینەڕوو، دەمێکبوو ناپلیۆن تالیرانی دەناسی وبەپیاوێکی بەڵێن شکێن ودرۆزنی دەزانی، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەژیرترین سیاسەتمەداری لەقەڵەمدەدا، بەوەی تالیران ئامادەیی خۆی بۆ ناپلیۆن دەربڕی بەوەی دەتوانێت هەندێ لەکەسایەتییەکانی دەسەڵاتداری حکومەت بفرۆشێت، ئەگەر کڕیاری باشی دەستکەوێت، بۆیە ناپلیۆن لەم پێشنیارە کەمێ بڕوایکرد، چونکە ناوبراو نەیدەتوانی ئەوجۆرە کارانە بکات وتەنها ئەوەبوو لەم دواییانەدا دیرکتوار ئەویان بەوەزیری دەرەوە دانابوو وئەمەش ئەوەی دەگەیاند تالیران تەنها دەیەوێت پلەوپایەکەی بەناپلیۆن بفرۆشێت، تالیران زۆر خزمەتی[80] پڕبەهای ناپلیۆنی دەکردوو بەخێرایی دەیگەیاند، ژنرال ناپلیۆن باوەڕی بەهۆش وشارەزایی سیاسی ئەوبوو، پاش کەمێ تالیران تەواو خۆی تەسلیمی ناپلیۆن کردوبوو وبوو بەمریدی، دواتر فوشەش هەمان کاریکرد، فوشە کەلەسەردەمی دیرکتواردا وەزیری ناوخۆبوو، دەیویست لەکاتی حوکمڕانی ناپلیۆنیشدا هەمان پلەوپایەی پێبدرێت، یەکێ لەلایەنە باشەکانی ئەوپیاوە ئەوەبوو ناپلیۆن دەیزانی ناوبراو لەگەڕانەوەی بوربنەکان بۆسەر حوکمڕانی تۆقیبووە، فوشە یەکێ بوو لەئەندامانی ژاکوبنەکانی پێشوو ویەکێ لەوپیاو کوژانەبوو کەڕای لەسەر لەسێدارەدانی لویسی شازدەهەم دابوو، ئەمەش بەس بوو بۆئەوەی خیانەت لەناپلیۆن نەکات، لەبەرخاتری بوربنەکان، ئەو پێشنیارەی فوشیە بۆ خزمەتکردنی ناپلیۆن کردی بووە جێگای قبوڵکردن، برژوازیەکان پەیمانیاندا ناپلیۆن هەرچی خەرجی وپارەی بیەوێت بیدەن ( کولو)[81] کەیەکێکبوو لەخاوەن بانکە گەورەکان، پێنج سەد فرانکی زێڕی بۆ ناپلیۆن نارد، چونکە فەرمانڕەوای ئایندەی فەرەنسا لەم ساتەوەختانەدا پێویستی بەلایەنی ئیداری بوو، ئەو پارەیەی قبوڵکرد.

ناپلیۆن لەماوەی ئەو (25) ڕۆژەی کەگەڕابۆوە بۆ فەرەنسا پێشوازی زۆر لەکەسایەتی وئەشرافەکانی فەرەنسای کردوو زانیاری باشی کۆکردبۆوە، پێشنەوەی کودەتاکەی بەرپابکات، تالیران، وێنای ئەوەی دەکرد ئەگەر کودەتابکرێت ودیرکتوارەکان لەسەرکار لاببرێن، ناپلیۆن وەك لەبواری سەربازی ناوداری هەیەو بەتوانایە لەبواری سیاسیدا شارەزایی نییەو هەرخۆی دەسەڵاتی سیاسی باڵای حکومەتی ئایندە دەگرێتەدەست، لەوماوەی گەڕانەوەی ناپلیۆن بۆپاریس ناوبراو لەهەڵسوکەوت وقسەکانیدا خۆی بەسادەو ساویلکەو ناشارەزا لەکاروباری سیاسی وحکومی نیشاندەدا هەتا نەبێتە جێگای

---

80 - -خزمەت : مەبەست لەخزمەتی سیاسی وگەیاندنی هەواڵی حکومی ولێپرسراوانی دیرکتوارە.

81 - -کول: دەوڵەمەندێکی تازە پێگەیشتووبووە.(و- فارسی)



سەرنجی دیرکتوارو مەترسی بکەوێتەسەر، پێش کودەتـاو دوای کودەتاکـەش نـاپلیۆن تـوانی بەوریایی سـەرنجی چـین و توێژەکانی کۆمەڵگاو حزب ولایەنە سیاسییەکانی چەپ وراستیش بۆلای خۆی ڕاکێشێت وهـەموو لایـەك ئومێـدی ئـەوەیان بەناپلیۆن بوو، کۆماری لەچنگ دەسـەڵات پەرسـتان دەربێنێـت ودەیـانگوت:(ئەمـە هـەمان ژنـرالی وانـدەمیری-یـە کـەبۆ ڕزگارکردنی کۆماری گەڕاوەتەوە) هەتا ناپلیۆنیش دەیویست واخۆی نیشانبدات ئەم ئەفسانەیە بەدیاربخات.

ئەم کودەتایە هێزی ڕەهای بۆناپلیۆن دەستەبەرکرد کەلە(9-ی نۆڤەمبەردا ڕوویدا، هەرچەندە(18-ی برومر، سەرەتای دەستپێکردنی وکودەتاکەکرا، بەڵام لە(10-ی نۆڤەمبەری سالی-1799)دا بەشێوەی پراکتیکی کرا.

کارەکە بەوئاسانییە نەبوو دووکەس لەدیرکتوارەکان واتە ( سیەیس و ڕۆەدوکو) دەستیان لەوکودەتایەدا هـەبوو، بـەڵکو ئەوەبوو فوشە[٨٢] هەردوو گوهیەو مولنی فریودابوون وتەنها باراس مابۆوەو ناوبراویش دڵخۆشی خۆی بەوەدەدایەوە بێبوونی ئەو هیچ کارێ ناکرێ بگیردرێتەبەرو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد.

لەئەنجومەنی(500) کەسی وئەنجومەنی پیراندا هەندێ نوێنەر ئاگاداری ئەوکودەتایەبوون وپێشوەخت دەیانزانی گۆڕان لەئارادایە، بەڵام ئەندامەکانی تر دەمەتەقەیان دەکرد بۆ وەرگرتنی زانیاری لەم بارەوەو هەردووکلاش لایەنگری گۆڕانکاری بوون.

(3)

پلانی کودەتاکە لەشەوی(8-ی برومردا کێشرا، ئەو ڕۆژە لەکاتژمێر شەشی بەیانییەوە، ماڵی ناپلیۆن وردەوردە سەردارو خاوەن پلەو پایەکانی بۆهاتن و پڕبوو، سەربازگەکانی پاریس نزیکەی (7) هەزار سەربازی تێدابوون وناپلیۆن دەیتوانی تەواو پشت بەمانە ببەستێت، هەروەها (1500) سەربازی پارێزەری هەردوو ئەنجومەنی (500) کەسی وئەنجومەنی پیرانیانیش هەبوون کەئەگەری ئەوەیان لێنەدەکرا دژی ناپلیۆن ببنەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبوا ئەم نهێنیە بپارێزن ونەهێڵن بەهانە بدەنەدەستی ئەندامە چەپەکانی ناوئەو دوو ئەنجومەنەو ئەوانە سەربازەکان هانبدەن بەناوی بەرگریکردن لەکۆماری هـان بدرێن، بەڵام شتەکە واهاتبۆپێش- یان باشتر وایە بڵێین: وارێکخراوبوو هەردوو ئەنجومـەن خۆیـان خواسـتویانە نـاپلیۆن دەسەڵات بگرێتەدەست، هەرکە ناپلیۆن لەبەرەبەیانی ڕۆژی هەژدەی برومردا لەگەڵ سەردارەکانی خۆیدا کەباوەڕی تەواوی پێبوون (موراو لوکلرك ، کەزاوای ناپلیۆن بوون) هەروەها، برنادوت وماکدونالدو چەندین ئەفسەری سەربازی کەلەسەر داوای ئەو بۆ یاریدەدانی هاتبوون، کۆکردنەوەو پێی گوتن، ئەو ڕۆژەهـات ڕاپـەڕین و پێویـستە کۆمـاری ڕزگاربکـەین، نـاپلیۆن فەرمانیدا سەربازەکان بەریز بوەستن وچاوەڕوانی ئەوەی دەکرد جاسوس و لایەنگرەکانی هەواڵی ئەوەی پێبدەن ئەنجومەنی پیران دەستوبەجێ کۆبوونەوە بکات، کەڕۆژێ پێشتر ئەوپەیامـەیان بۆنـاردرابوو وهـەموو ئەنـدامانی ئـەو ئەنجومەنـەش لەبرۆوازییەکان پێکهاتبوون، یەکێك لەوئەندام پەرلەمانانە ناوی (کرنە) بوو ولایـەنگری پۆنابـارت بـوو هەڵـسایە سـەرپێ و گووتی،(ئەگەر کۆماری هەر بمێنێتەوە ئەوادەکەوێتە چـنگ لاشـە خۆرەکـان ودواتـر دەکەونەسـەر خـواردنی ئەندامـە بـێ گۆشتەکانی لەشی ئەو، گوتی ئەم رستەیە بەو مانایەیە کودەتایەکی مەترسیدار لەگۆڕێدایەو ناوی کەسیشی نەگوت و تەنانەت

82 - -بۆ ئەوەی خوێنەر بەهەڵەدا نەچێت پێویستە ئەوە وەبیر بهێنینەوە کەفوشەی سیاسەتمەدار، وەزیربوو وئەندام نەبوو لەدیرکتوار کەپێنج ئەندام بوون.(و- فارسی)



چەند وشەیەکی بێ سەروبەریشبوو، ئەمە بووەهۆی ئەوەی پێشنیاری ئەوەبکرێت [٨٣] هەردوو ئەنجومەنی(500)کەسی‌و ئەنجومەنی پیران بگوازرێتەوە (سن کلو)وسەرکوتکردنی ئەوکودەتایەو راپەرینەش بەناپلیۆن بسپێردرێت کەفەرماندەی گشتی پاریس بوو، لەلایەن ئەندام پەرلەمانەکانەوە ئەوانەی کەوایاندەنزانی چ لەگۆرنییە ودەنگیان بۆ بریاری گواستنەوەی هەردوو ئەنجومەنەکە بۆ سن کلویاندا، بەپەلە ئەم بریارە دەنگی بۆدرا، کەس ناکۆك نەبوو، دوای دەرچوونی بریارەکە ناپلیۆن ئاگادارکرایەوە.

بۆچی ناپلیۆن پێشنەوەی هەردوو ئەنجومەنی پیران‌و پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە گواستنیەوە بۆ سن کلو؟ چونکە دەبوا هەرچۆنێکبێت میراتی سالآنی پرشکۆی شورشی فەرەنسی لەبەرچاوبگرێت.

لەیاداشتی ئەو جیلەدا ئەو ساتەوەختە مەترسیدارانە مابوون کەچینی سێیەم هەر زۆرو ستەمەێکیان لێبکرێت دەستبەجێ رادەپەرین‌و ئەوە لەبیری خەڵکدامابوو کەچۆن رژێمی پاشایەتی کە(1500) سالبوو حوکمی دەکرد سەروژێریان کردو تێکیانشکاند، چۆن چۆنی میللەت بۆ دواجار لەمانگی مایۆی سالی (1795)دا کەللەسەری یەکێ لەئەندامانی ئەنجومەنی کنوانسیونیان بەنوکی رمێکەوە کردبوو ونیشانی ئەندامەکانی تری کنوانسیونیاندەدا، کەلەترساندا ووشك ببوون ......،

ناپلیۆن چەند باوەری بەخۆی بوو بۆ دەستبردن بۆئەو کارەی کەنەخشەی بۆ کێشابوو، لەناوشاری پاریسدا مەترسیداربوو، نەك لەوشارۆچکەی سن کلو کەهەردوو ئەنجومەنی بۆ گوازرابوونەوە وتەنها کۆشك‌و تەلاری پاشایانی فەرەنسای تێدابوون، نەخشی بەرێوەبردنی کارەکە وەك ناپلیۆن کێشابووی ئاوا بەرێوەچوو، بەرووکەش لەرووی یاساییەوە کارەکە بەرێوەدەچوو وبەپێی قانون ناپلیۆن بەلێپرسراوی پاراستنی پاریس دانرابوو وناوبراو فەرمانیدا تیپێ سەرباز ئەندامانی ئەنجومەن بگەیەننە سن کلو وپارێزگاریان لێبکەن.(بەلآم لەراستیدا دەست بەسەر کرابوون) ناپلیۆن سەرەتا ستاف سەرکردایەتی سەربازەکانی بۆ کۆشکی توبلر برد، کەبارەگای ئەنجومەنی پیرانبوو وگەمارۆی ئەو شوێنەیداو لەگەڵ چەند سەربازێکیدا چووەناو هۆڵی کۆبوونەوەکە، ناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی ئەوکاتی گوتاری پێشکەش نەکردبوون، تەنها بۆسەربازەکانی نەبێت. ئەوەبوو بەدەرهاویشتنی چەند رستەیەکی نارێك‌و پچرپچر گوتی (ئێمە لایەنگری کۆمارین کەلەسەر بنەمای ئازادی‌و یەکسانی‌و لەسەر بنچینەی دەسەلاتداریەتی میللی بێت‌و سوێند دەخۆم ئەوەش بەدەست دەهێنین) بەلآم لەورۆژانەدا گوتاربێژی ورەوانگۆیی گرنگنەبوو، ماوەیەك ئەندامانی پەرلەمان بێدەنگبوون، ئینجا ناپلیۆن چووە دەرێ‌و هەرکەگەیشتەوە سەرشەقام بینی سەربازەکانی بەهاتوهاواری خۆشییەوە سلاوی لێدەکەن، لەوساتەدا شتێکی چاوەروانەکراو روویدا کەسێك بەناوی بوتە کەباراس ناردبووی لەناپلیۆن نزیکبۆوەو گوتی باراس زۆر نیگەرانەبەوەی تائیستا تۆ دەرخواستی ئەوت نەکردووە. ئینجا ناپلیۆن بەدەرەنگێکەوە گووتی(ئێوە [٨٤] چیتان بەسەر فەرەنسیەکاندا هێنا، کەمن شکۆمەندیم بۆئێوە جێهێشتبوو؟ کەچی

---

[83] - 1- ئەمە تەنها تاکتیکێك بووە بۆئەوەی ئەودوو ئەنجومەنە بکوێزرێنەوە بۆ سن کلوولەژێر کۆنترۆڵدابن.

2- سن کلو: شارۆچکێکە لەخۆرئاوای پاریس وەدەکەوێتەسەر لێواری رووباری سن و کۆشکێکی جوانی پاشایانەی لێیە کەهاوینان پاشا کۆنەکانی فەرەنسا لەوێدا نیشتەجێ دەبوون .(و- فارسی)

أ- تیدابوون : لەم رستەیەدا مەبەست لەوەیە مەترسی میللەتی پاریس زیاتربوو لەسەری، نەك هەردوو ئەنجومەنەکەی کەشێوە کۆنترۆڵ کرابوون، واتە ترسی ناپلیۆن لەخەڵکی رەش وروت بوو،(و-فارسی)

[84] - ئێوە : مەبەستی لەدیرکتوارەکانە،

ئێستا شەردەبینم، ملیۆنەها پارەم لەئیتالیاوە بۆ ئێوە ناردەوە! بەڵام ئێستا گەندەڵیو دزیو هەژاریو برسێتی دەبینم، ئێوە چیتان لەسەت هەزار ئاشناو شەرە[85] سەرکەوتنەکانی من کرد؟ هەموویان مردن ؟ ئینجا ئەوەی دووبارەکردەوە کەدەبەوێت کۆماری لەسەربنەمای (ئازادیو رەوشتی جوانو ئازادی تاکەکەس، دابمەزرێنێت.

دیرکتوار ، واتە ئەنجومەنی دەسەڵاتی باڵای کۆماری، بەبێ هیچ کێشەو شەڕو دەست بەسەرکردنێك هەڵوەشایەوەو سیەیسو رۆژەدکوس دەستیان لەم کودەتایەدا هەبوو. کاتێ گوهیەو مولنیش بینیان هەمووشتێك لەدەستچوو، بەدوای سەربازەکانی سن کلودا رۆیشتن. تەنها باراس مابۆوەو ناپلیۆن دەستبەجێ فەرمانی بەتالیراندا بچێت بۆلای باراسو دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێ بنووسێتو ئیمزای بکات، باراس باش دەیزانی ناپلیۆن سورەلەسەر ئەوەی دەست لەکار بکێشێتەوە، بۆیە راستەوخۆ ئەوکارەی کردوو داوایکرد حەزدەکات دەست لەکاروباری سیاسی بکێشێتەوەو بچێتەسەر ملکەکەیو لەشوێنێکی گومناودا لەناو کۆشکەکەیدا بژێت ودەستەوبەجێ بەهاوەڵی تیپی سەربازی رەوانەی کۆشکەکەی خۆی کرا کەلەدەرەوەی شاردابوو، بەم جۆرە ئەوپیاوە تابەئەو رۆژە هەموو لایەکی تەفرەدابوو لەپڕ فریوی خواردو بۆ هەمیشە لەسەر شانۆی سیاسی نەما.

دیرکتوار هەڵوەشایەوەو ئەندامانی هەردوو ئەنجومەنی پیرانو پەرلەمان لەبەرەبەری ئێوارەی(18-برومردا بۆ سن کلو نێردرابوون، ئێستاش کاتێنەوە هاتووە ئەم دوو ئەنجومەنەش بەهێواشەکی هەڵبوەشێندرێتەوە، هەرچەندە هەردوو ئەنجومەنی پیرانو پەرلەمان لەژێر دەسەڵاتی سەربازەکانی ناپلیۆن دابوون، بەڵام ناپلیۆن دەیویست ئەودوو ئەنجومەنە بۆخۆیان دان بەبێتوانایی خۆیاندا بنێنو خۆیان خۆیان هەڵبوەشێننەوەو ئەمەش بەڕەسمی رابگەیەننو دەسەڵات بدەنەدەست ناپلیۆن، هەتا ناوبراو نەخشەکانی خۆی بەرووکەش قانونیانە جێبەجێبکات، خۆنەگەر سەرەتا پلانی هەڵوەشاندنەوەی ئەودوو ئەنجومەنەی جێبەجێ کردبا، جۆرێ لەدڵ ساردیو بێ سەروبەری لەناو سەربازەکانیدا دروست دەبوو، ناپلیۆن فەرمانیدا هەرلە سن کلودەوە تاپاریس سەربازی تێدا دابنرێنو ئەمە لەهەمان رۆژدا جێبەجێکرا، خەڵکی پاریسیش بەواق ورماوییەوە سەیری ئەو ریزە سەربازو گالیسکە سەربازیانەیان دەکرن کەلەنێوان پاریسو سن کلودا هاتوچویان دەکرد، سەبارەت بەکرێکارانو زەحمەتکێشانیش پڕوپاگەندەی ئەوەبڵاوبۆوە کەئیتر هەموو رۆژێ کاردەبێتو گرژی ئاڵۆزی نامێنێت، لەناو دوکانو بازارەکانی پاریسیدا جارجار هاواری بژی بۆناپارت بەرزدەبۆوە، بەگشتی خەڵك لەحاڵەتێکی چاوەڕوانیدابوونو ماتەیان هەڵگرتبوو، ئێستا هەموو ئەندام پەرلەمانو ئەنجومەنی پیران نەچوبوونە سن کلو، چونکە زۆربەیان بڕیاریان دابوو رۆژی 19-ی برومر، بچن بۆ سن کلو وکۆبونەوەی خۆیان ئەنجامبدەن.

لەبەرە بەیانی ئەورۆژە کەدووەم وکۆتایی کودەتاکەبوو، هەندێك پێشهاتی جددی رووبەرووی ناپلیۆن بۆوە، بێ سەرپێچی کردن لەخۆرئاوای رۆژی (18)هەمدا دوودامەزراوەی سەرەکی حکومەت هەڵوەشابوونەوەو تەنها یەکێکیان مابوو ئەویش پەرلەمان بوو، واتە: دیرکتوار بوونی نەمابوو وئەنجومەنی پیرانیش ئامادەیی تەواویخۆی راگەیاندبوو کەوبەدەستی خۆی خۆی هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان: واتە ئەنجومەنی (500)کەسی هەرمابۆوە لەوپەرلەمانەدا نزیکەی

---

[85] - شەرێکی سەرکەوتنەکانم: مەبەستی ناپلیۆن لەسەربازەکانیەتی . ( و- کوردی )



(200) ئەندام پەرلەمانی لایەنگری (کۆمەڵەی لایەنگرانی ئازادیو یەکسانی) ژاکوبنەکان هەبوون، لەراستیدا هەندێك لەمانە ئامادەبوون خۆیان لەبەرامبەر پارەدا بفرۆشن– یان لەترساندا خۆیان تەسلیم بکەن، بەڵام کەسانیتر هەبوون کەپاشماوەی شۆرشی مەزنی کۆماری بوون، بەتێروانینی ئەمانە بەربەرەکانی کردنی ئەمانە دەسەڵاتی سەرکەتکەرو لەناوبردنی خیانەتکاران ئەرکەو دروشمەکانی وەك (ئازادیو یەکسانی –یان مەرگیان لانەدەنا) چوونکە وشەی پوچ وبێ مانا نەبوون، ئەمانە کەسانێکبوون کەنرخیان بۆژیانی خۆیان وکەسانیتر دانەدەنا لەپێناو باوەڕەکەیانداو دەیانگوت: ئەگەر بوار رەخسا پێویستە دوژمنان بەجیۆتین ملیان بپەڕێندرێت– یان ئەگەر نەکرا بەخەنجەری بروتوس [٨٦] بکوژرێن، بەدرێژایی رۆژی (18–ی برومر) فراکسیۆنی ژاکوبنەکان کۆبونەوەی نهێنیان ئەنجامدەدا، نەیاندەزانیچی بکەن، دەست بۆ چ کارێك ببەن، سیخورەکانی ناپلیۆن کەلەناو ئەوانەشدا هەبوون بەردەوام خەریکی ژاوەژاوبوونو ئەمانەیان بەوە فریودەدا کەهەرگیز زەبر وەشاندن لەژاکوبنەکان نادرێت، بەڵکە مەترسی دەسەڵات پەرستان لەئارادایە، ژاکۆبنیەکان گوێیان لەوقسانە دەگرتو نەشیاندەزانی باوەڕ بە چ بکەن، ئەمانە بەرەبەیانی رۆژی 19–ی برومەر چوون بۆکۆشکی سن کلو تاکۆبوونەوەی پەرلەمان ئەنجامبدەن.

کاتێ لەسپێدەی رۆژی 19–ی برومەردا بەرەو تەلاری پەرلەمان دەرۆیشتن پەشێویو پەرتەوازەییان دیاربوون، بەڵام هەندێك لەمانە کەللەیی ببوونو گرژیان پێوەدیاربوو، سەربازە سوارەکان بەهاوەڵی سوپاسالارەکەیان هاتن بۆ سن کلو.

هەرکە پەرلەمان زانی ناپلیۆن هاتووەو سەربازی سوار دەوریانگرتوون هەندێك لەئەندام پەرلەمانەکان نارەزایی خۆیان لەوەدەربری بۆچ پەرلەمان هاتووە لەسن کلودا کۆبونەوەی خۆی دەکاتو چ شتێك لەپشت پەردەوەیە ؟ ئەو دەستە پەرلەمانتارانە بەئاشکرا هاواریانکرد، ئیستا پەییان بەنەخشەکەی ناپلیۆن بردووەو لەوراستیەکە گەیشتوون، ئیتر هەندێکیان دەیانگوت ناپلیۆن دزو سەرکوتکەرو رێگرە، سەرەتا ناپلیۆن نیگەران بوو، بەڵام کەدواتر یەکەسەربازییەکانی خۆی بینی تورەبوو، لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژدا هەردوو ئەنجومەنی پیرانو پەرلەمان کۆبوونەوەی خۆیان بەجیاجیا ئەنجامدا، ناپلیۆنو ئەفسەرو دۆستەکانی لەژووری تەنیشت هۆڵی کۆبوونەوەکەدا بوون هەتا پەرەلەمان بڕیاری دروستکردنی حکومەتێکی تازە دەربکاتو ناپلیۆنیش بۆ ئەم کارە راسپێرێتو دواتر بڵاوەی لێبکەن. وەلێ کاتژمێر بەسەرچوونو ئەو بڕیارە لەلایەن ئەودوو ئەنجومەنەوە دەرنەکرانو ئەندامی ناکۆکی زۆر بەوبڕیارە نارازی بوون، خەریکبوو خۆرئاوا دەبوو، دەبوا ناپلیۆن کارێکی بەپەلە ئەنجامبدات ئەگەرنا نەخشەکەی سەرناگرێت، لەکاتژمێر چواری ئێوارەدا لەپڕ چووە ناوهۆڵی ئەنجومەنی پیرانو لەبێدەنگیەکی مەرگباردا وتەیەکی پێشکەشکرد کەلەوتەکەی دوێنێی باشترنەبوو وپچرپچر بوو، چەمکی گشتی وتەکەی ئەوەبوو ئەو دەیەوێت دەستبەجێ بڕیاربدرێتو ئیستاش بۆیەهاتووە تائەو مەترسیانەی لەسەریانە نەهێڵێتو رزگاریان بکات، هەروەها گوتی: ئێوە بوختانتان بۆمن کردوەو منتان لەگەل سیزارو کرومولدا هاوتا کردووە) بەڵام من بەپێچەوانەی ئەمانە دەمەوێت ئازادی رزگاربکەم، چونکە ئیتر حکومەتێك نییە لەسەرکاربێت، من گێرە شێوێن نیم بۆخۆتان دەمناسن ...)، تاکیدی لەسەرئەوە دەکردەوە ئەگەر ئەو بیەوێت زیان بەکۆماری بگەیەنێت ئەوا لەشی بەخەنجەر دادڕادڕو

---

[86] -بروتوس: زرکوری سەرداری رۆمی سیزارە، کەلەگەڵ کاسیوسدل، کودەتایان بەسەر سیزاردا کردو کاتێ سیزار ئەوی لەنێوان بکوژەکانی خۆیدا بینی گوتی:( بروتوس تەنانەت تۆش) ناوبردنی خەنجەری بروتوسیش وەك تانەلێدانە لەخیانەتکردن لەگەڵ ئازیزانو نزیکاندا، یان ئەوانەی لەپشتەوە خەنجەر دەوەشێنن.(و.کوردی)



هەنجن هەنجن بکەن، هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی پیران بەهاوارو نەڕەوە بەرپەرچیان دایەوە، ئینجا ناپلیۆن هەڕەشەی ئەوەی لێکردن هێزی چەکداری لەبەردەستدایە لەتەلاری ئەنجومەنی پیران هاتەدەرێ، بێئەوەی ئامانجەکەی بەدەست بهێنێت کەئەویش دەنگدان پێی بۆگرتنەدەستی دەسەڵاتو دروستکردنی حکومەت بوو، کارەکە بەرەوناڵەباری دەچوۆوەو لەوانەبوو خراپتریشی لێبێت، ئینجا ویستی بەهێمنی مەبەستی خۆی بخاتەبەردەم ئەنجومەنی (500)کەسی، هەرچەندە ئەگەری ئەوەهەبوو فراکسیۆنی ژاکوبنەکان ببنە یەك ناکوك لەگەڵیداو سەرئەنجام مەسەلەی (بروتوس) بێتەپێش، ناپلیۆن دەستەیەك لەنارنجۆك هاوێژەرەکانی لەگەڵخۆیدا هێنابوون، بەڵام ئەودەستە سەربازە زۆر لەوە کەمتربوون بتوانن بەرگری لەفەرماندەکەیان بکەن، ئەگەر ئەوانە ویستیان راماڵی بکەن.

لەوفەرماندە سەبازیانەی لەگەڵ ناپلیۆندابوون، ژنراڵ ( ئوژرو)بوو کەلەشەڕەکانی ئیتالیادا لەژێر فەرماندەیی ناپلیۆندابوو، لەوکاتەی دەچوونەناو تەلاری ئەنجومەنەوە، ناپلیۆن ڕووی بۆلای ( ئوژرو) وەرگێڕاو گوتی: ئوژرو شەڕەکەی ئارکل وەبیرخۆت بێنەوە، ناپلیۆن بۆخۆی لەوکاتەدا ئەوشەڕەی وەبیرهاتبۆوە کەبەژێر کڕی تۆپەکانی دوژمندا بەنارنجۆك هێرشیان دەکرد بۆ گرتنی پردی ئارکل، ناپلیۆن دەروازەی هۆڵی کۆبونەوەکەی کردەوەو لەشیپانەی دەرگاکەوە خۆی نیشاندا، ئەندامانی ئەنجومەنی (500) کەسی هەرکەبینیان بەهاتوهاوارو نەڕەنەڕ گوتیان بمرێ چەتەو ڕێگر، لەناوبچێت خۆپەرست، بڕۆ ئەی ناپاك، ئێمە ئێستا بڕیارێك دەردەکەین کەتۆ لەژێر پارێزگاری قانوندانیت، هەندێ لەئەندامەکان دەیانویست ڕاماڵی بکەنێ، چەند دەستێ بەرۆکیان گرت وهەندێك لەقۆپچەکانیان پچڕاندن، هەندێك هەوڵیاندا قڕقڕاگەی بەدەست بگرن، یەکێ لەئەندامەکانی ئەنجومەنی (500) کەسی بەهەموو هێزی خۆی مستە کۆلەیەکی لەشانی ناپلیۆن سرەواند، ناپلیۆن کەسێکی باڵاکورت ولاوازبوو وەهەروەها بەدرێژایی تەمەنی خۆی هێزی بازوی بەکارنەهێنابوو خەریك بوو، خەریکبوو لەژێر چنگی ئەمانەدا بخنکێت، دواتر سەربازەکانی دەووبەری توانیان دەورەی ناپلیۆن بگرن ونەیەڵن چیتر زەبری بەربکەون ولەتەلارەکەیان بردەدەرێ، ئەندامانی ئەنجومەنی (500) کەسی کەتەواو توڕەو دەمری ببوون گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان وبەهاتوهاوارو شیرەشیڕ داوای ئەوەیاندەکرد دەنگ بۆ بڕیارێك بدەن کەناپلیۆن لەژێر پارێزگاری قانوندا نەماوە، لەوڕۆژەدا سەرۆکایەتی ئەنجومەنی (500) کەسی براکەی ناپلیۆن لوس بۆناپارت بوو، کاتێ ناپلیۆن هاتەوەسەر خۆی بڕیاریدا بەزۆری چەك بچێتەوە بۆ ئەنجومەنی (500) کەسی وسەرەتا هەوڵیدا براکەی لەوێ بێنێتەدەرێ، کاتێ لوسی لەتەلاری ئەنجومەن دەربازبوو وخۆی گەیاندە لای براکەی، ناپلیۆن فەرمانی بەلوسی برایدا بچێت گوتەیەك بۆسەربازەکان بدات وبڵێ گیانی پێشەواکەیان لەمەترسیدایەو دەبێ بچن زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی (500) کەسی لەدەست دەستەیەك کەسی شێت ڕزگاربکەن، خۆئەگەر کەمێ گومان لەناقانونی بوونی ئەم کارەدا هەبووا لای سەربازەکانی، ئەوا ئەم ئۆینە سەری نەدەگرت، لەناکاو دەنگی تەپڵی سەربازی بەرزبۆوەو سەربازە نارنجۆك هاوێژەکان لەژێر فەرماندەی (مورا)دا بەرەو تەلاری ئەنجومەن هەڵمەتیان بردوو لەماوەیەکی کەمدا داگیریانکرد، بەپێی گوتەی ئەوکەسانەی ئەو ڕووداوەیان بینیوە، گوایا ئەوکاتەی دەنگی تەپڵی سەربازی بەرزبۆتەوە مقۆمقۆ لەنێوان ئەندامەکانی ئەنجومەنی (500) کەسیدا بەرز بۆتەوەو گوتویانە پێویستە شەرو بەرەنگاری بکەین ولێرەدا بکوژێین نەك خۆمان بدەین بەدەستەوە، دەروازەی تەلاری ئەنجومەن دەرپەڕێندراو سەربازە نارنجۆك هاوێژەکان ڕژانە ناوێ وهەموو لایەکیان خستەژێر کۆنترۆڵی خۆیان، دەنگی تەپڵەکان هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی



ناوبراوی بێدەنگونەبڵەقکردبوو وئیتر ئەندامانی ئەنجومەنی(500)کەسی دەم لەسەرپشت هەر یەکەی بەلایەکدا تێیان قوچاند، واتە هەندێك بەدرەکادا هەندێکیشیان بەکردنەوەو شکاندنی پەنجەرەکان، خۆیان گەیاندە حەوشەی تەلارەکە، هەموو ئەو رووداوە پێنج دەقیقەی خایاند، فەرمانەکە وادەرکرابوو ئەو نوینەرانە نەبکوژن و نەدەستگیریشیان بکەن، کاتێ ئەندامانی ئەنجومەنی (500) کەسی چوونە حەوشەکە بینیان چواردەوریان بەسەرباز گەمارۆ دراوە، دەنگی فەرماندەی نارنجۆك هاوێژەکان لەگوێی ئەندامانی ئەنجومەندا دەزرنگایەوە کەدەیگوت (ئەم پۆخڵەواتانە ببەنە دەرێ) هەندێك لەوئەندامانەی ئەنجومەنی(500) کەسی بەپێی خوێندنەوەی یاداشتەکانیان تاکۆتایی تەمەنیان هاواری ئەو رۆژەی (مورا)یان بیرناچێتەوە، لەوکاتەدا ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد ئەو ئەندامانەی ئەنجومەن کەبەملاولادا هەلاتوون بهێننەوەو بیانبەنەوە هۆڵی ئەنجومەن .

دواتر بریار وادرا ئەندامانی ئەنجومەنی(500)کەسی کۆبونەوەیەك بکەن و دەنگ بۆئەوەبدەن دروستکردنی حکومەتی کنسولی بکرێت، بەوپێیە هەندێ لەوئەندام پەرلەمانانەی لەژێر باران و چەقوچڵۆی سەرمادا لەکۆلان و چاخانەکاندا دۆزییاننەوەو هێنایاننەوە ەتەلاری ئەنجومەن، ئەمانە یەکسەر هەرچی داوایان لێکردن جێبەجێیانکردوو هەڵوەشانەوەی خۆیان راگەیاندو دواتر بەریاندانەوە، شەو درەنگان لەیەکێك لەتەلارەکانی سن کلوشدا بەبێ کێشەو گرفت دەنگیان بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی بالای کۆماریدا کەلە سێ کەس پێکهاتبوو، ئەوانیش ناپلیۆن و سیەیس و روژەکو بوون، چونکە تائەوکاتەش ناپلیۆن بۆ فەرمانڕەوایی ڕەهای خۆی کاتەکەی بەگونجاو نەدەزانی، بەلام سووربوو لەسەرئەوەی ئاکام کنسولی خۆی بگۆرێت بۆ دیکتاتۆری خۆی بەمانای وشە، ئەو دەیزانی ئەم دوو هاوکارەی هیچ رۆڵێکیان نابێت، تاکە جیاوازیش کەلەنێوان ئەم دووانەدا هەبوو، ئەوەبوو (رۆژەدکو) بەعەقڵە ناتەواوەکەی خۆیەوە ئەمەی دەزانی، بەلام سیەیس گومانیلەم جۆرەی نەدەکرد، پاش ماوەیەك ئەویش ئەوراستیەی بۆ ڕوون بۆوە.

فەرەنسا کەوتەژێر دەستی ناپلیۆن، سەعات دووی سبەی رۆژی دواتر هەرسێکیان سوێندی وەفاداریان بۆ کۆماری خوارد، شەو درەنگبوو ناپلیۆن بەهاوەلی (بورین) سن کلوی جێهێشت، کاتەکانی ناهەموارو تەلخبوون و لەڕێگای گەرانەوەی بۆپاریس بەزەحمەت چەند قسەیەکی کردن.



# هەنگاوە سەرەتاییەکانی دیکتاتۆری

(1800 -1799)

(1)

لەوساتە وەختەی کەمورا ئیوارەی رۆژی (19/ی برومر لە(سن کلو)دا هەوالی ئەوەی بەناپلیۆن راگەیاند تەلاری ئەنجومەنی (500) کەسی چۆلکراوەو کارەکەسەری گرتووە، ناپلیۆن لەوکاتەوە بۆماوەی (15) سالّ بوو بەفەرمانڕەوای ڕەهای میللەتی فەرەنسا، ئیتر ناپلیۆن لەپێنج سالّی یەکەمدابوو بەکنسولی یەکەم [87] و لەدەسالّی دوایشدابوو بەخاوەن دەسەلاّتی ڕەها.

سەرەتا فەرەنسا کۆماری ودواتر بەئیمپراتۆری ناودەبرد، چونکە نەلەبنەمالّە کۆمەلاّیەتییەکان و نەلەڕژێمی تازەدا هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك ڕووی نەدەدا، بەم جۆرە دیکتاتۆری بزۆوازی دژە شۆڕش [88] جێگیر بوو وچەسپا، ئەو بزۆوازتییەی کەتەنگەی پێ هەچلنرابوو ولەشەپرێوی وپەشۆکاوی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی فەرەنسای تالێوارەکانی هەلّوەشانەوە بەرەو مەترسی بردەوە، سەرئەنجام ئەم ڕێگاچارەی دۆزیەوە، ئەویش ئەوەبوو دەبێ دیموکراسی لەناوببات وتاکەکەسیش بۆ لەباربردنی ئەم ڕەوشە دیموکراسییە ناپلیۆنەو ئەودەتوانێت پانتاییەکی باش وئازادانە بۆ زەمانەتکردنی سەرمایەی تایبەتی دابین بکات، ناپلیۆن ئەم بنەماو ڕەوشەی حکومەتی تازەی تەواو لەژێر ڕکێفی خۆیدا دارشتەوە، هەموو توانای خۆی بۆئەمە خستەگەڕ، بەپلەی یەکیش هەموو هەولّەکانی بۆئەوەبوو خۆی بەیەگانە فەرمانڕەوای ڕەهای ئەم حکومەتە دانێت، ناپلیۆن ڕێکخراوەکانی هەلّوەشاندنەوەو سەرلەنوێ دروستی دەکردنەوەو گۆڕانکاری تێدادەکردن، ئامانجی ناپلیۆن تەنها بۆگرتنەدەستی دەسەلاّتی بالاّو ڕەهابوو، ئەوسەرەتا بۆچەسپاندنی ئەمە لەزۆر ڕێگاوە هەولّیدەداو بەڕێگای سیاسی وسازشی کاتی وپشودرێژی ئەم کارانەی جێبەجێدەکردن، بەلاّم بەبەسەر چوونی سالّ وردەوردە ناوبراو ئەوتوانایەی لەدەستدا، هەرچەندە لەسالاّنی سەرەتای حوکمڕانیدا ئەوتوانایەی هەبوو، ناپلیۆن سەبارەت بەخۆی دەلّێت هەندێك جار دەبێتە ڕێوی وهەندێك جاریش شێر، بەڕای ئەو گرنگی حوکمدار لەوەدایە بزانێت چ کاتێ ببێتە ڕێوی و چ کاتێکیش شێر، ئێستا لەڕۆژگاری کنسولیدابوو کەناپلیۆن دەزگایەکی دەولّەتی جێگیری دروستکرد بۆ سەرکوتکردن، تەنانەت هیچ یەك لەوحکومەتانەی دوای ناپلیۆن هاتن وتا بەئەمڕۆش لەفەرەنسادا هەمان ڕەوشیان گرتەبەر، جگەلەحکومەتی کۆمۆنەی پاریس. [89]

هەنگاوەکانی ڕۆژگاری کنسولی یەکەم هەرچاکسازیکردن لەبواری ئیداریدا نەبوو، کەببوە جێگای سەرنجی ڕۆشنبیرانی ناوەوەو دەرەوەی فەرەنسی، بەلّکو ئەو ڕۆشنبیرانە لەوڕووەوە زیاتر ستایشی ئەمەیاندەکرد کەئەو حکومەتە توانیویەتی ئەم بارودۆخە دابین بکات لەژێر سایەیدا وردەوردە بازرگانی وپیشەسازی بەرەوپێشدەچێت ولەسەر سیستمێکی باش وڕۆشن دەڕوات وبزۆوازیەتی گەورەی فەرەنسا توانیویەتی لەژێر ئەم ناوەوە سەرکەوتنەکانی سالّی (1798)و دواتریش بەم ڕێگایە

---

87 - کنسولی یەکەم: مەبەست لەوەیە دەسەلاّتی بالاّتر.

88 - دژە شۆڕش: مەبەست لەشۆڕشی گەورەی کۆمۆنەیە- یان وەك لەدەقەدا هاتووە شۆڕشی کۆماری (و- فارسی)

89 - کۆمۆنەی پاریس: یان کۆمۆنەی دووەم، حکومەتێکبوو شۆڕشگێڕی، کەدوای گەمارۆدانی پاریس لەلایەن پروسیان وهێرشکردنی ئەمانە لەسالّی (1871) دا هاتبوونەسەر حوکم ودواتر دووبارە بەگەمارۆدانەوەی پاریس لەلایەن هێزێکی ڕێکخراوی حکومەتی(تی یر) لە(28)ی مانگی مایۆی هەمان سالّدا ڕوخێندرا.(و- فارسی)



بسڕێتەوەو سەرپۆشی بکات، ڕۆڵی گەورەی ناپلیۆن وەك داهێنەرێك توانی ڕەوشی سیاسەتی دەرەکی حکومەت وبواری ئابووری برژوازی بەگەش و ڕوون وبهێنێتەدی، ئەمە نەك هەر لەسەرەتای سالانی حوکمڕانیەتی ناپلیۆندا گەشەیکرد، بەڵکو بەدرێژایی فەرمانڕەوایی ناوبراو درێژبۆوە، زۆرجار ئەو ژنراڵە تەمەن سی ساڵەی کەمەتا ئەوکاتە جگەلەشەڕو داگیرکردنی ئیتالیاو میسر، توانی بەزەبرێك حکومەتی ولاتەکەی خۆشی لەناوبەرێت وببێت بەفەرمانڕەوا، لەشەو درەنگانی دوای (19–ی برومر)دا دەکەوتە بیرو خەیاڵ وتائەو کاتەش بڕوای نەدەکرد بۆتە فەرمانڕەوای یەکێك لەگەورەترین ولاتانی ئەوروپا، ئەوکاتەش تەواو هێورنەبۆوە، ئەم ولاتە ئەگەر تەنها لەسەردەمی(کلوویس)ەوە حسابکرابا ئەوا مێژووەکەی دەگەیشتە (15) سەدە، ئەو شۆڕشەی توانی ڕژێمی پاشایەتی خاوەن مێژوویەکی (1600) ساڵە لەناوبەرێت، ئەم بەیەك زەبر توانی حکومەتی کۆماری لەناوبەرێت ودواتر کۆماریش پەراوێز بکات وبۆخۆی ببێتە فەرمانڕەوای ڕەهای دەوڵەت، ناپلیۆن لەپاشماوەی رووخاندنی شورشی کۆماری ورژێمی شانشینی کۆن، خۆی لەبەردەم زۆر کاروباری نیوەناچڵو وێرانەی دەولەتدا بینیەوەو دەبوا رێکیان بخاتەوە. سەبارەت بەکاروبارەکانی دەرەکی دەولەتیش کنسوڵی یەکەم خۆی لەبەردەم دۆخێکی ئاڵۆزو مەترسیداردا دەدیەوە، لەوکاتەی ناپلیۆن سەرقاڵی داگیرکردنی میسربوو هاوپەیمانییەتی دووەمی ئەوروپا ئیتالیایان لەژێردەستی فەرەنسا دەرهێنابۆوە، لەشکرکێشیەکەی سۆڤۆرۆف سەرکەوتنەکانی سالانی (1796و1797)ی ناپلیۆنیان بەربادا، راستە کاتێ لەشکری سۆڤۆرۆف بەچیاکانی ئەلپدا تێدەپەڕی هێزو توانای ئەوەی نەبوو فەرەنسا داگیربکات، بەلام هاوپەیمانییەتی ئەورووپایی بیری لەوەنەدەکردەوە دەست لەچەك شلبکات، واچاوەڕواندەکرا لەکەژی بەهاردا دوژمنان لەسەر سنوورەکانی فەرەنسا وەدیاربکەون، خەزێنەی دەوڵەتی فەرەنسا بەتاڵبوو، سوپا چەند مانگێکبوو موچەیان نەدرابۆیە، سیاسەتمەداران بەوردی چاودێری ئەوەیان دەکرد، داخوا ئەو فەرمانڕەوا گەنجە کرسیە چۆن دەتوانێت چارەسەری ئەم بارودۆخە دژوارو مەترسیدارە بکاتو بەڕەی خۆی لەئاو دەربێنێت؟

(2)

سەرەتا ناپلیۆن گرنگی بەرێکخستنەوەی دامو دەزگاکانی حکومەتە تازەکەیدا، واتە بەهێزکردنی توانای رەهای خۆی، بینینی ئەوتێکهەڵچونانەی کەلەگەڵ سیاسەتمەدارانی کۆنی وەك سیەیس، کەبەخەیاڵی خۆیان دەیانویست ڕۆڵی سەرشار ببینو ببنە ڕێنمایەکەرو چاوساغی ئەم گەنجە،کەمێ پێکەنیناوی‌و گەمژانە دەهاتەبەرچاو، ناپایۆن لەوکاتەدا سیاسەتمەدارە پیشەییەکانی فەرەنسای بەچاوی خۆتێهەڵقوتێنەرو چەنەبازو پەڕپوت سەیردەکردو دەیگوت: ئەمانە نایانەوێت تێبگەن کەڕۆژگاریان بەسەرچووە، بەلام سەبارەت بەژاکوبنەکان، ناپلیۆن هەم رقی لێبوونو هەم لێشیان دەترسا، هەرگیز ناپلیۆن باسی روبسبیریەکانی نەدەکرد، بەلام باش دەیزانی ئەوکەسانەی روبسبیریان کوشتو بۆخۆیان جیگاکەیان گرتەوە لەچ قوماشێك بوون، ئەو رقی لەوسوودخۆرو دزو دەغەڵکارانەبوو کەبەگفتولفتی باقو بریقەدار ناپاکی، کارە دزێوەکانی خۆیان رووپۆشدەکرد، دەبۆوە.



سیەیس کەناپلیۆن رایسپاردبوو خەریکی نووسینەوەی یاسای بنچینەیی دەوڵەتبێت، ناوبراو[90] نەخشەیەکی دانایانەی دارشتبوو بۆ نووسینەوەی یاسای بنچینەییو ئاگای لەوەنەبوو سەرمایەداری گەورەی فەرەنسا، ئیستا دەیەوێت یەك رژێمی پۆلیسی بەتوانا بێتەکایەو لەناویدا مافە یاساییەکانی خۆی جێبکاتەوە کەپەیوەندی بەئازادی بازرگانیو پیشەسازییەوەیە، کۆلاکەکانی گوندنشین دەیانویست ئەوزەویانەی تازە کەوتبۆدەستیان بەشێوەیەکی تەواو وبێتسر ببێتە هی خۆیانو لەقانوندا بچەسپێت، دواتر ناپلیۆن بەسەرساممییەوەیە نووسینەوەی ئەو یاسایەی بەناوابەستە لەقەڵەمداو بۆخۆی رێنمایی کردو زاراوەشی لەومادده دەستوریانەدا بەکارهێنا.

دەستوری تازەی دەوڵەت یەك مانگ لەدوای کودەتاکە تەواوبوو، کارگێرانی سەرۆکایەتی دەوڵەت درابۆ دەست سێ کەس[91] ویەکێك لەمانە لێپرسراوی ئەودوانەی تر بوو وئەمانە تەنها دەوری مشوەرەتیان دەبینی، پەرلەمانیش کەئەندامەکانی لەلایەن ئەو سێ کەسەی کنسولەوە دیاری دەکرانو ئینجا پەرلەمانیش هەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو ئەنجومەنی (تریبونا)[92] یان لەخۆ پاڵێوراوانی میللەت هەڵدەبژارد، سەرەتا بریاردرابوو دەستوری تازە بخرێتەبەردەم رای گشتی، بەلام ناپلیۆن فەرمانێکی دەرکرد کەدەبێ پێش خستنەبەردەم رای گشتی کاربەدەستوری تازەبکرێتو دەستبەجێ کاری پێکراو لەناو ئەو دەستورەشدا ناپلیۆن بەکەسی یەکەم دیاریکرابوو، لەرۆژی(1799/11/25)دا دەستور خرایەبەر رای گشتیوسەرئەنجامی ئەم دەنگدانە بەم جۆرەی خوارەوەبوو(3011007) کەس دەنگیان بەبەڵێ و(1562) کەسیش بەنەخێر، دابوو. لەشارو گوندەکاندا بەچاوی رێزو رزگارکەرەوە سەیری کنسولی یەکەمیان[93] دەکرد کەکۆماری لەچنگ شەری دەسەلات پەرستانی(13-ی واندەمەری[94] رزگارکردو توانیویەتی دەست تێوەردانەکانی بریتانیاو روسیاو نەمسا کەتائەوکاتەش هەرەشەیان لەفەرەنسا دەکرد بەنەزۆکی بهێڵێتەوە.

هێز بەتەواوەتی کەوتەدەست ناپلیۆن، هەموو دامودەزگاکانیتر تەنها تارماییەکی بێ رۆح بوونو کەمترین دەسەڵاتو نفوزیان نەبوو، سیەیس نیگەرانو دڵسواربوو، بەلام ناپلیۆن سامانێکی زۆری دایەئەو وبۆهەمیشە بەدووری خستنەوە لەهەر کاروبارێکی گرنگی دەولەت، ناپلیۆن لەهەمان سەرەتاوە نیشانیدا گوێ بەرخنە لێگرانی نادات، لە(11/27/)دا ناپلیۆن فەرمانێکی دەرکرد کە(60) رۆژنامە لەکۆی گشتی (73) رۆژنامەی فەرەنسا دابخرێنو ئەو (13) دانەی مابوشنەوە کەوتنەژێر چاودێری وردی حکومەتەوەو پاش ماوەیەك (9) رۆژنامەی تریش بەفەرمانی حکومەت داخران وتەنها (4) رۆژنامە مانەوە، ناپلیۆن دەیدەتوانی کەمترین بەرگی ئازادی چاپەمەنی بگرێت، هەمان ئەو رەفتارانە ئەوەیان دەردەخست ناپلیۆن بەچ شێوەیەك بیرلەبەهێزکردنی، دەسەلاتی خۆی دەکاتەوە، بەرای ئەو سەرچاوەی دەسەلاتی ئەو تەنها لەلای سەربازە

---

[90] - ناوبراو: سیەیس.

[91] - سێ کەس: سیەیسو رۆژەدکو وناپلیۆنە، کەئەمەی دواییان بوو بەکەسی یەکەم ودەسەلاتداری سەرەکی تەواو. (و- کوردی)

[92] - تریبونا: یەکێکە لەودوو ئەنجومەنەی کەبەپێی دەستوری ساڵی هەشتەمی شۆرش دروستکرابوو، ئەو ئەنجومەنە سەت کەس بوو ولەلایەن پەرلەمانەوە دیاری دەکران ، کاری ئەم ئەنجومەنە گفتوگۆکردن بوو لەسەر دەستوورو کوتاربێژو شارەزایانی ئەم بوارەو کەسایەتییەکانی دەولەت و دانی بەپەرلەمان، ئەم ئەنجومەنە لەساڵی (1807) دا هەڵوەشێندرایەوە. (و . فارسی )

[93] - کنسولی یەکەم: واتە ناپلیۆن. کەسەردەستەی دووەکانی تر بوو.

[94] -(13-ی واندەمەری: ئەمە تەقویمی شۆرشی گەورەی کۆماری فەرەنسایە: کەدەکاتە(25-ی سیتمبەری ساڵی-1799)
(و. کوردی)



نارنجۆك هاوێژەكانی مانگی برومری-یەو جگەلەمانە خۆی بەقەرزداری هیچیتر نەدەزانی وهەریشتی بەئەو سەربازانەی دەبەست، ئەمەش نەك هەر وێناكردن، بەڵكو باوەڕی سیاسیشی بوو، یەكێك لەگوتەكانی ئەو ئەوەبوو كەدەیگوت: هەمیشە حەق بەدەست تیپەكانی سەربازییەوەیە، هەمان ئەم تیپە سەربازیانەبوون كەلەڕۆژانی (18و19) ی برومردا فەرەنسایان خستەژێر دەستی ئەو، وەك چۆن پێشتریش ئەو سەربازانەی فەرەنسا ئیتالیاو میسریان داگیركردبوو (دواتریش هەموو ئەوروپایان داگیركرد) بۆیە بەڕای ناپلیۆن كەس مافی ئەوەی نەبوو هێزی لەگەڵدا دابەشبكات.

سیەیس زوو هەستی بەوبیرۆكانەی ناپلیۆن كرد، هەموو لایەنگرەكانیشی پەیان بەم واقیعە بردو دواتر هەموو لایەك لەم ڕاستیە گەیشتن گوتەكەی گۆتە[95] سەبارەت بەناپلیۆن تەواو ڕاستە كەدەڵێت (هێز بەلای ناپلیۆنەوە وەك ئامێرێكی مۆسیقی دەستی هونەرمەندێكی گەورەبوو وهەركەتوانی دەستی پێ بگات دەستیكرد بەژەنینی)

یەكەم شەڕی ناپلیۆن دوای دەسەڵات گرتنەدەست ئەوەبوو كۆتایی بەشەڕی ناوخۆیی بێنێت كەلەخۆرهەڵاتی فەرنسادا هەڵایسابوو، ئەمە زیاتر لەشەڕی ناوخۆ دەچوو نەك تاقمی چەتەو ڕێگری چەكدار كەئەوكات لەخوارو وخۆرهەڵاتی فەرەنسادا تەشەنەی كردبوو، دەبوا بەزووترین كات ئەو ئاژاوەیەی ناوخۆی نەهێشتبا، چونكە دەیزانی لەكەژی بەهاردا شەڕ سەرلەنوێ دەستپێدەكاتەوە،

(3)

دەستە ڕێگرەكانی كەدوای ڕووخانی حكومەتی دیركتوار پەیدابیون و لەسەر ڕێگاكانی خوارو وناوەڕاستی نێوان شارو شارۆچكەو گوندەكاندابوون، ببوونە پەتایەكی كۆمەلایەتی گەورە، ئەو چەتانە بەچرقەی نیوەڕۆ فارغۆنی[96] نەفەر هەڵگرو گالیسكەیان لەسەر شارێگاكاندا ڕادەگرت ونەك هەر ڕووتیان دەكردنەوە، بەڵكو زۆرجار ئەوانەشیان دەكوشتن، كەهێرشیان دەكردەسەر گوندو ئاوەدانییەكان وئەوانەی دەستیان دەكەوتن چەند سەعاتێك ئەشكەنجەیان دەدان، هەتا شوێنی پارەكەی خۆیانیان پێبلێن، هەرلەبەر ئەمەشبوو ئەوانەیان ناونابوو (توون چی) تەنانەت ئەم چەتەو ڕێگرانە هەندێكجار هەڵمەتیان دەبردەسەر شارەكانیش، ئەو دزو گێرانانە لەژێرناوی لایەنگرانی بوربنەكان ئەم كارانەیان ئەنجامدەداو پروپاگەندەی ئەوەیان دەكرد تۆڵەی تەخت وتاراجی پاشایەتی دەكەنەوە، ئەمانە زۆربوون ولەناو ئەو تاقمەشدا كەسانێك هەبوون بەهۆی شۆڕشی كۆمارییەوە ڕاستەوخۆ زیانیان لێكەوتبوو، بەپێی گوتەی ئەو كەسانەی كەلەو ڕۆژگارانەدا ژیاون، هەندێك لەسەر دەستەی ئەو ڕێگرانە بەشێك لەتالان و بڕۆكەی دەستیان دەكەوت دەیاندایە كارگوزارانی پاشایەتی، هەرچۆنێكبێت بێ سەرەو بەرەیی دەزگاكانی حكومەتی دیركتوار پێش ڕووخانی ببووەهۆی ئەوەی ئەم چەتانە لەدەست قانون قوتاربن وبەسزای خۆیان نەگەن، كنسولی یەكەم بڕیاریدا ئەمانە لەناوبەرێت وئەمەش شەش مانگی دەویست، ناپلیۆن هەندێك بڕیاری توندو تیژی سەبارەت بەڕیشەكێشكردنی ئەم ڕێگرانە دەكرد، كەبریتی بوون لەوەی: نابێ دیل لەوچەتانە هەبێت ودەستەوبەجێ

---

[95] - گۆتە: ( 1749-1832 ) گەورەترین شاعیرو فەیلەسوفی ئەڵمانیە كەخاوەنی شاكارەكانی ( فاوست)و ( ڤالتر)ە. (و- فارسی)

[96] -فارغۆنی نەفەرهەڵگر: لەو ڕۆژگارەدا عەرەبانەی ئەسپی نەفەرهەڵگر هەبووە كەتایبەت بەگواستنەوەی خەڵكبووەو لە شێوەی فارگۆنی شەمەندەفەری ئێستادابووە. (و- كوردی)



گوللەباران بکرێن، ئەو کەسانەی ئەوانەش پەنابدات– یان شتومەتی دزی بکرێت، بەهەر شێوەیەك پەیوەندی بەئەمانەوە بکات لەسێدارە دەدرێت، دەستەیەك لەسەربازی تایبەت بۆئەوە تەرخانکران هەرکەسێك پەیوەندی–یان لایەنگری ئەمانەبێت بکوژن، تەنانەت ئەوکەسانەی کەلەدامودەزگاکانی ئاسایش وناوخۆی وڵاتیشدابوون وگومانی ئەوەیان لێدەکرا کەمتەرخەم– یان دەستیان لەگەڵ ئەوچەتانەدا هەبووە، سزای توند دەدران.

ئەمە یەکێك لەخووەکانی تری ناپلیۆنی ئاشکراکرد، ئەو هیچ لێبوردەیەکی لەبەرامبەر ئەوکەسانەدانەبوو کەتاوانیان دەکرد، بەڕای ئەو هەموو کەموکوڕی وکەمتەرخەمیەك دەبێ سزادانی بۆدابنرێت، بەهیچ جۆرێکیش بەکەمکردنەوەی سزادان ڕازی نەبوو، ئەگەر بتوانین بڵێین ئەو دژی چاکەکاری بوو وپێی وابوو چاکەکردن لەکاروبارەکانی دەوڵەتدا زیانبەخشەو ناپەسەندە ڕاستە.

کاتێ برابچوکەکەی (لویس) لەساڵی(1806)دا بەپاشای هۆڵەندا دانراو ناوبراو لای ناپلیۆن پڕوپاگەندەی ئەوەی کرد، گوایا هەموو میللەتی هۆڵەندا زۆرخۆشیان دەوێت، ناپلیۆن بەتوڕەییەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی (برام کاتێ بەچاکەکار ناودەبرێت، ئەوە ئەمە دەگەیەنێت کەموکوڕی لەڕەوشی دەسەڵاتدا هەیە) هەروەها کاتێ لەنیسانی ساڵی(1811)دا یەکێك لەڕۆژنامەکان بەناوی (لاکازت دوفرانس) زۆر وەسفی ئیمپراتۆری کردبوو وناپلیۆنی بەمیهرەبان وبەخشندە ناوبردبوو، بەمە ئیمپراتۆر توڕەبوو ودەستبەجێ نامەیەکی بۆ وەزیری ناوخۆ نووسی وتێیدا نووسیبوو( بەڕێز دوك دورو ڤیکو، کێ ڕێگای بەڕۆژنامەی لاکازت دوفرانس، داوە ئەمڕۆ ئەو وتارە دەربارەی من بڵاوبکاتەوە؟) ئینجا فەرمانیدا سەرنووسەری ڕۆژنامەی ناوبراو لابرێت. چونکە ئەو سەرنووسەرە زۆر گەمژەکاری دەکات)

ئەگەر کەسێك بەناپلیۆنی گوتبا ئاژەڵێکی دڕندەیە، ئاسانتر لێیخۆش دەبوو لەوکەسەی ناوی ئەوی بەبەخشندەو باش ببردبا، هەموو ئەم خەسڵەتانەی ناپلیۆن بەبەسەرچوونی کات دیارکەوتن، بەڵام فەرمانڕەوای تازە لەپێناو قوتاربوونی تاوانبارێکدا ئامادەبوو دە کەس بکوژێت کەگومان لەیەکێك لەمانە کرابا، ناپلیۆن دوای لەناوبردنی چەتەو ڕێگرەکان خەریکی گرنگیدانی تایبەتی بوو بەولایەتی(واندە) چونکە بەهۆی ئەوەی هەندێ لەڕۆحانی وبرژوازیەکانی ئەو ولایەتەو جوتیارەکانیشی هاوەرزی دەریایی بوون لەگەڵ بریتانیادا، چەك وتفاقی باشیان پێدرابوو بۆ دژایەتی کردنی شۆڕشی فەرەنساو ئەگەری دروستبوونی شەڕی پارتی زانی لەوناوچەیەدا هەبوو، ناپلیۆن بۆ چارەسەرکردنی ئەمە پلانێکی جیاواز لەونەخشەیەی بۆلەناوبردنی چەتەو ڕێگرەکان گرتبوویەبەر دارشت، پێش کودەتاکەی (18– بروم) واندەییەکان، چەند سەرکەوتنێکیان لەشەڕکردن لەگەڵ کۆمارییەکاندا بەدەست هێنابوو، شاری (نانت)یان گرتبۆدەست وبەدەنگی بەرز لەسەر تەپۆلکەو بەرزاییەکانەوە دروديان لەبورینەکاندەدا، ناپلیۆن لەلایەك سەربازەکانی پڕچەك وتفاقکردوو لەلایەکیش پەیمانی لێبوردنی بۆئەو کەسانەدەرکرد کەچەك دادەنێن وپێی ڕاگەیاندن هیچ دەستدرێژیەك ناکرێتەسەر مەزهەبەکەیان کەکاسۆلیکی بوون، سەرئەنجام ڕازیبوو لەگەڵ ڕابەری بەناوبانگی ئەمانە (ژۆرکا دودال) گفتوگۆبکات وڕێککەون، ناپلیۆن پەیمانی ناوبراودا لەکاتی دانوستاندا کەئەو لەپاریس دەمێنێتەوە ئەگەر ڕێکبکەون– یان نا، گیانی پارێزراو دەبێت ودەتوانێت چ کات بیەوێت وبەسەلامەتی بگەڕێتەوە، بەم جۆرە ئەو لادێییە کۆنەپەرستەی ولایەتی (برتانی) بەپەیکەرێکی زل وزەبەلاحەوە، چەند کاتژمێرێك بۆدانوستان لەگەڵ دەستەپیاوێکی لاواز (کەتا ئەوکاتەش پێیان دەگوت بۆناپارت) دانیشت، لایەنگرو موریدەکانی ناپلیۆن تەواو دڵنیگەرانی



فەرماندەکەيان بوون ولەژوورەکانی تردا جەنجاڵيان دروستکردبوو، ئەمانە دەيانزانی کادودال بۆ دەستگەيشتن بەئامانجەکانی خۆی، ئامادەيە هەموو فيداکاريەك بکات، چونکە لەدەمێکەوە ناوبراو سەرچڵی دەکات وقومار بەگيانی خۆی دەکات.

بۆ کادودال، ناپليۆنی نەکوشت؟

چونکە هەتا ئەوکاتەش ئەوئوميدە هيچەی مابوو وبەپێی وابوو ناپليۆن لەلايەنگرانی ڕژێمی شانشينيەو بەوە تەفرەی خواردبوو کەئەونيازێکی شاراوەی هەيە، تەنانەت لايەنگرانی ڕژێمی شانشينيش وێنای ئەوەياندەکرد ئەوفەرمانڕەوا گەنجە دەيەوێت نەخشەيەك بەرپابکات وەك ئەوەی ( ژرژمانك )[٩٧] لەسالی(1660) لەبريتانياکردی، واتە: ئەو کەسەی يارمەتی بنەماڵەی پاشايدا بۆگەڕانەوەيان بۆسەر کورسی دەسەڵات وکۆماريی لەناوبرد.

ديارە ناپليۆن حکومەتی کۆماری لەناوبردوو بەشێوازی کارکردنی دامودەزگاکانيشی ئەوەی نيشاندەدا، وەك ئەوەی کار بۆحکومەتێکی سەرکوتکەربکات، بەڵام ئايا وێنای ئەوەدەکرێت کەسێکی وەك ئەو کەدەسەڵاتی يەکەمی حکومەتی لەدەستدايە بيداتە دەست کەسێکی تر؟ ئەگەر ئەمەش نەگرينەبەرچاو داخوا کردنی ئەم کارە سەبارەت بەئەو دەستيدەدا– يان نا، ئەمە گەورەترين هەڵەبوو کەلايەنگران وهەندێك لەکۆنەپەرستەکان ئومێدی خۆيان لەسەر هەڵچنيبوون.

کادودال، ناپليۆنی نەخنکاند، بەڵام بەبێ ڕێککەوتن لەژوورەکە هاتەدەرێ، کنسولی يەکەم چەند پێشنيارێکی بۆ کادودال کردبوون، لەمانەش: بەئەوی گوتبوو بەپلەی سەرلەشکر خزمەتی سەربازی بکات وبەمەرجێکيش تەنها شەڕ لەگەڵ دوژمنانی دەرەکيدابکات، کادودال ئەو پێشنيارەی ڕەتکردبۆوەو گەڕايەوە واندە، ماوەيەك دوای ئەمە يەکێکيتر لەپێشەواکانی (شوان) کەناوی (فروتە)بوو بەديلگيراو گوللە بارانکرا.

کادودال کەپێشتر لەمانگی نۆفمبەری ساڵی(1800)دا لەشەڕ لەگەڵ دەوڵەتدا تێشکابوو، دوای ئەو دانوستانەی لەگەڵ ناپليۆندا دووبارە دەستی کردەوە بەشەڕکردن ودواتر ناچاربوو بۆماوەيەکی دوورودرێژ خۆی بشارێتەوەو جارجارەش هێرشی لەناکاوی دەکردەسەر يەکە سەربازييە بچوکەکان.

سەرکەوتنەکانی سوپای فەرەنساو دەرکردنی لێبوردنی گشتی وچاکسازيکردن لەسياسەتی دژبە ڕۆحانييەکان هەموو ئومێدی گەڕانەوەی بنەماڵەی بوربنەکان وئەو فيوداليیانەی بۆگەڕانەوی سيستمی شانشينی بەناپليۆنيان هەبوو کەمدەکردەوە، واتە ئەم شتانە ورەو ڕۆحيەتی شوانيەکانی دادەبەزاند، کادودال دەيبينی چەکدارەکانی پۆلپۆل دەڕۆن، لەولايەتی واندەدا خەڵك زياتر کەوتبوونە چاوەڕوانييەوەو دەيانويست بەپێهەڵگرتن وماستاو وکلکەسوتەکردن سەرنجی سەرۆك کۆماری تازە بۆخۆيان رابکێشن، واتە: لايەنگرانی سيستمی شانشينی ئەوەياندەکرد، ناپليۆن نەيدەويست لەمەزياتر زەبروزەنگ دژبە ئەمانە بەکاربهێنێت، چونکە لەکەژی بەهاردا گرتنەبەری شەڕێکيتری لەخەياڵدابوو، ئەولەکردنی کارێکی زەوريەوە بۆکارێکی زەرورتر دەچوو، ئەو لەکوشتن وبڕينی چەتەو ڕێگرەکانەوە هاتەسەر شەڕی واندەو ئينجا ئاوڕی لەباری ئيداری ومالی دەوڵەت دايەوە، چونکە دەبوا لەشکرێکی بەهێز بۆبەهار ئامادەبکات، خەزنەی دەوڵەت پارەی تێدانەبوو، دەزگای ئيداری ديرکتوار سامانی دەوڵەتيان تەواو دزيبوو، ناپليۆن پێويستی بەشارەزايەکی ئيداری بوو کەکەسێکی بەتواناو لێزان بێت، ئەمە زۆر

---

[97] -ژرژمانك: سوپاسالارێکی بريتانيەو جێگری کرومول بوو(1608-1670) ئەو سەرەتا دژی لايەنگری ڕژێمی شانشينی بريتانيا دەجەنگا بەڵام دواتر چارلسی هێنايەوە سەرکورسی دەسەڵات(لەبريتانيا)(و- فارسی)

1-( 1608-1670) شۆڕشی گەورەی بريتانيا.



درێژەی ئەکێشا کەسێکی بەناوی ( گودن )[٩٨] دۆزیەوەو کردیە وەزیری دارایی، بەڵکە ئەویستە لەم بوارەشدا ناپلیۆن کاروبارەکانی زەمینداری وکشتوکاڵی، یەکلاو جێبەجێکرد، دواتر ئیمپراتۆرو وەزیری دارایی نەخشەی ئەوەیان دانا گرنگی بەباجی ناڕاستەوخۆ بدەن، ئەم جۆرە پۆلێنکردنەی باج وەرگرتنە کەهەژارو دەوڵەمەندی بەیەکسانی دەگرتەوەو بەئاسانی دەتوانرا وەگیربکەوێت، چونکە کڕین وفرۆشتنی کەلوپەلی ڕۆژانە باجی ڕاستەوخۆ وباشی دەبێت بۆدەوڵەت، برژوازیەتی شارودێهات لەپیادەکردنی ئەم سیاسەتە ناڕەحەتبوون، هەروەها لەودەستپێشخەریانەش کەلەوبارەوە دەکران، وەك: دامەزراندنی دەزگایەکی تایبەت بەچاودێریکردن وبەدواداچوون بەدەزگاکانی ئیداری دەوڵەتداو نەهێشتنی دزی ودەنگەڵی وبەرتیل خواردن، دزو بەرتیل خۆرەکان زۆربوون، تەنانەت هەندێ لەمێژوو نووسەکان کەوتوونەتە بیری ئەوەی بەتوێژێکی برژوازی ڕیزبەندبکەن. هەندێك لەسود خۆرو بەتاڵانبەرانی سامانی گشتی دەوڵەت، هەرزوو هەستیانکرد فەرمانڕەوای تازە بواری ئەمەنادات، ناپلیۆن یەکێ لەدەسەلاتدارانی حکومەت کەبەهۆی دزینی ماڵی دەوڵەتەوە دەوڵەمەندبیوو وبیبووە قسەکەرو دەمڕاستی خەڵك زیندانی کردو هەندێکی تریشی خستنەژێر چاودێرییەوە، فەرمانیدا لەهەموو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا ئەنجومەنی نەزاهەت بەحسابەکاندا بچێتەوەو لێیبپێچینەوە لەگەڵ ژمێریارەکاندا بکات، زۆرجار ئەگەر کەسێك شتێکی هاتباوەسەرو ناوبراو بیشی سەلماندبا ئەوخەتای نییە، هەر زیندانی دەکردو ئەوەندە لەزینداندا دەیهێشتەوە تاناوبراو لەتاواندا پارەی وردەی دزراویشی دەدایەوە دەوڵەت، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێستاش زۆری مابوو تەواو دزی وبەرتیل خواردن ڕیشەکێش بکات.

**(4)**

ناپلیۆن زۆر بەجدی خەریکی ڕێکخستنەوەی دام ودەزگاکانی دەوڵەت بوو، فەرەنسای بەسەر ولایەتەکاندا دابەشکردەوە، بەلام شوێنەواری هەرجۆرە خودموختاریەکی ناوخۆیی لەناوبرد، هەموو دەزگاکانی هەڵبژاردنی لەشارو گوندەکاندا لابرد، ئیتر وەزیری ناوخۆ وپارێزگارێك تەواوی دەسەلاتی ڕەهایان پێدرا، پارێزگار لێپرسراوانی تری شاری ودێی وەك: قایمقام وبەڕێوەبەری شارەوانی وبەڕێوەبەری فەرمانگەکانی دەوڵەت و... هیتری دیاری دەکردو ئەمانە لەبەرامبەر پارێزگاردا بەرپرسیاریەتیان هەبوو وئەو دەیتوانی لەسەر کاریان لابیات ، ئەنجومەنی پارێزگاو ئەنجومەنی گشتی شار سەربە خودی پارێزگاربوون، کاری ئەنجومەنی گشتیش تەنها ئەوەبوو ئاگاداری پارێزگاکان بکەنەوە لەکەمو کوریەکانی ئەو پارێزگایانە، وەزیری ناوخۆ دڵی کاروبارە ئیداریەکانی دەوڵەتی لەدەستدابوو، دەسەلاتەکانی ئەو بوارەکانی بازرگانی و پیشەسازی وهەموو بوارەکانی تری ئیداری دەگرتەوە، بەلام ئەم دەسەلاتانەی وەزیری ناوخۆ دواتر وردەوردە لەلایەن ناپلیۆنەوە دابەشکران بەسەر وەزارەتەکانی وابەستە.

لەدادگانیشدا ڕیفۆرمی گەورەکرا: لەنیوەی مانگی مایۆدا ناپلیۆن قانونێکی تازەی سەبارەت بەدامەزراوەکانی وەزارەتی داد دانا، ئەودوای ئەوەی شێوازی دادگاکانی گۆڕی، دەستەی دادگای باڵای نەهێشت، هێزی ڕەهای ئەو ئەوەندەبوو قبوڵی

---

[٩٨] - مارتن میشل شارل( 1756-1841) داهێنەری سیستمێکی تایبەت بەوەرگرتنی باجی ناڕاستەوخۆوجیاکردنەوەی خاوەنداریتی زەوی وزار، دواتربوو بەوەزیری دارایی ناپلیۆن ولەساڵی (1809)دا نازناوی( دوك دوگائت )ی پێبەخشرا. (و- فارسی)



نەدەکرد دەنگی ئازادی لەدامەزراوەکانی دادگادامەبێت، بۆیە هەموو ئەندامانی دەستەی دادگای باڵای بەیەکجار لەسەرکار لابرد، کاتێ شەڕی دوژمنانی سیاسی لەئارادابوو، ناپلیۆن بواری ئەوەی نەبوو دادگا سەربەخۆیی خۆی هەبێت، بەڵام ئەوکاتیش کەسێك شەڕی لەگەڵ پەلێکی تردا دەکرد– یان کێشەیەکی دوور لەسیاسەت ڕوویدەدا ناپلیۆن حەزیدەکرد دادگا بەبێ لایەنگری سیاسی پیشەکەی خۆی بەڕێوەببات، کاتێ دەستەی حاکمە باڵاکانی دەوڵەت کەلەلایەن خۆیەوە دانرابوون هاتنەسەردانی، ناپلیۆن پێی گوتن: هیچ کاتێ بیرلەوە نەکەنەوە کەکەسێك پەنای بۆئەوان هێنا هەتا دادیان بپرسێت ی ئەوە بگرنەبەرچاو سەربە چ حزب وڕێکخراوێکن، ناپلیۆن گرنگی ئاسایشی ناوخۆدا، بەتایبەت پایتەخت، سەرۆکی پۆلیسی پاریس هەرچەندە سەربە وەزارەتی ناوخۆبوو، بەڵام کەڵکی لەهەندێك بڕیاری تایبەتیش وەردەگرت وراپۆرتەکانی خۆیان ڕاستەوخۆ دەدایە کنسولی یەکەم، لەهەمان سەرەتاوە ئەوە ئاشکرابوو کەناپلیۆن دەزگای پۆلیس دەکاتە ناوەندێکی تایبەتی چاودێری و هەواڵگری تالەوڕێگایەوە بتوانێت هەڵسوکەوتی وەزیرەکان چاودێری بکرێت، ناوبراو دەزگای هەواڵگری وزانیاری گەیاندنی بەسەرچەند بەشێکدا دابەشکردن کەهەندێکیان جاسوسیان بەسەرهەندێکی ترەوە دەکردو تایبەت بوون.

فوشەی کردە لێپرسراوی پۆلیسی گشتی[99] کەناوبراو کەسێکی زۆر شارەزابوو لەوبوارەداو ئای وئۆین وتەڵەکەبازی باشی دەزانی وبەکورتی پیاوی پلەیەکبوو لەم ڕووەوە.

ناپلیۆن دەیزانی فوشە نەك ئەو، تەنانەت باوکی خۆشی بەبڕە پارەیەکی باش دەفرۆشێت، بۆیە چەند هەواڵگرێکی جێگای باوەڕی خۆی بۆچاودێری کردنی هەڵسوکەوتی فوشیە دانان. هەمیشە ناپلیۆن لەوبڕوایەدابوو کەفوشە چاونەترسەو لەنەنگی وناوناتۆرە سڵناکاتەوە.

چەند ساڵێك دوای ئەمە ناپلیۆن تاجی دەسەڵاتداریەتی ڕەهای نابۆسەر وفوشەش بەجلوبەرگی زێرکفتی وەزارەتی پۆلیسەوە مەدالیاو نیشانەکانی ئازایەتی وخەڵاتەکان بەسەرسینگیەوە دەبریسکانەوە، ڕۆژێکیان ناپلیۆن زۆر شپرزەو تورەبوو ویستی سوکایەتی بەفوشە بکات وهەموو ئەوکارە خراپ وناڵەبارانەی پێشووی وەبیر بێنێتەوە، لەپڕ پێی گوت ( تۆ[100] هەمان ئەوکەسەی کەڕات لەسەر لەسێدارەدانی لویسی شازدەهەمدا).

فوشەش وەك هەمیشە سەری ڕێزی لەبەرامبەر ئیمپراتۆردا نەوی کردوو لەوەڵامدا گوتی(تەواو ڕاستە، ئەمە یەکەم خزمەتم بوو کەتوانیم بەبەڕێزتانی بکەم) قسەیەکی پرمانابوو، فوشە ویستی بەئیمپراتۆر بڵێت خۆشبەختی هەردووکیان دەگەڕێتەوەبۆ شۆڕشی کۆماری، بەوجیاوازیەی یەکێکیان شۆڕشیان لەناوبرد هەتا جێگا بەتاڵەکەی لویسی شازدەهەم بگرن ودەسەڵات بگرنەدەست، ئەوەی تریشیان بەدڵسۆزانە یارمەتی یەکەمیدا، لەڕاستیدا فوشە لەساڵی (1799)دا زۆر کەڵکی بۆناپلیۆن هەبوو، چونکە خیانەتی بەدۆستەکانی پێشووی خۆی کردو هەموویانی بەئاغا[101] تازەکەی فرۆشت.

---

99 - پۆلیسی گشتی: مەبەست لەهێزەکانی ناوخۆیە.

100 - تۆ: فوشەیە.

101 - 1 - ئاغا: مەبەست لەناپلیۆنە.

2- کنسولی یەکەم: واتە لێپرسراوی دووکەسەکەی تری کنسولی.



ناپلیۆن لەهەمان ئەو زستانەی گەیشتەسەر کورسی دەسەڵات، ناوەندێکی دەوڵەتی بەهێزی دروستکرد کەلەهەموو ڕووەکانەوە بێ کەم وکوڕی بوو وبەهۆی دەستەیەك کەسی خاوەن پلەوپایە بەرز بەڕێوەدەبرا، هەموو دەسەڵاتێکی دەوڵەت بەپێی دەستوری وڵات کەوتبۆدەست کنسولی یەکەم.

ناپلیۆن جارێکیان گوتی( دەبێ دەستوری بنچینەیی دەوڵەت کورت وپوختبێت) بەوجۆرە خۆی زاڵکرد بەسەر دەستوریشداو دەیگوت کاتێ دەتانەوێت زاراوەی قانونی بەکاربهێنیت دەبێ کورتوپوخت بنووسرێت، ئەمەش بەئامانجی ئەوەبوو هەموو هێزی دەوڵەت لەچنگ خۆیدا کۆبکاتەوە. ئەگەر لەدنیادا فەرمانرەوایەکی لەخۆرازی‌و قەبولی هیچ سنووردارییەکی نەکردبێت هەبوبێت، ئەوا هەرناپلیۆنە.

هەرلەسەرەتای ڕۆژانی کودەتاکەوە، ئەوانەی ساویلکانە ببوونە پارێزەرو بەرگریکەر لەناپلیۆن، بەتایبەت سیەیس‌و هاوشێوەکانی، بوونە قوربانی ئەوو وەك دووکەڵ بەئاسمان هەڵچوون.

کاتێ سیەیس پێشنیارێکی خستەبەردەم ناپلیۆن‌و بەپێی ئەو راپۆرتە ناوبراو داوایکردبوو پلەوپایەی بەرزی پێبدرێت، وەك سەرۆکایەتی حکومەت [102] ناپلیۆن لەوڵامی ئەمەدا گوتی (من رازی نیم ئەم کارە پێکەنیناویە بکەم) ئەو پێشنیارەی سیەیسی رەتکردەوە.

ئینجا سیەیس سوربوو لەسەر ئەمەو ویستی ملەی لەگەڵدابکات، لەوکاتەدا فوشەی وەزیری هێزەکانی ناوخۆ چوو سەردانی سیەیسی کردوو بەڕێنمایکردنی دۆستانە ئاگاداری کردەوە کەناپلیۆن لێپرسراوی تەواوی هێزە چەکدارەکانی وڵاتەو پێویستە ئەوەبزانێت ئەگەر پێ داگرێت لەسەر ئەمە، کەڵکی نییەو تەنانەت ئاکامەکەشی خراپە، دیاربوو ئەم ئامۆژگارییەی فوشە قەناعەتی بەسیەیس هێنابوو وئیتر لەوکاتە بەدواوە سیەیس قەراقیی لەم مەسەلەیەکرد، دەستوری ساڵی هەشتەمی کۆماری بەم جۆرەبوو( دەستوری دەوڵەت، کەلەژێر چاودێری خودی ناپلیۆندا نووسراوەتەوە) ئەم دەستورەش تەواو لەگەڵ ئەو دروشم و ئامانجانەی ناپلیۆندا دەهاتەوە، هەموو هێز لەدەستی کنسولی یەکەمدابوو ودوو کنسولەکەی تر تەنها ڕای مشورەتیان هەبوو، ناپلیۆن بۆماوەی دە ساڵ وەك کنسولی یەکەم هەلبژێردرابوو، کنسولی یەکەم ئەندامانی پەرلەمان کەژمارەیان دەبوا (80) کەس با بۆخۆی دیاری دەکردن وهەڵی دەبژاردن. هەموو خاوەن پلەو پایەکانی دەوڵەت، ئەفسەرانی سوپا، وەزیرەکانیش بەزەوقی خۆی هەڵیدەبژاردن ودایدەنان، تەنانەت ئەوانەی کەکاریشیان لەوەزارەتەکاندا دەکرد لەبەرامبەر ئەودا لێپرسراویەتیان هەبوو.

ناپلیۆن دوو دامەزراوەی تری دروستکردن کەبۆ بەهێزکردنی جێبەجێکردنی کاروبارەکان بوون، یەکەمیان (تریبونا)بوو وئەوی تریشیان دەستەی یاسادانان بوو، ئەندامانی ئەم دوو ناوەندە گوایا لەسەر داوای پەرلەمان (بەڵام لەڕاستیدا لەسەر خواستی کنسولی یەکەم بوو) لەنێوان هەزاران کەس هەڵدەبژێردران کەداواکاریان بەرزکردبۆوە.

دواتر ئەنجومەنێکیش بەناوی شۆرای دەوڵەت دروستکرا کەئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە هەموویان لەلایەن حکومەت وکنسولی یەکەمەوە دیاری دەکران، دەبوا ئەم دوو دەزگایانەی لەسەرەوە ناومانبردن بەپێی ئەم خاڵانەی خوارەوە کاربکەن، دەوڵەت

---

102 - سەرۆکایەتی حکومەت: واتە سەرۆك وەزیران،(و- فارسی)



پێشنیارێکی قانونی دەدایە شۆرای دەوڵەتی وشۆراش ئەو لیستەی سەیردەکردو ڕای خۆی لەسەردەردەبڕی ودەیدایە ئەنجومەنی تریبونا، تریبوناش مافی ئەوەی هەبوو سەرزارەکی ڕای خۆی لەسەردەربیبڕێت، بەڵام بۆی نەبوو بڕیاری کۆتایی لەسەربدات، دواتر ئەو پێشنیارە قانونییە دەنێردرا بۆ ئەنجومەنی یاسادانان وئەو ئەنجومەنەش مافی ئەوەی نەبوو گفتوگۆ لەسەرئەم پێشنیارە قانونییە بکات وتەنها دەیانتوانی سەبارەت بەوپێشنیارە قانونییە یاداشتی لاوەکی بەرزبکەنەوە، دواتر ئەو پێشنیارە قانونییە دەنێردرایەوە لای کنسولی یەکەم وحوکمی قانونی پێدەدرا، ئەم ئەنجومەنی یاسادانانە هەمیشە لەژێر دەسەڵاتی ناپلیۆندابوو، دواتر لەساڵی (1807)دا ناپلیۆن ئەنجومەنی تریبونانی هەڵوەشاندەوە، زۆرجار ناپلیۆن هەندێ بڕیاری ڕاستەوخۆ بۆپەرلەمان دەنارد هەتابڕیاری لەسەربدەن و هەردوو ئەنجومەنی یاسادانان و جێبەجێکردنی پشتگوێ دەخستن، چونکە ئەودوو[103] هێزە تەواو کەوتبوونە دەست خۆی، بەم جۆرە دیکتاتۆری تازە توانی لەساڵی (1800)دا دەستبەجێ نەخشەکانی خۆی بەڕووکەش قانونیانە ئەنجامبدات، هەربەپێی ئەم ڕەوشە ناپلیۆن توانی دوژمنەکانی لە( واندە)دا لەناو ببات وچەتەو ڕێگرەکان نەهێڵێت ودزی وبەرتیل خواردن وگەندەڵی ئیداری ڕیشەکێشبکات ویەك تۆڕی جاسوسی بەرفراوان دروستبکات کەلەژێر چاودێری ولێپرسراویەتی فوشەدابوو، ئەگەر بشێ ئەم گوتەیە بەکاربهێنین وبڵێین فوشە بەڕاستی باوکی جاسوسکاری بوو، ڕاستە، وەك چۆن پەندێك لەڕۆمی کۆندا هەیەو دەڵێت (کەمرۆڤی شاعیر دێتە دنیاوە، دەبێتە ڕاوێژکار) فوشە یەك داهێنەری دەزگای جاسوسی بوو، تەنانەت لاسایکەرەوەکانی تری وەك: دلکارتوی ئیتالی وبنکندۆرف ودوبلتی ڕوسی وزیدل نیکی نەمساوی، بێ هودە هەوڵیاندەدا لەسەر شێوازی ئەوبڕۆن، ناپلیۆن تەواو دەسەڵاتی دابۆ فوشە بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی وچەند جاسوسێکی تایبەتیشی بۆچاودێری کردنی ناوبراو دانابوو، ئەو باش دەیزانی ودەیویست پێشنەوەی بەهاربێت وبچێت بۆشەڕێکی دوورەدەست، دەبێ تەواو دڵنیابێت لەکاروبارەکانی دەوڵەت وئامادەکاری دڵنیاکەرەوەی لەجێبەجێکردن وهاتنەسەرباری سیستمی وڵاتدا هەبێت.

ناپلیۆن تەنها بەوە نەوەستایەوە لێپرسراوانی دەزگاکانی پۆلیسی ناوخۆ باش ولێوەشاوەبن وهەموو ئیمکاناتێکیان بخاتەبەردەست، بەڵکو (13) ڕۆژنامەی کەلەکۆی گشتی (60) ڕۆژنامە مابوونەوەو بەشێوەیەکی کاتی بڕیاری ڕاگرتنیان درابوو، یەکجارەکی بڕیاری داخستنیانی بۆدەرکردن، ئیمپراتۆر لەچوونی بۆشەڕ، کوتەکی سەرکوتکردنی کەخۆی دروستی کردبوو، دەدایە دەست وەزیرەکانی ولەو کاتانەی شەڕی لەگەڵ هاوپەیمانانی ئەورووپیدا دەکرد، ڕاگرتنی ئاشتی وئارامی وڵاتی لەو وەزیرانە داوادەکرد، بەڵام مانگێك پێشنەوەی ناپلیۆن بچێت بۆشەڕ لەمانگیئیبریلی ساڵی (1800)دا، فوشە گروپێکی هاوبەش لەئینگلیزەکان و لایەنگرانی سیستمی شانیشینی کەپەیوەندیان لەگەڵ براکانی لویسی شازدەهەم دابوو، واتە: کنت دوو پرو وانس وشارل کنت دارتو) کەشفکردو ئەو زانیاریەی گەیاندە ناپلیۆن، ئەو لایەنگرانەی ڕژێمی شانشینی بەئاشکرا خەریکی کودەتابوون و ویستبوویان بەیارمەتی بریتانیا دەسەڵاتی فەرەنسا بگرنەوەدەست، بۆیە بریتانیەکانش پشتگیری لایەنگرانی گێڕانەوەی شانشینی فەرەنسایان کردبوو، چونکە ئەمانە ئامادەیی خۆیان دەربڕیبوو ئەگەر دەسەڵاتیان گرتەوە دەست هەموو جۆرە ئیمتیازێك بەبریتانیا دەدەن لەڕووی بازرگانی وپیشەسازی وسیاسی، ناپلیۆن تەواو گەیشتە ئەوڕایەی

---

[103] - ئەو دوو هێزە: مەبەست لەئەنجومەنی ترلیبون وجێبەجێکردنە ( واتە: یاسادانان و تەنفیزی)



پێویسته سه‌ره‌تا دوژمنانی ناوخۆ، ئه‌وانه‌ی لایه‌نگری هاتنه‌وه‌ی بوربۆنه‌کانن سه‌رکوتبکات وله‌ناوبه‌رێت، ئینجا شه‌ڕی بریتانیا بکات، فه‌رمان بۆ فوشه ده‌رکرا ده‌ستبه‌جێ ئه‌وانه‌ی لایه‌نگری سیستمی شانشین زه‌بریان لێبوه‌شێندرێت، ئه‌مانه ده‌ستبه‌سه‌ربکرێن وڕه‌وانه‌ی دادگابکرێن.

زۆرجار ناپلیۆن ئه‌م ڕسته‌یه‌ی دووباره ده‌کرده‌وه که‌بڕوای ته‌واوی پێ بوو(جولاندنی پیاوان هاوتایه له‌گه‌ڵ جولانی ئه‌هرامی میسر، سکه‌وترس)

به‌کارهێنانی وشه‌ی سکه به‌لای ئه‌وه‌وه ته‌نها مه‌به‌ست له‌پاره‌نه‌بوو، به‌ڵکو هێزخوازی وده‌سه‌ڵات په‌رستی باڵا ده‌ستیشی ده‌گرته‌وه، چۆن ده‌بێ دژی ئه‌وانه لایه‌نگرانی سیستمی شانشینی بێته‌وه؟ ڕۆژگارێك به‌په‌نابردن بۆ زۆر وسته‌م، دواتر به‌فریودانیان وپاره‌و پله‌وپایه پێدانیان، له‌به‌هاری ساڵی(1800)دا ئیتر ناپلیۆن په‌له‌ی بوو هه‌رچی زووتر خۆی بگه‌یه‌نێته سوپاکه‌ی وکاتی ئه‌وه‌ی به‌ده‌سته‌وه‌نه‌مابوو، جگه‌له به‌کارهێنانی هێزو کوشت وکوشتاری لایه‌نگرانی ڕژێمی شانشینی به‌ڕێگای پاره‌پێدان ولاواندنه‌وه مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵدابکات، شه‌ڕی ناپلیۆن له‌گه‌ڵ بریتانیادا ڕاسته‌وخۆنه‌بوو نه‌له‌سه‌ر ده‌ریاش بوو، به‌ڵکو وه‌کو ڕابردوو سه‌ره‌تا له‌دژی نه‌مسا ده‌ستی پێکرد که‌یه‌کێکبوو له‌هاوپه‌یمانانی ئه‌وروپا، کاتێ ناپلیۆن له( 8- مایۆی ساڵی(1800)دا فه‌ره‌نسای جێهێشت، زانی مانه‌وه‌ی حکومه‌ته دیکتاتۆره‌که‌ی ئه‌و له‌فه‌ره‌نسادا په‌یوه‌ندی ته‌واوی به‌ئه‌نجامی ئه‌م شه‌ڕه‌وه‌هه‌یه، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه- یان سه‌روی ئیتاڵیا له‌چنگ نه‌مساوییه‌کان ده‌ربهێنیته‌وه- یان ئه‌وه‌تا جارێکیتر سوپای نه‌مساوی دێنه‌وه‌سه‌ر سنووره‌کانی فه‌ره‌نساو مه‌ترسی دروستده‌که‌نه‌وه.

## مارنگو- چه‌سپاندنی دیکتاتۆری

### ده‌ستوردانانی کنسولی یه‌که‌م (1800- 1803)

(1)

ناپلیۆن خۆی ئه‌وه‌ی نه‌بوو نه‌خشه جه‌نگییه‌کانی خۆی پێشوه‌خت ورده‌کارییه‌کانی بخاته‌ڕوو،به‌مانایه‌کیترهه‌رئاماجه‌سه‌ره‌کییه‌کانی ئاماژه‌پێده‌کردوبه‌شه لاوه‌کییه‌کانی هێڵه گشتییه‌که‌ی مه‌رامبون، له‌ڕاستیدا ئه‌و جگه‌له بیرکردنه‌وه‌ی پلان وڕه‌وشی شه‌ڕکردن که‌متر بیری له‌شتیتر ده‌کرده‌وه، جگه‌له‌مانه‌ش ڕۆژ به‌ڕۆژ ته‌نانه‌ت هه‌ندێکجار سه‌عات به‌سه‌عات ئاگاداری جموجۆڵی سوپای دوژمن بوو، بنه‌مای کاره‌کانی ئه‌و له‌سه‌ر ئه‌وه‌بووکه هه‌میشه دوژمنی به‌ژیرترو شاره‌زاتر هه‌ژمار ده‌کردوو ده‌یگوت مادام تێکهه‌ڵچوونی شه‌ڕی سه‌ربازی ڕووی نه‌داوه که‌واته ده‌بێ دوژمن به‌مه‌ترسیدار سه‌یربکرێت، ناپلیۆن به‌هێواشه‌کی شه‌ڕی له‌دژی سوپای نه‌مسا کرد که‌سه‌رووی ئیتالیای داگیرکردبۆوه‌و ساڵی پار سوپای فه‌ره‌نسای تێدا تێکشکاندبوو، به‌سه‌رکردایه‌تی فه‌رمانده‌ی به‌ناوبانگی ڕوسی سڤۆرۆف، به‌ڵام سڤۆرۆف له‌گه‌ڵ سوپای نه‌مسادا نه‌مابوو وئه‌مه‌ش به‌لای ناپلیۆنه‌وه زۆر جێگای سه‌رنج و گرنگی بوو، چونکه ده‌یزانی ئیتر ڕوسیا له‌هاوپه‌یمانی ئه‌وروپا چۆته‌ده‌رێ، ته‌نانه‌ت تائه‌وکاته‌ش نه‌یده‌زانی که‌له‌هه‌مان مانگی ئۆگۆستی ساڵی (1800)دا له‌وکاته‌ی بۆسرپینه‌وه‌ی سه‌رکه‌وتنه‌کانی سڤۆرۆف پێی نایه‌وه‌سه‌ر خاکی ئیتالیا، له‌شاری پترسبۆرگی ڕووسیادا خه‌ریکی ناشتنی ته‌رمی سڤۆرۆف بوون له‌مه‌زاری(ئه‌لکسانده‌ر نوسکی)دا، ئیتر له‌ڕووبه‌ڕووی سوپای ناپلیۆندا سڤۆرۆف نه‌بوو، به‌ڵکو ته‌نها



(ملاس)بوو کەمۆسیقاژەنێکی باش وسەرلەشکرێکێکبوو لەفەرماندە لێوەشاوەکانی سەربازی ونـاپلیۆن سـالانی(1800)و دواتریش یەك لەدوای یەك تێکیشکاندبوو، بەلام ئەمانە بەخەسـتی لەهـەولی ئـەوەدابوون وای نیـشانبدەن وپروپاگەنـدەی ئەوەبکەن ناپلیۆن بەپێی بنەماکانی شەڕ ناجەنگێت، ناپلیۆن بـەپێی بـاوەڕی جـەنگی خـۆی بەشـێوەیەکی وا تونـدوتۆل وسـەختی هێرشـی کردەسـەر– مـلاس، وەك ئـەوەوابوو مـلاس نـاپلیۆن بێـت، ملاسـیش بـەجۆرێ ڕووبـەڕووی بـۆوە وەك ئەوەی ناپلیۆن بێت.

نەمساوییەکان خۆیان لەبەشی خۆرئاوای بەندەری ژەن جێگیرکردبوو، مەلاس وێنای ئەوەی نەدەکرد، ناپلیۆن سەختترین ڕێگا کەدەکەوتەوە سەرخاکی سویسراو بەتەنگەبەری (سن برنار)دا دەهاتەوە، بۆیە زۆر گرنگی بەو لایەنەدا کەچی کنسولی یەکەم هەمان ئەو ڕێگایەی گرتەبەر، سەرمای قەلاتە پڕبەفرەکان وبنهەلۆلی بەفرو جومگەی ڕنووی کەلەژێر پێی سەربازەکاندا قلیشیان دابوو وکرابوونەوە، ڕەهێلەو تۆفان وگەردەلوولی باوسەرما، ئەمانە ئەو بەلایانە بوون کەهاتەپێش سوپای ناپلیۆن وبەرگەشیانگرت، تەنها سەربازەکانی ئانیپال دووهەزار سـال لەمەوبـەر وپـێش سـوپای سـۆڤرۆف ونـاپلیۆن بەرگـەی ئـەو سەختیەی ئەم ڕێگایەیان گرتبوو، بەجیاوازی ئەوەی وەك ڕۆژگاری ئانیپال فیلەکان خلۆری دۆل وچەمەکان نەدەبوونەوە، بەلکو ئەمجارەیان تۆپەکان بوون، ژنرال لان پێشرەوی سوپابوو ولەدوای ئەوەوە سوپا بەڕیزێکی بێ کۆتایی لەجولەدابوو، برینی ڕێگای چیاکانی ئالپ ڕۆژی (16)ی ئۆگۆست دەستپێکردوو لەڕۆژی (21)ی هەمان مانگدا ناپلیۆن بەسوپاکەیەوە گەیشتە تەنگەبەری سن برنار، تەنها شەڕێکی سوك ڕوویدا لەگەل یەك یەکەی سەربازی نەمساویدا کەپاسەوانی تەنگەبەری ناوبراویان دەکرد، لەماوەیەکی کەمدا ئەو سەربازە نەمساویانە هەلاتن وڕاستەوخۆ سوپای فەرەنسی بێ کات بەفیڕۆدان بەرەو خواروو ڕۆیشتن وکەوتنە پشتی سوپا سەرەکییەکەی نەمسا.

ناپلیۆن ڕاستەوخۆ بەرەو شاری میلان ڕۆیشت ولە( 1800/6/2)دا پایتەختی لمباردی داگیرکرد، ئینجا شارەکانی (پاوی وکرەمون وپلیزاس وبرەچیاو هەموو شارۆچکەو گوندەکانی ئەوناوچەیەی خستەژێر ڕکێفی خۆیەوەو لەهەمان شوێندا سوپای نەمساویەکانی تێکشکاند، تائەوکاتەش سوپای نەمـسا هەرلـە دەوروبـەری ژەنـدا مـابوون کەماوەیـەك لەمەوبـەر سـوپای فەرەنسایان لەوێدا تێکشکاندبوو، بەلام هاتنی ناپلیۆن ئەم سەرکەوتنەی ئەمانەی بەربادداو بەهای نەهێشت.

ملاس بەپەلە ڕووبەڕووی سوپای فەرەنسی بۆوە کەبەشێوەیەکی چاوەڕوان نـەکراو لەسـەرووەوە سـەریان دەرهێنـابوو، لەنیوان پانتایی دەشتەکانی ئەلکساندراو ترتوندا گوندێك هەیە بەناوی مارنگو، لەسـەرەتای زسـتاندا نـاپلیۆن لەکۆشـکی کۆماری فەرەنسادا لەسەر نەخشەی پلانی شەڕی داهاتووی بەپەندجە ئامـاژەی بەوگونـدە کردبـوو وبەلێپرسـاوانی بـالای دەولەتی نیشاندابوو وگوتبووی(پێویستە ئێمە لێرەدا نەمساوییەکان تێکبشکێنین) لێکدانی گەورەی هەردوو سوپا لەڕۆژی (14/ ی ئۆنیۆ) ڕوویدا.

ئەم شەڕە بەگشتی لەناو کاروبارەکانی سیاسەتی نێودەولەتی وبەتایبەت لەڕۆلی مێژوویی ناپلیۆندا کاریگەری گەورەی هەبوو و وەدی هێنا.

بارودۆخێکی پرگومان ودوودلی بالی بەسەر پاریس وهەموو فەرەنسادا کێشابوو، لایەنگرانی سیستمی شانشینی ڕۆژ بەڕۆژ چاوەڕوانی هاتنی هەوالی لەناو چوونی ناپلیۆنیان دەکرد، چونکە هەموو لایەك دەیانزانی سوپای نەمسا لەوپەڕی بەهێزیدایەو



تۆپخانەکانیشی لەتۆپخانەی سوپای فەرەنسا بەتواناترن، هەروەها پروپاگەندەی ئەوە بلاوببۆوە گوایا سوپای بریتانیا بەم زووانە لە(واندە)[104] دا دادەبەزێت، رابەرەکانی (شوان )کان، واتە: کادودال ودۆستەکانیان تەواو دڵنیابوونەوە کەبوربنەکان بەم زووانە دێنەوەسەر تەختی دەسەلاتی فەرەنساو ئەمەش تەنها بەبیستنی مەرگی ناپلیۆن- یان تێکشانی سوپای فەرەنسا.

لەئەورووپادا تەنانەت ئەو ولاتانەی کەبێ لایەنیش بوون، بەنیگەرانییەوە چاودێری رووداوەکانیان دەکردو لەچاوەروانی سەرکەوتنی سوپای نەمسادابوون، هەتا ئەمانیش بێن پەیوەندی بەهاوپەیمانی ئەورووپا لەدژی فەرەنسا بکەن، بوربنەکان[105] خۆیان بۆگەرانەوە بۆ پاریس ئامادەکرد، ناپلیۆن وفەرماندە سەربازییەکان ئەفسەرو سەربازەکان بەوپەری جددییەوە سەیری ئەم شەرەیان دەکردو وەك رێگای هات ونەهاتیان لەقەڵەم دەداو چارەنووسی خۆیان پێوەبەند کردبوو، ئەمجارەیان نەمساوییەکان لەرووی ژمارەو پرچەکی وپێشودانەوە تەواو ئامادەبوون، لەکاتێکا سوپای فەرەنسا بەوپەری دیژواری وماندووییەوە ئەو رێگا سەخت ودوورو درێژەیان بریبوو، کۆی گشتی سەربازەکانی ناپلیۆن بیست هەزار کەس بوو، لەگەڵ هەندێك تۆپخانە کەهێنابوویانە پێشی شەرەکە، چونکە زۆربەی تۆپەکانی تری بۆ گەمارۆدانی قەلا سەربازییە ئاسیکانی سوپای نەمسای جێگیر لەسەر بەرزاییەکان دانابوون، تانەتوانن بەهانای بەشە سەرەکییەکەی سوپای نەمساوە بێن وڕێگریان لێبکات- یان بەلانی کەمەوە دوایان بخات.

لەبەرامبەردا ملاس سی هەزار سەربازو (100) تۆپی ئامادەو کەرەستەی جەنگی تەواوی لەدەستدابوو، جگەلەمەش ناپلیۆن هەندێك لەتۆپەکانی خۆی خستبوونە ژێر فەرمانی ژنرال دزەك، چونکە بۆ روو بەروو بوونەوە لەگەڵ(100) تۆپی سوپای نەمساویدا نەیاندەتوانی (15) تۆپ بێننە مەیدانی شەڕ، ئەوشەرەی بەرەبەیانی رۆژی(14/ی یۆنیۆی ساڵی (1800) لەنزیك گوندی مارنگودا روویدا، تواناو زاڵی یەکە سەربازییەکانی نەمساوی ئاشکراکرد، فەرەنسییەکان بەوپەری دلێرانە دەجەنگان، بەلام شەرەکە دیژوارتر ببوو وسەربازەکانی ناپلیۆن کەوتبوونە پاشەکشەکردن زیانی زۆریان لێکەوت، لەنزیك کاتژمێر (2)ی پاش نیوەرۆدا ئاراستەی شەرەکە رووی لەئەگەری تێکشکانی سوپای فەرەنسا دەکرد، سێ سەعاتی پاش نیوەرۆش بەشەرکردن بەسەرچوو وملاس کەسەرکەوتنی خۆی بەمسۆگەر دەزانی، تەترێکی بۆ ڤیننا ناردوو لەوپەیامەیدا راپگەیاندبووکە سەرکەوتوویەو دەستکەوتی زۆریشی دەستدەکەوێت و ژمارەیەکی زۆریشی دیلی سەربازی فەرەنسی دەبن.

سوپای فەرەنسا کەوتبۆ حاڵەتی بێسەرو بەرەیی وپەشۆکاوی، ناپلیۆن ئارامی خۆی پاراستبوو وناوەناوە دەیگوت پێویستە خۆراگرن بەرگری بکەن چونکە ئێستا شەرەکە کۆتایی نەهاتووە، چەند دەقیقەیەك لەکاتژمێر سێی پاش نیوەرۆ تێپەرییبوو، لەپر دۆخی شەرەکە گۆڕا، ئەمەش بەهۆی گەرانەوەی لەشکری دوزە کەسەرەتا بۆگرتنی رێگای پشتەوەی سوپای نەمسا دانرابوو، هەتا لەکاتی تێکشکاندیاندا رماڵیان بکەن، لەوساتەوەختە ناسك وچارەنووسسازەدا ناوبراو هاتەناو گۆرەپانی شەرو بەتۆپەکانی خۆی دوژمنی شپرزەکرد، لەو ساتەوەختەدا نەمساوییەکان بەئاستێ لەسەرکەوتنی خۆیان دڵنیابوون تەنانەت

---

104 - واندە – ناوچەیەکی باشووری فەرە نسایە.

105 - بەمانای شانشینی پێشووی فەرەنسا.(و- کوردی)

هەندێك لەیەكە سەربازییەكانیان خۆیان بۆپشوودان ونانخواردن ئامادەكردبوو، سوپای نەمسا لەژێر ئەو زەبرانەی كەلەشكری تازەهاتووی مەیدانی شەڕی دوزەو بەهێزی هێرشهێنانی تەواوی سەربازەكانی تری فەرەنسا، نەمساوییەكان بەجارێك ورەیان بەرداو خۆیان ڕانەگرت وتێكشكان، لەسەعات (5)ی ئێوارەدا سەربازەكانی نەمساویی هەڵدەهاتن وسەربازەكانی فەرنسیش سەریانكردبوونە سەرو دەیانكوشتن، ژنرال دوزە لەهەمان شەڕدا كوژرا، ئەوشەڕە گەورەی كەیەكێكبوو لەوشەڕە ناودارانەی ئەو، ناپلیۆن بەچاوی فرمێسكاویەوە گوتی (مخابن... بۆ دوزە .. ئای چەند ڕۆژێكی خۆشدەبوو ئەگەر من ئەم ئێوارەیە دوای ئەم سەركەوتنە، لەمەیدانی شەڕدا باوەشم بەدوزەدا كردبا – بۆچی من حەقمە بگریەم ؟).

پێش كۆتایی هاتنی شەڕو تێكشكانی سوپای نەمسا، ناپلیۆن كەهەواڵی كوژرانی دوزەی بیست ئەم قسانەی كردن، جگەلەم جارەیان تەنها جارێكیتر ناپلیۆن فرمێسكی لەچاوان باریون، جاری دوەمیش چەند ساڵ دوای ئەم سەركەوتنەیە لەشەڕێكیتردا مارشال لان كەگوللە تۆپ هەردوو قاچی پەڕاندبوون ولەباوەشی ئەودا مرد، ناپلیۆن فرمێسكی بۆ هەڵوەراندن وبەكوڵ گریا.

ئەو پەیامەی كە ملاس بۆ ڤیێننای ناردبۆوە، ئەوپەڕی شادی وخۆشی خستبۆ دڵی دەسەڵاتدارانی نەمسا، بەڵام ئەو پەیامەی كەتەتەری دووەم گەیاندی، ئەوەی گەیاند جارێكیتر ئیتالیایان لەدەست چۆوەو دوژمنە هەراسانكەرەكەیان سەركەوتووە، شەش ڕۆژ دوای سەركەوتنی ناپلیۆن هەواڵەكە گەیشتە فەرەنساو حكومەتی فەرەنسی، لەپڕ نیوەڕۆی ڕۆژی(20/ی یۆلیۆ، تۆپێكی شادی تەقێنراو دواتریش ودواترینیان سێیەم تۆپ تەقێندرا، تەتەرێكی تازە گەیشتوو هەواڵێكی ڕەسمی لەناپلیۆنەوە هێناوەو لەوپەیامەدا نووسرابوو، نەمسا تەواو شكستی خوارد، نیوەی تۆپخانەكانی لەدەستداوەو هەزاران سەربازی نەمساوی كوژراو دیلن وئێستا ئیتالیا كەوتۆتەوەدەست ناپلیۆن، ئەمجارەیان خۆشی و شادی نەك هەر باڵی بەسەر گەڕەكە دەوڵەمەندەكانی شاردا كێشا، بەڵكو گەڕەكە هەژارەكانیش لەخۆشیاندا وەجۆش وخرۆش هاتبوون، دەمێكبوو گەرەكی(سنت ئانتوان) خۆشی وشادی ئاوای بەخۆیەوە نەبینیبوو، ئەو كرێكارانە تائەو كاتەش نەیاندەتوانی پێشبینی ئەوەبكەن سەركردە تازەكەیان ئەوان دەخاتە دەستە پۆڵاینەكانی خۆیی وبەدەست بەستراوی دەیانخاتە بەردەست خاوەن كارخانەو كارەكان، نەیادەزانی ئەو دەسەڵاتەی كەپێشەنگەكەی دیاركەوتووەو شۆڕشی لەناوبرد، خەریكی پتەوكردنی یەك سیستمی كۆمەڵایەتی تایبەتی بەناو قانونییە كەلەسەر بنەمای ڕەنج بردنی بێ وەستان وفرۆشتنی وزەی كاریانە بۆ بژێوی سەختی خۆیان ، لەپاریسدا، لەسەرای سەنتەری بۆرسەدا، لەبەردەم بانكەكاندا، لەگۆڕەپانەكانی شاردا، خەڵك ڕژابوونەسەر شەقامەكان وبەدەربڕینی خۆشی وشادمانی مۆنجاوی دەدایەوە، ئەمەش هەمووی لەخۆشی سەركەوتنەكەی ناپلیۆن بوو كەلەلایەك كۆتایی بەو پروپاگەندەو بێ سەرو بەرەییە دەهێناو لەلایەكی تریشەوە چەپەكەوانەیەكی توندیشی لەدمی ئەوانەدابوو كەئومێدیان بەگەڕانەوەی ڕژێمی شانشینی هەبوو، زۆر لەژاكوبنەكان بەبێ دەنگی تورەیی خۆیان حەشاردابوو ولایەنگرانی شانشینیش (بورینەكان) خۆری هیوایان كەوتبۆ ئاوابوون، بەڵام هەردوو ئەم لایەنانە خۆیان لەوشەپۆلەی خۆشیو شادی خەڵكی پاریس لاچەپەككرد، ئەم شادی دەربڕینە كاتێك گەیشتە ئەوپەڕی لوتكە كەناپلیۆن گەڕایەوە پاریس، هەركە خەڵك ماڵێكیان دەبینی چرای تێدا هەڵنەدەكراو خۆشی وشادی ودیوار ڕازاندنەوەی نەكردبوو، هاواریاندەكرد ئەم ماڵە لایەنگرانی ئەشرافیەتی تێدان، دەستبەجێ پەنجەرەو دەرگای ئەو ماڵانەیان دەشكاندو دەردەپەڕاند.



هەندێك لەخەڵك لەبەردەم كۆشكی كۆماریدا ئاهەنگ وشادیان دەكردوو بەهاوار داوایاندەكرد ناپلیۆن خۆیان نیشانبدات، بەڵام ئەو نەهاتە بەرهەیوانەكە هەتا خەڵكەكە بیبینن.

(2)

دوای سەركەوتنی لەشەڕی مارنگو، ناپلیۆن دەیویست پەیمانی ئاشتی لەگەڵ نەمسادا ببەستێت، ئیتر لێرەبەدواوە دەیویست ئاشتی لەگەڵ بریتانیاو هەموو هاوپەیمانانی ئەورووپایدابكات، سەرئەنجام دەشی ویست خەریكی دلنان و جێبەجێكردنی ئەو دەستورەبێت كەبۆخۆی بۆ وڵاتی دانابوو وبەهۆی شەڕی ئیتالیاوە دواخرابوو، تەواوی بكات، بەڵام شتێكیتر تائەو كاتەش هۆشی ناپلیۆنی گرتبوو وبەدرێژایی سەردەمی كنسولیشی بەقوڵی بیری لێدەكردەوە، ئەویش شەڕكردن بوو لەگەڵ ژاكوبنەكان ولایەنگرانی ڕژێمی شانشینی، فوشە: ڕای وابوو لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی لەم كاتەدا مەترسیان زیاترە، بەڵام ناپلیۆن لەگەڵ ئەم بۆچوونەی فوشەدا نەبوو وپێی وابوو ناوبراو لەترسی گەڕانەوەی سیستمی شانشینی ترسی لەدۆستە كۆنەكانی خۆی (ژاكوبنەكان) كەمترە، جگەلەمانەش ڕاستی هاتنەوەسەركاری ژاكوبنەكان ئەگەری زۆر كەمبوو، بەڵام دوای شەڕی مارنگو ناپلیۆن تەواو گەیشتبۆ ئەوبڕوایەی ژاكوبنەكان مەترسی گەورەیان هەیەو دوژمنی سەرسەختن.

هەر لەسەرەتای ئەو ڕۆژانەی دەسەڵاتی وڵاتی گرتەدەست ئەوەبوو دەبێ حسابی خۆی لەگەڵ چەپ وڕاستەكاندا یەكلایی بكاتەوە، واتە ژاكوبنەكان ولایەنگرانی ڕژێمی شانشینی، دیارە شێوازی بەگژداچونەوەی ئەو لەگەڵ ئەو دوانەدا جیاوازبوو، چونكە دەیویست لەگەڵ لایەنگرانی ڕژێمی شانشینیدا ئاشتی بكات، بەئاشكرا خۆی بۆ دانوستان لەگەڵیاندا نیشاندا، دەركردنی لێبوردنیش بۆهەندێك لەلایەنگرانی ڕژێمی شانشینی ئەوەی دیاردەخست نایەوێت گرژی دروستبكات وچاوپۆشی لەزۆرشت دەكرد، سەبارەت بەلایەنگرانی ڕژێمی شانشینی. بەڵام دەربارەی ژاكوبنەكان هاوكێشەكە تەواو جیاوازبوو، لەڕاستیدا ناپلیۆن نەفرەتی لەوانە دەكردوو ئازارو ئەشكەنجەشی دەدان، ناپلیۆن هیچ كاتێ كەسێكی شۆڕشگێڕنەبووەو دۆستایەتی كردنیشی لەگەڵ برای ڕوبسپیرو ژاكوبننەكاندا تەنها خولیای بەدەست هێنانی دەسەڵات بووە لای ئەو، ناپلیۆن كەسێكی خۆپەرست وتاسەر ئێسكان سەركوتكەربوو ودوای كودەتاكەی(18/ی برومەر) لەهەوڵ وتەقەلای ئەوەدابوو حكومەتێكی سەركوتكەر دروستبكات، ئەم حكومەتەش مەرامی چینی باڵای بۆرژوازی بوو وگوێشی بەو واقیعە مێژوییە نەدەدا كەژاكوبنەكان شۆڕشیان كردبوو، لەساتەوەختی زۆر ناسكدا شۆڕشی كۆماریان ڕزگاركرد، ناپلیۆن لەگەڵ ئەو بۆرژوازیەتە دەهاتەوە كەپارێزەری بەرژەندییەكانی بوو، لەدیكتاتۆریەتی ژاكوبنەكاندا، تەنها لایەنی سەختگیرو توندوتیژی ئەوانی دەبینی، بەڵام لەو لایەنەی كەڕزگاركەری فەرەنساو شۆڕشی كۆماری بوون، خۆی لێگێلدەكرد، وەك چۆن لەساڵی (1821)دا بەروستوپچین [106] كەهۆكاری سوتاندنی مۆسكۆ بوو وبەتوانجەوە بە(مارای ڕوسی )[107] یان ناودەبرد، بەم جۆرە ئەم پیاوەی لەپێناو شۆڕشی فەرەنسادا گیانی خۆی بەختكردبوو وبەیەك كۆلاكی ئەشرافی خاوەن گوندو كۆیلەداری بەراورد دەكرد،

---

[106] - ڕستوپچین: كەسایەتیەكی سیاسی ڕووسیە (1763- 1826) لەساڵ ( 1812) دا لەوكاتەی ناپلیۆن هێرشی كردەسەر ڕوسیا، فەرماندارى مۆسكۆ بوو، كاتێ فەرەنسییەكان ویستیان بچنەناو ئەوشارەوە، ناوبراو ئاگری لەمۆسكۆ بەردا. كچی ڕستوپچین ( كنتس دوسكور) بووبە نووسەرو یەكێك لەو ئەدیبە خۆشەویستانەی كەلی فەرەنساو زۆر كتێبی بۆ منداڵان نووسیون. (و- فارسی)

[107] - مارا ژان پل: فیزیایەكی ناسراو وسیاسەتمەدارێكی گەورەبوو، ئەندامی دەستەی كنواسیون بوو ویەكێك بوو لەوكەسانەی كەبووە هۆی كوشت وبڕیە خوێناویەكەی مانگی دیسەمبەر، مارا لەدادگایی كردنی لویسی شازدەهەمدا بەشداربوو، مارا خاوەنی كتێبێكە بەناوی (دەستی میللەت)و داویدی نیگاركێشی بەناوبانگ، تابلۆی كوژرانی ئەوی كێشاوە. (و- فارسی)



کەڕزگارکردنی ڕوسیا بەلای ئەوەوە بەمانای پاراستنی ڕژێمی ئیمپراتۆری بوو، بەرگری کردنیش لەولات تەنها بەبەگەڕخستنی هێزی کۆلاک وئەشرافەکانکدایە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناپلیۆن چارەی ژاکوبنەکانی نەدەویست کەچی جارێکیان لەکاتی باسکردنی دیکتاتۆری ژاکوبنەکان، گوتی: بەڕاستی ژاکوبنەکان لەساڵی(1794– 1793)دا کۆماریان ڕزگارکردو فریایکەوتنەوە.

بیستبوویەوە کەمادام دوستال، زۆر چەنەبازی ودەم درێژی دەکات، گوتی (بەو ژنە بڵێن من لویسی شازدەهەم نیم) ئەو باش دەیزانی سەرسەخترین دوژمنانی ئەو لەگەڵ ژاکوبنەکانن، بۆیە بەبێ بەزەییانە سەرکوتی ئەمانەی دەکرد، کوشتن وگرتن وڕاوەدونانی ژاکوبنەکان کەلەدوای کودەتاکەی(18– برومر)ەوە دەستپێکرد، جگەلەوەی ماوەماوەی کەمکەم ڕادەگیردرا، دەنا بەدرێژایی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن بەردەوامبوو، برژوازیە لوکالیسەکان، جاسوسیان لەسەر ژاکوبنەکان دەکردوو زەبرو زەنگیان لەسەر بەکاردەهێنان، ئەم زوڵم وستەمە گەیشتە ڕادەیەك چوارکەس لەژاکوبنەکان بەخۆیان وکێردەکانیانەوە ویستیان لەناو ئۆپێرادا خۆیان بگەیەننە ناپلیۆن وبیکوژن، بەلام پیاوانی ئاسایش ئەو پلانەیان ئاشکراکرد، ئیتر نەك هەر ئەوچوار کەسەیان لەسێدارەدان وبەس، بەڵکو بڕیاری دەستگیرکردنی ژاکوبنەکان دەستی پێکردوو پۆلپۆل بۆتاراوگەیان دەناردن [108] ، زۆر لەمانە نەیانتوانی بگەڕێنەوە فەرەنسا– یان ئەگەر هەندێك لەمانە بشگەڕابانەوە لەپەژارەو مەینەتی دوورخراوەییاندا پیروپەکەوتە ببوون، هەندێك لەمانە لەزیندانەکاندا دەمردن، ئەوکات خۆکوشتنی زیندانییە سیاسییەکان باوبوو، هەندێك لەمانە لەدورگەی(کاین)ی فەرەنسیدا گیانیان سپارد، دوای یەك مانگ لەڕووداوەی (18/ی تۆڤەمبەری )ی ساڵی (1800) [109] پۆلیسی نهێنی فوشە توانی کەسێك بەناوی شوالیە دەستگیربکەن کەخەریکی دروستکردن ونانەوەی بۆمبێکی گەورەبوو، جارێکیتر شاڵاوی گرتن ودورخستنەوە سەرانسەری ولاتی گرتەوە، بەڕاست وچەپ دەستگیریان دەکردن، هەرچەندە ئەو دەستگیرکراوە ژاکوبنانە کەسێکیان بەناوی شوالیە نەدەناسی وهیچ ئاگاداری ئەوپلانەی ئەو نەبوون.

جگەلەمەش لەدیسەمبەری هەمان ساڵدا پلانێکیتر بۆکوشتنی ناپلیۆن ئاشکرابوو کەژاکوبنەکان دەستیان تێیدانەبوو، ناپلیۆن ئەمەی کردەبەهانەو جارێکیتر داگژایەوەسەر ژاکوبنەکان ودەستیکرد بەڕەشەبگیری ودورخستنەوەیان. هەر کەسێك بیەوێت بچێتەناو ناخی ڕەفتارەکانی ناپلیۆن وپەی بەهەڵسوکەوتی واقیعی ئەوبەرێت، نابێ هیچ کاتێك فریو بەوگوتانەبخوات کەپێهەڵگوتانە باسی دەکەن وئەمانە دەیانەوێت ناپلیۆن بەپیاوێکی نیمچە شۆڕشگێڕ بناسێنن.

چونکە سەرەتا دوژمنەکانی ناپلیۆن دواتر پێهەڵگوتەرەکانیشی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ناویاننابوو(ڕوبسپیری سوارچاك) بەلام ئەوهیچ کاتێك نەبوو بەڕوبسپیر، ئەو کەسەرکوتکەرێکی بێهاوتاو خۆپەرستێکی سکومانگی بوو، نانی بەنرخی ڕۆژ دەخوارد، لەڕۆژانی سەرەتای گرتنەدەستی دەسەلات، ناچاربوو هەندێك دەسەلاتداریەتی حکومەت بداتەدەست برژوازییەکان– یان وەك حکومەتی پێشوو هەندێك شت بهێڵێتەوە، بەلام هەرکە هەلی بۆڕەخسا، هەموو ئەمانەی ماشت وفەرەنسای کردە دەوڵەتێکی سەرکوتکەرو سەربازی وئەورووپاشی کردە چەند ولاتێکی سەربە ئەو حکومەتە سەربازییەی خۆی، لەحکومەتی ڕەهای ناپلیۆندا شوێن نەبۆ ژاکوبنەکان ونەبۆ ئایدۆلۆژییەکەشیان هەبوو، بەم

---

[108] - تاراوکە: لێرەدا مەبەست لەو شوێنانەیە کەفەرەنسا داگیری کردبوون و ناو خاکی ئەو ولاتە نەبوو.

[109] - 1 - کاین: دورگەی کۆیانە لەئەمریکای باشوورو دوورخراوە سیاسیەکانیان لەفەرنساوە بۆ ئەوێ دەنارد.

2- مەبەست لەڕووداوەکەی ناو ئۆپێرایە. (و- کوردی)



جۆرە خەونی زێڕینی ( کۆمارییەکان)و تێڕوانینی یەکسانی وئازادی، لەناوبردو تەفروتونای کرد، بەوەی بریتانیا بەیەکگەیشتنی شازادە خانمی نەمساوی وناپلیۆنی بەرۆژێکی مێژوویی لەقەڵەمدا، ڕاستی کرد، چونکە لەومێژووە بەدواوە ئیمپراتۆریە سەرکوتکەرەکەی ناپلیۆن دەستی بەگرتێبەردانی هەموو شانشینە سەرکوتکەرە کۆن وتازەکان کرد، بەڵگەنەویستەکە حکومەتە سەرکوتکەرە کۆن وتازەکان، بەهۆی ژاکوبنەکان و کاریگەرییەکانی بۆرژوازی فەرەنسی کۆماریخواز کردبوونییە دوژمنی سەرسەخت وئاشتی نەکەر، ئەوفشارە دڕندانەیەی دژبە ژاکوبنەکان بووکە سەرەتا بەڕووکەش بەپێی قانون بەڕێوەدەچوو ویەکێکبوو لەخەسڵەتەکانی حوکمڕانی ناپلیۆن، فوشەش دوای کودەتاکەی (18- دیسەمبەر) وردەوردە هاتەسەر ئەو باوەڕەی ژاکوبنەکان لەلایەنگرانی هاتنەسەرکاری ڕژێمی شانشینی مەترسیدارترن، ئەگەر بگوترێت فوشە لەلێپرسراوەکەی زیاتر کورتبینی نیشاندەدا، ئەوا ڕاستە، کنت دوپروانس، کەخۆی بەپاشای فەرەنسا دەزانی وبراکەشی شارل وهەموو سەرانی لایەنگری ڕژێمی گەڕانەوەی شانشینی کەلەغەریبایەتیدا دەژیان، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی ئیتر دوای ڕووداوەکەی(دیسەمبەر) هەلی گەڕانەوەی ڕژێمی شانشینی ڕەخساوە، باشە ئەگەر وابا ئایا باشتر وانەبوو فەرەنسا لەجیاتی ئەوەی ملکەچی یەك شەرانگێزی خەڵکی کرسی بن، ملیان بۆ ڕژێمی شانشینی دێرینی خۆیان نابا؟ شۆڕش دوای دەساڵ سەنگەساری و خۆڕاگری لە(18و 19)ی بروەردا لەناوچوو بوو، ئیتر لێرەودوا بۆئەو دەستەی کەلەمانگی یازدەی ساڵی(1799)دا حکومەتی دیرکتواری لەناوبردبوو لەمانگی یۆنیۆی ساڵی (1800)تیشدا لەمارنگو سوپای نەمسای تێکشکاند، هیچ کارێك لەپێش نەمابوو جگەلەوەی لویسی هەژدەهەم، پاشای ئیماندار بەئاینی مەسیح، کەتا ئەوکاتەش پێیاندەگوت ، کنت دوپروانس، بگێڕێتەوەسەر تەخت وتاراجی باوك وباپیرانی، مەعلوم نییە داخوا دوپروانس بۆخۆی ئەو بیرۆکەی هاتبۆ مێشکەوە- یان بەهۆی ئامۆژگاری براکەی شارل (کەسروشت، بیرو هۆشی کەمی پێدابوو) ئەوکارەی کرد، هەر چۆنێکبێت ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو لویسی لە(میتو)دا کەمەنزڵگەی ئەوکاتی خۆی بوو، نامەیەکی بۆ ناپلیۆن ناردو لەونامەیەدا داوای لەئەو کردبوو، بنەماڵەی بوربن بگەڕێنێتەوەسەر تەخت وتاراجی فەرەنساو پێشنیاریشی بۆ ناپلیۆن کردبووکە هەرچی بۆخۆی وهاوەڵەکانی داوابکات بێ دریغی دەیاندرێتێ، هەروەها تائکید لەسەر ئەوەش کرابۆوە (دوعای خێری نەوەکانی ئایندەش دەبێتە ڕووناککەرەوەی ڕێگای ئەو)

ناپلیۆن وەڵامی ئەم نامەیەی نەدایەوە، دواتر نامەو پەیامیتر بۆ ئەو وجوزفین نێردران، لەهاوینی ساڵی (1800)دا دوای سەرکەوتنەکەی مارنگو، کاتێ ئەوە ئاشکرابوو ناپلیۆن دەسەڵاتی تەواوی بەسەر فەرەنساداهەیە، جارێکی تریش لویس نامەیەکی بۆ ناپلیۆن ناردەوە، ئەمجارەیان ناپلیۆن بۆ یەکەم جارو دواجار وەڵامی دایەوەو بەم جۆرەی بۆ نووسی(بەڕێز- نامەکەی ئێوەم پێگەیشت، سەبارەت بەوڕێزو شکۆمەندیەی بۆ منتان داناوە، سوپاستان دەکەم، ئێوە نابێ بەئومێدی گەڕانەوەی فەرەنسابن، ئەگەرنا دەبێ بەسەر سەدان هەزار تەرمدا تێپەڕن، بەرژەوەندی خۆت بەقوربانی خۆشگوزەرانی وبەختیاری فەرەنسابکە، مێژوو چاکەی ئێوە دەداتەوە) کاتێ ئاوارەکانی لایەنگری شانشینی وئەوانیتر پەیان بەوەبرد ناپلیۆن لەوکەسانە نییە فەرمان لەکەسانیتر وەربگرێت، بەڵکو لەوکەسانەیە کەحکومەت بەسەر کەسانی ترەوە دەکات ولەنیازو ئامانجی ئەوگەیشتن، بڕیاری کوشتنیاندا. دیارە لەهەمان ئەو کاتانەدا ئەم بیرۆکەیەش لای ژاکوبنەکان دروستبوو، بەڵام چونکە ئەمانە چەند کودەتایەکیان لەلایەن فوشەوە ئاشکراکرابوو تەواو پەشێو وپەشۆکاو ببوون، فوشە لەڕێگای



جاسوسەکانی خۆیەوە ئاگادارکرابۆوە کەپلانێك بۆ کوشتنی ناپلیۆن هەیەو بڕیارە لەئۆپێرادا لەشەوی(10/ی ئۆکتۆبـەردا بکرێت ولەوکاتەی ئەو چەکدارانە بەرەو نزیکبونەوە لەناپلیۆن دەچوون[110] ، دەستگیرکران، دواتر ئەوەئاشکرابوو ئەوچەکانە لەلایەن خودی فوشەوە بەوچـوار کەسـەدراوە، ئەوانـە لەسـێدارەدران وبـەو هۆیـەوە فوشـە زیـاتر کەسـایەتی زیـادیکردو خۆشەویستتربوو،

دەستەی دوژمنانی ناپلیۆن دەگەرانو سەریان بەهەموو شوێنێکدا دەکردو دەیان ویست لەناخافڵو بەنهێنی زەبری خۆیان بوەشێنن، لەڕۆژی (3) نیوزدا، واتە(25/ی دیسەمبەری سالی(1800)دا کاتێ ناپلیۆن دەیویست بەکۆلانی سن نیکز[111] دا بچێت بۆ ئۆپێرا، تەقینەوەیەکی گەورە لەوێ روویدا، ئەو گالیسەکەی ناپلیۆنی تێدابوو نزیکەی (10) چرکە بوو بەوشوێنەدا تێپەریبوو کەتەقینەوەکە ڕوویدا، سەرجادەو شۆستەکە لەخوێندا شەلاڵبوو، لەهەمان کاتیشیدا ئەو گالیسکەی نیوەی خراپ ببوو بەسەلامەتی ناپلیۆنی هەرگەیاندە ئۆپێراکەو ناپلیۆن زۆر بەئاسایی چووە شوێنە دیاریکراوەکەی خۆی، تەنانەت ئەوانەی ناوئۆپێراکە چەند دەقیقەیەك دوای ئەوە هـەواڵی تەقینەوەکـەیان زانـی، لەولێکۆڵینـەوە پۆلیـسیانەی بەڕێوەچـوون هـیچ گومانلێکراوێك دەستگیرنەکرا، ناپلیۆن دڵنیابۆوەو باوەری خۆی لەسـەر ئـەوە سـاغکردەوە کەژاکۆبینـەکان ئـەم کارەیـان ئەنجامداوە، ناپلیۆن فۆشەی بەوەخەتابارکرد، لەبەر سەرقاڵی لەگرتنو راوەدوونانی لایەنگرانی سیستمی پاشایەتی، ئاگای لەژاکۆبنەکان نەماوەو فەرمانی پێدا ئەوانـە یـەکجاری یەکلابکاتـەوە، فەرمانیـدا لیـستێکی (130) کەسـی لەژاکوبینـەکان ولایەنگرەکانیان بنووسرێتەوەو دەستبەجێ ئەوانە دەستگیربکرێنو راستەوخۆ دوور بخرێنـەوە بۆگویـان– یـان دورگـەی سشل[112] ، کەبەدەگمەن کەس لەو دورگەیە بەزیندوویی دەگەرایەوە، پارێزگارانی هەموو شارەکانی فەرەنسا کەوتنەگرتنی ژاکۆبنەکانو لایەنگرەکانیشیان، ئەوانـەی ناویـان لەلیـستەکەی فوشـە نووسـیبووی هـەبوو، دوای دەسـتگیرکردنیان دوور نەخرانەوە بۆتاراوگە، بەڵکو خرانە زیندانەکانی دەوڵەت لەفەرەنسا، پێشەوەی لێکۆڵینەوە– یان دادگایی بکرێن، تەنانەت کاتێ راستییەکان روون بوونەوەو تاوانبارە راستەقینەکانیش دۆزرانەوە ئەمانە ئازاد نەکران.

ئەوەی ئەو پلانەشی ئاشکراکرد هەر فوشە بوو وئەمەشی لەوکاتەدا ئاشـکراکرد کەژاکوبینـەکانی خـستبوونە زینـدانو بـۆ تاراوگەی ناردبوون، لەراستیدا فوشە یەکەم کەسبوو کەدەیزانی ژاکوبنەکان دەستیان لەوکارەدانییەو ئەمەشـی تـەنها بـۆ هێورکردنەوەی ناپلیۆن کرد، دووهەفتە دووای ئـەم رووداوەی گـەرەکی سـن نیکـز، لەبەرەبـەری کۆتـایی هـاتنی گـەرانو دەستگیرکردنی ژاکوبنەکان، کەسێك بەناوی (کـارن) دەسـتگیرکراو دوای ئـەو هەنـدێکی تـر بـەم ناوانـەگیران ، سـن رۆان وبورمونو نزیکەی دوانزدەکەس کەلایەنگرانی رژێمی شانشینی بـوونو لەپاریـسیدا نیـشتەجێ بیـوون، کـابنو سـن رۆان، یەکسەرە دانیان بەوەدانا کەئەوان ئەو تەقینەوەی گەرەکی ناوبراویان ئەنجامداوە بۆ کوشتنی ناپلیۆن، دیارە ئەم پلانەش لەلایەن سەرانی لایەنگرانی شانشینیەوە نەخشەی بۆ کێشرابوو هـەتا بنەماڵـەی بوربنـەکان بێنەوەسـەر تـەختو تـاراجی

---

[110] - 1- ئەوچوار کەسە بەم ناوانە بوون: سراشی وئارنا ودمرویل وتوپینو لوبرن.

[111] - سن نیکز: کەرەکیکە لەپاریسو دەکەوێتە خۆرهەڵاتی باکوری ئەوشارە .

[112] - 1- کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە ئۆقیانووسی هندیەوەو سەرووی دورگەی ماداسکار، کەئەوکات سەربەفەرەنسا بوونودواتر لەساڵی(1813)دا کەوتە ژێر دەسەڵاتی بریتانیا ، (و- فارسی )

2- بوربنەکان: مەبەست لەبنەماڵەی شانشینی فەرەنسایە، کەئێستا لەتاراوگەدا دەژین، (و- کوردی)



پاشایەتی، ئاشکرابوونی پلانگێرەکان هیچ فشارەکانی سەر ژاکۆبینەکانی کەم نەکردەوەو بڕیاردرا بەهەمان توندو تیژیش هەڵمەت ببرێتەسەر لایەنگرانی گەڕانەوەی ڕژێمی شانشینی، ناپلیۆن ویستی بەیەك تیر دوو نیشانە بپێکێ، دواتر کەبەئەویانگوت: فوشە گرتن‌و دورخستنەوەی ژاکۆبینەکان بەناڕەوایی دەزانێ، ناپلیۆن لەوەڵامدا گوتی: فوشە سەیرە... ئەو هەمیشە ئاوابیردەکاتەوە، هەرچۆنێکبێت تازە زۆرگرنگ نییە، من لەشەری ئەمانە پشتم کردەوەو دڵنیابووم) زۆرجاریش لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی پلانی کوشتنی ناپلیۆنیان دانان‌و سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناپلیۆن بەئەندازەی ژاکۆبینەکان کینەی لەلایەنگرانی ڕژێمی شانشینی نەبوو، وەك خەڵك دەیانگوت: ناپلیۆن چی ڕق وکینەی هەبوو بەژاکۆبینەکانی ڕشت‌و لەبەرامبەر لایەنگرانی سیستمی شانشینیدا کینەدۆزی ئەوتۆی نەمابوو تادژیە ئەوانیش بیکات، واتە: کەفوکوڵی دڕندانەی سڕیبۆوە، ناپلیۆن دەیتوانی لەکاتی پێویستدا بێ بەزەیی بێت‌و لەهەمان کاتیشدا خوێن ساردی‌و ئارامی خۆی بپارێزێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو ناپلیۆن دەیویست لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی بێنێتە ژێرباری فەرەنسای نوێ‌و ئاشتی ئەوەیان لەگەڵدابکات لەبەرەی بوربنەکان جیابینەوە، بەواتایەکی ڕوونتر، ناپلیۆن دەیویست ئاشتی لەگەڵ ئەولایەنگرانەی گەڕانەوەی سیستمی شانشینیدا بکات کەقانونی بوونی حکومەتی ناپلیۆن بەرەسمی دەناسن‌و ئەگەری ملکەچ کردنیان بۆحکومەت لەئارادایەو ئەویش چاوپۆشی لەرابووردوویان دەکات‌و دەیانبەخشێت، بەڵام لەگەڵ ئەوکەسانەی کەئاشتیان نەدەکردوو تەنها لەبیرو کاری ئەودابوون بوربنەکان بگەڕێنەوەسەر تەختی پاشایەتی، بەوپەری بێ بەزەییانە لەگەڵیاندا دەجوڵانەوەو کوشت‌و بڕی دەکردن.

پێش شەری مارنگو ناپلیۆن فەرمانی بەفەشە دابوو لیستێك بکاتەوە بەناوی ئەوکۆچ کردوانەی کەئەگەری ڕێگادانیان بۆ گەڕانەوەی فەرەنسایان پێبدرێت، دەستنووسەکانی سەرتایی ئەوناوانە نزیکەی (100) هەزار کەس بوون‌و(52) هەزاریشیان بەپێی فەرمانی مێژووی یەکەمی واندەمری(1800/10/20) گەڕابوونەوە فەرەنسا، لەولیستە تازەی کەناوی ئەوانەی بۆیان هەبوو بگەڕێنەوە فەرەنسا زۆرلەوە زیاتربوو کەپێشبینی کرابوو، لە(125)هەزار کەسی ئاوارە(141) هەزار کەس مۆڵەتی گەڕانەوەی فەرەنسایان پێدرابوو بەمەرجێ لەژێر چاودێری پۆلیسدابن، تەنها(3373)کەس لەم لیبوردنە گشتیە بێبەشکران.

بەڵام ناپیلۆن بەوەوە نەوەستاو بەپێی ئەو بڕیارەی کەلەساڵی (1802)دا دەرچوو، هەر پەناهەندەیەکی فەرەنسی ئاوارەی وڵاتیتر سوێند بەبەئەمەکی بۆ ڕژێمی تازەی فەرەنسا بخوات، بۆی هەیە بگەڕێتەوەو لێبوردن دەیگرێتەوە، بەوبڕیارە هەندێك لەوپەناهەندانەی تریش کەباری گوزەرانیان خراپبوو گەڕانەوە فەرەنسا. بۆماوەیەك وڵات ئارامی بەخۆیەوە گرت‌و نلپلیۆن بەشەوق وزەوقەوە خەریکی جێبەجێکردنی کاروبارە سیاسییەکانی دەوڵەت بوو، هێچ کاتێ نەلەپێشترو نەدواتریش ناپلیۆن ئەوەندە حەزی نەدەکرد ئاشتی لەگەڵ هاوپەیمانانی ئەورووپایدا[113] بکات، ئەو پێویستی بەوئاشتی کردنەبوو، لەلایەك بۆئەوەی گرنگی بەباری ئیداری‌و ئابووری وڵات بدات ولەلایەکی تریشەوە دەیزانی گەلی فەرەنسا تینوی ئاشتی کردنە، سەرەنجامی کار بەتایبەت بۆئەوە پێویستی بەم ئاشتی کردنەبوو هەتا کاروبارەکانی دەوڵەت بەگشتی‌و بواری ئابووری تەواو ڕێکبخاتەوە.

113 - فەرەنسا خۆی بەشێکە لەئەورووپا: بەڵام لێرەدا مەبەست لەهاوپەیمانانی ئەورووپا ئەوەیە ئەو وڵاتانەی دژی فەرەنسا هاوپەیمانیان دروستکردبوو،



(3)

ناپلیۆن لەهەڵبژاردنی دەستیارێکی سیاسیش، بەهەمان لێزانی لەهەڵبژاردنی فوشە سەرکەوتووبوو- چونکە پرنس تـالیران نیشانیدا کەلەهونەری دیپلۆماسیدا کەسێکی تەردەستو کارایە، بەڵام تێڕوانینـی نـاپلیۆن لەهـەر یـەك لەفوشـەو تـالیران جیاوازبوو.

ناپلیۆن کەڵکی لەفوشەو دەزگا پۆلیسەکەی ئەو وەردەگرت، لەهەمان کاتیشیدا بەکەسێکی خراپەکارو داوێن پیسی لەقەڵەم دەدا، چونکە تەواو متمانەی بەفوشەنەبوو، جاسوسی تایبەتی خۆی بۆچاودێری کردنی ئەو دانابوون‌و لەم بوارەشدا ناپلیۆن نەیدەتوانی بەسەر وەزیرەکەی [٩١٤] خۆیدا سـەربکەوێت، لـەم رووەوە نـەناپلیۆن بۆناپـارت‌و نەئەلکسەندەری ماکدۆنیش نەیاندەتوانی شان لەشانی فوشەبدەن، چونکە فوشە لەچاوتروکانێکدا دەیتوانی یەك بەیـەك هـەموو ئەوکەسـانە بناسـێت کەناپلیۆن بەجاسوسی لەسەرئەوی دانابوون.

لەبواری ئاسایشی ناوخۆ ناپلیۆن پێویستی بەفوشەبوو، چونکە وەك گوتمان ناپلیۆن لەو رووەوە تۆزی فوشەی نەدەشکاندو ناچاربوو پشت بەفوشە ببەستێت.

بەڵام لەرووی دیبلۆماسیەوە ناپایۆن لەتالیران کەم توانـاتر نـەبوو، تەنانـەت لەهەنـدێك رووەوە لەئەویـشی تێدەپەرانـد، هەرچەندە تالیران وەزیری دەرەوە بوو وبەکەسێکی بەڕێز هەژماردەکرا، وەلـێ ئـەوە نـاپلیۆن بـوو کەهەمیـشە فـەرمان‌و رێوشوێنی بۆ تالیران دادەنان.

یەکێك لەگەورەترین سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن ئەوەبوو، توانی گۆرانکاری بنەرەتی بخاتەناو سیاسەتی روسیا، نـاپلیۆن پەیامێکی ناراستەوخۆی بۆ پلی ئیمپراتۆری روسیا ناردو تێیدا ئامادەیی فەرەنسای دەری لەئازادکردنی هەموو ئەوسەربازە رووسیانەی لەجەنگی کورساکفی ساڵی (1799)دا بەدیل گیرابوون، بێ هیچ مەرج‌و خواستێك لەبەرامبەر ئەمەدا، لەوکاتەدا هیچ دیلێکی فەرەنسایی لەروسیادا نەمابوون‌و ئەمەش بووەجێگای دڵخۆشی ئیمپراتۆری روسیاو بۆ بەدواداچوونی ئەمـە ئیمپراتۆری روسیا، ژنرال سپرنگپورتنی بۆ پاریس نارد، سپرنگپورتن لەناوەراستی مانگی دیسەمبەردا گەیـشتە پـاریس، ناپلیۆن لەیەکەم دیداری لەگەڵ ژنرالی ناوبراو گەرمترین سۆزو خۆشەویستی ورێزی بۆ پلـی ئیمپراتـۆری روسـیا دەربڕی‌و جوانمێری وشکۆمەندی ئەوی ئاماژە پێکرد، ناپلیۆن نەك هەر لڕیاریدا ئەو (6) هەزار سەربازە دیلەی روسیا ئازاد بکرێن، بەڵکو فەرمانیشیدا لەسەر خەرجی دەوڵەتی فەرەنسا جلوبەرگی تازەی یەکە سەربازییەکانی خۆیان بدەنێ‌و پێڵاوی تازەو چەکەکانیشیان بدەنەوە، لەپای ئەو هەڵسوکەوتە دۆستانەیەدا لەنێوان دوو دوژمنی سەرسەختی یەکتری ئەمـە پێـشینەی نەبوو، نامەیەکی تایبەتیش لەلایەن ناپلیۆنەوە بۆ ئیمپراتۆریەتی رووسیە نێردراو لەناوەرۆکی ئەونامەیەدا نووسرابوو(هەرکاتێ ئیمپراتۆری روسیا بالیۆزی جێگای متمانەی خۆی بۆپاریس بنێرێت ، گرێبەستی پەیمانی ئاشتی لەنیوان فەرەنساو روسیادا لەماوەی (24) سەعاتدا دەبەسترێت، پل، تەواو سەری سورمابوو، ئەو کەدوژمنی خـوێن خـۆری فەرەنـسابوو، لـەپڕ بـوو



بەدۆستو دەستبەجێ نامەیەکی وەڵامی بۆ ناپلیۆن ناردەوەو تێیدا باسی ئەوەی کردبووکە پێویستە ئاشتی بکەینو ئامادەشی بەوەکردبوو کەبەئاوەڵی ناپلیۆن دەتوانن ئاشتی وئارامی بگێڕنەوە ئەوروپا) دوای سەرکەوتنی لەم کارەیدا ناپلیۆن کاری بۆئەوە دەکرد، نەك هەر پەیمانی ئاشتی لەگەڵ روسیادا مۆربکات، بەڵکو دەیویست یەکێتی سەربازی لەگەڵ رووسیادا ببەستێت.

بیرۆکەی هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ روسیادا لەبەر دوو هۆبوو: بەپلەی یەك لەدەست نەچوونی هیچ بەرژەوەندیەك لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا، دووەمیش: بۆئەگەری ئەوەی بەبەسەرچوونی کات بەکۆکردنەوەی هەمووهێزی خۆی بتوانێت دەسەلاتدارێتی بریتانیا لەسەر هیندستان لەرێگای روسیای خۆرئاواو ئاسیای ناوەراستەوە بخاتەژێر هەرەشەوە، ئەم بیرۆکەیە هەرلەکاتی داگیرکردنی میسرەوە تادواین رۆژگارەکانی فەرمانڕەوایی کردنی ناپلیۆن، هەر لەخەیاڵیدابوو وەگوریشەی داکوتابوو، ئەم بیرۆکەیە مایەوەو هەرسەری نەگرت، بەهۆی ئەوخێرا پێشکەوتنەی پەیوەندی نێوان روسیاو فەرەنسا، بریتانیا کێچی کەوتە کەوڵەوە.

ناپلیۆن نەخشەی ئەوەی دەکێشا رێ خۆشکەری بۆناردنی لەشکرێك لەژێر فەرماندەیی خۆی بۆخۆرئاوای روسیا بچێتو لەوێشدا پەیوەندی بەسوپای روسیاوەبکاتو لەوێوە هەردوو سوپا بەئاسیای ناوەڕاستدا بەرەو هندستان ببات، ئیمپراتۆری روسیا بیرۆکەی ناردنی سوپا بۆهندستان وهێرشکردنەسەر سوپای بریتانیا لەو وڵاتەیدا بەشادمانی پێشوازی لێکرد، تەنانەت بۆئەم مەبەستە پێش ناپلیۆنیش وردەئامادەکاری کردن. ئیڤانوڤیچ پلاتۆف، کەسەرکردەیەکی کازاخستانی بوو وشەش مانگبوو بەفەرمانی ئیمپراتۆر زیندانی کرابوو، لەپڕ ناوبراویان لەقەلاتی پتر کەتێیدا زیندانبوو، هێنایە دەرێو راستەوخۆ بردیان بۆلای ئیمپراتۆر وناوبراو یەکسەرە ئەم پرسیارەی لەپلاتوف کرد: ئایا تۆ رێگای هندستان شارەزای؟

پلاتۆف کەسەری سورمابوو وهیچ لەمەسەلەکە نەدەگەیشت، بەلام ئەوەی زانی ئەگەر وەلامەکە بەنەخێر بداتەوە ئەوا دەیبەنەوە زیندان، بۆیە یەکەودەردوو، گوتی: بەڵێ شارەزام، ئیتر یەکسەرە کردیان بەفەرماندەی لەشکری (دن) کەپێکهاتبوو لە(32) هەزار سەربازو فەرمانیان بۆدەرکرا خۆیان ئامادەبکەن بۆچوون بەرەو هندستان، ئەوچوار لەشکرە بەرەو هندستان کەوتنەرێ، بەلام رێگا بڕینەکەیان زۆر درێژەی نەکێشا...، ئەوروپا بەدڵنیگەرانیەوە سەری ئەو دۆستایەتیەی نێوان فەرمانڕەوای فەرەنساو ئیمپراتۆری ڕوسیایان دەکرد، چونکە ئەگەر ئەم دوانە بەجددی پەیوەندیەکانیان پتەوبووبا، ئەوادەبوونە فەرمانڕەوای هەموو ئەوروپا، ئەمە تەنها بۆ چوونی ناپلیۆن وپل نەبوو، بەڵکو هەموو سیاسەتمەدارانی ئەوروپایی ئەو رۆژگارەش لەوبڕوایەدابوون، ترس ولەرزێکی تەواو باڵی بەسەر بریتانیادا کێشا.

ڕاستە چەك وتەقەمەنییەکانی فەرەنسا لەهی بریتانیا کەم تواناتربوون، وەك چۆن هێزی دەریایی بریتانیا لەهێزی دەریایی فەرەنسا بەهێزترو تۆکمەتربوو، هێزی دەریایی ڕوسیاش بەبەراورد لەگەڵ هێزی دەریایی بریتانیادا ئەسڵەن حسابی بۆنەدەکرا، بەلام ئەو پلانەی ناپلیۆن بەناردنی سوپای فەرەنساو ڕوس بۆ هندستان (ویلیام پیتی، سەرۆك وەزیرانی بریتانیا مەزنی گرژو دەمریکرد، لەهەموو کۆشکەکانی کۆماری وشانشینی وڵاتانی ئەوروپادا بەترس و لەرزەوە چاوەڕوانی هاتنی بەهاری ساڵی (1801)یان دەکرد، چونکە لەوکەژەدا دووهاوپەیمانە گەورەکەی ئایندە دەیانتوانی هەموو شتێکیان لەدەستبێت، بەلام یەکەم ڕۆژی بەهاری( 11ی مارس) پێشهاتێکی تر ڕوویدا، کاتێ هەواڵی کوژرانی پل: ئیمپراتۆری روسیا



گەیشتە پاریس، ناپلیۆن بەو رەنجەی چەند مانگبوو دابووی وبەوپەڕی ژیری و وریاییەوە دەستەبەری کردبوو ولێیبەباچوو،دەهری بوو وبەتوڕەییەوە هاواری کرد(ئەو تیرەی بریتانیا لەکۆڵانی سن نکیزدا تێمی گرت، ئامانجی نەپێکا، بەلام لەپترسبورگدا ئامانجی پێکا) ناپلیۆن گومانی لەوەنەبوو کوژرانی پل لەژێر سەری بریتانیادایە، ئەو هاوپەیمانیەتییەی نێوان ئەو دوو وڵاتە لەشەوێکی مانگی مارسدا کەکودەتاچیەکان چووبوونە ژووری خەوەکەی ئیمپراتۆرو کوشتیان، هەڵوەشایەوە.

(4)

دەبوا ناپلیۆن هەموو ئەونەخشانەی داپرشتبوون بگۆڕێت، بەلام ئەو دەیتوانی وەك چۆن تۆپخانەکەی بەتەردەستی بەکاربهێنێت لەم بوارەشدا کارابوو، ئیتر دەبوا بەئاراستێکیتر کەلەگەڵ هەلومەرجی هەنوکەیدا هاتبایەوە، ڕووبەڕوو بوبایەوە، ئیتر مەسەلەی شەڕکردن لەگەڵ بریتانیادا وەلانراو ئاشتی کردن هاتەپێش، بەلام لەگەڵ نەمساوییەکاندا دەمێکبوو گفتوگۆی ئاشتی دەستی پێکردبوو لە(9/ی فبرایەری سالی 1801)دا، کوبنستل وەزیری دیاریکراوی نەمساوی پەیمانی ئاشتی لەلونەویلدا مۆرکردبوو وئەو ڕێککەوتنەش لەلایەنی فەرەنساوە، جوزیف بۆناپارتی برای ناپلیۆن و وەزیری دەرەوە تالیران مۆرکرابوو، بەلام لەڕاستیدا ئەم دوانە تەنها فەرمانەکانی ناپلیۆنیان جێبەجێ کردبوو وبەدەر لەڕێنماییەکانی ناویراو هیچی تریان نەکردبوو، نەمسا چونکە لەخۆرهەلات وخۆرئاوایەوە کەوتبۆ ژێر هەڕەشەی هێرشکردن، ناچاربوو قبوڵی هەموو ئەومەرجانەبکات کەفەرەنسا دانابوون، ئەوەی ناپلیۆن ئامانجی بوو توانی لەو ئاشتی کردنەی لەگەڵ نەمساویەکاندا بەدەستی بهێنێت، جیاکردنەوەو دابڕانی بەلجیکا لەنەمسا ودەستهەلگرتن لەلوکسامبورگ وهەموو ئەو خاکەی ئەلمانیا کەنەمسا داگیری کردبوو وکەتبۆ سەرلای چەپی رووباری(رن) بەڕەسمی وناساندنی کۆماری باتاو[115] و هل وتیل [116] وکۆماری سیزالپین ولیگوری، کەئەمانە بەشێکبوون لەخاکی ژێر دەسەلاتداریەتی فەرەنسا، بەلام سەبارەت بە(پیەمون ) ئەم ولایەتە سەرەتا سوپای فەرەنسا داگیری کردبوو وهەروەك خۆی لەژێر ڕکێفی فەرەنسادا مایەوە، کوبنستل لەو نامانەیدا کەلەژێر ناونیشانی خود کولوردو دابوون: بەم جۆرەی نووسیوە(ئێستا ئەو ڕێککەوتننامە سەرشۆڕیەی کەمن بەناچاری مۆرمکرد، ئەم پەیمانە لەهەردوو ڕووی شێوەو ناوەڕۆکەوە شێوە ئابڕوو چوانەیە...)

کوبنستل زیاتر لەو ڕووەوە حەقی بوو توڕەبێت، کەدەیزانی تالیران لەدانوستان لەگەڵ شانشینی نەمسادا، توانیبووی بەنهێنی دیاری زۆر وەربگرێت بێ ئەوەی کارێك لەبەرژەوەندی نەمسا ئەنجامبدات، چونکە ئەو ڕێککەوتن نامەیە هەرلەسەرەتاوە تاکۆتایی لەلایەن ناپلیۆنەوە سەرافەتی وڕێنمایی دەکرا، هەرچۆنێکبێت نەمسا باری کەوتە لێژی، بەلام دیاربوو ئیمپراتۆری نەمسا لەبەرگەگرتنی ئەو زیانەگەورەدا چاوەڕوانی دەرفەتێکبوو بۆ ڕێکسختنەوەی خۆیی وئەم ئومێدی هەل ڕەخسانەشی دابۆ دەست ڕێکەوت وڕۆژگار، بەم جۆرە لەکاتی کوژرانی پل، ئیمپراتۆری ڕوسیادا، تاکە وڵات لەودەوڵەتە زلهێزانەی لەحاڵەتی شەڕکردن لەگەڵ فەرەنسادا مابۆوە بریتانیابوو، ناپلیۆن نەخشەکانی خۆی گۆڕین وبڕیاری ئەوەیدا

---

[115] - باتاو: واتە هۆڵەندای ئەمرۆ.

[116] - هل وتیل: خاکی سویسرای ئێستا (و- فارسی).



هەرچی زووترە ئاشتی لەگەڵ بریتانیاشدابکات، بریتانیا ڕێژگارێکی دیژواری بەسەردەبرد، بازرگانی وپیشەسازی بریتانیا لەو ڕۆژانەدا لەسەرانسەری ئەوروپا ڕکەبەرێکی نەبوو، شۆڕشی پیشەسازی دواساڵەکانی سەدەی هەژدە، لەڕووی ئابووری پلەی یەکەمی هەبوو بەبەراورد لەگەڵ هەموو وڵاتە پیشەسازیەکانی ئەوکاتدا.

یەکێك لەو هۆکارانەی بۆرژوازیەتی فەرەنسی تورەو بێزارکردبوو، ئەو هاوپەیمانیە بازرگانیەی ساڵی(1786)ی نێوان فەرەنساو بریتانیابوو وکەبەهۆی ئەوەوە پیشەسازیەکانی ناوخۆی فەرەنسا کەوتبۆ ژێر ڕکێفی پیشەسازی مانیفاکتۆرەو کاڵاکانی تری بریتانیا، لەسەردەمی کنوانسیونەکان ودیرکتوارەکاندا شەڕی نێوان فەرەنساو بریتانیا شەڕی بازرگانی وپیشەسازی بوو، ویلیام پیت، سەرۆك وەزیرانی بریتانیا لەپێشەوەی هەربڕیارێکی سیاسی هاوپەیمانی ئەوروپادابوو دژبە فەرەنسا، ئەوپیاوە لەسەردەمی دەسەڵاتداریەتی خۆیدا یارمەتی پروس ونەمساو پیەمون وهیتری بەبێ درێغی دەداو لەڕووی ئابووری وسیاسییەوە بریتانیا دیارترین وڵات بوو، بەڵام نەیارمەتییەکانی بەهاوپەیمانیەتی ئەوروپا کەڵکی هەبوو، نەدانی ئەوکەشتی وچەکو تفاقە سەربازیانەی دانیە لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی فەرەنسا، بۆیە وردەوردە لەساڵی(1801)دا ئەو باوەڕە هاتەئارا، باشتروایە سازش لەگەڵ فەرمانڕەوا تازەکەی فەرەنسادا بکات، بەڵام نابێ ئەوەشمان بیربچێت ئەم کەسانەی بەرژەوەندیان لەگەڵ ئەوخاکە ژێردەستانەی وەك هۆڵەندا دەهاتەوە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نەبوون، توێژی بازرگانی ئەوروپایی ئاشتی دەویست، چینی کرێکاریش بەئاشکرا هەڵدەشڵاخانەوەو مانیان دەگرت وداوای کارو ڕزگاربوونیان لەبرسیەتی دەکرد، مەبەست لەئاشتی کردنی ناپلیۆن لەگەڵ نەمسادا ئەوەبوو، پانتاییەکی زۆری خاکی ئەڵمانیاو ئیتالیا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتداریەتی خۆی، دوای مەرگی پل: ئیمپراتۆری ڕوسیا، جێنشینەکەی ئەلکسەندەر ئەوئاشتیەی قبوڵکردو لەهەمان کاتیشدا پێشنیاری ئەوەی بۆ فەرەنساکرد هەمان ڕێککەوتن لەگەڵ بریتانیاشدا مۆربکرێت، لێپرسراوانی حکومی بریتانیا لەوکاتانەدا ئومێدی لەناوچوونی ڕژێمی تازەی فەرەنسایان نەمابوو، بۆیە بڕیاری دانوستانیاندا، ویلیام پیت، پێش کوژرانی پلی ئیمپراتۆری ڕوسیا دەستی لەکار کێشبۆوەو جێگرەوەکانی حکومەتەکەی ئەو کەسانێکبوون سازشکردنیان لەگەڵ فەرەنسادا بەباش دەزانی، ئادینگتون سەرۆك وەزیران بوو وهاکسبری لۆدێریش ببووە وەزیری دەرەوە، ئەو کابینە تازەیەی حکومەت ڕایگەیاند بریتانیا بەئاشتی کردن لەگەڵ فەرەنسادا ناکۆك نییە، گفتوگۆی ئاشتی لەشاری ئامیندا بەسترا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بریتانیادا لە(26/مارسی ساڵی(1802)دا مۆرکرا، بەپێی ئەو ڕێککەوتن نامەیە دەبوا بریتانیا لەماوەی ئەو تۆساڵە شەڕەی لەگەڵ فەرەنسادا توانیبووی هۆڵەنداو ئیسپانیا(جگەلە دورگەکانی سیلان (سراندیب )و (ترینیتە) بدرابانەوە فەرەنسا، دورگەی ماڵتەش درابایەوە شوالیەکان، دەبوا بریتانیاش هەموو ئەو شوێنانەی لەکاتی شەڕدا لەدەریای ئادریا تیك ودەریای سپی ناوەڕاستدا داگیری کردبوون بەجێیان بێڵێت، فەرەنساش میسر جێبهێڵێت وسوپاکەی بگێڕێتەوەو هەموو ئەوتاڵان وبڕۆیەی لەڕۆمیشدا سوپای فەرەنسا کردبووی بگێڕدرێتەوە بۆ پاپ، ئەمە خاڵە سەرەکیەکانی ئەو ڕێککەوتنەبوون لەنێوان ئەودوو وڵاتەدا، بەڵام گرنگترین شت تەنها ئەمانە نەبوون، ئایا هەر بۆ ئەمەبوو کەئەشراف وبرژوازیەتی بریتانیا بۆماوەی (9) ساڵ شەڕو ملیۆنەها لیرەیان بۆ سوپاکەی خۆیان وهاوپەیمانان خەرجکردو کەرەستە جەنگییەکانی خۆیان لەهەموو ئۆقیانوسەکاندا هێنابۆ جوڵانان ؟ ئەوەی بەلای دەسەڵاتدارانی بریتانیاوە لەهەموو شت دەردەناکتربوو ئەوەبوو نەیتوانیبوو قولانجێك لەو شوێنانەی فەرەنسا لەئەوروپادا داگیری کردبوون لەچنگ دەربهێنن.



بەلجیکاو هۆڵەنداو ئیتالیاو بەشی چەپی سەر زێی ڕن ویپەمون، وەك پێشوو هەر لەژێر دەستی ناپلیۆندا مابۆوە، هەموونەو شانشینە داگیرکراو- یان نیوە داگیرکراوانە کەهێز ناپلیۆن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ -یان ناڕاستەوخۆ لەسێبەری خۆی گرتبوون، بازاڕێکبوون بۆ فرۆشتنی کاڵاکانی بریتانیا- یان کاڵای وڵاتە ژێر دەستەکانی بریتانیا، لەدەست چووبوون، هەموو هەوڵ وکۆششەکانی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی بریتانیا لەپەیمانی ئاشتی شاری ئامی،ن بۆ ڕێککەوتنێکی بازرگانی بوو، تاهەرنەبێ کەمێك لەبەرژەوەندی بریتانیادا بێت، بەخۆڕایی نەبوو سەری نەگرت، بەو جۆرە بازارە پڕ بەرەکەتەکەی ناوخۆی فەرەنسا وەك پێشگرتن لەدەسەلاتی ناپلیۆن بەڕووی کاڵاکانی بریتانیادا داخرابوو هەروا دەمایەوە، جگەلەمانەش لەڕووی سەربازی وسیاسی وئاسایشی بریتانیاش لەبەرامبەر هێرشەکانی سوپای فەرەنسادا وەك پێشوو جێگای دڵنیایی بوونەوە نەبوو.

ئەوکاتەی ناپلیۆن هۆڵەنداو بەلجیکای تەواو خستەژێر ڕکێفی خۆی زۆرجار دەیگوت (بەندەری ئانورس دەمانچەیەکی لەسەر پێی ئاراستەکراوە بۆ دڵی بریتانیا...)

ئەگەری ئەوەنەبوو ڕێککەوتنامەکەی شاری ئامین درێژە بکێشێت، چونکە بریتانیا خۆی هەتائەوپەڕی بەدۆڕاو دەزانی، کاتێ خەڵك لەپاریس وشارەکانی تری فەرەنسادا هەواڵی وردەکاریەکانی ئەم ڕێککەوتنەیان زانی دڵخۆشی ئەمانە گەیشتە لوتکەو دەیانگوت گوایا ئەو دوژمنە سەرسەختە ئاشتی نەکردنەی لەگەڵ فەرەنسا، دانی بەشکستخواردوویی خۆیدا ناوەو داگیرکردنەکانی ناپلیۆنی بەدروست داناوە، ئەم شەڕە دوورو درێژە لەهەموو بەرەکاندا بەسەرکەوتوویی تەواو کەوتەوە.

## (5)

چارەنووس وانەبوو کەلەسەردەمی حوکمڕانی ناپلیۆندا فەرەنساو ئەورووپا بۆماوەیەکی دورو درێژ ئاشتی باڵی بکێشێت، دوای ئەو دووساڵە کەلەبەهاری (1801)، دوای ئاشتیکردن لەگەڵ نەمسادا تابەهاری ساڵی ( 1803) واتە: ماوەیەکی کەم دوای ئاشتییەکەی ئامین لەگەڵ بریتانیادا درێژەی نەکێشاو دووبارە شەڕ لەنێوان فەرەنساو بریتانیادا هەڵایسایەوە، لەوماوەیەدا ناپلیۆن بەوپەڕی زاڵییەوە توانی هەموو کاروبارەکانی ناوخۆی فەرەنسا ڕێکبخاتەوە، بەتایبەتی گرنگی بەدەستورو ڕێککردنەوەیدا، ناپلیۆن بۆخۆی ڕاستەوخۆ سەرافەتی کۆبونەوەکانی پەرلەمانی دەکردو لەکۆبونەوەکانی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشیشدا ئامادەدەبوو، کەخۆی دروستی کردبوو، لەکۆبونەوەکانی پەرلەماندا تاوتوێی ڕاپۆرتەکانی دەکرد ئەو گلەیی وکازاندانەی هەبوون لەوەزیرو لێپرسراوانی تری دەوڵەت، بانگهێشتی دەکردن بۆپەرلەمان ولێپێچینەوەو پرسیاری ئالۆزو تەماوی لێدەکردن، ناپلیۆن حەزیدەکرد گوێ لەکەسانی دەستڕەنگین و هونەرکار بگرێت وشتیان لێوەفێربێت، ئامۆژگاری زڕکوڕەکەی خۆی ئاوژن دوبوهانە[117] ی بەوە دەکردکە مرۆڤ لەشارێکی غەریبیدا پێویستە لەبری ئەوەی بێکار بسوڕێتەوە

---

[117] - 1- ئاوژن: کوڕی ویکمت ئەلکساندەر دوبوهان وخاتوو جوزفین بوو ودوای ئەوەی ناپلیۆن خاتوو جوزفینی کردە هاوسەری خۆی، بەناوژنیان دەکوت زڕکوڕی ناپلیۆن، ناوبراو زۆر قارەمانییەتی تواند لەشەڕەکاندا،

2 - ئاوژن: بووبە لێپرسراوی ئیتالیا، کەئەوکات لەژێر ڕکێفی فەرەنسادابوو، (و- فارسی)



کاتەکانی خۆی بەخوێندنەوەوە بەسەربەرێت باشترە، دواتر ناوبراو بووبە دەسەڵاتداری یەکەمی ئیتالیا ، ناپلیۆن هەموو شتێکی لەم ڕستەیەدا چڕدەکردەوە،

(زیادکردنی زانیاری بۆکەڵك وەرگرتن لێی لەبواری پراکتیکیدا )

ناپلیۆن لەگفتوگۆکردن لەگەڵ لێپرسراوانی دەریایی فەرەنساو بریتانیایدا کەباسی هەردوو جیاوازی کەشتییە جەنگییەکانی نێوان ئەودوانەی بۆدەکردن، ئەوانی تووشی سەرسامی و واق وڕمان دەکردنەوە، دواتر دەبینین ناوبراو چۆن گرنگییەکی زۆری بەبواری ئابووریدا (لێرەدا مەبەست لەئابووری بەپێوانەی ئەو گرنگی دانبوو بەبەرەوپێشبردنی بەرهەمی پیشەسازی)

ئێستا دووساڵ بەسەر گرتنەدەستی دەسەڵاتی فەرەنسادا تێنەپەڕیبوو، کەفەرەنسا لەبوارەکانی بازرگانی وگومرگ و گواستنەوەی دەریایی وخاکی وزۆریتر، شارەزایی تەواوی وەرگرتبوو، ناپلیۆن نەك هەر دەیتوانی کێشەی سنووری نێوان ئەڵمانیاو داواکاری ولایەتە خودموختارەکانی ئەمریکا بەملکداریەتی بکات، بەڵکو دەیتوانی ڕای خۆی بەپشتبەستن بەمێژوو بسەلمێنێت و وەڵامگۆیی ئەوانە بداتەوە کەپرۆپاگەندەی ملکداریەتی ئێرەو ئەوێیاندەکرد لەنێوان خۆیاندا، ناپلیۆن گوێی لەڕاو بۆچوونی هەموو ئەوکەسانەدەگرت کەشایستەی گوێ لێگرتن بوون، بەڵام سەرئەنجام هەرکاری بەبۆچوونەکانی خۆی دەکرد– ئەو ڕایەی خۆی باوەڕی پێبوو، زۆرجار دەیگوت (کەسی سەرکەوتوو لەشەڕدا ئەوکەسەنییە پەندو ڕێنمایی باش بڵێت، بەڵکو ئەوەیە کەلێپرساویەتی جێبەجێکردنی ئەو پەندو ئامۆژگاریانە بگرێتە ئەستۆ) لەنێوان ئەوکەسە شارەزایانەی قسەیان بۆدەکرد بەدەگمەن قسەی یەکێکیانی وەردەگرت وجێبەجێیدەکرد– یان باشتر وایە بڵێین باوەڕی تەواوی پێی هەبوو بۆجێبەجێکردنی، سەبارەت بەسیاسەتی ناوخۆش هەربەم شێوەیە بەدەرکردنی بڕیار تەواونابێت، بەڵکو بەجێبەجێکردنی دەکرێت، ئەو پێی وابوو چاودێریکردنی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی حکومەت لەبڕیارەکان کەمترنییە، کاتێ بڕیارەکانی حکومەت خاوەخاویان پێدەکرا – یان باش جێبەجێ نەدەکران، ڕاستەوخۆ وەزیری لێپرساوی جێبەجێکردنی ئەوبڕیارەی دەخستەژێر لێپرسینەوەو داوای لێدەکرد لێپێچینەوە لەگەڵ لێپرسراوانی وابەستەبەمە بکات، خزمەتکردن [518] لەدامودەزگاکانی دەوڵەتدا شتێکی مەترسیداربوو، ئەوکارمەندانەی لەدەزگاکانی ئەودا کاریان کردبوو، بەپێری دەیانگێڕایەوە کەدەبوا کارمەند درەنگ بخەوتباو سبەی زووش لەخەو هەڵسابا.

بەڕای ناپلیۆن پێویستە دەوڵەت تائەوپەڕی توانا هەوڵبدات کار بەکارمەندەکانی بکات، خۆکە لەسیستمی ئەو حکومەتەدا زوو کارمەندەکان بمردبان، بەلای ئەوەوە زۆر گرنگنەبوو، تەنانەت ناپلیۆن ڕای خۆی لەم بارەوە بەم ڕستەیەی خوارەوە دەردەبڕێت ( نابێ بهێڵێت پیاوەکان پیرببن )و بەبۆچوونی ئەو نیشانەی حکومەتەکردنی سەرکەوتوو لەواتای ئەو ڕستەیدابوو، ناوبراو هەوڵی دەدا هەتائەوپەڕی توانا موچەو ئیمتیاز بەکارمەندانی دەوڵەت بدات، بەڵام لەبەرامبەردا هەرچی لەتوانایدابوو فشاری دەهێنا بۆئەوەی کاری زیاتربکەن، ناپلیۆن بۆخۆی شەوڕۆژ خەریکی ئیش وکاری دەوڵەت بوو، تەنها چەند سەعاتێکی بۆخەوتن وتەرخانکردنی چارەکە سەعاتێکیش بۆ نانخواردنی ئێوارەو کەمتریش لەچارەکە سەعاتێك بۆنانخواردنی بەیانیانی

---

[518] – مەبەست لەوەیەکە لەسەردەمی ناپلیۆندا کارمەندەکانی دەوڵەت ئەگەر پێیان خواردانابا– یان کەمترین کەمتەرخەمی وکەندەڵیان لەسەر سپوت بووبا، سزای توند دەدران. (و- کوردی)



دانابوو، ئەوە ئەوەی بەپێویست نەدەزانی چاودێری حاڵی کەسانێتر لەخۆی زیاتربکات، وەك چۆن ڕەفتاری لەگەڵ سەربازەکانیدا دەکرد، ئاواش هەڵسوکەوتی لەگەڵ کارمەندانی دەوڵەتدا دەکردو هەڕەشەی دادگایکردن وسزادانی لێدەکردن، (ترموك)ی پیر کەلەسەردەمی ڕژێمی شانشینیشدا کارمەندبووە، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ناپلیۆن دەیتوانی نیازەکانی خۆی بەشێوەیەك بڵێت وبەجۆرێك دەراوی زاری خۆشبوو وەك ئەوەی لەگەڵ هاوکارانی خۆیدا قسەبکات دەدوا، بەوجۆرە خۆشەویستی خۆی لای کارمەندەکانی وەك سەربازەکانی زیاددەکردوو دەچووە دڵانەوە، کارمەندەکانیش لەزۆری کارکردن وماندوو بووندا دەمردن، وەك چۆن سەربازەکان لەمەیدانی شەڕدا تێدادەچوون، خزمەتکارەکانی ئەو چ لەمەیدانی شەڕو چ لەفەرمانبەری دەوڵەتدا، بەوپەڕی سۆزو شەیداییەوە کاریان دەکرد تانیشانەیەکی شانازی– یان زەردەخەنەیەکی لامسەللایی ناپلیۆن وەربگرن، بەحوکمی ڕای گشتی کەدوای ئاشتی کردنەکە بەڕێوەچوو وبەپێی بڕیاری ڕۆژی (12ی ئۆگۆستی ساڵی (1802)، ناپلیۆن (3568885) دەنگی بەڵێی لەبەرامبەر(8374) دەنگی نەخێر هەبوو وبەکنسولی هەمیشەیی هەڵبژێردرابوو وبەسەرۆك کۆماری فەرەنسا، لەمەوە وەدیارکەوت لەکۆماری فەرەنسادا حکومەتێکی سەرکوتکەر هاتەسەرکارو زۆر درێژە ناکێشێت کەکنسولی یەکەم دەبێت بەپاشا–یان ئیمپراتۆر، ناپلیۆن بەهەمان شێوەی سەپاندنی دیکتاتۆریەکەی خۆی کردی، دەبوێست دەسەڵاتی ئایندەشی لەسەر بنەمای درێژەدان بەو ڕەوشەی بگرێتەبەر، واتە: لایەنگری بۆرژوازی گەورەی شارو گوندەکان وچینی وردە بۆرژوازو کۆلاك و...هیتری، هاوشێوەبگرێت، ئینجا پەیمانی بەبازرگاناندا حکومەتی فەرەنسا دەتوانێت ودەیەوێت بازاڕی ناوخۆ لەبەرامبەر ڕکەبەریی دەرەکییەکاندا پارێزگاری لێبکات وبەشێك لەئەوروپا، تەنانەت هەموو ئەورووپاش بکاتە شوێنی کەڵك لێوەرگرتنی سەرمایەگوزاری و پیشەسازی فەرەنسا، بەمانای بازاڕی ساغکردنەوەی کاڵاکان وبازرگانی کردن، ئەو دەیزانی بەمکارەی بۆرژوازیەتی فەرەنسی چاوپۆشی لەدرێژەپێدانی حکومەتە سەرکوتکەرەکەیی کەبەدرێژایی مێژووی شانشینی بەم قۆناغە ناهەموارەدا تێنەپەڕیبوو، بکەن.

(6)

ناپلیۆن سووربوو لەسەرئەوەی هەر لەمپەرێکی بەردەم پەیوەندییەکانی سەرمایەداری وپتەوکردنی هێزی خۆی بێت لابەرێت ونەهێڵێت، لەمەش زیاتر نەخشەی ئاشتی کردنی دەوڵەتی فەرەنسای بەڕەسمی لەگەڵ کڵێسای کاسۆلیکدا کێشاو زەمینەی بۆخۆشکرد، لەمێژووی (18–ی بروم) بەدواوە، ڕێوڕەسمی مەراسیمەکانی مەزهەبی ئازادکرد، ئینجا بڕیاردەرکرد ئەرکی دینی یەك شەممانیش بکرێت و زۆر لەکەشیشەکانی کەدورخرابوونەوە گەڕاندەوە فەرەنساو هەندێکیشیان کەزیندانی کرابوون ئازادکرد، دواتر لەگەڵ پاپدا کەوتەگفتوگۆ، سەبارەت بەچۆنیەتی ئەمەو بەپێی پێشنیارەکانی پاپی مەزن، مەزهەبی کاسۆلیك وەك ئاینی ڕەسمی زۆرینەی گەلی فەرەنسا دەناسراو کڵێسای کاسۆلیکیش دەکەوتە ژێر پارێزگاری دەوڵەت، ئەو گفتوگۆکردنانە ڕێککەوتننامە بەناوبانگەکەی بەکنکوردی لێکەوتەوە، کەبەڕای مێژوونووسانی بۆرژوازی (شاکارێکبوو لەگرتنەبەری ڕێگای دروستی دەوڵەت)

لەڕاستیدا ئەم ڕێککەوتنە پاشەکشەکردنی بەشێکی سەرەکی بوو کەشۆڕشی فەرنسا لەبەرژەوەندی ئازادی فکریدا بەدەر لەدەسەڵاتی کڵێسای هێشتبوویەوە.



شۆڕش کاریگەری پراکتیکی کڵێساو نفوزی ڕەسمی ڕۆحانیەکانی بەسەر میللەتی فەرەنسادا تاتاستێکی زۆر کەمکردبۆوە، بەلام ناپلیۆن جارێکیتر ئەوەی دایەوە دەست کڵێسا، هۆکاری ئەم هەنگاوەی ناپلیۆن چی بوو ؟ وەڵامەکە ئاشکرایەو هیچ گومان وغوباری لەسەرنییە، بێ گومان ناپلیۆن بێ دین نەبوو، بەڵام ئیمانێکی لاحسەللایی و سەرتوێژی بەخواهەبوو، بەدرێژایی تەمەنی خۆی کەمترین کاتی بەقسەکردن لەسەر مەزهەب بەفیڕۆدەدا، هیچ کاتێ گوێی بەقسەی ئەوپیاوە ئاینیانە نەدەدا کەپێیاندەگوت پشت بەخوا ببەستە، کنت کیارامونتی، لەساڵی ( 1799)دا بەپاپی گەورەی حەوتەمی ڤاتیکان دانرا کەوەك نوێنەری خواوابوو لەسەر زەوی، ناپلیۆن ئەوی بەپیرەمێردێکی فێڵباز سەیردەکرد، چونکە پاپ ئامادەبوو دەسیسەو تۆینبکات بۆگێڕانەوەی بەماڵەی بوربنەکان بۆسەرتەختی پاشایەتی فەرەنسا بۆئەوەی ئەوسامانەی کڵێسا کەلەسەردەمی سەرەتای شۆڕشەوە دەستی بەسەرداگیرابوو بگێڕێتەوە، بەڵام ناوبراو بەڕۆح لەناپلیۆن دەترسا، چون تەواوی ئیتالیا کەوتبۆژێر ڕکێفی فەرەنساو دوای شەڕی مارانگوش شاری ڕۆم و پاپ خۆیان بەگرفتاری ژێرچنگی کنسولی یەکەم دەزانی، پاپی حەوتەم زەندەقی چوبوو وبەچاوی زیادڕەو وچەتە سەیری ناپلۆنی دەکرد، ناپلیۆنیش باوەڕی بەهیچ قسەیەکی پاپ نەبوو وئەوی بەکەسێکی درۆزن ودەسیسەچی دەزانی، ئەمەڕای هەریەك لەم دوانەبوو کەلەبەرامبەر یەکتریاندا هەبوو، چ پێش ئاشتی کردن و چ دواتریش، هیچ یەك لەم دوانە تاسەرەمەرگیش ئەم تێڕوانینەی خۆیان نەگۆڕی، کەسایەتی خودی پاپ بەلای ناپلیۆنەوە گرنگنەبوو، بەڵکو هێزی کڵێسا گرنگبوو کەلەبەر چاو نەگرتنی ئەمە نەدەکرا، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەنا مانەوەی هێزە سەربازییەکانی فەرەنسا لەئیتالیادا زیانی پێدەگەیشت، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو ئەگەر بتوانێت کڵێسای کاسۆلیك بخاتەگەڵ لایەنگری خۆی کەڵکی زۆری هەبوو، ناپلیۆن کە(بالساموی[119] پێشبینی کەرو کانتی[120] فەیلەسوفی بەکۆپاڵێك دەڕەتاند، دەیگوت(کەشیشەکان بەبەهاترن لەکالیوسترووییەکان وکانتییەکان وهەموو خۆش[121] خەیاڵاتەکانی تری ئەڵمانی) درێژەی بەقسەکەی دەداو دەیگوت (چونکە سروشتی مرۆڤ وایەو حەزدەکەن شتی نائاسایی باوەڕپکەن بۆیە باشتر وایە دەرگای کڵێسایان لەڕوودا بکەنەوە، تابچن گوێ لەڕێنمایی ودانایی ساختەی مەزهەبی بگرن، بەڵام بارێگایان پێنەدەین زۆر فەلسەفە چییەتی بکەن، ناپلیۆن لەو بڕوایەدابوو بۆ وڕکردن ودەبەنگکردنی خەڵك کڵێسا بیریان لاچەپ دەکات، بەواتایەکیتر: ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەوپیرە فێڵبازەدا(واتە: کنت کیارامونتی، کەخۆی ناونابوو پاپی حەوتەم وخەڵکی گەمژەبوون ئەوانەی باوەڕیان بەوەدەکرد، کەناوبراو نوێنەری خوایە لەسەر زەوی)، سیخوڕو پیاوانی ئاسایشی سەربە فوشە بەنهێنی کەڵکی باشیان لەکەشیش وپێش نوێژی کەران دەکرد بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت (حکومەت) جگەلەمەش لەوەباشتر بوو دەسەلاتدارانی حکومەت خەڵك بخەنەناو ئەو ئاڵۆزیەی گوتەی فەیلەسوفەکان کەکەس سەری لێدەرناکات، هەروەها ناپلیۆن لەوبڕوایەدابوو ئەم پۆلیسە ڕەشەی کاسۆلیکی، بۆهێورکردنەوەی شاڵاوی هەڵچونی سەردەمی ڕۆشنگەری وبیرۆکەی

---

[119] - بازوف بالساموی: یەکێکە لەپزیشکەکانی ئیتالی وتەڵەکەبازێکی بەناوبانگ بوو(1734- 1795) و یەکێکە لەپەیڕەوانی باوەڕدار بەزانستی کیمیاو ئیقباڵ وفاڵگرتنەو جادوکەری، لەکۆشکی پاشایەتی لویسی شازدەهەمدا سەنگ وبەهای زۆری هەبوو، ئەو لەمەسەلەی کەردنبەندەکەی شاژندا تێوەگلابوو وشاژن ڕقی لێهەڵساو لەفەرەنسای دوورخستەوە .(و- فارسی)

[120] - فەیلەسوفێکی ئایدیالستی ئەڵمانیەو لە کونیکسبرك لەدایکبووە ( 1721-1804)

[121] - خۆش خەیاڵاتەکانی: خەیاڵ پڵاونوەکان، . (و- کوردی)



شۆڕشگێڕی باشترین ڕێگاچارەیە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە. ڕێککەوتننامەی نێوان پاپ وناپلیۆن کەبەلنکوردا بەناوبانگە لەیۆلیۆی سالی(1801)دا مۆرکراو لە(15/ی ئیبریلی سالی (1802)دا ئەوقانوونەش کەبەهۆی ئەو ڕێککەوتنامەوە دەرچوو کاری پێکرا، ڕێکخراوەیی تازەی کڵێسای کاسۆلیکی لەفەرەنسادا دیاریدەکرد، ئەمەش چەند برگەیەکی ئەو ڕێکەوتن نامەیەیە، ناپلیۆن مەزهەبی کاسۆلیکی بەمەزهەبی زۆرینەی خەڵکی فەرەنسا ناسیبوو، نەك وەك ئەوەی مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت بێت، کەلەپێش شۆڕشدا مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت بوو، هەروەها مۆڵەتی ئەوەیدەدا مەراسیمە ئایینییەکان بەئازادی بکرێن، لەبەرامبەردا پاپا پابەندبوو بەوەی هەرچی ئەو ملکوماڵەی کڵێسای کاسۆلیك کەلەسەردەمی شۆڕشەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، دەستی لێهەلگرێت.

ناپلیۆن بەکەیفی خۆی ئەسقەفی گەورەی ئەسقەفەکانی هەڵدەبژاردو دیاری دەکرد، دوای ئەمە پاپ حوکمی بەشەرعی ناسینی ئەوانەی دەردەکرد، ئەوکەشیشانەی لەلایەن ئەسقەفەکانیشەوە دادەنران، چونکە دەوڵەت داینەنابوون ولەڕێگای دەنگدانەوەنەبوو نەیاندەتوانی هەتاسەر گرێنتی مانەوەیان لەسەرئەم پیشەیە دەستەبەر بکرێت ودەوڵەت ئەمەی نەدەگرتە ئەستۆ، ئەو فەرمانانەی لەلایەن پاپەوە دەردەچوون کاریان پێنەدەکرا، مەگەر پێشتر مۆڵەتی لەدەوڵەتەوە پێدرابا، ئەمەبوو ڕێککەوتننامەی کنکوردا کەزیاتر لەسەد ساڵ دوای ناپلیۆنیش هێزو کاریگەری خۆیان هەرمابوو، ناپلیۆن لەلێکدانەوەکانیدا هەڵەی نەکردبوو، چونکە ماوەیەك دوای ئەو ڕێکەوتننامەیە ڕۆحانیەتی کاسۆلیکەکان لەهەموو قوتابخانە ئایینییەکاندا وانەی تایبەتیان بەقوتابییەکان دەگوتەوەو لەو وانانەدا کەوشە بەوشە نووسرابۆوە، دەبوا خوێندکارەکان دەرخیانکردباو ئەمەش بریتی بووله:

یەکەم: خوای گەورە ناپلیۆنی وەك نوێنەری ڕووخساری خۆی ناردۆتە سەرزەوی.

دووەم: ئەو کەسانەی لەئەرکەکانی سەرشانی خۆیان سەبارەت بەناپلیۆن کەمتەرخەمی دەکەن، ئەوا سەرپێچی لەدەستووری خواوەند دەکەن وشایستەی نەفرەت لێکردنی هەمیشەین.

ئەم ڕوونکردنەوەیە هەندێك ڕاستیتر لەگەڵ خۆیدا دێنێتە پێش.

لەمەراسیمەکانی مەزهەبیدا لەسەر منبەرەکانی وتاربێژی ئاینی دەیانگوت: ڕۆحی موقەدەس بەشێوەیەکی کاتی چۆتەناو لەشی ناپلیۆنەوەو لەگەڵیدا تێکەڵاوبووە، هەتا ئەم بێ سەرو بەرەییەو بێ دینی شۆڕشگێڕەکان[122] پیشەکێش بکات، ڕاستی ئەوقسەیەو لێکدانەوەی دوای ئەوەی، ناپلیۆن بوو بە ئیمپراتۆر، ئەم قسەیە بۆدوژمنانی دەرەکی وهاتنەناوەوەی ڕۆحی پیرۆز بۆ ناولەشی ناپلیۆن لەکاروباری سەرکردایەتی کردنی سوپاکەیەوە، لەماوەی ئەوچەند مانگەی ڕێککەوتننامەکەی کنکوردا ، ناپلیۆن بیرۆکەی ئارمی (لژیون دوسنور) کەتا ئێستاش لەفەرنسادا باوە جێبەجێکرد، ئەو لەسەرەتاکانی ساڵی (1801)وە کەوتبۆ بیری ئەوەی نیشانەیەکی شانازی بۆ پاداشتدانەوەی ئەو کەسانەی لەسوپادا خزمەتی دیار– یان ئازایەتیان نواندووە– یان خزمەتی بەرچاوی دەوڵەتیان کردووە، بدات، ئەم نیشانەیە چەند جۆری هەبوو وتەنها لەژێر ئاگاداری فەرمانڕەوای ڕەهادا دەدرا.

122 - مەبەست لە: شۆڕشی کۆماری فەرەنسایە کەوبەکۆمۆنەی پاریسیش ناسراوە.



لەسەردەمی ناپلیۆندا پەیڕەو بنەمای خوێندن داڕێژراو تابەئەمڕۆش[123] هەر بەوشێوەیە ماوەتەوە، ڕاستە ئەمە لەسەر خوێندنگە سەرەتاییەکان نەبوو، بەڵام خوێندنی ناوەندی ودواناوەندی وخوێندنی باڵا هەروەك خۆی ماوەتەوە بەچەند وردە گۆڕانکاریەکەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە کاروباری زانکۆکان کرایە ژێر دەسەڵاتی وەزیری ڕۆشنبیری، زانکۆکان لەسەردەمی ناپلیۆندا، لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتبوون:

1 – خوێندنی باڵا.

2– ناوەندی ودواناوەندی،(دەرچوانی ناوەندی ودواناوەندی).

کاری سەرەکی خوێندنگا تایبەتییەکانیش (کەوابەستە بەکەرتی تایبەت بوو، لەسەردەمی ناپلیۆندا دامەزرا) دەبوا لەڕشتەکانی ئەندازیاری وهونەری وقازی وکەسانی ئیداری و... هیتر، پەروەردەبکات.

چاودێری کردنی سەختی ئەو کۆلیژانە شێوەی سەربازی بەخۆیەوە گرتبوو، تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵی ئەم خوێندکارانە زۆر سەخت وقورس بوو، بەڵام قوتابخانەکانی ناوەندی ودواناوەندی زیاتر بۆ پەروەردەکردنی خوێندکاری بوارەکانی ئەفسەربوون، دوای دەرچوونی هەر خوێندکارێك تاقیکردنەوەیەکیان دەکردوو دەیانناردە کۆلیژی سەربازی، ئەوانە دەیانتوانی لەفەرمانگەکانی دەوڵەتیشدا کاربکەن، بەڵام هەمان ئیمیتازی ئەوانەیان نەبوو کەزانکۆیان تەواوکردبوو وڕشتەکەیان دیاریکراوبوو، ناپلیۆن حەزیدەکرد خۆی بەپارێزەری زانست وفێرکردن نیشان بدات، شارەزایانی بواری ماتماتیکی وکیمیا وئەستێرەناس وفیزیاییەکان و ...هیتر، ڕاستەوخۆ خرابوونە ژێر چاودێری خۆیی وئاگاداری دەکردن وگرنگی تایبەتی بەزانایانی بواری مێژوویی دەدا، بەتایبەت مێژووی میسر، چونکە میسرناسی بەچەمکە زانستییەکەی لەسەردەمی لەشکرکێشییەکەی ئەو بۆسەر میسر وداگیرکردنی ئەوخاکە سەری هەڵدابوو، ناپلیۆن لەزانست ئەنجامی باشی دەویست ودەیویست لایەنەکانی قابیلی درك ودیاری ئەو گرنگی بدات بەدەستەوە.

ئەو لەورنامەیەی ساڵی (1812)ی کەلەشاری ڤیتسبکی[124] پوسیاوە بۆ لاپلاس[125] ی نووسی، بەڕاشکاوی دەڵێت: پێویستە زانست پێش هەموو شتێك لەڕێگای شانازیکردن بەئیمپراتۆر بەکاربهێنرێت، لەم هەلومەرجەدا، هەتا زانستی ئەبستراکی وەك ئەستێرەناسیش دەتوانێت خزمەت بکات، بەڵام ناپلیۆن زانستی گێڕانەوەی خۆش نەدەویست ویشتی بەمانە نەدەبەست، بۆ نموونە: نەیدەتوانی بونی تاسیت[126] بەوەی بێ ڕێزی بەقەیسەرەکانی ڕۆم کردبوو بەرگەبگرێت، فەلسەفەی سەردەمی ڕۆشنگەری (لێرەدا مەبەست لەسەردەمی شۆڕشە) بیرۆکە ئایدۆلۆژییەکان بەلای ناپلیۆنەوە جێگای نەفرەت لێکردن بوون.

---

123 - تابەئەمڕۆش: ئێستاش ئەو قانونە هەرماوە – یان زۆری تر مەبەستی لەساڵانی نووسینی ئەم کتێبەیە کەبۆ نیوەی یەکەمی سەدەی بیست دەگەڕێتەوە نەك ئەم ئێستا. (و- کوردی)

124 - ڤیتبسك: شارێکە لەوڵاتی بیلاڕوسیای ئێستا، ئەوکات سەربە ڕووسیابووەو دەکەوێتەسەر ڕووباری دڤینا. (و- فارسی)

125 - لاپلاس: بیرمەندێکی ماتماتیکی وئەستێرە ناسێکی بەناوبانگی فەرەنسیە ( 1749-1820) و زۆر توێژینەوەو لێکدانەوەی سەبارەت بەئەستێرەکان هەیەو بەتایبەتیش دەربارەی مانگ وزەوی ومشتری وزوحەل، تیرۆیەکەی لاپلاس کەسەبارەت بەجیابوونەوەی هەسارەکانی دەوری خۆرە کەلە خۆرخۆی جیابوونەوە، بەناوبانگترین تیۆری زانستی ئەستێرەناسیە، لەبواری فیزیاشدا بەتایبەت لەلێکۆڵینەوە لەئەلکترومکناتیسیدا تیۆریەکی هەیە، ناوبراو ئەندامی ئەنجومەنی زانایانی فەرنسابووە. (و- فارسی)

126 - تاسیت، مێژوو نووسێکی بەناوبانگی لاتینیە، لەشاری ڕۆم لەدایکبووە(55-125-میلادی) ئەو داهێنەری ساڵنامەو زۆر مێژووی ترە لەهەمووشیان بەناوبانگتر(مێژووی داب ونەریتی میللەتی جێرمەن ( ئالمان )و قسەی ڕەوانبێژانە. لایەنی مرۆڤ دۆستی وهونەریانەی ئەو بوّتە هۆی ئەوەی شێوازی مێژوو نووسینەکەی جیاوازی هەبێت لەگەڵ کەسانی تردا، لەزمانەوانیشدا زۆر بەتوانابووەو نووسینەکانی زۆر ڕوون وناوازەن . (و- فارسی)



لەئابووری سیاسیشدا بەتایبەت تیۆریەکەی فیزیوکراتەکانی[127] بەزمان لوسی وتەفرەدەرانە دەزانی وهەر بەوجۆرەش سەیری کانتی فەیلەسوفی دەکرد.

ئامانجی ناپلیۆن پێش هەموو شتێك ئەوەبوو هەمووجۆرە یادەوری سەردەمی شۆڕش وئایدۆلۆژیاکەی لەناومێشکی خەڵکدا ڕەش بکاتەوە، چونکە بەلای ئەوەوە ڕۆژگارێکی نەفرەت لێکراوبوو، تەنانەت دەیویست یادی هەندێك شتی مێژوویی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەش بیرخەڵك بباتەوە، نووسین لەسەر شۆڕش تەنانەت ئاماژەکردن بەئەوو پیاوانی ئەو ڕۆژگارەش قەدەغەبوو، ئەروبسپیر ناوێك هاتبۆ ئەم دنیایەو ئەماراو بابۆف وهەتا خودی میرابۆش، لەم دنیایەدا نەژیاون.

کاتێ لەساڵی (1807)دا لەئەنجومەنی باڵای زانستی پارس، کەسێك کەزۆر چاکەو باشی لەگەڵ دەزگاکانی حکومەتدا هەبوون، بەهۆی ئەوی ناوی میرابۆی هێنابوو، ناپلیۆن تووڕەبوو ونامەیەکی بۆ وەزیری ناوخۆ ناردوو تێیدا نووسیبوو: باسکردنی میرابۆ، بۆ دەملێکوتانی سەرۆکێکی ئەنجومەنی باڵای زانستی نەهاتووە، هەتا وشەی شۆڕشیش لەبڵاوکراوەکاندا نەدەنووسراو لابرابوو، ناپلیۆن هەرلە سەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵات، بیرۆکەی خۆقایمکردن و چەسپاندنی دەسەڵاتی لەسەر ئەوە داڕشتبوو کەدامودەزگاکانی ڕاگەیاندنەکان پێویستیان بەدارکاری وتەمبێ کردن هەیەو ئەمەشی جێبەجێکرد .

ئێستا دوومانگ وچەند ڕۆژێك بەسەر کودەتای (18-برومر)دا تێپەڕیبوو، بەپێی بڕیارێك کەلە(27/ی مایۆدا دەرکرا، شەست ڕۆژنامەی داخستن، بێ ئەوەی ئاگاداربکرێنەوە- یان سەرپێچیان کردبێت، تەنها (13) ڕۆژنامە مابوونەوە، ئەم (13) ڕۆژنامەش ماوەیەك دوای ئەمە بۆچوار دانە کەمکرایەوە، ئەمچوار ڕۆژنامانەش (کەبریتانیاکان ناویاننابوو دەستەسڕی باخەڵ) جگەلەشتی هیچ و لاوەکی هیچی تریان بڵاونەدەکردەوە، بۆیە خوێنەریشیان نەمابوون.

تەنانەت ناپلیۆن ڕێگای بەو ڕۆژنامانە نەدەدا کەدژی لایەنگرانی شۆڕشیش هیچ بڵاوبکەنەوە، بەمانایەکی سادەتر ئەسڵەن نەیەویست وەبیر خوێنەرانی بێنێتەوە کەڕۆژگارێ ئەمانە هەشبوون، بۆنوموونە: هەندێك لەڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا دژی شۆڕش وئایدۆلۆژیەکەیانی دەنووسی وبەشکۆمەندی ومەزنی ئەویان هەڵدەگوت وگەیاندبوویانە کەشکانی فەلەك، چونکە شۆڕشی لەناوبرد، کەچی ئەو ڕۆژنامانەشی لەناو ئیمپراتۆریەکەی خۆیدا قەدەغەکردن.

ئەو بۆیە ئەو ڕۆژنامانەی قەدەغەکرد، چونکە ناوی شۆڕشیان دەنووسی- یان هەندێك کەسایەتی ئەو ڕۆژگارە، تەنانەت ساڵنامەی شێوە دەفتەری بەرباخەڵیشی قەدەغەکرد کەباسی ڕۆژگاری شۆڕشی بەگوتەی دوو ڕستەش تێدا نووسرابوو وئەوانەی چاپیش کرابوون کۆیانکردنەوە، لەگوتارو مەقالەکانیشدا باسکردنی سویسراو هۆڵەنداو کۆمارین قەدەغەکرا، هەرچەندە ناپلیۆن کۆماری هۆڵەندای لەساڵی (1806) دا لەناوبرد، لەساڵی (1810) دا کەسێك بەناوی باروول بوور، کتێبێکی بەناوی( کردەوەی فەیلەسوف وکۆماریخوازەکان نووسی) وخەریکی چاپکردنی بوو، ئەوپیاوە لەکتێبەکەیدا بەناشیرینترین شێوە باسی شۆڕشەکانی کردبوو وبەدزێوترین شێوەش بەشان وباڵی ناپلیۆنی هەڵگرتبوو وکلکەسوتەو ماستاوکردنی بۆئەو کردبوو، ناوبراو دڵنیابوو لەوەی کتێبەکەی بێ کێشە بڵاودەکرێتەوەو لەلایەن حکومەتەوە ڕەزامەندی

---

[127] - فیزیوکراسیەکان: واتە پەیڕەوکەرانی ڕێبازی فیزیوکراسی، ئەو ڕەوشە لەزانستی ئابووریدا دەڵێت تاکە سەرچاوەی سامان زەویە. (نووسەر)



پێدەدرێت، بەڵام بەهەڵەداچوونی ئەو لەوەدابوو، ئەوکتێبە لەژێر سانسۆر دەرنەچوو وچاپکردنەکەی ڕاگیراو هۆی ڕاگیرانەکەشی بەم جۆرە نووسرابوو(یادەوەری دیۆواری ڕۆژگاری ڕابردووی بەبیرهێناونەوە).

(ژاکوبینیسمی نهێنی) گوناهێکبوو دەوڵەتی ناپلیۆن چاوپۆشی لێنەدەکردو ئەدیبەکان دەبوا ئەو هەڵەیە نەکەن، نیشانەکانی ئەم ژاکوبینیسمیە نهێنیەش لەسەر خوێندنەوەی سەیرو سەمەرەی نووسینی ئەدیبەکان لێکدەدایەوە، بۆنموونە: ئەگەر نووسەرێك باسی پاکدامێنی ئاریتیدی[128] کردبا، یان باسی شەرافەتمەندی (کاتن)ی کردبا، یەکسەرە گومانیان لێدەکرد، چونکە ئەسیناو ڕۆم، کۆماری ببوون [129] ، سەرپێچی ئەوەیان دەخستە پاڵ نووسەرەکە گوایا ویستویەتی ستایشی حکومەتی کۆماری بکات، ناپلیۆن چاپەمەنی وبڵاوکراوەکانی ئەو وڵاتانەی داگیری کردبوون- یان لەشەڕەکاندا دۆڕابوون لەباربرد، ئەگەر کەمترین ئاماژەیان بەداگیرکەر- یان ژێردەستەیی وڵاتەکەی خۆیان کردبا، ئەوا ئەو ڕۆژنامەیە دادەخراو نووسەرەکانیشی دەستبەسەردەکران، تەنانەت ئەوکەسەی نووسیبووی گیانی دەکەوتە مەترسییەوە، چارەنووسی پالمار کەکتێب فرۆشێکبوو لەسەر بڕیاری ناپلۆن لەنورنبرگدا گوللەبارنکرا، تەنها تاوانیشی ئەوەبوو ئامادەنەبوو ناوی ئەونووسەرە ئاشکرابکات کەنامیلکەیەکی بڵاوکردبۆوەو ببووە هۆی هەراسانبوونی ناپلیۆن، ئەمە ئەوەی دەگەیاند ئەگەر نووسەرو بڵاوکراوەکان کەمێ دڵسۆزییان بۆ وڵاتە داگیرکراوەکەیان نیشاندابا چ چارەنووسێك ڕوو بەڕوویان دەبۆوە، نەهێشتنی هەموو یادو یاداشتی ڕۆژگاری شۆڕش وبنەماکانی ئەو، ئەوپەڕی چاودێری دەکراو بەتوندی لێکۆڵینەوەی لەسەردەکرا، ئاماژە بەڕزگاری نیشتمانی ومافی ئۆتۆنۆمی میللەتەکانی ئەورووپای ژێر ڕکێفی خۆی قەدەغەبوو، ئەمەبوو ڕەوشی سیاسی ناپلیۆن لەبواری چاپەمەنیدا.

( 7 )

دوومانگ دوای شەڕی مارنگو وچەند هەفتە دوای گەڕانەوەی لەئیتالیا، کنسولی یەکەم بەپێی ئەو بڕیارەی لە(12/ئۆگوستی ساڵی(1800) دەرچوو، ئەنجومەنێکی بۆ ڕەشنووسی قانونەکانی مەدەنی دیاریکرد، تادەستورێك کەببێتە بناغەی ڕەوشی قەزایی فەرەنساو هەموو ئەوخاکانەی لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسادابوون، بەهۆی بوونی چەند گرفتێکی گەورە لەداڕشتنەوەو جێبەجێکردنی ئەمەدا، ناپلیۆن ئەندامانی ئەو ئەنجومەنەی کەمکردەوە بۆ چوارکەس، چونکە ئەو تاقەتی بوونی ئەنجومەنێکی ئەندام زۆرو دەمەتەقێی زۆرو کۆبوونەوەی دوورودرێژو نەبڕاوە بگرێت، بەڵام ئەم چوار کەسە هەموویان لەقانون زان ومافپەروەری دیارو بەتواناببوون، ئەو دەستەیە کەبنەماکانی ئەو قانونەیان داڕشت ودواتر ناونرا، قانونەکانی ناپلیۆنی، بەپێی بڕیاری (1852) پەسەندکراو تائێستاش ئەو قانونە بەهایان ماوەو بەناوی قانونەکانی مەدەنیەوەن وناوی قانونەکانی ناپلیۆنیشیان پێدەگوترێت وگۆڕانکاری ئەوتۆشیان بەسەردا نەهاتووە، لەنووسینەوەی قانونەکانی مەدەنیدا کەبەهیمەتی

---

[128] - 1- ئاریستید: سەردارو سیاسەتمەداری ئەسینایەو ئازناوی دادەپەروەری هەبووە (540-460 ، پێش میلاد ) و شەریفترین پیاوی وڵاتەکەی خۆی بووەو لەشەڕەکانی یۆنان لەگەڵ خشاریاشای پاشای هەخامەنشینەکاندا – بەتایبەت لەشەڕەکانی دەریایی سالامین وپلاتەدا ئازایەتی زۆری نیشانداوەو بەرکەبەری تیستوکل هەژمارکراوەو ئیدارەی ئەسینای بەیەکسانی کردووە، (و- فارسی)

2 - کاتن: ڕەوانبێژو سیاسەتمەداری ڕۆمی وکەسێکی باوەڕ جێگیرو دژایەتی جوانپەرستی ڕۆمیانی کردوەو زۆر نووسینی سەرنج ڕاکێشی لەدوای خۆی جێهێشتوون (149-234، پێش میلاد)

[129] - کۆماری بون: مەبەست لەوەیە ڕۆژگارێك کۆماری بوون . (و- فارسی)



ناپلیۆن داڕێژران: دەبوا قانونی حوکمی مافی لەبنچینەدا زاڵی بۆرژوازیەت بەسەر فیوداڵیەوەبێت وپێگەو دەستەباڵایی خاوەنداریەتی لەکۆمەڵگادا چەسپاوبێت ونەهێڵدرێت بنەمای خاوەنداریەتی بۆرژوازی بکەوێتە بارودۆخی ناسکەوە، لەمانەش فیودالیەت کەلەلێواری گۆڕدرابوو زەفەری پێنەبەرێت هەتا ئەو کرێکارانەی کەدەشیانەویست زنجیرەکان بپسێنن، لەعۆدەی نەیەن.

ناپلیۆن پێی وابوو هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش لەفەرەنسادا بۆ خواستی ئازادی نەبووە، بەڵکو لەوەوە بووکە خوازیاری یەکسانی بوون، بەڕای ئەو یەکسانی و بەیەکچاوسەیرکردنی خەڵکبووە لەمافەمەدەنیەکاندا، نەك بارودۆخی کۆمەڵایەتی وئابووری ژیانی خەڵك، ئەوهەوڵیدا ئەو نایەکسانیە لەناو قانونی مەدەنی، کەخۆی دانەری سەرەکی بوو، بوەنێتەوەو بیخاتە حاڵەتی جێبەجێکردنەوەو درێژەی پێبدات، سەبارەت بەشۆڕشیش دەیگوت (ئازادی تەنها دەستەواژەیەك بووە) ئیتر ئەو ئازادی سیاسی نەهێشت ویەکسانیش بەومانایەی کەخۆی درکی پێدەکردبوو بەشێوازی قانونی خستیەڕوو.

لەو گۆشەنیگایەوە کەڕۆحیەتی سیستمی لۆژیکی بەوەی بەرگری دەوڵەتی بۆرژوازی دەکرد بۆیە(قانونی ناپلیۆن ) بۆتە جێگای پێهەڵگوتن وستایشی وڵاتە سەرمایەدارەکان وتائێستاش هەربەو شێوەیەیە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێ ویژدانترین ڕەخنەگریش ناتوانێت نوکلی لەوەبکات ئەم قانونانە بەبەراورد لەگەڵ قانونەکانی شۆڕشدا پاشەکشەی کردبوو ووەك ئەو باش نەدەهاتەوە، هەرچەندە ئەم قانونە بەبەراورد لەگەڵ قانونەکانی تری هەموو وڵاتانی تری ئەورووپادا پێشکەوتووتربوو، جێگای ئاماژە بۆکردنەکە لەم قانونەدا چاوپۆشی لەزۆر دەستکەوتەکانی شۆڕشکران، لەقانونی ناپلیۆنیدا ژن سەربە پیاوەو لەمەسەلەی میراتگرەویشدا کچ لەکور کەمتری بەردەکەوێت، لەقانونەکانی شۆڕشدا کەلەسەر بنەمای مرۆڤ دۆستانەبوو(بێژووەکان وحەڵاڵ زادەکان) لەبەرامبەر قانوندا یەکسانبوون، بەڵام قانونەکانی ناپلیۆنی ئەم خاڵەی لابرد.

(نەهێشتنی مافەکان) [٥٣٠] هەموو سزادانە ڕەزیلکردنەکان دووبارە لەسەر مەحکومدراوەکان جێبەجێکرانەوە، ئایا لەدەرچوونی ئەم قانونەو کارپێکردنیدا خەڵك ناڕەزایی دەربڕی ؟

بەدڵنیاییەوە بەڵێ، تەنانەت لەکاتی ناردنی بۆ ئەنجومەنی تریبونا، هەندێك لەئەندامەکانی ناڕەزاییان دەربڕی، بەڵام کاریگەری نەبوو کەس گوێی پێنەدان، ئەو ناڕەزاییانەی لەسەرەوە باسمانکرد زوو یەکلاییکرایەوەو نەبوو بەلەمپەڕ لەبەردەم ئەم قانونانەی ناپلیۆندا(واتە: قانونی مەدەنی) ناپلیۆن بەجۆرێ ئەنجومەنی تریبونەکانی تەتەڵەکرد، کەتەنها (50) ئەندامی بێ زمانی[٥٣١] هێشتەوەو فەرمانی دەرکرد نابێ ئەو ئەنجومەنە ژمارەی ئەندامەکانی لە(50) کەس تێپەڕێت.

کاتێ ئەم چاکسازیە لەئەنجومەنی تریبونەکاندا ڕوویدا ئیتر هەموو شتێك بەپێی زەوقی ناپلیۆن بەڕێوە دەچوو، لەمانگی(مارسی– 1803)دا قانونەکانی ناپلیۆنی کەپێشتر لەئەنجومەنی باڵای دەوڵەتدا تاوتوێ کرابوون، درایە ئەنجومەنی

---

[130] - نەهێشتنی مافەکان: ئەمە یەکێکبوو لەسزاکان کەلەبەرامبەر تاوانباراندا کراوەو لەپێش شۆڕشەوە هەبووەو لەقانونی شۆڕشدا لابرا، ئەوانەی دادگا بڕیاری لەسەردەدا، ئەوکەسە لەمافە کۆمەڵایەتیـەکانی بێبەری دەکراو بەمردوو لەقەڵەم دەدراو بەبەرچاوی خۆیەوە نیشانەکانی مردنی خۆی دەبینی، واتە: میراتەکەی دابەشدەکراو هاوسەرەکەشی بەتەڵاقدراو هەژماردەکراو دەیتوانی شووبکاتەوە. (و- فارسی)

[131] - بێ زمان: مەبەست لەوەیە ئەو ئەندام تریبونانەی مابوونەوە کەسانی ملکەچ وباربەربوون و ڕای راستەقینەی خۆیان دەرنەدەبڕی وتەنها کارتۆنی بوون، (و- کوردی)



یاسادانان وئەویش بێ قاوقیلە یەك بەیەك ەنگی بۆ مادەکانیدا، قانونی ناوبراو کەلە(مارسی، 1804)دا ئیمزای کۆتایی لێدرا، بووبە بنەمای قانونی فەرەنسا، ئێستا وابرۆوازی گەورەی فەرەنسا گەیشتە ئارەزووەکانی خۆی، شۆرشی برۆوازی دوای مەرگیشی بەرو ئامانجی خۆی مایەوەو ئیتر ئەوە ڕوونبۆوە قسەکردن لەسەر درێژەدان بەشۆرش دوای(18/ی برومر) شتێکی نابەجێیە، بەلام هیچ مێژوو نووسێك مافی ئەوەی نییە ئەوخالە فەرامۆشبکات کەئەم قانونە بووەهۆکارێکی گەورە بۆپێشکەوتنی ئەو ولاتە ئەوروپاییانەی ناپلیۆن داگیریکردن .

بەبەسەرچوونی ڕۆژگار هەندێ برگەیتر بۆئەو قانونە زیادکران وبەپشتبەستن بەمانە ناپلیۆن چینی کرێکاری زیاتر دەخستە ژێربار، نەك هەر تەنها قانونی شاپلیە کەمانگرتنی هەتا وازلەکارکردنی دەستەیەکی بەیەکەوەی بەسەرنجەوە سەیردەکردوو لێکۆلینەوەیان لەگەلدادەکردن وئەو کرێکارانە دەنێردرانە دادگا، تەنانەت لەمەش زیاتر، دەفتەرچەی کاریشیان دروستکرد، کەلەدەست خاوەن کارەکاندابوو، بەبێ ئەو دەفتەرچەیە کرێکار نەیدەتوانی لەهیچ شوێنێکدا کارێکیتری دەست بکەوێت، لەسەر ئەو دەفتەرچەیە خاوەن کارەکە هۆی وازهێنان ودەرکردنی ئەوکرێکارەی دەنووسی، دەتوانین ئەوە بهێنینەوە بەرچاوی خۆمان کەخاوەن کارەکان تاچ ئاستێك لەم ئازادییە بێ سنوورەی خۆیان بۆبێبەشکردنی کرێکاران لەکرێی ڕۆژانەیان بەپەیداکردنی پارەوەنانێکی مەمرەمەژی کردوویانە، قانونی بازرگانیش کەلەلایەن ناپلیۆنەوە نووسرابۆوە، هەموو قانونەکانی بانکداری وئالوگۆڕ وبۆرسەو ...هیتر، بەتەواوەتی بەهەمان شێوەی سەرێ دانرابوو، بەکورتی ناپلیۆن بەدانانی قانونی سزادانی کاری یاسایی بەیەکجاری تەواوکرد، لەسێدارەدانیشی هێشتەوەو سزای شەللاق لێدانیش کەلەسەردەمی شۆرشدا نەمابوو، هێنایەوە کایەو لەسەر کەتنکەرەکان جێبەجێدەکرا، قانونی داخکردن وئەوانەی زیادرەویشیان لەقانونەکانی مافی خاوەنداریەتی تایبەت دەکرد، سزای توندی بۆدیاری کرابوو، ئێستا ئەم کارە مەزنەی دانانی قانون تەواو نەببوو کەلەمانگی مارسی سالی (1803)دا شەرکردنەوە لەگەل بریتانیادا سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە، ناپلیۆن دووبارە شمشێری لەکالان دەرکێشایەوەو ئیتر تاکۆتایی دوورو درێژی قارەمانیەتییە خوێناویەکەی خۆی نەیخستەوە ناو کیفەکەی.



# هەڵایسانەوەی شەڕی تازە لەدژی بریتانیاو تاج لەسەردانانی ناپلیۆن (1803-1804)

## (1)

دوای وەستانێکی کورت، دووبارە شەڕی گەورە دەستپێکردەوەو دوژمنەکانی ناپلیۆن بەئاشکرا مەترسی ئەوەیان دەردەبڕی وحسابی جددیان بۆدەکرد، لەفەرنساو هەموو ئەوخاکەی کەوتبوونە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی ناپلیۆن، سوپای بەتوانا دروستکرابوون وئامادەی جەنگبوون، ناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی خۆی لەوەهەراسانبوو ئاشتی لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانە بکات کەدەوڵەتەکانیان حکومەتی سەرکوتکەرو دواکەوتوو وفیودالی بوون، لەسەرووی هەموشیانەوە بریتانیا کەلەو ڕۆژگارەدا بەهێزترین دەوڵەتی دنیابوو، بەتایبەت لەڕووی ئابوورییەوە، شەڕەکانی ناپلیۆن تەنها بۆ هێنانەدی نیازی بۆرژوازییەکانی فەرەنسابوو بۆ لەناوبردنی دەولەتە کۆنەپەرستەکانی ئەوروپاو ڕاکێشکردنیان بۆناو هاوکێشەکانی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شەڕەی فەرەنسا، کەتازە کەوتبۆسەر پێو بریتانیاش زۆر لەم لەپێشتر کەوتبۆ قۆناغی پیشەسازییەوە، واتە: لەم ڕووەوە بریتانیا زۆر پێشکەوتووتر بوو کەبەهیچ کلۆجێك لەگەڵ فەرەنسادا بەراورد نەدەکرا، جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوشەڕانەی ناپلیۆن بکەین کەتەواو لەشەڕەکانی سەردەمی شۆڕش جیابوون، لینین: لەم بارەوە ئاوا دەڵێت (یەك جەنگی میللی ئەگەری ئەوەی هەیە ببێتەشەڕێکی ئیمپریالیستی کەئەمە پێچەوانەکەشی ڕاستە، بۆ نموونە: شەڕەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا سەرەتا وەك شەڕی میللی سەری هەڵدا، لەڕاستیشدا هەر میللی بوو، ئەم شەڕانە شۆڕشگێڕانەبوون چونکە بەرگریان لەشۆڕشی مەزن دەکرد، لەبەرامبەر هاوپەیمانی حکومەتە کۆنەپەرست وسەرکوتکەرەکانی ئەوروپادا، بەڵام کاتێ ناپلیۆن زۆر لەو دەوڵەتانەی ئەوروپای خستەژێر ڕکێفی خۆیەوە، شەڕی میللی فەرەنسا گۆڕابۆ جەنگەکانی ئیمپریالیستی وئەویش بەنۆبەی خۆی شەڕی میللی تری بەمەبەستی ئازادی میللەتەکان لەچنگ ئیمپریالیستی ناپلیۆن سەری هەڵدا) (لێرەدا مەبەستی لینین ئەوەیە لەبەکاربردنی ئیمپریالیستی بەتێڕوانینی گشتی بەتاڵانبردنی سامانی وڵاتانی ترەو واتای چنگی ئیمپریالیستیش لەمەی دواییاندا ئەوەیە کەبۆ بەتاڵانبردنی وڵاتانیترە) ئێمە لێرەو دوایش لەشوێنێنیتردا ئاماژەبەمە دەکەینەوە.

سەرمایەداری بریتانیاش بەڕۆڵی خۆی لەشەڕکردن لەگەڵ ڕکەبەرێ سەرسەختەکەی خۆیدا، واتە سەرمایەداری فەرەنسادا کەوتە پێکدادانێکی خوێناوی، لەو شەڕەدا بریتانیا بەژیرانە کەڵکی لەوشوێنانە وەردەگرت کەداگیری کردبوون وسوپای ئەوانەشی بەخەرجی خۆیی وچەك وتفاق پەرداخ دەکردن، هەروەها ویلیام پیت، بەملیۆنەها لیرەی وەك هاوکاری دەدایە ڕوسیاو نەمسا – یان دەیدایە پروس هەتا ئەوانە دژبە فەرەنسا شەڕبکەن، هەمان ئەوکارەی دەکرد کەباوکی (40) ساڵ پێشتر یارمەتی تیرەی ئایرۆکی وهەموو تیرەکانی تری سورپێستی دەدا هەتا ئەوانە دژی فەرەنسییەکان لەکەنەدادا هانبدات، بەڵگەنەویستە جیاوازی نێوان ئەم دووشتە تەنها ئەوەبوو لەمەی دواییاندا پارەی زیاتر دەدرا.



بۆ چ بریتانیا لەساڵی (1802)دا ئاشتی ئامینی لەگەڵ فەرەنسادادکرد؟ تەنها ڕاگرتنی شەڕبوو بەشێوەیەکی تاکتیکی بۆ ماوەی ساڵێك، چونکە ئەو کەف وکوڵ وشادمانیەی لەکۆتایهاتنی شەڕ ڕوویدا پاش ماوەیەك زۆر لەبرژوازییەکان و کۆلآنەکانی بریتانی بەئاشکرا پەیان بەوەبرد ناپلیۆن سەرکەوتووەو بریتانیا شەڕی دۆڕاند، ناپلیۆن تەنها ئەوەی قەدەغەنەکرد کاڵاکانی بریتانیا لەبازاڕەکانی فەرەنسادا ساغ بکرێنەوە، بەڵکو لەوشوێنانەی کەکەوتبونە ژێر دەسەڵاتی خۆشی ، چونکە هۆڵەنداو بەلجیکاشی لەژێر دەستدابوو هەموو کاتێ دەیتوانی هەڕەشە لەدەریاوانی بریتانیا بکات، بەتایبەت لەساڵی (1802) بەدواوە تەواو زاڵبوو بەسەر ئەوەدا کەزۆر لەو وڵاتانەی بەناو سەربەخۆ هەژماردەکران ئەو بڕیارەی سەرەوەیان بەسەردا بسەپێنێت وهاوپەیمانی ئەورووپاش هیچی لەدەست نەدەهات، ناپلیۆن دوای پەیمانی ئاشتی ئامین زۆرلە لویسی چواردەهەم مەترسیدارتربوو کەلەوپەڕی بەهێزی دابوو وبەشی چەپی ڕووباری رنی هێنایەوەسەر خاکی فەرەنسا، ئەگەر ئەوە بەراورد بکەین تەنها لەگەڵ ئەوخاکەی ناپلیۆن هێنایە ژێر دەسەڵاتی وڵاتی فەرەنسا، تەنانەت لەگەڵ خۆرئاوای خاکی ئەڵمانیش کەخستییە سەرخاکی فەرەنساش بەراورد ناکرێت، حوکمی دەسەڵاتدارییەتی دیکتاتۆری سەربازی ناپلیۆن بەئاشکرا هەژموونی بەسەر ئەورووپادا کێشابوو وهەستی پێدەکراو ئەو دیارکەوتنەشی لەشەڕکردنی لەگەڵ بریتانیا دەستی پێکرد، سەبارەت بەو شوێنانەی فەرەنساش داگیری کردبوون هەمان پەیڕەوی وڵاتانی ئەورووپی دوژمنی لەگەڵدا دەکردن، هیچ بەهایەکی بۆئەو بڕیارەی کەلەسەردەمی دیرکتوارەکاندا دەرکرابوو، بەوەی دەبێ کۆیلەکان ئازادبن، دانەدەنا. بەپێی ڕێککەوتننامەکەی ئامین لەگەڵ بریتانیادا ناپلیۆن هەموو ئەو شوێنانەی بریتانیا داگیری کردبوون ولەژێر چنگی فەرەنسای دەرهێنابوون، خستییەوە ژێر ڕکێفی خۆی، واتە: سن دومنگ و دورگەکانی ئانتیلی بچوك ودورگەکانی ماسکارێنی وگۆیان) لەوشوێنانەدا خۆی لەبریاری ئازادبوونی کۆیلەکان کەمێ بوارد، بەڵام ئەو شوێنانەی کەلەبریتانیای ساندبوونەوە پەیڕەوی ئەوەی نەدەکرد، ناپلیۆن بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی توسن لوفرتور لەساڵی (1802)دا لەشکرێکی (10) هەزار سەربازی ناردو توسن لوفرتور کەبە بەهانەی خیانەتکردن هێندرا بۆ هۆردووی سەربازی فەرەنسا لە( 7/یۆنیۆی ساڵی 1802)دا بەدەستبەسەرکراوی نێردرا بۆ فەرەنساو دەستبەجێ ناپلیۆن فەرمانیدا قارەمان وسەرکردەی ئازادی خوازی ڕەش پێستەکان بەنهێنی ببەن لەیەکێك لەزیندانە ژێر زەمینەکانی قەلآتی ژودا بەندبکەن، ناسازگاری ئاو وهەوای ئەو شوێنە شێداُرو کێوستانیەو هەڵسوکەوتی خراپی لێپرسراوانی ئەو زیندانە لەبەرامبەر توسن لوفرتۆر، تەنانەت مۆڵەتی ئەوەشیان نەدەدا کەس سەردانی بکات ونەیاندەهێشت دەرەوەش ببینێ ولەماوەی دوومانگدا لەژێر ئەوفشارە بێبەزەییانەی لەبەرامبەریاندا کرد ناوبراو مرد، ناپلیۆن پلانی سەبارەت بەوشوێنانەش گەڵالەکردبوون کەلەژێر دەسەڵاتی فەرنسادابوون، بەڵام دووبارە شەڕکردنەوەی لەگەڵ بریتانیادا ئەم نەخشەیەی ئەوی دواخست، هەتا بەهۆی دوورەدەستی و وەخۆڕانەگەیشتنی ناپلیۆن لەبەر شەڕو پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ ناوچەی میسی سپیی کەکەوتبۆ ئەمریکای سەروو هەموو هەرێمی لویزیانی لە(30/ی ئیبریلی ساڵی 1802)دا بەئەمریکا فرۆشت، ئەو دەستە برژوازیە بریتانیەی لەبەهاری ساڵی (1803)دا بەئاشکرا هاواری دەکردو دەیگوت: لەڕێککەووتننامەی ئاشتی ئامیندا فەرەنسا سەرکەوت، دووبارە بانگەشەی ئەوەیکرد پێویستە نەهێڵدرێت ناپلیۆن دەستی بەوشوێنانە ڕابگات کەداگیری کردوون وڕێگای پێنەدرێت شوێنیتر داگیربکات، ناپلیۆن، پێی وابوو دوای



ڕێککەوتننامەی ئاشتی ئامین ئیتر بریتانیا دوورەپەرێزو دەستەوەستان ڕادەوەستێ وسەیری ئەو پێشهات وکارانە دەکات کەدەیەوێت بیانکات.

گفتوگۆی دیپلۆماسی ئاڵۆز دەستی پێکرد، هەردوولا نەیاندەوێراو ونەشیان دەویست ئیمتیاز بەیەکتری بدەن وهەردوو فەرنساو بریتانیاش باش ئەمەیان دەزانی ودرکیان پێکردبوو.

لەمانگی ئیبریلی ساڵی (1803) بەدواوە ئەم دانوستانە بەردەوام بوو ودواچاوەڕواندەکرا زوو کۆتایی بێت، لەپاریس و لەندەندا هەردوولا گومانیان هەبوو، وەزیرەکانی بریتانیا هیچ یەکێکیان ڕاکانیان یەك نەدەکەوت لەسەر ئەوشەڕەی کەسەرەتا بێ هاوپەیمان دەمانەوە، لەکاتێکا فەرەنسا لەوکاتەدا لەگەڵ هەموو دەوڵەتە بەهێزەکانی ئەوروپادا ئاشتی کردبوو، هەروەها لەفەرەنساشدا برژوازیەت دژی شەڕ بوو، چونکە هەڕەشەی لەبەرژەوەندییەکانی دەکرد، لێرەدا جێگای خۆیەتی ئاماژە بەو ڕەفتارەی ناپلیۆن بکەین کەببووە جێگای سەرنجی چاودێرانی سیاسی، گومانی تێدانییە ئەو کەسایەتییە خۆبەزلزان ومۆن وتوڕەو تۆسنە، ڕقی لەهەموو کەس دەبۆوەو ورێقی توڕەیی بەسەر هەمووآندا دەڕشت، بەڵام پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت، ئەو لەڕاستیدا تەواو بەسەرخۆیدا زاڵبوو ولەبنەڕەتدا کەسێکی هێدی و هێمن بوو، ناپلیۆن بەئەکتەری تراژیدی تالما[132] سەرسامبوو زۆر گوتەی شانۆکانی ئەوی لەبەرکردبوون ولەکاتی نمایشکردنی شانۆکانیدا گرنگی پێدەداو پەیامە بەرزەکانی مرۆیی دەبوونەوە جێای سەرنجی، بەمە ئیمپراتۆر[133] ئەوەی بەبیردەهاتەوەکە زۆرجار ئەوانەی دێن بۆ کۆشکەکەی، شازادە خانمن کەعەشیقەکەی خۆیان لەدەستداوە، فەرمانڕەوایان دەبینێت کەوڵاتەکانیان لەدەستچووە، پاشایان دەبینێت لەئەنجامی شەڕەوە تەختی پاشایەتیان سەرو ژێربووە، ئەو سەردارانە دەبینێت کەئومێدی گەیشتنیان بەتەختی پاشایەتی تێدا بەدی دەکرێت وبۆ پارانەوەو کلکە سوتە هاتوون، ناپلیۆن هەمیشە ئەوەی بەنموونە دەهێنایەوەو دەیگوت: تۆ دەتوانیت لەنمایشەکانی تالمادا هەست بەدەوروبەری خۆت بکەیت کەچۆن کەسایەتییەکان لەژێر پێکاندا پلیقاونەوەو ڕکەبەرێ وململانێی دیژوارو غەمگین لەقوڵایی دڵەکاندا حەشاردراوە ئەمە بەڕوونی هەست پێدەکەیت ودەبینی، ئینجا درێژەی بەگوتەکەی دەداو دەیگوت: ئەو نمایشانەی تالما بەلای منەوە تراژیدین، تەنانەت منیش گەورەترین قارەمانی تراژیدی ڕۆژگاری خۆمم، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئایا هیچ کاتێ بووە من وهەموو ئەو ئەکتەرانە دەست بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان لابەین؟

یان لەجوڵەو سرەوتەکانی خۆماندا وردەکارو ڕێك بین؟ ئایا قەت بووە ڕەفتاری سەیرو نامۆ بکەین ورێگا لەخۆبەزلزانی و ڕێشمەی ڕق هەڵسانەکانمان بگرین؟ هاوارنەکەین ؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر، ئێمە هەموومان کەسانی ئاسایین و وەك کەسێك هەڵسوکەوت دەکەین کەزەوق – یان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەدوێت، هەموو ئەوانەش لەسەر ئەم شانۆیەی ژیاندا هەن شتێکیان خستۆتەسەر دەسەڵاتدارییەتی تراژیدیای دنیاو ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە، جگەوەی ئاوایان نەکردووە ئینجا کەڕۆڵیان لاچەپەك بووە کەوتوونەتە ڕێنمایی وئامۆژگاری تراژیدیانە کەپەندوباو لەم سەرمەشقییەیان وەربگیردرێت. بەردەوام

---

[132] - تالما ( فرانسوا جوزێف تالما: ئەکتەرێکی بەناوبانگی تراژیدیەو بۆتە جێگای سەرنجی ناپلیۆن، ئەو ئەکتەرە بەجوڵەکانی سەرشانۆی و نمایشەکانی باوەڕی بەڕاستیە مێژووییەکان هەبوو، شانۆکارەکانیی لەسەر جوڵەی سروشتی ڕامکردبوو(1763-1826) (و- فارسی)

[133] - ئیمپراتۆر: مەبەست لە ناپلیۆنە (و- فارسی)



ناپلیۆن بەسەر نەخشەو پلانەکانی خۆیدازاڵبوو، ئەو تەنها کەموکورییەکی هەبوو ئەویش زوو هەڵچوونی بوو، کەنەیدەتوانی دانبەخۆید [١٣٤] بگرێت، کارگەری تورەبییەکانی ناپلیۆن زۆر توندو تیژبوو وهەژمونی دەخستەسەر دەورو بەرەکەشی ودەی ترساندن، بەو تورەبوونە هونەرمەندانەیەی رای هەموو ئەوانەی دەگۆری بەوەی ئەم لەسەر حەقەو بەرامبەرەکەی ناحەقە، تەنها ئەو کەسانەی ناخی ئەویان دەناسی دەیانزانی وپەیان بەو رۆڵە رپاییە ساختەیەی دەبرد، تەنانەت ئەو کەسانەش هەندێك جار پەیان بەو راستییە نەدەبردو بەهەڵەدا دەچوون، ویزورس، بالوێزی بریتانیا لەفەرەنسا لەویروایەدابوو هیچ کاتێ ناتوانرێت وڵاتەکەی ئاشتی راستەقینە لەگەڵ ناپلیۆندا بکات ودرێژە بکێشێت، ئەمەش لەبەر ئەوەنا کەفەرەنسا لەئاشتی کردنەکەی ئامیندا زۆر ئیمتیازی دەستکەوتبوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی ناپلیۆن لەو وڵاتانەی هاوسنووری فەرەنسابوون وامەڵسوکەوتی دەکرد وەك بڵێی ژێر دەستەنی، بۆنموونە: لەپایزی ساڵی (1802)دا ناپلیۆن ئاگاداری سویسرای کردەوە بەوەی حەزدەکات لەو وڵاتەدا دەستورێکی تازە بنووسرێتەوەو حکومەتێك بێتەسەرکار دۆستی فەرەنسا بێت، ئەو وای بەسویسراییەکان نیشاندەدا وڵاتەکەیان کەوتۆتە نێوان سنووری ئیتالیاو فەرەنسا ودەست نیشانی فەرەنسایەو بەگرتنەبەرچاوی ئەم تێبینیە جوگرافیاییانە سوپایەکی (30) هەزار سەربازی لەژێر فەرماندەیی ژنرال (نی) ناردەسەر مەرزی سویسرا، سویسراش ملکەچی ئەو فەرمانانەبوو، دواتربوو بەگوێرایەڵی تەواو، هەر لەو رۆژگارەدابوو ناپلیۆن بەشێکی زۆری لەوڵاتی پەیمونی خستەسەر خاکی فەرەنسا، وڵاتە بچوك ومیرنشینە ئەڵمانی، دوای رێککەوتننامەی ئاشتی لونەویلی ساڵی (1801) ئیتر نەیاندەتوانی ئومێدیان بەیارمەتییەکانی نەمسا هەبێت وتەواو لێبرابوون ولەبەرامبەر ناپلیۆندا هەڵدەلەرزین ورەفتاری ژێر دەستەیی وئۆکەرانەیان دەکرد، سەرئەنجام هۆڵەنداش سەخت گرفتاری چنگی فەرەنسا ببۆوەو دیاربوو ئیتر نەیدەتوانی خۆی رزگاربکات، بریتانیا ئەم بارودۆخەی لاگرانبوو ونەشیدەتوانی خۆی لێدەربازبکات، ناپلیۆن لەیەکەم دانیشتنی لەگەڵ بالوێزی بریتانیا لە(8/ی فبرایەری ساڵی_ 1803)دا کردی بەقاوقیلەو شیرەشیرو خۆی بەتورەیی نیشاندلو بەئاشکرا هەرەشەی دەکردن وگوتی: ئەگەر بریتانیا دەست بۆ شەرکردن ببات ئەوا کارێکی خۆکوژییە، هەروەها گوتی: هەمیشە بریتانیا خەریکی دروستکردنەوەی هاوپەیمانیەتییەو ئەمەش بێهودەییە چونکە نەمسا ئەو دەوڵەتە بەهێزەنەماوە.

دواتر ویزورس، لەو نامانەی کەوەك بالوێزی بریتانیا لەفەرەنسا بۆهالسبری وەزیری دەرەوەی وڵاتەکەی ناردن، بەم جۆرە نووسیبووی (پێمانوابوو نەعرەتەی یەك ئەفسەری سوپای دیراگونمان گوێ لێدەبێت، نەك قسەکردنی سەرۆکی بەهێزترین وڵاتی ئەورووپا).

ناپلیۆن بەم خۆ تورەکردنەی وایدەزانی دەتوانێت لەلایەك ئاشتی لەگەڵ بریتانیادا بکات ولەلایەکی تریش ئاغایەتی خۆی بەسەر ئەورووپادا بهێڵێتەوە، بەڵام ئەو لەگەڵ دوژمنێکی سەرسەختدا رووبەروو ببۆوە، هەرچەندە لەو رۆژگارەدا لەهەموو بریتانیادا ناکۆکی توند لەنێوان بۆرژوازیەت وتوێژی ئەشرافدا هەبوو، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوخاڵە کۆکبوون نابێ ئەورووپا ببێتە کۆیلەی دەستی ناپلیۆنی دیکتاتۆر.

---

134 - لێرەدا مەبەست لەوەیە بەروکەش تورەییەکەی بۆ جێبەجێکردنی پلان ومەبەستەکانی بووە، (و-کوردی)



دوای ئەو هەڕەشەیەی ناپلیۆن، بریتانیا سوپایەکی سەت هەزار کەسی خستە ئامادەباشی وتەواو پەرداخی کرد، لە(13/ی مارس)دا، ناپلیۆن دواین نواندنی خۆی نیشانداو دواتر ڕایگەیاندو گوتی (ئێوە[135] بڕیاری شەرتانداوە).
دووبارە دەتانەوێت (15) ساڵ شەڕبکەنەوەو منیش بۆئەوە ناچاربکەن؟).

ناپلیۆن ئەوەی لەبریتانیا دەخواست دورگەی ماڵتە(کەپێش ڕێکەوتننامەی ئامین داگیری کردبوو وبڕیاری دابوو ئەوخاکە بداتەوە شوالیەکان ودواتر دەستی بەسەردا بگرێتەوە، بەڵام بریتانیا بەبەهانەی ئەوەی ناپلیۆن بڕیارەکانی ڕێککەوتننامەی ئامینی پێشێلکردوون، بەپەلەو گەرموگور دەستی لەکشانەوەی لەماڵتا نیشان نەدەدا، ناپلیۆن بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو گوتی (بریتانیا شەڕی دەوێت، بەڵام ئەگەر ئەوان لەڕاکێشانی شمشێر لەکالان دەستپێشخەری بکەن، من دواین کەس دەبم شمشێرەکەم بخەمەوە کالان ... ، لەوانەیە ئێوە بتوانن فەرەنسا لەناوبەرن، بەڵام قەت ناتوانن بیترسێن، سڵا لەوانەی پەیمان شکێنی دەکەن، ئەگەر ئەوانە پێیانوایە ماڵتە لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا دەمێڵنەوە، ئەوا شەڕێکی بێ ئاشتیکردن ڕوودەدات).

ئینجا ناپلیۆن ئەوهۆڵەی جێهێشت کەبالوێزی وڵاتانی ئەوروپایی ولێپرسراوە خاوەن پلەوپایە بەرزەکانی تێدا میوانبوون، لەسەرەتای مانگی ئیبریلی ساڵی (1803)دا ویزورسی بالوێزی بریتانیا، فەرنسای جێهێشت وبەم جۆرە شەڕی نێوان بریتانیاو ناپلیۆن کەتاکۆتایی دەسەڵاتداریەتی درێژەی کێشا، هەڵایسا.

(2)

لەبریتانیادا دەیانزانی ئەم شەڕە مەترسیدارو دیژواردەبێت، لەهەمان سەرەتای شەڕ دەستپێکردندا( ویلیام پیت) کەلە ساڵی (1801) دا دەستی لەکار کێشابۆوە، دووبارە دەستبەکاربۆوەو هۆی دەست لەکارکشانەوەی (پیت)ی سەرۆك وەزیرانیش ئەوەبوو هەموو بۆرژوازیەت وئەشرافەکانی بریتانیا پێیانوابوو ئاشتیکردن لەگەڵ ناپلیۆندا دەشێ وشتێکی مومکینە، ناوبراویش دژی ئەوڕایە بوو، ئێستا دووبارە ڕۆڵی ویلیان پیت دەستی پێکردەوەو ئەوپیاوە نۆساڵی تەواو لەگەڵ شۆڕشی فەرنسادا شەڕی کردبوو ودەبوا لێرەودواش لێپرسراویەتی شەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا بگرێتە ئەستۆی خۆیی کەزۆر لەشەڕەکانی پێشوو مەترسیدارتربوو، هەرچەندە ویلیام پیت لەوبڕوایەدابوو شەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا زۆر لەسەردەمی شەڕکردنی شۆڕش دیژوارتردەبێت، بەڵام ئەوەشی لەبەر چاوگرتبوو ئەم شەڕە نابێتەجێگای دڵنیگەرانی سیاسی ناوخۆی بریتانیا، بەدڵنیاییەوە فەرەنساش لەساڵی(1803)دا زیاتر زاڵبوو بەسەرئەو خاکانەی کەداگیری کردبوون و باری ئابووری زۆر لەپێشوو باشتربوو وسوپایەکی بەهێزو تەیارتری هەبوو ولەسەرتۆپیی ئەو دەوڵەتەش سەرکردەیەکی بەتواناو ڕەوانبێژێکی ژیری هەبوو، بەڵام لەلایەکی ترەوە کارخانە پیشەسازییەکان [136] و دروستکردنی کەلوپەلی زیاتر کاریگەری خراپی بۆسەر بریتانیا هەبوو، بەتایبەت لەڕووی دروستکردنی چەك وتەقەمەنی. ویلیام پیت شۆڕشی ملوانەکانی ساڵی (1797)ی باش بەبیرمابوو وئێستا

---

[135] - ئێوە: بریتانیا.
[136] - مەبەست لەبەرەو پێشوونی پیشەسازی فەرەنسایە: بەتایبەت چەك وتفاقی جەنگی، (و-کوردی)



لەفەرنسادا فەرمانڕەوایەکی سەرکوتکەر لەسەر کارەو حکومەت دەکات، کەژاکوبنەکانی زۆر بەدڕندەیی کوشت وبڕکردو شوێنەواری هەموو جۆرە ئازادییەکی لەناوبردبووە، ئەم ڕاستیانە هەموویان لەئارادابوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەژدە مانگی سەرەتای ئەو شەڕە زۆر ڕووداوی سەخت و دیژواری تێدابوون. دوای ئەوەی چینی بۆرژوازی بریتانیا بەخۆشییەوە پێشوازی لەڕێککەوتننامەی ئاشتی ئامین کرد، بەڵام دوای ئەوەی بۆیاندەرکەوت ناپلیۆن ڕێگانادات بەهیچ جۆرێك کاڵای بازرگانی بریتانیا بۆفەرەنساو ئەو شوێنانەی داگیریشی کردوون بچێت [٥٣٧]. بەڵام توێژی ئەشرافی بریتانیا تەواو داوای شەڕی دەکردوو لاری لێی نەبوو، چونکە دەیزانی ئەگەر شەڕنەبێت ئەوادەبێ حکومەتی بریتانی چاکسازی بکات بەبەرژەوەندی بۆرژوا لەڕێگای هەڵبژاردنەکانەوە، بەمەش دەبوا خۆیۆ شەڕێکی مەترسیداری ناوخۆ سازبکەن، ئەمە ئەو هەلومەرجە بوو کەبریتانیای تێکەوتبوو، جگەلەمانەش ترسی یەك ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکاریش هەبوو، بۆیە هەردوو توێژی ئەشراف وچینی بۆرژوا ئامادەی شەڕکردنبوون، لەگەڵ فەرەنسادا.

ویلیام پیت، بۆ ڕێگاگرتن لەدابەزاندنی سوپای ناپلیۆن لەسەر لێوارەکانی خاکی بریتانیا، خەریکی نەخشەو پلان دانان بوو.

ناپلیۆن سەرەتا سەرتاسەری خاکی هانور[٥٣٨]، کەیەکێکبوو لەولایەتە گەورەکانی ئەڵمانیاو لەژێر دەسەڵاتی بریتانیادابوو داگیری کرد، ئەوناوچەیەش لەژێر فەرمانڕەوایی میرنشینی ئالکتور دابوو[٥٣٩]، ئینجا ناپلیۆن فەرمانیدا جارێکیتر بەتەواوەتی خاکی ئیتالیا داگیربکاتەوە، کەتا ئەوکاتەش هەندێك لەهێزی سەربازی فەرەنسایی تێدامابوو، ئینجا فەرمانی بەهۆڵەنداو بەلجیکا کرد سوپاکەی خۆیان بخەنەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فەرەنسی، پاش ماوەیەکیتر فەرمانیدا هەموو کاڵاکانی بریتانیا لەناو فەرەنساو ئەو وڵاتانەی لەژێر دەستی خۆیدابوون، دەستیان بەسەردا بگیردرێت وهەموو ئەوانەی سەربە بریتانیاش بوون، زیندانی بکرێن هەتا ئەوکاتەی ئاشتی لەگەڵ بریتانیادا دەکرێت، دواتر سوپایەکی مەزنی لەسەر بەندەری [٥٤٠] بولونی، کەدەکەوێتە سەردەریای شمال کۆکردەوە بۆ ئامادەباشی پەڕینەوەیان وچوونەسەر خاکی بریتانیا، ناپلیۆن لەیۆنیۆی ساڵی (1803) دا، مانگێك دوای هەڵایسانی شەڕ، گوتی: ئەگەر هەوای تەم ومژاوی بریتانیا سێ ڕۆژ بواریدات وهەوربێت، ئەوا لەندەن وپەرلەمانی بریتانیا داگیردەکات، لەکاروبارەکانی خۆسازکردنی هۆردووی سەربازی بەندەری بولونی، لەکۆتایی ساڵی (1803)و سەرەتای ساڵی(1804)دا بەچالاکانە کەوتە جموجۆڵی تەواو ولەهەموو بەندەرەکاندا بەردەوام بوو، بەبوونی سێ ڕۆژ هەوای تەمومژاوی بواری بۆ سوپای فەرەنسا خۆشدەکرد خۆیان لەدیدی سوپای دەریایی بریتانیا بەدووربگرن وبتوانن پێ بنێنەسەر خاکی بریتانیا، ئیتر ناپلیۆن هەموو لەمپەرەکانی تێکدەشکاندن وخۆی دەگەیاندە پەرلەمانی بریتانیا، زۆرجار ناپلیۆن و زۆر لەهاوڵاتیانی بریتانیاش وایان بیردەکردەوە.

( زۆر لەبریتانییەکان کەلەو ڕۆژگارەدا ژیاون دواتر دەیانگوت، لەمانگەکانی سەرەتایی شەڕدا، پلانی دابەزاندنی سوپای فەرەنسا لەسەرخاکی بریتانیایان بەگاڵتەجاڕی سەیردەکرد، بەڵام لەکۆتایی ساڵی (1803–1804)دا ئیتر هیچ بریتانیەك بەوپلانەی ناپلیۆن پێکەنینی نەدەهات وببوە شتێکی جددی، بریتانیا هەرلەڕۆژگاری ساڵانی (1588)دا کەلەچاوەڕوانی

137 - بچێت: کاڵای پیشەسازی بریتانیا بچێت بۆ بازاڕەکانی فەرەنساو شوێنەکانی ژێر دەستەی، بۆ ساغکردنەوەیان، (وکوردی

138 - هانور: وڵاتە دێرینەکەی ئەڵمانیایە کەلەساڵی (1866-1946) بەشێکبوو لەولایەتی پروس وئەمڕۆش بەشێکی ساکسۆنی خواروو پێك دەهێنێت. (و- فارسی)

139 - ئالکتور: لەئەڵمانیادا بەو شازادانەیان دەگوت کەمافی هەڵبژاردنی ئیمپراتۆری ئەڵمانیان هەبوو،

140 - مەبەست لەپۆلۆنیا نیە، ئەو بەندەرە دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای ئەوروپا، (و- فارسی)



کەشتی (ئارماد) کەشتی ئیسپانیا کەدەیویست بێتە لێوارەکانی خاکی بریتانیاو لەنگەربگرێت، هیچ کاتێکیتر توشی ئەم مەترسییەی ئێستای نەبێوە، ناپلیۆن بەسەرکێشی لەبەندەرو شارو شارۆچکەکانی سەرلێوار دەریای دەگوت ورایدەگەیاند پێویستە وابکەن ووانەکەن وسەرکەوتنمان مسۆگەرە بەسەر دوژمنی هەمیشەیی [541] فەرەنسادا.

سەبارەت بەسوپاو ئامادەکاری جەنگی فەرەنسا، هەواڵی ترسناك وزیاد پێوەنان وسەیر دەگەیشتنە بریتانیاو ئەم هەواڵانەش پێویستی بەوەدەکرد حکومەتی بریتانیا هەنگاوی جددی بنێت، ئەو پیاوەی توانیبووی لەساڵی (1798)دا خۆی لەچنگ هێزێکی دەریایی بەتواناو سوپایەکی بەهێزی وەك بریتانیا قوتاربکات وبچێت میسر داگیربکات ولەسەر ڕێگای خۆشیەوە ماڵتە بخاتەژێر ڕکێفی خۆی، ئەو پیاوە باش دەیتوانی کەڵك لەهەوای تەمومژاوی دەریای مانش وەربگرێت.

ئیتر کاتی دەستپێکردنی شەڕی ناپلیۆن لەمانگ وهەفتەدا نەمابوو، بەڵکو کەوتبۆ سەر ڕۆژو سەعات ودەبێ ئەوچیبکات؟ بریتانیا دووڕێگا چارەی لەبەردەمدابوو:

یەکەم: ئەوەبوو بەمشت زێر بڕژێن وبەپەلەپڕوزاوان هاوپەیمانییەتێکی ئەوروپایی ڕابگەیەنن وئەو هاوپەیمانیەتییەش لەخۆرهەڵاتی ئەورووپاوە هێرش بکەنەسەر ناپلیۆن، بەوجۆرە بریتانیا لەدەست داگیرکردنی ناپلیۆن ڕزگاربکەن، بەڵام نەمسا کەلەبەرامبەر ناپلیۆندا تێشکابوو لەڕێککەوتننامەی ئاشتی (لونەویل)دا ئەو هەموو باج وزیانەی دابوو ولێکەوتبوو، نەیدەتوانی بەوزووانە لەوتیشکانەی ڕاست بێتەوە، نەمسا حەزی لەشەڕبوو، بەڵام نەیدەویست خۆی تێوەبگلێنێت، پرووس دوودڵبوو وڕووسیاش مەسەلەکەی گابەسوك وگا بەقورس نیشاندەدا، گفتوگۆ لەئارادابوو، ویلیام پیت لەدروستکردنی ئەو هاوپەیمانیەتیە نائومێد نەبوو وباوەڕی بەسەرکەوتوویی خۆی هەبوو، لەدروستکردنی ئەو هاوپەیمانیەتییە، هەرچەندە کارەکە بەخاوخلیچکی بەرەوپێشدەچوو وئەگەری ئەوەی هەبوو بەلاکەلاك سەرنەگرێت.

ڕێگای دووەمیش وابەستە بەخودی ناپلیۆن بوو، ویلیام پیتی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا وهاکسبری، دەمێکبوو دەیانزانی جورج کادودال، ئەندامی دەستەی شوانیەکانەو لەلەندەندا دەژێت وپەیوەندی لەگەڵ کنت دارتوادا هەیە، بەتێڕوانینی گشتی دەیانزانی کۆچ کردووانی فەرەنسی خەریکی پلانی کوشتنی ناپلیۆنن، زۆری نەبرد حکومەتی بریتانیی لەوردەکارییەکانی ئەوەگەیشت کەپەناهەندەکانی فەرەنسی، لایەنگری گەڕانەوەی ڕژێمی شانشینی، خەریکی چ پلانێکن. لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی بەهۆی تێشکانیان لەشۆڕشی واندەدا، تەواو گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی لەناوبردنی ناپلیۆن بەڕێگای شۆڕشی چەکداری ئەستەمە، بۆیە بڕیاریاندابوو بەڕێگای تیرۆرکردنی خودی ناپلیۆن نەخشەو پلان داڕێژن و وەك ساڵی (1800) بۆمبی بۆ دابنێن، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ئومێد کەوتبۆ دڵی ویلیام پیتەوە، دەوڵەتی بریتانیا دەیویست بەشێوەیەکی وریاییانە دەست بخاتە ئەوکارەوە، باشتروابوو وەك پلانەکەی کوشتنی پلی یەکەم ئیمپراتۆری ڕوسی، کەخەریکی لەشکرکێشی بوو شانبەشان لەگەڵ ناپلیۆندا بۆسەر هندستان، کاربکات، واتە: لەپشت پەردەوە یارمەتی ئەو پلانانە بدات وبەڕووکەشیش تەشریفاتی دەوڵەتی پارێزگاری بکات وئەو هەلەلەدەست نەدات کەتەسەلکردنی دڵی خۆی بەباشترین شێوە دەربڕێت، چونکە کاتێ بالوئیزی ڕوسیا( ڤرونتسوف) حکومەتی بریتانیای لەمردنی ئیمپراتۆری ڕوسیا ئاگادارکردەوەو پێی

---



ڕاگەیاند گوایا بەخوێنڕێژی دەماغ مردووە، بەو جۆرە هەڵسوکەوتیش لەگەڵ کوژرانی ناپلیۆندا بکات و وایدەربخات ئاگای لەهیچ نەبووە.

بەڵام لەدەوروبەری ناپلیۆن پارێزگارو ئەئەفسەری سەربازی ناڕازی نەبوون ونە(کنت.پالن) و(بنیگن)[142] و(پلاتن زوبوف) هەبوون، کەئەمانە پلانی خوێنڕێژی ئیمپراتۆری ڕوسیایان ئەنجامدا، ئەم جارەیان مەسەلەکە ئەوەنەبوو کەبەهاوکاری یەك خاتوونی جوان ودڵگیرو ئەشراف زادەی وەك ئولگا ئەلیکساندرونا ژریتوو، کەخوشکی پلاتن زوبوف بوو وفیزورسی بالوئیزی بریتانیا لەپترسبورگ لەڕێگای ئەوکچەوە نارەزایەتی خۆی لەهەڵسوکەوتی ئیمپراتۆری ڕوسیە دەربڕیبوو ودەستی لەوپلانەدا هەببوو، بەڵکو ئەمجارەیان دەبوا لەڕێگای یەك لادێیی دڕندەی کەللەڕەق، کەئەلە نقورچی ئاگادارکردنەوەی کەلەکەو ئاماژە تێدەکات ونەلەتوانجەکانی کەسانی تریش سەردەردەکات، بەهیچ جۆرێك ئاگاداری ئەوەنەبوو کەمەسەلەکە تەنها بۆسەری کنسولی یەکەمە، بەواتایەکی سادەتر، کادودال باش درکی بەوەنەدەکرد چۆنچۆنی دەتوانرێت سەرۆکی دەوڵەتێك لەپایتەختەکەیدا لێبدرێت، ئەو نەیدەزانی ئاشنایی لەئابوئۆپنی دیپلۆماسی وگفتوگۆی پاراوی ناوکۆشك نەبوو وبەو پێی گەورانەی ناوچەکمەکانی ڕاوکردن، نەیدەتوانی لەسەر تەختایی هۆڵەکانی سیقلی وتەلارەکاندا بەباشی هەنگاوبنێت، ویلیام پیتی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا هەرچەندە ڕوسیشی نەدەزانی، بەڵام هەر ئەو پەندە ڕوسیەی دووپات دەکردەوە کەدەڵێت (دووسەت گوتە نیو کردار ناهێنێت).

پلانەکە لەلەندەندا نەخشەی بۆ کێشراو دەبوا جورج کادودال ناپلیۆن بکوژێت، واتە: لەوکاتەی ناپلیۆن لەمالمزوندا، وەك عادەتی خۆی ڕۆژانە بەتەنها لەدەوروبەری مەنزڵگاکەیدا سواری ئەسپ دەبێت وماوەیەك دەگەڕێت، لەوکاتەدا چەند کەسێکی چەکدار لەگەڵ کادودالدا بن وپرامالی بکەنێ وبیکوژن.

جورج کادودال، بەمانای وشە کەسێکی کۆنەپەرست بوو وزۆرجار لەواندەدا گیانی خۆی خستبۆ مەترسییەوە لەڕووداوی سەیرو سامناکدا بەساغی دەرچووبوو، ئێستاش بەوپەڕی بوێرییەوە ئامادەبوو ناپلیۆن بکوژێت، چونکە ئەوی بەپێشەنگی شۆڕش دەزانی و زۆریش داخ لەدڵبوو لەشۆڕشی کۆماری وبەداگیرکەری تەخت وتاراجی پاشای قانونی فەرەنسا(لویس دوبوربینی) دەزانی.

لەشەوێکی ئەنگوست لەچاوی مانگی ئۆگوستی ساڵی (1803)دا کادودال وهاوەڵەکانی بەکەشتییەکی بریتانی لەسەر ڕۆجی دەریای نرماندی دابەزین ولەوێوە یەکسەر بۆ پاریس چوون، ئەوانە هەم پارەی زۆرو زەوەندیان پێبوو هەم پەیوەندیان لەگەڵ هەندێك کەسایەتیدا هەبوو لەپایتەخت وهەم شوێنگەو جێای نهێنی وقایمیان هەبوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبوا پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسەشدابکەن کەدوای کوشتنی ناپلیۆن دەبێ دەست بەسەر کورسی دەسەڵاتدا بگرێت وبوربینەکان بگێڕێتەوەسەر تەخت وتاراجی باوك وباپیرانیان، لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی ژنرال موریان بەشایستەی ئەوکارە دانابوو وژنرال پیشگروشیان دیاریکرد، بکەوێتە نێوانیان بۆ پێکهێنانی هەردوو ژنرال مورۆ وکادودال، پیشگرو کەدوای ڕووداوەکەی (18/ فروکتیدور)[143] دوورخرابۆوە بۆگۆیان وتوانیبووی لەوێ هەڵبێت و بگەڕێتەوە پاریس وبەنهێنی لەوێدا

---

[142] - بنیگسن: ئەو سێ کەسانەی سەرەوە دەستیان لەکوشتنی پلی یەکەمی تزاری ڕوسیادا هەبووە.(و- کوردی)

[143] - (18/ی مروکتیدور) ئەو هەوڵەی بۆکوشتنی ناپلیۆن درا، لەمانگی سیتمبەری ساڵی(1800)دا (و- کوردی)



بمێنێتەوە، ئەوکەبە خۆفرۆش ناسرابوو وسزای دوورخراوەیی بەسەردا درابوو، هیچی لەدەست نەدەدا تاسڵ لەکردنی ئەم کارەبکاتەوە، بەڵام ژنرال مورو شتێکی تربوو وبەپێچەوانەی پیشگرو لەباروودۆخێکی باشدا دەژیا، ئەو یەکێکبوو لەسەردارە باڵاکانی فەرەنساو زۆر حەزی لەگرتنەدەستی دەسەڵات بوو، بەڵام کەسێکی ئیرادە سستبوو، دەمێکبوو نەفرەتی لەناپلیۆن بوو وکینەی لێهەڵگرتبوو، چونکە ناپلیۆن بەبوێرانە لە(18/ی برومر) [١٤٤] دا دەستی بۆ کارێکبرد کەئەو نەوێرابیکات، ئیتر لەوکاتەوە لەدڵی خۆیدا کینەی لەبەرامبەر ناپلیۆندا لەدڵ گرتبوو، هەندێك لەڕاکوبنەکان ئەویان بەیەك کۆماریخوازی دووڕەگ دەزانی ولایەنگرانی ڕژێمی پاشایەتیش بەوەی دەیانزانی ڕقی لەناپلیۆنە دڵنیابوون لەوەی هاوکاریان دەکات ودەستیان لەگەڵ تێکەڵاودەکات بۆ پلانی کوشتنی ناپلیۆن، لەڕاستیدا بوغز لەدڵی ئەو لەبەرامبەر ناپلیۆندا، هۆکاری سەرەکی بوو بۆبەشداریکردنی لەوپلانەدا، بەڵام ئەمە ئەوەی نەدەگەیاند وێنای ئەوەبکرێت ئامادەبێت بوربنەکان بهێنێتەوەسەر تەخت وتاراجی پاشایەتی، بۆیە کاتێ نەخشەی کوشتنی ناپلیۆنیان بەئەو گوت، ئاشکرای نەکردن، پیشگرو کەپەیوەندی بەحکومەتی بریتانیاوە هەبوو، هەواڵی ئەوەی بۆ بریتانیا نارد کە ژنرال مۆرو ئامادەیە بەشداری لەپلانی کوشتنی ناپلیۆندا بکات ئەو بەراشکاوی بەپیشگرووی گوت ئامادەنییە گفتوگۆ لەگەڵ کادودالدا بکات وبوربنەکان بێنەوەسەر تەختی پاشایەتیو خزمەتیان بکات، لەوکاتانەی ئەم گفتوگۆو ئاینوێژینە لەئارادابوو، جاسوسەکانی ناپلیۆن لەناو ئەوانەدابوون و هەر زانیاریەکی تازەیان چنگ دەکەوت ڕۆژ بەڕۆژ دەیانگەیاندە ناپلیۆن.

لەڕۆژی (15/ی فبرایری ساڵی 1804) ژنرال مورو لەماڵەکەی خۆیدا دەستگیرکرا، هەشت ڕۆژ دوای ئەمە شەو پیشگروشیان دەستگیرکردو باشترین دۆستی خۆی کەپەنای دابوو ئەوی لەبەرامبەر (300) هەزار فرانکدا بەپۆلیسی نهێنی فرۆشتبوو، لێکۆڵینەوە دەستی پێکرد، بەڵام پیشگرو ئامادەنەبوو دان بەهیچ دابنێت و چ ئاشکرا بکات، بەناوی ناپلیۆنەوە بەپیشگرویان گوت ئەگەر دان بەوەدابنێت لەگەڵ کادودالدا گفتوگۆی کردووە، ئەوا دەیبەخشن وئازادی دەکەن، ئەم جارەشیان مورو نوقەی نەکرد، پاش (40) ڕۆژ لەدەستگیرکردنی پیشگرو ناوبراویان لەژووری زیندانەکەیدا بەمردوویی دیتەوە کەبەبۆین باغەکەی خۆی خنکاندبوو، دواتر بووبە پروپاگەندەی ئەوەی گوایا پیشگرو خۆی خۆی نەکوشتووە، بەڵکو بەفەرمانی کاربەدەستانی باڵا خنکێندراوە، ناپلیۆن ئەم پروپاگەندانەی بەدرۆخستنەوەو گوتی (من هەم دادگام هەبوو بۆدادگایی کردنی ئەو وهەم سەربازیش بۆگوللە بارانکردنی وبەدرێژایی تەمەنی خۆشم کاری بێهودەییم نەکردووە)

بەڵام هەر چۆنێکبێت ئەم پروپاگەندەیە زەمینەی لەباری هەبوو بۆ باوەڕکردن پێی، چونکە چەند ڕۆژێك پێشئەوەی پیشگرو بمرێت، ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو هاتەپێش، ئەویش لەسێدارەدانی یەکێك لەئەندامانی خێزانی بوربنەکان [١٤٥] بەناوی دوك دانگین بوو.

لەوکاتەی مورو وپیشگرو دەستگیر کران، گرژی لەسەروچاوی ناپلیۆندا بەدی دەکرا،چونکە جگەلەوەی بەئاشکرا دەستی بریتانیای لەو پلانەدا دەدی، ڕۆڵی بوربنەکانیشی دەزانی لەمەودواو ئەو ڕاستیەشی لاڕوونبوو کەبریتانیا جورج کادودال

---

[144] - ( 18 بورمر) مەبەست لەکودەتاکەی ناپلیۆنە کەبەسەر دیرکتوارەکانیدا کردوو دەسەڵاتی فەرەنسای گرتەدەست،

[145] - بوربنەکان : واتە بنەماڵەی پاشای فەرەنسا، کەئەوکات لەفەرەنسا هەڵاتبوون، (و- کوردی)



لەکۆتایی هاوینی ساڵی (1803)دا بەپارەو کەشتی خۆی ناردۆتە فەرەنساو ناوبراویش هەرلە پاریسدایەو هەرئەو دەتوانێت بۆخۆی– یان بەتاقمێکەوە دەست بۆ کوشتنی ببەن.

نابلیۆن جارێکیان لەکاتی توڕەبووندا گوتی (ئەگەر بوربنەکان پێیان وابێ من ناتوانم تۆڵەی ئەو پلانانەی بۆ کوشتنی من دایدەڕێژن بکەمەوە، ئەوا تەواو بەهەڵەداچوون).

تالیرانیش کاتێ گوێی لەم قسەیەی نابلیۆن بوو بۆخۆدەرخستن وبۆ ئەوەی بەبێ هیچ دەستپاراستن وترسێك تۆڵەی خۆی لەلایەنگرانی ڕژێمی شانشینی بکاتەوە، کەزۆر ڕقیان لێیبوو گوتی (بەدڵنیاییەوە بوربنەکان وادەزانن خوێنی تۆ لەڕەنگی خوێنی ئەوان نییە) ئەم قسەیە نابلیۆنی دەهەریتر کردوو بۆیەکەمجار ناوی دوك دانگینی هێناو دەستبەجێ فەرمانی بەدروستکردنی یەك ئەنجومەنی تایبەتیداو، کەفوشەو تالیرانیش تێیدا بەشداربوون، ئەو ئەنجومەنە ڕای بەدەستگیرکردنی دوك دانگیندا، بەڵام دوو گرفت هەبوون: یەکەم دانگین لەفەرنسا نەدەژیا، بەڵکو لەوڵاتی ئەڵمانیادا بوو، ئەو کێشەیە بەلای نابلیۆنەوە هیچ بوو، چونکە ئەوکاتە ئەو وەك وڵاتەکەی خۆی هەڵسوکەوتی بەسەر خاکی ئەڵمانیای باشووردا دەکرد، دووەمیش: ئەوانەی بەشداری ئەو پلانەی کوشتنی نابلیۆنیان کردبوو، بەهیچ کلۆجێ دانگین لەگەڵیاندا بەشدارنەبوو وئەسڵەن هەر ئاگاشی لێنەبوو، ئەمەش بەلای نابلیۆنەوە زۆر گرنگنەبوو، چونکە پێشتر بڕیاریدابوو ناوبراو لەدادگایەکی سەربازی کەزۆر پابەندی بەڵگەو گەواهی نەبێت دادگایی بکات، بۆیە دەستبەجێ فەرمانی دەستگیرکردنی ناوبراو دەرکرا، دوك دانگین لەیەکێك لەشارە بچوکەکانی وڵاتی (باد)[146] دا دەژیا بەناوی ئتنهام وئاگای لەوهەڕەشە گەورەیە نەبوو کەلەسەر سەری دەخولایەوە، لەشەوی (14/ لەسەر 15/ی مایۆی ساڵی (1804 )دا تیپی سواری پاسەوانانی سنوور چونە ناوخاکی ئەڵمان ودانگنیان دەستگیرکردو هێنایانە فەرەنسا، وەزیرەکانی ئەڵمانیا دڵخۆشبوون بەوەی ئەوانیشیان لەگەڵ دوك دانگیندا دەستگیرنەکردوون، تەنانەت دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئەڵمانیاش هیچ ناڕەزاییەکیان دەرنەبڕی.

لە(20/ی مایۆدا دانگینیان گەیاندە پاریس ودەستبەجێ بۆ زیندانی (نسن )یان گواستەوە، لەئێوارەی(20/ی مانگی مایۆدا ئەنجومەنی دادگای سەربازی بۆ دادگایکردنی ناوبراو کەتاوانی دەستبوونی لەگەڵ بریتانیاو شۆڕشی چەکداری لەدژی فەرەنسای درابۆ پاڵ، بەستراو لەسەعات (2,45) دەقیقەی شەودا فەرمانی لەسێدارەدانی دەکرا، دوگ نامەیەکی بۆ نابلیۆن نووسی وتکای کرد ئەونامەیە بدەنەدەست ئەو، سەرۆکی دادگای سەربازی کەناوی (هولن)بوو ویەکێکبوو لەقارەمانەکانی داگیرکردنی (باستی) دەیویست بەناوی دادگاوە داوای کەمکردنەوەی سزای دوگ بکات ، بەڵام ژنرال ساواری، کەبەتایبەت لەکۆشکی تویلرەوە ناردرابوو، قەڵەمەکەی لەدەستی هولن ستاندو گوتی: ئیتر ئەم کارە وابەستە بەمنە)

لەکاتژمێر سێی شەودا، دوگ دانگنیان بردە چاڵێکی نزیك قەڵاکەو[147] گوللە بارانیان کرد.

کاتێ نابلیۆن ناوەڕۆکی نامەکەی دانگینی خوێندەوە وای نیشاندا ئەگەر زووتر ئەو نامەیەی بەدەست گەیشتبا ئەوا دەیبەخشی، ئەو بەدرێژایی ئەو ڕۆژە مۆن ومڵچ بوو وکەس نەدەوێرا قسەی لەگەڵدابکات، بەڵام دواتر گوتبووی لەلەسێدارەدارنی دوگدا تەواو لەسەر حەقبووە، چونکە پاراستنی بەرژەوەندی وڵات وای پێویستکردووە، سەرئەنجام چەند

---

[146] - باد: ناوە کۆنەکەی ئەڵمانیایە.

[147] - قەڵات: مەبەست لەقەڵاتی سەربازییە کەلە کوردستانیشدا هەیە: وەك قەڵاتی سەربازی پیرەمەگرون وچوارقورنەو زۆری تر.(و- کوردی)



ڕۆژ دوای لەسێدارەدانی دوگ دانگین، کادودالیشیان دەستگیرکرد، هەرچەندە کاتێ ویستبویان ئەو لەسەر شەقامەکەدا دەستگیربکەن دەستی کردبۆوەو چەند پاسەوانێکی کوشتبوون وبریندارکردبوون، دواتر ئەو وهاوەڵەکانیان ناردنە بەر گیوتین وملیان قرتاندن وژنرال مورویشیان لەفەرەنسا دوورخستەوەو ناردیان بۆ تاراوگە.

## ( 3 )

لەمانگی مارسدا پێش لەسێدارەدانی دوك دانگین ولەوکاتەی دادگایکردنی کادودال دەکرا، لەپاریس وشارەکانی تردا پروپاگەندەی ئەوەبڵاوبۆوە، گوایا دوك دانگین، ئەوکەسە دەستنیشانکراوەبووە کەکادودال وهاوەڵەکانی ویستویانە دوای لەناوبردنی ناپلیۆن ئەو بکەن بەپاشای فەرەنساو تەخت وتاراجی پاشایەتی پێبسپێرن.

ئەم پروپاگەندەیە درۆبوو وهیچ ڕاستییەکی تەنانەت کەمیشی تێدانەبوو، بەڵام خزمەتێکی زۆری بەناپلیۆن کرد، ئەنجومەنەکانی تریبیون وپەرلەمان وئەنجومەنی یاسادانان کەبەحساب نوێنەری میللەت بوون، لەڕاستیشدا تەنها کەرەستەیەکی دەستی ناپلیۆن بوون، کۆبوونەوەو بڕیاریاندا ئەوانەی هەوڵدەدەن ناپلیۆن بکوژن ئەوا بەدوژمنی گەلی فەرەنسا لەقەڵەم دەدرێن، کەلاڵەی پرۆسەی ئەوەشیانکرد، ناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی هەربەرابەرو سەرداری فەرەنسا بمێنێتەوەو دەسەلاتدارییە ڕەهاکەشی بگوڕدێت بۆ حوکمڕانی بۆماوەیی وکوڕو نەوەکانی دوای خۆی حوکمی فەرەنسا بکەن.

بەمجۆرە دوای بنەماڵەکانی مرو نژین، کەلەسەدەی پێنجەوە تاسەدەی هەشت حوکمی شانشینی فەرەنسایانکردو دواتر بنەماڵەی کارولنژینەکان کەلەسەدەی هەشتەوە تاسەدەی دەهەم حوکمی شانشینی فەرنسایانکردو دوای ئەوانیش هەردوو بنەماڵەی والودەکان وبوربنەکان کەلەکۆتاییەکانی سەدەی دەهەمەوە هەتا ساڵی (1792) حوکمی شانشینی فەرەنسایان کردو لەوساڵەدا لویسی چواردەهەم، کەلەسەردەمی شۆڕشدا پێیاندەگوت لویسی کاپە، لەسەر تەختی پاشایەتی لابراو دوای ئەو سێ شانشینەی حوکمی فەرەنسایان کردبوو دەبا شانشینییەکی تریش بەناوی بنەماڵەی بۆناپارت بێتەکۆڕێ، ئەو کۆمارییەی کەلە(10/ی ئۆکۆستی ساڵی 1792دا) دروستبوو، دەبوا دووبارە جێگاکەی خۆی بۆ سیستمی شانشینی ڕەهای بۆناپارتەکان چۆڵبکات، لەگەڵ ئەوەشدا زنجیرەی بۆناپارتەکان ناوی پاشانشینیان لەخۆیان نەنابوو، بۆیە پاشای تازە[٥٤٨] حەزیدەکرد پێی بگوترێت ئیمپراتۆر، چونکە ئەوناوە بۆیەکەم جار شارلمان لەساڵی (800) لەکاتی دانانی تاج لەسەری، ئەوناوەی لەخۆی نابوو، هەزار ساڵ دوای ئەو مێژووە، واتە: لەساڵی(1804)دا ناپلیۆن بەئاشکرا ڕایگەیاند کەلاسایی شارلمان ئیمپراتۆری خۆرئاوانشین دەکاتەوە، ئیتر ئەوخۆی بەجێنشینی پاشاکانی فەرەنسا نەدەزانی، بەڵکو خۆی بەجێنشینی ئیمپراتۆر شارلمان لەقڵەم دەدا.

جگەلەمەش ئیمپراتۆریەتی شارلمان بۆهەوڵوتەقەلای ئەوەبوو درێژە بەدروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەتر بدات، واتە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم ،ناپلیۆنیش خۆی بەجێگرەوەی ئەو ئیمپراتۆریەتیە دەزانی وخۆی بەرابەری ئەو وڵاتانە هەژماردەکرد کەشارستانیەتی خۆرئاوایان هەبوو، دواتر ناپلیۆن سەرکەوتوو بوو لەوەی دەسەلاتەکەی بەرفراوانتر بکات، بەجۆرێ شارلمان



هەرگیز حوکمی ئەوپانتاییەی زەوی نەکردبوو، کەبەشێوەی وڵاتی سەربەدەسەڵاتی خۆی- یان لەژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی خۆیدا حوکمی دەکردن، پێش شەڕەکەی ڕوسیای ساڵی (1812).

هێزو توانای ناوبراو لەڕووی بەراورد بەپانتایی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی کەلەسەروی ئەفریقاو هەندێ لەئاسیای میانەو ئەورووپای هەبوو، ناپلیۆن زیاتری لەدەستدابوو، بەشێوەی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ کەلەڕووی ئاوەدانی وبەپێتی ئەو خاکانە زۆرلە سەردەمانی ڕۆم باشتربوو.

کاتێ ئەورووپا هەواڵی ئەوەیان بیست ناپلیۆن دەیەوێت ئیمپراتۆریەتی شارلمان زیندوو بکاتەوە، زۆرلەوانە بەکەسێکی خۆبەزلزان وداگیرکەری بەرەڵابوو لەقەڵەمیانداو دژبە دنیای شارستانیان ناوبرد، کەشەڕخوازی دەوێت، هەموو بالوێزەکانی وڵاتە زلهێزەکانی ئەوکاتی ئەورووپا بەوردی چاودێری ڕووداو گۆڕانکارییەکانی سەبارەت بەمەیان دەکردو گوێهەڵخەری هەواڵەکان بوون ، لو(18/ی ئیبریلی ساڵی (1804)دا پەرلەمان بڕیارێکی دەرکردو بەپێی ئەوبڕیارە، ئیمپراتۆریەتی فەرەنسییەکان بەوابەستەیی بەجێنشینکردنی ناپلیۆن بۆناپارت دەسپێردرێت ومەسەلەی گەڕانەوەش بۆ ڕای گشتی هاوڵاتیان لەساڵی(1799)دا ئاسانتر بەڕێوەچوو، هەرچەندە هەرلەساڵی (1802)وەوە هاڵاوتیانی فەرەنسی چاوەڕوانی ئەمەیان دەکرد، بزژوازیەتی فەرەنسا بەتوندی پشتگیری سیاسەتەکانی ناپلیۆنی دەکردو گەڕانەوە بۆسیستمی شانشینی بورینەکانی بەشتێکی ئەستەم دەزانی، بەڵام کۆماریخوازەکان دژی ئەم هەلومەرجەبوون ویادی ئەو ڕۆژگارانەیان دەکردەوە کەشۆڕشی کۆماری چۆن بۆئازادی ویەکسانی تێدەکۆشاو کێردو خەنجەری وزەبری بەهێزی لەسەرکوتکەران دەسرەواند، هەندێك پێیانوابوو کەبەناپلیۆن بگوترێت فەرمانڕەوای باڵا، ئەم ناوە لەشانازیی و مەزنییەکانی کەم دەکاتەوە، پولویی کوریە [149] ، لەو ڕۆژگارەدا گوتبووی (ئەگەر ئەوکەسە ناپلیۆنبێت وبیەوێت ناوی خۆی بنێت فەرمانڕەوای باڵا، ئەوا لەپلەوپایەی خۆی کەمدەکاتەوە)

بتهۆفن، کەلەبەر سەرسامی بەناپلیۆن سەمفۆنیاکەی خۆی بەناوی (سمفۆنیای قارەمانییەتی) دانابوو ودەیویست پێشکەش بەناوبراوی بکات، کاتێ ئەو هەواڵەی بیست (هاوشارییەتی ناپلیۆن گۆڕاوە بۆ ئیمپراتۆریەتی) ئەو دیاریەکەی پێشکەش نەکردو هەڵی پەستارت، لەوکاتانەی کەکۆمەڵێك ئەشراف وسەرداری وڵاتان ومیرو ئافرەتی ناسك ونازدار بەجلوبەرگی ئاڵووالاوە بۆیەکەمجار لەناو کۆشکی تویلردا کرنوژیان بۆ ئیمپراتۆری تازە دەبردو پیرۆزباییان لێدەکرد، تەنها چەند کەسی نهێنی زان وخوا دەیانزانی، بۆ چ ناپلیۆن مەراسیمی بەئیمپراتۆربوونی خۆی بەدڵساردییەوە سەیر دەکات وهەر لەخۆڕانیە کەناوی شارلمانی بردووە، ناپلیۆن حەزیدەکرد پاپیش بەشداری مەراسیمی تاج لەسەر دانانەکەی بکات، وەك چۆن لەساڵی (800)دا پاپ ئەمەی بۆشارلمان کردبوو، بەڵام ناپلیۆن دەیویست گۆڕان لەوشێوە تاج لەسەردانانەدا بکات، بەو مانایەی شارلمان بۆخۆی چۆتەلای پاپ تاتاجی ئیمپراتۆری بخاتەسەر، بەڵام ئێستا ناپلیۆن دەیەوێت خودی پاپ بێت بۆپاریس.

---

[149] - پول لویس کوریە: نووسەرێکی فەرەنسیە (1772-1825) ئەو دژی بوربنەکانی دەینووسی وکتێبێکی لەدواجێماوە بەناوی (نامەکان) کەپڕە لەبیروکەی بەرزو جوان، چاوپیاخشاندنەوەو وەرگێڕانی، داڤنشی وکلونە -ش یەکێکە لەشاکارە جوانەکانی ئەو، ئەم نووسەرە بەدەستی لێپرساوی دەستەی ڕاوچیەکانی خۆی بەکوشتچوو. (و-فارسی)



پاپی حەوتەم هەواڵی ئەومەیلەی ناپلیۆنی پێگەیشت وگرژو هەراسانبوو، ئەوانەی لەپاپ نزیکبوون دڵنەوایان دایەوەو ئامازەیان بەمێژووکرد کەچەند جارێك شتی وا ڕوویداوەو پاپ لئونی یەکەم، چەند جارێك ئامادەبوو بچێت سەردانی ئاتیلا سەرداری هیاتیلا بکات، لەکاتێکا ئاتیلا لەڕووی کەسایەتی وئەدەب وشکۆمەندییەوە بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئیمپراتۆری تازەی فەرەنسیەکان، لەلایەکەی ترەوە، ئەوسەربازانەی کەلە سەرووی ئیتالیادا جێگیربوون هەڕەشە لەهاوڵاتیانی ئیتالی دەکەن.

دوای ئەوەی پاپ خۆی ساغکردەوە ئەم خواستەی ناپلیۆنی قبوڵکرد، بەڵام وازی لەچەنەکردن نەهێناو دەیویست بەشێك لەو ملك وماڵانەی پاپی کەکەوتبۆ سەروی ئیتالیا، تەنانەت کەهەندێکیشبێت دەستی بکەوێتەوە، بەڵام پاپی حەوتەم وکاردینال کنسالوی وهەموو ئەندامانی ئەنجومەنی ڕۆحانی، کەلەگەڵ پاپدابوون، نەیاندەتوانی وەك ناپلیۆن ڕۆڵی سیاسەتمەدارییەتی بەرجەستەببینن، پاپ بەبێ هودەیی دەستیکرد بەقسەکردن وفرت وتۆزین، ئینجا دەمی لەشکایەت وناڕازی وگرفتاری کوتا، دووبارە پەنای بۆفرت وتۆزین بردەوەو سەرئەنجام دەستی کرد بەپاڕانەوە، چونکە ئەمانە هیچ کەڵکیان نەبوو لەبەدەم ناپلیۆندا، پاپ دەستیکرد بەپیاهەڵاگوتی شان وباڵی ناپلیۆن، بەڵکو شتێکی بداتێ.

ناپلیۆن پێش لەسەرنانی تاجی ئیمپراتۆری لەلایەن پاپەوە، هەستی بەوریاکاری وهیچ لەباراندا نەبووییەی پاپ باشترکرد، ئەو لەلایەکەوە پێویستی بەپاپ بوو، چونکە لەو ڕۆژگارەدا سەدان ملیۆن کەس لەسەرانسەر گۆی زەویداو بەتایبەت فەرەنسییەکان باوەڕی مەزهەبیان بەپاپ هەبوو، بۆیە ناپلیۆن پاپی بەیەکێك لەپایە سەرەکییەکانی تاج لەسەردانانەکەی دەزانی، بەتایبەت بەوەی باس لەزیندووکردنەوەی ڕەوشی شارلمان لەگۆڕێ دابوو، بەڵام لەلایەکی ترەوە ناپلیۆن پاپی حەوتەمی بەوچاوە سەیردەکرد کەسێکی جادوگەرو فێڵبازەو بەوکەسانەی هەژماردەکرد کەپڕوپاگەندەی ئەوەدەکەن ڕۆحی خوا لەلەشی مەسیحدایەو دەلەسەو پاگەندەی خورافات وتراویلکەیی لەناو کڵێساکاندا دەکەن وکەڵك لەدەبەنگی هەندێك کەس وەردەگرن، لەکاتی هاتنی پاپدا ناپلیۆن قەولی بەکاردینالەکان دابووکە بەپێشوازییەوە بچێت، بەپیریشیەوە چوو، بەڵام ناپلیۆن بەجلی ڕاوکردنەوەبوو ولەحاڵەتێکدابوو کەدەستوپێوەندو سەگ وتاژی ڕاوی لەدەورویەردابوون ولەدارستانی فونتن بلودا چەند هەنگاوێك دوور لەکۆشکەکەی خۆی کەکەوتبۆ لێواری شاری پاریس چاوی بەپاپ کەوت، داوا لەپاپکرا لەگالیسکەکەی خۆی دابەزێت وچەند هەنگاوێك بۆ ئەوبەری شەقامەکە بەپێ بڕوات وسواری گالیسکەکەی ئیمپراتۆربێت، تەنانەت ناپلیۆن زەحمەتی دابەزینیشی لەگالیسکەکەی نەکێشا، بەدرێژایی ئەوماوەیەی پاپ لەپاریسدا مایەوە، ناپلیۆن بەهەمان شێوە ڕەفتاری لەگەڵدا کردوو ڕێزی کەمی لێدەگرت.

لەڕۆژی(2/ی دیسەمبەری ساڵی، 1804)دا مەراسیمی تاج لەسەردانانی ناپلیۆن لەکڵێسای نتردام وپاریدا بەڕێوەچوو، کاتێ ریزێك گالیسکەی زێڕین کەسایەتیە دیارەکان ومیرنشین وپاشاو پاپ وکاردینالەکانیان دەهێنایە کڵێسای ناوبراو، خەڵکێکی زۆر لەوناوە کۆببونەوەو سەیریاندەکرد، گوایە لەو ڕۆژەدا ڕستەیەکی بەناوبانگ گوتراوە، لەوانەیە لەدەم یەکێ لەکۆماری خوازەکانەوە گوترابێ، ئەویش ئەوەبوو، گوایە ناپلیۆن لەوکەسەی پرسیوە: ئایا ئەم مەراسیمەت پێ خۆش بوو؟

ئەویش لەوەڵامدا گوتویەتی: بەڵێ گەورەم، زۆرم پێخۆشبوو، بەڵام مخابن جێگای ئەو (300) هەزار پیاوە خاڵیە کەگیانی خۆیان فیداکرد بۆنەهێشتنی مەراسیمی ئاوا).



زۆر کەسیش پێشبینی ئەوەیاندەکرد ئەم ڕستە ئەفسانەییە سەبارەت بەمۆرکردنی پەیماننامەی کنکورد [150] گوتراوە، هەرچۆنێکبێت لەهەریەك لەم دوو شتانەدا گوترابێت، شتێکی ڕرمانایە، بەپێچەوانەی ئەوەی پاپ چاوەڕوانی دەکردو بەرنامەی بۆداڕێژرابوو، ناپلیۆن گۆڕانکاری ڕرمانای لەزۆرشتدا کرد، لەوساتەوەختەی پاپ بەوپەڕی شکۆمەندییەوە تاجەکەی هەلگرت تالەسەرسەری ناپلیۆنی دابنێت، وەك چۆن نزیکەی (10) سەدە لەمەوبەر پاپی یەکەم نابوویە سەرسەری شارلمان، لەوکاتەدا لەپڕ ناپلیۆن تاجەکەی لەدەستی پاپ ڕفاندو خستییە نایە سەری خۆی، ئینجا هاوسەرەکەی جوزفین لەبەرامبەر ناپلیۆندا کرنوژی بردوو ناپلیۆن تاجە بچوکەکەی خستەسەری ئەویش، ئەم هەڵسوکەوتە مانایەکی توانج ئامێزی هەبوو، ناپلیۆن نەیدەویست لەم مەراسیمەدا گرنگی زۆر بەپاپ نەدرێت، ئەو حەزینەدەکرد جگەلە دەستی خۆی بەدەستی کەس تاجی بخرێتەسەر، جاچجای ئەوەی لەدەستی پێشەوایەکی ڕۆحانی وەری بگرێت کەئامادەبوونی ئەوی لەم مەراسیمەدا بەبەکەڵك دەزانی وهیچ نرخێکیشی بۆ دانەدەنا.

جەژن وشادی لەپایتەخت وشارەکانیتر بەچراخان وتۆپ تەقاندن ولێدانی زەنگەکانی کڵێساکان ومۆسیقالێدانی بەردەوام چەند ڕۆژێکی خایاند، لەو ڕۆژانەدا ناپلیۆن هەستی بەو مەترسییە تازەیەکرد کەلەپلەی وەرگرتنی ئیمپراتۆریەتەکەیدابوو، پێش مەراسیمی تاج لەسەر دانانەکە، هەواڵی ئەوەی پێگەیشتبوو دوای شکستخواردنی پلانی کوشتنی ئەو لەلایەن کادودال وهاوەڵەکانییەوە، ویلیانم پیت [151] هەوڵە دیپلۆماسیەکانی خۆی زیاتر وەگەڕخستبوون هەتا هاوپەیمانیەتێکی تر دروستبکات، کەلەدوای شەڕەکانی شۆڕشی کۆمارییەوە بەهاوپەیمانیەتی سێیەم هەژماردەکرا، دەیانویست دژبە فەرەنسا دروستی بکەن، ئێستا ئەو هاوپەیمانیەتییە بەشێوەیەکی پراکتیکی دروستبووە.

---

150 - کنکورد: ئەو پەیماننامە ئاشتیەیە کەلەنێوان ناپلیۆن وپاپدا بەسترا بۆ گێڕانەوەی کەشیشەکان بۆ فەرەنسا،

151 - ویلیانم پیت: سەرۆك وەزیرانی بریتانیایە،(و- فارسی)



# تێکشکانی هاوپەیمانی سێیەم
# (1806-1805)

(1)

یەکەم هاوپەیمانی گەورەی وڵاتە زلهێزەکانی ئەورووپایی دژبە فەرنسا، لەساڵی(1792)دابوو کەلەگەڵ فەرەنسادا کەوتـە شەڕو تێکشکاو سەرئەنجام رێککەوتننامەی کامپوفورمیوی ساڵی(1797)ی لێکەوتەوە، کەلەنێوان ژنراڵـەکانی نەمساوی وناپلیۆندا مۆرکرابوو، ئەمەش بەهۆی لەناوچوونی ئەو هاوپەیمانییە ئەورووپاییە.

هاوپەیمانیەتی دووهەمیش: لەکاتی مانەوەی ناپلیۆن لەمیسردا، لەزۆرلاوە ئەو هاوپەیمانیەتییە تەنگەی بەفەرنسا هەڵچنیبوو وکەناپلیۆنیش لەمیسر گەڕایەوە دووبارە تێکیشکاندنەوەو دوای بێلایەن بوونی پلی یەکەمی، ڕوسیا، نەمساش ناچـاربوو ئاشتی لونەویل لەساڵی(1801)دا مۆربکات وبەمجۆرە هاوپەیمانی دووەمیش هەڵوەشایەوە، لەساڵی (1805)دا بۆجارێکیتر ناپلیۆن ڕووبەڕووی هاوپەیمانی ئەورووپایی سێیەم بۆوەو هێزەکانی هەردوولا کەوتبوونە خۆئامادەکردن بۆشـەڕ، نـاپلیۆن لەساڵانی (1804 و1805)دا بیری لەشەڕێکی ئیمپریالیستی گەورە دەکردەوە لەسەرخاکی بریتانیاو داگیرکردنی لەندەن وبانکی ناوەندی بریتانیا، ئاگای لەوەنەبوو کەدەبێ ئەوشـەڕە لەگـەڵ هـەمان دوژمنـی سەرسـەختیدا بکات، بـەڵام نـەک لەلەندەندا بەڵکو لەپشتیەوە لەڤییەننادا ئەنجامی بدات.

ویلیام پیت، بەچنگان زۆری دەڕشت بۆ دروستکردنی هاوپەیمانیەتی سێیەم، چونکە بەڕاستی ترس وسامی تەواو باڵی بەسەر وڵاتی بریتانیادا کێشابوو لەبەرامبەر ناپلیۆندا، ئەو هۆردوویەی بولونی کەلەکۆتایی ساڵی (1804)و سەرەتای (1805)دا بەدەستی ناپلیۆن دروستکرابوو، ببووە سەربازگەیەکی بەهێزو مەترسیدارو سوپایەکی گەورەو تەیارکراوی ئامادەی تێدابوو وتەنها چاوەڕوانی فەرمانی دەکرد هەتابەدەریای مانشدا بپەڕێتەوەو بـچێتەسەر خـاکی بریتانیـا، لەبریتانیاشـدا خـەریکی دروستکردنی لەشکری میللی بوون، بەمجۆرە هەموو ئومێدی بریتانیا بەدروستکردنی هاوپەیمانیەتێکی ئەورووپایی بوو دژبە فەرەنسا.

نەمسا بەچاوێکی دووربین و وردەوە سەیری شەڕی دەکرد، ئەو قوربانیانەی کەبەناچاری لەڕێککەوتننامەی ئاشتی لونەویلدا بەرگەی گرت، زۆر بەقورسی لەسەری تەواوبوون، بەتایبەت لەدوای ئەوکاتەوە ناپلیۆن ببووە هێزێکی زۆر گەورەو دەسەڵاتی بەسەر ولایەتە بچوکەکانی خوارووو وباشووری خۆرئاوای ئەڵمانیادا هـەبوو، ئومێـدی نەمـسا تەنهابـە هەڵایـسانی شـەڕێکی تازەبوو، هەتا ئەو لەدەوڵەتە دۆڕاوەکانەوە بهێنێتەوە ڕیزی دووەم وڵاتە زلهێزەکانی ئەورووپا، ئێستاش ئەو هەلە بۆ ئەم شەڕە بەپارەی بریتانیا هاتۆتەپێش.

ویلیام پیت، لەهەمان ئەوکاتانەی لەگەڵ نەمسادا کەوتبۆ گفتوگۆ بۆ دروستکردنی ئەو هاوپەیمانیەتییە، لەگەڵ ڕوسیاشدا کەوتبۆ ڕاوێژکردن، ناپلیۆن دەیزانی بریتانیا ئومێدێکی گەورەی بەوەهەیە شەڕبکات ونەمسا وڕوسیاش لەوشەڕەدا بەشداری بکەن دژ بەفەرەنسا، دەیشزانی نەمسا لەوەی هەندێك خاکی ئەڵمانیای ژێر دەستی خۆی لەڕێکەوتننامەی ئاشتی لونەویلدا لەدەستداوەو ئەمەش بۆتە هۆی توڕەیی وکەنەفتی وگوێڕایەڵی ڕێنماییەکانی حکومەتی بریتانیا دەکات.



ئیتر لەساڵی (1803) بەدواوە ئەو قسانەی ناپلیۆن جارجارە دەریدەبڕین – یان بەگوتەی خۆی هەتا لایەنگرو بەکرێ گیراوانی بریتانیا لەئەورووپادا لەناو نەبات، سەرکەوتنی بەسەر بریتانیادا بەشتێکی ئەستەم دەزانی، ئەو بەتالیرانی گوت: ئەگەر نەمسا بەشداری شەڕیکات ئەواخودی بریتانیا حەزدەکات فەرەنسا ئەورووپا داگیربکات.

ئیمپراتۆر ئەلکسەندەر هەرکەهاتە سەرتەختی پاشایەتی ڕووسیا، هەموو ئەو گفتوگۆ دیپلۆماسیانەی باوکی لەگەڵ فەرنسادا کردبوونی وشێوە هاوپەیمانیەتێکی بەستبوو، هەڵوەشاندنەوەو وەلانان، ئەو بۆخۆی باشی دەزانی ئەو پلانەی بۆ کوشتنی باوکی داڕێژا، چۆنبوو، چونکە خۆی ڕۆڵێکی گەورەی گێڕابوو بۆلەناوبردنی باوکی، تزاری گەنج ئەوەشی باش دەزانی ئەشراف وکۆلاکەکانی[152] ڕوسیا، بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان دەبەن لەبریتانیادا دەیفرۆشن و ئەمانە تا چ ئاستێك بەدۆستایەتی کردنی ئەو وڵاتە پابەندن، خاڵێکی گرنگی تریش هەیە، ئەویش نابێ بیرمان بچێت، لەبەهاری ساڵی (1804)دا بریتانیاو نەمسا ئومێدی ئەوەیان هەبوو– یان باشتر وایە هەوڵیاندا وڵاتی شانشینی (ناپول)[153] وپروس کەناکۆکبوون لەگەڵ ناپلیۆندا، بهێننە ناو ئەو هاوپەیمانیەتیە، بۆناو ڕوسیا بۆ شەڕکردن لەگەڵ دیکتاتۆری فەرنسادا، چاوەڕوانی نەکرنو هەلێکی باشی بۆهاتەپێش، بە چ دیارە کەناپلیۆن بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنانەدا کەرەستەو هێزی سەربازی دەبێت، کوشتنی دوك دانگین هەموو وڵاتانی ئەورووپای شانشینی وروژاندبوو وخۆیان بۆشەڕ ئامادەدەکرد، بۆ ئەوەی دژی دێوە زەبەلاحەکەی کرس[154] بوەستنەوە.

ئەمانە دەیانویست کەڵك لەڕژانی خوێنی دوك دانگین وەربگرن لەڕووی سیاسییەوە، چوونەژێر کلێشەی فەرمانڕەوای ئەڵمانیاو، ڕاستی ڕووداوی دەستگیرکردنی دانگینیان هێنایەوە پێش وئاماژەیان بەوەکرد ناپلیۆن دەستدرێژی کردۆتەسەر خاکی ئەڵمان وپێویستە ناوبراو ناڕەزایی دەبرێت، بەڵام ئەو فەرمانڕەوایەی ئەڵمانیا کەلەترساندا چەقوچۆی گرتبوو، ورتەی نەکرد، تەنانەت بەپەلەش بەنهێنی تەتەرێکی بۆلای ناپلیۆن ناردبوو ولێی پرسیبوو، ئایا هەڵسوکەوتی حکومەتی ئەڵمان لەکاتی دەستگیرکردنی دوك دانگیندا باشبووە لەبەرامبەر ئەو پاسەوانانەی سنوور کەهاتبوون بۆ دەستگیرکردنی ناوبراو وبەڕێزتان ناڕازی نین؟ ئەو پاشایە لەکۆڕو کۆبوونەوە نهێنییەکان کەمتاکورت ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی لەبەرامبەر ناپلیۆندا، بەڵام چون سنووری وڵاتەکەی هاوسێی فەرەنسابوو، کەمتر دەوێرا بەئاشکرا ناڕەزایی دەربڕێت، بەڵام شێوازی ناڕەزایی دەربڕینی تزاری ڕوسیا بەئاشکرا لەناڕەزایی هەموو پاشاکانی تری ئەورووپا دیارترو کاریگەرتربوو، ئەلکساندەر ئیمپراتۆری ڕوسیا لەیاداشتێکی تایبەتیدا بەڕەسمی دەستدرێژیەکانی فەرەنسای بۆسەر خاکی ئەڵمانیای، مەحکومکردو ئاکامی خراپی ئەمەشی لەڕووی مافی نێودەوڵەتییەوە خستەڕوو.

ناپلیۆنیش بەوەزیری دەرەوەیدا ئەم نامە بەناوبانگەی بۆنارد کەئەلکساندەر بەدرێژایی تەمەنی خۆی هیچ کاتێ بیری نەچۆوە، چونکە بەهەموو تەمەنی خۆی کەس بوختانی وابێبەزەییانەی بەئەو نەگوتبوو، لەناوەڕۆکی ئەو نامەیەدا نووسرابوو، دوك دانگین بۆیە دەستگیرکرا چونکە بەشداری لەپلانی کوشتنی ناپلیۆندا هەبوو، خۆ ئەگەر بڵێین تزار ئەلکسەندەر زانیاری

---

[152] - کۆلاك: خاوەنداریەتی زەوی گوندەکان،

[153] - ناپولی: لەو ڕۆژگارەدا وەك شانشینبووەو شێوەسەربەخۆ، (و- کوردی)

[154] - کرس: دورگەی کرس ناپلیۆن لەوێدا لەدایکبووەو ئەوکات ئەو دورگەیە سەربە ئیتالیابووە، (و- فارسی)



ئەوەی بەدەستکەوتبا بکوژانی خوالێخۆش بوو باوکی(ئیمپراتۆر پل) لەدەرەوەی ولاتدان و ئەگەری دەستگیرکردنیشیان هەیە، ئەگەر ئەلکساندەر ویستبای ئەوانە دەستگیر بکات، ئەوا ناپلیۆن ڕێگای ئەوەی بەخۆی نەدەدا لەبەرخاتری ئەمە ناڕەزایی لەبەرامبەر ئەلکساندەردا دەربڕێت.

هەموو ئەورووپا دەیزانی بکوژانی ئیمپراتۆر پل، بەڕەزامەندی کورەکەی ئەنجام دراوەو تزاری گەنج دوای دانیشتنی لەسەر تەختی پاشایەتی، نەوێرا یەك موو لەسەری بکوژانی باوکی هەلکێشێت ویالن وبنیگسن وزوبوف وتالیزین و ئەوانیتر بەوپەڕی ئاسودەییەوە لەپترسبورگدا [155] دەژین وجارجارەش دەهاتن سەردانی کۆشکی زستانەی تزاریان دەکرد) بەم نامەیە ئاگری ڕق وکینە لەدلی ئەلکسەندەردا کلپەی کرد لەبەرامبەر ئەوکەسی ئەم بوختانەی بۆ دەکات و ئەمەش لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا ڕەنگی دەدایەوە، ئەلکساندەر کە ئامادەبوو بچێتەناو هاوپەیمانیەتی سێیەمی ئەورووپا دژبە فەرنسا، بەمەبەستی بەرفراوانکردنی بنکەی کۆمەلایەتی ناوخۆ ودەرەکی وسازدانی سەربازی ولاتەکەی خۆی و دەستەبەرکردنی هاودەردی لەگەل لایەنگرانی ئازادیخوازی بەئاشکرا، ناڕەزایی خۆی لەنیازە نامەشروعەکانی ناپلیۆن بەوەی دەیەوێت دنیا داگیربکات دەربڕی و داخ ومەخابنی بۆ لەناوچوونی کۆماری لەفەرنسادا ڕاگەیاند، ئەمە خۆی لەخۆیدا شتێکی ڕیایی بوو وباش پەردەپۆشی نەکرابوو، چونکە تزاری ڕوسیا هیچ کاتێ کەمترین خەمی نەمانی کۆماری فەرنسای نەخواردبوو، بەلام دەربڕینی ئەوە بەئامانجی سیاسی بوو، کاریگەری دەکردەسەر کەسایەتی ناپلیۆن لەلایەن ئەوکەسانەی تائەوکاتیش لایەنگری کۆماری بوون، ئەم ڕەخنەگرتنە ئازادیخوازانەی ئەو(تزار) لەدیکتاتۆریەتی ناپلیۆن، کاریگەری هەبوو، ویلیام پیت، بێ دوودلی دەستگیرۆی ڕوسیای کردو ئەوەی بەدیارخست ئامادیە یارمەتی هەموو ئەو دەولەتانە بدات کەدەیانەوێت، شمشێر لەڕووی ناپلیۆن ڕابکێشن.

لەوکاتانەدا ئیمپراتۆری فەرنسا چی دەکرد؟ ئەو ئاگاداری گەمە دیپلۆماسییەکانی دوژمنەکانی بوو، بەلام بەڕای ئەو دروستکردنی ئەو هاوپەیمانیە لەژێر سەرافەتی ویلیام پیتدا بەخاوەخاو بەرەوپێشدەچێت وپێی وابوو نەمسا هەتا پایزی سالی (1805) ناتوانێت خۆی بۆشەڕ ئامادەبکاتەوە، بۆیە لەلایەکەوە سەرقالی ئامادەکردنی سوپاکەی بوو بۆ ناردنی بەدەریاداو دابەزاندنی لەسەر خاکی بریتانیاو لەلایەکی تریش وامەلسوکەوتی دەکرد وەك ئەوەی لەئەورووپادا جگەلەخۆی کەسیترنەبێ حسابی بۆبکرێت، بۆ نموونە: وای پێباش بوو پیەمون، بخاتەسەر خاکی فەرنساو کردیشی، ئینجا پێی باشبوو شارەکانی ژەن ولوك بخاتەسەر فەرنسا، ئەمەشی ئەنجامدا، ئەوەی بەپێویستزانی خۆی بەپاشای ئیتالیا ڕابگەیەنێت ولەشاری میلاندا تاج بخاتەسەری، ئەمەشی لە(28/ی مایۆی سالی 1805)دا کرد، پێی باشبوو هەندێك لەمیرنشینە بچوکەکانی ئەلمانیا بەلایەنگرانی- یان باشتر وایە بلێین بەنۆکەرە ئەلمانیەکانی خۆی بدات هەتا حوکمڕانی ئەوشوێنانە بکەن، لەمانەش میرنشینێکی دایە(باویر) شازادەکانی ئەلمانیا کەملکومالیان کەوتبۆ ئەورووپای خۆرئاواوەو نەمساش دوای ڕێککەوتننامەی ئاشتی لونەویل بەتەواوەتی لەو ناوچانەدا دەرکرابوو، جگەلەپەنابردن بۆ ناپلیۆن ئەمانە هیچ ڕێگا چارەیەکی تریان بەدی نەدەکرد، هەموویان پۆلپۆل دەهاتنە پاریس ولەژووی چاوەڕوانی کۆشك ووەزارەتخانەکاندا دەمانەوەو خزمەتکردنی خۆیان

[155] - پترسبروک: ئەوکات ئەوشارە پایتەختی ڕوسیابووەو دواتر بۆتە مۆسکۆ ودوای شۆڕشی کەورەی ئۆکتۆبەریش پترسبۆرک ناوەکەی کۆڕدرا بۆ لینینگرادو ئێستا دووبارە ناوە کۆنەکەی لێنراوەتەوە(و- کوردی)



دەردەبڕی وهەندێکیان جاسوسیان بۆ فەرەنسا دەکردو ڕاپۆرتیان لەسەر یەکتری دەنووسی وخەریکی پاشقولگرتن لەیەکتربوون ودەووروخول وکلکە سوتەیان بۆناپلیۆن دەکرد.

بەرتیل ودیاری وداواکاریان دەدایە تالیران ودڵسۆزی وکۆیلەیەتی خۆیان بەیان دەکرد، لەناو کۆشکی ناپلیۆندا سەرەتا بەکەمێ سڵیمینەوەو شەرم هەڵسوکەوتی نۆکەرانەیان دەکرد، یەکێك لەوشازادە نەفس نزمە ئەڵمانیەیان دەبینی کەچۆن لەپشت کورسیەکەی کەناپلیۆنی لەسەر دانیشتبوو وکڕنکانی دەکرد، ڕاوەستابوو ولەوکاتەیَ ناپلیۆن دەستی بەرزدەکردەوە بۆ ڕاگرتنی وەرەقەکان ئەو لێکلێك دەستی ئیمپراتۆری فەرەنسای ماچ دەکردو ناپلیۆنیش هیچ گوێی پێنەدەدا.

( 2 )

پایزی ساڵی(1805)هات وناپلیۆن بەلێپرسراوانی گوت: نەك هەرسێ ڕۆژ بەڵكو دوو، تەنانەت ڕۆژێکیش بەسە دەریای مانش تەمومژ بیگرێت وسوپاکەمان بپەڕێندرێتەوە سەرخاکی بریتانیا، کاتی تەمومژی گەورەی دەریای مانش نزیکدەبۆوە، لەمەوبەر ناپلیۆن فەرمانی بەلێپرسراوی سوپای دەریایی فەرنسا ویلنوڤ دابوو کەلەدەریای سپی ناوەڕاستەوە بچێت بۆ دەریای مانش وپەیوەندی بەسوپای فەرەنساوە بکات لەبولونداو دواتر بەنهێنی تەنگەبەری مانش ببڕێ وسوپا لەسەر خاکی بریتانیا پیادەبکات.

بەڵام لەپڕ لەڕۆژێکدا دووهەواڵ گەیشتنە ناپلیۆن، کەئەو کات لە بولونـدابوو، یەکێکیان ئەوەبوو لێپرسـاوی دەریاوانی سەربازی فەرەنسا ویلنوڤ، ناتوانێت لەماوەیەکی کەمدا فەرمانەکەی ئەو جێبەجێبکات، دووەمیش ئەوەبوو: سوپای ڕوسیا بۆ گەیشتن بەسوپای نەمسا کەوتۆتەڕێ وئامادەی ئەوەن دەستەوبەجێ شەڕلەدژی ناپلیۆن ولایەنگرانی ئەڵمانی ئەودا بکەن وئێستا هێزەکانی دوژمن بەرەو خۆرئاوا لەپێشڕەویدایە، ناپلیۆن ڕاستەوخۆ پلانەکەی گۆڕی، چونکە زانی ویلیام پیت، بەسەر گرفتەکاندا زاڵبووەو بریتانیای لەدەست داگیرکردن ڕزگارکرد، فەرمانیدا نەخشەی شەڕ بگۆڕدرێت ومەسەلەی ناردنی سوپا بۆسەرخاکی بریتانیا رابگیردرێت وپلانی هێرشکردنەسەر نمسا وڕوسیا جێبەجێ بکرێت، فەرمانی بەژنرال دارو فەرماندەی گشتی سوپای فەرنسادا ئەم بڕیارە بگەیەنێتە ئەفسەرانی هەموو یەکە سەربازییەکان، ئەمەش لەمانگی ئوگوستی ئەوساڵەدا ڕوویدا، ئیتر هۆردووی سەربازی بولونی کەدووساڵبوو ڕەنجی تێدادەدرا بۆ ڕووبەڕوو بونەوە لەگەڵ دوژمنێکی سەرسەخت وکەوتبۆ ئەوبەری دەریاوە وەلانرا، هەرچەندە پێش گەیشتنی ئەم هەواڵەش ناپلیۆن گوتبووی (ئەگەر تاپازدە ڕۆژیتر لەلەندەندا نەبم، ئەوا لەسەرەتای مانگی نوڤەمبەردا لەڤیننا دەبم)

ئێستا لەندەن ڕزگاری بوو، بەڵام دەبێ ڤیێنا ببێتە قوربانی سەرفرازبوونی لەندەن، ناپلیۆن چەند سەعاتێك تاوتوێی ئەو نەخشە تازەیەی کرد، فەرمانی دەرکرد دەستبکرێت بەگرتنی سەربازی تازە هەتا زیاتر پشتی سوپا قایمبێت و کەلوپەلی سەربازی وخۆراکیش ئامادەبکرێت وبکەوێندرێتە ڕێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا، ناپلیۆن بەپەلە تەتەری پەیام هەڵگری دیپلۆماسی وپەیمانی فریودەرانەو پێشنیارو داواکاری بۆ هەریەك بۆبەرلین ومەدریدو درسدو ئامستردام نارد، لەپاریسیشدا دۆخەکە کەمێ جەنجاڵ وناڵەباربوو، دەسەڵاتدارانی حکومەتەکەی ناپلیۆن لەپاریسەوە ڕاپۆرتێکیان بۆناردبوو وتێدا نووسرابوو کەبازرگان وپیشەسازان و..هتر، لەگرتنەبەری سیاسەتی دەرەکی ئەوناڕازین و لەبەرخۆیانەوە سکاڵایان



هەیەو خودی ئەو بەلێپرسراوی ئەو شەڕەی ئەوروپا دژبە فەرەنسا دەزانن، ڕاستە ئەوانە پرتەو بۆڵەو ناڕەزایی خۆیان بەدزی دەردەبڕی، بەڵام هەرچۆنێ بێ ناڕازی بوون، ناپلیۆن توانی لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەو هێزدووە سەربازییە گەورەی بولونی کۆبکاتەوەو سوپاکەی بەشێوەیەکی ئامادە بەڕێگا بخات وئەو لەشکرەشی کەلەوێدا مابۆوە بەبەهێزی وتواناوە جێبهێڵێت، ئینجا لەسەر لێواری دەریای مانشەوە بەسەرخاکی فەرەنسادا خۆی بگەیەنێتە سەرخاکی (باویر) کەهاوپەیمانی خۆی بوو.

ناپلیۆن بەخێرایی بەرەوپێشچوو، هێزەکانی نەمسا کەکەوتبوونە سەر لێواری ڕووباری دانوب وقەڵاتی قایمی سەربازی ئولمیان [156] کەوتبۆ دەستەچەپ، ئینجا لەخۆرهەڵاتەوە وەرسوڕایەوەو سوپاکەی جێگیرکرد.

یەکێك لەوهۆکارە بنەڕەتیانەی بۆچی هاوپەیمانیەتی سێیەم؟ دروستکردنی ئەو هاوپەیمانیەتییە لەنیوەی دووەمی ساڵی (1804)دا کەوتبۆ بیری لێپرسراوانی ئەو هاوپەیمانییە؟ تاماوەی ساڵ ونیوێکیش ئەمانە ناهاتنەوە مەیدانی شەڕ!

بۆیە دەیانویست ئەم جارەیان بەتەواوەتی خۆیان سازبکەنەوەو هەرنەبێ ئومێدی نیمچە سەرکەوتن بۆخۆیان دەستەبەر بکەن، سوپای نەمسا هیچ کاتێ بەم جۆرەی ئێستا سازو پەرداخ نەبوو، یەکە سەربازییەکان لەژێر فەرماندەی ژنرال ماك دابوون وهیوایەکی زۆر بەو سوپایە هەبوو، دیارە ئەم تێکهەچوونە سەربازییە چاوەڕوانکراوەی نەمساو فەرەنسا زۆر ئاکام وهاوکێشەی لەگەڵخۆیدا دەهێنان، لەبریتانیاو ڕوسیاو هەموو ئەوروپادا چاوەڕوانی سەرکەوتنیان دەکرد لەو شەڕەداو ئەو بۆچوونەش لەبەرئەوە نەبوو سوپای نەمسا بەشێوەیەکی باش سازوتەیارە، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو سەرانی ئەوروپا گومانیان لەوەهەبوو ناپلیۆن بەیەکجار سوپای بولونی بێنێت ولەوێوە بەرەوخوارووی خۆرهەڵاتبێت، خۆ ئەگەر گریمانواش بکات ناتوانێت ئەوهەموو هێزە زۆرە بێنێت وبەخێرایی جێگیری بکات، کاتێ ماك [157] گەیشتە باویر دەیزانی لەوێدا ڕووبەڕووی سوپای ئیمپراتۆری فەرەنسا دەبێتەوە، بێ لایەنی وڵاتانی پلەدوو تەنها نووسراوی سەرکاغەزبوو، چ پێش [158] ناپلیۆن و چ لەکاتی ناپلیۆنیشدا، شازادە ئالکتور، باویر کەوتبۆ نێوان دووبەرداش یەکێکیان هاوپەیمانی سێیەم ودووەمیشیان فەرەنساو نەیدەزانی چی بکات، بەنهێنی لەگەڵ هاوپەیماناندا نیمچە قەولدانێك درابوو، ئەگەر شەڕبوو بەوپەڕی تواناوە یارمەتی نەمسابدات، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك، بەخاو خێزان و وەزیرەکانیەوە چوو بۆلای ڤورتسبورگ ، کەلەشکرێکی فەرەنسی بوو ولەژێر چاودێری فەرماندەیی برناردوتدا بوو، شازادە ئالکتور ودوکی گەورەی ئەڵمانیاش ڕوویان لەهاوپەیمانان وەرگێڕا، بەپێی ئەو وانە مێژووییانەی کەلەقوتابخانەکانی ئەڵماندا دەخوێندرێت، بەتایبەت هی ناوەندی کەبەداخەوە ناڕاست باسی ئەو ڕووداوە دەکەن ودەڵێن (لەکاتێکا پێیان لەجەرگی خۆیان دەناو لەترسان بێدەنگی خۆیان لەئەڵمانی بوونیان بێ نوتقەهێشتەوە) شازادەکان ئالکتور باویرو وورتمبرگ، چون بۆ پاریس وبەهۆی ئەو پایەداریە ئازایەیان کەبۆ هاواری ئەڵمانی بوونیان کردبوویان، بەفەرمانی ناپلیۆن کرانەوە پاشای وڵاتەکانی خۆیان وئەوانە هەتا کودەتای ساڵی (1818) هەر فەرمانڕەوایی وڵاتەکانیان دەکرد.

---

156 - ئولم: یەکێکە لەشارەکانی ئەڵمانیاو دەکەوێتە ولایەتی وورتمبرگ و زادگای زانای گەورەی فیزیایی ئەنشتاینە، لەقەڵاتی (سەربازگە)ی ئەو شارەدابوو کەماك سەرداری سەربازی نەمساوی بەهەموو هێزەکەیەوە خۆی تەسلیمی ناپلیۆن کرد، (و- فارسی)

157 - ماك: سەرکردەیەکی نەمساویە (1752-1828) بەکوناهی خۆبەدەستەوەدانی خۆیی و(30) هەزار سەرباز لەدادگایەکی سەربازیدا حوکمی لەسێدارەدانی بەسەرداوەو دواتر لێبوردن وئازادکرا. (و- فارسی)

158 - چ پێش ناپلیۆن: مەبەست لەسەردەمی شۆڕشی کۆمارییە، (و- کوردی)



دوکی گەورەش کەوەك ئەو دووپاشایەی سەرەوە تازە دەسەڵاتی کەوتبۆ دەست، لەسەر حسابی خاکی نەمسا هەندێ خاکی خستەسەر وڵاتەکەی خۆی وداگیری کرد، ئەم پاشایانە داوایان لەناپلیۆن کرد پارەیان بداتێ، بەڵام ناوبراو وەڵامی ئەوەی نەدانەوە.

ڕێگای سەرەکی باویر ئازادبوو، فەرماندە سەربازییەکانی فەرەنسی فەرمانیان پێدرا بەزویی بەرەوپێشبچن ولەهەموو لایەك چادر هەڵدەن وبەخێرایی بەرەو ڕووباری دانوب سەرەو ژێر بڕۆن، برنادوت داوو، سولان، نی، مارمون و ئوژۆ، بەخۆیان ویەکە سەربازییەکانیانەوە، هەروەها موراش بەسەربازە سوارەکانی خۆیەوە، هەموو فەرمانەکانی ناپلیۆنیان بەوردی وەك میلی سەعات جێبەجێدەکرد، لەماوەی کەمتر لەسێ هەفتە تەنانەت بیست ڕۆژیشی نەخایەند، ئەو سوپایەی کەبەمەزن ناودەبرا بەبێ ناخۆشی وکەموکوری لەلێوارەکانی دەریای مانشەوە بۆلێوارەکانی ڕووباری دانوب گوازرابۆوە، ناپلیۆن لەوکاتانەی باسی هونەری شەڕکردنی دەکرد جارێکیان گوتی:(پێویستە بەجۆرێ هەڵسوکەوت بکرێت سوپا بەجیاجیا بڕێت وکۆمەڵ بجەنگێت) سەرکردە سەربازییەکان خەریکی جێبەجێکردنی ئەو فەرمان نەخشانەبوون کەئیمپراتۆر بۆی کێشابوون ولەکاتی دیاریکراودا هەموو ئەو یەکە سەربازیانە لەدەوروبەری قەڵاتی سەربازی ئولم سەریان دەرهێنایەوە، ماك کەبەسەر مەشق وپێشەنگی هێزی سەربازی نەمسا لەوێدا دانرابوو، بەجۆرێك گەمارۆدرا وەك بڵێی کەوتبێتە ناو گونیەکەوە، ناپلیۆن لە(24/ی دیسەمبەردا پاریسی جێهێت ولە(26/ی هەمان مانگدا گەیشتە ئتشراسبورگ، ناپلیۆن بەدەستپێکردنی ئەم شەڕە لەوکاتەی کەلەئشتراسبورگەوە بەرەو مەیدانی شەڕ دەچوو سوپاکەی ڕێکخستەوەو لێپرسراویەتییەکانی دابەشکردو فەرماندەکانی پۆلێن پۆلێنکرد، ئەو لەشکرەی کەدەبوا پایەگاو چاودێری ئەو شوێنانە بکات کەداگیردەکران جیای کردەوە، ئەو سوپایەش کەدەبوا لەپێشەوەی شەڕبێت و ناوی نا سوپای مەزن وبەسەر (7) لەشکردا دابەشکردو لێپرسراویەتی هەریەك لەو(7) لەشکرەشی درایەدەست ئەو کەسانەی پێش تاج لەسەر دانانەکەی ناپلیۆن بەرزکرابوونەوە بۆپلەی مارشال، کۆی گشتی سەبازەکانی ئەم سوپایە (186) هەزار کەس بوو وهەموو پێکهاتەکانی سەربازی تێدابوو، وەك تۆپخانەو سەربازی سوارو پێڕۆو..هتر، زۆرینەی هێزی سەربازی سوارو تۆپخانەش ڕاستەوخۆ لەژێر فەرمانی خودی ناپلیۆندا مابۆوە، بۆ نموونە: مارشال مورا، کەبەلێپرسراوی گشتی سەربازی سواری دانرابوو، لەڕاستیدا تەنها فەرمانەکانی ناپلیۆنی دەگەیاندە ئەویەکە سەربازە سوارانە، ناپلیۆن هەر کاتێ ویستبای دەیتوانی ئەوسوپا سوارەو تۆپخانە، بۆ یارمەتیدانی لەشکرێکی بنێرێت، جگەلەمە سەربازەکانی لێپرسراوی کەرەستەکانی تۆپخانەو گاردی تایبەتی ئیمپراتۆری کەنزیکەی (7) هەزار سەرباز دەبوون، لێرەدا باس لەساڵی (1805) دەکەین کەگاردی ئیمپراتۆر پێکهاتبوو لەتیپی نارنجۆك هاوێژو سەربازی پیادەو سوارو دوو تیپ پاسەوانانی سنوورو لەشکرێکی ئیتالی، چونکە ئیمپراتۆری فەرەنسا بەپاشای سەروی ئیتالیاش هەژماردەکرا لەو لەشکرەی ئیتالیایدا کەلەگەڵخۆیدابوو، ژمارەی سەربازە فەرنسییەکانی زیاتربوو، لەهەڵبژاردنی گاردی ئیمپراتۆریدا ئەو سەربازانەیان دەستنیشان دەکرد کەدلێری وئازایەتیان نواندبوو، ئەو سەربازانە موچەی باش و خواردنی خۆشیان دەدانێ، جلوبەرگی جوان وپوختەیان لەبەربوو وکڵاوی بەرزی پەشمەکەداریان لەسەردەکرد، ئیمبراتۆر زۆری لەمانە دەناسین وئاگاداری بارودۆخی ژیانیان بوو وچاودێری دەکردن، ناپلیۆن تێبینی تایبەتی سەبارەت بەفەرماندە سەربازییەکانی خۆی هەبوو وگومانی لەدانی پلەوپایەی سەرلەشکرو ئەفسەری پلەباڵا نەبوو، کەتەمەنیان لەخوار چل ساڵییەوەبوو، تەنانەت هەندێك لەسەرکردە



سەربازییەکانی لەتەمەنی (34) ساڵیدا گەیشتبوونە پلەی ماشال، لەڕۆژگاری ناپلیۆندا گەنجیەتی بۆبەرەوپێشچوون وسەرکەوتویی گرنگبوو وڕێگای لێنەدەگیردرا، بەپێچەوانەی هەموو سوپاکانی ئەو ڕۆژگارە کەگەنجیەتی دەبووە ڕێگر لەبەردەم پلەوپایە بەرزکردنەوەی سەربازی، ئەوسەربازانەی بۆ ڕێکخستنەوەی سەربازەکانیتر دانران، ناپلیۆن داهێنەری ئەمە بوو، تەنها بۆ تەمبێ کردنی و هێنانەوە سەربازی سەربازەکان نەبوو، بەڵکو شورای دادگای تایبەتی سەربازی حوکمی لەسێدارەدانیشی هەبوو لەبەرامبەر ئەو سەربازانەی تاوانی گەورەیان دەکرد، ئەمە جگەلەوەی حوکمی زیندانی کردن وکارکردن بەزۆرو... هیتریشی دەگرتەوە، ناوەندێکیتری دادگایکردن هەبوو کەپێیان دەگوت: دادگای شەرەف وتەنها لێپێچانەوەی لەکاری نائاسایی دەکرد، ئەو دادگایە بەپێی هیچ قانونێك دروستنەکرابوو وتەنها بەفەرمانی ناپلیۆن بوو، لێرەدا گوتەی شایەتحاڵێك دەگێڕمەوە: دوو سەرباز لەمەیدانی شەڕ خۆیان دزیبۆوەو دواتر وەدیار کەوتنەوەو پاساویان بۆ نادیاریەکەی خۆیان هێنایەوە، کاتێ ئەفسەری ئەوتیپە دڵنیادەبوو لەوەی ئەو دوو سەربازە لەترسی شەڕ خۆیان شاردۆتەوە، دەستبەجێ سێ کەسیان وەك سەربازی قازی لەنێوان سەربازەکان هەڵبژاردوو ئەم دادگایە دوای گوێگرتن لەتاوانباران حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا دان وگوللەباران کران، فەرماندە سەربازییە باڵاکان لەو هەواڵانە ئاگادار دەکرانەوە، بەڵام ئەوان هیچیان نەدەگوت، نەدەبوا هیچ ئەفسەرێك لەو دادگایکردنەدا بەشداری بکات، نەك ئاگاداری سزای حوکمەکەبێت – هەرنا بەشێوەیەکی ڕەسمی.

سەرداری خۆپەرست کەخۆی بەئیمپراتۆر ڕاگەیاندو تاج لەسەرنانەکەی لەلایەن پاپەوە پیرۆزبایی لێکرا، لەساڵی (1810) بەدواوە هاوسەرێکی لەخێزانی پاشایەتی نەمسا هێناو توانی قەناعەت بەسەربازەکانی بێنێت بەوەی هەموویان وەك پێشوو بەرەنگاری بوربنەکان ودەستێوەردانی دەرەکی بنەوەو بەرگری لەنیشتمان بکەن وپۆخۆشی هەمان ئەو سەربازەی سەرەتایی فەرەنسایە، لەڕاستیدا سەربازەکان بەتێڕوانینی ئەو تەنها پلە گۆشتی دەم تۆپەکان بوون و ئەمە گوتەیەکبوو ئەو زۆرجار دووبارەی دەکردەوە، ئەو سەربازانەش ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبوون وکوێرانە ببونە گوێڕایەڵی، هەمیشە ناوی ئەویان بەخۆشەویستییەوە دەهێنا، قەیسەری ڕوسیا کەهەموو ئەورووپا لەبەری دەلەرزی بەلای ئەو سەربازانەی ناپلیۆنەوە وەك یەك سەربازی سادە سەیردەکراو لەناوخۆیاندا بە(سەرجوخی[159] بچوك ) و(کەچەڵۆکە) ناویان دەبرد.

هەروەها لەو باوەڕەدابوون گوتەکەی ناپلیۆن ڕاستەکە دەڵێت: هەموو سەربازێك گرتنەدەستی داری سەرلەشکری لەجوعبەکانی[160] دایە، سەردارانی وەك موراو برنادوت و لوفەرو.. هیتر، ئەو ئەستێرانەبوون وەك بازنەی دەوری ئەستێرەی زوحەل دەوەری ئیمپراتۆریان دابوو، خزمەتی سەربازی خۆیان لە چ پلەیەکەوە دەست پێکردبوو، ناپلیۆن باوەڕی تەواوی بەسەربازو ئەفسەرەکانی هەبوو، بەڵام پشتی بەهەموو ژنراڵ و مارشاڵەکانی نەدەبەست خۆنەگەر کردباشی دەربەست نەبوو، سەبارەت بەڕۆڵی ژنراڵەکانیش پێویستە ئەوە بڵێین: ناپلیۆن کۆمەڵێ کەسی بەتواناو بەرجەستەی سەربازی لەدەوری خۆی کۆکردبوونەوە، ئەوسەرکردە سەربازیانە هەموویان لەیەك شتدا یەکیان دەگرتەوە، ئەویش ئەوەبوو لەجولەی سەربازی خێراو

---

[159] - سەرجۆخی : واتە دەستەی کوللە بارانکردن، لەسوپادا چەند سەربازێك دیاری دەکرێن بۆئەمە.

[160] - جوعبە: مەبەست لەفیشەکدانە (قایش مەخزەن) - ناپلیۆن لێرەدا بەمەبەستی ئازایەتی بەکاری هێناوە. (و- کوردی)



پلاندانانی دەستبەجێ وەهەڵمەتی سەربازی کورچکبڕ یەك بۆچونیان هەبوو وپەیڕەوی ئەمەیاندەکرد، ئینجا ناپلیۆن فێری ئەوەی کردبوون مەبەست لەوەی دەڵێم بەیەك ئاماژە تێبگەن وبەلێزانی خۆیان جێبەجێی بکەن.

توانای پێشڕەوی وبەڕێگاخستنی سەربازی ناپلیۆن بەجۆرێ مارشاڵەکانی ڕاهێنابوو، بێ ئازادی تەواو کارەکانی خۆیان لەمەیدانی شەڕدا لەدەست نەدەداو بەوردی دەسورەکانی ئەویان جێبەجێدەکرد.

شمشێر وەشێنێکی نەخوێندەوار وشێردڵی وەك (لوفەرێ)و نەجیب زادەیەکی سەرسەخت و مۆنی وەك (داوو)و سوارچاکی بێ باکی وەك(موراو) ئەفسەرێکی وەك(برتیە) کەوەك لەدایکێکی پلاندارێژەری سەربازی وپاوکێکی ئەفسەر بوبێت، ئەمانە تاکتیکدانەرو نەخشەدانەربوون، دلێرانی وەك(نی)و (لان)، لەکەسانی وەك(برنادوت)ی فێلبازو لێزان و(ماسنای) ڕێکخەری سەربازی و(مارمون)کەمترنەبوون، بەدڵنیاییەوە ئازایەتی ئەوکەسانە پێویستبوو، چونکە دەبوا لێپرسراویەتی سەربازەکان لەئەستۆبگرن، هەموو ئەمانە نمونەی ئەفسەری قارەمان ودیارو ئازابوون، جارێکیان کاتێ لەڕوو بەڕووی (لان)دا ستایشی ئەوریاندەکرد بەوەی زۆرجار لەگەڵ سەربازە سوارەکانیدا بێ ترس هێرشی کردۆتەسەر دوژمن: ئەو بەدەنگێکی بەرز گوتی: ئەو سوارەی هەتا سی ساڵی بەکوشت نەچێت، سەربازنییە.

لان لەوکاتەدا تەمەنی (34) ساڵبوو ودوساڵ دواتر لەمەیدانی شەڕدا بەنارنجۆك کوژرا.

لان تەنها سوارچاکێکی بێباك نەبوو، بەڵکو سەرکردەیەکی لێوەشاوەش بوو، ئەفسەرەکانی ئیمپراتۆر ئەمانەبوون، ئەو ئەفسەرانەی ناپلیۆن بۆخۆی هەڵی بژاردبوون وبەرزترین پلەی سەربازی پێدابوون، هەموو ئەو سەرکردە سەربازیانە لەساڵی (1805)دا لەشەڕی دژبە هاوپەیمانی سێیەم ئامادەبوون، جگەلە(دزێ) کەلەشەڕی مانگودا کوژرابوو، هەروەها سەردارێکی تریش لەگەڵیاندانەبوو ئەویش (مورو)بوو کەناپلیۆن لەهەموو سەرکردە سەربازییەکانی زیاتر بەهای بۆئەو دادەناو دوورخرابۆوە بۆئەمریکاو لەتاراوگەدا دەژیا.

بەئەو لەشکرە مەزنەو یاریدەی ئەو ئەفسەرە دلێرانەبوو کەناپلیۆن لەو ڕۆژگارەدا گەیشتە لوتکەو دەدرەخشایەوە.

یەکە سەربازییەکانی (سو)و (لان)و (مورا)لەڕوویاری دانوب تێپەڕین ولەناکاو لەپشتی سەری هێزەکەی (ماك)ەوە قوت بوونەوە.

هەندێك لەسەربازەکانی نەمساوی هەرکە چاویان بەومەترسییە گەورەیە کەوت، بەرەو خۆرهەلات هەلاتن، بەلام زۆرینەی هێزە سەربازییەکەیان بەهۆی لەشکرەکەی مارشال (نی)یەوە گێڕدرانەوە ناو قەلاتی سەربازگەکە، لەهەموو لایەکەوە چواردەوری قەلاتی ئولم گیرا، بەلام تائەوکاتەش ڕێگایەك بۆ هەلاتن مابۆوە، گەچی ئەو سەرکردە سەربازییە نەمساوییە فریوی ئەو جاسوسانەی خوارد کەناپلیۆن ڕەوانەی کردبوون، لەمانەش (شولمستر) کەلەهەموویان دیارتربوو، ئەو جاسوسانە پێش ماك کەوتن ڕێنمایی وئامۆژگاری ئەوەیانکرد شەڕیکات [161] باشترەو گوتیان ناپلیۆن ناچاردەبێت دەست لەگەمارۆدانەکەی هەلگرێت، چونکە لەڕاستیدا شۆڕشێك لەدژی ئەو لەپاریسدا هەڵساوە، هەرچەند ماك بەگومانەوە گوێی

---

[161] - 1- شەڕیکات: مەبەستی ناپلیۆن لەوەبوو ماك بەوڕێگایەی کەتا ئەوکاتیش دەتوانرا پێدا هەلێت، هەلنەیەت، ئەو جاسوسانەشی هەربۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناوە، دەنا دواتر کەلەواو دەوری قەلاتە سەربازییەکە دەگرن داوای خۆبەدەستەوە دانی لێدەکەن.

2- لەوە دەچێت ئەو ڕۆژنامەی زمارەو بروارەکەی دەستکاری کرابێت هەتا ماکی پێ فریوبدەن، (و- کوردی)



لەڕای ئەمانە دەگرت، ئەو جاسوسانە بەنهێنی یەکێکیان بۆهۆردووی سەربازی فەرەنسییەکان ناردو ئەم هەواڵەیان گەیاند، ئەوانیش ژمارەیەکی تایبەتی ڕۆژنامەیەکی پاریسیان نارد کەهەواڵی ڕاپەڕین وخۆپیشاندانی لەپاریس تێدابڵاوکرابۆوە، ئینجا شولمستر ئەو ڕۆژنامەی دایەدەست ماك وناوبراو دوای خوێندنەوەی دڵی ئاسودەبوو، لەڕۆژی 15/ی ئۆکتۆبەردا لەشکری (نی)و (لان) توانیان بەرزاییەکانی سەرووی قەڵاتەکە بگرن، بەمەش پێگەی ماك دیژواتربوو.

نابلیۆن تەتەری ناردنەلای ماك وپێشنیاری خۆبەدەستەوەدانی بۆکردبوو وەهەڕەشەی ئەوەشی کردبوو، ئەگەر شەڕیکات ئەوا قەڵاتەکە دەگرێت وهەرچی سەربازی نەمساوی هەیە دەیانکوژێت.

لەڕۆژی(20/ی ئۆکتۆبەری ساڵی 1805)دا قەڵاتی ئولم خۆی بەدەستەوەداو لەشکری ماك بێ هیچ مەرجێك بەهەموو بارووبنەوە خۆی تەسلیمی نابلیۆن کرد، ئیمپراتۆر ماکی ئازادکردو سەربازە دیلەکانی نەمساشی بۆ کارکردن ناردنە فەرنسا، کەمێ دوای خۆبەدەستەوەدانی ماك، نابلیۆن هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کەژنرال (مورا) توانیویەتی (8) هەزار سەربازی هەڵاتووی نەمساوی دەستگیربکات، دوای تێکشکانی ئابرو بەرانەی قەڵاتی ئولم کەلەڕاستیدا هاوپەیمانی سێیەم شەرەکەی دۆڕاندبوو وتەنها هەندێك لەئەفسەرە باڵاکانی سوپای نەمساو ڕوس ئەم هەڵەیان بیست وپەیان بەو ڕاستییەبردکە شەڕەکەیان دۆڕاند، سوپای نابلیۆن بێ ئەوەی وەدرەنگی گێڕن ڕاستەوخۆ بەرەو ڤێننا کەوتنەڕێ وبەهۆی گەڕان و ڕاوەدوونانی سەربازە هەڵاتووەکانی نەمسا توانیان کۆمەڵێ سەربازیتر دەستگیربکەن وژمارەی ئەو سەربازەدیلانەی نەمسا نزیکەی (29) هەزار کەسبوون، هەروەها ژمارەی ئەوانەی لەناو قەڵاتی ئولمیشدا گیرابوون (32) هەزار سەربازبوون کەنزیکەی (41) هەزار سەربازی نەمساوی بوون، لەم ئامارەدا ژمارەی ئەوانەی توانیبویان خۆیان قوتاریکەن ونادیاربوون هەژمارنەکراوە، نابلیۆن لەگوتەیەکیدا کەبۆ یەکە سەربازییەکانی گوت وسەرئەنجامی ئەوشەڕەی تێدا ئاشکراکرد، ئاوای باسکرد(دووسەد تۆپ نەوەت ئاڵاو.. هەموو فەرماندە سەربازییەکانیش دەستگیرکراون ولەو سوپایە گەورەیە زۆربەیان نەیانتوانیوە خۆیان ڕزگاربکەن وەهەڵبێن).

سوپای فەرەنسییەکان بەخێرایی بەرەو ڤێننا دەچوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەشکری کوتزۆف توانی لە(نۆڤەمبەردا لەنزیك دورنشتاین، کەدەکەوێتە بەشی چەپی ڕووباری دانوب، هێرش بکاتەسەر یەکە سەربازییەکانی مورتیەو تێکی بشکێنێت وزیانێکی زۆری لێبدات، لەڕۆژی 13/ نۆڤەمبەردا نابلیۆن کەلەپێشیەوەی سەربازانی سوار دەڕۆیشت وگاردەکەشی لەدوورپشتیدا بوون و گەیشتە ڤێنناو کۆشکی پاشایەتی (شونبرون)ی بۆ مەنزڵی خۆی هەڵبژارد، فەرەنسییەکان پێشنەوەی ئیمپراتۆری نەمسا هەڵبێت پێشنیاری ئەوەیان بۆکردبوو وازلە دژایەتی کردن وشەڕ لەگەڵ نابلیۆندا بێنێت، بەڵام ئەو قەبوڵی نەکردبوو. ئیتر لێرەودوا ئومێدی هاوپەیمانی سێیەم تەنها بەسوپای ڕوسیاو خودی تزار مابوو، ناوبراویش دڵی خۆی بەوەخۆشکردبوو پروس هاتبۆ ناو هاوپەیمانەتیەکەوە، هەرچەندە ئەمە زۆر درێژەی نەکێشاو هەموو ئەو ئومێدانە وەك دوکەڵ بەئاسمان هەڵچوو.



# (3)

لەهەمان ئەو ڕۆژانەی (ماك) لەقەڵاتی ئولمدا گەمارۆدرابوو وخەریكی خۆبەدەستوەدان بوو، ئەلكسەندەری یەكەم، لەبەرلین بوو وفشاری خستبۆسەر فریدریك ویلهلمی سێیەم پاشای پروس تاشەڕكردنی لەگەڵ ناپلیۆندا ڕابگەیەنێت.

فردریك ترس ولەرزی هەمان ئەوشازادانەی خواروی ئەڵمانیای لێنیشتبوو كەلەمەوبەر باسمانكردن، ناویراو لەئەلكسەندەرو ناپلیۆن وەك یەك دەترسا، تەنانەت ئەلكسەندەر بەتوانجێكی هەڕەشە ئامێزەوە وای تێگەیاندەكە سەربازانی ڕوسیا دەتوانن ڕێگایەك لەسەرخاكی پروسەوە بۆخۆیان بكەنەوە، بەڵام چوون پاشای پروس بەسەختی پێداگری كردوو ئامادەیی بەرەنگاری كردنەوەی نیشاندا، ئەلكسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا وای پێباشبوو بەزمانی خۆش لەگەڵیدا بكەوێتە قسە، بەڕێكەوت هەواڵێك گەیشت كەبۆ پلانەكەی ئەلكسەندەری ڕوسیا زۆر بەكەڵكبوو، ئەویش ئەوەبوو ناپلیۆن فەرمانی بەمارشال برنادوت كردبوو بۆپێشڕەوی بەرەو نەمسا بەسەرخاكی ئانشپاخدا تێپەڕێت، كەیەكێكبوو لەولایەتەكانی ئەڵمانیا.

پاشای پرۆس لەلایەك لەم كارە سەربەخۆیەی ناپلیۆن دڵگران ببوو ولەلایەكیش چاوەڕوانی ئەوەی نەدەكرد سوپای مەزنی فەرنسا سەركەوتوو بێت، لەپێش گەمارۆدانی قەڵاتی ئولمەوە وردەوردە بەلایەنگری هاوپەیمانان خزایە ناوشەڕەوە [162]، بەپێی یەك ڕێككەوتننامەی نهێنی لەنێوان فردریك ویلهلم وئەلكسەندەری ڕوسی، پروس پەیمانیدا ناڕەزایی دەربڕێت وشەڕ لەدژی فەرنسا ڕابگەیەنێت، ئیتر سیناریۆیەكی پێكەنیناوی هاتەپێش، ئەویش ئەمەبوو: فردریك ویلهلم وشاژن لویزو ئەلكسەندەری ڕوسیا، چوونەسەر مەزاری فردریكی دووەمی پاشای پروس وسوێندیان بەگۆڕەكەی ئەوخوارد كەبۆ هەمیشە هەردۆست و هاوپەیمانی یەكتربن.

(لایەنی پێكەنیناوی وگاڵتەجاڕی ئەمە لەوەدابوو ڕۆژگارێ ڕوسیا بۆماوەی حەوت ساڵ شەڕی لەگەڵ هەمان ئەم فریدریكەی دووەمدا كردبوو ولەماوەی ئەو شەڕەدا دەمێك ڕوسیا ئەوی تێكدەشكاندو دەمێكیش پروس ڕوسیای تێكدەشكاند، تەنانەت ماوەیەك ڕوسیا بەرلینیشی داگیركردو شتێكی وایانكرد خەریكبوو فریدریكی دووەم خۆی بكوژێت) دوای ئەمە ئەلكسەندەر پروسی جێهێشت وڕاستەوخۆ گەڕایەوە نزیك بەرەكانی شەڕ لەنەمسا، لەنەمساو بریتانیادا هەموویان كەوتبوونە خۆشی وشادییەوە، ڕۆژنامەكان هەواڵی هاوپەیمانیەتی هەمیشەیی ڕوسیاو پروسیان بەمانشێتی گەورەو خۆشییەوە بڵاودەكردەوەو دەیانگوت: هەركاتێ سوپای پروس بەكێوەكانی متالیكدا تێپەڕێ و خۆی بگەیەنێتە مەیدانی شەڕ، ناپلیۆن [163] لەناو دەچێت. دەبوا ناپلیۆن بەهەر نرخێكبێت پێش گەیشتنی سوپای پروس سوپای هاوپەیمانانی پێشەوەی تێكبشكێنێ، لەگەڵ داگیركردنی ڤییەنادا هێزەكانی فەرەنسا توانیبوویان دەستبەسەر پردی گەورەی ئەوشارەدا بگرن كەدەچۆوەسەر ئەوبەری لای چەپی ڕووباری دانوب وئەمەیان تاكە پردبوو كەنەمساوییەكان فریانەكەوتبوون بیتەقێننەوە، بەسەرهاتی گرتنی ئەم پردە گێڕانەوەی ئەفسانەیی بەخۆیەوە گرتووە، كەهەریەك لەمگێڕانەوانە نادروست وئاوێزان بەئەفسانەن، ڕوسەكان لەبەشی دووەمی كتێبی شەڕو [164] ئاشتیدا خوێندویانەتەوەو باش ئەمە دەزانن، بەڵام لەڕاستیدا مەسەلەی گرتنی ئەوپردە بەم جۆرەی خوارەوە بووە: موراو لان و رتران و یەك ئەفسەری هەندەسی بەناوی دود، دوای ئەوەی زۆر بەوریایی یەك تیپی

---

[162] - واتە: دژبە ناپلیۆن،

[163] - ناپلیۆن: لێرەدا زیاتر مەبەست لەسوپای فەرەنسایە،

[164] - كتێبی شەڕو ئاشتی: شاكارێكی بەناوبانگی نووسەری گەورەی ڕوسی تۆلیستۆیە (و- كوردی)



سەربازی نارنجۆك هاوێژیان لەنێو درك ودالّی بەرزی وێدا جێگیرکردوون، بۆخۆیان بەئاشکرا بەرەو پردەکە چون کەسەربازی نەمساوی کۆنترۆڵیانکردبوو وفەرمانیان پێدرابوو هەرکە دوژمنیان لێدیارکەوت پردەکە بتەقێننەوە، بەلام موراو هاوەڵەکانی هاواریان لێکردوون وگوتیانە: ئێستا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ نەمسادا مۆرکراوەو شەرەکەن، ئەوانە بێ سڵینەوەو بەئاسایی بەپردەکەدا پەڕینەوەو داوای فەرماندە سەربازییەکەی ئەوانیانکردووە کەناوی (کنت ئوریشپریگ) بووەو دووبارە درۆکەی خۆیان بۆئەویش دووبارە کردۆتەوە، ئینجا پێشنەوەی کنت ئوریشپریگ فریابکەوێت وەلامی ئەوانە (٦٦٥) بداتەوە، لەپڕ نارنجۆك هاوێژەکانی فەرەنسایی لەناو درك ودالّەکاندا هاتوونەدەرێ وهێرشیان کردۆتەسەر ئەو سەربازە نەمساویانەی کەلەدەوری پردەکەدابوون ولەماوەی یەك دەقیقەدا پردەکەیان خستەدەست خۆیان، نەمساوییەکان هەوڵیاندا شەڕبکەن، بەلام تازە کارلەکار ترازاو کەڵکی نەبوو، کاتێ لەلایەن موراوە ئەم هەواڵە بەناپلیۆن گەیشت ناوبراو دەستەوبەجێ فەرمانیدا چەند یەکەیەکی سوپای فەرەنسا لەوپردە بپەڕنەوەو هێرش بکەنەسەر سوپای ڕوسەکان.

لەوکاتانەدا سوپای ڕوسیا لەحاڵەتێکی دیژواردابوو، ناپلیۆن بەزۆرینەی سوپاکەی خۆیەوە لەڕووباری دانوب پەڕیبۆوە ودەویست ڕێگای پاشەکشەکردنی سوپای ڕوسیا بگرێت، کوتزۆف فەرماندەی گشتی سوپای هاوپەیمانان باشی دەزانی تاکەڕێگای ڕزگاربوون گرتنەبەری پاشەکشەی خێرایە لەکرەمسەوەو لەوێشەوەبۆ ئولخان کەدەکەوێتە خۆرئاوای ئۆلموتز. ئەو (35) هەزار سەربازی لەگەڵدابوو، ناپلیۆنیش سوپاکەی نزیکەی (100) هەزار سەربازبوو، ڕووداوەکەی پردی ڤێنا لەلای سەربازەکانی ڕوسیا بووەجێگای گومان وبەئاشکرا دەیانگوت خیانەت کراوە، لەدەستدانی پردی ناوبراو بەجۆرێ جێگای سەرسوڕمان وپرسیاربوو تەنانەت دەیانگوت نەمساوییەکان بەنهێنی ئاشتیان لەگەڵ ناپلیۆندا کردوەو ئەمەش بۆتەهۆی ئەوەی سوپای فەرەنسا بەخێرایی بپەڕێتەوە ئەوبەری ڕووباری دانوب وئاکامی ئەو خیانەتەش لەناوچوونی سوپای ڕوسی لێدەکەوێتەوە، لەپاشەکشەی بەهەڵەداوانی سوپای ڕوسیادا کوتزۆف ناچاربوو بەئاشکرا ژمارەیەك سەربازبنێرێت بۆدواخستنی هاتنی سوپای فەرەنساو بیانکات بەقوربانی، دوای ئەوەی لەکۆی گشتی (35) هەزار سەرباز (12) هەزار سەربازی تێداچوون، سەرئەنجام توانی سوپا شپرزەکەی لەچنگ دیلی ڕزگاربکات وخۆی بگەیەنێتە ئۆلموتز، کەپێشتر دوو ئیمپراتۆری لێبوون و هەلاتبوون، واتە: فرانسوای نەمساوی وئەلکسەندەی ڕوسیا.

لەوکاتەدا بارودۆخەکە بەم جۆرەی خوارەوەی لێهات: بەسەربازەکانی گاردو هەموو ئەو سەربازانەی بۆ یارمەتی نێردرابوون کۆی گشتیان گەیشتبۆ(75) هەزارو سوپای نەمساش تەنها نزیکەی (15- بۆ 18) هەزار سەربازیان لەوێدا هەبوو، بائەوەشمان بیرنەچێت پێش داگیرکردنی ڤێننا یەك لەشکری گەورەی نەمسا لەلایەن ناپلیۆنەوە لەناوبرابوو، هەروەها لەشکرێکی تری نەمسا کەناپلیۆن فەرمانی بە(ماسنا)دابوو لەخۆرهەلاتی ئیتالیا بەگژیاندا بچێتەوەو پاکسازیان بکات، کەوتبوونە حاڵەتی تێشکان و پاشەکشە.

بەوجۆرە هێزەکانی هاوپەیمانان کۆی گشتی سەربازەکانیان دەگەیشتە (90) هەزار کەس کەلەئۆلموتزدا جێگیرکرابوون، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کوتزۆف لەهەموو کەس باشتر دەیزانی ئەستەمە بتوانرێت ئەو (75) هەزار سەربازەی کەتەنها



ژمارەیان لەسەرکاغەز هەیە، ڕووبەڕووی شەڕببنەوەو ئامادەی بەگریکردنبن، بۆیە ناوبراو [166] لەشەڕکردن دەترساو پێی وابوو دەبێ درێژە بەپاشەکشێ کردن بدرێت وشەرەکە دوابخرێت هەتائەوکاتەی بڕیاری کۆتایی لەوڵاتی پروس وەردەگیرێت وسوپاکەی بێتەناو جەرگەی شەڕەکەوە.

بەڵام ئەو لەلایەن ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسییەوە فشاری خرایەسەرو ناوبراو دەیویست دەستەوبەجێ شەڕبکرێت، ئەلکسەندەر هیچی لەهونەری شەڕنەدەزانی، هەر تامەزرۆی تۆمارکردنی داستانی گەورەبوو وسەرکەوتنی بەشتێکی لەقەڵەم دابوو، چونکە گومانی لەوەنەبوو پروسیش دێتەناو شەڕەکەو بەشداری دەکات، شەڕکردن لەشوێنێکی بایەرو کێوستانی و ڕاکردن لەبەردەم سوپاکەی ناپلیۆندا، بەلای تزاری ڕوسیاوە بەشتێکی شەرمەزارکەرانە دەهاتەبەرچاو، ڕاوێژکاری سەربازی [167] خۆشەویست و لاوی ئیمپراتۆر، شازادە (دولگروکوف) کەخۆشەویستی تزای بەمە بۆخۆی دەستەبەر کردبوو لەگەڵ ڕاکەی ئەودابوو بۆشەڕکردن، کوتزۆف دەیزانی خودی تزارو شازادە دولگروکوف، هەموو ئەو دارو دەستەیە لەڕووی سەربازییەوە وەك کەسێکی مەدەنی شارەزاییان هەیەو بەس، بەڵام کوتزۆف بەدڵنیاییەوە دەیزانی ئەگەر سوپای ڕوسیا بکەوێتەشەڕ دژیە سوپای فەرنسا، ئەوا کارەساتێکی گەورە بەسەر سوپاکەیدادێت وپێویستە خۆیان بەدووربگرن لەزەبرەکانی ناپلیۆن ولەدەست پێگەیشتنی ئەو بەدووربن، بۆیە دژی شەڕبوو، بەلام نەیدەتوانی سەرەڕۆیی بکات وسەئەنجامێکی ڕەشی توشبێت، چونکە تزار فەرمانڕەوای ڕەهابوو.

لێرەدا هەرکوتزۆف پیاوێکی سەربازی ڕاستەقینەبوو، کەلەناو هەردوو سوپای ڕوسیاو نەمسادابوونی هەبوو، ئەوتاکە سەرداری شارەزابوو لەپیشەکەی خۆیدا، هەرچەندە هەندێك لەوانەی گوێیان لەڕاکەی کوتزۆف دەبوو شێوە باوەڕێکیان پێدەهێنا، بەلام کەسێکی [168] گەورەتر لەخۆی هەیەو کوتزۆف ناتوانێت سەرپێچی لەفەرمانەکانی بکات، هەرچەندە ئەو پێشبینی پلان ونەخشەکەی ناپلیۆنی تەواو درکیش پێکردبوو.

ناپلیۆن بەدوای سوپای ڕوسیاوەبوو هەرکە سوپای دوژمن وەستاو چیتر پاشەکشەی نەکرد، ئەویش سوپاکەی ڕاگرت ولە(برون)ی نزیکی ئولموتزدا هۆردووی سوپاکەی خست، تاکە شتێك کەناپلیۆن لەوکاتەدا بەڕاستی لێی دەترسا ئەوەبوو ڕوسەکان شەڕنەکەن ودرێژە بە پاشەکشەکەیان بکێشن.

بەوەی ناپلیۆن لەفەرەنسا دوور کەتبۆوەو دەیزانی هوگویتز – لەڕێگادایە هەتا نارەزایی دەوڵەتی پروس بداتەدەست ئەو، بۆیە دەیویست هەرچی زووترە ئەم شەڕە یەکلایی بکاتەوەو کۆتایی بێت، لەوکاتەدا ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان توانا دیپلۆماسی ونواندنەکەی گەیشتە ئەوپەڕی درەوشاوەیی، هەموو ئەو کارو پێشهاتانەی لەناو سوپای ڕوسیادا ڕوویدابوو، پێشبینی کردبوون و بڕیاریدەدانی ڕایەکەی تزار کەدەیگوت دەبێ شەڕبکرێت دەستی کردبە ڕۆلگێڕانی دیپلۆماسی کاریگەر بۆئەوەی ڕوسیا تیژبکات بۆ شەڕکردن.

---

[166] - ناوبراو: واتە، کوتزۆف، سەرکردەیەکی سەربازی ڕوسیەو فەرماندەی گشتی سوپای هاوپەیمانانە،(و-کوردی)

[167] - ڕاوێژکار: لێرەدا مەبەست لەهەندێك کاروباری سەربازییە، بەرێکای کەسی دووەم دێت، بۆفەرماندان وجێبەجێکردنی کارەکان.

[168] - کەسێکی گەورەتر: مەبەست لەتزارە ئیمپراتۆری ڕوسیا،(و-کوردی)



ناپلیۆن وایینیشاندا تۆقیوەو لەحاڵەتی لاوازی وشەپرێوی دایە، دەبوا والەدوژمنەکانی بگەیەنێت لەداڕماندایەو هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخساوە هێرش بکەنەسەر سوپای فەرەنساو تێکیبشکێن، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانەشی سەرەتا فەرمانی بەبەرەی پێشەوەی سوپاکەیدا پاشەکشەبکەن، ئینجا ژنرال ساواری ناردەلای ئەلکسەندەر بەمەبەستی پێشنیارکردنی ئاشتی، بەژنرال ساواریشی گوتبوو بڵێ: ناپلیۆن داوای دانیشتن لەگەڵ ئەلکسەندەر ئیمپراتۆری ڕوسیادا دەکات، ئەگەر تزاریش بەمە ناڕازی بوو، ئەوا ئەوتکای لێبکات کەسێکی جێگای متمانەی خۆی بنێرێت بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ناپلیۆندا، لەئۆردووی سەربازی ڕوسەکاندا: هاوارو قریشکەی شادی وسەرکەوتن بەرزبۆوەو هاواریان دەکرد، ناپلیۆن تۆقیوە، بۆناپارت لەناوچوو! پێش هەموو شتێك نابێ لێگەڕێن هەڵبێت.

هەموو ئەو مانۆڕانەی ناپلیۆن پێچەوانەی نیازەکانی بوون.

کوتزۆف بووبە کەسێکی بێ ئیعتبارو ترۆو ترسنۆك وهیچ نەزان، ئەلکسەندەر ڕازی نەبوو چاوی بەناپلیۆن کەوێت بۆ ئاشتی کردن ولەبری خۆی شازادە دولگروکۆفی نارد، ناپلیۆن پاش بەسەرچوونی ئەوشەڕە زۆر بەڕیشی ئەو ژنراڵەی کۆشك پێدەکەنی ولەنووسراوە ڕەسمییەکانیدا ناوینابوو(کوڕە گەمژە قۆشمەچییەکە).

دولگروکۆف، بەقسەکردنی شێوە فەرمان کردنانە، وەك ئەوەی لەگەڵ کەسێکی ژێر دەستی خۆیدا بدوێت، لەگەڵ ناپلیۆندا کەوتە گفتوگۆ، بەقسەی ناپلیۆن کەدواتر باسی ئەو دانیشتنەی لەگەڵ ئەو ژنراڵە گەمژەیەدا دەگێڕایەوە دەیگوت(وەك ئەوە وابوو لەگەڵ نەجیبزادەیەکی مەحکوم بەدوور خستنەوەی بۆسیبیریا بدوێت، ئاوا هەڵسوکەوتی دەکرد).

ناپلیۆن بەجددی درێژەی بەو ڕۆڵە کۆمیدیەی خۆیداو وای دەرخست کەسێکی مەلول ویەدبەختە، بەڵام لەهەمانکاتدا هەستی بەوەکرد نابێ لەم ڕۆڵ بینینەیدا زۆر زیادەڕەوی بکات چونکە هەموو شتێك لەم دنیایەدا تەنانەت گەمژەیی شازادە دولگروکوفیش سنووری خۆی هەیەو لەکۆتایی دانیشتنەکەدا گوتی مەرجی پێشوەختم قبوڵ نییە، چونکە دولگروکۆف داوای لێکردبوو ناپلیۆن لەئیتالیاو هەموو ئەو شوێنانەی داگیری کردوون بکشێتەوە، دوای ئەو ڕاپۆرتە دڵخۆشکەرەی کەدولگروکۆف بەئەقڵی خۆی خستیەڕوو، هەموو گومان ودوودڵیەکی لەدڵی هاوپەیمانانـدا نەهێشت و بڕیاریانـدا هەرچـی زووتـرە هێـرش بکەنەسەر ناپلیۆن چونکەکەوتۆتە حاڵەتی نائومێدی ولاوازی و خێرا تەفروتونای بکەن.

ڕۆژی دووی دیسمبەری ساڵی 1805، ڕێك یەك ساڵ دوای تاج لەسەردانانی ئیمپراتۆریـەتی نـاپلیۆن لەلایـەن پاپـەوە، لەدەشتاییەکانی سەر بەرزایی پراتزندا کەدەکەوێتە خۆرئاوای گوندی ئوسترلیتز[٥٦٩]، شەڕێکی خوێنـاوی دەسـتیپێکرد، کەلەڕووی گرنگییەوە یەکێکە لەشەڕە گەورەکانی مێژوویی وگەورەترین شەڕەکانی ناپلیۆن.

ناپلیۆن هەرلەسەرەتای شـەڕەکەوە هـەتاکۆتایی سـەرافەتی شـەڕەکەی کـرد، هـەموو مارشـاڵەکانی لەمەیـدانی شـەڕدا ئامادەبوون، تێشکانی سوپای ڕوسیاو نەمسا، هەر لەبەیانییەوە دیاربوو، بەڵام ئەگەر سوپای نەمساو ڕوسیا گرفتاری ئەو بەرزاییانە نەبووبانەوە کەناپلیۆن سەربازی لێدانابوون، بەم جۆرە توشی ئەوکارەساتە سامناکە نەدەبوونـەوە، نـاپلیۆن پێشبینی ئەوەی کردبوو ڕوس ونەمساوییەکان دەیانەوێت ڕێگای ڤێنناو پردی دانوبی لێبگرن، هەتا گەمارۆی بدەن– یان

[169] - ئوسترلیتز: ئاوایەکە دەکەوێتە خاکی چیکوسلۆڤاکیاو کەپێ دەکوترێت ( دۆڵی موراوی) و ناپلیۆن لەوێدا سوپای ڕوسیاو نەمسای بەسەختی تێکشکاند.(و- فارسی)



بەرە كێوستانەكانی خۆرهەڵاتی بڕەتێنن، بۆیە بەپووكەش لای چەپی خۆی وانیشاندا سەربازی فەرەنسی تێدانین، بەڵام كاتێ ڕوسەكان لەلای چەپەوە بەرەوپێشهاتن، ناپلیۆن بەزۆرینەی یەكە سەربازییەكانی خۆیەوە ڕاماڵی كردنێ وتێكیشكاندن. سەربازەكانی فەرەنسی دوژمنیان بەرەو گۆلاوی نیوە بەستەڵەك ڕەتاندن وزۆر تیپی سەربازی ڕوسی لەو گۆلاوانەدا مردن وهەندێكیشیان بەئاگری تۆپەكانی سوپای فەرەنسا كوژران وئەوانی تریش خۆیان دابەدەستەوە، سەربازە سوارەكانی گاردیش لەبەرهەڵمەتی نارنجۆك هاوێژەكانی سوپای فەرەنسا خۆیان ڕانەگرت وزۆربەیان كوژران، ئەفسەرەكانی فەرەنسی لەئازایەتی سەربازەكانی ڕوسیاو دەبەنگی وگەمژەیی فەرماندە سەربازییەكانیان كەهیچ نەخش وپلانێكی شارەزایان لەهونەری شەڕدانەبوو سەریان سوڕمابوو، بەتایبەت لەوەی (بوخوودن) فەرماندەی باڵی چەپی سوپای ڕوسیا كە(29) لەشكری لەدەستدابوو، لەجیاتی ئەوەی بچێت بەهاواری هێزە سەركییەكەیانەوە كەكەوتبۆ تێكشكان، هەموو ئەوكاتە خەریكی هێرشكردنەسەر بنكەیەكی سەربازی فەرەنسی بوو كەهیچ گرنگنەبوو وتەنها چەند سەربازێكی تێدابوون، سەرئەنجام كاتێ بووخوودن، پاشەكشەیكرد، زۆر درەنگبوو وزۆریش نەزانانە ئەو پاشەكشەیەی ئەنجامداو چەندجین هەزاركەس لەیەكە سەربازییەكانی كەوتنەناو گۆماوەكانەوەو خنكان، كەناپلیۆن ئەمەی بینی فەرمانیدا تۆپبارانیان بكەن وئەوەی كوژرا كوژراو خنكا خنكاو سەربازەكانی بەزیندویش مابوونەوە خۆیان بەدەستەوەداو بەدیلگیران.

هەردوو ئیمپراتۆر: واتە فرانسوای نەمساو ئەلكسەندەری ڕوسیا، زۆر پێش یەكلایی بوونەوەی شەڕەكە هەڵاتبوون، تەنانەت هەندێ لەدەستوپێوەندەكانیشیان[170] لەبگرەو بەردەی شەڕدا هەڵاتبوون وئازادببوون، ئەو دوو ئیمپراتۆرە ماوەیەك دوای ئەمە، لەیەكتری جیابوونەوەو هەریەكەیان بەلایەكدا ڕۆیشتن، ئەو ڕۆژە كورتەی زستان لەتەاووبوندابوو، خۆر كەلەپرشنگی بەیانەوە بەردەوام هەتاوەكەی دەدرەخشایەوە ئاوابیبوو، لەوكاتەدا ئەلكسەندەر وفرانسوای ئیمپراتۆر لەلاپاڵێكی دوورەدەست لەتاریكیدا خەریكی دووركەوتنەوەو تێقوچانبوون وترس ولەرز دایگرتبوون.

ئەلكسەندەر كەهەوتببوو لەترساندا دەلەرزی بەبابەڕۆ دەگریا، ڕۆژانی دواتریش هەڵاتن و دووركەوتنەوە درێژەی كێشا. كوتزۆف [171] برینداریببوو وبەزەحمەت توانی خۆی ڕزگاربكات لەچنگ بەدیلگیرانی، كەشەوداهات هەموو شتێك كۆتایی پێهات، ناپلیۆن لەوكاتەی هەموو ژنرال وفەرماندە پلەبەرزەكانی سوپا لەدەوری بوون وسەربازەكانیش لەدوورەوە دەهاتنەلای بەشادییەوە سەلامیان لێدەكرا، سواری ئەسپەكەی بوو وچووە مەیدانی شەڕەكەو سەیری لاشەی سەربازو ئەسپەكانی كرد كەپانتایی مەیدانی شەڕەكەیان داپۆشیبوو، نزیكەی (15) هەزار سەربازی ڕوسی و نەمساوی كوژرابوون، ژمارەی دیلەكان (20) هەزار كەسبوو، هەموو تۆپخانەو چەك و تفاقی سەربازیشیان لێجێمابوو، سوپای فەرەنساش لەكۆی گشتی (80) [172] هەزار سەربازەكەیان (9) هەزاریان كوژرابوون. سبەی پەیامی ناپلیۆن بەم شێوەیە ڕاگەێندرا:

(سەربازەكانم من لێتان ڕازیم، ئەمڕۆ لەئوسترلیتزدا ئەو ئازایەتییەتان نیشاندا كەمن لێم چاوەڕوان دەكردن، ئێوە ئاڵای هەڵۆنیشانی خۆتان بۆ شانازی هەمیشەیی شەكاندەوە، ئەو سوپایەی لەژێر فەرماندەی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیاو نەمسادابوو

---

[170] - دەستوپێوەند: لێرەدا مەبەست لەوكەسانەیە كەشێوە كۆیلەبوون ودەبوا لەخزمەت ئیمپراتۆردا بووبان.

[171] - كوتزوف: پەراوێزی پێشوو.

[172] - لەمەوبەر كوتمان كۆی كشتی سەربازەكانی سوپای مەزنی ناپلیۆن نزیكەی (100 ) هەزار كەسە، بەلام لێرەدا ئەو (20) هەزار سەربازەی لەسەرو ئیتالیابوون هەژمارنەكراوە، (و- كوردی)



لەماوەی کەمتر لەچوار سەعاتدا تێکتانشکاندو تەفروتوناتان کردو ئەوەی لەبەر هەڵمەتی شمشێرەکانی ئێوەش هەڵاتن لەگۆلاوەکاندا[٥٧٣] خنکان)

ئیمپراتۆری نەمسا پەیامێکی بۆ ئەلکسەندەر ناردو تێیدا رایگەیاندبوو، درێژەدان بەشەڕ کارێکی سەرشێتانەیە، ئیمپراتۆری ڕوسیاش، ئەمەی بەڕاستزانی ورازیبوو، ئیمپراتۆری نەمسا نامەیەکی تکاکاری بۆ گفتوگۆکردن بۆ ناپلیۆن نووسی وناوبراویش ڕازیبوو لەنزیك ئوسترلیتزدا چاوی بەئیمپراتۆری نەمسا بکەوێت.

هەڵسوکەوتی ناپلیۆن لەبەرامبەر فرانسوادا بەئەدەبانەبوو، بەلام یەکەم قسەی ئەوەبوو سوپای ڕوسیا خاکی نەمسا جێبێڵێت، ئینجا ڕایگەیاند جگەلە نەمسا ئاشتی لەگەڵ هیچ لایەنێکی تردا ناکات، بەدڵنیاییەوە ئیمپراتۆری نەمسا هەموو مەرجەکانی ناپلیۆنی قبوڵکردن، بەم جۆرە هاوپەیمانیەتی سێیەم تەمەنەکەی کۆتایی هات.

(4)

لەنیوەی دووەمی مانگی نۆڤەمبەرو سەرەتای مانگی دیسەمبەردا ویلیام پیتی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا چاوەڕوانی هەواڵی شەڕی دەکرد، ویلیام پیت کەدامەزرێنەری هاوپەیمانی سێیەم بوو، دەیزانی ئیتر بریتانیا بۆماوەیەکی نیمچە دووریتر ڕووبەڕووی شەڕی داگیرکردنی بریتانیا لەلایەن ناپلیۆنەوە نابێتەوە، چونکە جگەلەمەش لە(21/ی ئۆکتۆبەری سالی 1805) یشدا لەشەڕێکی دەریایی ترافالگار[٥٧٤] لێپرسراوی دەریایی بریتانیا (نلسن) هێرشی کردبۆسەر هێزی دەریایی هاوبەشی فەرنساو ئیسپانیاو تێکیشکاندبوون، ناوبراویش[٥٧٥] لەوشەڕەدا تێداچوو بوو، ئیتر ناپلیۆن کەشتی جەنگی تەواوی نەمابوون، بەلام ویلیام پیت لەشتیتر دەترسا، هەموو بڕوازیەتی بریتانیا دەیانگوت کارەکە نەگەیشتۆتە بنبەست وبەبەریەوەماوە، چونکە ناپلیۆن دەیەوێت بازرگانەکانی بریتانی لەناوبازاڕەکانی وڵاتانی ئەوروپایی کەبەشێوەی ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ دەسەلاتی بەسەریاندامەیە دەربکات، جگەلەمانەش وڵاتانی پڕ پیت و بەرەکەتی ئەوروپا کەخاوەنی کەنداو وبەندەری وکاخانەجاتی دەریاییە دەتوانێت کەرەستەی جەنگی وکەشتی تازە دروستبکات وجارێکیتر ناپلیۆن سوپا بێنێتەوە هۆردووی بۆلنی.

کارەساتی خۆبەدەستەوەدانی ماك لەئولمداو گەیشتنی ناپلیۆن بەڤێناو دەستبەسەرداگرتنی پردی دانوب وپاشەکشەکردنی[٥٧٦] کوتزوف لەبەرامبەر سوپای فەرەنسادا، بەتوندی کاری کردبۆسەر ویلیام پیت، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڕازیبوونی پروس بۆ هاتنەناوەوەی هاوپەیمانی سێیەم وشەڕکردنی دژی ناپلیۆن تروسکایی ئومێدی لەدڵی ویدا دروستکردبوو، لەوڵاتی دوورە دەستدا(مورافی) لەنزیك ئولموتزدا، دەبوا ئەوشتە ئالۆزو تەماویە ڕوونبێتەوە داخوا ئایا ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن لەداگیرکردنی نیوەی ئەورووپاوە سەرەونگون دەبێت- یان نیوەکەی تری ئەو کیشوەرەش دەکەوێتە

---

[173] - - گۆلاو: مەبەست لەگۆمی قوڵی ڕاسوەتاوە هەندێکیان پەنداو دەدەنەوە، واتە هیچیان لەبەرناڕوا،(و- کوردی)

[174] - ترافالگار: ناوی ئەو شوێنەیە کەشەڕەکەی تیاکراوە،

[175] - ناوبراو: مەبەست لە(نلسن)ە فەرماندەیەکی سەربازی دەریایی بریتانیابووە کەسەرکردایەتی شەڕی ترافالگاری کردووە،

[176] - پاشەکشەکردنی: سەرۆك وەزیرانی بریتانیا تائەوکاتەش هەواڵی تێشکانی سوپای نەمساو ڕوسیای نەزانیوە، یان باشتر وایە بڵێین پێنەگەیشتووە. (و-کوردی)



دەست ئەو؟ سەرئەنجام ڕۆژنامەیەکی هۆڵەندی ئەم ڕووداوە شومەی سەرکەوتنی سوپای فەرەنسای بڵاوکردبۆوە، گەیشتە لەندەن.

لەکۆبوونەوەکانی پەرلەماندا بەتوندی سەرزەنشتی ویلیام پیتیان کردوو وسەرکۆنەی ئەو بۆچوونە عاقیبەت خراپەیاندەکرد، هەندێك لەوئەندام پەرلەمانانەی دژی ویلیام پیت بوون، داوای دەست لەکارکشانەوەی ئەویان دەکرد وسووریشبوون لەسەرئەمە، هەتا شکۆمەندی بریتانیا لکەدارنەبێت، ئەو پارەو زێڕەی بریتانیا کەبەملیۆن ملیۆن درابوو بۆ دروستکردنی هاوپەیمانی سێیەم وئێستا لەدەست سەرداری نالیۆەشاوە دایەو دەبێ بگێڕدرێتەوە.

ویلیام پیت کەبەرگەی ئەم فشارو نامرادیەی نەگرت نەخۆش کەوت و کەوتەسەر جێگاو دوای چەند هەفتەیەك لە(23/ی یەنایەری سالی (1806)دا مرد.

شەڕی ئوسترلیتز – وەك خەڵکی ئەو ڕۆژگارە بەدەمیانەوە گرتبوو ودەیانگوت (سەرسەختترین ولێوەشاوەترین دوژمنی ناپلیۆنی لەناوبرد)

کابینە تازەکەی حکومەتی بریتانیاش کەبەسەرۆکایەتی (فوکس) پێکهێنرا، بڕیاریدا پێشنیاری ئاشتیکردن بۆناپلیۆن بکات، سەرکەوتنی ناپلیۆن بێکەم وکوڕی بوو، ئەو مەرجی ئاشتی کردنی خۆی نووسراو دیاریکراوبوون و چ ئەوانەی لەشەڕدا دۆڕابوون و چ ئەو وڵاتانەش بەبێلایەن بوون، بەدەستەوەستانی لەبەردەمیدا کەوتبوونەوە، ئەو زۆر بەوریاییەوە کەڵکی لەسەرکەوتنەکانی خۆی وەردەگرت.

سەرئەنجام هوگویتز، دیپلۆماسی پروسی کەپەیامی ناڕەزایی دەربڕینی فریدریك ویلهلمی پێبوو، دوای بڕینی ڕێگایەکی دوورو درێژ گەیشتە ڤییەنناو یەکەم شتی کەویستی بیرخۆی بباتەوە، نەگەیاندنی پەیامەکەی بوو، ئەو بەزەردەخەنەکردنەوە چووەلای ناپلیۆن وکڕنوژی بۆبردو بەبۆنەی سەرکەوتنی لەشەڕدا پیرۆزبایی لێکرد، ئەویش وەك پاشاکەی خۆی کەئەو کردەوە گەمژانەی دوایی خۆی بەسوێند [٥٧٧] خواردن لەسەر گۆڕی فریدریکی دووەم، ترسی لێنیشتبوو، هوگویتز بەم جۆرە کەوتە دوان:(من پیرۆزبایی لەسەرکەوتنی بەڕێزتان دەکەم ..) بەڵام ناپلیۆن قسەکەی پێ بڕی وگوتی:(ڕێکەوت پیرۆزبایی کردنەکەی ئێوەی گۆڕی) ناپلیۆن سەرەتا دەستیکرد بەهاوارو تووڕەبوو وگوتی ئاگام لەهەموو هەست وخوستێکی پاشای پروسە، بەڵام دواتر ئامادەیی خۆی نیشاندا لەگوناهەکانی ئەو ببورێت و ڕابردوو لەبیربکات، بەمەرجێك دەوڵەتی پروس بەم مەرجانەی خوارەوە پەیمانی یەکێتی لەگەڵدا ببەستێت، دەبێ دەوڵەتی پروس، دوك نشینی ئانشپاخ بداتە باویرو خاکی شازادە نشینەکانی نوشاتڵ وکلوو شاری وزلیش بداتە فەرەنسا، لەبەرامبەردا ناپلیۆن ولایەتی هانور کەهێزەکانی فەرەنسا هەر لەسالی (1803)وە لەوێدان وئەو ولایەتە بەئەسڵ ملکی پاشای بریتانیایە، دەداتەوە پروس.

هەروەها دەبێ دەوڵەتی پروس شەڕ لەدژی بریتانیا ڕابگەیەنێت، هوگویتز، هەموو ئەو مەرجانەی ناپلیۆنی لەئەستۆ گرتن وپاشاکەشی بەمەخۆشحاڵبوو کەئاوا بەوەندە، لەدەست ناپلیۆن ڕزگاری بوو، دەوڵەتی (باویر) کەهاوپەیمان بوو لەگەڵ فەرەنسادا ولایەتی تیرۆلی لەنەمساو دوك نشین ئانشپاخیشی لەپروس ستاند، بەڵام ناوچەی بەپیت و پیشەسازی (برگی) دایە

---

[177] - مەبەست لەوسوێند خواردنەی ئیمپراتۆری ڕوسیاو پاشای پروسە کەبۆ هەمیشە هاوپەیمانی یەکتری
و- کوردی



ناپلیۆن، سەرئەنجام نەمسا سەرتاسەری ولایەتی ونیزی دایە ناپلیۆن پاشای ئیتالیا [١٧٨]، بەمجۆرە نەمسا یەك لەسەرشەشی دانیشتوانی خۆی کەدەکاتە (4) ملیۆن کەس لە(24) ملیۆن لەدەستدا، یەك لەسەر حەوتی داهاتی خۆیی وخاکێکی زۆری ولاتەکەی لەدەستدا، ئەمە جگەلەوەی دەبوا(40) ملیۆن فلورنیش زێر بداتە ناپلیۆن، پەیمانی ئاشتی لەبەرواری(26/ی دیسامبەری سالی ( 1805) لەپرسبورگدا مۆرکرا.

چەند ڕۆژێك پێش ئەم ڕێککەوتننامەیە هاوپەیمانیەك لەنێوان ناپلیۆن وپاویرو ورتمبرگ و باد دا مۆرکرابوو.

ئەو کاروانە بێکۆتاییەی کەلەنەمسادا وەدەست کەوتبوو بەرەو ئیتالیاو فەرەنسا کەوتەڕێ، لەم دەستکەوتانەش:(2) هەزار تۆپ وزیاترلە(100) هەزار تفەنگ کەلەعەمبارەکانی دەولەتی نەمسا دەرهێندرابوون– یان لەبەرەکانی شەردا دەست سوپای فەرەنسا کەوتبوو، بەلام ناپلیۆن خۆی بۆئەنجامدانی کارێکیتر یەکلایی نەکردەوەو نەمسای لەدەستوپێ کەوتووی جێنەهێشت.

لەئۆکتۆبەری سالی (1805)دا دوای شەڕەکەی ترافالکار [١٧٩]، فردینان پاشای ناپولی وهاوسەرەکەی کارولین، بەبینینی ئەو خەونە خۆشەی کەسەرئەنجام ناپلیۆن تێکشکاوە، پەیوەندیان لەگەل بریتانیاو ڕوسیادا بەستبوو، بنەمالەی بوربنەکانی ناپول ستەمی ناپلیۆنیان بەمەلول وسەنگەسارییەوە بەرگەگرتبوو ونەفرەتیان لەئەودەکرد، ماری کارولین شاژنی ناپولی وخوشکی ماری ئانتوانیت [١٨٠]، دەمێکبوو داخ لەدلی فەرەنساو کینەیان لەناپلیۆن هەلگرتبوو، تەنانەت لەڕووبەڕووی ئالکیەی نوێنەری فەرەنسا لەناپولی دەیگوت: هیوادارم دەولەتی ناپولی ببێتە کبریت وئاگرێکی گەورە بەرپابکات.

ئالکیەش جارێکیان ئاوا وەلامی دایەوەو گوتی: ئەگەر وابێ پێش هەموو شتێك شخارتەکە خۆی دەسوتێت، لەڕاستیدا دوای سەرکەوتنە گەورەکەی ئوسترلیتز، ئەو کبریتە [١٨١]لەچاو تروکانێکدا سوتا، شانشینی ناپۆل باجی ئەو هەلەیەی بەشێوەیەکی کارەساتاویدا، ناپلیۆن گوتی نابێ بنەمالەی پاشایەتی بوربنەکان لەناپۆلیدا بمێنن وفەرمانی دەرکرد خاکی ئەو ولاتە داگیربکرێت، بنەمالەی پاشایەتی ناپۆلی بەپەلەپروزاوان لەژێر چاودێری هێزە دەریاییەکانی بریتانیا بۆ سیسل هەلاتن وماوەیەك دوای ئەوە ناپلیۆن براکەی خۆی جوزێف بەپاشای ناپولی دەستنیشانکردو پلەو پایەی سەربازیشی دایە، هەندێك لەوسەربازانەی کەقارەمانیەتیان لەگرتنی ناپولیدا نواندبوو، تەنانەت چەند کەسێکی دووپلەش بەسەرخست، ئینجا بەرەو پاریس درێژەی بەڕۆیشتن داو لە(26/ی یەنایەری سالی (1805)دا لەناو ئاپۆرەی پێشوازی کردن وشادمانی دەربڕینی خەلکدا گەیشتەوە کۆشکی تویلری، کەمێ دوای گەیشتنەوەی هەوالی ئەوەیان پێگەیاند کەدوژمنی سوێندخۆری سەرسەختی، سێ ڕۆژپێش گەڕانەوەی بۆپاریس مردووەو [١٨٢] بریتانیا دەیەوێت ئاشتی لەگەل فەرەنسادا بکات.

---

178 - ناپلیۆن پاشای ئیتالیا: لێرەدا نووسەر مەبەستی لەبەکارهێنانی ئەم ڕستەیە کەئەوە وەبیرخوێنەر بێنێتەوە کەناپلیۆن لەمەوبەر خۆی بە پاشای ئیتالیاش دانابوو وئەمەی بەرەسمی ڕایگەیاندبوو،

179 - ترافالکار: پەیراوێزی پێشو، (و- کوردی)

180 - ماری ئەنتوانێت: شاژنی فەرەنسایەو ژنی لویسی شازدەهەمە کەلەسەردەمی شۆڕشی گەورەدا بەگیوتین ملیان پەڕاند،

181 - کبریت: مەبەست لەناپۆلیە. هەروەها وشەی کبریت: لەبری وشەی شخارتە دانراوە نەك بەمانا کانزاییەکەی،

182 - مردووە، مەبەست لەویلیام پیتی سەرۆك وەزیرانی بریتانیایە. ( و- کوردی)



ئیتر لەمەودوا ناپلیۆن دەیتوانی خۆی بەشارلمانی ئیمپراتۆری خۆرئاوا بزانێت، جەژن وئاهەنگ ومیوانداری وشەوگار بەسەربردن وشادی بەردەوام لەکۆشکەکەی ناپلیۆندا بەرپابوو، زۆرە میرو شازادەی ماستاوچی کەحەزیاندەکرد ببنە جێگای سەرنج وسۆزی ناپلیۆن، وەك خوا دەیانپەرست وتوزەلەی بێ شەرمانەی بەشان وباڵ هەڵگوتنی ناپلیۆنیان لێدەدا.

(5)

دوای مردنی ویلیان پیتیش ناپلیۆن ئومێدی بەگۆڕانی سیاسەتی بریتانیا نەبوو، بەڵام کاتێ فوکس کەلەبەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەکیدا رکەبەری پیت بوو، گەیشتە ئەوئاستەی وردەوردە لەئەورووپادا دەماودەم خەڵك مقۆمقۆی ئەوەیان دەکرد ئاشتی نێوان بریتانیاو فەرەنسا نزیکبۆتەوە، لەڕاستیدا دانوستان دەستی پێکردو فوکس لورد یارموتی بۆ درێژەپێدان بەگفتوگۆکردن نارد بۆپاریس، ناپلیۆن بەهیچ جۆرێ باوەڕی بەڕاستی ئاشتی کردنی بریتانیا نەدەکرد، لەمانگی فبرایەری ساڵی (1806)دا پروسی ناچارکردبوو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ بریتانیادا بپسێنێ، تەنانەت ناپلیۆن خەریکی ئەوەبوو پروس پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕوسیاشدا نەهێڵێت، هەتا لەپڕ زەبرێکی گەورە لەپروس بوەشێنێت، پاشای پروس لەهەمان سەرەتای ساڵی (1806)دا وردەوردە هەستی بەوەکرد پەنجەی خستۆتە ناو چ لانەی زەرگەتەیەکەوە.

بێ گومان ناپلیۆن لەئەو بوردبوو وواشی نیشاندابوو پروس لەگەڵیدابێت بەهاوپەیمان وپەیمانیشی دابویە ولایەتی هانووریشی بخاتەژێر دەسەڵاتی، بەڵام کاتێ بریتانیا لەمە ئاڕەزایەتی خۆی دەربڕی شەڕی لەگەڵ پروسدا ڕاگەیاند، ناپلیۆن دەستی لەولایەتی هانوور هەڵنەگرت وهێزە سەربازییەکانی خۆی لەوێدا هێشتنەوە، لەوکاتانەدا فریدریك ویلهلم هەوانی چوونی لورد یارموتی بیست بۆپاریس وئەوەشی بیست ناپلیۆن بەو نوێنەرەی بریتانیای گوتووە ئەگەر وڵاتەکەی ئەو[183] ڕازیبێت بەومەرجانەی ناپلیۆن هەیەتی، ئەوا ولایەتی هانوور دەداتەوە پاشای بریتانیا، پاشاو دەوڵەتی پروس بۆیاندەرکەوت تا چ ئاستێ فریویان خواردووە، ئیتر توڕەیی ونەفرەت بەتایبەت لەبەرامبەر ئەو کەسانەی کەپێشنیاری ئەوەیان بۆ فریدریك کردبوو نەچێتەناو هاوپەیمانی سێیەم، ئەو دەستەیە دەیانگوت ئەگەر بیانتوانیبا ڕێگری لە ڕوودانی کارەساتەکەی ئوسترلیتز بکەن ئەوا تائەوکاتەش پروس لەتوانایدابوو وئەوا ئەمڕۆ دووچاری ئەوەنەدەبۆوە بەتەنها ڕوو بەڕووی ناپلیۆن بێتەوە.

لەو ڕۆژانەدا ناپلیۆن بڕیاریدا هاوپەیمانی (ڕن) دروستبکات ودەسەڵاتی ڕەهای خۆی بەسەر خۆرئاوای ئەڵماندا بچەسپێنێت وشێوەی قانونی پێبدات، لەنیوەی ساڵی (1806)دا ئەم هاوپەیمانیەتییە دروستبوو وپەیڕەو دەستووری ئەو لە(12)ی ژوئیەدا ئەو میرنشینانەی ئەڵمانیای خۆرئاوا لەژێر ڕێنمایی ناپلیۆندا، مۆرکرا.

ئەم وڵاتانەش بریتی بوون لە: باویر، وورتمبرگ، ڕاتیسبن، دوك نشینی گەورەو بادو هس ودارمشتات و دوك نشینی ناسو وهەشت میرنشینی تری ئەڵمانی، ئەو هاوپەیمانیەتییە ناپلیۆنیان وەك ئیمپراتۆری پارێزەری خۆیان ناساندبوو وبەڵێنیاندابوو ئەگەر شەڕ ڕوویدا ئەوا (63,000) سەرباز بخەنە ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆن، زۆر میرنشینی سەربەخۆ، کەلەژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بنەماڵەی هابسبورگدا بوون، ئیتر لەمەودوا سەربەهاوپەیمانی (ڕن)بوون کەملکو ماڵەکانیان کەوتبۆ خاکی ئەو دەوڵەتانە، بەوجۆرە فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی نەمسا لەسەر ئەڵمان وچەندین شانشینی سەربەخۆش کەبە(ئیمپراتۆری

---

183 - وڵاتەکەی ئەو: واتە بریتانیا.



پیرۆزی ڕۆم وئەڵمان) ناودەبران، بەشێوەیەکی واقیعی چۆنیایەتی خۆیان لەدەستداو ئیمپراتۆری ئەمساش کەناپلیۆن بەڕاشکاوانە داوای لابردنی ئەم ناوەی لێکردبوو قبوڵیکرد، کەئەم نازناوە هەزارساڵبوو هەبوو[١٨٤].

ئەم زیادڕەویەی ناپلیۆن کەزۆر خاکی تری بەبەهانەی هاوپەیمانیەتی (ڕن) هێنایە ژێر ڕکێفی خۆی تەواو ئەڵمانیای گرژو تورەکرد، ئەو هاوپەیمانیەتییە ناپلیۆنی هێنایە ناودڵی خاکی ئەڵمانیاوەو هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆبوو بۆسەر هەموو خاکی پروس.

بەتایبەت مەترسییەکە لەوەوە زیاتر تینی هێنا، ناپلیۆن لەگەڵ دروستکردنی هاوپەیمانیەتی (ڕن) کۆمەڵێ دەسەڵاتداری لەچەند شوێنێکدا وەك میرو پاشا دانان، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند دەیەوێت بەشێوەیەکی شاراوە پانتایی ئیمپراتۆریەکەی بەرفراوانتربکات، لە(15/ی مارسی ساڵی 1806)دا مورا بەفەرمانڕەوای خاکی دۆکی گەورە دانرا، لە(30/ی هەمان مانگدا جوزیف بوناپارت کرابە پاشای ناپول ومارشال برتیەش بووبە فەرمانڕەوای دوك نوشاتل، لە(5/ی یۆلیۆدا، یەکێکیتر لەبراکانی بەناوی لویس بۆناپارت کرابە پاشای هۆڵەنداو تالیرانیش وەزیری دەرەوە کرابە پاشای بنوان ومارشال برنادوتیش کرابە شای پونتەکورو، کەدەکەوێتە خوارووی ئیتالیاوە، هەموو ئەو پاشاو میرانە تەنانەت وەك میرنشینەکانیش لەژێر پارێزگاری ناپلیۆندا نەبوون، بەڵکو ئەوانە نوێنەر-یان دەسەڵاتدارانێك بوون کەڕاستەوخۆ سەربە ناپلیۆن وملکەچی فەرمانەکانی ئەوبوون وهەموو ئەورووپاش ئەم ڕاستیەی دەزانی، لەوکاتانەشدا ناپلیۆن خۆی بۆشەڕ ئامادەکرد، لەمانگی یۆلیۆدا، دوای دروستکردنی هاوپەیمانیەتی (ڕن) بەپەرلەمان وئەنجومەنی جێبەجێکردنی ڕاگەیاند کەئێستا خاوەنی یەك سوپای (250) هەزار کەسیەو کەلوپەل و پێداویستی ئەوانیش، بێئەوەی قەرزبکرێت- یان لەبودجە کەمبکرێتەوە دابین کراوە، ناپلیۆن پێویستی بەوەبوو(200) هەزار سەرباز لەم بەراوبەری ڕووباری ڕن ولەدەوڵەتە هاوپەیمانەکانی ئالزاس ولورندا جێگیربکات، پروپاگەندەی ئەوەبڵاوبۆوە گوایا ناپلیۆن دەیەوێت خاکیت رداگیربکات وبیخاتەسەر ئیمپراتۆریەکەی، لەشەشی یۆلیۆدا دیپلۆماسێکی ڕوسی بەناوی دوبریل لەلایەن ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاوە بۆپاریس نێردرا بەبەهانەی دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ سەبارەت بەکێشەی بەندەری کاتارو[١٨٥].

بەڵام لەڕاستیدا ئەو تەتەرە بۆئەوە نێردرابوو داخوا ئەگەری ئاشتی کردنی ناپلیۆن لەگەڵ بریتانیادا هەیە- یان نا؟

دوو هەفتە دوای گەیشتنی ئەو دیپلۆماسە ڕوسیە، تالیران بەوپەڕی وریاییەوە توانی پەیمانی ئاشتی کردن لەگەڵ ڕوسیەدا بەئیمزای ئەو دیپلۆماسە ڕوسە مۆربکات وبێنێتەپێش، ئیتر ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا کەوتە چاوەڕوانی ئەوەی بۆی ڕوونبێتەوە داخوا ئەو ڕێککەوتننامە سەرەتاییەی لەنێوان دیپلۆماسەکەی لردیارموت و فەرنسادا بەستراوە قبوڵبکات – یان نا.

بەڵام ئاشتی کردن لەگەڵ بریتانیادا ئەستەم بوو، بەرژەوەندییە ئابووریی وسیاسییەکانی چینی دەسەڵاتداری بریتانیا بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو دیکتاتۆریەی ناپلیۆن کەدەسەڵاتی بەسەر نیوەی ئەورووپادا هەبوو بسازێت، ناپلیۆن لەگفتوگۆکاندا نەك هەر ئامادەنەبوو ئیمتیازبدات بەبریتانیا، بەڵکو وێنای ئەوەیکرد بریتانیا میسرو سوریاو.. هیتر، دەست لێهەڵگرێت.

---

[١٨٤] - مەبەست لەئیمپراتۆریەتی نەمسایە کەلەهەزار ساڵ لەمەوبەرەوە ئەو نازناوەی هەبووە، بەڵام ناپلیۆن ناچاریکرد ئەو نازناوە لەسەرخۆی لابدات،

[١٨٥] - کاتارو: بەندەرێکە لەسەر دەریای ئادریاتیك وسەربە وڵاتی یوگسلافیایە.(و- کوردی)



کەفوکسی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا لە(13/ی سێپتەمبەردا مرد، لەماوەی یەك رۆژدا ئەم هەواڵە بەسەرتاپای ئەوروپادا بڵاوبۆوە، لە روسدا حزبێك کەخوازیاری شەڕکردن بوو لەگەڵ ناپلیۆندا سەری قوتکردەوە، ئیتر ڕوونبۆوە ئیتر نەڕوسیاو نەبریتانیاش ئامادەنین ئاشتی لەگەڵ فەرەنسادابکەن، فریدریك ویلهلم کەتەواو سەری لێسوڕمابوو ونەیدەزانی چی بکات، لەبیستنی هاتنەوە گۆڕێی هاوپەیمانیەتی دژی ناپلیۆن خۆشحاڵبوو، لەهەمان ڕۆژی مردنی فوکسدا بڕیاریدا سوپاکەی بنێرێت بۆ ساکس، سێ هەفتە دوای ئەمە هەموو ئەو هەواڵەیان زانی ئیسپانیاش بۆ سەرکەوتنی ئەم هاوپەیمانیەتییە ئامادەیە پەیوەندی بەو هاوپەیمانیە چاوەڕوانکراوەی نێوان ڕوسیاو پروس و بریتانیا بکات وگفتوگۆی نهێنی لەنێوان دەرباری ئیسپانیاو فریدریك ویلهلمدا دەستی پێکرد، ڕق وکینەو داخ کەوتە دڵی نەجیبزادەکان وهەندێك لەبرژوازییەکانی مەملەکەتی پروس وپاشایان بەخیانەتکارو ترسنۆك ودەبەنگ ناودەبرد، ئەرستۆکراتەکان نەفرەتیان لەناپلیۆن دەکردو ئەویان بەبەرپرسی نەهێشتنی شاو میرنشینی لەئەوروپادا دەزانی، برژوازیەتی پروس بەوردی تێبینی ئەوەیان دەکرد چۆن ناپلیۆن لەبەرژەوەندی برژوازیەتی فەرەنسا قۆرخی بازاڕەکانی ئەو شوێنانەی کردووە کەکەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەناو ئەفسەرو سەربازەکانی فەرنسادا، ڕۆحی بوغزو کینەسۆزی وتۆڵەسەندنەوەو خیانەت و... بڵاوبۆوە.

شاژن لوئیز ڕابەرایەتی ئەو حزبە ئەرستۆکراتی وسەربازیەی دەکرد، لەڕوسیاو بریتانیاوە کەلەوکاتەدا خەریکی گفتوگۆی ئاشتی بێ ئاکام بوون، پیرۆزبایی وبەڵێن وپەیمانی دڵخۆشکەرە دەگەیشتنە ئەو حزبە.

هۆی سەرەکی خۆیەکلایی کردنەوەی پروس بۆشەڕکردن لەگەڵ فەرەنسادا ئەوەبوو دەیانگوت– یان پێیانوابوو چەند زیاتر ئیمتیازبدەن بەناپلیۆن ئەو زیاتر هەڕەشە دەکات وڕێککەوتن لەگەڵیدا کەڵکی نییە، بڕیاریدا نامەیەك بۆ ناپلیۆن بنێرن وداوای ئەوەی لێبکەن سەبارەت بەدەوڵەتی پروس چ نیازێی لەداڵدایە؟ ئیمپراتۆری فەرەنسا وەڵامی ئەو نامەیەی نەدایەوە.

سوپای پروس کەوتەڕێ، ئەو تیپە سەربازیانەی کەبەرەو خۆرئاوا دەبۆوەو بەناو بەرلین وماگدبورگدا تێدەپەڕی و سرودی نیشتمان پەروەرانەیان دەگوتەوەو شاژن لوئیز بەپێشوازیانەوە دەچوو و وورەی زیاتری وەبەردەهێنان، فریدریك ویلهلم پاشای پروس بۆ پەیوەستکردنی بەسوپاوە کەلەدەوروبەری ملگدبورگدا دامەزرابوون، چوو ولەوێدا یاداشتێکی بۆ ناپلیۆن ناردو لەونامەیەدا داوای لەناپلیۆن کردبوو دەبێ یەکە سەربازییەکانی فەرەنسایی لەسەر خاکی پروس پاشەکشەبکەن، لەوەڵامی ئەو نامەیەدا ناپلیۆن بەسەر مەرزی ساکسدا تێپەڕی و زیاتر هاتە ناوێ.

# تێکشکانی پروس وملکەچبوونی تەواوی ئاڵمان(1806-1807)

(1)

ناپلیۆن لە(8/ی ئۆکتۆبەردا فەرمانی داگیرکردنی ساکسی دەرکرد کەهاوپەیمانبوو لەگەڵ پروسدا، سوپای مەزن لەسەردەمی ڕێککەوتننامەی ئاشتی پروسبورگەوە لەباویزدا جێگیرببوو، لەسێ قۆڵەوە سنووری ساکسیان بڕی ولەپێشەوەی سوپا سەربازە سوارەکانی مارشال مورا دەڕۆیشتن وناپلیۆنیش بەهەموو هێزەکەیەوە لەپشتییەوە دەڕۆیشت، ژمارەی سوپای مەزن لەوکاتەدا نزیکەی (195) هەزار کەس بوون، بەو سەربازە تازە گیراوانەی کەلەپشتی بەرەی شەڕەوە بەپەلە مەشقیاندادەدرا، بەڵام هێزی سەربازی پروس (175 –بۆ180) هەزار کەس بوون.

بۆ درککردن بەوکارەساتەی کەبەسەر سوپای پروسداهات لەچەند ڕۆژێکدا مەسەلەکە ڕێژەی زۆرتری سەربازی ناپلیۆن نەبوو کە(15بۆ20) هەزار سەربازبوو، نەفەرماندەیی ونەخشە بۆکێشانی سەربازی گەورەو سەردارانی سەربازیش، بەڵکو شەڕبوو لەنێوان دوو سیستمی کۆمەڵایەتی وئابووری لێکجیاواز، دوو ڕژێمی سیاسی ودوو تاکتیك و دوو پێکهاتەی سوپا، بەڵکو ئەمانە دوو شتی دژەیەك بوون، لێدانی دەوڵەتێکی شانشینی فیودالی سەرکوتکەرو دواکەوتوو لەڕووی پیشەسازییەوەو خاوەن تەکتیکی سەربازی بیدایی، لەبەرامبەر دەوڵەتێك کەبەیارمەتی شۆڕشی بۆرژوازی زۆر گۆڕانکاری بنچینەیی لەپێکهێنانی ڕژێمەکەیدا دروستبوون وبەرەی شانشینی وفیودالی لەژێریان دەرهێناوەو نەهێشتووە، ئێمە پێشتر باسمان لەشێوازی پێکهاتەی سوپای ناپلیۆن کرد، بەڵام سوپای پروس ئاوێنەو ڕەنگدانەوەی دەوڵەتەکەی بوو کەلەسەر بنەمای سرواژ دامەزرابوو، سەربازەکانی پروس دێهاتی بوون نیوەکاری زەوییەکانی فیودالەکان بوون ولەژێر زەبروزەنگی ئاغاکانیانەوە هاتبوون بۆژێر فشاری مەشقی سەربازی و زۆر ستەمی مەشقە سەربازییەکان بەبەکارهێنانی شمیشێری دەم پان و...هیتر، ئەو کۆیلانەبوون بەزەبری تێهەڵدانی پڕتینی ئەفسەرەکان وملکەچی فەرمانی سەربازی بکرێن ودەکران، ئەوانە دەیانزانی چەند بەئازایەتی دلێرانە شەڕبکەن هیچ لەئازارەکانیان کەم نابێتەوەو هەردەچەوسێندرێنەوە، ئەفسەر دەبوا نەجیبزادەبا دەنا ئەو پلەیەی نەدەدرایە، جگە لەمانەش هەتا ئەو ئەفسەرانە پیر نەبووبان نەدەگەیشتنە پلەی ژنرالی.

تانیوەی سەدەی هەژدەهەم ئەم دابونەریتە کۆنانە نەك هەر لەسوپای پروسدا بەڵکو لەهەموو سوپای دەوڵەتانی ئەورووپادا باوبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فریدریك[186] ی دووەم توانیبووی لەماوەی ئەوشەڕە حەوت ساڵەی فەرەنسی وپروس ونەمساویەکاندا خۆی بەسەرکەوتویی بێڵێتەوە، هەرچەندە جارجاریش توشی شکستی گەورە دەبۆوە، فریدریکی دووەم تێبینی ئەوەی کردبوو مەشق وڕاهێنانی بێ بەزەییانەی سەربازەکان وستەمکردن لێیان، دەتوانێت بەڕق وکینەوە ئەمانە بچنە مەیدانی شەڕ: جارێکیان ناوبراو بەیەکێك لەنزیکترین فەرماندە سەربازییەکانی خۆی گوتبوو (سەیرترین شت بەلای منەوە

---

[186] - فریدریکی دووەم: باوکی ویلهلمی پاشای پروسەو پێش شۆڕشی فەرەنسی حوکمڕانی پروسی کردوە. (و- فارسی)

ئەوەیە من وتۆ لەناو هۆردووی سەربازگەکانی خۆماندا ئاسایشمان پارێزراوە) ئیتر ئێستا چل ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژگارەدا تێپەڕیبوو وڵاتی پروس هەمان وڵاتی پروس بوو وتەنها جیاوازیش ئەوەبوو فریدریکی گەورە نەمابوو ولەجێگای ئەودا (دوك دو برونسویك)ی ناڵێوەشاوەو بەناو ژنراڵەکانی کەکەسایەتییەتی لاوازیان هەبوو، فەرمانڕەوابوون.

ئەرێ ئەوە دەسەڵاتدارانی پروس، لەو ڕۆژگارە ئاقیبەت ڕەشەدا چیان لێهاتووە؟ فریدریك ویلهلمی سێیەم کەساڵێك لەمەوبەر، لەشەڕکردن لەگەڵ فەرەنسادا، شانبەشان لەگەڵ بریتانیاو ڕوسیادا زەندەقی چووبوو، ئێستا چۆن واغیرەتی جوڵاوەو دەیەوێت شەڕ لەگەڵ ناپلیۆندا بکات؟ پێویستە ئەو ئازایەتی وغیرەتەی ئەو پێش هەموو شتێك لەڕووی مەینەتبارییەوە سەیربکرێت، چونکە ئەو بارودۆخەی ئەو تێیدابوو بۆخۆشی دڵنیابوو لەوەی بەردەوام بوونی لەسەر ملکەچ کردنی تەواوی بۆ ناپلیۆن ناتوانرێت درێژە بکێشێت و ڕزگارییێت وهەرچۆنێکبێت ناپلیۆن هێرشدەکاتە سەری، بەڵام ئەفسەرو ئەرستۆکراتە پلەیەکەکانی پروس خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی و لاقی ئەوەیان لێدەدا دەرسێکی تاڵی ئەوپیاوە شەڕانگێزەی خەڵکی کرسی[٥٨٧] دادەدەن کەبکوژی دوك دانگین وسەردەستەی (دەلینگ شۆرەکان[٥٨٨])ە.

ئەوانە لەناو خۆیاندا دەیانپرسی بۆ ناپلیۆن تائێستا بەسەر کێدا سەرکەوتووە؟ نەمساوی ترسنۆکی هەمەنەژاد؟ وەحشییەکانی وەك تورکی عوسمانی وشانشینی میسر؟ ئیتالیایی نەفس نزم؟ ئایا ئەو سەرکەوتنانەی کەشانازی پێوەدەکات لەکاتی تێکهەڵچوون لەگەڵ سوپای پروسدا نابێتە دووکەڵ وبەئاسمان هەڵناچێت؟ پاشای پروس و ئەفسەران وفەرماندە پلەبەرزەکان وئەشرافەکان وخودی شاژن لوئیزیش، هەموویان بەهۆی گەوجی وخەیاڵ پڵاویان و کەش وفشی باوەڕپێنەکراو پێشوەخت مەحکومی تێشکان ببوون، ئەمانە ئامادەنەبوون دان بەو واقیعەدابنێن کەتەنها فەرەنسانییە بوبێتە سەرچاوەی بەهێزی سەربازی وساماندارى ناپلیۆن، بەڵکو ئەو چەندین وڵاتی گەورەو دەوڵەمەندی ژێر دەستەی خۆی هەبوون کەدەیتوانی هێزو توانای لێوەربگرێت، ئەمانە پێیانوابوو هەرکە سوپای پروس هێرشێکی بەهێزی کردەسەر ناپلیۆن وتێکیانشکاند، لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی لەپاریسدا ڕادەپەڕن و بووربۆنەکان دەچنەوە سەرتەختی پاشایەتی، دوك دو برونسویك فەرماندەی گشتی سوپا، واتە ئەوکەسەی کەلەساڵی (1792)دا شەڕی دژی فەرەنسا کردو دەستی لەکاروباری شۆڕش وەردەداو ئێستاش لەبەرامبەر ناپلیۆنی هەمیشە سەرکەوتوودایەو هیچ ئومێدێکی لەدڵی ناگەڕێت بۆ سەرکەوتن بەسەریداو ڕق وکینەی کۆنیشی لەدڵدا هەڵگرتووە، لەکڵێساکانی شاری بەرلینیشدا کەشیشەکانیش بەئۆرەی خۆیان پروپاگەندەی ئەوەیاندەکرد، پەروەردگار لەدێر زەمانەوە پشت وپەنای بنەماڵەی هوهنزورنەکانە، بڵاودەکردەوە، هەموو لایەك بەبێ ئۆتکەیی چاوەڕوانی هەواڵی مەیدانی شەڕبوون، کەس نەیدەزانی کام یەك لەم دوو[٥٨٩] هێزە تێکدەشکێن، سێ بەشەکەی سوپای ناپلیۆن لەپشت جەنگەڵەکانی فرانکونیەوە بەرەو ڕووباری دامێن ئەلب دەڕۆیشتن بۆئەوەی پشتی سوپای پروس بگرن ونەهێڵن یارمەتیان پێبگات.

---

[187] - - خەڵکی کرس: مەبەست لەناپلیۆنە،

[188] - دەلینگ شۆرەکان: لەسەردەمی شۆڕشی فەرنسادا ئەشرافەکان ئەم ناوەیان بەشۆڕشگێڕەکان دەکوت، چونکە ئەمانە پانتۆلی کورتی باویان لەبەرنەدەکردو پانتۆلی درێژیان دەکردەبەرو وردە وردە شۆڕشگێڕەکان ئەم لەقەبەیان بەکەسانی نیشتمان پەروەردەکوت. (و- فارسی)

[189] - ئەم دوو هێزە: مەبەست لەسوپای پروس وفەرەنسایە،(و- کوردی)



یەکەم شەڕ لەنزیکی شلایتسدا لەڕۆژی(9/ی ئۆکتۆبەردا ڕوویدا، واتە ڕۆژێك دوای گەیشتنی ناپلیۆن بەساکس، پێشەوانی سوپای فەرەنسا بەفەرماندەی موراو برنادوت – نزیکی یەك یەکەی سەربازی پرۆس بوونەوەو بەفەرمانی ناپلیۆن هێرشیان کرایەسەرو لەوشەڕە لاوەکییەدا سوپای پروس تەفروتونابوون و(700) سەربازیان لەدەستدان کە(300)یان کوژران وئەوانی تریش هەلاتن وبریندارببوون و ونبوون، ڕۆژی (10/ی ئۆکتۆبەریش شەڕێکیتر کەلەهی یەکەم گرنگتربوو ڕوویدا، هەرکە مارشاڵ لان گەیشتە نزیکی زالفلدو گەیشتە پێگەیەك کەشازادە لوئیزی ڕابەری حزبی شەڕخوازی دەرباری پروس بەخۆی ولەشکرێکی (9) هەزار کەسییەوە لەوێدا جێگیرببوو، مارشال لان یەکسەرە هێرشی کردەسەرو ئەم شەڕەش فەرەنسییەکان تێیدا سەرکەوتووبوون، سوپای پروس دوای شەڕێکی خوێناوی هەلاتن ونزیکەی هەزارو پێنج سەت کوژراو بریندارییان لەدوای خۆیان جێهێشت ولەکۆتایی ئەو شەڕەشدا شازادە لوئیز بەسەرەنێزە بەکوشتچوو.

سەربازە هەلاتووەکانی زالفلد خۆیان گەیاندەوە سوپای سەرەکی پروس کەبەفەرماندەیی شازادە هوهنلوهە لەنزیك ینادا بوون، سوپایەکی سەرەکیتر کەلەژێر فەرماندەی خودی دود دو برونسویك دابوو وبەرەو خۆرهەلات وبولای ناومبورگ کەوتبوونە پاشەکشە، چارەنووس وای هێنا ئەمانە نەتوانن بگەنە ئەو شارەی ئامانجیانبوو، کاتێ یەك لەدوای یەك هەواڵی شەڕی شلایتس و زالفلد وکوژرانی شازادە لوئیزی گەیشت، هەموو لایەك سەرسام بوون، لەلایەك ئەوەسەیربوو ئەو دوو شەڕە لاوەکییە دوڕاوی سوپای پروس توانی کاریگەری گەورە لەسەر هەمووان [590] جێبهێڵێت، ئیتر لەبری کەش وفش و لاف وگەزافکردن کش وماتی باڵی کێشاو ترس وپەشۆکاوی بووبە فەرمانڕەوا، تەنها شاژن لوئیز بەسەرخۆی نەدەهێناو لەگەڵ ئەوەی بەشێوازی قارەمانانەی مەرگی شازادە لوئیزی خۆرهەلات – دەشی گوت شەڕی گەورەمان لەپێشەوە ماوەو هەموو شتێك بەیەك جار چاکدەبێت وتێی هەڵدێنینەوە، ناپلیۆن پێشبینی ئەوەی دەکرد هێزی سەرەکی سەربازانی پروس لەنزیك ویماردا جێگیرکرابێت، تابتوانن درێژە بەپاشەکشەکردنی خۆیان بەرەو بەرلین بدەن، هەروەها وای بۆدەچوو کەشەڕی یەکلاکەرەوە لە 15/ی ئۆکتۆبەردا لەنزیك ویماردا ڕوودەدات.

ناپلیۆن داووی [591] بەرەو ناومبورگ ناردو فەرمانی پێکرد چەند دەتوانێت فشاربخاتەسەر سوپای پشتەوەی ڕێگای گەڕانەوەی دوژمن، هەروەها فەرمانی بەمارشال برنادوتیشکرد خۆی بگەیەنێتەوە ئەو.

بەلام ئەمیان نەیتوانی فەرمانەکە جێبەجێبکات، ناپلیۆن بۆخۆشی بەهاوەڵی مارشالەکانی سوو و نی و مورا بەرەو ینا ڕۆیشت، ئێوارەی ڕۆژی 13/ی ئۆکتۆبەر گەیشتە ئەوشارە، لەگەڵ دیاریکردنی بەرزایی وشوێنە ستراتیژیەکاندا چاوی بەسوپایەکی گەورەی پروس کەوت کەلەویمار دوردەکەونەوەو لەحاڵەتی پاشەکشەدان، شازادە هوهنولهم بوو کەبە سوپاکەیەوە هەڵدەهات و زانیبووی سوپای ناپلیۆن شاری ینای داگیرکردوە، بەلام پێشبینی ئەوەی نەدەکردکە خودی ئیمپراتۆری فەرەنسا لەوێدابێت، لەشەوی (13/ لەسەر 14/ی ئۆکتۆبەردا هوهنلوهە، سوپاکەی گێڕایەوەو لەو نزیکانەدا جێگیریکرد، ناپلیۆن چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد، بەلام ڕاستەوخۆ بڕیاریدا شەڕ دەستپێبکرێت.



پێش پرشنگی بەیانی ناپلیۆن بەسەربازەکانی خۆی ڕاگەیاند، ئەم شەڕەی پێشمان هەموو مەملەکەتی پروس دەخاتەژێر دەستی فەرەنساو چاوەڕوانی دلێری وئازایەتیانە بۆسەرکەوتن ودواتر نەخشەی شەڕەکەشی بۆشیکردنەوە، سەرئەنجام بەرەبەیانی(14/ی ئۆکتۆبەری ساڵی (1806) واتە: ئەو ڕۆژەی کەدەبوا چارەنووسی پروس یەکلایی بکرێتەوە، هات، دوای پرشنگی هەتاو شەڕ دەستی پێکرد، شەڕێکی دیژوارو خوێناوی ودرێژ خایانبوو، بەڵام هەرلە سەرەتاوە فەرەنسییەکان توانیان زاڵی خۆیان بسەلمێنن ودوژمن نەتوانێت ئومێدی سەرکەوتنی هەبێت، پروس و ساکسییەکان وردەوردە کەوتنە پاشەکشەکردن وبەسەختیش بەرگریان لەخۆیاندەکرد، بەڵام ئیمپراتۆری فەرەنسا کەهەڵبژاردەی هێزەکانی واتە هێزەکانی مارشال– سو و لان و ئاوژەرو نی و سوارە سەربازەکانی مورای بەورياييەوە نەخشەی شەڕی بۆ کێشابوون، بەرەو شەڕ قاویدان، پلانەکانی خۆی موبەمور پێ جێبەجێدەکردن، کاتێ سوپای پروس تێشکاو کەوتنەهەڵاتن، ڕاونانی ئەمانە زۆر لەشەڕی ئوسترلیتز دیژوارتربوو.

(2)

پاشماوەی ئەو سوپا تێکشکاوە بەرەو ویمار هەڵاتن وسوارەکانی مارشال مورا هەتا لەناو ئەوشارەشدا ڕاوەدووی سەربازە هەڵاتووەکانی پروسی دەنا، لەوکاتەدا پروسەکان زیانی گیانی زۆریان لێکەوت، سەربازە سوارەکانی فەرەنسا هەرسەربازێکی هەڵاتووی پروسەکانیان دەبینی سەریان بەشمشێر دەپەڕاند، تەنانەت ئەوکەسانەی خۆشیان بەدەستەوەدەدا دەیانکوشتن، تەنها هەندێك لەوسوپایە توانیبووی هەڵبێت وخۆی ڕزگاربکات، زۆرینەی سوپای پروس تارومارو دەستگیرکران و زۆریشیان سەرنگون بوون.

هوهنلوهە، کەلەکاتی شەڕدا تەواو پەشۆکابوو ویستی بچێتە ناومبروگ، چونکە ئومێدی ئەوەی هەبوو خۆی بگەیەنێتە سوپای سەرەکی پروس کەلەژێر فەرماندەی دوك دو برونسویك دابوو، بەڵام لەپڕ بەرەبەری ئێوارێ سەربازی هەڵاتوویی تر هاتن ولەگەڵ سەربازە هەڵاتووەکانی ینادا یەکیانگرتەوەو هەواڵی شومی ئەوەشیان گەیاند چ کارەساتێکی سامناك بەسەر سوپای پروسدا هاتووە، دوك دوبرونسویك پێش ئەوەی بگاتە ناومبورگ لەشوێنێکدا بەناوی ئاورشتات بەهۆی تێکهەڵچوونی لەگەڵ یەکەیەکی سەربازی فەرەنسی بەفەرماندەیی داوو وتێکشکانی لەبەرامبەریدا، دوك دو برونسویك ، بەم جۆرە سەربازە هەڵاتووەکانی ئورشتات ولەگەڵ سەربازە هەڵاتووەکانی هوهنلوهەدا تێکەڵاو بوونەوەو وەك لافاو لەیناو ویمارەوە سەرەو ژێر هەڵاتن ودورکەوتنەوە، بەمجۆرە پاشای پروس لەوە ئاگادارکرایەوە سوپاکەی لەدووشەڕی جیاواز لەگەڵ ناپلیۆن ومارشال داوودا تێکشکاوەو تەنانەت لەبەین چوون.

هیچ کەسێك لەئەوروپادا تەنانەت دوژمنە سەرسەختەکانی پروسیش چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد ئەم شەڕە لەماوەی شەش ڕۆژدا یەکلایی بێتەوە، کاتێ دۆڕاوەکان لەسەر زمانی یەکترەوە هەواڵی تێکشکان ولەدەستچوونی هەموو شتێکیان دەبیست وئیتر شتێك نەماوە ناوی سوپای پروس بێت، هەموو واق وڕماو سەرسام ببوون.



پاشماوەی سوپای پروس بەبێ سەرو بەرەیی تەواوەوە دریژەیان بەهەڵاتنەکەیان دەدا، سوپای فەرەنسا کەلەدوای ئەمانەوەبوون چی شتومەك وچەك وتۆپی لەئەمانە بەجێ دەما کۆدەکردەوە، ناپلیۆن ڕاستەوخۆ بەرەو بەرلین کەوتەڕێ ولەڕێگادا فەرمانیدا میرنشینی دوکی گەورەو هس وکاسلی ودەسەلاتدارانی ئەو هەرێمانەی لەسەر کارلابردن وشارەکانی برونکسویك ویمارو ئارفورت وناومبورگ وهال و ویتمبرگی خستەژێر ڕکێفی خۆی، شازادە هوهنلوهەش توانیبووی بەزەحمەت نزیکەی (20) هەزار سەرباز کۆبکاتەوە کەزۆر گوێڕایەڵی وبێسەرو بەرەبوون، کۆیکاتەوەو بەرەو سەروو پاشەکشەبکات، بەلام چوون ئەم لەشکرە هەلاتووە بەرەو خۆرهەلات ڕۆژ بەڕۆژ لەژێر فشاری سەربازەکانی مارشال مورادابوون، وردە وردە لەکەمبوونەوەدا بوون، دوای ئەوەی هوهنلوهە لەپرنتسلا پەڕیەوە تاخۆی بگەیەنێتە ئاشتین، چواردەوری گیراو ناچار خۆیدا بەدەستەوە، چەند ڕۆژێك پێش ئەم ڕووداوە قەلاتی سەربازی ئاشپانداو کەپڕبوو لەئازوقە بێ هیچ بەرگریەك خۆیدابوو بەدەست ژنرال لان، قەلاتی سەختی ئاشتتین کەسەربازگەیەکی گەورەبوو (6) هەزار کەس بەرگریان لە شوێنەدەکرد، هەر دوای ئاگادارکردنەوەیان بەشەرنەکلردنیان وبێ ئەوەی یەك گوللە تۆپ بتەقێندرێت خۆیان بەدەستەوەدا، سەربازانی پروس هەزار هەزار خۆیان تەسلیمی سوپای فەرەنسا دەکرد، ئەوانەی دوو هەفتە لەمەوپێش کەش وفشیاندەکرد بەوەی ناپلیۆن لەناودەبەن دیارنەمابوون، لە(27/ی ئۆکتۆبەری سالی 1806)دا نۆزدە ڕۆژ دوای دەستپێکردنی شەڕو(13) ڕۆژ دوای شەڕەکانی یناو ئاورشتات، ناپلیۆن بەخۆیی و چوار مارشالیەوە لەنێوان لەشکری نارنجۆك هاوێژان ولەپێشەوەی سوپاکەیدا گەیشتە شاری بەرلین.

سەرۆکی شارەوانی بورك ماستر کلیلی ئەو شارەی پێشکەش بەناپلیۆن کردو داوای لێکرد ئەم شارە لەباج ببەخشێت، ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد خەلك دوکانەکانیان بکەنەوەو ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێبکەنەوە، دانیشتوانی شار بەسلاو وکرنوزەوە کەهاوەلبوو لەگەل ترس پێشوازیان لەئیمپراتۆری فەرنسا کرد، دوای ئەوەی ناپلیۆن لەبەرلیندا نیشتەجێ بوو، پێش هەموو شتێك خەریکی دەستگیرکردنی سوپا پەرتەوازەکەی پروس بوو، بەگشتی جگەلە سەربازەکانی ژێر فەرماندەی ژنرال بلوخری پروسی کەفەرماندەیەکی لێوەشاوەی پروسی بوو، سوپای پروس هیچی تری لێنەمابۆوە، بلوخر توانیبووی نزیکەی (20) هەزار ئەفسەرو سەرباز لەسوپای تێکشکاوی پروس کۆبکاتەوەو لەوکاتەی کەژنرالەکانی ناپلیۆن واتە سو و موراو برنادوت بەدوایەوە بوون بەرەو خۆرهەلات هەلبێت، کاتێ گەیشتە لویك وسنووری دانیمارکی لێدەرکەوت شادمان بوو، بەلام دانیمارك کەلەناپلیۆن تۆقیبو بەرەسمی ڕێگای نەدا سوپا شەپرێوەکەی بلوخر بێتەناو ولاتەکەیان، خۆ ئەگەر ڕێگاشی پێدرابا چووبا ناوخاکی دانیمارك ئەوا هەر ڕزگاریان نەدەبوو، چونکە ژنرالەکانی ناپلیۆن بەدواوەی بوون، لەڕۆژی (7) نۆفەمبەردا سوپای فەرەنسی گەیشتە لویك و لەشەقام وکۆلانەکانی ئەم شارەدا ڕاوەدووی سەربازەکانی بلوخریانداو ئەمانە شەڕێکی بێهودەیان کردو سەرئەنجام (6) هەزار سەربازی پروسی بەکوشت چوون ودواتر بلوخر بەخۆیی و(14) هەزار سەربازەی کەمابۆوە لەوشارە هەلبێت، بەلام هەر ئەوشەوە مارشالەکانی فەرەنسایی توانیان لەدەشتایی لویکدا پێی بگەنەوەو گەمارۆی بدەن و بلوخر بەناچاری بەخۆیی وئەفسەرو سەربازو ئازوقەکەیانەوە خۆیان بەدەستەوەدا.

لەوکاتانەدا سوپای فەرەنسا گەمارۆی قەلاتی کوسترینیان داو دوای ئاگادارکردنەوەیان بەوەی خۆیان بدەن بەدەستەوە، بێ شەڕکردن ئەمانیش تەسلیم بوون و(4) هەزار سەربازی پرچەك لارەمل خۆیان بەدەستەوەدا، تەسلیم بوونی قەلاتە

سەربازییەکان یەك لەدوای یەك پێشینەی نەبوو ودوایین سەربازگەش کەخۆیدا بەدەستەوە، سـەربازگەی ماگدبورك بـوو، تەنانەت خۆبەدەستەودانی ماگدبورگ زۆر جێگای سەرسوڕمان بوو، بەجۆرێ کەهەواڵی ئەمەیان بەناپلیۆن گەیاند سەرەتا باوەڕی نەکرد، ماگدبروگ قەڵاتێکی سەربازی زۆر سەخت بوو وبەناوەندێکی بازرگانی زۆر بەپیت وبەرەکەتیش هەژماردەکراو پڕلە لەکەلوپەلی سەربازی وئازوقەبوو ونزیکەی (22) هەزار سەربازی تەیاری تێدابوون، کەلەژێر فەرماندەی ژنرال کەلایست دابوون، دوای خۆبەدەستەوەدانی بلوخر، قەڵاتی سەربازی ماگدبورگ تاکە شوێن بوو کەسوپای پروسی تێـدامابوو، دوای شەڕێکی کەم ژنرال کلایست لە(8)ی نۆڤەمبەردا خۆی تەسلیمی مارشال نی کردو کەناوبراو گەشتە شار ئازوقەی بێ ژمارو ئامێری سەربازی وعەمباری چەك وشتومەکی سەربازی زۆری لەگەڵخۆیدا هێنان، دواتر ژنرال کلایستی فەرماندەی سەربازی پروس بەمجۆرە باسی خۆبەدەستەوە دانەکەی دەکات و دەڵێت: گوایا خەڵکی شار زەندەقیان لەتۆپەکانی سوپای فەرەنسا چووەو پەیوەندیان پێوەکردم ولەبەرم پاڕانەوە شەڕنەکەم، منیش[192] لەبەرخاتری خەڵکی ئەوشارە شەڕم نەکردوو خـۆم بەدەستەوەدا، هەرکە هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی ماگدبورگ بڵاوبۆوە، ناپلیۆن وفەرەنساو هەموو وڵاتانی ئەورووپا ئەوەیان لاروونبۆوە ئیتر دەوڵەتی پروس وێرانبوو، واتە: سوپای پروس نەماو هەموو سەربازگە سەخت وئاسیکان تەنانەت قـەڵاتی سەربازی دانتزیکیش بەهەموو چەك وئازوقەوە بێ هیچ شەڕکردنێك خۆیان بەدەستەوەداوە، هەروەها پایتەخت و زۆرینەی شارەکانی پروسیش فەرەنسییەکان بەڕێوەی دەبەن ودانیشتوانەکانیشی ملکەچی فەرمانی ئەوانن.

پاشای پروس وشاژن لویزو منداڵەکانیان ودەستوپێوەندەکان دوای ئەوەی ماوەیەك بەرەزیلی لەم شار بۆئەوشار بەئاوارەیی دەڕۆیشتن، سەرئەنجام پەنایان بۆ مل برد کەدەکەوێتە کۆتایی سنووری خۆرئاوای پروس، هەموو ئەو ئومێدانەی فریدریك ویلهلم بۆ ئاشتیکردن ورێککەوتن لەگەڵ ناپلیۆندا وەك بڵقی سەرئاو وابوو، چونکە ناپلیۆن لەمەوبەریش مـەرج وخواسـتی لەتوانا بەدەری داوادەکردن.

بە فەرمانی ناپلیۆن لەرۆژنامەکانی فەرەنسادا نووسینی گاڵتەجاریو رخنەگرانەیان لەسەر شاژن لویز دەنووسیو کردبوویانە جێگای گاڵتە پێکردنو سوکایەتیان پێدەکرد، هەروەها ئەویان بەبەرپرسی ئەی ،لاِ ی ،سەر بروسادا هات لەقەڵم دەدا. ئەم گوتەو سوکایەتی پێکردنە نەبووە رێگر لەبەردەم ئەوەی فریدریك ویلهلمی سێیەم، نامەی بەوپەڕی ڕێزەوە بۆ ناپلیۆن بنووسێتو لەونامانەدا ئومێدی خواستبوو ئیمپراتۆری فەرەنسا لەکەلوپەلەکانی پشودانی ناو کۆشکی پتسدام رازی بێتو هەموو شتێك لەگەڵ زەوقو خۆشی ئەودا گونجاو بوبێت، بەڵام ناپلیۆن وڵامی ئەو نامانەی نەدایەوە.

• ئیمپراتۆر بەدرێژایی دەسەڵاتداریەتیو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی بەقەت پایزی ساڵی(1806) نەگەیشتبۆ لوتکەو دواتریش نەیتوانی بگاتەوە ئەو ئاقارە، ئەو لەماوەی یەك مانگدا توانی یەکێك لەچوار دەوڵەتە بەهێزەکەی ئەورووپای ئەوکات تێکبشکێنێت، سەرکەوتنی ئەو بەسەر بروسدا یەکێکبوو لەوسەرکەوتنە بەرچاو ومەزنانەی تائەو رۆژگارەش بەدی نەکرابوو، هیچ بەرگریەکی ئەوتۆ نەکرا، ملکەچیو فەرمانگیری خـەڵکی ئـەو وڵاتـە بـەجۆرێکی سەرنجراکێشانەبوو، پاشـای میـسرو نەمساوییەکانو شەڕو بەرەنگاریانکرد، لەبەرەامبەر ئەودا، روسەکانیش بەدلێرانە شەری سوپای فەرەنسایان دەکرد، تەنانەت هەندێك لەیەکە سەربازییەکانی روسیا لەشەری ئوسترلیتزدا بەجۆرێ قارەمانانە جەنگان، کەدواتر ناپلیۆن ستایشی ئازایەتیو

---

[192] - -منیش: مەبەست لەژنرال کلایستە،



چاونەترسی ئەمانی کرد، بەڵام ئێستا سوپایەکی گەورەو خاوەن مێژوویەکی دێرین لەشەرو سەرکەوتن و شانازییەکانی کەفریدریکی گەورە تۆماری کردبوون و خاوەنی سیستمێکی ئیداری زۆر بەرزو گەلی بوو ولەرووی فەرهەنگیشەوە هیچی لەوڵاتانی تری ئەورووپا کەمترنەبوو، لەپڕ تەفروتونا بوو وبووبە کەلاکێکی بێ گیان، سەرتاسەری ئەورووپا واقیان وڕمابوو، دەوڵەتەکانی ئەڵمانی هەر یەکەو باڵوێزی خۆیان بۆلای ناپلیۆن نارد، تاملکەچی و دەست لەسەرسینگی خۆیان بەئیمپراتۆری فەرەنسا رابگەیەنن.

لەرۆژەکانی مانگی ئوکتۆبەرو نۆڤەمبەردا کەناپلیۆن گەیشتبۆ ئەوپەری دەستە بالایی و درندەیی و زۆرداری و لەکۆشکی پتسدامدا دەژیا، لێك لێك هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی سوپای پەرتەوازەی پروسی لێرەولەوێ پێدەگەیشت، لەوکاتانەدا کەهەموو میروشاو... هتد، لەبەردەمیدا دەکەوتنە سەرئەژنۆ وداوای بەخشین-یان گرتنە ژێرسێبەری خۆیان لێدەکرد، شازادەکانی ئەلکتورو دوکماو پاشاکان لەبەردەمیدا کڕنوژیان دەبردوو دەستەوەستان بەملکەچی دەوەستان و خۆیان بەبەندەو نۆکەری بەوەفا دەناساند، ناپلیۆن بریاریدا زەبرێکی بەهێز لەدوژمنی سەرەکی خۆی بدات، چونکە دوای دلگیرکردنی برۆس، کردنی ئەم کارەی بەسەرکەوتوو وگونجاو دەزانی، دووهەفتە دوای تەسلیم بوونی ماگدبورگ، ئیمپراتۆری فەرەنسا لە(21/ی نۆڤەمبەری ساڵی 1806)دا، فەرمانە بەناوبانگەی خۆی بەناوی فەرمانی بەرلین دەرکرد.

(3)

کەبریتی بوو لەگەمارۆدانی خاکی بریتانیا، گەمارۆدانی خاکی لەمێژووی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن و سەرتاسەری ئەورووپاو هەتا کاریگەری گەورەی لەسەر مێژووی ئەمریکاش جێهێشت.

ئەم شتە بەدرێژایی فەرمانڕەوایی ناپلیۆن، بووەبنچینەی سەرەکی هەموو شەڕەکانی ئابووری وسەرئەنجامیش سیاسی.

بڕیارە بنەڕەتییەکانی فەرمانی بەرلین چی بوو؟ قەدەغەکردنی کڕین وفرۆشتن، واتە: ئاڵوێری بازرگانی لەگەڵ بریتانیادا، دیارە ئەمە لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنساوە هەبوو ودواتر بەدانانی لەبڕگەکانی قانونی ساڵی (1794)دا نووسرابۆوە، لەسەردەمی حوکمڕانی ناپلیۆندا ئەمە نەك هەر کاری پێنەکرا لە(22/ی فبرایەری ساڵی (1806)دا جارێکیتر هێنان وکڕینی بەروبومەکانی بریتانیای قاچاغکرد، ئەمەش ئەوکات بۆ پاراستنی پیشەسازی فەرنسابوو. بەدەرکردنی بڕیاری بەرلین لە(21/ی نۆڤەمبەری ساڵی (1806)دا بازرگانی کردنی هەموو ئەوشوێنانەی لەژێر رکێفی خۆیدابوون لەگەڵ بریتانیادا قەدەغەکرا، دەیویست بەم کارەی ئابووری بریتانیا توشی تەنگژەی کوشندەو قاتوقڕی بکاتەوە، ئەم جارەیان تەنها بەدەستهەلگرتنی بریتانیا لەفەرەنسا کۆڵی نەدا، بەڵکو دەیویست ئەوان لەهەموو بازرگانی کردنێکی ئەورووپا دووربخەنەوەو تەواو بریتانیا پەراوێز بکات.

ماددەی یەکەمی ئەو بڕیارە بەم جۆرە نووسرابۆوە: دورگەکانی سەربە بریتانیان دەبێ گەمارۆ بدرێن.

ماددەی دووەمیش بریتی بووله: هەر جۆرە کڕین وفرۆشتنێك بەدورگەی بریتانیا قەدەغەیە، هەروەها فەرمان درابوو هەرکەسێکی بریتانی لەهەر شوێنێك ببینن دەستبەجێ دەستگیری بکەن وماڵەکانیان دەستبەسەردا بگرن، هەرچەندە زۆر ئەم ماددانە شی نەکرابوونەوە.



بەلام پێویستە لەخودی ئەو بڕیارەی بەرلین وردببینەوە هەتا پەی بەچەمکی مێژووی ئەو بڕیارە ببەین، گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا تەنها لەکاتێکدا ئەکتیف بوو، ئەگەر ئاکامی باشی لێکەوتبایەوەو ئەورووپا کەوتبا– یان بەلانی کەمەوە لەژێر چاودێری وردی دەسەلاتدارەیتی ناپلیۆندابا.

ئەنجامەکەی ڕوون و ئاشکرابوو، ئەگەر بۆ بەچۆکداهێنانی بریتانیا هەموو ولاتانی ئەورووپا پەیڕەوی بڕیارەکەی ناپلیۆنیان کردبا، ئەوا دەبوا ناپلیۆن هەموو ئەورووپای داگیرکردباو پێش هـەموو شـتێکیش گـشت ڕۆخـی دەریاکـانی سەرکیـشوەری ئەورووپای خستبایە ژێر دەسەلاتە سەربازەکانی خۆی وڕێگای نەدابا بەقاچاغ کـالا لـەبریتانیاوا هێنرابـاو پێـچەوانەکەشی، بیرۆکەی نەخشەکانی ناپلیۆن پێویستی بەکەس نەدەکرد بیری لێبکاتەوەو لێکی بداتەوە، چونکە گەمارۆدانی ئابووری بریتانیا ئاکامی خراپیشی هەبوو بۆسەر خەلکی ئەورووپا کەبەرووبومی بریتانیان بەکاردەهێناو دەخوارد، وەك قاوەو شەکرو.. تـاد، ناپلیۆن پێشوەخت دەیزانی قاچاغچییەکانی بازرگانەکانی بریتانیا چـەند قـازانجی لێدەکـەن، هـەروەها مامەلەچییەکانی فەرەنسایش کەمەودای خامی خۆیان لەبریتانیادا ساغ دەکردەوە، بەلام بەڕای ناپلیۆن بۆ وەلام دانەوەی هەموو ئەوشتانە یەك وەلامگۆیی هەبوو، ئەویش درێژەدانبوو بەداگیرکردنی هەموو ئەورووپا هەتا بتوانێت پلانی گەمارۆدانی ئابووری بریتانیا سەربگرێت، هەروەها ناپلیۆن پەی بەوڕاستیەش بردبوو کەلەهەموو ئەورووپادا تەنها یەك چین لەوبڕیارەی شـادمان بـوون، ئەویش برژوازی سنعەتکاربوو کەلەشەڕی ڕکەبەرێی بریتانیا ڕزگاریان دەبوو، دوای تێشکانی دەولەتی پروس، ولاتی ساکس هەموو پەیوەندییەکانی خۆی لەگەل هاوپەیماناندا پچڕاندو پەیوەست بەناپلیۆنەوە بوو وسـنعەتکارانی ساکسی بەشـەوق وزەوقەوە پیرۆزباییان لەیەکتری دەکرد.

بەلام بازرگان وجوتیاران خەلکی زۆری کالا بەکارهێنەر سەخت دلنیگەران بوون وخۆیان بەمالوێران دەزانی، پێشتر ناپلیۆن درکی بەمەش کردبوو کەتەنها بەزۆرو ترس دەتوانێت دەولەت ومیللەتانی ئەورووپایی ناچاربکات برگەو ماددەکانی بڕیـاری گەمارۆدانی بریتانیا جێبەجێ بکەن وسەرپێـچی نەکـەن، دوای بڕیـاری(21/ی نۆڤەمبـەری سـالی (1806)، دامەزرانـدنی ئیمپراتۆریەتی شارلمانی [594] ، بەرفراوانبوون وفەرمانڕەوایی ڕەهای ئەو دوای بڕیاری گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیـا، بووبە پێویستییەکی ڕەهاو بێ چەندوچون.

تالیران وەزیری دەرەوەی فەرەنسا هاتەلای ئیمپراتۆر لەکۆشکی پتسداو فەرمانی پێکرا دەقی ئەو بڕیارەی ناپلیۆن بەهەموو ولاتانی ژێر دەسەلاتی فەرەنساو نیوە ژێر دەستەیدا بلاوبکاتەوە، ئینجا ناپلیۆن فەرمانی بەمارشالەکانی خۆیکرد هـەموو ڕۆخی دەریاکانی شمال وبەلتیك داگیربکەن، ناوبراو باش دەیزانی چ نەخشەیەکی داڕشتووە، ئەو لەوپەیامەدا کەبۆ پەرلەمانی فەرەنسای نارد ئاوای نووسیووە: شەڕو ململانێی پاشایان بۆ پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ئێمەیان والێکردووە دوای چەند سالێك لەکاروانی بەرەوپێشچوونەکانی شارستانییەتەکەمان بگەڕێننەوە سەرەتا کەنموونەی ژیانی دڕندانەی میللەتە سەرەتاییەکانە، بەلام ئێمە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی گەلەکەمان وهاوپەیمانەکانیان، ناچاربووین بەهەمان چەك بچینە شەڕی

[594] – شارلمانی: مەبەست لەناپلیۆنە: بۆ زانیاری زیاتر پەراوێزی پێشووتر،



دوژمنی هاوبەش کەئەو تائێستا دژبە [194] (ئێمەی بەکارهێناوە) بڕواری ئـەم پەیامـە لەهـەمان ڕۆژدا نووسـراوەکە بڕیـارە بەناوبانگەکەی(21/ی نۆڤەمبەری ساڵی (1806)ی تێدا دەرکرا.

ئەورووپا بڕیاری گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیای بەترس وگومانەوە قبولکرد، ئێستا زامی ئەو ڕوخان وتەفرو تونابوونەی پروس نەسرِیبۆوە کەدەسەلاتدارانی دەوڵەتەکانی تری بەدەرلەژێر دەسەلاتی ناپلیۆن، ڕۆژیان بۆ کۆتایی خۆیان دەژماردن، بریتانیا لەوە گەیشتبوو ئیتر شەڕی مان ونەمانی لەپێشەوەیە، بریتانیا جارێکیتر هانای بردەوەبەر ئەو دەوڵەتەی کەپێشتر دووجاریتر لەساڵانی (1798 و 1805)دا پەنای بۆبردبوو، دووبارە ئەلکسەندەری یەکـەم، لەلایـەن بریتانیـاوە بـەڵێنی وەرگرتنی پارەو یارمەتی وەرگرت بەمەرجێ فریای پروس بکەوێت، کابینەی دەوڵەتی بریتانیا داوای نەمساشکرد بێتەناو ئەم هاوکێشەیەو یارمەتی پارە لەبریتانیا وەربگرێت بۆشەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا، بەڵام ئەو دەوڵەتە تائەو کاتەش لەتێشکانە سەختەکەی ئوسترلیتز خۆی نەگرتبۆوەو بەچاوی بۆغزو کینەوە لەدەوڵەتی پروسی دەڕوانی، چـونکە لەسـاڵی(1806)دا پەیوەندی بەهاوپەیمانییەتی سێیەمەوە نەکردبوو، لەبەرامبەردا ناپلیۆن لەپترسبورگدا ئامادەکاری بۆشەڕ دەکرا، لەهەموو پایتەختەکانی ئەورووپاداو بەتایبەت لەپایتەختی ڕووسیادا جاسوسی هەمەجۆری خۆی دانابون کەهەر لەشازادەو بانوانی ناو کۆشکی پاشایەتی ودوکاندارو کەشتی وان و کارمەندانی پۆست وپزیشك و ..هیتریان تێدابوون، بـەهۆی ئەمانـە ئاگـاداری گفتوگۆی نهێنی نێوان ڕوسیاو بریتانیاو هەموو دەوڵەتەکانیتر بوو، دەشیزانی پارەو زێڕ لەلایەن بریتانیاوە دراوە بەتزاری ڕوسیاو چ بەرنامەیەکیش لەبەرامبەر ئەودا لەئارادایە، دوای ئەوەی ناپلیۆن بەشێوەیەکی کاتی بەرلینی کردە ناوەندی ئیداری کاروبارەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی، بڕیاریدا لەیەك کاتدا درێژەبە گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیابدات ولەلایـەکی تریـشەوە سوپایت رسازبکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوەی پێشی.

ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد شارەکانی ڕۆخ دەریای وەك هامبورگ و برم و لوبك ، کەناوەندی بازرگانی بوون، داگیربکرێن، یەکە سەربازییەکانی فەرەنسا بەدرێژایی ڕۆخی دەریای مارش ودەریای ئەتلانتیك بەرەوپێشدەچون وشـارو شارۆچـکەو گونـدو ئاوەدانییەکانیان داگیردەکردو ئەو بریتانیاییانەی کەدژیـشیان دەوەسـتانەوە لـەناویان دەبـردن ودەسـتیان بەسـەر مـاڵ وکاڵاکانیادا دەگرت وکاڵای بریتانیشیان دەگرت، لەهەموو شوێنێکی سەر ئەو دەریایەشدا بنکەو زاڵگەی سەربازیان دادەنان وکەشتی وبەلەمیشیان خستبوونەگەڕ بۆ ئەوەی قاچاخچییەکانی بریتانی بگرن، دەبوا پروس وساکس وهەموو شانشینەکانی تـری ئـەڵمانیا خـەرجی سـوپای مـەزنی فەرەنـساشیان کێشابا، ئـەو شـارانەی کەپێگـەی بازرگانیـان هـەبوو و وابەسـتە بەهاوپەیمانییەتی بازرگانی ئەورووپا بوون ناچاربوون، خەرجی پاسەوانان و پیاوانی گومرگ وبەلەمـەکانی چـاودێریکردنی نەهێشتنی هاتنی کاڵای بریتانی بدەن.

لەوڕۆژانەدا ناپلیۆن خۆی بۆشەڕی پۆڵەندا کەسەربازانی ڕوسیا لەوێدا جێگیربوون ئامادە دەکرد.

---

[194] - دژبە ئێمە: لێرەدا ناپلیۆن مەبەستی لەبریتانیایە کەبەدوژمنی سـەرسـەختی دەزانێت،(و- کوردی)



# (4)

ئەم جارەیان دەستێوەردانی ڕوسیا زۆر لەساڵی (1805) مەترسیدارتربوو، چونکە ناپلیۆن ڕاستەوخۆ هەڕەشەی لەسنوورەکانی ڕوسیا دەکردو یەکە سەربازییەکانی بەردەوام بوون لەپێشرەویان بەرەو خۆرئاوا [195]، لەلایەکی ترەوە، لێپرسراوانی پۆڵۆنیا یەك لەدوای یەك دەهاتن بۆ کۆشکی پتسدامی بەرلین و ئەو شاو میرنشینانە لەبەر ناپلیۆن دەپاڕانەوە سەربەخۆی پۆڵۆنیا بپارێزرێت، ئیمپراتۆری فەرنسا کەپاشای ئیتالیاو پارێزەری یەکێتی ڕن بوو، حەزی دەکرد ناونیشانی پلەو پایەیەکی بەرز بخاتەسەر ناوی خۆی، لەبەر ئەمانە ڕوسیا کەوتبۆ ژێر مەترسییەوە، هەروەها لیتوانیاو بیلاڕوسیاو تەنانەت ئۆکرانیاش کەکەوتبوونە بەشی ڕاستی ڕووباری دنیپر، لەدەستبدات. جگەلەمانەش بڕیاری گەمارۆدانی ئابووری بەرتانیاش وایدەکرد ڕوسیا ناچاربکات پەیڕەوی ئەوبڕیارەبکات، ئیتر ڕێگاگرتن لەناردنی بەروبومە کشتوکاڵییەکان بۆ بریتانیا کاریگەری زۆری لەسەر بەهای دراوی ڕوسیا جێدەهێشت کەتازە خەریکبوو بەهای پەیدادەکرد، نیازی شەڕکردن جگەلەوەی ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەی شەڕی ڕیسوایی ئوسترلیتزی لەپشتەوەبوو، لەلایەکی ترەوە ڕوسیا لەتێشکانی خێرایی پروس وخۆڕانەگرتنی کەوتبۆ گومان وترس ودەیزانی لەڕووبەڕووی چ سوپایەك ودوژمنێکی گەورەدایە، هەروەها نابێ چاوەڕوانی یارمەتی لەهیچ لایەنێك بکات ودەبێ شەڕبکات، چونکە پروسیش لەئەورووپادا لەگەڵ دەوڵەتە بەهێزەکان نەمابوو لەپترسبورگدا بڕیاردرابوو لەهێڵی یەکەمی بەرەی شەڕدا(100) هەزار سەرباز بەچەك وتفاقی سەربازییەوە دابنێن، دواتر دەبێ دوای چەند ڕۆژێك گاردی تایبەتیش بکەوێتە جموجۆڵ وبەرەو شەڕبچێت.

ناپلیۆن بڕیاریدا دەستپێشخەری بکات، لەمانگی نۆڤەمبەردا سوپای فەرەنسا چووبوونە ناو خاکی پۆڵۆنیاو ئەرستۆکرات وبرژوازییەتی ئەو وڵاتە، بەتایبەت بازرگان و پیشەوەران، بەخۆشی وشادییەوە پێشوازیان لێدەکردن و پێش وەخت دروویان بەسەر ناپلیۆندا دەگوتن وبەرزگارکەری سەربەخۆیی پۆڵۆنیایان ناودەبرد، پۆڵۆنیا لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە دابەش ببوو بەسەر سێ بەشدا، بەڵام ناپلیۆن زۆر گرنگی بەیەکگرتنەوەو سەربەخۆیی ئەو وڵاتە نەدەدا، ئەو دەیویست پۆڵۆنیا وەك قەڵغانێك لەبەرامبەر هێرشی ڕوسیادا بەکاربهێنێت، بەڵام بۆ ئەم کارە دەبوا لەسیاسەتی دەرەکی خۆیدا دەستووری شۆڕشی برژوازی فەرەنسا نیشان بدات وبگرێتەبەر.

ڕاستی ناپلیۆن بیری لەلەناوبردنی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا نەدەکردەوەو پۆڵۆنیاشی تەنها بۆ بەهێزکردن ودابینکردنی ئازوقەی سوپاو پێداویستییەکانی وڵاتەکەی پێدابین بکات، دوای ئاشتی کردنی تیلسیت، دەبوا ناپلیۆن پۆڵۆنیا بەشێوەیەکی تازە دابەش بکاتەوەو بەشێکی زۆری وابەستەبە پروس بکات، بەناوی دوک نشینی گەورەی وارش و بیخاتەسەر هاوپەیمانیەتیەکەی خۆی، پاشای ساکس، دوک نشینی گەورەی وارسۆ بریتی بوو لەنیوەی بەشی خۆرئاوای خاکی پۆڵۆنیاو هاوڵاتیانی ئەوێش بەرەگەز پۆڵۆنی ئەسڵی بوون، جگەلەناوچەی بیەلوستوك، کەلەژێر چنگی ئیمپراتۆری ڕوسیادا مابۆوە، دواتر ناپلیۆن توانی

---

[195] - بەرەو خۆرهەڵات: وەرگێڕە فەرەنسییەکە کەلەڕوسییەوە وەریگێڕاوە، بەهەڵەدا چووە لەبری بەرەوخۆرهەڵات نووسیویەتی بەرەو خۆرئاوا(و- فارسی)



یەك حزبی لایەنگری خۆی لەنێوان ئەشرافەکانی پۆلۆنیا دروستبکات، هەرچەندە ئەوانە زۆر لەوەدەترسان ڕوسیا خزم وکەس وکارەکانیان لەلیتوانیاو بیلاروسیاو ئۆکرانیادا بکوژێت ودەستگیربکات.

وەزیری بەرگری دەوڵەتی تازەی پۆلۆنیا، شازادە جوزیف پونیا توفسکی بوو، دواتر بوویە مارشال لەسوپای فەرەنسادا، خۆی بەلایەنگری ناپلیۆن ڕاگەیاند. گرتنەبەری سیاسەتی ناپلیۆن لەپۆڵەندادا ئەوەبوو ئەو وڵاتە بگۆڕێت بەیەك حکومەتی برژوازی هاوشێوەی فەرەنسا، ماددەی یەکەمی یاسای بنچینەیی کەبۆ دوگ نشینی وارشۆ داڕێژابوو بەم جۆرەبوو(هەموو کەسێك لەبەرامبەر قانوندا یەکسانە) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بڕیارە هەربەڕواڵەت هەبوو وئەگەر جوتیارێك لەگوندەکەی خۆی ڕۆیشتبا ئەوا دەبوا زەویەکەی بداتە ئاغای گوندەکە، لەنێوان گوندنشینەکانی پۆلۆنیای بەشی سەربە پروس، بەهۆی جوتیارانی ئازاد کەشوێنەکەی خۆیان جێدەهێشت، لەژێر ڕێنمایی وپشتگیری ناڕاستەوخۆی سەربازەکانی فەرەنسا کەمکەم مژدەی سەرهەڵدانی یەك ڕاپەڕین وهەڵشلاخانەوە دژبە کۆلاکەکان سەریهەڵدا، بەڵام ئەم ڕاپەڕینە بەهەتیوی و بێ پشتیوانی مایەوەو کۆلاکەکانی بێهێز نەکرد، بەزیندوو بوونەوەی ئەو ئومێدەی پۆلۆنیا لەدەست زوڵم و زۆری پروس ڕزگاربێت، بەو تێڕوانینە دڵفرێن وشیرینە، هاوپەیمانیەتییەك لەنێوان لیتوانیاو بلاڕوسیاو ئۆکراین دروستبوو وبەباوەشی کراوە پێشوازی لەسوپای فەرەنسا لەپۆلۆنیا کرا، ولایەتی پزنانی پێشوازی سەرکەوتوانەی لەمارشال داوو کرد، لەسەر تاسەری ئەو ولایەتەو تەنانەت ئەو شوێنانەی کەسوپای فەرەنساش داگیری نەکردبوون، کاربەدەستانی پروسیان لابردن وکاربەدەستی فەرەنسیان لەجێگاکانیاندا دانان، ئەم دژایەتی کردنەی پروس بەهۆی ڕۆلگێرانی ڕابەری شۆڕش وڕاپەڕین(فی بیکی)بوو کەتازە لەفەرنسا هاتبۆوەو لایەنگرانی شۆڕشی کوچیوتسکو [196] بوو، ڕاپەڕین دژی پروس وردەوردە بەرفراوانبوو لەناو سوپاییەکانداو شۆڕشییەکان، کەلەلایەن ئەرستۆکراتەکانەوە یارمەتی دەدران تینیان هێنابوو ولەزیادبووندابوون، بەڵام لەکۆتایی مانگی یەنایەری ساڵی (1807) بەدواوە یەکە سەربازییەکانی ژنرال دومبروفسکی کەلەئیتالیا گەڕابوونەوەو بۆ ڕزگارکردنی دانتزیك دەچوون، کەوتبوونە ڕیزی پێشەوەی سوپا.

لەمانگی فبرایەری ساڵی (1807)دا ژمارەی سوپای پۆلۆنیا گەیشتە (30) هەزار کەس، ئەو سەربازانە لەژێر فەرمانی ئەفسەرانی پۆلۆنیدابوون ولەلایەن ناپلیۆنەوە لەشەڕەکانی ساڵانی(1794و1797)دا دروستکرابوون، سەرافەتیان دەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا بەتێڕوانینی گشتی سوپای پۆلۆنیا بۆ یارمەتیدانی سوپای فەرەنسا زۆر گرنگ وپراکتیکی نەبوو، مارشال لان لەپۆلۆنیاوە نامەیەکی بەم جۆرەی بۆناپلیۆن نارد کەناوبراو لەبەرلین بوو، پۆلۆنیا سروشتێکی هەڵپڕاوو بێ سەروبەرەیی هەیەو چاوەڕوانی ئەوەناکرێت بتوانرێت ڕەوشتێکی درێژخایەن بۆ ئەوانە دابرێژرێت.

لەکۆتایی مانگی نۆڤەمبەردا، ناپلیۆن هەواڵی ئەوەی پێگەیشت چەند یەکەیەکی سەربازی سوپای ڕوسیا گەیشتۆتە وارشۆ، ناپلیۆن فەرمانی بەموراو داوو دا ڕاستەوخۆ بەرەو وارشۆ بکەونەڕێ، مورا لە(28/ی نۆڤەمبەردا بەخۆیی و سەربازە سوارەکانیەوە شاری پوزنانی داگیرکرد، دواتر ناپلیۆن بۆخۆی هاتە پۆلۆنیاو چووە وارشو بەئەرستۆکراتەکانی کەبۆ پێشوازی کردنی هاتبوون گوت: پێویستە سەرەتا شکۆمەندی وسەربەخۆیی پۆلۆنیا بگێڕنەوە، تەنانەت ناپلیۆن هەتا دەشیویست

---

[196] - کوچیوتسکو: ژنراڵێکی پۆلۆنی نیشتمان پەروەرە (1746- 1817) لەشۆڕشکردن دژی ڕوسیا بەشداری کردووەو خۆی بەدیکتاتۆری پۆلۆنیا ناساندووە ، دواتر ڕوسیا دەستگیری کردووەو ئیمپراتۆر پلی یەکەم ئازادی کرد، دواین ڕۆژەکانی تەمەنی لەئاراوگەو غەریبایەتیدا بەسەربرد. (و- فارسی)



داکۆچیوتسکۆی قارەمانی میللی ئەو ڕۆژگارەی پۆڵۆنیاو ڕابەری شۆڕشی دژبە دابەشکردنی پۆڵۆنیا کەلەوکاتەدا لەپاریسدا دەژیا بگێڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، کوچیوتسکو ڕازی بوو بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، چونکە ئەو ناپلیۆنی بەچاوی فەرمانڕەوای کامڵ سەیردەکرد، فوشە کەلێپرساویەتی ئەم گفتوگۆکردنەی لەئەستۆدابوو، بەنهێنی لەئیمپراتۆری پرسی ئایا چ وەڵامێکی شایستەی کوچیوتسکو بدەنەوە؟ لەوەڵامدا ناپلیۆن بەڕاشکاوی گوتی ناوبراو کەسێکی گەوجە، چونکە ناپلیۆن دەیزانی ئومێدنییە لیتوانیاو بیلاروسیا شۆڕشی سەرتاسەری دژی ڕوسیا بکەن، بۆیە بڕیاریدا پشت بەخۆی ببەستێت.

شەڕ لەگەڵ ڕوسیادا هەڵایسابوو، ناپلیۆن وارشۆی جێهێشت وهێرشی کردەسەر سوپای ڕوسیا، دوای چەند سەرکەوتنێکی لاوەکی سەرئەنجام شەڕی گەورە ڕۆژی(24/ی سێبتەمبەری ساڵی (1806)لەپلتوسك کەدەکەوێتەسەر ڕووباری نارەو ڕوویدا.

فەرماندەی سوپای ڕوسیا بنیگن بوو، کە ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا وەك هەموو بکوژەکانی باوکی لێی دەترساو ڕق وکینەی لێداگرتبوو، هەرچەندە ئەو بکوژانە بەفیتی ئەو ئەوکارەیان کردبوو، بەڵام چونکە کەس نەبوو لەبنیگن لێوەشاوەتر ئەویان بەفەرماندەی گشتی دانابوو. مارشال لانی سوپای فەرەنساش لێپرساویەتی فەرماندەیی ئەو سوپایەی لەئەستۆدابوو کەلەپلتوسکدا شەڕیاندەکرد، بێ ئەوەی هیچ لایەك سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ئەوشەڕە کۆتایی هات، وەك چۆن باوە فەرماندەی هەردوو سوپا لەڕاپۆرتەکانیاندا کەبۆ سەرۆکەکانیان بەرزدەکردەوە، ڕایگەیاندبوو سەرکەوتووبوون.

مارشال لان، ڕاپۆرتێکی بۆ ناپلیۆن نووسیبوو وتێدا گوتبووی ڕوسەکان زیانێکی زۆریان لێکەوتوەو لەپلتوسکیشیان بەدەرناون، هەروەها بنیگنیش بەئەلکسەندەری ڕاگەیاندبوو کەخودی ناپلیۆنی تێکشکاندووە، لەکاتێکدا ناپلیۆن هەرگیز پلتوسکیش نەهاتبوو وهەتاوی ئەو ناوچەیەشی پێنەکەوتبوو، بەڵام هەر لەوشەڕەوە، فەرەنسییەکان لەوەگەیشتن ئەوانە وەك پروسە چەقاوەسوو وگەندەڵەکان نین وشەڕیان لەگەڵ سەربازی ڕووسیدایە کەدلێرانە دەجەنگن.

ناپلیۆن زستانی لەپۆڵۆنیادا بەسەربردوو سوپاشی لەفەرنساوە داواکردو هێنای، سوپای ڕوسیاش کۆمەکی پێگەیشت، ناپلیۆن لەپۆڵۆنیادا کۆی گشتی سەربازەکانی (105) هەزار کەس بوو کەلەو ژمارەیەش نزیکەی (30) هەزار سەرباز پاسەوانی شارو شارۆچکەکان بوون.

بنیگنیش نزیکەی (80-بۆ90 ) هەزار سەربازی لەگەڵدابوو، هەردوولا ئامادەی شەڕکردن بوون، ئەم شەڕە لە(8/ی فبرایەری ساڵی (1807) ) لەنزیك ئایلوی خاکی خۆرهەڵاتی پروسدا ڕوویدا، شەڕی ئایلو یەکێکبوو لەشەڕە خوێناوییەکانی ئەو ڕۆژگارەو لەهەموو شەڕەکانی تری ناپلیۆن سەختتربوو وبەبێ یەکلایکردنەوە کۆتایی پێهات، نیگسن سێ یەکی سوپاکەی لەدەستدابوو، سوپای فەرەنساش زیانی گەورەی لێکەوتبوو، ڕوسەکان تۆپخانەی زۆرتریان هێنابوونە مەیدانی شەڕو هەندێك لەمارشالەکانیشیان نەگەیشتبوونە مەیدانی شەڕ، یەکە سەربازیەکەی ژنرال ئوژەرو لەژێر ئاگری تۆپەکانی ڕوسیادا نیمچە فەوتابوون، تەنانەت خودی ناپلیۆنیش کەلەگەڵ سەربازە پێرەوەکانی خۆی لەگۆڕستانی ئایلو واتە لەناوەندی کارزاردابوو خەریکبوو لەژێر بارانی تۆپەکانی ڕوسیا کەلەدەورووبەریدا دەکەوتنەوە بەکوشت چێت، ناپلیۆن هەمیشە لەوبڕوایەدابوو پێویستە فەرماندە لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێت گیانی خۆی نەخاتە مەترسییەوە، بەڵام لەئایلوش هەروەك چۆن لەلودی وگرتنی پردی ئارکولدا کردی ئەمەشی بەپێویست دەزانی، تاکەجیاوازی لەنێوان شەڕی لودی وئارکول لەگەڵ ئایلودا ئەوەبوو



لەشەڕی پێشودا دەبوا بۆخۆی پێش نارنجۆك هاوێژەکان بکەوێت وئێستاش دەبێ لەناو سوپا پیادەرەوەکەیدایە بۆ ئەوەی ورەیان بەرزبکاتەوە وچەند سەعاتێك خۆیان لەبەر تۆپبارانی سوپای ڕوسیادا ڕابگرن وپەرتەوازە نەبن.

ئەوانەی دەوروبەری ناپلیۆن بەچاوی خۆیان بینیان تەنهابوونی ئیمپراتۆر سوپای پیادەی بەوەناچارکرد خۆیان لەژێر گڕو ئاگری تۆپەکانی ڕوسیادا ڕابگرن، ڕیزی پێشەوەی یەکە سەربازییەکانی فەرەنسا ببوونە تلیت لەژێر تەقینەوەی تۆپەکانی ڕوسیا لەناویانداو سەربازەکانی گاردو نارنجۆك هاوێژەکان جێگای ئەوانیان دەگرتەوە، لەگەڵ ئەوەدا ناپلیۆن بەوپەڕی ئارامییەوە سەرافەتی شەڕەکەی دەکرد، بەڵام لەچاوەڕوانی ئەوەدابوو سەربازانی سواری سوپاکەی بێن هێرشبکەنەسەر سوپای ڕوسیاو کەمێك دیژواری وسەختی ئەوشەڕە کەمبکەنەوە، سەرئەنجام گۆڕستانی ئایلو لەدەست فەرەنسییەکاندا مایەوەو مەیدانی شەڕەکە بۆ شوێنێکیتر لەوشاکە دەشتە پان وبەرینە گوازرایەوە، کاتێ تاریکی شەو باڵی بەسەر مەیدانی شەڕەکەدا کێشا، فەرەنسییەکان خۆیان بەسەرکەوتوو ولەقەڵەمدا، چونکە ڕوسەکان مەیدانی شەڕیان جێهێشتبوو، ناپلیۆن لەیاداشتەکانیدا خۆی بەسەرکەوتوو هەژمارکردووە، بەڵام ئەو لەهەموو کەس باشتر دەیزانی لەوشەڕەدا سەرکەوتنی واقیعی بەدەست نەهاتبوو، زیانی زۆری لێکەوتبوو هەرچەندە زیانەکانی سوپای ڕوسیا زۆرتربوو، ناپلیۆن دەیزانی کەبنیکسن سوپای بەهێزو شەڕکەری لەدەستداماوەو نەك هەر پروپاگەندەی ئەوەدەکات تێکنەشکاوە، بەڵکو لەهەموو شوێنێك باس لەسەرکەوتوویی خۆی دەکات.

کولنکور [٥٩٧] (ویسانس) کەنیدەویست ڕۆحیەتی خۆی لەدەست بدات، ئاوای نووسیووە(لەماوەی چوار مانگدا فەرەنسییەکان هیچ ئەنجامێکیان لەشەڕکردن لەگەڵ ڕوسەکاندا دەستنەکەوت وخواش دەزانێ کێ سەردەکەوێت)

دوای شەڕی ئایلو، دابەزینێکی لەنکاوی بەهای دراوی فەرەنسی لەبۆرسەکاندا ڕوویدا، دوور لەفەرنساو لەبەرامبەر سوپای ڕوسیادا زەبری گەورەی پێکەوبتوو، بەڵام گورزی گوچك بریشی لەسوپای ڕوس وەشاندبوو، دەبوا ناپلیۆن خۆی بۆیەك شەڕی گەورەی یەکلیاکەرەوە سازبکات– یان تێشکان– یان زەبروەشاندنێکی هاوشێوەی ئایلو دەیتوانی ببێتە پێشینەیەك بۆ فەرمانڕەوایيەتی ئەو لەسەر هەموو ئەورووپا.

# ( 5 )

لەزستانێکی ساردو تەم ومژاویدا ناپلیۆن ناچاربوو سوپاکەی خۆی لەپۆڵۆنیای وێران وپروسی خۆرهەڵاتدا جێگیربکات، نەخۆشخانەکان پڕبوون لەوسەربازانەی لەشەڕی ئایلودا بریندارببوون، بۆگەنیوی ئەو تەرمانەی کەلەمەیدانی شەڕدا جێمابوون بۆ چەند کیلۆمەترێك بڵاودەبۆوەو خەڵك ناچاربوون ئەو ناوچەیە جێبێڵن وبۆ شوێنێکی دوور بچن، ناپلیۆن بڕیاریدا چاوەڕوانبێ هەتا کەژی بەهار، ئینجا هێرش بکاتەسەر ڕووسیا، ئەمەش جۆرێکبوو لەسەر کێشی.

سەردانی نەخۆشخانەکانی دەکرد، چاودێری کاروانی ئازوقەو کەلوپەلەکانی دەکردو شوێنی چۆڵی سەربازە تێداچووەکانی بەسەربازی تازە گەیشتوو لەفەرەنساوە پڕەکردەوە، ئەو لەوبڕوایەدابوو ڕوسەکان، واتە: سوپای ڕوسیا هەر لەسەر

---

[597] - ژنراڵێکی فەرەنسیە (1772-1827) نوێنەری ئیمپراتۆر ناپلیۆنەو بەنوێنەرایەتی خۆی بەشداری کۆنگرەی شاتیونی کرد. (و- فارسی)



مەرزەکانی وڵاتی خۆیاندانێن ونزیکن، لەکاتێکدا لەنێوان فەرەنساو ڕوسیادا چەند وڵاتێکی بەرفراوان هەبوون کەبەڕووکەش لەژێر دەسەڵاتی ئەودابوون، دەبوا کەلوپەلی سەربازی وخۆراك لەڕێگایەکی دوورەوە بهاتبا، ئەو گوندو ئاوایییانەی کەبەدەستی سوپای فەرەنسا تاڵان وبرۆکرابوون، خەڵکەکەی لەبرساندا دەمردن وبەژن و منداڵەکانیانەوە لەدەورویەری هۆردووەکانی سەربازی فەرەنسادا سواڵیان دەکردوو داوای خێرو نانیان دەکرد، ناپلیۆن حەزی نەدەکرد ئەو زستانە بەئاسودەیی لەشارەکانی داگیری کردبوون وەك: درپوزنان و پرسلاو کۆشکی وارشۆدا بەسەربەرێت، ئەو دەیویست ببێتە سەرمەشقێك بۆ ئەوەی ڕۆحیەتی سەربازەکانی لەو شەڕەی پێشیان بەبەهێزی بهێڵێتەوە.

لەنامەیەکی کەبۆ جۆزیفی برای پاشای ناپولی نووسیویەتی دەڵێت: زۆرجار بۆماوەی پازدە ڕۆژ چەکمە سەربازییەکانم لەپێم داناکەنم، یەکە سەربازییەکانی فەرەنسا لەناو بەفرو گڵدان بێ شەراب و بێ نان دەژین خۆراکیان تەنها پەتاتەو گۆشتە، هەمیشە لەپێشڕەوی جموجۆڵدان بێ ئەوەی پشوویدەن، بەردەوام خەریکی گوللەتەقاندنن، لەبەرامبەر دوژمندا بەتۆپ وتفەنگ، برینذارەکان بەعەرەبانە جەنگییە سەربەتاڵەکان دەنێردرێنە پشت بەرەی شەڕ، سەربازەکان بەهەموو هێزو توانایانەوە بەبێ بەزەییانە شەڕدەکەن، ئەو چەند مانگە بێ شەڕکردنە ناچار بەلای ناپلیۆنەوە ناخۆش بوو، هەرسێ چوار ڕۆژ جارێك نامەو پێشنیار لەلایەن مارشاڵ و میرو شانشینی شوێنەکانی ژێر دەستی خۆی وەك ناپولی وئەمستردام و میلان و بەرلینەوە پێدەگەیشت، ئەمە جگەلەو نامانەی کەلەوەزیرو کاربەدەستانی پاریسەوە دەگەیشتن، چونکە ناپلیۆن چەندین وڵاتی لەژێر دەستدابوون وئیدارەی دەکردن، هەیمشە وەك یەك سەربازی سەرکوتکەر بەشەخسی خۆی بڕیارە گرنگەکانی دەردەکردن.

ئەو زۆرجار وەك چۆن لەئوستروداکەجار هەبوو لەناو عەمبارێکی ئازوقەدا — یان لەناو ماڵی لادێییەکدا — نامەو ڕاپۆرتەکانی بۆی دەهاتن دەیخوێندنەوەو ئەو نامەو فەرمانانەی دەریشی دەکردن دەینووسینەوە، ئەو لەلایەك ڕێ و شوێن وبەهێزکردنی خاڵەکانی گومرگی و زاڵگەکانی چاودێری گەمارۆی ئابووری سەربرتانیای دەردەکردو لەلایەکیش ڕێنمایی و ڕێسای کەبۆ وانەخوێندنی سەربازی کوڕو کچ دانرابوون مۆردەکرد، هەم نامەی سەرزەنشتاوی بۆ براکەی کەپاشای هۆڵەندابوو دەنووسی و هەم بەنامە داوای لەپاشای باویر دەکرد، پشتگیری و یارمەتی چاودێرانی تیرۆڵ بدات، فەرمانی بەسوپای ئیسپانیاش دەکرد ژمارە پاسەوانەکانی سەر دەریا زیادبکەن، لەلایەکی تریش شتی ئەدەبیاتی دەخوێندەوەو سەرنج وتێبینی خۆی لەسەر گۆڤاری (مرکوردو فرانس) دەردەبڕی وبابەتە بڵاوکراوەکانی ئەو گۆڤارەی بەخراپ و هیچ لەقەڵەم دەداو نامەی بۆ فوشەی وەزیری ناوخۆی فەرەنسا نووسی چاکسازی لەوگۆڤارەدا بکرێت وسەرنووسەرەکەی بگۆڕدرێت ویەکێکی ژیرتر لەشوێنی ئەودا دابنێت.

هەروەها ئاگای لەهونەرو شانۆش بوو ودەیزانی چۆن هونەرمەندەکان دژی یەکتر خەریکی پلان ودەسیسەن، بۆیە بڕیاریدا خاتوو دوستال، بەهۆی باوەڕی ئازادیخوازانەی لەپاریس دەربکرێت، هەروەها ئاگای لەژمێریاری و ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی دارایی بوو ونادروستی وهەڵەی ژمێریاری ئەوانەی ڕاستدەکردەوە، هەندێك لەکارمەندانی دەوڵەتی ئیتالیای دەرکردن هیتری لەجێگایاندا دادەنانەوە، فەرمانیدا بەوشیارییەوە چاودێری هەڵسوکەوتەکانی دەوڵەتی نەمسا بکرێت وئاگاداری هێزی



سەربازی بکرێت، فەرمانی گەڕان وپشکنینی شارەکانی پروسی دەرکرد، ناپلیۆن بەم هەموو شتانە ڕادەگەیی وبێدولخستن ووەدرەنگگەڕان وەلامی ڕۆشن وڕاشکاوی ئەمانەی دەدایەوە.

ئەوتەنها بەو ڕاپۆرت وپێشنیارانەی کەوەزیرو سەرداران وبالوئیزەکانی بۆیان دەنارد وازی نەدەهێنا، بەڵکو بۆخۆشی پێشنیارو بۆچوونەکانی خۆی دەخستەڕوو وداوای دەکرد ڕاستەوخۆ وبێ دواخستن سەرنجەکانی خۆیان لەسەر ئەمانە دەربڕن وبەڕاپۆرت بۆی بنێرن، تەتەرەکان وەك شنەبا نامەکانیان دەهێنا و دەگەیاند، ناپلیۆن هاوتا لەگەڵ کارە سەرەکییەکەی خۆیدا کەخۆسازکردن بوو بۆشەڕی بەهاری داهاتوو، ئەم کارانەشی دەکردن وئەنجامدەدان.

ناپلیۆن ئەونیازەی کەلەکۆتایی ساڵی (1806)دا هەیبوو، توانی بەوپەڕی سەرکەوتوانە بەدەستی بهێنێت، پاشای عوسمانییەکانی ناچارکرد شەڕکردنەکەی کەلەگەڵ ڕوسیادا هەیبوو توندوتیژتربکات، لەمانگی مارسی (1807)دا نامەیەکی بۆ پاشا سەلیم نووسی و زۆر بەژیرانە ئەو نامەیە کاریگەری پەیداکرد، دیارە پێشتریش سەرکەوتوو بوو لەوەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی[٥٩٨] عوسمانی وبریتانیا تێکبدات، بەوجۆرە بەشێك لەسوپای ڕوسیا دەبوا لەبەرەی ویستولەوە سەرقاڵی شەڕکردن بێت، ئەوبەرەیەش بەشێکی نیوەسەرەکی چارەنوسی شەڕی دیاریدەکرد، ناپلیۆن ماوەیەك خەریکی گفوگۆکردن بوو لەگەڵ پاشای پروسدا کەپەنای بۆ کونیکسبرگ بردبوو، مەرجی ناپلیۆن بۆ کەفریدریك ویلهلم پێشنیارکرابوو زۆر بەگرانی لەسەردەکەوت ولەژێر فشاری ئیمپراتۆریەتی ڕوسیادا فریدریك ویلهلم دەستی لەدانووستان لەگەڵ ناپلیۆندا هەڵگرت، ئەو واتە فردریك ویلهلم لە(26/ی ئیبریلدا لەبارتنشتایندا چاوی بەتزاری ڕوسیا کەوتبوو.

تۆپ وچەك وتەقەمەنی بەلێشاو دەهات بۆ هۆردووی سەربازەکانی ناپلیۆن وبۆخۆی ئەمانەی بەسەر یەکە سەربازییەکاندا دابەش دەکرد، ترس لەناپلیۆن لەئەوروپادا گەیشتبۆ ئاستێك ناوبراو هەرچی ویستبا دەیکرد، هەتا لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کەقەت نەشەڕیان لەگەڵ فەرەنساشداکردبوو فشاری بۆ دەهێنان، داوای لەئیسپانیا کرد(15) هەزار سەربازی بۆ بنێرێت، لەکاتێکا ئیسپانیا نەشەڕی لەگەڵ پروس ونەلەگەڵ ڕوسیاشدا هەبوو.

دەستبەجێ نامەیەکی بۆ پاشای مەدرید نارد ناڕاستەوخۆش سەرۆك وەزیرانی ئەو وڵاتەی ئاگادارکردبۆوە کەئەم (15) هەزار سەربازەی ئیسپانیا سەبارەت بەسوپای فەرەنسا ئەوەندە گرنگ نییە، بەڵام ناپلیۆن لەوەڵامدا بۆ (گۆدوی) سەرۆك وەزیرانی ئیسپانی نووسی، بەپێچەوانەوە ئەو پازدە هەزار سەربازە گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە، دەستەوبەجێ دەوڵەتی ئیسپانیا ئەو (15) هەزار سەربازەی بەدووبەش ناردن بۆ پروسی خۆرهەڵات وبەشەکەی تریشی بۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵات، لەمانگی مایۆی ساڵی (1807)دا ناپلیۆن (8) مارشاڵی لەدەست دابوون کەکۆی گشتی سەربازەکانیان (228) هەزار کەس بوو، ئەمە جگەلەو(170) هەزار سەربازەی پروسیان داگیرکردبوو ولەو وڵاتەدا جێگیربوون وهەتائەو کاتەش لەگەڵ یەکتریدا وەیەك نەکەوتبوونەوە بۆشەڕکردن لەگەڵ ڕوسیادا، لە(26/ی مایۆدا) دانتزیك دوای بەرگری کردنێکی توندو تیژ، تەسلیمی مارشال لوفەور ببوو ولەو قەڵاتە سەربازیەدا کەلوپەلی زۆری سەربازی وخۆراك بەدەست هاتبوو.

شەڕ نزیك ببۆوە، سوپای ڕوسیا بەبەراورد لەگەڵ سوپای فەرەنسادا، چ لەڕووی ژمارەو چ لەڕووی تەیاری کەمتربوو.

---



دیاره لەناو سوپای فەرەنسادا کەمێ گەندەڵی ودزی ودەستبڕی دروستببوو وناپلیۆن بۆ بنبڕکردنی ئەمە زۆر سەرکەوتوونەبوو، وەك لەمەوبەر گوتمان سەربازانی فەرەنسا لەناو دوو وڵاتی وێرانی داگیرکراودا(پرۆس و پۆڵەندا) بە چ دەردەسەری وسەختی دەژیان وزستانی ساڵی (1807)یان چۆن بەسەنگەساری بەسەربرد، بەڵام سوپای ڕوسیا لەئەمانیش سەختتر دەژیان، سەربازەکانی ڕوسیا لەسەرمان ولەبرساندا وەك مێشولە دەمردن.

ئیتر ئەلکسەندەری یەکەم لەئوسترلینزێکیتر[٩٩٩] نەدەترسا، لەناو دەسەڵاتدارانی حکومەت وکۆشکی پاشایەتیدا دەمێکبوو کەوتبۆ حۆیی وبیری لەوەکردبۆوە دەبێ گەلی ڕوسیا ئیمکاناتی ماددی بۆ ئەوشەڕە گەورەی پێشیەوە بدات وکەڵك لەمە وەربگیردرێت. ئەم جۆرە بیرکردنەوەی ئیمپراتۆری ڕوسیا زۆر ئاکامی سەیرو پێکەنیناوی هەبوون، ئەم بیرۆکە پێشنیاری ئەنجومەنی کەشیشانی ئەرتدوکسی ڕوسیاکراو دوای ئەوەی ئەمانە ئەمەیان پێگوترا ئەوانیش بەدەستپێشخەری وداهێنانی خۆیان فتوایەکیان دەرکرد کەسەبارەت بەو ڕۆژگارە شتێکی سەیرو گاڵتەجاڕی بوو، ئەویش ئەوەبوو: ڕۆحانییەکان وەك نوێنەری مەزهەبی ئەرتدوکسی مەسیحی، ناپلیۆنیان بەسەر مەشقی دجالان و دوژمنی دێرینی مەسیحیەت ودامەزرێنەری دادگایی کردنی جولەکان ڕایانگەیاند، کەناپلیۆن نوکڵی لەئایینی مەسیحی دەکات ودەیەوێت ببێتە کەشیشی مسوڵمان، ئەمە ئاماژەیەکبوو بۆ شەڕەکانی میسرو سوریا، تەنها بۆیەش لەگەڵ ڕوسیادا دەجەنگێت بۆ ئەوەی کڵێسای ئەرتدوکسی وێران بکات.

لەسەرەتای مانگی مایۆدا هەموو ئەو یەکە سەربازیانەی کەلەگوندو ئاوایی وشارو شارۆچکەکاندا جێگیربوون، بەفەرمانی ناپلیۆن گەڕانەوە سەربازگەکان وماوەیەك دوای ئەمە سوپای فەرەنسا تەواو ئامادەی شەڕکردن بوو.

بەڵام بنیگسی فەرماندەی گشتی سوپای ڕوسیا، بڕیاریدابوو لەسەرتای مانگی یۆنیۆدا دەست بۆ شەڕو تێکهەڵچوونی سەربازی ببات، ئەلکسەندەری یەکەم فشاری خستبۆسەر فەرماندەی گشتی سوپای ڕوسیا دەست بۆ شەڕکردن نەبات تاچەند ڕۆژێکیتر، بەڵام بنیگسن، بەو شارەزاییەی خۆی لەشەڕو ئەزموون وەرگرتنی لەشەڕی ئایلو کەزەبرێکی کوشندەیان لەسوپای فەرنسادا، ئیمپراتۆری ڕوسیای ڕازیکرد ئەم هەلە لەدەست نەدرێت وهەرچی زووترە هێرش بکرێتەسەر سوپای ناپلیۆن وسەرماو سۆڵەش لەبەرژەوەندی سوپای ڕوسیادایە.

سوپای ڕوسیا لەڕۆژی (5/ی یۆنیۆ)دا دەستیکرد بەشەڕ، بەفەرمانی بنیگسن، هێزی باگتراتیون، هێرشیانکردەسەر هێزی مارشال (نی) کەلایەکی بەرەی شەڕی گرتبوو وکەمێ دوورتر لەسوپای سەرەکی فەرنسا جێگیرببوو، لەوکاتەشدا پلاتۆف، ئەمیر تومان قزاقان، لەڕووباری ئال دەپەڕییەوە، مارشال نی لەبەرامبەر ئەو هێرشەدا کەمکەم پاشەکشەی کرد، سوپای ڕووسیا لەهەموو شوێنەکاندا دەستیانکرد بەشەڕ.

ناپلیۆن بڕیاری دابوو لەڕۆژی(10/ی یۆنیۆ دەستبکات بەشەڕ، بەڵام ئەم دەستپێشخەریەی ڕوسەکان وایکرد دەستبەجێ نەخشەی شەڕەکەی بگۆڕێت، کاتێ گەیشتە شوێنی شەڕەکە بینی سوپای ڕوسیا شەڕیان ڕاگرتووەو دوای لەشکری مارشال نی ناکەون، ئەمە تەنها(24) سەعاتی خایاندو دووبارە ڕوسەکان دەستیانکردەوە بەشەڕکردن، دەستبەجێ ناپلیۆن شەش

---

[٩٩٩] - ئوسترلینز : ئەو شەڕەیە کەئەمساوی و ڕوسەکان بەسەختی تێدا تێشکان. (و- کوردی)



لەشکری سوپای خۆی یەك خستن وسەربازەکانی کاردیشی لەگەڵ خستن کەژمارەیان (125) هەزار کەس بوو وفەرمانی بەمارشالەکەی خۆیدا یەك زەبری گورچکبڕ لەسوپای ڕوسیا بدات.

لەوکاتەدا بنیگسن، فەرماندەی گشتی سوپای ڕوسیا، لەبەرەیەکی شەڕدا (85) هەزار سەربازو لەلایەکەی تریشدا (10) هەزار سەربازی لەدەستدابوون وئامادەی شەڕبوون لەنزیك هایلسبرگدا، بنیگسن توشی شەڕێکی سەختبۆوە لەگەڵ سوپای فەرنساداو ئەم شەڕەش چەند سەعاتێکی خایاند، لەوشەڕەدا سوپای فەرەنسا (8) هەزار سەربازو سوپای ڕوسیاش (10) هەزار سەربازیان تێداچوون، تەنانەت خودی بنیگسنیش بریندارببوو، ئینجا ناپلیۆن دوو لەشکری خۆی ناردەسەر ڕێگای کونیکسبرگ ولەئەنجامی ئەوەدا بینگسن ناچاربوو بەرەوبارتنشتاین پاشەکشەبکات، بەبۆچوونی بینکسن، شەڕی خایلسبرگ دەبۆهۆی دواخستنی ناپلیۆن، ئیمپراتۆری فەرەنسا زۆرینەی هێزەکەی خۆی یەکسەرە بەڕێگای ئایلودا بەرەو کونیکسبرگ برد، پێشبینی ئەوەشی دەکرد دوژمنەکەی دەیەوێت، پایتەختی پروسی خۆرهەڵات ڕزگار بکات ، لەڕۆژی(14/ی یۆنیۆ)دا لەکاتژمێر (3)ی شەو، مارشال لان بینی سوپای ڕوسیا کەپێشتر لەشارێکی بچوکی فریدلنددا جێگیربوون دەیانەوێت بەرەو خۆرئاوای ڕووباری ئال بڕۆن تابەرەو کونیکسبرك بچن، لان دەستبەجێ لەشکرەکەی بۆ پێشگیری ئەوان نارد.

بەمجۆرە شەڕێکی ترسناکی ڕۆژی(14/ی یۆنیۆی سالی (1807) کۆتایی بەوجەنگە هێنا. مارشال لان چەند ئەفسەرێکی خۆی بۆلای ناپلیۆن ناردن تاشێوەی شەڕەکە بەناپلیۆن بڵێن، ئەو فەرمانیدا هەموو تۆپخانەکەیان بکەوێتەڕێ وبۆخۆشی چووە مەیدانی شەڕی کارزار، ئەو پەی بەوەهەڵە ئاکام خراپەی بنیگسن بردبوو کەزۆرینەی سوپاکەی بۆپەڕینەوە لەڕووباری ئال کۆکردبۆوە، ناپلیۆن ئەم ئەرکە مەترسیدارەی بەمارشال (نی) سپارد هەتابچێت هێرشبکاتەسەر بەشە سەرەکییەکەی سوپای دوژمن، ڕوسەکان بەتایبەت گاردە سوارەکانی ژێر فەرماندەی ( کولگری ڤۆف) بەدلێرانە شەڕیاندەکردو بەرگریان لەخۆیاندەکرد، هەندێك لەسەربازەکانی مارشال (نی)یان لەناوبردن، فەرەنسییەکان کەبەزۆرو سەختی فریدلندیان گرتبوو، هەموو پردەکانی سەر ڕووباری ئالیان ڕووخاندن، ناپلیۆن بۆخۆی ڕاستەوخۆ سەرافەتی شەڕەکەی دەکرد، هەرکە گوللە تۆپێك بەسەرسەری ناپلیۆندا بەوزە تێپەڕی، سەربازێکی بینی ڕایکردوو دواتر کەناپلیۆنی بینی سەری نەوی کردوو ڕاوەستا، ناپلیۆنیش ڕووی تێکردو گوتی ئەگەر چارەنوس وابا ئەو گووللە تۆپە بەرتۆکەوتبا ئەوا کەسەت پێش لەژێر زەویدا بای هەربەرت دەکەوت.

زۆرجار بەئازایەتی جەنگانی ڕوسەکان سەرسامبوو، هەرچەندە بنیگسن هەڵەی سەربازی گەورەشی دەکردن، فەرنسییەکان دووچاری ئەگەری زۆر مەترسیدار دەبوونەوە، یەکە سەربازییەکانی ڕوسیا ناچار لەبەرگری تۆپەکانی سوپای فەرەنسا خۆیان بەڕووبارەکە دادەدا، هەندێك هەڵاتن، هەندێکیشیان خۆیاندا بەدەستەوە، بەڵام ژمارەی ئەو سەربازە ڕوسیانەی لەئاوەکەدا خنکابوون لەدیلەکان زۆرتربوون، هەموو تۆپخانەی ڕوسەکان کەوتەدەست سوپای فەرەنسی، بنیگسن، کەزیانی زۆری دابوو وژمارەی سەربازە کوژراو ودیل وبرینداراەکانی لە(25) هەزار زیاتربوو، لەپڕ بەرەو پرەگل کەوتە پاشەکشەکردن وسوپای فەرەنساش کەوتنەدوایان.



هەڵاتن تاکە ڕێگابوو بۆ لەناونەچوونیان، ماوەیەك دوای شەڕی فریدلند، مارشاڵ (سو) کونیکسبرگی داگیرکردو ئەوشارە ئازوقەو کەلوپەلی سەربازی زۆری تێدا بەجێ مابوو کەبریتانیا لەڕێگای دەریاوە گەیاندبوویە ئەوشارە بۆ یارمەتی دانی سوپای ڕوسیا.

سوپای فەرەنسا لەڕۆژی (19/ی یۆنیۆدا)، واتە: پێنج ڕۆژ دوای شەڕی فریندلند، گەیشتە ڕووباری نیمن، پاشماوەی سوپا هەڵاتووەکەی ڕوسیا لەڕووبار پەڕیبۆوە، ناپلیۆن گەیشتە سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا، واتە: تیلیست.
شەودرەنگان، لەنزیك تیپێکی سەربازی فەرنسی کەپاسەوانی ڕووباری نیمن بوون، ئەفسەرێکی لەشکری باگراتیون بەپەڕۆیەکی سپی کەلەدوورەوە رایدەوەشاند بەدیارکەوت، ئەو ئەفسەرە پەیامێکی پێبوو ودەیویست بیگەیەنێتە فەرماندەی سوپای فەرنسی مارشال مورا، ئەویش ئەوەبوو بنیگسن پێشنیاری ڕاگرتنی شەڕی کردبوو، موراش دەستبەجێ نامەکەی بۆ ئیمپراتۆر ناردو ناپلیۆنیش ڕازی بوو ئەم شەڕە خوێناویە کۆتایی پێبێت.

## (6)

ئەلکسەندەر تادواین ساتەوەختەکان گومانی لەوەنەدەکرد کەشەڕ بدۆڕێنێت.

لە(12/ی یۆنیۆدا هەواڵی شەڕی هایلسبرگ بەتێشکانی سوپای ڕوسیا گەیشتبۆ تیلیست، کنستانتینی برای ئیمپراتۆری ڕوسیا بەگفتولفتێکی توندەوە پێی داگرتبوو لەسەرئەوەی ئەلکسەندەر سازش لەگەڵ ناپلیۆندا بکات، ئەو بەبراکەی گوتبوو گەورەم ئەگەر ناتەوێت ئاشتی لەگەڵ فەرەنسییەکاندا بکەیت، ئەوا هەریەك لەسەربازەکانی خۆت دەمانچەیەکیان بدەیەو باخۆیانی پێبکوژن، ئەوکاتە ئاکامەکەی هەمان ئەوەدەبێت کەتۆ بتەوێت شەڕێکیتر بکەیت، تەنانەت دەروازەی ئیمپراتۆریەتی تۆش دەکەوێتەدەست سوپای فەرەنسا، گوێی ئەلکسەندەر بەوجۆرە قسانە ڕانەهاتبوو، ئەو شەوەی (14/ی یۆنیۆ، واتە لەوکاتەی سوپای ڕوسیا لەفریدلندا تێشکابوو، بۆ پێشوازی کردن لەخۆراك وکەلوپەلی سەربازی تیلسیتی جێهێشتبوو، بەڕێکەوت بەیانی ڕۆژی(15/ی یۆنیۆ، وردەوردە هەواڵی تێشکانی سوپای ڕوسیا لەفریدلند گەیشتە شاری تیلیست، ئەوکاتە زانیان سێ لەسەرچواری سوپای ڕوسیا لەشەڕی فریدلندا لەناوچووەو ئەوانەی توانیویشیانە خۆیان ڕزگاربکەن ئامادەنین بچنەوە بەرەی شەڕ، بنیگسنیش سەری لێشێواوەو نازانێت چی بکات.

لەدوای ئەم پروپاگەندەو مقۆمقۆیانە هەواڵی دروست گەیشت، ئەویش ئەوەبوو: سوپای ڕوسیا لەفریدلندا تێشکاوەو کەمتر لەتێشکانە گەورەکەی ئوسترلیتز نییەو ناپلیۆن وسوپای مەزنی ئەو ئامادەن هێرشبکەنەسەر خاکی (III) ڕوسیا، ئیتر ترس لەدڵی فەرماندە پلەبەرزەکانی دەوڵەت گەڕا.

دنیس داڤیدۆف، پارتیزانی بەناوبانگی ساڵی (1812) دوای ڕووداوەکەی شەڕی فریدلند، کەسوپای ڕوسیای تێدا تەفروتونابوو بەمجۆرە دەنووسێت (من لە 18/ی یۆنیۆدا گەیشتمە بارەگای گشتی فەرماندەی سوپای ڕوسیا، لەوێ کۆمەڵێك خەڵکی هەمەڕەگەزی لێبوون، ئینگلیزو سویدی و پروسی و بنەماڵەی پاشایەتی فەرنساو خاوەن پلەوپایەکانی دەوڵەتی



ڕوسی و سەرلەشکرو کەسایەتی بیانی و بۆرژوازی و فەرمانبەرانی سوپاو فەرمانگەکانی ڕوسی و ڕاوو ڕووتکەران و [201] دەلاڵانی سیاسی و ...هیتر، کەدەستخەڕۆ وسەرگەدان مابوونەوەو تێکیانەوە دەهاویشت و وەرەو بڕۆ و ژاوەژاویان بوو، هات وهوت و ترس و سام ویگرەو بەردە شەپۆلی دەدان ودەتگوت نیوسەعاتیتر دنیا خراپدەبێت)

بنیگسن داوای لەئەلکسەندەر کرد ڕێککەوتننامەی ڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ ناپلیۆندا مۆربکرێت، ئەم جارەیان ئەلکسەندەر ناچاربوو بۆئەمە ناپلیۆن وەك لەمەوبەر باسمانکرد هەرکە پێشنیاری ڕاگرتنی شەڕی بەدەست گەیشت ڕازی بوو، ئیتر درێژەدانی شەڕی لەگەڵ ڕوسیادا بەپێویست نەدەزانی، چونکە ئەمە خۆئامادەکردنەوەی سەرلەبەری دەویست.

دەوڵەتی پروس لەبەین چووبوو، ڕوسیاش ئامادەبوو گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا جێبەجێ بکات وبێتە گەل گروپی سیاسی ژێر دەسەلاتی بڕیارەکانی وابەستە بەگەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا کەناپلیۆن دەریکردبوون، لەم کاتەدا ناپلیۆن هیچی تری لەئەلکسەندەر داوا نەدەکرد، لە(22/ی یۆنیۆ)دا ئەلکسەندەر ژنرال کنت لبانوف ڕوستوفسکی وەك نوێنەری خۆی ناردەلای ناپلیۆن کەئەوکات ناوبراو لەشاری تیلیست دابوو، ناپلیۆن سەرەتای گفتوگۆکردنی لەگەڵ نوێنەری ئیمپراتۆری ڕوسیادا بەمجۆرە دەستپێکرد (لەومێژە نزیکبۆوە کەنەخشەیەکی جوگرافیایی پانی لەسەر ڕاخرابوو و ڕووباری ڤستولی نیشانی ڕوستوفسکی داو گوتی: ئێرە سنووری نێوان دوو ئیمپراتۆرە، یەکێکیان ئیمپراتۆرەکەی تۆیەو ئەوی تریشیان منم)

بەمجۆرە ناپلیۆن نیازی خۆی کەسڕینەوەی پروس ودابەشکردنی خاکی پۆلۆنیای دەردەخست خستەڕوو.

لەو ڕۆژانەدا ئەلکسەندەر لەئاولیدا نیشتەجێ ببوو، لەو ڕۆژە مەترسیدارانەدا، لەکاتی ڕاگرتنی شەڕەوە هەتا گەڕانەوەی لبانوف، ئیمپراتۆری ڕوسیا لەحاڵەتێکی ڕۆحی خراپبوو تەنانەت بەدرێژایی ئەوماوەیە وەك ئەوساتە وەختە پەشۆکابوو کەهەواڵی تێشکانی سوپای ڕوسیایان لەئوستراینزدا پێگەیاند، ناپلیۆن دەیتوانی لەماوەی (10) ڕۆژدا بگاتە [202] ویلنو.

ئەلکسەندەر دانی بەوەدانا کەزۆر سەربازو ئەفسەرمان تێداچوون، زۆر لەفەرماندە پلە بەرزەکانمان – یان نەخۆش کەوتوون – یان بریندارن، بەدڵنیاییەوە ڕۆژگارێکی ناهەموارو سەخت بەسەر پروسدا هاتبوو، بەلام لەژیاندا ڕۆژگاری وابەسەردێت پێویستە مرۆڤ پێش هەموو شتێك بیر لەشانسی خۆی بکاتەوەو ئاگاداری خۆی بکات، جگەلەوەی دەبێ لەسەریەك بنەمای سەرەکی لانەدات ئەویش ئەوەیە پەیڕەوی کاری خێرو خۆشی کردن بێت لەپێناو وڵاتەکەیدا) ئینجا بیر لەبەخت وپارێزگاری کردنی خۆی.

لەچاوپێکەوتنێکی تایبەتی ڕۆژنامەی پرنس کوراکین دا کەلەشاولی لەگەڵیدا سازکرابوو، ئەمەی بەسەر زماندا هاتبوو کەناچارە دوای (24) سەعات لەگەیشتنی هەواڵی تێشکانی سوپای ڕوسیا لەفریدلندا، گۆڕانکاری سەرەکی لەسیاسەتەکانی خۆیدابکات وبڕیاربدات ئاشتی بکات، خۆئەگەر پێویست بکات ئەوا لەگەڵ ناپلیۆندا هاوپەیمانیش دەبەستێت، دیارە بەهۆی ئەم تێشکان وئاشتی کردنەی ڕوسیا لەگەڵ فەرەنسادا ئیتر دەوڵەتی پروس بەتەواوەتی تێدادەچوو– یان ئەوپەڕی پارچەیەکی بچوکی دەمایەوە، ئەمەش مەسەلەیەك بوو لەگفتوگۆکانی ئاشتی کردندا بەپلە دوو دەهات،

ئەو دەربارییانەی کەلەدەوروبەری تزاردابوون لەرزو تایان گرتبوو لەترساندا، لەترسی زەبری پێش سوپایانی ناپلیۆن.

---

[201] - ڕاوو ڕوتکەران: لێرەدا مەبەست لەو کەسانەیە کەبەرووکەش شەڕدەکەن ودژی دەسەلاتێکن، بەلام لەڕاستیدا دوای دەستکەوتی ماددی کەوتوون. (و- کوردی)

[202] - بگاتە: بەسوپای فەرەنسا داگیری بکات. (و- کوردی)

کاتێ ئەلکسەندەر لەوەئاگادارکرایەوە ناپلیۆن ڕازی بووە بەئاگربەست، خۆشی وشادی باڵی کێشاو هەموویان هەڵبڕانەوە، دەستبەجێ ئەلکسەندەر فەرمانی دەرکرد پەیامێك بنێرێت بۆ ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان ودڵنیای بکاتەوە لەوەی تزار تەواو حەزدەکات هاوپەیمانیەتیەکی توندوتۆڵ لەگەڵ ناپلیۆندا ببەستێت وتەنها پەیوەندی باش ویەکدیگیری نێوان فەرەنساو ڕوسیا دەتوانێت بەختیاری وئاشتی لەدنیادا بەرپابکات، تزار دوای مۆرکردنی ئاگربەست حەزیدەکرد بەشەخسی چاوی بەناپلیۆن بکەوێت، ئیتر ئەلکسەندەر نەیدەتوانی دۆخی خۆی لەفردریك ویلهلم بشارێتەوە کەتادوایین ساتەوەخت دڵی بەئەو خۆشکردبوو، تزار هەموو ڕێنمایی و ڕوونکردنەوەکانی خۆی بەئەو گوت و پاشای پروسیش داواکاری وازهێنانی لەشەڕی بۆ ناپلیۆن نارد، ئەو دەیویست هاردنبرکی وەزیری خۆی کەنیشتمان پەرستێکی توندڕەوبوو بۆ بارەگانی گشتی هێزی سەربازی فەرەنسا کەلەتیلسیت دابوو بنێرێت، بەڵام کاتێ ئەم ناوەیان لای ناپلیۆن هێنا، ناوبراو توڕەبوو وهاواریکردو پیلاقەی بەزەویدا دان وگوتی: ئیتر کەس ناوی هاردنبرگ لای من نەهێنێت.

لە 25/ی یۆنیۆی ساڵی(1807)دا یەکەم دیدار لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆردا ڕوویدا،بۆ ئەوەی نەئەلکسەندەر پێ بنێتەسەر خاکی ژێر ئیمپراتۆریەتی فەرەنسییەکان ونەناپلیۆنیش پێ بنێتەسەر خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا، کەلەکێکی گەورەی تەختە کەچادرێکی ڕازاوەی لەسەر هەڵدرابوو، هێنایانە ناوەڕاستی ڕووبارەکەو لەوێدا لەنگەریان پێگرت، هەموو ئەو کەسانەی گاردی تایبەتی ناپلیۆن بوون لەم بەری ڕووبارەکە بەڕیزوەستابوون ولەوبەریش ئەوانەی لەگەڵ ئەلکسەندەردا هاتبوون بەهەمان شێوە ڕاوەستابوون.

دنیس داویدوف، ئەم ڕووداوەی بەچاوی خۆی بینیوەو لەیاداشتەکانیدا نووسیویەتی ولەهەموو مێژوو نووسان باشتر باسی ئەمە دەکات ودەڵێت: ئێمە چووین تاچاومان بەوسەردارە گەورەیە، ئەو سیاسەتمەدارە مەزنە، ئەو پاشادانەرە، ئەو سوپاسالارە جوامێرە بکەوێت کەیەك لەدوای یەك سوپای وڵاتانی ئەورووپای تێکشکاندبوو وئێستا گەیشتۆتەسەر سنووری وڵاتی ئێمە، ئێمە دەچووین بۆبینینی پیاوێك کەتوانای ئەوەی هەبوو هەموو ئەوکەسانەی سەروکاریان لەگەڵ ئەودایە بەشێوەیەکی ڕەها ملچەکی خۆی بکات، پیاوێك کەڕۆحیەتێکی نائاسایی ولەڕادەبەدەری هەبوو...،وکاتێ گەیشتینە لێواری ڕووبارەکە، ناپلیۆنمان بینی لەنێوان گاردەکانی خۆیدا سواری ئەسپەکەی ببوو وئاوسارەکەی بەدەستەوە گرتبوو، هاوارو تلیلیی وخۆشی وشادی دەربڕینی ئەوانەی لەدەوری بوون، لەوبەرییەوە گوێی ئێمەی کاس کردبوو، ئەوانەی لەپێشیەوە دەڕۆیشتن نزیکەی چوارسەت کەس دەبوون.. لەوساتەوەختەدا هەستکردن بەمەزنی ئەوپیاوە هۆشی هەموو لایەکی داگیرکردبوو، دواتر هەموو خەڵکەکە ڕوویان بۆخوارێتر وەرگێڕاو سەیری ئەو بەلەمەیانکرد کەپیاوە مەزنەکە، ئەوسەردارە بێ هاوتایەی دەهێنایە ناوەڕاستی ڕووبارەکە، ئەو سەردارەی کەنەزیری ئەو لەڕۆژگاری ئەسکەندەری مەزن وقەیسەرەوە، نەکەس بینیبویی ونەکەس بیستبووی، ئەوسەردارەی کەبەڕەوانبێژی وژیری خۆی بەهۆی ملدانی گەلێکی خاوەن کۆنترین وپێشکەوتوترین شارستانیەتی خستبۆژێر دەسەڵاتی خۆیی و سەرکردایەتی دەکردن، کەوتبۆ پێش ئەسکەندەرو قەیسەر، بەڵام (دنیس داویدوف، بەهۆی بوونی سانسۆر لەسەر بڵاوکراوەکان نەیدەتوانی لەیاداشتەکانی خۆیدا ئەم هەستەی خۆی بنووسێتەوە، کەنەك هەرتەنها ئەو بەڵکو زۆرینەی ئەفسەرەانی ڕوسیش سەبارەت بەئیمپراتۆری ڕوسیا تێبینیان کردبوو، ئەو



ئیمپراتۆرەی کەبەپێی گوتەی ئەو هەڵچوونی دەروونی بەڕووبەش ئارام شاردبۆوە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئێمە بەهۆی ئەو کەسانەی کەدواتر باسیان کردوەو لەوێدابوون ئاگادرین.

لەناو کۆڕو کۆبوونەوەکانی ڕوسیادا ئاشتی کردنەکەی تیلیست– یان زۆر بەتەنگیتر لەتێشکانەی سوپای ڕوسیا لەئوسترلیتز سەیردەکردو بڕوای ئەرستۆکراتە گەنجەکان وئازادیخوازەکان لەگەڵ بۆچوونی ئەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداری شەڕیانکردبوو، یەکیان دەگرتەوە، لەیەکێك لەشعرێکی پوشکیندا (1824) بناوی( ئەلکسەندەر جارێکیتر لەخەویدا ناپلیۆن دەبینێتەوە) دەڵێت:

بەو شێوەیەی کەلەمەیدانی شەڕی ئوسترلیتزدا دیارکەوت،

لەوێ کەباڵی ڕاستی ئەو لەشکری خۆرهەڵاتی شکاردەکرد،

ئینجا ڕوسەکانی([203]) ، فێرکرد چۆن لەتێداچوون هەڵبێن.

دووبارە بەو شێوەی کەدەستی داگیرکەر، ئاشتی بەنەنگییەوە قبوڵدەکات،

( لەتیلیستدا لەبەرچاوی تزارەوە گەنجێك بەدیارکەوت )

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەقی ئەوشعرە بەتەواوی بەچاپ گەیێندرا، لەچاپەکانی کۆندا کەمێ دەستکاری دەکراو بەشی دووەمی دێڕی پێش کۆتایی بەم جۆرە بڵاو دەکرایەوە( ئاشتی ونەنگی ....) ئەمەش ناکۆکبوو لەگەڵ خودی مەبەستەکەی پوشکیندا، هەرچۆنێکبێت ئەوپیاڵەی خستیانەسەر لێوەکانی ئەلکسەندەر ئەوەندە تاڵنەبوو کەوەك بۆخۆی چاوەڕوانی دەکرد، هەرکەئەو دوو ئیمپراتۆرە چوونەسەر ئەو شوێنە دیاریکراوە، ناپلیۆن باوەشی بەئەلکسەندەردا کردوو هەردووکیان چوونەژێر خێمەکەو گفتوگۆ دەستی پێکردو نزیکەی دوو سەعاتی خایاند، هیچ یەك لەم دوو ئیمپراتۆرە وردەکاری ئەم گفتوگۆو ڕێککەوتننەیان باسنەکرد، بەڵام دواتر هەندێ لەو ڕێککەوتننامەیە ئاشکرابوو ودوای چەند ڕۆژێك ئەو ئاشتی کردنە مۆرکراو زیاتر شتەکە ڕوونبۆوە، ناپلیۆن لەتزاری پرسی: بۆدەبێ ئێمە لەگەڵ یەکتریدا بجەنگین؟

ئەسکەندەر گوتی:

بەڕێز منیش بەبارتەقاوی تۆ نەفرەتم لەبریتانیایە، ئیتر لێرەودوا بەیاوەری ئێوە، شەڕی بریتانیا دەکەین. ناپلیۆن وەڵامی دایەوەو گوتی: کەواتە ئاشتی کردن لەنێوان ئێمەدا مەیسەرە.

بەدرێژایی ئەوکاتەی ئەو دوو ئیمپراتۆرە خەریکی دانوستان بوون، پاشای پروس لەم بەری بەشی خۆرهەڵاتی رووبارەکە لەچاوەڕوانیدا مابۆوە، بەڵکو بانگهێشتی ئەویشبکەن، ناپلیۆن هەتاڕۆژی دواتر قبوڵی نەکرد ناوبراو بەشداری گفتوگۆکانی ئاشتی بکات.

---

[203] - گوایا پوشکین لەم دێرە شعرەیدا مەبەستی لەئیمپراتۆری ڕوسیا، ئەلکسەندەرە. (و- فارسی)



لەوکاتەی خەریکی بوو لێکجیاببنەوە، ئیمپراتۆری فەرەنسا داوای لەئیمپراتۆری ڕوسیاکرد بۆخوانی نیوەڕۆ لای ئەو بمێنێتەوە، بەڵام پاشای پروسی دەعوەت نەکرد، تەنانەت بەقورسیشەوە سەری خواحافیزی کردنی بۆ لەقاندو پشتی تێکرد، لەڕۆژی(26/ی یۆنیۆ)دا لەسەرداوای ناپلیۆن ئەلکسەندەر لەڕووبارەکە پەڕیەوە تابچێت لەتیلیستدا خوانی نیوەڕۆ لای ناپلیۆن بخوات. ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ئەم دووانە هەموو ڕۆژێك یەکتریان دەبینی، لەسەرەتای ئەو دیدارانەدا ناپلیۆن ڕێگای نەدەدا هیچ یەك لەوەزیرەکانی لەوردانیشتنانەدا ئامادەبن.

ناپلیۆن بەئەلکسەندەری گوت: من دەبمە باش کاتبی تۆ و تۆش ببە باش کاتبی من)

لەهەمان ئەو قسانەی ناپلیۆنەوە، ڕوونبۆوە بەڕاستی پروس کەوتۆتە چ دۆخێکی خراپەوە، ناپلیۆن بەڕاشکاوی پێشنیاری دابەشکردنی دەوڵەتی پروسی دەکرد، بەومانایەی ئەوخاکەی کەوتبۆ بەشی خۆرهەڵاتی ڕووباری ویستول بخرێتەژێر دەسەڵاتی ئەلکسەندەرو ئەوەشی دەکەوتە خۆرئاوای ڕووباری ویتولیش بخرابایەسەر ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا، ناپلیۆن حەزی نەدەکرد یەك وشەش لەگەڵ فردریك ویلهلمدا بدوێت، لەهەندێك شتی دەگمەندا کەمۆڵەتی بەئەودەدا بێتەلای، ئەویش زیاتر بۆ سەرکۆنەکردن وسوکایەتی کردنبوو بەئەو، تەنانەت ئیمپراتۆری فەرەنسی قسەی نابەجێ وسوکیشی لەڕووی ئەلکسەندەردا بەدۆستەکەی ئەو دەگوت و پێی دەگوت: پاشای ڕەزیل وسوپای ڕەزیل و ئەو دەوڵەتەی کەهەموو دنیای فریوداوە شایستەی ئەوەنییە بمێنێتەوەو بوونی هەبێت، ئەلکسەندەریش تەنها بەزەردەخەنەیەك وەڵامی ئەم قسانەی ناپلیۆنی دەدایەوەو جارجارەش دەیگوت هەرچەندە پاشای پروسیان شایستەی سەرزەنشت کردنە، بەڵام ڕێگابدە هەرنەبێ هەندێك لەخاکی پروس بۆ پاشایەتی کردنی فریدریك ویلهلم بمێنێتەوە.

پاشای تۆقیوی پروس ئامادەی کردنی هەموو کارێکبوو، تەنانەت هەتا عشوەگەری وزیبایی هاوسەرەکەشی لەڕووی دڵسۆزی بۆ وەدەتهێنانی نیازەکانی بەکاربهێنێت، بۆیە فەرمانیدا شاژن لویز کەجوانیەکی بێهاوتای هەبوو، بهێنن بۆ شاری تیلیست، ئەم شابانویە هەمان ئەو کەسەبوو کەناپلیۆن لەسەرەتای شەڕکردنی لەگەڵ دەوڵەتی پروسدا، بەچاوی دوژمنی سەرەکی خۆی سەیری دەکردو فەرمانی دابوو لەبڵاوکراوەکانی فەرەنسادا شتی ناشیرین لەسەر ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو بنووسن، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا لەدەرباری پروسدا هەموویان ئومێدی ئەوەیان هەبوو یەك دیداری نهێنی ئەم خاتونە لەگەڵ ناپلیۆنی سەرکێش وسەرکەوتودا، کەمێ توڕەیی و کەللەڕەقی ئیمپراتۆری فەرەنسی کەمبکاتەوەو بەزەیی بجوڵێت. بۆیە بەپەلە شاژنیان سازکردو ڕەوانەیانکرد، هەرچەندە ئەوکارەش تەواو جێگای دڵخۆشی نەبوو، چونکە دەیانزانی ناپلیۆن زۆر سەروکاری– یان شەیدانی ئافرەت نییە، هەرچەند دڵیشی پێدەدان، هەرچۆنێکبێت چاوپێکەوتنەکە لەناو کۆشکی تیلیستدا ڕێکخرا، دەبوا شاژن هەوڵبدات هەرنەبێ ماگدبورگ وچەند شوێنێکیتر بگێڕێتەوەسەر پروس، لەوکاتەی ناپلیۆن بەجلوبەرگی ڕاوکردنەوە گەڕایەوەو لەبەردەم دەروازەی کۆشکدا دابەزی، شاژن لویز بەوپەڕی خۆڕازاندنەوەو شکۆمەندانە بەپیریەوە چوو، ئەم دیدارە دووقۆڵیە ماوەیەکی دوورو درێژی خایاند، هەتا پاشا فریدریك ویلهلم ئیتر تەنگەتاوبوو وچیتر نەیتوانی بەرگەی ئەم نەنگیەو چاوکسکەو سەیرکردنە پڕماناکانی کەسانی دەرباری خۆی بگرێت، غیرەتی وەبەرخۆی هێناو چووە ژووری دانوستانی نێوان شاژن و ناپلیۆن، پێش ئەوەی دانیشتنەکە بگاتە ئەنجام وخاتوو لویز هیچی دەستکەوێت، کۆتایی هات.



دواتر ناپلیۆن بەدەم گاڵتەکردنەوە بەمارشالەکانی خۆی گوتبوو: ئەگەر پاشای پروس کەمێ درەنگتر هاتبایە ژوورێ ئەوامن ناوچەی ماگدبورگم بەشاژن دەبەخشی، پروسی قەدیم و پومرانی و براندمبورگ و سلیزی لەدەست بنەماڵەی شانشینی هوهنزولرندا مانەوە، بەڵام ولایەتەکانیتر چ لەخۆرهەڵات و چ لەخۆرئاوایدا لێیستێندرانەوە، جگەلەمەش بەنووسینی ڕستەیەك لەماددەی چواری ڕێککەوتننامەی تیلیستدا، شکۆمەندی میللی پروسی خستەژێر پێ، ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیەش ئەمەبووکە، ئەم چوار ولایەتەش تەنها لەبەر خاتری ئیمپراتۆری ڕوسیا دەدەمەوە شای پروس.

هەموو خاکی خۆرئاوای ڕووباری ئەلبی پروس، خرایە ژێر دەسەڵاتی پاشای وستفال کەتازە بەدەستی ناپلیۆن دامەزرابوو، ولایەتەکانی دوك نشینی گەورە(هس)ی هاتوریش کرانە شانشینێکی تازەو خرانەژێر دەسەڵاتی برای ناپلیۆن ژروم ، ئەوخاکەی پۆلۆنیایە کە لەدەوڵەتی پروس ستێندرابۆوە – ولایەتەکانی پزنان و وارشۆی خستەژێر دەسەڵاتی پاشای ساکس ، ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاش لەسەر داوای ناپلیۆن بەشێکی بچوکی بیەلوستوکی خستەژێر ڕکێفی خۆی، یەك پەیمانی بەرگری و یەکدەستی لەنێوان ئەو دوو ئیمپراتۆرەدا مۆرکراو بەهۆی ئەمەوە ڕوویابوو بەلایەنی جێبەجێ کردنی گەمارۆی ئابوری لەسەر بەریتانیا کە ناپلیۆن بڕیاری لەسەردابوو .

لەڕۆژی (8/ی یۆلیۆی ساڵێ 1807) ڕێککەوتننامەی تیلسیت، کەسەبارەت بەپروس وهەموو خاکی ئالمانیا ئامەموار بوو، مۆرکرا.

لەتیلسیتدا هەتا خۆرئاوابوونی ئەوڕۆژە ئاهەنگ وشادی دەستپێکرد. بەدرێژایی ئەو ڕۆژانە هەردوو ئیمپراتۆر خۆیان بەدوو دۆست وهاوپەیمانی یەکگرتوویی هەمیشەیی نیشاندا، ناپلۆن هەموو هەوڵێکی خۆی خستبۆگەر بۆئەوەی خوشەویستی خۆی بۆئەو دوژمنەی دوێنێی، بەدیاربخات. لەڕۆژی(9/ی یۆلیۆ)دا ناپلیۆن و ئەلکسەندەر هەردوو هێزی گاردی فەرەنسی و ڕوسیان بەسەرکردەوە، کاتی لەیەکترجیابوونەوەش لەبەرچاوی ئەوهەموو کەسانەی کەلەمبەراوبەری ڕووبارەکەدا ڕاوەستابوون، بەیەکتریانەوە ماچکرد. جگەلەو دوو ئیمپراتۆرە کەسیتر هەستی بەو گۆرانە گەورەیەی بارو دۆخی دنیادا نەدەکرد، کەلەم چەند ڕۆژەی ڕێککەوتننامەی تیلسیتدا ڕوویدابوو.



# لەتیلیستەوە هەتا ڤاگرام

## ( 1 )

لەوکاتەی لەسەرتاسەری ئەڵمانیادا بەخۆپیـشاندانی شـادییەوە پێشوازیان لـەناپلیۆن دەکـرد، لەتیلیـستەوە بۆپـاریس گەڕایەوە، ئێستا ئەو بەڕووکەش گەیشتبۆ ئەوپەڕی بەهێزی، بەجۆرێك بەدرێژایی مێژوو هیچ سەرکردەیەك نەیتوانیبوو بگاتە ئەو ئاستە، ئیمپراتۆری سەرکوتکەر کەبەرفراوانیەتی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا بریتیبوو لە: بەلجیکا وئەڵمانیای خۆرئـاواو پیـەمون و ژن و پاشـای ئیتالیـاو پـارێزەری ئـەو و هاوپەیمانیـەتی رن، کـەدواتر ساکسیش هاتـەناو ئـەو هاوپەیمانیـە، وفەرمانڕەوای هۆڵەنداو ناپولی، کەبراکەی پاشای ئەویش بوو. هەروەها لەپانتایی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیـدا فـەرمانڕەوایی ڕەهای هەبوو، دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئەڵمانیای ناوەڕاست و بەشێك لەئەڵمانیای خۆرهەڵات کەبەناوی شانشینی وستفالی بەبراکـەی خـۆی ( ژروم)ی بەخـشیبوو، بەشـێکی زۆری هابـسبورگیش کەلەنەمـسا سـتێندرابۆوەو درابـۆ پاشـای بـاویر کەدەستنیشانکراوی خۆی بوو، هەروەها سەردەریای سەرووی ئەورووپا کەلەوێدا شارەکانی هامبورگ و برم و لوبك و دانتزیگ و کونیکسبرگ لەژێر دەسەڵاتی سوپاکەی ئەودابوون، پۆڵەنداش کەتازە خەریکی دروستکردنی سوپای تازەبوو لەژێر دەسەڵاتی مارشال داوو بوو وبەناو فەرمانڕەوای ئەوێش پاشای ساکس– بەلەقەبی دوکی گەورە دەستنیشانی دەستی ناپلیۆن بـوو، ئیمپراتۆری فەرنسییەکان فەرمانڕەوایی هەموو ئەو پانتاییە بەرفاوانەی ئەروپای دەکرد.

جگەلەمانەش دورگەکانی ئایۆنین [204] ، شاری کاتارو [205] ، بەشێکیش لەخاکی سەر دەریای ئـەدراتیك لـەژێر دەسـەڵاتی ناپلیۆندابوو، پروس کەتەنها خاکێکی کەم و دیاریکراوی مابۆوەو خۆپرچەککردنی سنووردارکرابوو، کەوتبۆ ژێرباری چەندین جۆر باجدان وبەچەند قسەیەك کەلەدەمی ناپلیۆنەوە هاتبادەرێ لەترساندا چەق وچۆی دەگرت، نەمساش قەراقپی لێکردبوو ودەم لەکوت مابۆوەو ملکەچی فەرمانەکانی ناپلیۆن بوو، ڕوسیاش هاوپەیمانیەتییەکی بەهێزی لەگەڵ فەرەنسادا مۆرکردبوو، تەنها بریتانیا مابۆوە کەدرێژەی بەشـەڕکردن دەداو کـەوتبۆ بەربـەرەکانی کـردن، دوای گەڕانـەوەی نـاپلیۆن بـۆ پـاریس بەهاوکاری گودن وەزیری ئلبووریی و مولین وەزیری مالییە، کۆمەڵێ چاکسازیان لەدامەزراوە ئیدارییەکان و باجی دەرامەت و گومرگ و.. هێتردا کردو بەهۆی ئەمەوە داهاتی ئیمپراتۆری گەیـشتە نزیکـەی (750– بـۆ70 )ملیـۆن کەلەوەبـەرهێنانی بێبەزەییانەی گەلی فەرنساو گەلانی تری ژێردەستە کێشرابۆوەو وەرگیرابوو، ئـەم بـڕە پارەیـەش بـەس بـوو بـۆ بودجـەو خەرجییەکانی دەوڵەت، یەکێك لەتایبەتکمەندییەکانی ئیدارەکردنی ناپلیۆن ئەوەبوو خـەرجی سـەربازی لەگـەڵ بودجـەی

---

204 – دورگەیەکی یۆنانییە.

205 – شارێکە لەیوگسلافیا. (و- فارسی)



دەوڵەتدا دادەنا، نەك بودجەی تایبەت، ئیعتباری دەوڵەت ئەوەندە بەرەوپێش چـووبوو بـانكی فەرەنسا كەلەسەردەمی ناپلیۆندا دامەزرا، دانی قەرزی بەبری (4٪ )ی لێوەردەگیرا، واتە، بەسود، كەلەسـاڵانی 1804 و1805)دا (10٪) بـوو، سالانە باجی بەڕێژەی ( 36) ملیۆن فرانكی زێڕەی دەدایە فەرەنسا ئەمە ئەو پارەیـەبوو كەپاشـای ئیتالیـا پێشكەش بەئیمپراتۆری فەرنسای دەكرد.

بەڵام خەرجییەكانی ئیداری وڵاتی ئیتالیا لەداهاتی ناوخۆی ئەو وڵاتەوە فەراهەم دەكرا، كەسێك فـەرمانڕەوایی ئیتاڵیـایی دەكرد كەزركوڕەكەی [206] خۆی بوو واتە: ئۆن دوبوهارنە.

پێویست ناكات ئەوەش وەبیربهێنینەوە كەسوپای فەرەنسا لەئیتالیادا جێگیربیوو وخەرجیان لەسەر حكومەتی ئیتالیا بوو، شانشینەكانی تری ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی فەرەنساش بەهەمانشێوە خەرجی ئەو سەربازانەی سوپای مەزنیان دەكێشا كەلەو دەوڵەتانەدا جێگیركرابوون، بەوەرگرتنی ئەو باج وسەرانەیەی كەلەو مەملەكەتانەی ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی فەرەنسا وەردەگیردران، ناپلیۆن لەفەرەنسادا سكەی پێدروستدەكردن و ئەو دراوانەش لەبازاڕەكاندا ئالو وێری پێدەكرا، ئەو زاراوانەی ئیداری كەلەرۆژگاری كنسولیەتیدا لەلایەن خۆیەوە داڕێژرابوون لەساڵی (1807)دا لابران، نـاپلیۆن دەیویـست دەست بۆ چاكسازی وابیات كەئاستی پیشەسازی فەرەنسا بەرەوپێشتر ببا، بەڵام لەو ڕووەوە زەمینە لەبارنەبوو، چونكە ئەو چاكسازیانەی كەگفتوگۆیان لەسەردەكرا، دەبوا هاوتا لەگەڵ درێژەدان بەگەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا بەڕێوەبچێت، كەمێك دوای گەڕانەوەی لەتیلیست ناپلیۆن دەستپێشخەرییەكی سیاسی گەورەی كرد كەبەڕای خۆی بێ كردنی ئەم كارە درێژەدان بەگەمارۆدانی ئابووری سەربریتانیا ناكامی نەدەبوو، ئیتر ناپلیۆن هەموو كارو چالاكییەكانی خستەبواری ئـابووری، پـێش ئەوەی كاریگەری ئەو گەمارۆیە ئابوورییەی سەر بریتانیا لەسەر چینەكانی كۆمەڵایەتی ئیمپراتۆری فەرەنساو سیاسەتەكانی ناپلیۆن بەدیاركەون، پێویستە سەرەتا هۆی سەرەكی ئەمە، واتە: نەخشەی داگیركردنی شێوە دورگەی ئیبری[207] بزانین.

جێگای وەبیرهێنانەوەیە لەپایزی ساڵی (1807)و زستانی ساڵی (1808)دا جۆرە ناكۆكبوونێك لەبۆچوونەكانی مارشال و وەزیرەكانی و خاوەن پلەوپایە بەرزەكانی دەوڵەت لەگەڵ ناپلیۆندا سەری هەڵدا، كۆشكی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن لەجوانی وڕازاوەیدا نغرۆ ببوو، نەجیبزادە كۆن و تازەكان برژوازیە گەورەو كۆن و تازەكان، لەئاهەنگ و میوانداری و شەو نخونییەكاندا لەڕووی زێڕو زیوو باق وبریقەوە لەگەڵ یەكتریدا ڕكەبەرێیان دەكرد، سێڵاوی زێڕو زیوی هەڵەڕژاو دەكەوتە بەرچاو، چونكە شازادەكانی بیانی و پاشایانی دەستنیشانكراو لەلایەن ناپلیۆنەوە، بۆ نیشاندانی خزمەتكردن بەئیمپراتۆری فەرەنسا ماوەی دوورو درێژ لەپاریسدا دەمانەوە، پارەیەكی زۆریان خەرج دەكرد، هەروەها ئاهەنگی شێوە جاویی پەریانیش لەكۆشكەكانی تویلری و فونتن بلو و سن كلو و مالمزونیشدا بەرپادەكران، هەرگیز ڕژێمی شانشینی كۆنی فەرەنسا ئەوجۆرە شكۆمەندییەی بەخۆیەوە نەبینیبوو ونەئەو هەموو ژن و پیاوە داپۆشراو بەزێڕو زیوەی تێدابوون.

---

[206] - وەك لەمەوبەر باسمانكرد، ناپلیۆن بێوەژنێكی هاوسەری ئەفسەرێكی فەرەنسی هێناوە كەلەشەڕەكانی لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسادا كوژرابوو وئەم ژنە كوڕێكی هەبوو بەناوی ئۆژن وەدەكاتە زركوڕی ئیمپراتۆر.
(و- فارسی)

[207] - بەدەوڵەتەكانی ئیسپانیاو پورتوكال دەكوترێت، كەبەشێوە دورگەی ئیبریش ناودەبرێت. (و- كوردی)



بەلام هەموو ئەوانە دەیانزانی لەیەکێك لەو ژوورانەی دەنگی ژاوەژاوی پێناکات گەورەکەیان. بەسەر نەخشەی جوگرافیایی شێوە دورگەی ئیبریدا نوشاوەتەوەو سەیری دەکات.

زۆر لەو ئەفسەرانەی لەوتاهەنگانەدا خەریکی ڕابواردن و سەماکردن بوون، ئەگەری ئەوەهەبوو بەیەك ئاماژەی ئیمپراتۆر دەستبەجێ ئەم هەموو خۆشی وشادییە جێبهێڵن و جارێکیتر گیانی خۆیان بکەنەوە خۆراکی گوللەتۆپەکان و تفەنگەکان، بەلام ئەمە لەبەر خاتری چی؟

لەڕۆی شەڕەکەی ئوسترلینزەوە بەڕای زۆر لەجەنگاوەرەکان پێویست بوو کۆتایی بەشەڕکردن بهێنرێت وئیتر فەرەنسا گەیشتۆتە لوتکەی بەهێزی ولەئاستی وێناکردن وخەون وخەیاڵ چۆتەدەرێ، بێگومان هەموو دانیشتوانی ژێر دەسەلاتدارێتی ئیمپراتۆری فەرەنسا بێ چەندو چوون ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبوون، گوندنشینەکان بەرگەی سەربازی کردنیان دەگرت، بازرگانەکان کەوتبوونە حاڵەتێکی خۆشییەوەو کاروبارەکانیان باشبوو، خاوەن پلەوپایە بەرزەکانی دەوڵەت ومارشاڵەکان ئیدی ترسی ئەوەیان نەمابوو شۆڕشێك بەرپابێت وئەم ڕژێمە لەناوبەرێت، ئەوان دەیانزانی پەنجە ئاسنینەکانی ناپلیۆن فشاری توندیان کردۆتەسەر ناوچەی کرێکارنشینانی پایتەخت، بەلام ئەوان لەشتێتر دەترسان، ئەوان زەندەقیان لەدرێژەدانی بێکۆتایی شەڕو بەرفراوانکردنی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسابوو لەلایەن ناپلیۆنەوە، هێزی ڕەهای ناپلیۆن زۆر بەرفراوانبوو، بەلام کەم شارەزایی مارشال وکاربەدەستە بالاکانی حکومەت لەمێژبوو دەیانگوت ئەم جۆرە ئیمپراتۆریە جیهانییە پایەدارنابێت وشتێکی ئاسایی نییە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی زاڵی هێزی مێژوویی لەڕادەبەدەرو لەناودەچێت، ئەمانە پەیان بەمەبردبوو وجارجارەش دەیانهێنایە سەرزمان ودەیانگوت: ئەوەی ناپلیۆن لەسەرەتاوە هەتا ئاشتی کردنەکەی تیلیست ئەنجامی داوە، زیاتر لەموعجیزە دەچێت نەك واقیعی مێژوویی.

هەندێك لەمانە کەتالیرانیش ڕای وابوو، دەیانگوت: درێژەدان بەنووسینەوەو بوونی ئەم جۆرە داگیرکاریە دەبێتە ئەفسانەیەك لەلاپەڕەکانی مێژووداو ڕۆژ بەڕۆژ دیژوارتردەبێت ومەترسیدارتر دەبێ، ناپلیۆن لەبەرامبەر هاوکارەکانی خۆیدا، بەسوپاشەوە، بەشێوەیەکی دەستکراوەو سەخاوەت یارمەتی دەدان، دوای ڕێککەوتننامەی تیلیست، یەك ملیۆن سکەی زێڕی بەدیاری دایە مارشال لان. بۆمارشال (نی)ش موچەیەکی سالانەی بەبڕی (300) هەزار فرانك بڕیەوە، بەشی (برتیە)ش سالانە موچەی(405) هەزار فرانکی هەبوو، زۆربەی مارشال و ژنراڵەکانی ئەو بەخشیشیان پێدراو موچەیان بۆبڕایەوە، وەزیرەکان، بەتایبەت گودن ومولین وتالیران وفوشە، بەئەندازەی مارشالەکان گرنگیان پێدراو پارەیان درایەو موچەیان بۆ زیادکرا، هەموو ئەو ئەفسەرانەی گاردو سوپا بەخشیشیان درایە کەلەوشەڕدا جێدەستیان دیاربوو وقارەمانیەتیان نواندبوو، زۆر لەمانەش موچەی مانگانەی زۆر، ئەو سەربازانەی لەشەڕدا برینداربوون سێ بەرامبەر پاداشتیان وەرگرت، ئەم دەستبلاویە تەنانەت بەیەك فرانکیش زیان بەخەزنەی دەوڵەتی فەرەنسا تەواو نەدەبوو، چونکە جگەلەوەی ئەو ولاتانەی کەوتبوونەژێر دەسەلاتی فەرەنسا باجی سالانەی زۆریان دەدا، ناپلیۆن باجی تایبەتی لەو ولاتانە دەستاند کەبڕەکەی دەگەیشتە دەیان ملیۆن فرانك، بۆ نومونە: دبوا شانشینی وستفالی (40) ملیۆن فرانك لەباجی زەوییەکانی کشتوکاڵی وەربگرێت و بیدات بەفەرنسا، پۆلۆنیاش دەبوا (30– بۆ35 )ملیۆن فرانك بدات، زۆری تریش ... .



ناپلیۆن بەزەوقی خۆی ئەو پارانەی خەرجدەکرد، ئەوەی کەلەدانی بەخشیش بەوکەسانەی لێیەوە نزیکبوون زیاد دەبوو، ناپلیۆن لەعەمباری کۆشکی توبلری دەهاویشت، بەپێی گوتەی ناپلیۆن لەساڵی (1812)دا ئەو پارەیە بڕەکەی گەیشتە (300) ملیۆن فرانکی زێڕ، ئەو خەرجیەی دەستوپێوەندەکانی کۆشك وجەرجی ساڵانەی کۆشك نزیکەی (25) ملیۆن فرانك بوو، بەڵام لەچاو ئەوهەموو پارەو زێڕو زیوەی کەبەدیاری دەهێندرایە کۆشك، وەك دڵۆپە ئاوێکبوو لەدەریایەك، بەم جۆرە داهاتێکی زۆر لەو شوێنانەوە بۆ ناپلیۆن دەنێردرا کەداگیرکرابوون، بڕی ئەو پارەیە دەگەیشتە ملیۆنەهاو ناپلیۆنیش بێ درێغی بەشێکی لەوپارەو زێڕە بەسەر سوپاو کارمەندانی وڵاتەکەی خۆیدا دابەش دەکرد، ئەو هەموو پارەو موچەی کەدەدرایە ئەمانە، نەدەبووە هۆی ئەوەی ئەو بیرۆکەیە لەدڵی خۆیاندا دەربهاوێژن کەئەم هەموو خۆشی و دەوڵەمەندییە لەئاشتی وئارامیدا خۆشەو دەبێ تەمەنی خۆیان لەشەڕی بێکۆتایدا بەهەدەر بدەن، هەموو لایەك دەیانزانی ئێستا ناپلیۆن تەواو لەتیلیست نەگەڕابۆوە کەخەریکی خۆسازکردن بوو بۆشەڕی پورتوگال بەسەر خاکی ئیسپانیادا، زۆرینەی ئەو کەسانەش نەیاندەزانی ئامانج لەو شەڕکردنە چییە، لەو ڕووەوە پێویستە جارێکیتر تێبینی گەمارۆدانە ئابوورییەکەی سەر بریتانیا بکرێتەوە، چونکە ئیتر لەو مێژووە بەدواوە هیچ کاتێك ناپلیۆن لەمەسەلەی گرنگیدان بەو گەمارۆ ئابووریەی سەر بریتانیا خافڵگیرنەبوو، لێرەوە ئامانجی ناپلیۆن ئەوەبوو ئابووری بریتانیا بخاتە گێژاو وتەنگژەی توندەوە، تەواو بۆچوون وهەنگاوی لوژیکیانەبوو.

ناپلیۆن نەیدەتوانی باوەڕ بەبنەماڵەی شانشینی براگانسی[208] پورتوگال بینێت وپشتیان پێببەستێت، نەبە بنەماڵەی بوربنەکانی ئیسپانیاش، ئەستەم بوو ناپلیۆن بەوەباوەڕبکات ئەم دوو بنەماڵەی شانشینییە، ئامادەبن بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی خۆیان بەبریتانیا نەفرۆشن ونەشهێڵن کاڵاو بەروبوومی بریتانیا بێتە وڵاتەکەیانەوە، ئاشکرابوو هەردوك پاشا چاوپۆشیان لەبڕیارەکەی بەرلین کەسەبارەت بەگەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا دەرکرابوو، دەکردو هەزار بڕو بەهانەو پاساویان دەهێنایەوە، بەوەی بەرفراوانبوونی سنووری دەریایی خاکی شێوە دورگەی ئیبری زۆربوو وبەردەوامیش دەریاوانەکانی جەنگی بریتانیا بەسەر کەنداوی بیسکەو[209] سەرتاسەری ئۆقیانوسی ئەتڵەسی و دەریای سپی ناوەڕاستدا زاڵبوون ولەسەر خودی خاکی شێوە دورگەی ئیبریشدا قەڵاتی سەربازگەیەکی گەورەی بریتانی لەسەر تەنگەبەری جەبەل تارق هەبوو، بەدڵنیاییەوە هەتا ناپلیۆن ئەو دوو وڵاتەی نەخستبایەژێر دەسەڵاتی خۆی، نەدەتوانرا بڕیارەکانی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا جیبەجێبکرێن، بنەمای ئەم مەسەلەیە لەناو هۆشی ناپلیۆندا بەم جۆرە ڕێگاچارەی بۆ دۆزرابۆوە، ئەویش ئەوەبوو دەبوا تەواوی سنووری دەریایی ئەورووپا[210] کەوتبایە ژێر دەسەڵاتی سوپاکەی خۆی، ئینجا گەمارۆی سەربریتانیا کاریگەری دەبوو، ئەو کەسەی ملکەچی ئەمەش نەبووبا دەبوا بەزۆر وەلا خرابا.

بوربنەکانی ئیسپانیا لەبەرامبەر ناپلیۆندا خۆیان بەڕاستگۆ نیشاندەداو درۆشیان دەکرد، چونکە نەدەیانویست و نەدەشیانتوانی دژی بریتانیا ببنەوەو بەشێوەیەکی پراکتیکی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵدا بپچڕێنن، بنەماڵەی شانشینی

---

[208] - بنەماڵەی پاشایەتی پورتوگالە، کەلەئالفونسی کوڕە بێژووەکەی ژان- ی یەکەمەو نازناوی مەزنی هەیە، (و- فارسی)

[209] - لەسەروی شێوە دورگەی ئیبریدایەو دەکەوێتە نێوان فەرەنساو ئیسپانیا، (و- کوردی)

[210] - لێرەدا ئێرلەنداو بریتانیا لەگەڵ ئەورووپادا هەژمارنەکراون، (و- کوردی)



براگانسیش لەپورتوگالدا بەهەمان شێوە ڕەفتاریان دەکرد، واتە: خۆیان لەناپلیۆن هەڵدەکردو بەملکەچی فەرمانەکانی ناپلیۆن خۆیان دەخستەڕوو وهەوڵیشیاندەدا چاوپۆشی لەجێبەجێکردنی بڕیارەکانی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا بکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بریتانیا کەدوای ڕووداوەکەی تیلیست تاك وتەنها مابۆوە، بەجددی بڕیاریدا بەتوندی بەربەرەکانیەکانی خۆی درێژە پێبدات، لەسەرەتای ڕۆژانی مانگی سێپتەمبەری ساڵی ( 1807)دا هەندێك لەکەشتییە جەنگییەکانی بریتانیا بەبەهانەی ئەوەی دانیمارك ئامادەیە بچێتە گەل گروپی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا، شاری کۆپنهاگنیان تۆپ بارانکرد، کەناپلیۆن ئەو هەواڵەی بیست زۆر توڕەبوو وبڕیاریدا هەرچی زووترە دەستبکات بەجێبەجێکردنی نەخشەکەی خۆی، ئەویش داگیرکردنی ئیسپانیاو پورتوگال بوو، لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (1807)دا سوپایەکی (27) هەزار کەسی لەژێر فەرماندەیی مارشال ژونۆدا، بەفەرمانی ناپلیۆن بەسەر خاکی ئیسپانیادا بەرەو پورتوگال کەوتەڕێ، ماوەیەك دوای ئەمە لەشکرێکیتر کەپێکهاتبوو لە(24) هەزار سەربازو لەژێر فەماندەیی ژنرال دوپن دابوو بەدوای لەشکری یەکەمدا ڕۆیشت، جگەلەمانەش ناپلیۆن نزیکەی (5) هەزار سەربازی شمشێر وەشێن وسەربازی سوارو تفەنگ بەدەستی بۆ مەیدانی ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوە نارد، پاشای پورتوگال داوای یارمەتی لەبریتانیاکرد، هەرچەندە پاشای پورتوگال چەند لەناپلیۆن دەترسا ئەوەندەش سڵی لەبریتانیا دەکردەوە،

تەنانەت ناپلیۆن نەیویست بەڕێگای دیپلۆماسی ڕەزامەندی لەئیسپانیا وەربگرێت هەتا سوپاکەی بەسەر خاکەکەیدا بڕۆن بۆشەڕی پورتوگال، تەنها فەرمانی بەمارشال ژونۆکرد لەکاتی پەڕینەوە بۆ ناوخاکی ئیسپانیا پەیامێك بۆ ئیسپانیا بنێرێت ولەڕێگای تەتەرێکەوە مەدرید ئاگاداربکاتەوە، مەدریدیش دوای گەیشتنی ئەم پەیامە جگەلەڕازی بوون هیچ ڕێگە چارەیەکی تری نەبوو.

لەکۆشکی ناپلیۆندا، کامباسرەسی خاوەن متمانەی ئیمپراتۆر، بەوپەڕی ڕێزەوە ناڕەزایی خۆی لەسەر ئەم هەنگاوەی ناپلیۆن دەربڕی، بەپێچەوانەی تالیران کەئەم کارەی ئیمپراتۆری تەواو بەڕاست دەزانی، ئەم سیاسەتمەدارە، لەمانگی ئۆگوستی ساڵی (1807)دا دوای ئاشتی کردنەکەی تیلیست، دەستی لەکارکێشابۆوە، بەهانەی دەست لەکار کشانەوەکەشی ئەوەبوو ناپلیۆن بەنامە لەبەرتیل خۆری ودەستکەوتی نامەشروعی ئەو ئاگاداری کردبۆوە، چونکە تالیران لەوڕووەوە کەموکوڕی زۆری هەبوون، بەڵام ڕاستییەکەی هۆی دەست لەکار کێشانەوەکەی ناوبراو ئەوەبوو، تالیران ئاکامی خراپی لەسیاسەتە جیهانییەکانی ناپلیۆندا دەدی، بۆیە بڕیاری دابوو وردەوردە خۆی لەهەموو کاروبارێکی سیاسی بەدووربگرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەناو کۆشکی دەربادا خاوەنی ڕێزی خۆی بوو، بەڵام لەم کاتانەدا دووبارە دەیویست جارێکیتر بێتەوە جێگای سەرنج وگرنگی گەورەکەی، هەرچەندە ئەو سەرکەشیەی داگیرکردنی پورتوگال وئیسپانیاشی بەمەترسیدار دەزانی، بەڵام بەڕیایی وایدەردەخست ئەو هەنگاوەی ئیمپراتۆری فەرەنسا ڕاست ودروستەو زۆر لەجێگای خۆیدایەتی، لەشکری مارشال ژۆنو گەیشتەسەر خاکی ئیسپانیاو یەکسەرە بەرەو پورتوگال ملی نا، سەربازەکانی فەرەنسا ئەو وڵاتەیان بەوشکەساڵ دیتەوەو تاڵانی جوتیارەکانیان دەکرد، جوتیارەکانیش لەهەر شوێنێکدا سەربازی هەڵبڕاو وەدواکەوتوویان ببینیبان دەیانکوشتن وتۆڵەی خۆیان لێدەکردنەوە.



سەرئەنجام دوای ڕۆیشتنێکی دوورو درێژ کەشەش هەفتەی خایاند، مارشال ژونۆ لە(26/ی نۆڤەمبەری ساڵی (1807)دا گەیشتە پایتەختی پورتوگال وداگیری کرد، دوو ڕۆژپێش ئەو مێژووە، بنەماڵەی شانشینی بەیەك کەشتی برتیانیایی هەڵاتبوون، ئینجا نۆرەی ئیسپانیا هات.

(2)

لەئیسپانیادا بارودۆخەکە بەم شێوەیەی خوارەوەبوو، شارلی چوارەم کەفەرمانڕەوای ئەو وڵاتەبوو، پیاوێکی نەفسنزم و ژیربوو وتەواو کەوتبۆ ژێر کۆنترۆڵی هاوسەرەکەی گودوی، پاشاو شاژن گودوی، دژایەتی فردینانی میراتگرەوەی تەخت وتاجی پاشایەتی بوو دەکرد کەلەساڵانی (1805 و 1806 و 1807)دا چینی برژوازی ونەرستۆکراتەکانی ئیسپانیا ئومێدی زۆریان پێبوو، بێ سەروبەرەیی وگەندەڵی لەناو دامودوزگاکانی وڵاتدا هەبوو وسیاسەتی ناوخۆش زیانی بەبواری بازرگانی وکشتوکاڵ گەیاندبوو، کەپێشتر لەگەشەسەندنی زیاتردابوو، تەنانەت برژوازیەت ونەرستۆکراتەکانی لەیەك بەرەی دژدا کۆکردبوونەوە، بەڕای ئەمانە بەڕووخاندنی پیاوە خۆشەویستەکەی کۆشکی پاشایەتی،" واتە: مێردی شاژن گودوی"، ئەگەری ئەوەهەبوو جارێکیتر ئیسپانیا بکەوێتەوەسەر پێی خۆیی و ببوژێتەوە.

بیرۆکەی ڕێککەوتن وگونجانی گەلی ئیسپانیا لەگەڵ ئیمپراتۆری فەرەنسییەکاندا کەوتبۆ سەرزاران وێنای ئەوەیان دەکرد بەلای کەمەوە ببێتەهۆی چاکسازیکردن وپارێزەری سەربەخۆیی ئیسپانیان لەبوارەکانی ئابووری وسیاسەتی دەرەکیدا ئاسودەبن، فردینان، خوازبێنی یەکێك لەبرازاکانی ناپلیۆنی کرد، بەڵام داواکاریەکەی ڕەتکرایەوە.

لەڕاستیدا ئیمپراتۆری فەرەنسا پلانێکی تری دارشتبوو، ئەو دەیویست بنەماڵەی پاشایەتی ئیسپانیا لاببات ویەکێك لەبراکانی- یان یەکێ لەمارشالەکانی بکاتە پاشای ئەو وڵاتە، لەماوەی کەژی زستان وبەهاری ساڵی (1808)دا یەکە سەربازییەکانی سوپای فەرەنسا یەك لەدوای یەك بەرەو ئیسپانیا دەهاتن، هەتا مانگی مارسی ئەوساڵە نزیکەی سەت هەزار سەرباز لەئیسپانیادا جێگیرکرا، کەناپلیۆن لەسوپاکەی خۆی دڵنیابۆوە ئامادەیە، بڕیارو نەخشەکانی دان وکەڵکی لەودووبەرەکییەی ناوبنەماڵەی پاشایەتی ئیسپانیا وەرگرت، مارشال مورا کەفەرماندەی لەشکرێکی (80) هەزار سەربازی بوو، هێرشی کردەسەر مەدرید، شارلی چوارەم وهاوسەرەکەی گودوی سەرەتا بڕیاریاندا هەڵبێن، بەڵام لەوکاتەدا خەڵك ڕاپەڕیبوو ونەیانهێشت ئەمانە هەڵبێن ولەئارانخونزەدا دەستگیریان کردن، شۆڕشییەکان دەستیان گەیشتە شاژن گودوی و بەبێ بەزەییانە ئازاریانداو خستیانە زیندانەوە، دواتریش پاشایان ناچارکرد دەست لەپاشایەتی بۆ فردینان بکێشێتەوە، ئەمە لە(17/ی مارسی ساڵی (1808) ڕوویدا، شەش ڕۆژ دوای ئەمە، واتە: لە(23/ی مارس)دا، مارشال مورا گەیشتە پایتەختی ئیسپانیا، بەڵام ناپلیۆن پاشای تازە فردینانی بەڕەسمی نەناسی وداوایکرد پاشای تازەو پاشای کۆن و هەموو ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی، بێن بۆ شاری بایون بۆلای خۆی، ئەو مافی داوەری دەسەڵاتدارەیتی ڕەهای دەربڕینی ڕای خۆی لەسەرئەمە بەحەقی خۆی دەزانی، لە(30/ی ئیبریلی ساڵی (1808)دا شارلی چوارەم وگودوی هاوسەری وفردینانی حەوتەم، پێکەوە چوون بۆ بایۆن بۆلای ناپلیۆن.



بەڵام ناپلیۆن داوایکرد هەموو شازادەکانی ئیسپانیا بێن بۆئەم شارە چوون مەدرید شڵەقاوە، وردەوردە مەبەستی ناپلیۆن ڕوونبۆوە، ئەو دەیویست دوای ئەوەی هەموو بنەماڵەی شانشینی ئیسپانیای ڕاکێشێ شاری بایۆن کرد، ڕووخانی ئەمانە ڕابگەیەنێت وهەموو ئەوانە دەستبەسەر بکات وئینجا بەهانەی بکەوێتەدەست وئیسپانیا بخاتەسەر دەسەڵاتداریەتی فەرەنسا.

لەبەرواری(2/ی مایۆ)دا خەڵکی مەدرید دژی سوپای فەرەنسا ڕاپەڕیبوون، مارشاڵ مورا ئەو ڕاپەڕینەی شەڵتانی خوێن کرد، بەڵام ئەوەتروسکە سەرەتاییەکانی ئاگری شەڕی ناوخۆی ئیسپانیابوو، ناپلیۆن لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەداو لەوکاتەی تازە بنەماڵەی شانشینی ئیسپانیا گەیشتبوونە ناو تەلاری نیشتەجێ بوونی ناپلیۆن وجەنجاڵی وقەرەباڵغییەکی زۆربوو، شارلی چوارەم بەگۆچانەکەی داگژایە فردینانی حەوتەم وناپلیۆنیش لەتوڕەییدا بەسەریدا شیراندن وگوتی: دەبێ هەردووکتان دەست لەدەسەڵاتی خۆتان بکێشنەوەو چاولەتەختی پاشایەتی ئیسپانیا بپۆشن، من بەفەرمانڕەوای ئیسپالنیا بناسن. هەرواشی لێهات، چونکە شارلی چوارەم وهاوسەرەکەی وفردینانی حەوتەم، بەدەست سوپای فەرەنساوە گرفتاربیبوون، ئینجا ناپلیۆن گوتی: بۆ پاراستنی ئاسایش وخزمەتکردن وخۆشگوزەرانی ئێوە، ڕێگاتان پێنادەم بگەڕێنەوە ئیسپانیا، بەڵکو دەبێ پاشاو[211] شاژن بچن لەکۆشکی فونتن بلودابن، کۆشکی پرسن دوتالیرانیش کەلە والانسەدابوو بۆ فردینان وشازادەکانی تری دیاری کرد.

ئەم بڕیارە ڕاستەوخۆ جێبەجێکرا، چەند ڕۆژێك دوای ئەمە لە(10/ ی مانگی مایۆ)دا ناپلیۆن فەرمانی بەبراکەی جوزێف کرد، کەپاشای ناپولی بوو، بچێت بۆ مەدرید ولەسەر تەختی پاشایەتی ئەو وڵاتە دانیشێت. مارشاڵ موراش فەرمانی پێکرا بچێت بۆ ناپولی وببێتە پاشای ئەو وڵاتە.

ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان بەوەی ئەوکارەی زۆر بەئاسانی بەدەستەوەهات وبەتەردەستی بنەماڵەی پاشایەتی ئیسپانیای بەساویلکەیی هاتنەژێر دەستی و بێ ئەزیەتی زۆر دەستی بەسەر ئیسپانیادا گرت، زۆر دڵخۆشبوو، بەڵام لەپڕ شتی چاوەڕواننەکراو، نەك هەر تەنها سەبارەت بەناپلیۆن، بەڵکو بەلای هەموو ئەورووپاوە کەلەترس ولەرزدا دەژیان ڕووداوێکی گرنگبوو، ئەویش ئەوەبوو یەك شەڕی خوێناوی لەنێوان سوپای فەرەنساو شۆڕشگێڕە پارتی زانەکانی ئیسپانیادا ڕوویدا، بۆ یەکەمجار ناپلیۆن ڕووبەڕووی دوژمنێك دەبۆوە کەپێشینەی لای ئەونەبوو، ئەو دوژمنەی لەمیسرو سوریاشدا هاوشێوەی ئەمەی نەبینیبوو.

گوندنشینە ئاستوریە[212] ، توڕەو خەنجەر بەدەستەکان، شوانە ڕووت وڕەجاڵەکانی سیراموڕفا، بەتفەنگی ژەنگاوییەوە، سنعەتکارەکانی کاتالونی بەنێزەی درێژەوە(ناپلیۆن کەناوی ئەوانەی نابوو،خوێڕی)وفەرمانڕەوای ڕەهای ئەورووپابوو ولە بەرامبەریاندا سوپا مەزنەکانی ڕوسیاو نەمساو پروس بەچۆکدا هاتبوون و بەدەربڕینی وشەیەك ئیمپراتۆری کۆنی لەسەر کارلادەبردن وهی تازەی لەجێگایدا دادەنانەوە ) لەدەست کۆمەڵێ ( بەرەڵای ئیسپانیایی[213]. هەراسان ببوو؟ بەڵام لەوکاتانەدا نەناپلیۆن ونەهیچ کەسێکیتر نەیاندەزانی ئەم ترۆیە (بێ سەروبەرانە) یەکەمین گۆڕەڵکەنی ئیمپراتۆریەتی مەزنی ناپلیۆنن ولەناوی دەبەن.

---

211 - مەبەست لەشارلی چوارەم وکودوی هاوسەریەتی. (و-فارسی)

212 - مەبەست لەلایەنگرانی پاشایە.

213 - مەبەست لەشۆڕشگێڕەکانی ئیسپانیایە کەبەشێوەی پارتی زان شەڕیان دەکرد.(و-کوردی)



کاتێ ناپلیۆن لەساڵی (1808)دا نەخشەی داگیرکردنی ئیسپانیای کێشاو دەستی پێکرد، هەمیشە تێبینی یەك ڕووداوی مێژوویی دەکرد، کەبەڕووکەش ببووە جێگای گەشبینی ئەو، ئەمیش ئەوەبوو: ڕێك سەت ساڵ لەمەوبەر لویسی چواردەهەم کەفەرمانڕەوایی فەرەنسای دەکرد، نەوەیەکی خۆی بەناوی فیلیپ کردە پاشای ئیسپانیاو ناوبراو هەمان ئەو کەسەبوو کەپشتاوپشتی بنەماڵەی شانشینی بوربنەکانی ئیسپانیای لێکەوتەوە، لەو ڕۆژگارەدا گەلی ئیسپانیا، پێشوازیان لەوپاشا تازەیەکردوو بەرگریان لەتەختی پاشایەتی فیلیپ دەکرد، هەرچەندە لەورۆژگارەشدا نیوەی دەوڵەتەکانی ئەوروپا کەوتنە شەڕ لەگەڵ لویسی چواردەهەمی فەرنسادا، بۆئەوەی فیلیپ لەسەرتەختی پاشایەتی ئیسپانیا لابرێت، لەسەر ئەم بنەمایە بۆچی ناپلیۆن بەگرتنە بەرچاوی ڕۆژگاریش لەلویسی چواردەهەم بەهێزتربوو، ناتوانێت ئەمەبکات؟ بۆ ئەو نەتوانێت شانشینێکی بۆناپارتی لەئیسپانیادا دابمەزرێنێت ودروستبکات؟ جگەلەمەش پێویستی نەدەکرد وەك لویسی چواردەهەم شەڕیش لەگەڵ ئەوروپادا بکات لەسەر ئەم کارەی چونکە پێشتر ئەوروپا خرابۆژێر دەسەڵاتی خۆیی و ڕوسیاش ببووە هاوپەیمانی.

بەڵام ناپلیۆن بەشێوەیەکی گشتی دڵی خۆی بەمەخۆشدەکردو ئەواویش بەهەڵەدا چووبوو، ئەو نەیدەویست درك بەوجیاوازیەی دانانی فیلیپ دوبوربن لەساڵی (1700)دا لەگەڵ دانانی جۆزێف بۆناپارت بەپاشای ئیسپانیا لەساڵی (1808)دا بکات.

بازرگانان وکەشتی دروستکەران و ئەرستۆکراتەکان مەسەلەی دانانی فیلیپ بەپاشای ئیسپانیایان بەوپەڕی خۆشی و شادییەوە پێشوازی لێکردبوو، چونکە ئەمانەش وەك لویسی چواردەهەم وێنای ئەوەیانکردبوو ئەو شوێنانەی ئیسپانیا داگیری کردبوون دەبێتە ملکی فەرەنسا، بەڵام ئەوانە هەڵەیەکی گەورەیان کردبوو، چون ئەمانە بەکۆی گشتی هەموویان دژی ئەوەبوون سەرمایەو بازرگانی و پیشەسازییەکانی فەرەنسا بهێنە ئەو شوێنانەو فیلیپی پێنجەم ناچارکرابوو مافە کۆمەلایەتییەکانی هاوڵاتیانی ئیسپانیایی بدات بەهاونیشتمانەکانی خۆی، واتە: فەرەنسییەکان، هەروەها ئیسپانیا ئەوکات باجی نەدەدا بەفەرەنساو تەنها ئەوەندەبوو بنەماڵەی بوربنەکان و فیلیپ بێتە پاشای ئیسپانیا، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا جۆزێف بۆناپارت، لەژێر شانێلی پرشکۆی پاشاکانی ئیسپانیادا تەنها فەرمانڕەوایەکی سادەبوو کەلەلایەن ناپلیۆنەوە دانرابوو، بەمانایەکی باشتر، جۆزێف تەنها کەسێکبوو کەلەلایەن ناپلیۆنەوە ئەرکی ئەوەی پێسپێردرابوو گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا توندتربکات و ئیسپانیایش بەشێوەیەکی پراکتیکی وەك ژێر دەستەیەکی فەرەنسی بۆ وەبەرهێنانی بۆرژوازییەکانی فەرەنسا دابینبکاو زەمینە بۆ ئەمە برەخسێنێت، لەئیسپانیادا باش دەیانزانی هەر لەسەرەتای کودەتاکەی (برومری ساڵی 1799)وە هەزاران سکاڵاو خواست وداوا لەلایەن پیشەکاران و بەزازو ...هیتری ، فەرەنسایی خرابوونە بەردەم ناپلیۆن وئەمانە بەرنامەی ئابووری خۆیان لەم دواییانەدا ئاواخستبۆ بەردەم ناپلیۆن:

1- پێویستە بازاڕەکانی ئیسپانیا تایبەت بەبەرهوبوم وپیشەسازییەکانی فەرەنسا هەبێت،

2- دەبێ دەولەتی ئیسپانیا خوری مەڕە مرینوسەکان (لەو ڕۆژگارەدا ئەو خوریە لەدنیادا هاوتای نەبوو بۆچاکی) تایبەت بەکارخانەکانی فەرەنسا بفرۆشێت.



3- ئیسپانیا بەگشتی بەتایبەت لەئەندەلوسدا، دەبێ هەموو جۆرەکانی لۆکە بچێنرێت، کەبۆ کارخانەکانی ڕستن و چنینی فەرنسا زۆر زەرووری بوو وناپلیۆن کڕینی لۆکەی لەبریتانیا قەدەغەکردبوو، هەربە فەرنسا بفرۆشرێت.

سەرئەنجام، بۆ یاریدەدانی هەموو پیشەسازانی ئیسپانیاو بۆ گوندنشینەکانی ئەم خاکە کەبژێوی ژیانیان ڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ وابەستەیی زۆری بەبەرهەمی موو وخوری ولۆکەوە بوو.

لەهەندێك بەشی فەرەنسادا کەتا ئەوکاتەش بەمیرنشینی لوکاڵی وخێڵەکی مابوونەوە، بەتایبەت لەو شارۆچکانەی کەخەریکبوو ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیە بەرەو نەمان دەچۆوە، هەموو کۆلاکەکان کەپەیوەندی نزیکیان لەگەڵ بریتانیاو شوێنە ژێر دەستەکانی ئیسپانیادا هەبوو، ملکەچی ناپلیۆن بوون، ئیتر ڕاستەوخۆ بریتانیا شەڕی ڕاگەیاند لەگەڵ ئیسپانیاداو وەك چۆن ئەو دورگانەی فەرەنسا کەلەدنیادا هەبوون دەجەنگی و دژایەتی دەکردن لەگەڵ ئیسپانیاشدا بەهەمان شێوە کەوتە جموجۆڵ، هەموو ئەو شوێنانەی لەدەست داگیرکردن ونوڵم و زۆری ناپلیۆندا توشی زیان ببونەوە، دەستیاندایە یاخیبوون وشۆڕشکردن دژی فەرەنسا، گوندنشین وپیشەکارانی ئیسپانیا هەرلەسەرەتاوە ئەوەیان سەلماند کەدەتوانن بەرەنگاری فەرەنسا ببنەوەو شۆڕشبکەن؛ بەلام بەڕووکەش لەو ڕۆژانەدا ناپلیۆن لەکارەکانیدا سەرکەوتوو دیاربوو، بوربنە دەستبەسەرەکانی ئیسپانیا کەلەژێر پاسەوانی پۆلیسەکانی فەرەنسادا بەرەو کۆشکەکانی فونتن بلوو والانسە، بران بۆ جێنشینکردنیان لەوێداو جۆزێف بۆناپارتیش چوو بۆ مەدرید.

ڕاستە ناپلیۆنیان لەهەندێك ڕووداوی لاوەکیش ئاگاداردەکردەوە، لەمانەش گوندنشینە ئیسپانیاییەکان غیرەتی ئەوەیان کردووە شەوانە دەستەدەستە هێرشبکەنەسەر بازرگانەکانی ئیسپانیایی و گوللە بارانیان کردوون وکاتێ ئەمانە دەستگیردەکران و گوللەبارانیشدەکران بەبێدەنگی-یان بەدروشم گوتنەوە بەرەو مەرگ دەچوون، هەروەها ڕاپۆرتی ئەوەشیان بۆ ناپلیۆن بەرزکردبۆوە خەڵکی مەدرید دژی سەربازەکانی فەرەنسا ڕاپەڕیون ومارشال مورای فەرمانی بەسەربازەکان کردووە گوللەبارانیان بکەن، بەلام خەڵکەکە هەڵنەهاتوون وچوونەناو ماڵەکان و لەپەنجەرەو دەرگاکانەوە تەقەیان لەسەربازەکانی فەرەنساکردووە، کاتێ سەربازەکانی فەرەنسیش بۆ ڕاوەدوونانی ئەمانە چوونەتە ناوئەو تەلارو ماڵانە، ئیسپانییەکان تادواین فیشەك شەڕیانکردووەو ئینجا بەشەڕە کێردو مست وچنگەکرکەو ددان وەرکژاونە سەربازەکانی فەرنساو شەڕێکی خوێناوی زۆر دیژوار دەستی پێکردووەو تەنانەت سەربازە فەرەنسییەکان ئەو شۆڕشگێڕانەیان بەردەدانەوە خوارێ بۆسەرسەر نێزەی سەربازەکانی تری کەلەدەرەوەی ئەو ماڵ وتەلارانەدا ڕاوەستابوون.

فەرەنسییەکان لەیەکەم هەنگاوی گەیشتنیان بەسەر خاکی ئیسپانیا، هەستیان بەوکینە سۆزی ونەتەوەپەرستییەی خەڵکی ئەو وڵاتەکرد، یەکەیەکی سەربازی چووبووە ناوگوندێکی چۆڵ کەپێشتر دانیشتوانی ئەو دێیە چنگیان وەجەنگەڵ دابوو، لەناو خانوێکدا کەتەنها ژنێکی گەنج ومنداڵەکەی تێدامابوون، سەربازەکان، هەندێك خواردنیان دەستکەوتووە، فەرماندەی ئەویەکە سەربازییە کەوتبۆ گومان وپێش ئەوەی ڕێگا بەسەربازەکانی بدات ئەو خواردنە بخۆن لەوژنەی پرسیبوو تۆ بڵێی ئەم خواردنە ژەهراوی نەکرابێت؟ بۆ ئەوەی دڵنیا بێنەوە ئەفسەرەکە ژنەکەی ناچارکردبوو پێشان ئەو کەمێ لەو خواردنە بخوات، ئەوژنە جوتیارەش بێ دوودڵی داواکەی ئەوی جێبەجێکردبوو، بەلام ئەفسەرەکە هەر گومانی مابوو وبەژنەکەی گوتبوو دەبێ هەندێکیش لەم خواردنە بدەیتە منداڵەکەت، دایکی منداڵەکە ئەوەشی کردبوو، ئینجا سەربازەکان کەوتبوونە خواردنی



ئەوخۆراكەو پاش ماوەیەك دایك ومنداڵەكەو سەربازەكانی خواردنەكەیان خواردبوو بەئازارێكی زۆرەوە مردن وفریودانەكە سەری گرتبوو.

لەرۆژانی سەرەتاییدا ئەمجۆرە ڕووداوانە سەربازەكانی فەرەنسایی توشی سەرسوڕمان كردبۆوە، بەڵام پاش ماوەیەك كەمێ دۆخەكە ئارامبۆوەو كەس ئەوەی بەلاوە سەیرنەبوو وبەشێوەیەكی ئاساییان وەردەگرت، ناپلیۆن سەری لەم ڕووداوانە ئەستووردەبوو وتەواو هەراسانببوو، ماوەیەكی دووروودرێژی خایان تاڵەچۆنییەتی ئەم شەڕە گەیشت.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لەنیوەی زستان بەدواوە وردەوردە هەندێك لەدەوڵەتە دۆڕاوەكان بەچاوی ئومێدەوە سەیری ئەو تروسكاییەی ئاگری كێوەكانی پیرینەیان [214] دەكرد، پڕوپاگەندەی پڕچەكبوونەوەی سوپای نەمسا بلاوبۆوە، كەسێ ساڵ بەسەر شەڕی ئوسترلیتزدا تێپەڕیبوو ونەمسا پشووی دابوو وبرینە قوڵەكەی ئەوشەڕەی سارێژبۆوە، ئومێد لەدڵی شانشینی نەمساو چینی برژوازو ئەرستۆكراتەكاندا پەیدابیوو كەخۆیان لەچنگ زوڵمی ناپلیۆن ڕزگاربكەن، جێگای ئامـاژە بۆكردنـە لەڕوسیاو هەنگاریاو بوهم ونەمسادا ترسی ئەوەیان هەبوو فەرمانڕەوایی ناپلیۆن درێژە بكێشێت ونەمسا ناچاربێت دەستوری مەدەنی ناپلیۆن پەیڕەوبكات، چونكە ئەمە بەمانای ڕووخانی یەكجارەكی سیستمی كۆنی پاشاو میرەكانبوو.

ناپلیۆن پێی باشبوو هێزی هاوپەیمانیـەتی ڕوسـیاو فەرەنـسا نیـشان بـدرێت، هـەتا لەوكاتـەی خـەریكی سـەركوتكردنی شۆڕشگێڕەكانی پیرینەیە خۆی لەهەرجۆرە جموجۆڵێكی سەربازی نەمسا بەئاسایش ببینێتەوە، لەڕۆژنامەكانی ئەورووپاییدا بەڕێزەوە بەم شێوەیەیان دەنووسی، بەڕێز ئیمپراتۆری فەرنسا لەنزیكەوە هەندێك لەخەڵكی ئیسپانیای دڕندە دێنێتەوەسەر هۆشی خۆیان، بەڵام زۆر لەدانیشتوانی ژێر دەسەڵاتدارێتی فەرەنسا، بەگوێی یەكتریاندا دەچـرپاندو بـەنهێنی دەیـانگوت: سەرئەنجام ئەم ڕێگرە زەواڵی خۆی بۆ پەیدابوو، هەتا ئەوكاتەی ڕاگەێندرا كەهەردوو ئیمپراتۆری ڕوسیاو فەرنسا لەپایزی ساڵی(1808)دا لەفورتدا چاویان بەیەكتری دەكەوێت.

# (3)

دەمێكبوو ناپلیۆن دەیویست توندوتۆڵی هاوپەیمانیەتی نێوان فەرەنساو ڕوسیا نمایشبكات، بـەڵام لەناوەڕاسـتی مـانگی یۆلیۆدا، ڕووداوێكی چاوەڕواننەكراو هاتەپێش وناپلیۆنی ناچاركرد پەلە لەچاوپێكەوتنی لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕوسیادا بكات، ئەویش ئەوەبوو ژنراڵ دوپن كەداگیركردنی خۆرئاوای ئیسپانیای پێسپێردرابوو، گەیـشتبۆ ئەنـدەلوس ودوای داگیركردنـی ودرێژەی بەپێشڕەویەكەی خۆیدابوو، بەڵام لەپڕ سوپاكەی لەدەشت وبیابانێكی چۆڵەوانی بێ ئازوقەدا بینیبۆوەو لەهەموو لایەكەوە دەستەی بێ ژماری گوندنشینە پارتیزانەكانی ئیسپانی گەمارۆیانداوەو هێرشیان كردبۆسەر.

لە(20/ی یۆلیۆ)دا ژنراڵ دوپن لەنزیكی بلن چەكی داناوەو خۆی تەسـلیم كردبـوو، دیـارە ئـەم ڕووداوە بـەمانای دەسـت شلكردنی زوڵم و زۆری فەرەنسانەبوو لەسەرئیسپانیا، بەڵام ڕەنگدانەوەی ئەم ڕووداوە كاریگەرییەكی گەورەی لەسەر ئەورووپا جێهێشت.

---

[214] - مەبەست لەوكێوانەیە كەشۆڕشی پارتیزانی ئیسپانیـەكانی تێدابوو دژبە سوپای فەرەنسا،(و- فارسی)



لەشکری هەرگیز تێنەشکاوی ئیمپراتۆری فەرەنسا شکستی خواردبوو، شکستێك کەسەرەکی نەبوو، بەڵام دیارو بەرجەستەبوو.

بەبیستنی ئەم هەواڵە ناپلیۆن تورەبوو ودوپینی بۆ دادگایکردنی سەربازی نارد، ناپلیۆن لەمەسەلەی ڕەوشت وناکۆك لەگەڵ ئەخلاقدا بۆچوونی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڕای ئەو گەورەترین کاری ناکۆك لەگەڵ ئەخلاقدا قبوڵکردنی شتێکبوو کەبەلێوەشاییەوە ئەنجام بدرێت، کاتێ فەرماندەی سەربازی نالێوەشاوە کاروباری وابەستەبە جەنگ قبوڵبکەن، ئەمە ناکۆکە لەگەڵ ئەخلاقداو دەکۆردرێت بۆ تاوان، ژنرال دوپن بۆ هەمیشە لەبەرچاوی ناپلیۆن کەوت، ئیمپراتۆر زوو هەستی بەئاکامە خراپەکانی ڕووداوەکەی بلن کرد، ئەو لەگەڵ ئەوەیدا کەبەخوێن ساردییەوە باسی زیانی بلنی دەکردو دەیگوت: لەچاو مەزنی ئیمپراتۆریەتەکەیدا شتێکی چشە، بەڵام دەیزانی ڕەنگدانەوەی ئەمە دەبێتەهۆی ئەوەی ئەمسا زیاتر پەلەبکات لەپرچەککردنی خۆی، ئەمسا پێی وابوو ناپلیۆن ناتوانێت لەدوولاوە درێژە بەبەرەی شەڕکردن بدات، ئەوشەڕەی کەلەخوارووی ئیسپانیادا هاتبۆپێش دەبوا لەبەرەی دانوبدا لاوازی بکات.

بۆڕێگاگرتن لەگومانی شەڕکردن دەبوا ناپلیۆن لەئەمسای گەیاندبا ئەلکسەندەری ڕوسیا خەریکی داگیرکردنی خاکەژێردەستەکانی خۆرهەڵاتی ئەمسادەبێت وهاوپەیمانەکەشی، واتە: ناپلیۆن لەخۆرئاوایەوە بەرەو ڤیننادێت، ئەمە بنچینەی کۆبوونەوەی هەردوو ئیمپراتۆری فەرەنساو ڕوسیابوو لەئارفورت.

ئیمپراتۆری ڕوسیا دوای ڕێککەوتننامەی تیلیست، کەوتە هەلومەرجێکی نالەبارەوە، هاوپەیمانیەتی کردن لەگەڵ ناپلیۆنداو پساندنی پەیوەندییەکان لەگەڵ بریتانیادا زیانی زۆری بەئەرستۆکرات وتوێژی بازرگانی ڕوسیا گەیاند، تێکشکانەکانی سوپای ڕوسیا لەفریدلندو تیلیستدا تەنها بەیەك بەدبەختی سادە هەژمارنەدەکرا، بەڵکو ئەنگی وریسوایی بوو.

تزار بەپشتبەستن بەبەڵێنەکانی ناپلیۆن کەبەبەسەرچوونی کات ڕێگا بۆئەوە خۆشدەکات، هەندێك لەخاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بخرێتەژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیاو بەمە کەمێ سێبوری توێژی ئەرستۆکرات و بازرگانەکانی دەدایەوە، بەڵام ڕۆژەکان دەڕۆیشتن وناپلیۆنیش هیچ هەنگاوێکی لەو ڕەووەوە نەنان، بەپێچەوانەوە وردەوردە لەپترسبورگدا پروپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوە ناپلیۆن هانی تورکەکان دەدات زیاتر درێژە بەشەڕەکەیان بدەن لەگەڵ ڕوسیادا.

لەئارفوتدا هەردوو ئیمپراتۆری ڕوسیاو فەرەنسا دەیانویست ئەو مەرامانەی بەکاغەز لەهەگبە دەبیلۆماسیەکانیادا بوون، زیاتر لەدانوستانەکانیاندا وەك بەڵگە بیخەنەڕوو ولێی دڵنیابینەوە، هەردوو ئەو هاوپەیمانانە ئەمیان دەزانی خەریکی یەکتر فریودان بوون، هەردووك لایان لەیەکتری بەگومان بوون وپێویستیشیان بەیەکتری بوو، ئەلکسەندەر ناپلیۆنی بەکەسێکی زۆر ژیر دەزانی و ناپلیۆنیش بەدیبلۆماسیەت و وریایی ئەلکسەندەر سەرسامبوو، ئیمپراتۆری فەرەنسی سەبارەت بەئەلکسەندەر دەیگوت: ئەو(یەك یۆنانی گوازراوەی ئیمپراتۆریەتی بیزایس)ە، دووبارە هەردوو ئیمپراتۆر لە(27/ی دیسەمبەری ساڵی 1808) لەئارفوتدا چاویان بەیەك کەوتەوەو بەبەرچاوی کۆمەڵێ خەڵکی زۆرەوە بەیەکتریانەوە ماچکردو بۆماوەی دوو هەفتە کەپێکەبوون ولەیەکتری جیانەدەبوونەوەو پێکەوە لەناو سوپای، خۆشگوزەرانی وسەما دیتنەکان وشانۆ وشکارکردن و گەڕانەکانیاندا پێکەوەبوون، ئەگەر ئەمساوییەکان ئەم هەواڵەیان نەبیستبا بەلای ناپلیۆنەوە جێگای هەراسانی

بوو، بەڵام ئەگەر تورکەکان بێ هەواڵیان لەم چاوپێکەوتنەی نێوان ئەم دوو ئیمپراتۆرە هەبا، بەلای ئەلکسەندەرەوە زۆر گرنگنەبوو.

لەوماوەی کەکەوتە نێوان رێککەوتننامەی تیلیست وئارفورت، ساڵێکی خایاند، ئەلکسەندەر بۆی مەعلومبوو بەڵێنی ناپلیۆن بەوەی خۆرهەڵاتی بداتەدەست ئەو وخۆرئاواش بخاتەژێر دەستی خۆی، تەنها فریودانبووە، ئیتر ئەوە ڕوون ببۆوە کەناپلیۆن نەك هەر ڕێگای ئەوە بەتزار نادات قستەنتینیە بخاتەژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵکو مولداڤیا [215] والاسیش کەبەتەمابوو لەژێر دەستی تورکەکاندا دەربێنێت، ناداتە ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا. لەلایەکیترەوە تزار ئەوەشی دەبینی دوای (12) مانگ لەئاشتی تیلیست، ناپلیۆن سوپاکەی خۆی لەو بەشە نەگوازتۆتەوە کەبڕیاروابوو بیداتەوە پاشای پروس، واتە: فردریك ویلهلم، بەڵام ئەوەی بەلای ناپلیۆنەوە گرنگبوو ئەوەبوو هەتا کۆتایی بەشەڕی پارتی زانەکانی ئیسپانیا نەهێنێت خۆی لەهێرشی ئەگەری نەمسا بپارێزێت، بۆ ئەوەی ئەلکسەندەریش لەو ڕووەوە یاریدەی بدات، دەبێ بەڵێنی ئەمەبدات هەرکاتێ نەمسا هێرشی کردەسەر سوپای فەرەنسا ڕوسیا دژی بوەستێتەوەو لەگەڵیدا بجەنگێت، ئەسکەندەر نەیدەویست پەیمانێکی لەمجۆرە ببەستێت وجێبەجێیبکات، بۆیە ناپلیۆن ئامادەبوو یاریدەی سەربازی ڕوسیابیدات وهەموو خاکی گالیسی هەتا دەگاتە کارپات" ناوچەیەکە لەپۆلۆنیا "، بداتە ئەلکسەندەر، دواتر نوێنەرانی دیاری لایەنگرانی ئیسلاو نوێنەرانی (ئەنجومەنی مێژوو نووسانی نیشتمانی ومیللی ڕوسی، زۆر بەسەختی سەرزەنشتی ئەلکسەندەریان کرد بەوەی بۆچ ئەو پێشنیارەی ناپلیۆنی قبوڵنەکردووەو ئەو هەلەباشەی لەدەستداوە کەئیتر هەرگیز بەدەست نایەتەوە، بەڵام ئەلکسەندەر پاش هەندێك بەرگریکردن لەبۆچوونەکەی خۆی دانی بەهەڵەکەی داهێناو تەسلیمی ڕای ئەرستۆکراتەکانی ڕوسیابوو، چونکە ئەم ئەرستۆکراتانە کەدووجار لەساڵی (1805 و 1807) سوپای ڕوسیایان لەبەرامبەر سوپای مەزنی فەرەنسادا تێشکابوو، ئەمەیان بەنەنگیەکی گەورە هەژماردەکردو بەقبوڵکردنی پێشنیارەکەی ناپلیۆنیش بۆ ئەلکسەندەر ئەم نەنگیە پاك دەبۆوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەلکسەندەر لەناپلیۆن دەترساو حەزی نەدەکرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەودا بپچڕێنێت، ئەو بەهاندانی ناپلیۆن کەدەیویست سوید تەمبێ بکات لەبەرئەوەی پەیوەندی لەگەڵ بریتانیادا هەیە، لەمانگی دیسێمبەری ساڵی (1808) وە دەستی کرد بەشەڕکردن لەگەڵ سوید، تزار هەموو خاکی فریلاند هەتا ڕووباری تونیوی داگیرکردو خستیەسەر خاکی ڕوسیا، ئەلکسەندەر دەیزانی بەداگیرکردنی فریدلاندیش نەیتوانیوە

توڕەیی خاوەن زەوییە فیودالەکانی ڕوسیا هێوربکاتەوە، چونکە ئەمانە بەرژەوەندی خۆیان پێگرنگترە لەداگیرکردنی خاکی پڕبەفرو ساردی بێپیت، هەرچۆنێکبێت داگیرکردنی فریلاند بەڵگەیەکی تازەبوو بەدەست ئیمپراتۆری ڕوسیاوە کەپساندنی پەیوەندی لەگەڵ ناپلیۆندا مەترسیدارەو زیانی زۆری لێدەکەوێتەوە.

---

215 - کەبەشی خۆرهەڵاتی ئەو ناوچەیە لەساڵی (1945) خرایەسەر ئۆکرانیاو بوو بەبەشێك لەسۆڤیەت• مولداڤیاو والاسی: دوو وڵاتی دانوبن وئەمڕۆ کەوتونەتەسەر خاکی ڕۆمانیا. (و- کوردی)

تالیران بەنهێنی بۆ یەکەمجار لەگەڵ ئەلکسەندەردا کەوتە قسەو بەوە ئامۆژگاری کرد خۆی لەبەرامبەر بەرژەفریەکەی ناپلیۆندا رابگرێت وبەمەش خیانەتی لەئاغاکەی کرد، دواتر پاساو هێنانەوەی تالیران لەو رەفتارەی ئەوەبوو گوایا هۆی کردنی ئەم کارەی ئەوەبووە لەچارەنووسی فەرەنسا ترساوەو هەستی کردووە ئەو خۆبەزلزانی وسەرکێشیە لەسنووربەدەرسیەی ناپلیۆن فەرنسا بەرەو هەڵدێر دەباتەوە، ئەم دەسیسەبازە پیرە [316]. سەرەتا ئاوا لەگەڵ تزاری روسیادا کەوتبۆ قسە، کەجۆرە پێهەڵگوتنێکی پێوەدیارە(گەلی فەرەنسا شارستانییە، بەڵام فەرمانرەوای نییە، فەرمانرەوای روسیاش شارستانییە، بەڵام میللەتەکەی هەونیە، بۆیە پێویستە فەرمانرەوای روسیا لەگەڵ میللەتی فەرەنسادا یەك بگرێت)

دەڵێن تالیران بەدرێژایی تەمەنی خۆی ئاغاکانی خۆی فرۆشتبوون، ئەو رۆژگارێ دیرکتواری بەناپلیۆن فرۆشتن، ئێستاش لەئارفورتدا ناپلیۆن بەئەلکسەندەر دەفرۆشێت ودواتریش ئەلکسەندەریش بەبریتانیا، بەڵام بەوەی ناوبراو بریتانیاشی بەکەسیتر نەفرۆشت، هۆکەی ئەوەبوو بریتانیاییەکان تەنها کەسانێکبوون کەکریاری ئەوبوون، ئەگەرچی تالیران زۆرجار رۆجی خۆی دەخستە مەترسی، دواتر بەهای خۆی لەئەلکسەندەر وەرگرت، هەرچەند ئەوەندەشنەبوو کەناوبراو چاوەروانی دەکرد، بەڵام جێگای گرنگییە لێرەدا ئاماژە بەم دوخاڵەبکەین.

یەکەم: ئەو شتانەی کەلەساڵی (1808)دا وردەوردە ببووەجێگای دڵنیگەرانی لەلای مارشاڵ وکاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەتی فەرەنسا، لەهەموو کەس زیاتر درکی پێکردبوو،

دووەم: ئەلکسەندەریش پەی بەوراستییە بردکە ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن بەپێچەوانەی ئەوەی بەرووکەش دیارە، نەئەوەندە پتەو ودرێژخایەنەو نەئەوەندەش یەکگرتوو وخۆراگر، بۆیە ئیمپراتۆری روسیا لەو پێشنیارەی ناپلیۆن کردی کەسەبارەت بەوەبوو ئەگەر نەمسا ویستی لەگەڵ فەرەنسادا شەربکات دەبێ روسیا دژی ئەمە بوەستێتەوە، ناڕازی بوو، لەکاتی گفتوگۆکردن لەسەر ئەمە ناپلیۆن توڕەبوو وکڵاوەکەی خۆی بەزەویدا کێشاو بەپێلاقان کەوتەسەری، ئەلکسەندەر لەبەرامبەر ئەم رەفتارە نابەجێیەی ئەودا گوتی: تۆ توڕەو تۆسنی ومنیش شەڕانگێز..- یان ئەوەتا بەلۆژیك وبەڵگە بابدوێین- یان من دەڕۆم)

هاوپەیمانیەتی لەنێوان روسیاو فەرەنسادا هەرمابوو، بەڵام ناپلیۆن نەیدەتوانی دڵی خۆی پێخۆشبکات، لەروسیادا هەموو لایەك هەست وخوستیان راگرتبوو داخوا دانیشتنی ئارفورت، بەخێر کۆتایی دێت- یان نا، ئایا ناپلیۆن چوار مانگ لەمەوبەر بنەماڵەی پاشایەتی ئیسپانیای بانگهێشتکردن بۆ بایون ولەوێدا دەستبەسەری کردن، ئەلکسەندەریش دەستبەسەر دەکات؟ کاتێ ئیمپراتۆری روسیا لەئارفورت گەڕایەوە، ژنراڵێکی پیری پروسی بەراشکاوی بەشێوەیەکی بەرووکەش کارەکان سەرکەوتوانە دیاربوون، بەدرێژایی ئەوماوەی هەردوو ئیمپراتۆر لەئارفورتدا پێکەوەبوون، پاشاکانی کەناپلیۆن داینابوون وهەموو میرو فەرمانرەواکانیتر لەوپەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان ناپلیۆن وتزاری روسیا چێژیان وەردەگرت، بەڵام کاتێ ئیمپراتۆری فەرنسا لەئەلکسەندەر جیابۆوە، مەلول وغەمباربوو، ئەو دەیزانی ئەو پاشایانەی خۆی داینابوون ومیرو فەرمانرەواکانی ژێردەستی، خۆشیان بروایان بەپایەداری ئەو هاوپەیمانیەتییە نییە، تەنانەت نەمساش باوەڕی بەمەنەبوو، بۆیە دەبوا هەرچی زووترە کێشەی شۆرشگێرە یاخییەکانی ئیسپانیا، یەکلایی بکاتەوە.



# (4)

لەوکاتەدا ناپلیۆن (100) هەزار سەربازی لەسەرخاکی ئیسپانیادا هەبوو، فەرمانیدا (150) هەزار سەربازیتر رەوانەی ئیسپانیا بکرێت، شۆرشی گوند نشینەکان رۆژ بەرۆژ بەرفراوانترو بەگورتر دەبوو، بەزاراوەی ئیسپانی کەپێی دەڵێن گریلا، بەواتای شەری بچوکدێت، بۆ تێگەیشتن لەو رووداوانەی کەلەووڵاتدا روویدەدا تەواو کاریگەربوو.

ئەوشەرە کەلەلایەن گوندنشین وسەرخێڵ و شوان و... هیترەوە دەکرا، زۆر زیاتر لەشەرە گەورەکانی سوپای فەرەنسا ناپلیۆنی هەراسانکردبوو، دوای ملکەچکردنی پروس، بەرەنگاربوونەوەی سەرسەختی شۆرشگێرەکانی ئیسپانیا بەشێوەیەکی سەرسورهێنەرانە زیادیکردوو هیچ کاتێ ناپلیۆن وێنای ئەوەی نەدەکرد ئەو ئاگرەی پارتی زانەکانی ئیسپانیا ئاوا درێژە بکێشێت ونەگەری ئەوەهەبوو کاریگەری لەسەر ئیمپراتۆر جێبێڵێت لەسەرکەشی لەخۆبایی بوونی کەمێ بسرێنێتەوە، بەڵام کاریگەری لەسەر کەسێکی وەك ئیمپراتۆر ناپلیۆن، کەئەورووپای خستۆتە ژێر دەسەلاتداریەتی خۆی، کەمبوو،

ناپلیۆن بەوەی متمانەی بەیاریدەدەرانی سەربازی روسیانەبوو ودەیزانی ئەمسا دەیەوێت هێرشی بکاتەسەر، لەکۆتایی پایزی ساڵی (1808)دا لەوکاتەی تەواو کەللەیی ببوو، لەدەست پارتیزانە گوندنشینە درێوو چڵکنەکان وکەوتبۆ جۆش، بۆخۆی چوو بۆ ئیسپانیا.

لەوکاتانەدا بریتانیاییەکان توانیبوویان لەپایتەختی پورتوگال دابەزن وسوپای فەرەنسا لەوێدا تێکبشکێنن، ئیتر پورتوگال یەك پایەگای سەربازی فەرەنسا نەمابوو، بەڵکو بریتانیایی بوو. فەرەنسییەکان تەنها سەرووی ئیسپانیا هەتا رووباری ئابریان لەدەستدامابوو، ئیسپانیا لەشکرێکی بەچەك وتفاقی بریتانی سازکردبوو وناپلیۆن لەگەڵ ئەو لەشکرە تازەیەی ئیسپانیادا کەوتەشەرو لە(10/ی نۆڤەمبەری ساڵی (1808)دا لەدربورگوسدا تێکیشکاندن، بەهۆی دووشەری ترەوە کەدواتر روویدا، ئیتر لەشکری ئیسپانیا تەواو لەبەین چوو.

لە(30/ی نۆڤەمبەردا ناپلیۆن بەرەو مەدرید کەوتەرێ، جێگای وەبیرهێنانەوەیەکە ناپلیۆن بۆ زاڵبوون بەسەر ئیسپانیادا سوپای پۆلۆنیا کەخۆی دروستیکردبوو هێنابوو ولەگەڵ سوپای فەرەنسادابوو، بەفەرمانی ناپلیۆن پۆلۆنییەکان ملی شۆرشگێرە ئیسپانییەکانیان دەپەراندو بەبێ شەرمانە سەرکوتی راپەرینەکانی ئیسپانیایان دەکرد.

ناپلیۆن بەئەمانەی دەگوت: بۆسەربەخۆیی وەرگرتنی پۆلۆنیا پێویستە لێوەشاوەیی زیاتر نیشانبدەن وئێستا پۆلۆنییەکان لەکۆششی ئەوەدابوون بەداگیرکردنی نیشتمانی ئیسپانیاییەکان نیشتمانەکەی خۆیان ئازادبکەن، لە(4/ی دیسمبەری ساڵی (1808)دا ناپلیۆن گەیشتە مەدرید، پایتەخت بەخامۆشییەکی مەرگبارەوە پێشوازی لەئیمپراتۆر کرد، ئیمپراتۆر دەستبەجێ لەمەدریدو سەرتاسەری ئیسپانیادا حکومەتی سەربازی راگەیاندو دادگای سەربازی دروستکردن، ئینجا هێرشیکردەسەر بریتانیا. وادەهاتە بەرچاو کەئیتر سەربەخۆیی بوونەوەی ئیسپانیا جارێکیتر لەدەست چۆوەو چەند فشاری زیاتر دەخرایەسەر ئەو میللەتە بەرەنگاری بوونەوەیان دژبە سوپای فەرەنسا بەهێزتردەبوو.

شاری ساراگوس کەسوپای فەرەنسا گەمارۆی دابوو، چەند مانگێك بەرگریانکرد، مارشاڵ لان چواردەوری شاری گرتبوو لە(27/ی یەنایەری ساڵی (1809)دا چووەناو ئەوشارەوەو داگیری کرد، ئیتر لەوشارەدا رووداوی وادەهاتەپێش کەپێشینەی نەبوو، هەموو ماڵێك ببووە سەربازگە، سوپای فەرەنسا ناچاربوو هەموو هۆدەو تەویلەو کادێن وشوێنەکانی تری ئەم شارە



بەشەڕی دەستەویەخە داگیربکەن، ئەم کوشت وکوشتارە دڕندانەیە سێ هەفتەی خایاند، ئەوشارەی کەتا ئەوکاتەش بەرەنگاری دەکرد، سەربازەکانی مارشال لان، ژن ومنداڵیان دەکوشتن ودەستیان لەهیچ نەدەپاراست، بەلام ژن ومنداڵەکانیش هەرکە بواریان بۆدەڕەخسابا سەربازەکانی فەرەنسایان دەکوشتن، سوپای فەرەنسا (20) هەزار شۆڕشگێڕو (32) هەزار هاولاتی ئەوشارەیان لەناوبردن و ڕەشەکوژیانکردن.

مارشال لان، ئەوسوارە بێباکەی لەدنیادا لەهیچ نەدەترسا، ئەو ئەفسەرەی کەلەمەترسیدارترین شەڕەکانی ناپلیۆندا بەشداری کردبوو ونەیدەزانی بەزەیی ودەستپاراستن چییە، لەبینینی ئەوهەموو تەرمە کەلەسەر هەموو ماڵ وکۆلان و شەقام وسەربان وبەرزاییەکاندا کەوتبوون، کەوتە لەرزین و لەوکاتەی کەبەکۆلانەکانی ئەوشارەدا دەڕۆیی بەوسەربازلەنەی دەوروبەری گوت: چ شەڕێکە حەیفە مرۆڤ ناچاربکرێت میللەتێکی ئاوا ئازا بکوژێت، ئەم سەرکەوتنە جگەلەهێنانی پەژارەو سۆز چ کاریگەرییەکی تری هەیە؟

گەمارۆدان و داگیرکردنی شاری ساراگوس لەلایەن سوپای فەرەنساوە کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لەهەموو ئەورووپا بەگشتی ونەمساو هەموو دەوڵەتانی ئەڵمانی نەژاد بەتایبەتی جێهێشت، ئەو بەرگرییە دلێرانەی ئیسپانییەکان بەسەر دانەنەواندنیان، کاریگەری تەواوی کردەسەر شەرمەزاری وملکەچی بۆ ناپلیۆن و ورەو تەکانی بەدڵی ئەمانە بەخشی، ناپلیۆن دەوڵەتی داگیردەکردن، بەلام نەیدەتوانی تاماوەیەکی دوورو درێژ چینی بۆرژوازی ولاتەژێر دەستەکانی بەبێ کاردانەوە بهێڵێتەوە، بۆرژوازیەتی ئەورووپا کەبەدەستی خودی ناپلیۆن تەواو کەوتەسەرڕێ ولەکۆت وبەندی میرو شانشینەکانی ڕزگاری بوو وکەوتبۆ سەر ڕێگای بەرەوپێشچوون وئازادی سەرمایە، ئەمیش بەتۆرەی خۆی دەبوا ڕێگاچارەیەکی تازە بدۆزێتەوە بۆ ڕزگاربوونی لەم گیرۆدە ئابوورییە، کەسیاسەتەکانی ناپلیۆن لەدولاوە فشاری کردبۆسەر، هەرکە وردەوردە ڕاپەڕینە میللییەکان دژی ناپلیۆن لێرەولەوێ زیادیاندەکرد ئەمە هەمان ئەوڕێگا چارەیەبوو کەبۆرژوازی ئەورووپایی لەم گرفتە ئابوورییە دەربازدەکرد، پرینچکی ئەو بەرگرییە میللییانە هەرلە ساڵی (1803)وە بەدیارکەوتن، لەو شوێنانەی کەلەژێر دەسەلاتی ناپلیۆندابوون، بەلام لەساڵی (1813)دا لەهەموو ئەو ولاتانەدا وەك ئاگرێکی مەترسیدار گڕوکڵپەی پەیداکرد، ناپلیۆن لەساڵی (1806)دا تەنانەت پێش تێکشکانی پروسیش ئەوەی نیشاندابوو کەبچوکترین هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی گیانی نەتەوەیی لەناو دڵی میللەتی ئەڵماندا، چۆنچۆنی بەرپەرچی دەداتەوە، هەر لەدوای ڕێککەوتننامەی ئاشتی تیلیست، ناپلیۆن وای بیردەکردەوە دەتوانێت لەتەواوی شانشینەکانی ئەڵمانی نەژاددا چۆنی بوێت وابکات.

ناپلیۆن نەیدەزانی کەفیختە [217] لەبەرلیندا لەگەڵ وانە گوتنەوەکانی خۆیدا توانج وپلاری نیشتمان پەروەرانە باسدەکات، نەیدەزانی لەزانکۆکانی ئەڵمانیادا دەستەو گروپ دروستدەبن، هەرچەندە تائەوکاتەش نەدەوێران دژبە فەرمانڕەوا سەرسەختەکەیان ڕاپەڕن، بەلام بەنهێنی کینەو نەفرەتیان لەئەو لەدڵ گرتبوو، ناپلیۆن پەی بەم ڕاستییە نەبردبوو. ئەگەرچی بۆرژوازییەکانی دەوڵەتەکانی بەنەژاد ئەڵمانی، لەهێنان وجێبەجێکردنی قانونی مەدەنی ناپلیۆن ونەهێشتنی ڕژێمی میرو شانشینی دڵخۆشبوون، بەلام بەرگەی ستەمی سیاسی و ماڵی فەرەنسایان نەدەکرد، کەباجی

[217] - فیختە، یوهان کوتلیب (1762-1814) فەیلەسوفێکی ئەڵمانیەو قوتابی کانتەو مامۆستای شلینکە، سەرەتا فەلسەفەی ئەو بەشێکبوو لەفەلسەفەی کانت، بەلام لەکۆتایدا بووبەیەك فەیلەسوفی ئایدیالی ڕەها.

خوێندانیشیان دەدا، واتە دەبوا ئەڵمانییەکان ببوونا سەرباز لەسوپای مەزندا، بەڵام ناپلیۆن ئەمەی نەدەزانی و نەیدەویست بشزانێت.

لەئارمورتدا، شانشینەکانی ئەڵمانیاو هاوسەرەکانی ئەوان، بەپێی گوتەی ئەوکەسانەی لەوێدابوون، رێك وەك تۆکەرو کۆیلەی ئەربابێکی توڕەو تۆسن وابوون، ئەو نۆکەرو کۆیلانەی بۆ ماچکردنی دەستی ناپلیۆن بەپەرۆشبوون و ئیمپراتۆریش دەستی بۆ بەرزەکردنەوە تاماچی بکەن.

داوا لەگۆتەی شاعیری گەورەی ئەڵمانیا کرابوو، جارێك بچێت بۆ سەردانی ناپلیۆن، ئاکام کەناپلیۆن لەئارفورتدا پێشوازی لەگۆتە کردو بیری چۆوە کورسییەك بۆ دانیشتنی ئەو شاعیرە پیرەدابنێت، بەڵام کاتێ ناپلیۆن دەستخۆشی لەنووسینی کتێبی ڤارتێری ئەوکرد، گۆتە لەخۆشی وشادیدا باڵی گرتن، بەکورتی چینی باڵای کۆمەڵایەتی ئەڵمان کەناپلیۆن هەر لەگەڵ ئەوانەدا پەیوەندی هەبوو، تەنانەت کەمێکیش نارەزاییان دەرنەبڕی، میللەتێکی بێدەنگ وملکەچ بوون لەبەرامبەریدا، ئەو هاواڵانەی لەنەمساوەش دەگەیشتن ڕۆژ بەڕۆژ هەراسانکەرتربوون.

لەنەمسادا پروپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوە ناپلیۆن تەنها دەتوانێت بەیەك دەست شەڕبکات، چونکە ناچارە بەدەستەکەی تری باری گرانی شەڕی ئیسپانیا دابین بکات، لەنەمسادا دەیانزانی ناپلیۆن بەهیچ نرخێ ڕازی نابێت دەست لەئیسپانیا شلبکات وحەزی ئەو تەنها لەبەرئەوەنییە پانتایی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەکەی زیادبکات، بەڵکو لایەنی تری هەن و لەبەر ئەمە بۆماوەیەکی دوورو درێژ لەومەملەکەتەدا دەمێنێتەوە، لەو ڕۆژانەدا سیاسەتی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا لەژێر فەرمان و ڕێنماییەکانی ناپلیۆندا توندو تیژتر دەبوون، بەچاوپۆشیش لەشێوە دورگەی ئیبری کەبریتانیا لەهەندێك لەوخاکەدا جێگیرببوو، بەمانای ئەوەی سیاسەتی سەرەکی وئامانجی ناپلیۆن درێژەدانبوو بەسیاسەتی گەمارۆدانی ئابووری [218] سەر بریتانیا.

# (5)

خیانەتکردن– یان بەلانی کەمەوە گومانی خیانەتکردنی تالیرانی پارەپەرست وفوشەی جاسوس، واتە: ئەو دوو بێشەرەفە تەواو بیرو هۆی ناپلیۆنیان بەئەندازەی ئەگەری شەڕ لەگەڵ نەمسادا جەنجاڵ کردبوو، چونکە ئاگاداری ئەوەشبوو مارشالەکانی لەئیسپانیادا بێبوونی ئەو نیوەی ورەو توانای خۆیان لەدەستدەدەن، بەئومێدی براکەی جۆزێف، کەبەبێ خۆی کەسێکی دەستەوەستان وهیچ بوو، ئیسپانیای جێهێشت وبۆخۆی گەڕایەوە پاریس و فەرمانی بەهەموو وەزیرەکانیدا لەکۆشکی تویلردا کۆببنەوە، ئینجا لەڕۆژی(28/ی یەنایەری ساڵی (1809)دا بەتوڕەییەوە تالیرانی سەرکۆنەکردوو سزایدا، ناپلیۆن بەمجۆرە ڕوویکردە تالیران وئەم گوتانەی ئەو بەناویانگن:(ئەی دز، تۆدزی، تۆ پیاوێکی بێ باوەڕی! تۆ باوەڕت بەخوانییە! تۆبەدرێژایی تەمەنی خۆت سەرپێچیت لەئەرکەکانی خۆت کردووە، تۆ هەموو لایەکت فریوداوەو خیانەتت بەهەموو لایەککردووە، هیچ شتێك لای تۆ پیرۆز نییە، ئەگەر بۆتکرابا باوکیشت دەفرۆشت...، بۆچی من، تۆم بۆ مەیدانی

---

[218] - لێرەدا کەدەڵێین گەمارۆی ئابووری، دەقاودەق بەمانای گەمارۆی ئابووری بەشێوازی ئەمڕۆنییە، بەڵکو بەمانای ڕێکاگرتن لەئاڵوگۆڕو ئاڵوێری بازرگانییە لەگەڵ ئەو وڵاتەدا. (و- کوردی)



مەشقپێکردنی کاروزل [219] نەنارد؟ ئەتۆ رێك وەك بۆگەنی گۆرەوی ئاوریشمی ناو پـێلاو وایـت) نـاپلیۆن تـەواو ئاگـاداری خیانەتەکانی تالیران نەبوو، دەنا دەستبەجێ فەرمانی گوللەبارانکردنی دەردەکرد، بەلام ئەو کاری گرنگتیری لەپێشبوون، تایبەکەسێکی بەسك ومانگ خیانەتکار خەریکبێت، ئەویش ئـەوەبوو شـەڕکردن لەگـەڵ نەمـسادا بووەهـۆی کەمکردنـەوەی هەڕەشەکانی خۆی لەسەر تالیران.

لەئیسپانیادا لەژێر زەبرە بەهێزەکانی سوپای فەرەنسا نیمچە وێرانببوو، بۆجارێکیتر شۆڕشی گوندنشینەکان وراپـەڕینی شارەکان لەهەموو لایەکەوە سەری هەڵدایەوە، بۆ ئەوەی ئیتر هەرگیز خامۆش نەبێتەوە، ئەو خەڵکانەی کەلەزەوییەوە شین دەبوونەوەو لەزەویشدا خۆیان حەشاردەدا– یان بەواتایەکیتر لەزەوی هەڵدەقولان، سوپای (300) هەزار کەسی ناپلیۆنیان شپرزە کردبوو، بەلام لەوکاتانەدا ئیمپراتۆری فەرەنسا بەقەت نیـوەی ئـەو سـوپایەی هـەبوو لەلایـەکی تـرەوە سـەربازی مەشقپێدەکردن وئامادەی شەڕی نەمسای دەکرد، بەگرتنی خەڵك بۆسەربازی لەخاکی فەرەنسادا توانی (100) هەزار سەرباز دابین بکات، ئەمە جگەلەوەی لەو شوێنانەی کەوتبوونەژێر دەسەلاتی خۆی ولەشانشینەکانی بەرەگەز ئەڵمانیدا فەرمانیدا (100) هەزار سەرباز بۆ ئەو کۆبکەنەوە، ئەمانەش بەبێ هیچ نارەزایی وپرتەو بۆڵەیەك فەرمانەکەی ئەویان جێبەجێکرد، ئینجا لەنێوان سەربازە کۆنەکانی خۆی بەتایبەت ئەوانەی متمانەی پێبوون (110) هەزار کەسی هەڵبژاردوو (70) هـەزار سەربازیشی لەمانە ناردبۆ ئیتالیا، بۆئەوە رێگا لەئەگەری هێرشی نەمسا لەوشوێنەدا بگرن، بەمجۆرە ئەو لەبەهاری ساڵی (1809)دا زیاترلە(300) هەزار سەربازی ئامادەی لەدەستدابوو بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی شەڕی ئەگەری نەمسا، نەمساش لەلای خۆیەوە هەموو هێزەکانی خۆی ئەیارکردبوو، لەدەرباری ڤیێناو هەموو ئەو برژوازی و ئەرستۆکراتانەی بەرپاکەری ئەم شەڕەبوون، لەگەڵ یەکدا کۆکبوون، ئەشراف وئەرستۆکراتەکانی هەنگاریاش ئەم جارەیان وەفاداری تەواوی تەخت وتاراجی پاشابوون، لەڕاستیدا مەسەلەی بەرگریکردن ببووە ئامانەتێکی پیرۆزو لەنێوان هەموو ئەمانەدا هاوبەشبوو، ئەم ئەمانەتـە پیرۆزەش رژێمێکی سرواڵبوو کـەپانتایی سـنووری ئـەو لەسـەر نەخـشەی جوگرافیـایی بەزەحمـەت دیاریـدەکرا، لـەڕووی سیاسیـشەوە بـەهۆی سـێ شـەڕی ئاکـام خراپـی (1794و 1797 وە–1800 و 1805) بەسـەختی هەڵـەڕژاو بـێ سەروبەرەببوو، ئاوەدانترین خاکی بنەماڵەی شانشینی هابسبورگ درابۆ فەرەنسا، برژوازی سنعەتکار کەکەڵکی لەگەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا وەردەگرت، لەئیمپراتۆریەتی نەمساشدا زۆر کاریگەری پەیدانـەکردبوو، بۆیـە ئەوشـەڕەی لەسـاڵی (1809)دا لەلایەن نەمساوە بەرپادەکرا، زیاتر لایەنی میللی پەیداکردبوو، بەواتایەکیتر بەهۆی گـەمارۆی ئـابووری سـەر بریتانیا توێژی بەکارهێنی کالاو بازرگانەکان فشاریان کەوتبۆسەر وئەمەش ببوەهۆی ئەوەی شەڕی نەمسا لایەنی جەماوەری وەربگرێت.

لەنەمساو ئەڵمانیادا ئەوەیان دووبارە دەکردەوەکە دواین تیشکی پرشنگی خۆر لەئیسپانیاوە بەدیارکەوت، هـەموو دنیـا کەوتبوونە چاوەڕوانی، ناپلیۆن بەخۆیی و سێ مارشاڵ بەتوانایەوە، واتـە لان و داوو و ماسـناوە ئامـادەی شـەڕبوو، ئـەو چاوەڕوانی ئەوەیدەکرد سەرەتا نەمسا دەستپێشخەری بکات وشەڕەکە داگیرسێنێت، چونکە بەم کارەی بەڵگەیەکی تـری

[219] - کۆرەپانی مەشقی سەربازی کاروزل، کەوتۆتە نێوان موزەی لوڤرو کۆشکەکانی توێلری کەلویسی چواردەهەم لە(5و6ی یۆلیۆی ساڵی (1662)دا چووە سەیری نمایشی سەربازی خۆی ولەوشوێنەشدا پەیکەری سەرکەوتن دروستکراوە. (و- فارسی)



دەدایەدەست، بەوەی ئەو بەجددی لەگفتوگۆکانی لەگەڵ ئەسکەندەردا ئاماژەی پێکردبوو ولەمەئاگاداری کردبۆوە، واتە: هەتا ئەوکاتەش ناپلیۆن بەئومێدی ئەوەبوو ڕوسیا هێرش بکاتەسەر نەمسا، لە(14/ی ئیبریل)دا شارل، باشترین فەرماندەی سەربازی نەمساوی هاتەناو خاکی باوی ڕەوە، ناپلیۆن لەکاتی وەجوڵەخستنی سەربازەکانی ڕایگەیاند بۆماوەی دوومانگیتر واڵە نەمساوییەکان دەکات چەکەکانیان بەدەستەوەبدەن وئەوکات ئەگەر پێویستی کرد جارێکیتر دەگەڕێنەوە ئیسپانیا، بێگومان ئەوسەت هەزار سەربازە ئەڵمانیەی کەسێ یەکی سوپاکەی ئەویان پێکدەهێنا زۆر جێگای متمانەی ئەو نەبوون، ئەو دەیزانی چەند یەکەیەکی سەربازی کارای خۆی لەئیسپانیادا چەند زیانی لێکەوتووە، بەڵام تەنها ناپلیۆن ئەمەی هەستپێنەکردبوو، بەڵکو نەمساوییەکانیش ئەمەیان دەزانی و بەوپەڕی وره بەرزییەوە ئامادەی شەڕبوون، یەکەم شەڕی گەورە لەنزیك ئابنسبرگ ڕوویدا، نەمساوییەکان سەرکوتکران وزیاتر لە(13) هەزار سەربازیان لێکوژرا، ئەوانەزۆر دلێرانەتر لەشەڕەکانی ئارکول و مارنگو و ئوستر لیتز جەنگان، شەڕی دووەم لە(22/ی ئیبریل لەئالمودا ڕوویدا، ئەمەشیان بەسەرکەوتوویی سوپای فەرەنسا تەواوبوو، ئارشیدوك شارل زیانێکی زۆری لێکەوت وبەرەو ئەوبەری ڕووباری دانوب هەڵات، لەم شەڕەدا مارشال لان بەگرتنەبەری ماتۆڕێك لەڕاتیسبندا هێرشەکەی خۆی دەستپێکرد، ناپلیۆن کەخەریکی گەمارۆدانی ئەو سوپایەی نەمسابوو لەگەرمەی شەڕدا قاچی بریندارکراو چەکمەکەی ئیمپراتۆریان لەپێی داکەندو بەپەلە برینەکەیان پێچاو ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد سواری ئەسپەکەی بکەنەوەو بەدەوروبەرەکەی خۆشی ڕاگەیاند، نابێ بەهیچ شێوەیەك ئەم بریندار بوونەی ئاشکرابکرێت بۆئەوەی سەربازەکان ورەیان بەرنەدەن.

کاتێ گەیشتە ئەوشارەی خستبویانە ژێر ڕکێفی خۆیان دانی بەئازارو ئێشی خۆی داگرت وبەپێکەنینەوە سەلامی لەوسەربازانە دەکرد کەبەهاوارو شادییەوە دەستی سەرکەوتن وسەلاویان بۆئەو بەرزدەکردەوە، شەڕەکانی ئاکمول و ڕاتیسبن، کەبەزیانی (50) هەزار کوژراو وبریندارو ونبووی سوپای نەمساو سەرکەوتوویی سوپای فەرەنسا تەواوبوو، ناپلیۆن لەماوەی پێنج ڕۆژدا لەپێنج شەڕی گەورەدا سەرکەوتوو بوو، لەدرێژەی بەدواکەوتنی سوپاتێکشکاوە هەڵاتووەکەی نەمسادا، ناپلیۆن لەوبەری ڕووباری دانوب لەشوێنێکدا بەناوی ئابرسبرگ گەیشتەوە لەشکرەکەی ئارشیدوك شارل وئەوهێزەی تەفروتوناکردو ئەوشارەی ئاگرداو بەپێی گوتەی نەمساوییەکان ناپلیۆن نیوەی دانیشتوانی ئەوشارەشی سوتاندن، ژنرال ساواری دوك دورڤیگو، سەبارەت بەپەڕینەوەی سەربازە سوارەکانی فەرەنسایی بۆناو وێرانەی ئەم شارە ئاوای نووسیوە(ئێمە بەناو کۆڵێنەی لەشی هەڵبرووکاوی خەڵکدا تێدەپەڕین، سمی ئەسپەکان لەناو لاشەی هەڵپلۆخاوی ئەو تەرمە سوتاوانەدا نقوم دەبوو کەکەفی کردبوو، ئەم ڕووداوە لە(3/ی مایۆ)دا ڕوویدا.

لە(8/ی مایۆ)دا ناپلیۆن بۆجارێکیتر وەك ساڵی(1805) لەکۆشکی شونبرونداا خەوتەوەو لە(13/ی مایۆ)دا سەرۆکی شارەوانی ڤیێننا (بورگماستر) کلیلی پایتەختی نەمسای بۆ ناپلیۆن هێنا، بەڕووەکەش شەڕەکە کۆتاییهات، بەڵام شارل زۆربەی سەربازەکانی خۆی ڕزگارکردن وبواری ئەوەی بۆڕەخسابوو بەسەر پردەکانی ڤیێننادا بیانپەڕێنێتەوە، ئەوبەری ڕووباری دانوب وئینجا هەموو پردەکانی تەقاندبوونەوە، لەوکاتەدا ناپلیۆن بڕیاریدا دەست بۆکارێکی یەکجار پڕکێشەو دیژوار ببات، لەبەشی خوارووی ڕووباری دانوبی پایتەخت، هەندێ تەنکایی لەماڵێن بەدیارەوەبوون کەدرێژدەبۆوە دوورگەی لوباوی ناوەڕاستی ڕوبارەکە، ناپلیۆن فەرمانیدا پردێك لەکەشتی هەتا ئەو دورگەیە دروستبکەن بۆئەوەی سەربازەکان بەسەریدا



بەپەڕنەوە، چونکە ئەو لەوبڕوایەدابوو لەو دوورگۆکەوە سەربازەکان بەئاسانی لەو پانتاییە کەمەی مابوو لەئاوەکە بپەڕنەوە، دواتر فەرمانیدا پردێکی تریش[220] دوروستبکەن بۆئەوەی زووتر سەربازەکان بۆ ئەوبەری ڕووباری دانوب بپەڕنەوە، سەرەتا یەکە سەربازییەکانی مارشال لان پەڕینەوە، ئینجا یەکە سەربازییەکانی مارشال داوو دەستیانکرد بەپەڕینـەوەو ئـەو دوو مارشالە هەردوو گوندی سەر ڕۆخ ڕووبارەکەیان داگیرکرد(ئاسپرن و واسینگ) بەڵام لەپڕ ئەو دوو یەکە سـەربازییەو ئـەو سەربازانەی تری کەخەریکی پەڕینەوەبوون کەوتنەبەر هێرشی سوپای ئارشیدوک شارل، شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا، لەوکاتەی مارشال لان دەجەنگی بۆئـەوەی لەشـکری نەمساوییەکان دووربخاتـەوە، پردەکەی بەشـی ڕاسـتی دانـوب، کەبەکەشـتی دورسنکرابوو تێکچوو وزۆر سـەربازو کەرەسـتەی سـەربازیش کەوتنـەناو ئاوەکـە، ناپلیۆن فـەرمانی بەمارشـال لان کـرد دەستبەجێ پاشەکشەبکات وئەمە بووەهۆی ئەوەی زیانێکی زۆر لەسوپای فەرەنسا بکەوێت.

لەماوەی شەڕەکەدا گوللەتۆپێکی نەمساوییەکان لەنزیك مارشال لان تەقیەوەو هەردوو قاچی ئەوی پەڕاندن، لان لەسەر کۆشی ناپلیۆن گیانی لەدەستدا، بۆجاری دووەم فرمێسك بەچاوەکانی ناپلیۆنەوە بینران، سوپای فەرەنسا کەوتە پاشەکشە بـۆ دوورگۆکەی لوباو، ناپلیۆن دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە فەرەنسییەکان لە(10) هەزار سەرباز زیاتر زیانیان لێنەکەوتووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم ڕێژەیە زۆر لەوەزیاتربوو، پاشەکشەکردنی فەرەنسییەکان هیچ گومان ودوودڵیەکی پێوەنەبوو کەزیانی زۆریان لێکەوت، ئەم شەڕە لە(21 و 22)ی مایۆدا ڕوویدا.

لەدەربارو دەوڵەتی نەمسا شادمان بوون وخۆیان بۆئەوە سازدەکرد ئەو پایتەختەی کەلێیەوە هەڵاتبوون جارێکیتر بخەنەوە ژێر چنگی خۆیان، ئارشیدوك شارل کەپیاوێکی سەنگین ولێوەشاوەبوو وبەم شەڕەی لـەخۆبایی نـەبوو وتەنانـەت لـەوەش ناڕەحەت دەبوو کەپێیان هەڵادەگوت.

هەرچۆنێکبێت ئەم ڕووداوە هاوتای گەمارۆدانی عکای سالیْ (1779)و هەتا ئایلونی سالی (1807)ش نەبوو، ئەم سێیەمین تێکشکانەی ناپلیۆن زۆر دیژوارترو بەرچاوتربوو، ناپلیۆن دەیزانی لەئەڵمانیادا یەك سەرهەنگی پروسی بەناوی شیل بەخۆیی وسەربازەکانیەوە، دەستی کردووە بەشەڕی پارتی زانی دژی سوپای فەرەنسا، هەروەها گوندنشینێکی (تیرول)یش بەناوی ئاندراس هوفر، شەڕێکی هارشێوەی ئەوەی سەزەوەیانی لەکێوەکانی تیرولدا دەسـتپێکردووە، دەیزانـی ئـیتر ئاسایـشی ئیتالیادا بوونی نامێنێت ولەئیسپانیاشدا شەڕی پارتی زانیو ڕاپەڕینی خەڵك زیاتر فشاردێنێتو دوو بەرامبەر زیاددەکات.

هەواڵی شەڕی ئاسلینگ وابلابۆوە، گوایا ناپلیۆن لەدوورگۆکەی لوبادا گرفتارو گەمارۆدراو ماوەتەوە، ئەمە بەپێی گوتەی خەڵکی ئەوروپا کەئارەزووەکانی خۆیان بەشێوەیەکی واقیعی دەردەبڕی.

لەگەڵ ئەمانەشدا ناپلیۆن ئارامی خۆی لەدەست نەدابوو، بەڕووکەش تەنها غەم وپەژارەی ئەو لـەم ڕووداوە ترسـناکەدا مەرگی مارشال لان بوو، نەك تێشکان لەشەڕێکی بچوکدا، ئەو دەیزانی سوپای نەمسا لەئاسینگدا زیانی زۆریان لێکەوتووە، لەقۆناغی یەکەمی شەڕەکەی ڤێننادا نزیکەی (50) هـەزار سـەربازیان لەناوچووە، ناپلیۆن لەگـەڵ ورە بەرزکردنـەوەو بـەهێزکردنی سـوپاکەی خۆیـدا، نەخـشەی تـازەی دادەڕشـتن وبەگرتنەبەرچـاوی ئـەو ڕاپۆرتانـەی کەلـەپانتایی

[220] - لێرەدا مەبەست لەپرد ئەوەیە، کەشتی لەتەك کەشتیدا لەنگەر دەگرێت و سەربازەکان لەیەکێکیانەوە بۆیەکیتر دەچن وبەمجۆرە دەپەڕنەوە. (و-کوردی)

ئیمپراتۆریەتەکەیەوە پێی دەگەیشتن، بەسەر سوڕماوییەوە ئەوهەواڵەی خوێندەوە کەپاپی حەوتەم وکاردینالەکانی لەگەڵ هەوارەکانی خۆیاندا گوتویانە ئەوشەڕەی ئاسلینگ سزای خوایە بۆسەر ستەمکاری جیهان وسەرکوتکەری ئەم ڕۆژگارەو بوختانکەی ئازاردەری کڵێسای مەسیح، ناپلیۆن لەگەڵ ئەم هەموو گرفتاریانەی هەیبوون، ئەمەی بیرخۆی نەبردەوەو بۆ نوێنەری خوای سەر زەوی هێڵ وسنووری دیاریکرد، بەدرێژایی هاوینی ساڵی (1809) هەواڵی هەراسانکەر لەلایەن بریتانیاییەکانەوە بەناپلیۆن گەیشت، ئەو هەواڵانەش بریتیبوون لەوەی، بریتانیا یەك سوپای گەڕۆکی بەمەبەستی بەرەیەکی شەڕی دووەمی سازکردووە لەسەرووی بەلجیکاداو (40) هەزار سەربازی پیادەو (30) هەزار سەربازی دەریایی لەدورگەی والشرندا دابەزیون، بریتانییەکان توانیویانە بۆماوەیەکی کەم فلسینك داگیربکەن، بەڵام سەرئەنجام بریتانییەکان تەمبێ کران وبەرەو وڵاتەکەی خۆیان چارۆکەی کەشتییەکانیان هەڵداو هەڵاتن، ناپلیۆن بەردەوام لەنێوان ڤێنناو کۆشکی شونبرون ودورگەی لوباودا لەهاموشۆدا بوو، ئەو زوو توانی پێشبینی یەك سەرکەوتنی گەورە بەسەربازەکانی بگەیەنێت، لەنیوەی مانگی یۆلیۆدا سوپا کەوتە پشوودان و دورگەی لوباو تەواو قایمکرا، ناپلیۆن دڵنیابوو لەوەی ئارشیدوك شارلی فەرماندەی سوپای نەمسا ئەوماوە دووردرێژە دەستەوەستان ماوەتەوەو توانای ئەوەی نییە هێرشبکاتەسەر سوپای مەزنی فەرەنساو ئێستا تەنها بۆخۆی دەتوانێت فەرمانی یەکلایکەرەوەی شەڕێکیتر دەربکات دژی ئەو، دوای ئەوەی ناپلیۆن ئەوکارو ئەرکە سەربازیانەی کردن، تەنها چەند ڕۆژێکی بەدەستەوە مابوو بۆ پشوودانی خۆی، ڕاستەوخۆ خەریکی چارەسازی مەسەلەی پاپ بوو وبۆ ئەمە کەوتە جوڵە، پاپی حەوتەم سزای ئەو هەڵەشەییەی کەسەبارەت بەشەڕی ئاسلینگ لەوتارە ئایینییەکاندا دابووی وەرگرت، جگەلەمەش لە(17/ی مایۆی ساڵی (1809)وە شاری ڕۆم وهەموو خاکی کڵێسا بەپێی ئەو بڕیارەی کەناپلیۆن ئیمزای کردبوو خرابۆسەر خاکی فەرەنسا.

ئەم فەرمانە کەلەژێرییەوە ئەمە نووسرابوو(دەرچوو لەهۆردووی سەربازی ئیمپراتۆری ئێمە، ڤێننا، ئیمزای ناپلیۆن) ئەو خاکەی کەپاپ بەبەڵگەی (بەخشین نامە)ی درۆی هەڵبەستراو درابۆ پاپاکانی سەدەکانی ناوەڕاست وئەوخاکەی کەئیمپراتۆری قستەنتینیەی مەزنیش لەسەرەتای سەدەی چواردەمدا دابویە پاپ سیلوستری یەکەم، هەموویان لێدەستێندرێتەوە، ماوەیەك دوای دەرچوونی ئەم بڕیارە سوپای فەرەنسا لەبەرواری (10/ی یۆلیۆ)دا ڕۆمیان تەواو داگیرکرد پاپیان[221] لەوعلکو ماڵە بێبەشکرد کەنزیکەی (1500) ساڵ بوو لەژێر دەستی خۆیدابوو، پاپیش بەبەهانەی پاراستنی گیانی، کەدەکەوێتە سەرووی ئیتالیا گوازرایەوە.

ناپلیۆن دوای ئەوەی پاپی بەومەرەدە گەیاند، دەستی کردەوە بەجێبەجێکردنی کاروباری سەربازی لەڕۆژانی (2و3و4ی مانگی یۆلیۆ)دا ناپلیۆن سوپای تازەی هێنایە دورگەی لوباو وزیاتر لە(550) تۆپی بۆ ئەوێ هێنا، لە(5/ی مانگی یۆلیۆ)دا فەرمانیدا دەستبکرێت بەپەڕینەوەی سەربازەکان بۆ ئەوبەری ڕووباری دانوب، لەشکری ماکدونالد کەلەئیتالیاوە هاتبوو کەوتەوەگەل سوپا بەهێزەکەی ناپلیۆن، لە(5/ی مانگی یۆلیۆی ساڵی 1809)دا شەڕ دەستی پێکردو ئارشیدوك شارلسیش پێشبینی ئەوەی کردبوو وناپلیۆنیش لەوبڕوایەدابوو نابێ بەپێی پێشبینییەکانی دوژمن شەڕبکرێت وتەواو پەیڕەوی ئەمەشی

[221] - لێرەدا مەبەست لەشەخسی پاپ نیە، بەڵکو مەبەست لەدامەزراوەی مەزهەبی پاپە.(و-کوردی)

دەکرد، فەرنسییەکان نزیکەی (550) بۆ (560) تۆپیان هەبوو ونەمساوییەکانیش (500) تۆپیان هەبوو، هەردوولا پێداویستییەکانی تۆپخانەی خۆیان فەراهەم کردبوو، پەڕینەوە لەدانوب بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەستی پێکرد، خوێناوی وسەختی شەڕی ڕۆژانی پێنج وشەشی یۆلیۆ زۆر ساتەوەختی مەترسیداری بۆ ناپلیۆن هێنانەپێش کەئەو لەناوەڕاستی سوپاکەیدابوو، مارشالەکانی ئەو واتە داوو وماکدونالدو ماسناو وژنرال درونوی فەرماندەی تۆپخانە، بەوردی ودروستی دەجولانەوە، دوای تۆپبارانکردنێکی توند لەشکری ژێر فەرماندەی ماکدونالد کەپێکهاتبوو لە(26) تیپ، لەچوار لاوە هێرشیان کردەسەر دڵی سوپای نەمساو تێکیانشکاند، ئینجا دوای سەربازەکانی کەوتن، کەمێ دورتر لەبەرەی باکووری خۆرهەڵاتیشەوە مارشال داوو کەناپلیۆن گوندی واگرامی سەرتەپۆلکەیەکی بۆئەو دیاری کردبوو، خستییەژێر هەڵمەتی خۆیەوەو لەماوەیەکی کەمدا ئەوگوندەی داگیرکردو بەمجۆرە تێشکانی حەتمی سوپای نەمسا بەدیارکەوت، لەشەوی(6/ی مایۆی ساڵی 1809)دا هەموو شتێك کۆتاییهات، سوپای نەمسا لەپێگەکانی خۆیان دەرپەڕێندرابوون، بەڵام بەتێڕوانینی گشتی تەواو پەرتەوازە نەببوون وبەشێك لەیەکە سەربازییەکانیان بەشێوەیەکی کۆنترۆڵکراو پاشەکشەیان کردبوو، تێکشکانی نەمساوییەکان لەشەڕی واگرامدا خراپبوو وچی لەشەڕی ئوسترلیتز کەمترنەبوو، چونکە لەڕۆژی دووەمی ئەوشەڕەدا نزیکەی (37) هەزار کوژراو وبریندارو گومبویان هەبوون، فەرەنسییەکانیش زیانی کەمتریان لەدوژمن پێگەیشتبوو، بەڵام هی ئەمانیش بەشێوەیەکی بەرچاو زۆر بوو،

سەرکەوتن بەسەختی دەستکەوتبوو، بەدواکەوتنی سوپای تێشکاوی نەمساوی بۆماوەی یەك هەفتە درێژەی کێشا، ناپلیۆن سەربازە سوارەکانی خۆی دەنگدابوو کەدوای سەربازە هەڵاتووەکانی نەمسا بکەون وبیانکوژن، لە(11/ی یۆلیۆ)دا کاتێ ناپلیۆن گەیشتە زنائیم، لەوە ئاگادارکرایەوە شازادەی لیختنشتاین ڕاوێژکاری ئیمپراتۆری نەمسا تازەگەیشتۆتە ئێرەو دەیەوێ ڕێگای بدەن بچێت بۆخزمەت ناپلیۆن، ئیمپراتۆری نەمسا پێشنیاری ڕاگرتنی شەڕی کردبوو، ناپلیۆن بەمەرجی زۆرگران بەمەڕازیبوو کەبریتی بوولە: دەبێ هەموو ئەو شوێنانەی لەکاتی شەڕدا سوپای فەرەنسا گرتویەتیە دەست، تەنانەت ئەگەر یەك یەکەی سەربازی بچوکیشی تێدابێت، لەژێر دەسەڵاتی سوپای فەرنسادا بمێنێتەوە، هەتا ئەوکاتەی پەیمانی ئاشتی نێوانیان مۆردەکرێت وئەمەش وەك سەنەد دەبێت وپێویستە سوپای نەمساش هەموو ئەو شوێنانە جێبێڵن، لیختنشتاین هەموو ومەرجەکانی قبوڵکردن، دانوستان دەستی پێکرد، ئیمپراتۆری نەمسا کەڕۆحییەتی خۆی لەدەستدابوو، ئێستا تف ونەفرەت لەوکەسانەدەکات کەساڵ ونیوێك لەمەوبەر چوو بوونە بنکڵێشەیەوەو بۆ ئەوشەڕە عاقیبەت خراپەیان هاندەدا(شەڕێك کەنەمسا لەڕۆگاری شەڕی سی ساڵەوە تابەئەمڕۆ خوێناویتر لەمەی بەخۆیەوە نەدیوە) ئێستا ئامادەبوو قوربانی وفیداکاری گەورە لەپای ئەمەدابدات، ناپلیۆن پێش شەڕی واگرام سزای پاپی دابوو وئێستاش بەترس ولەرزەوە باسی دەکرێت، دەیانگوت ئەی دەبێ سزای چۆنی نەمسا بدرێت دوای شەڕی واگرام؟ مەرجەکانی ناپلیۆن زۆر لەوانە زیاتربوون کەدوای شەڕی ئوسترلیتز بەسەر نەمسایدا سەپاندن، ناپلیۆن داوای لەولایەتەکانی، کارینتی و کارنبول و ئایستری و ترسیست وهەموو شوێنەکانی تری خۆرهەڵات وخۆرئاوای ئیمپراتۆری نەمسا کرد کە(132) ملیۆن فلورنی زێڕ باج بدەن، هەرچەند نەمساوییەکان چەنەیانکردو پاڕانەوەو دیپلۆماسییەتیان بەکارهێنا کەڵکی نەبوو، داگیرکەری بێ بەزەیی ودڵڕەق تەنها ئامادەبوو ئەو باجە بۆ(85) ملیۆن کەمبکاتەوەو دەستهەڵگرتنیشی لەوخاکەی دیاری کردبوو بیخاتەسەر ئیمپراتۆریەکەی



پانتاییەکی زۆر کەمبوو، بەدرێژایی ماوەی گفتوگۆکردنی ئاشتی، ناپلۆن لەکۆشکی شونبروندابوو، ملکەچی وگوێڕایەڵی لەڤێنناو هەموو شوێنەکانی تری نەمسادا بەرقەراربوو، ئەو ترووسکاییەی ئومێدەی لەدڵی نەمساوی وئەڵمانییەکاندا پەیدابوو کوژایەوە، ناپلیۆن لەڕەشنووسی رێککەوتننامەکەی لەگەڵ نەمسادا نووسیبووی، نەمسا مافی ئەوەی نییە لە(150) هەزار سەرباز زیاتری هەبێت، ئیمپراتۆر فرانسوا ئەم مەرجەشی قبوڵکرد.

لە(12/ی ئۆکتۆبەر)دا ناپلیۆن لەبەردەم کۆشکی شونبروندا کۆمەڵێ لەگاردەکانی خۆیی وخەڵکێتری بینی کەئەمانە لەبۆنەو ئاهەنگە تایبەتییەکاندا ئاوا بەناڕێکی کۆدەبنەوەو لەشوێنی دوریشەوە دێن وتامەزرۆی بینینی ئەون، ناپلیۆن بەچاوی سەرسوڕمانەوە سەیری ئەمەیکرد، چونکە هاتنی ئەو هەموو خەڵکە بۆ ئەوشوێنەو کۆبوونەوەی سەربازەکانی بەخۆشەویستی ئەو لاخۆشبوو، بەتایبەت لەلایەن خەڵکی شاری ڤێنناوە کەگوێڕایەڵی وملکەچی تەواو و بۆئەو بوزیان خواردبوو.

ئەو مەراسیمە خەریکی کۆتاییهاتنی بوو کەلەپڕ کوڕێکی پۆشاك وجوان توانیبووی خۆی بگەبەنێتە نزیك ناپلیۆن و لەوکاتەی کاغەزێکی سکاڵای بەدەستی چەپیەوە گرتبوو ولەئیمپراتۆر نزیکبۆوە، پێش ئەوەی ئەوکوڕە بواری بۆ بڕەخسێت چەقوە تیژو درێژەکەی لەبەرباخەڵی دەربێنێت، دەستگیریان کردبوو.

کاتێ ئەم ئاهەنگە کۆتاییهات، ناپلیۆن داوایکرد ئەوگەنجە دەستگیرکراوە بێننەلای، کوڕەکە ناوی شتاپس بوو ویەکێکبوو لەخوێندکارەکانی زانکۆی ناومبورگ.

ئیمپراتۆر لێی پرسی: بۆ دەتویست ئێمە بکوژیت ؟

لەوەڵامدا گوتی: من لەوبڕوایەدام هەتا بەڕێزتان بمێنن، نیشتمانەکەی من ودنیا ئازادی وئاشتی بەخۆیەوە نابینێت.

ناپلیۆن لێی پرسی: کێ تۆی هانداوە؟

شایس گوتی: کەس.

ئیمپراتۆر گوتی: ئایا لەزانکۆکانی ئێوەدا ئەم وانانەتان دادەدەن ؟

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی : نا بەڕێز.

ناپلیۆن لێی پرسی: تۆ دەوتویست ببیتە بروتوس [٢٢٢].

شتاپس، وەڵامی نەدایەوە.

دواتر ناپلیۆن گوتبووی نەیزانیوە بورتوس کێیە بۆیە هیچی نەگوت،

ناپلیۆن لەوکوڕەی پرسی: باشە ئەگەر من تۆ ئازادبکەم چی دەکەیت؟ ئایا دووبارە هەوڵی کوشتنی من دەدەیتەوە؟

شتاپس: دوای ماوەیەك بێدەنگی گوتی: بەڵێ, بەڕێز.

ناپلیۆنیش بێدەنگبوو وبەگرژی بەدەم بیرکردنەوە لەژوورەکە چۆدەرێ وهەمان شەو دادگای سەربازی دانیشت وشەوی دواتر شاپس گوللەبارانکرا.

---

[222] - کوڕی ئاشەرعی سیزارەو یەکێکە لەوکەسانەی کەلەناو پەرلەمانی ڕۆمدا بەشداری لەکوشتنی سیزاردا کردوو لەپشتەوە خەنجەری لێدان وسیزاریش لەکیانەڵادا کوتویەتی(بروتوس هەتا تۆش) بۆ زانیاری زیاتر سەیریَ کتێبی کەنیزەی شازادەی میسر بکە بەرگی دوو،(و-کوردی).



دووڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە کەناپلیۆن باسکردن و بڵاوکردنەوەی ئەمەی لەڕۆژنامەکاندا قەدەغەکرد، واتە لە(14/ی ئۆکتۆبەری ساڵی 1809)دا، ئیمپراتۆری نەمسا فرانسوا بڕیاریدا ڕێکەوتننامەی ئاشتی شونبرون ئیمزابکات، ئەو ئاشتییەی کەملکومالی ئەوی بەبێ بەزەییانە لێدەستێندراو هێزو توانای دیکتاتۆری ئەورووپای تائەوپەڕی زیاد دەکرد.

نەمسا باجی ئاوا گرانی ئەوشەڕە ئاکام خراپەی وەهەڵەکەی بۆ دورخستنەوەی ستەمی ناپلیۆن بەدانی بەهای گیانی سەدان هەزار مرۆڤ و وێرانی وڵات و دانی سامانێکی زۆرو لەدەستدانی سێ لەسەر چواری ئاوەدانترین ولایەتەکانی خۆیی ودانی چەندین ملیۆن سکەی زێڕو سەردانەواندن وخۆبەدەستەوەدانی لەبەرامبەر ناپلیۆندا، قبوڵکرد.

# ئەوپەڕی بەهێزی (1810-1811)

## (1)

ماوەیەك دوای ئیمزاكردنی ڕێككەوتننامەی ئاشتی شونبرون، ناپلیۆن ڤییننای جێهێشت، وەك ئەو ڕۆژانەی كەلەشەڕەكانی میسرو مارنگو و ئوسترلیتز و تیلیست، بەسەركەوتووی بۆ پاریس گەرایەوە، پانتایی ئیمپراتۆریەتەكەی ئەو جارێكیتر سنوورەكانی بەولاوەتر بردبوون، بێ باكەكانو چاوەترسەكان، زۆر بەبێ رەحمانە سزادرابوون، دەسەلآتدارێتی پاپ بەسەر موڵك وماڵی مەملەكەتەكەیدا لێی ستاندرابۆوە، شۆرشەكانی تیرول تەفروتوونا كرابوون، پارتیزانە سەرەڕۆكانی شیل بەفەرمانی ناپلیۆن لەلایەن یەك دادگای سەربازی پرۆسەوە، دادگای كرابوونو بڕیاری گولله بارانكردنیان جێبەجێكرابوو، لەبریتانیاوە هەواڵی خۆكوژی بازرگانان وسنعەتكاران و ناڕەزایی میللەت دەگەیشت، گوایا ئەو چاوەڕوانییەی لەگەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا دەكرا، سەری گرتبوو.

وادیاربوو ئیمپراتۆری جیهان گەیشتۆتە ئەوپەڕی هێزو تواناو سامان وشانازی وسەروەری. ناپلیۆن دەیزانی بەزەبری زۆر ئەوروپای خستۆتەژێر فەرمانی خۆی وبەبێ هێشتنەوەی ترس لەسەر ئەوروپا ناتوانێت لەچنگ خۆیدا بێڵێتەوە، بەلآم بریتانیا خۆی نەدەدا بەدەستەوە، ئیمپراتۆری ڕوسیاش بەئاشكرا خەریكی هەڵپەو كلكەسوتەبوو، چونكە لەوشەڕەی كەتازە كۆتایی هاتبوو جێدەستی دیارنەبوو وتەنها بەڕووكەش وایدەردەخست خەریكی شەڕكردنە لەگەڵ نەمسادا، ئیسپانیاییەكانیش كەبەڕەشە كوژی لەناودەبران، هەر بەردەوامبوون لەشەڕو بەسەرسەختی بەرگریاندەكرد، بێئەوەی سەركەوتنی شەڕی واگرام وتێكشكاندنی نەمسا، هیچ كاریگەرییەكی خراپ لەسەرردرێژەدان بەشۆڕشی پارتیزانییەكەیان جێبێڵێت وبسڵەونەوەو دەست لەبەرەنگاریكردنی سوپای مەزنی ئیمپراتۆری جیهان شلبكەن.

دەوروبەری ناپلیۆن بەفیداكارانی وەك ژونۆ وپیاوانی دانای وەك برنادوت وخائینانی زیرەكی ئەشرافزادەیەكی وەك تالیران وموریدی وەك ساواری كەئامادەبوو بەیەك ئاماژەكردنی ناپلیۆن باوكی خۆی بكوژێت، گیرابوو، هەروەها سەركردەی سەربازی وەك داوو لەدەوری ناپلیۆن بوون كەلەكاتی پێویستدا ئامادەبوون ئاگر لەپاریس بەرپدات لەبەرخاتری دڵخۆشكردنی گەورەكەی، هەروەها هەندێك لەكورسی پەرستی بێ ڕەوشتی نەفس نزمیشی لەدەوره بوون، واته: خوشك وبراكانی ئیمپراتۆر كەتەنها ببوونە مایەی دەردەسەری بۆ ناپلیۆن وهەمیشه لەبەر یەكدابوون وخەریكی كێشەو ململانێ بوون لەنێوان خۆیاندا. بەوەی ڕۆژگاری شەڕ ئاوا زوو بەسەردەچوو، مەسەلەیەك بوو نەناپلیۆن گومانی لەمە پەیداكردبوو ونەكەسی تریش، بەلآم ئەگەری ئەوەش هەبوو ئەو گوللانەی كەئیمپراتۆر لەناودەبەن دەبێ هەڵەڕژابن.

ناپلیۆن ئەوەی بۆ وڵاتی فەرەنسای ئەنجامدابوو، بەوەی ببووە ئیمپراتۆری خۆرئاواو پاشای ئیتالیاو پارێزەری شانشینەكانی هاوپەیمانییەتی ڕن و زۆریتر، جیاوازی زۆری هەبوو، مانەوەی دووەمیشی بەژیانی خۆیەوە وابەستە كردبوو، پێویستبوو یەك



شانشینی بۆماوەیی دروستبکات وجێگرەوەی خۆی کەلەخوێنی خۆیبێت هەبێت، جۆزفینی هاوسەری منداڵی نەدەبوون ولەسەر ئەم بنەمایە پێویستە ئافرەتێکیتر بکاتە هاوسەری خۆی.

ئێستا برینداری شەڕی ڕاتیسبن وکێردی شتاپس، هەموو کاتێ ئەو ڕاستییەی وەبیردەهێنایەوە، ئەوەی ناپلیۆن کردوویەتی لەسەر یەك موو بەندەو مەسەلەی دروستکردنی یەك زنجیرەی شانشینی بەلای ناپلیۆنەوە یەك کاری زۆر گرنگ وبنچینەیی بوو.

نووسەرەکانی فەرەنسا سەدان کتێبیان لەسەر ناپلیۆن وئەوکاتەی ئیمپراتۆری فەرەنسا بەجوزفین–ی هاوسەری گوت ناچارم دەستت لێهەڵگرم نوسیوە ، ئەم ڕاستیەی کە جوزفین لەهاوسەریەتییەکەیدا خیانەت– یان کاری نابەجێێ کردوون، بەلای ئێمەوە گرنگ نییە، چونکە ئەمە یەکێکە لەو ڕووداوانەی کەدوای شەڕی واگرام یەك لەدوای یەك ڕوویاندەدا، بۆیە ئێمە تەنها بەکورتی ئاماژە بۆئەمە دەکەین، ئەگەر ناپلیۆن عاشقی ژنێك بوبێت ئەوا بێ گومان هەمان جوزفینە کەلەسەرەتای هاوسەریەتیدا شەیدای بوو، هەرچەندە ناپلیۆن شەش ساڵ لەهاوسەرەکەی بچوکتربوو، ئیتر ئەو هیچ کاتێ بەئەندازەی جوزفین عاشقی هیچ ئافرەتێکیتر نەبووە، تەنانەت کنتس والوسکاش، جاچجای ئافرەتیتر کەکەم و زۆر پەیوەندی لەگەڵدا بەستون، ئەمڕۆ چەند ساڵێك بەسەر شەڕی ساڵانی(1796–1797)دا تێپەڕیبوو کەئەوکات ناپلیۆن نامەی سۆزداری بۆ جوزفین بنووسێت، ناپلیۆن دەیزانی ئەوکاتانەی ئەو لەپاریسدا نەبوو، جوزفینی هاوسەری سەرگەرمی خۆی هەبوون، ساڵان ڕۆیشتن و هاوسەرەکەی بەترس ولەرزەوە دەهاتەلایی وناپلیۆن قەدەغەیکرد جوزفین شفاعەت بۆکەس بکات.

ناپلیۆن بەلایەوە سەیرنەبوو جوزفین سروشتێکی سەرچڵی وگەمژەیی هەبێت وجگەلەئارایش کردنی خۆیی و سەماکردن وشەونخونی وکات بەخۆشی گوزەراندن هیچیتر نەزانێت، لەناو خودی کەسایەتی جوزفیندا شتێك نەبوو ببێتە جێگای سەرنجی ناپلیۆن، بەڵگەو نووسراوەکان ئەمە نیشاندەدەن کەناپلیۆن بەئارەزووی ڕاستەقینەی خۆی جوزفینی تەڵاق نەدا، ئیمپراتۆر لەنۆڤەمبەری ساڵی (1809)دا کەمەسەلەی تەڵاقدانی هاوسەرەکەی لەگۆڕێ بوو بەجوزفینی گوت (سیاسەت دڵی نییەو تەنها مێشکی هەیە) بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر ئەوی خۆشدەویست وپێکەوە ڕۆژیان بەسەر دەبردن، سەرئەنجام لە(15/ی دیسمبەردا، تەڵاقنامەکە بەهەموو خاوەن پلەو پایەبەرزەکانی ئیمپراتۆری گەیشت، ئیتر ئەو دوانە لەیەکتری جیابوونەوە، بەڵام ڕۆژانی دواتر ناپلیۆن نامەی خۆشەویستی ئامێزی بۆکۆشکی مالمزون کەبەجوزفینی بەخشیبوو وئەو بەکۆشەگیری لەوێدامابۆوە دەناردن، داوا لەپاپکرا بەناوی کڵێسای کاسۆلیکەوە پشتگیری ئەم تەڵاقنامەیە بکرێت، کەشیشەکانی تر لەجێگای پاپی حەوتەم ئەمەیان گرتەئەستۆ، چونکە واپێویستی دەکرد زوو ئەم کارەبکرێت ولەماوەیەکی کەمدا ئەنجامدرا.

یەك ئەنجومەنی تایبەت لەخاوەن پلەوپایە بەرزەکانی کۆشك پێکهێنراو دوای پێداچوونەوە لەمە بڕیاریاندا داوا لەئیمپراتۆری فەرەنسابکەن لەبەرخاتری بەرژەوەندی باڵای ئیمپراتۆری، ناپلیۆن هاوسەرێکیتر بۆخۆی هەڵبژێرێت، بێگومان زۆرینەی ئەندامانی ئەو لیژنەیە لەگەڵ مەبەستەکەی ناپلیۆندا کۆکبوون، لەڕووی بوونی پارەو خۆشگوزەرانی ئەمانە ڕاستەوخۆ چارەنوسیان بەبەردەوامی ئیمپراتۆرییەوەبوو وحەزیاندەکرد ئەم ڕژێمە لەژێر ناوی بنەماڵەی شانشینی بۆناپارت بۆهەرگیز بمێنێتەوەو ببێتە شانشینێکی بۆماوەیی، چونکە لەگەڕانەوەی بنەماڵەی بوربنەکان هەراسانبوون، لەلایەکیترەوە هەموویان تەنانەت تالیرانی خائینیش، پێش ئەوەی بکەوێتەبەر ڕق و توڕەیی ناپلیۆن، حەزیاندەکرد خزمایەتی لەگەڵ یەکێك لەودوو



دەوڵەتە زلهێزانە بگیردرێت، واتە- یان بریتانیا- یان ڕوسیا، بۆ ئەوی کۆتایی بەوشەڕەبێت کەچاوەڕوانی دەکراو لەئارادابوو، گروپێك کەفوشە لێپرسراویانبوو حەزیاندەکرد ناپلیۆن لەگەڵ خوشکە گەورەکەی ئەلکساندەری ڕووسیادا کەناوی ئاناپاو لونا بوو ببێتە هاوسەرو بیهێنێت، ئەوانی تریش حەزیاندەکرد ماری لویزی کچی ئیمپراتۆری نەمسا بکاتە هاوسەری خۆی، دوا بەدوای ئەوەی تەلاقدانەکە تەواوبوو یەکسەر ناپلیۆن کەوتە بیرکردنەوە لەوەی ئافرەتێك بۆخۆی هەڵبژێرێت ودیاریبکات، جگەلە ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا تەنها سێ دەوڵەت، شەرەف وشایستەگی ئەوەیان هەبوو ناوی ئیمپراتۆری مەزن هەڵگرن، ئەوانیش ڕوسیاو نەمساو بریتانیا بوون، بەڵام فەرەنسا لەگەڵ بریتانیادا لەحاڵەتی شەڕدابوو، بۆیە تەنها ڕوسیاو نەمسا دەمانەوە.

ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا لەنەمسا بەهێزتربوو لەشەڕەکانی لەگەڵ فەرەنسادا دۆڕابوو، لەبەر ئەمە دەبوا ڕوسیا هەڵبـژێرێت وخوازبێنی یەکێك لەدوو خوشکەکانی ئیمپراتۆری ڕوسیا بکرێت، ئێستا دەبێ کام یەك لەم دوانە هەڵبژێرێت؟

ئەمە شتێکبوو کەبە پلەدوو گرنگبوو، چونکە ناپلیۆن هیچ یەك لەم دوو کچانەی نەبینیبوو، لەوکاتانەدا ئاکاترینا پاولونا لەژجرجدو لدمبورگ، مارەکرا، بەباڵوێزی فەرەنسا لەپترسبورگ گوترا دەربارەی خوشکەکەی تری ئەلکسەندەر بکەوێتە گفتوگۆو بیخاتەڕوو، لەمانگی دیسەمبەری ساڵی (1809)و یێنایەری ساڵی(1810)دا خۆشی وشادی لەناو کۆشکی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیادا بڵاوبۆوە، ئەلکسەندەری یەکەم بەزمان لوسی وگفتولفتی خۆش بەکولونکوری دەگوت: ئاغەویەڕی خۆشحاڵە خوکەکەی خۆی بداتە ناپلیۆن، بەڵام بەبۆچوونی شاژنی دایك (ماریا فدورڤنا ئانا)، ئێستاش منداڵەو تەمەنی تەنها شازدە ساڵەو.. هیتر، شاژنی دایك بەتەواوی دژی ئەوەبوو کچەکەی ببێتە هاوسەری ناپلیۆن وزۆر لەکەسانی ناو کۆشکیش لایەنگری ئەویان دەکرد، هەموو خاوەن زەوی وئەرستۆکراتەکان نەفرەتیان لەناپلیۆن دەکرد، چونکە گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا ڕۆژ بەڕۆژ کاریگەری خراپتری پەیدادەکرد، لە(28/ی یێنایەری ساڵی (1810)دا ناپلیۆن لەکۆشکی تویلریدا کۆبونەوەیەکی شکۆداری سازکرد کەکار بەدەستانی پایەبەرزی دەوڵەت تێیدا بەشداربوون، لەمانەش کامباسدەسی مۆرداری ئیمپراتۆری و ورا پاشای ناپول وفوشە وەزیری ناوخۆ، لەگەڵ ئەمانەدابوون، ئەمانەی سەرەوە ڕایانوابوو ناپلیۆن خوشکە گەورەکەی ئیمپراتۆری ڕوسیا بکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام ئەوانیتر پێیانباشبوو ناپلیۆن ماری لویزی کچی ئیمپراتۆری نەمسا بێنێت، بەڵام خودی ئیمپراتۆر لەو هەڵسوکەوتەی ڕوسیا توڕەبوو وبەئاشکرا ڕایگەیاندکە حەزدەکات کچی فرانسوا ئیمپراتۆری نەمسا بکاتە هاوسەری خۆی، شۆراش لەم بارەوە بڕیاری کۆتایی خۆیدا.

(9) ڕۆژ دوای ئەمە لەپترسبورگەوە هەواڵی ئەوەگەیشت شاژنی دایك حەزدەکات بۆ شوکردنی کچەکەی بەناپلیۆن ماوەیەك مۆڵەتیان پێبدرێت، لەهەمان ڕۆژدا لەمترنیخی باڵوێزی نەمسا لەپاریسدا پرسیان، ئایا ئیمپراتۆری نەمسا ڕازییە کچەکەی خۆی ماری لویز بدات بەناپلیۆن؟ ناوبراو دەیزانی لەوبارەوە گفتوگۆ لەگەڵ بنەماڵەی ئیمپراتۆری ڕوسیادا کراوەو ئەویش ئەمەی بەباش دەزانی ئەم هەلە بقۆزێتەوەو شانشینی نەمساش بیری لەمەکردبۆوەو ناوبراو یەکسەر گوتی: ئیمپراتۆریەتی نەمسا ڕازییە، لەهەمان ڕۆژدا واتە(6/ی فبرایەردا شۆرا کۆبونەوەیەکی نائاسایی لەکۆشکی تویلریدا بەست وبەکۆی گشتی دەنگ بڕیاردراو ڕەزامەندییاندا بەوەی ناپلیۆن کچی پاشای نەسا بکات بەهاوسەری خۆی، لەڕۆژی(7/ی فبرایەر)دا گرێبەستی



هاوسەریەتییەك دروستکرا، کردنی ئەم کارە زۆر زەحمەتی نەویست، چونکە عەقدی هاوسەریەتی لویسی شازدەهەم لەگەڵ ماری ئەنتوانیتدا [223] لەئەرشیف دەریانهێنابوو و وەك ئەو لەبەریان گرتبۆوە.

ئەمە بۆ ئیمپراتۆری نەمسا نێردراو ئەویش لەسەری رازیبوو ولەرۆژی(21/ی فبرایەر)دا پاریس لەو رەزامەندییەی شانیشنی نەمسا ئاگادارکرایەوە، لەرۆژی(22/ی فبرایەر)دا مارشال برتیە سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپای فەرەنسا، بەوەکالەتی لەلایەن زاواوە، واتە: ناپلیۆن، بۆ بەشداریکردن لەئەداروکانی گرێبەستی هاوسەریەتییەکە کەدەبوا لەکۆشکی پاشایەتی نەمسادا کرابا، بەرەو ڤیێننا کەوتەرێ. لەڤیێننادا ئەم بریارە لەبری ناپلیۆن بەشادییەوە پێشوازی لێکرا، دوای تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی نەمسا لەبەرامبەر فەرەنسادا ئەم ژنخوازییە ببووە پردەبازی رزگاربوون لەدەست فەرەنسا، ئەو رووداوە لاوەکی وبچوکانەی شادی خۆشییەکەیان کەمێ دەشێواند، لەبەرچاو نەگیرابوون، لەگەرماو گەرمی بەرێوەبردنی تەشریفات، ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد سەرۆکی پارتیزانەکانی تیرول کەدەستگیرکرابوو، گوللەباران بکەن، هوفری سەردەستەی پارتیزانەکان پێشئەوەی گوللەباران بکرێت، هاواری کردبوو (بژی ئیمپراتۆری مهرەبانی ئێمە، فرانتز، بەلام ئیمپراتۆری نەمسا قەدەغەیکرد بەهیچ جۆرێك ناوی ئەو گوندنشینە گومناوە بهێندرێت کەگیانی خۆی لەپێناو ئەودا بەختکرد.

لە(11/ی مارسی سالی (1810)دا کلێسای گەورەی ڤیێننا کەخەلکێکی زۆر لەحەوشەکەیدا کۆببوونەوە، مەراسیمی مارەبرانەی ماری لویزی 18 سالەی بۆ ناپلیۆن بەوپەری شکۆمەندییەوە بری ولەومەراسیمەدا بنەماڵەی پاشای نەمساو نوێنەرانی سیاسی وڵاتانی بیانی وخاوەن پلەوپایەکانی دەوڵەت و..هیتر، بەرێوەچوو. بوك زاوای نەبینیبوو تەنانەت لەرۆژی مارەکردنەکەشدا نەیتوانی شوەکەی ببینێت، وەك گوتمان ناپلیۆن هەتا ئەوەشی بەزەحمەتدەزانی وتاقەتی نەبوو بچێت لەڤیێننادا ئامادەبێت بۆ ژن لەخۆمارەکردنەکەشی، مارشال برتیە بەوپەری رێزەوە لەبری ناپلیۆن ئەو مەراسیمەی ئەنجامدا.

لەوانەیە بیستبێتت، ئەمەجێگای سەرسورمان نییە، ئەگەر بتەوێت بپرسی چۆن دەبێ دووکەس جێگای ئەو زاوایە بگرنەوە کەلەوێ نەبێت؟ ئەم نەریتە لەو رۆژگارەدا رێورەسمی شاهانە نەبوو لێرەدا جێگای سەرسورمانە.

برتیە لەلایەن ناپلیۆنەوە نێردرابوو هەتا بەرەسمی خوازبێنی ماری لویز بکات وئێستاش ئەرشیدۆك [224] لەژێر داوای ناپلیۆن دەبوا بەنوێنەرایەتی ناپلیۆن لەکلێسادا ئامادەبواو لەوێدا برتیە، دەستی ماری لویزی دابایەدەست ئەرشیدۆك شارل لەبری زاواو بوکی بردبا بەردەم محرابی مارەبرانەی قەدیس ومەراسیمی مارەبرانەکە لەوێدا ئەنجام دراباو تاکۆتایی لەتەکیدا مابایەوە. دوای ئەمە شاژنی تازەی فەرنسا بەجیهازو دەستوپێوەندەکانییەوە بەوپەری رێزەوە بۆپاریس هێندرا.

ناپلیۆن هەتا سەرجادەی کمپینی کەدەکەوێتە نزیك پاریس بەپیر بوکێوەهات و بۆیەکەمجار بوك وزاوا یەکتریان بینی، ئەم رووداوە کاریگەری زۆری کردەسەر ئەورووپاو بەزۆر شێوە لێکدەدرایەوە، بازرگانەکانی شارەکانی ئەورووپا (هانزە ئاتیك) لەو بروایەدابوون دوای ئەوەی بریتانیا بێبەشبوو لەپارێزگاری کردنی نەمسا ناچاردەبێت سازش لەگەڵ فەرەنسادا بکات، دەیانگوت ئیتر رۆژگاری شەر بەسەرچوو وسەردەمی خۆشبەختی وخۆشگوزەرانی هاتووە، بەلام سیاسەتمەداران لەو بروایەدابوون ناپلیۆن دەکەوێتە شەر لەگەڵ هەردوو دەوڵەتە زلهێزەکەی تری ئەورووپا، واتە: بریتانیاو روسیا، بەگرتنە

---

[223] - شازادێکی تری نەمساوی کەپوری ئەم ماری لویزەی نیشانەکراوی ناپلیۆن بوو. (و- فارسی)

[224] - شارل ئەرشیدۆك فەرماندەی گشتی سوپای نەمسایە. (و- فارسی)



بەرچاوی ئەم دۆخە ئالۆزەی دنیا، ئەوەی ڕۆشن دەکردەوە کەهەرجۆرە نزیکبوونەوەیەك وبەستنی هاوپەیمانیەتی بەهێزتر لەنێوان ڕوسیاو فەرەنسادا هەڕەشەبوو بۆسەر بوونی ئیمپراتۆریەتی نەمساو هەرجۆرە نزیکبوونەوەیەکی زیاتری ناپلیۆن لەنەمسا دەستەوەستانکردنی ڕوسیا دەگەیەنێت، هەندێك لەئەشرافەکانی نەمساوی، لەمانەش شازادە مترنیخ باڵوێزی نەمسا لەپاریس بەبیستنی ئەوەی مارەبڕانەکە کۆتایی هاتووە فرمێسکی شادی لەچاوان داباریێن.

تەنانەت کوڕەکەشی کلمان ئەم شادییەی خۆی نەدەشاردەوە، لەکۆشکی پاشایەتی شونبروندا زۆر ئەو ڕستەیە دەبیسترا کەدەیانگوت: نەمسا ڕزگاربیبوو.

لەپترسبورگدا واق وڕمان ونیگەرانی باڵی کێشابوو، ماریا فدورڤنا، لەخۆشی ئەوەی لەجیاتی دانی کچەکەی خۆی کچی ئیمپراتۆری نەمسایان داوەتەئەو تۆتکەی لێهەڵگیرابوو، بەڵام ئەلکسەندەری یەکەم و ڕومیانتسف وکوراکین وەهەتا سەرسەختترین دوژمنانی هاوپەیمانی کردن لەگەڵ فەرەنسادا، کەوتبوونە ترس وگومانەوە، بەڕای ئەمانە ئیتر نەمسا تەواو دەچێتە ڕەهەندی سیاسی ناپلیۆنەوەو لەسەرتاسەری ئەوروپادا تەنها ڕوسیا لەبەرامبەر داگیرکەری بێ ئامانی ئەوروپادا دەمێنێتەوە. هەردوای بەهاوسەربوونی ناپلیۆن، هەوڵەکانی دوو بەرامبەرکردەوە بۆ دریژەدان بەسیاسەتە ئابوورییەکانی.

## (2)

بەبێ درککردن لەسیاسەتی ئابووری ناپلیۆن ناتوانرێت بەشێوەیەکی ڕوون پەی بەوەببرێت کەئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن لەسەر چ پایەیەك ماوەتەوە، ناشتوانرێت وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە ئەگەر هۆی ڕووخانی ئەو چیبووە، گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا تەنها بەشێکە لەقانونی ئابووری کەناپلیۆن دایڕشت، گرتنەبەری سیاسەتەکانی ئەو لەم بوارەدا هاوئاهەنگە لەگەڵ سیاسەتە گشتییەکانیدا، ئەو لەدرێژەی ئەوشەڕە سەرکەوتوانەیدا توانی خۆی لەئیمپراتۆری فەرنساوە بکات بەئیمپراتۆری ئەورووپاو دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەسەر هندستان ومیسرو سوریاشدا بسەپێنێ و شوێنێتریش بخاتەژێر دەسەڵاتدارێتی فەرەنسا کەبەبەرژەوەندی ئەووڵاتە بشکێتەوە، ئەمەش جیاوازی هەبوو لەگەڵ خاکی دەوڵەتی فەرەنساو ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا، فەرنسا بەهۆی ڕێکخستن وسیستم دانانی قانونی ناپلیۆن ببووە یەك وڵاتی بەرهەم هێن، بەڵام ئیمپراتۆری فەرەنسا ببووە خاکی هێنانی مەودای خام وبەزەبری چەك ڕێگری لەبەرەوپێشچوونی پیشەسازی ئەو وڵاتانەی ژێر دەسەڵاتدارێتی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسای دەکرد، ناپلیۆن لەیەکەم ساڵی گرتنەدەستی ئاوساری دەسەڵاتی فەرەنسا نووسینگەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو، کەهەتا کۆتایهاتنی فەرمانڕەوایەتییەکەی هەر هەبوو، بەبڕوای ئەو دوو بەرژەوەندی هەبوون: یەکێکیان فیداکاری بۆ بەرژەوەندییەکانی میللی و ئەوی تریشیان مانەوە بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییەکانی وڵات، پانتایی ئیمپراتۆرییەکەی فەرەنسا زۆربوو وگەرەکی بوو بۆرژوازی گەورەی پیشەسازی و بازرگانی بەرژەوەندییەکانیان پارێزراوبێت، وڵاتە ژێر دەستەکانی خۆشی بۆتاڵان و بڕۆ بوو، کەئەم دووانەی سەرەوە وابەستەیی توندیان بەیەکەوە هەبوو، ئەمە گرتنەبەری بنچینەی سیاسەتەکانی ئەوبوو وبەپاراستنی بەرژەوەندی میللی دەزانی.

وڵاتانی بەلجیکاو بەشی چەپی سەر ڕووباری ڕن کەبەمەبەستی بۆ هەمیشەیی داگیرکرابوون و ڕاستەوخۆ خرابوونەسەر خاکی فەرنسا، هەرچەندە بەسەر چەند ولایەتێکیشدا دابەشکرابوون بەلام بەخاکی میللی هەژمارنەدەکران، بەڵکوبە ڕکەبەرانی



بۆرژوازییەکانی فەرەنسا لەقەڵەم دەدران و ڕێگادرابوو ئەو بۆرژوازیانە لێبدرێن و بۆرژوازیەتی فەرەنسی سەرتاپا لەوخاکانەدا سەرمایەگوزاری بکات.

هەموو ئەو دەوڵەت و شوێنانەی هەتا باجی وسەرانەیانداباو خەرجی ئەو سەربازانەیان کێشابا کەسەربازی فەرەنسا تێدابوون ئەوا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئیمپراتۆری ناپلیۆنـدابوون، بەکورتی هەموو ئەو وڵاتانەی داگیرکرابوون و لەژێر ڕکێفی ناپلیۆندابوون، دەبوا بینەبازاڕی فرۆشتنی کەلوپەلی فەرەنسایی- یان سەرچاوەی دابینکردنی مەوادە خاوەکان بۆ کارخانە پیشەسازییەکانی فەرەنسان، ئەوکەسانەی داهێنان ودۆزینەوەی پیشەسازیان بەنهێنی هێنابا بۆ پیشەسازکارانی ئیتالیا زیندانی دەکران، چونکەکردنی ئەمکارە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە قەدەغەکرابوو سنعەت وداهێنانی پیشەسازی لەفەرنساوە بهێندرێت، ناپلیۆن بەووریاییەوە فشارەکانی خۆی زیاددەکرد، بۆ نمونە: قەدەغەیکرد تیغ وبرەرو کێرد بهێندرێنە بازاڕەکانی فەرنسا، قوماشی ساکسونیش ببرێت بۆ وستفال، ناردنی ئاوریشمی خاوی لەئیتالیاوە بۆ ئیسپانیا قەدەغەکرد چونکە دەبوا بۆخاوەن کارخانەکانی رستن وچنینی لیون کەرەستەی خاو فەراهەم بکرێت، ئەو کالایانەی کەبەرێگای ترانزێت لەرێگای وڵاتانی سەربەخۆ دەرۆیشت گومرگی تایبەتی دەخستەسەر، بەڵام ئەگەر بەوڵاتانی ژێر دەسەڵاتدارێتی ڕاستەوخۆی خۆیدا تێپەڕیبا ئەوا گومرکی لێنەدەساند.

لەنووسینگەی ئیمپراتۆرەوە ڕۆژانە لێشاوێك فەرمانی قەدەغەکردن وبڕیارو ئاگادارکردنەوەو.. هیت،ر دەردەچوون وبەپانتایی ئیمپراتۆریەتەکەیدا بڵاودەکرایەوە، گرتنەبەر ئەم سیاسەتە خزمەتی زۆری بۆرژوازیەتی فەرنسای دەکردو بەهێزی ناپلیۆنیشی لەفەرەنسادا جێگیرتردەکرد، بەڵام دیارە بەڵگەنەویستەکە ئەم سیاسەتە دەبووەهۆی زەرەرو زیانی سنعەتکاری بچوك وخەڵکی بەکاربەری (٢٢٥) کاڵاکان لەپانتایی ئیمپراتۆریەتەکەیدا، ناپلیۆن دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی گەورە لەڕووی ئابووریەوە تەنها یەك فەرمانڕەوایی نەتەوەیی درێژەدەری ڕێگای لویسی چواردەهەم ولویسی پازدەهەم و جێبەجێکاری ئامانجەکانی کلبر(٢٢٦) بوو، ئەو بەپشتگیریکردنی چینی بۆرژوازی گەورەی وڵاتەکەی توانی چەندین ساڵ فەرمانڕەوایی ڕەهای خۆی بکات، ئاشکرایە بەنەهێشتنی هێزی بەرهەم هێنانی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئەم بنیاتنانە مەزنەی بەبێ شۆڕشی میللی هاوڵاتیانی ئیسپانیاو سوتاندنی موسکۆ خیانەتی مارمون(٢٢٧). لەپەنا دیوارەکانی پاریس- یان درەنگ گەیشتنی گروشی، بەمەیدانی شەڕی واتەرلو، تەنها ئەچارەنوسانەبوون کەهەرەسهێنانی ئیمپراتۆریان نیشاندەدا، بەکورتی هەتا ئەگەر نەخشەی سیاسی وسەرکردایەتی کردنی سوپا کەناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی خۆی لەمانەدا کارابوو.

لەساڵانی کۆتایی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا ئەگەر بەوجۆرەش و بەڕێکوپێکیش بەڕێوەچووبا، ئەوا هەردووبارە چارەنوسەکە ئەمەدەبوو کەڕوویدا.

---

[225] - دیارە لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەبکەین، چینی پرۆلیتاریای فەرنسا بەبەراورد لەگەڵ شوێنەکانی تری ژێردەسەڵاتی ناپلیۆن باری گوزەرانیان باشتربوو. (نووسەر)

[226] - ژان باتیست کلبر: گەورەترین وەزیر لەسەردەمی لویسی چواردەهەم وپازدەهەمدا (1619-1683) کەپێشکەوتنی گەورەی بەپیشەسازی وئابووری فەرنسا بەخشی وباری ئابووری پێشخست. (و- فارسی)

[227] - ئۆگوست فردریك لویس: مارشاڵێکی فەرەنسایە کەلەشەڕەکانی ئوسترلیتزو لشبۆنەو لایزیک و مارنغا دلێرانە جەنگا، بەڵام دوای ئەوەی پاریس لەلایەن هاوپەیمانانەوە داگیرکرا، خیانەتی لەناپلیۆن کردو پاشەکشەکردنی ئەو بووەهۆی تێشکان ودەست لەکارکێشانەوەی ناپلیۆن، ناوبراو کتێبێکی یاداشتەکانی خۆی هەیەو هەوڵیداوە پاساو بۆ ئەوکارەی بێنێتەوە. (نووسەر)



ئەگەر وابیربکرێتەوە گوایا تەنها ئیرادەی برژوازی گەورەی فەرەنسا ڕێشمەی دەسەڵاتی دایەدەست ناپلیۆن ڕاست نییە، ئەمە ڕاستەکە ناپلیۆن بناغەی سیاسەتەکانی ناوخۆ ودەرەکی لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی سەرمایەداری فەرەنسا دارشتبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا دەیویست ئەو برژوازیەش ملکەچی ئیرادەی خۆی بکات وناچاری بکات-خزمەت بەدەوڵەت بکا، ئەو دەوڵەتەی بۆ بەرژەوندی خودی خۆی دەویست بۆئەوەی فەرمانڕەوایی ئەورووپای پێبکات،

زۆر لەبرژوازییەکان سەرپێچیان لەفەرمانەکانی دەکرد کەبەلای ئەوانەوە ستەمکارانەبوون وپەنایان دەبرد بۆ زۆرکاری ناقانونی وەك ساختەکاریکردن لەلابردنی نرخەکان و... هیتر، بەمجۆرە کەوتبوونە بەرەنگاری کردنەوەیەکی جددی بێ دەنگ وهات وهاوارو قرە، لێرەدا ناتوانین گوتەیکی مارکس فەرامۆشبکەین کەلەکتێبی (بنەماڵەی پیرۆز)دا دەڵێت:(بەتێروانینی گشتی کودەتای (18/ی برومر ڕاپەڕینی شۆرشگێرانە نەبوو، بەڵکو برژوازیەت لەئازادیخوازی دەویست..)

لەشوێنێکیتردا نووسیویەتی (بەڵام ئەوە ناپلیۆنە چۆنیەتی واقیعی دەوڵەتی دیاریکردبوو ودەیزانی بنەمای ئەو دەوڵەتە لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی برژوا بەئازادی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆرادەگرێت، ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی ئەم ڕەوشە بەرەسمی بناسێنێت و پارێزگاری لێبکات، ناپلیۆن کەسێکی خەیاڵپلاوی تیرۆریست نەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا دەوڵەتی وەك ئامانجێکی شەخسی خۆی سەیردەکردو سەرمایەدارەکانی وەك غەزنەداری خۆی، بەبەکارهێنەری ئیرادەی خۆی سەیردەکرد، ئەو بنەمای مەترسی تیرۆری بەشەڕکردنی هەمیشەیی لەبری شۆڕشی هەمیشەیی گۆڕیبوو؟ غروری گەلی فەرەنسای گەیاندبۆ ئەوپەڕی تێری ورەزامەندی، بەڵام لەهەمان کاتدا چاوەڕوانی ئەوەی لەبرژوازیەتی فەرەنسا دەکرد چێژ وەرگرتن وخۆشی وسەرمایەکەی، ئەگەر پێویستی کرد لەپێناو ئامانجە سیاسییەکانی جیهان گیریانەی خۆیدا بکەنە قوربانی، ناپلیۆن حەزی ئازادیخوازانەی چینی برژوازی کەئایدیالیسمی سیاسی ژنانی هەنوکەیی ئەو کۆمەڵگایەبوو، یەکسەرە سەرکوتدەکردو گرنگترین بەرژەوەندی ماددی، واتە: بازرگانی وسنعەت، کەدواتر ئەمە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەودا یەکیان نەدەگرتەوە ڕەتکردنەوە، کینەی ئەو لەبازرگانان، لەڕاستیدا تەواوکەری ئەوکینەیەی بوو کەلەئایدیولوژیەکانی بوو، لەناوەوەی چینی برژوازی هەروەك دوژمنی دەوڵەت کەخۆی بۆ یەك ئامانجی شەخسی خۆی دروستی کردبوو دژایەتی دەکرد، چونکە ئایدیۆلۆژیای دژەخۆی تێدابەدی دەکرد، بۆ نموونە: بەپەرلەمانی ڕاگەیاند ناتوانرێت بەرگەی ئەوەبگرێت خاوەن زەوی و زارەگەورەکان، کەڵك لەوزەویانەیان وەرگرن– یان وەرنەگرن وبەکەیفی خۆیان ئازادبن، سەبارەت بەبازرگانیش ئامانجی پلانەکانی ئەوەبوو، بەکۆنترۆڵکردنی کەرەستەو ئامێرەکانی هێنان و گواستنەوە، بازرگانی بخاتەژێر دەسەڵاتی دەوڵەت.

بازرگانەکانی فەرەنسایی بەهێنانەپێشی واقیعێك توانیان هێزو توانای ناپلیۆن ڕاتەکێنن: ئەوانە بەبەهانەی وشکە ساڵی‌و نەهاتی توانایان ناپلیۆن ناچاربکەن شەری ڕوسیا بۆ دوومانگ دوابخەن‌و بەمجۆرە شەر لەکەژێکدا دەشتپێکرد کەزۆر وەدرەنگ کەرابوو).

ئەمەبوو لێکدانەوە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکانی ماکس لەسەر ناپلیۆن کەناوبراو لەکتێبی(خێزانی پیرۆز)دا نووسیویەتی، بەمشێوەیە ئەو بلیمەتە بەجۆرێکی لۆژیکیانە نیشانماندەدات وپێمان دەڵێت، ئەو مێژوو نووسەی بنەماکانی کۆمەڵایەتی وسیاسی ڕۆژگارێك لێکدەداتەوە، نابێ ڕەفتارو کەسایەتی ئەوکەسانە لەبەرچاو نەگرێت کەرابەرایەتی–یان بەڕێوەبەری ئەو سیاسەتەن.



کاتێ مارکس دەڵێت برژوازیەت خوازیاری ئازادیخوازی بوو، مەبەستی لەوەیە ئەویەشە بەدەستی ناپلیۆن ئەهێڵدراوە کەحکومەت دیکتاتۆری خۆی لەپەرلەماندا دەدییەوە، پەرلەمان دەیویست هێزی ڕەها لەدەست ناپلیۆندا بمێنێتەوەو هەموو ئەمجۆرە ئازادیانەی کەشۆڕشی برژوازی لەساڵی (1789) بەناوی ئەوانەوە هاتبۆئارا لەناو بەرێت.

مارکس وەبیرمان دێنێتەوە لیبرالیزمی برژوازی کەلەئەنجومەنی شورای دامەزرێنەرانی ساڵی (1789)دا دروستببوو، واتە: لەکاتی شۆڕشی کۆمیتەی ڕزگاری میللی تێکشکاو هەمان ئەو کۆششانەش کەلەسەردەمی دیرکتواردا بۆ ژنانەوەو جێگیرکردنی ئەوە دەکران ڕووبەڕووی هەمان کودەتای(18/ی برومر بۆوەو ناپلیۆن لەناوی برد، لەم دووانەی کەلەسەرەوە ناومان بردن، ئەوەی پێویستبوو بۆ بەرەوپێشچوون وبەرفراوانتربوونی پانتایی سەرمایەداری هاتبۆپێش، واتە: برژوازیەت بەشێوەیەکی کاتی پشتگیری دیکتاتۆریەتی ژاکوبنەکانی کرد کەکاریان بۆ نەهێشتنی ڕژێمی شانشینی وفیودالی دەکرد، ئینجا دیکتاتۆریەتی ناپلیۆنیان پارێزگاری لێکرد چون حکومەتێکی بەتوانابوو بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵاتدارێتی سەرمایەو شایستە بۆ شەڕەکانی وکرانەوەی[٢٢٨] جیهانی.

ناپلیۆن بەپێی پێداویستییەکانی پاراستنی بەرژەوەندی برژوازی حکومەتی دەکرد، ئەو بەرژەوەندیانەی کەخودی ئەو بەهای بۆ دانەدەنان وبەپلوتوکراسی ناودەبردن و ئەم ڕستەیەی زۆر دووبارە دەکردەوە:(سەرمایە لەڕۆژگاری ئێمەدا بەهۆی دزی وتاڵانەوەیە).

دیکتاتۆریەتی ناپلیۆن کەبەبەرژەوەندی دەوڵەتی برژوازی بەڕێوەدەچوو وئامانجی ئەوەبوو هێزی خۆی لەسەر باج دانی وڵاتانی هاوسێ بەرفراوانبکات، کەوتە ناکۆکی لەگەڵ هەندێك[٢٢٩] چینی برژوازیەتی فەرەنسا، ئەم دیکتاتۆرە برژوازییە بەچاوی بۆرنەبوون سەیری خۆی دەکردو پێی وابوو دەبێ برژوازیەتی فەرەنسا بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی ئەو هەڵسوکەوت بکات، ئەم بەشەی برژوازیەتی فەرەنسی کەلەڕووی سیاسییەوە دواکەوتبوو وتەنها چاوی لە دەستکەوت وهەبلە خەرجی خۆیی بوو، زۆرجار لەگەڵ ناپلیۆندا دەکەوتنە ناکۆکی.

مارکس ئاماژە بەوەدەکات، لەو ڕۆژانەدا پێش دەستپێکردنی شەڕی ڕوسیا، ناکۆکی توند لەبۆچوونەکاندا سەری هەڵدابوو وئەم ناکۆکییانەی بەناو چاکسازیبوون درزێکی گەورەو قوڵی نەك هەر لەسەر ناپلیۆن و ڕژێمەکەی تەنانەت هەموو ئابووری برژوازیش بەمەپشتبەستووبوو هەرەسپێهێنا، بۆیە پێویستە لەگەڵ باسکردنی هۆکارەکانی لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆندا ئەو هەلومەرجەی دۆخی ئەوکات وەبیربهێنینەوە.

## (3)

پێشنەوەی پەردەلەسەر ئەم ڕووداوە مەزنە مێژووییە لابدرێت کەئەوکات هەموو لەبەرامبەر ئەوفەرمانڕەوا بەهێزەدا ملکەچ بوون، میرو پاشاکان لەبەردەم ناپلیۆندا دەکەتنە سوژدەو نێوچاوانیان لەزەوی دەداو هەموو لایەك کەوتبوونە ترس ولەرزەوە، جگەلە گوندشین وپیشەکارانی ڕووت و ڕەجاڵی ئیسپانیایی، کەسیتر لەکیشوەری ئەورووپادانەبوو درێژە

---

[228] - مەبەست لەکرانەوەی بازاڕەکانی دنیاو ئاڵوویری بازرگانیە. (و-کوردی)

[229] - لێرەدا بەتایبەت مەبەستی لەبوارەکانی بازرگانی وپیشەسازییە. (و- کوردی)



بەشەڕیدات لەبەرامبەر ناپلیۆندا، یەکەم نیشانەی تۆفانی کەبەسەر ئیمپراتۆری فەرەنسادامات ئەوەبوو لەساڵی (1811)دا قەیرانێکی ئابوری ڕوویدا، ئەوپیاوەی بەڕووکەش لەترۆپکی ڕووداوەکانی جیهانیدابوو نەیدەتوانی هۆی سەرهەڵدانی ئەو تەنگژە ئابوورییە دیاری بکات، قەیرانە ئابوورییەکە لەقۆناغی دووەم، واتە: لەکاتی زیاتر فشارهێنان بۆسەر گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیاو دوارتر بوو، بۆیە واچاکە لێرەدا بەکورتی ئاماژەی بۆبکەین، گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا ئیتر لەساڵانی (1810- بۆ 1811) وەك ساڵی (1806) نەبوو ودەرکردنی بڕیارەکەی بەرلین ئەو گرنگییەی نەمابوو وەك ئەوکات، لەنیوەی دووەمی ساڵی (1809) بەدواوە، دوای شەڕی واگرام وڕێککەوتننامەی ئاشتی شونبرون، لەناو کڵێشەی سەری ناپلیۆندا دوو بیرۆکە هەبوون کەپێشتر ڕێوشوێنیان بۆدانرابوون ورەوشی سیاسی خۆی لەسەر ئەم ئاراستەیە دیاری دەکرد، یەکەم: بەچۆك داهێنانی بریتانیا لەڕێگای درێژەدان بەگەمارۆی ئابووری لەسەری، دووەم: بریتیبوو لەم ڕستەیەی کەناپلیۆن دەیگوت (من هەرچیم بوێت دەتوانم بیکەم) لێکدانەوەی لۆژیکیانەی ئەو بۆئەم قسەیەی ئەوەبوو(بۆیە من دەتوانم هەتا ئەگەر هەموو ئەوروپاش داگیربکەم وبیخەمەژێر دەسەڵاتداریتی خۆم، لەپێناو درێژەدان بەنەخشەی گەمارۆدانی ئابووری سەر بەریتانیا).

ئەو هەرچی ویستبا دەیکرد(ئاتیلا لەسەدەی پێنجەمی میلادیدا دەیویست کچی میرنشین وشانشینە بچوکەکان و سەرخێڵە بێ ژمارەکانی ئەڵمانی بەزۆر ڕاکێشی کۆشکەکەی خۆی بکات، کەچی ئێستا تەنها بەئاماژەیەکی ناپلیۆن کچی ئیمپراتۆری نەمسا کەشازادە ساڵانەو خانمێکی زۆر لوتبەرزو لەخۆڕازی وسەرکێشی هەموو بنەماڵە شانشینەکانی ئەوروپابوو، بۆئەو ناردوویانە بۆ پاریس، هەموو ئەم ڕاستییەیان دەزانی، ئەو ئیمپراتۆریە گەورەی نەمسا کەناپلیۆن بچوکی کردبۆوەو بۆچەند شارو شارۆچکێك، ئەمەش ببووە جێگای شانازی فەرەنسییەکان، بەجۆرێ ملکەچی وکۆیەلەیی خۆی نیشاندەدا کەبۆ یەکلاییکردنەوەی یەکجارەکی مەسەلەکە تەنها دوژمنی ماو بریتانیایە، هەموو دوژمنەکانیتر ئەسڵەن شایستەی ئەوەش نەبوون ناویان بهێندرێت.

ئیسپانییەکان، بەگوتەی ناپلیۆن (ئەو چەتە شرەپۆشانە) هەربە مرۆڤیش هەژمارنەدەکران وئامادەنەبوو بەدوژمنیشیان ناوببات، هەتا ئەو شانازییەیان پێنەدرێت، تادوای ڕەشەبکوژیەکەی ساڵی (1809-1810)ش وای نیشاندا ئیتر لەگەڵ ئەوانەدا شەڕی نییەو تەنها فەرمان دەردەکات ئەوانە بەدیلبگرن وگوللەبارانیان بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئاسودەبێت، تەنانەت لێرەشدا هۆکاری ئەمەی دەگەڕاندەوە سەر بریتانیا، چونکە یارمەتییەکانی بریتانیا تەنها چەك وتفاق نەبوو بۆ ئەو پارتیزانە ئیسپانیاییانە، بەڵکو تیپی سەربازی دەهاتن دەکەوتنە گەڵ ئەمانە.

تاکە لەمپەڕ لەبەردەم ناپلیۆندا تەنهاو تەنها بریتانیابوو، کۆتایی هاتنی ئەم شەڕەی نێوانیشیان بەلەناوچوونی یەکێکیان ودەسەبالایی تەواوی ئەوی تریان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ناپلیۆن هەوڵیدەدا ئەم شەڕە بگوزرێت بەشەڕی هەموو ئەوروپا لەگەڵ بریتانیا، وردەوردە چەند گەمارۆی ئابووری زیاتر درێژەی دەکێشا، زیانی زیاتر لەبریتانیاو کیشوەری ئەوروپا دەکەوت، ناپلیۆن ئەمەی دەزانی ودڵخۆشکەری ئەویش تەنها ئەوەبوو وەك ڕۆژانی پێش تیلیست گەیاندبوویە ئەوپەڕی دەهری وقین هەڵسان.



ناپلیۆن بەدرێژایی ئەوساڵانە کینەی دڵی خۆی بەکەسانێك دەرِشت کەسەرپێچیان لەفەرمانەکانی گەمارۆی سەر بریتانیا دەکرد، لەسەرتاسەری ئەورووپادا بەئاشکرا کەس نەدەوێرا سەرپێچی لەمەبکات جگەلەو حکومەتەی ئیسپانییەکان لەخۆرئاوای شێوەدورگەی ئیبریدا دروستیانکردبوو.

سزادانی ئەو کەسانەی سەرپێچیان لەبڕیارەکانی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا دەکرد، خێرا جێبەجێدەکرا، بەو مانایەی قاچاغچییەکانیان گوللەباران دەکردو کاڵا بریتانیاییەکانیان دەسوتاندن، ئەو میرو پاشایانەی دەستیان لەگەڵ قاچاغچییەکاندا هەبوو لەسەرکار لادەبران، لەساڵی (1806)دا ناپلیۆن برابچوکەکەی لویسی کردە پاشای هۆڵەندا، لویس دەیزانی پساندنی پەیوەندی تەواوی بازرگانی لەگەڵ بریتانیادا هەرِەشە لەتوێژی بازرگانی وکشتوکاڵی وڵات دەکات وئەمە زیاتر لەهەموو وڵاتانی تری ئەورووپا زیانی پێدەگەیەنێت، چونکە لەوکاتەوەی بریتانیا شوێنە داگیرکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هۆڵەندای خستبۆژێر دەسەڵاتی خۆی، بازرگانی کردنی هۆڵەندا بەشێوەیەکی بەرفراوان وکاریگەر وابەستەبوو بەبریتانیاو هێنانی مەوادی خام لەخاکە ژێر دەستەکانی بریتانیا.

لویس بۆناپارت تێبینی ئەمەی کردبوو وکەمتاکورتێك چاوپۆشی لەقاچاغیکردنی سەر بەندەرەکانی نێوان بریتانیاو هۆڵەندای دەکرد، ناپلیۆن دوای ئەوەی براکەی چەندجار لەمە ئاگادارکردەوە، سەرئەنجام لویسی لەسەرتەختی پاشایەتی هۆڵەندا لابردوو ڕایگەیاند ئیتر وڵاتێك نییە بەناوی هۆڵەنداو بەسەرچەند ولایەتێکدا دابەشیکردوو خستیەسەر خاکی فەرەنسا، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی بەرزکرابۆوەو ئەوەی دەگەیاند کەشارەکانی هاوپەیمانییەتی ئەورووپا (هانزە ئاتیك[240] بەرێگای قاچاغ ئاڵوێری دەکەن (بورین) نوێنەری ناپلیۆن ودەسەڵاتداری هامبورگیش چاوپۆشی لەم کارانەدەکات و بەرتیل وەردەگرێت، ناپلیۆن یەکسەر ناوبراوی لەسەر کارلابردو هەموو ئەو شارانەی (هانزە)شی خستەسەر ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا.

ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان ئەو شارانەی کەوتبوونەسەر دەریاکان خستیەسەر ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی، ئەمەش نەك لەبەرئەوەی سەرپێچیانکردووە، بەڵکو لەبەرئەوەی ناپلیۆن متمانەی بەکەسنەبوو.

گەمارۆدانە ئابوورییەکەی سەر بریتانیا کاریگەری خراپی لەسەر هاوڵاتیانی ژێر ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا جێهێشت، بەتایبەت بەکاربەرانی ئاسایی، نارەزایی دەربڕین لەو بڵاوکراوانەی کەلەژێر کۆنترۆڵی ناپلیۆنیشدابوون جارجار بەڕوونی و ئاشکرا بڵاودەکرانەوە.

لەڕاپۆرتێکی وەزارەتی ناوخۆی ساڵی (1810)دا هەواڵگرەکان بەکورتی ئاماژەیان بەوەکردبوو لەگۆڤارو بڵاوکراوەکانی ئەڵمانیادا بەردەوام وتاری شێوە نارەزایی دەربڕین بڵاودەکرێنەوە، هەروەها لەو ڕاپۆرتەدا هاتبوو ئەڵمانییەکان جگەلە خوێندنەوەو چوون بۆ شانۆکان وخوێندنەوەی ڕۆمان کەنووسەرەکانیان سەرباەت بەهاوپەیمانیەتی ڕن نووسیویانەو کۆپەلەیی تەواوی ڕێککەوتنی نێوان نەمساو فەرەنسا بەلاوازی هەردووکیان دەخەنەڕوو وبریتانیاش بەدوژمنی نەبەزیوو ورووسیاش

[240] -هانزە ئاتیك: بنەمای دروستبوونی ئەم هاوپەیمانیە بازرگانیە، بۆ پاراستنی بازرگانانی ئەڵمانیا بەگشتی وشاری کلن بوو، ئەم ڕێکخراوە بازرگانیە(پەیماننامەی بازرگانی ساڵی(1436)ی نێوان هامیزیشی چوارەم وبریتانیای لێکەوتەوە، هانزە، ڕۆژکاری زێرینی لەسەدەی (14و15) دەستی پێکرد، کەزۆر شاری تری گرتەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە شاری لوبوکی ئەڵمانیاو زۆر بەشی لەشارەکانیتردا گردنەوە کەبەناوی نوێنەری کوتورە، بوون. دەستکەوتە گرنگەکانی ئەو ڕێکخراوە بریتیبوون لە: بەرەوپێشبردنی مافی نێودەوڵەتی بەتایبەت لەرووی ئازادی دەریاکان بۆ بازرگانی ونەهێشتنی گەمارۆی ئابووری هەمەلایەنەو مافی ئەوانەی بێ لایەنن لەشەرەکاندا، بەتایبەت لەهاموشۆی دەریایدا، هەروەها داوەری بازرگانیش. (و- کوردی)



بەمیراتگرەوەی حکومەتی ڕاما (23) نیشاندەدەن، حەزیشیان لەتوێژینەوەو بواری سیاسییە بەگشتی، هەروەها گۆڤاری بێ ژماری هەفتانەو مانگانەو ساڵنامەکانی وڵاتەکەی خۆیان بەتامەزرۆوە دەخوێننەوە.

دیارە بارودۆخی هۆڵەنداش بەهۆی توندکردنی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا لەخراپبوونی زیاتردابوو، چونکە ئەو وڵاتە بنەمای ژیانی کەپشتی پێدەبەست بازرگانی وئاڵوویری دەریایی بوو، لەهۆڵەنداش کەموکوڕییەك بەدی دەکرا وەك ئەوەی لەئەڵمانیای سەرودا هەبوو، لەڕاپۆرتێکی تری هەمان وەزارەت، ئاماژە بەوکراوە کە(لێرەدا ڕۆژنامەی زۆر دەردەچن).

بەلای ناپلیۆنەوە هیچ لەوە ئاسانترنەبوو ڕۆژنامەکان وەهۆش خۆ بێنێتەوەو ئەویش لەم جۆرە کارانەدا هیچ دەستی نەدەپاراست ونیگەران نەدەبوو، بەڵام دڵنیابوونەوە لەوەی گەمارۆ ئابووریەکەی سەر بریتانیا بەڕێکوپێکی بەڕێوەبچێت گرفتێکی لەمە گەورەتربوو، دانانی کەسانی دەستپاك لەسەرسنووورە دەرياییەکان ودروست بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان زۆر لەوە پرکێشەتربوو لەوکار بەدەست ومیرنشین وپاشایانەی دەستیان هەیە لەگەڵ قاچاغچییەکاندا-یان خۆیان گلیدەکەن وچاوپۆشی لێدەکەن،

خەڵکی ئەورووپا بۆ کڕینی کاکاو وبیبەرو داودەرمان دوازدە بەرامبەر نرخی جارانیاندەدا، کەگەمارۆی ئابوری نەخرابۆسەر بریتانیا، کارگەکانی دروستکردنی قوماش لەفەرەنساو ساکس وبەلجیکاو چیك... ، نرخی لۆکەیان دەقات بەگرانتر لەجاران دەکڕی وناچاریشبوون بۆ لەکارنەکەوتنی کارخانەکانیان بیکڕن، ئەی ئەو هەموو قازانجانە بۆکوێ دەچوو؟

بەپلەی یەکەم دەچۆ باخەڵی پاسەوان وبنکە گومرگییەکانی سوپای فەرەنسا، دووەمیش دەچۆ باخەڵی خاوەن کەشتییەکانی بریتانی کەبەقاچاغ کاڵایان دەهێنا، کاتێ بڕی پارەیەکیان بۆ لێپرسراوێکی خاڵێکی گومرکی فەرنسی پێشنیاردەکرد کەموچەی پێنج ساڵی بوو، تەنها لەبەرامبەر ئەوەدا یەك شەو بەئارامی بخەون، بەخۆشحاڵییەوە ڕازی دەبوون، یان کەتۆپێك قوماشی نایابیان پێشکەش بەیەکێ لەمانەدەکرد کەبەهاکەی (500) سکەی زێڕبوو، ڕاستەوخۆ ڕازی دەبوون شەوێك چاوپۆشی لەئەرکەکانیان بکەن، بەبارتەقای ئەوبەرتیلەش سوپاسیان دەکردو بەقوربانی دەبوون تەنها لەبەرخاتری ئەوەی سێ سەعات ڕێگابدات کەشتییەکانی قاچاغیان بارکردووە بێن ونەمانیش بەرەو لایەکی تری دەریا بڕۆن، ناپلیۆن ئەمەی دەبینی ودەیزانی ئەم بەرەی شەرە زۆر لەشەڕەکانی ئوسترلیتزو واگرام وهیتر، سەختترە، زۆر ئەفسەرو پشکێنەری وپیاوانی گومرگی تازەی دەناردنە ئەو شوێنانە، بەڵام کەڵکی نەبوو وپاش ماوەیەك ئەوانیشیان دەکڕی وبەرتیلیان وەردەگرت، هەرچەندە زۆر لەمانەی دەدایە دادگاو سزادەدران، بەڵام ئەوەی دوای ئەمانەش دادەنران دووبارە بوزیان بۆ قاچاغچییەکانن دەخواردوو لەبەرامبەر وەرگرتنی پارەدا نەرم دەبوون، ئیتر ئیمپراتۆر کەوتەبیری ڕێگاچارەیەکی تر، ئەویش ئەوەبوو نەك هەر لەوشارانەی کەلەسەر دەریابوون، بەڵکو لەدورترین شوێنی سەردەریای ژێر ئیمپراتۆریەتی فەرنسادا، دەستکرا بەدەستبەسەرداگرتنی ئەوکاڵایانەی بریتانیایی بوون ودەبوا خاوەنەکانیشیان ئەوکەسانەیان ئاشکرا کردبا کەلێیان کڕیون، ئەوانەی لەوخاکانەی ژێر دەسەڵاتداریتی فەرەنسای شوێنەکانی غەیرە ئەورووپایی کاڵایان دەهێنا، هەوڵیاندەدا

---

23 - حکومەتی ڕەهای جیهانی: مەبەست لەئیمپراتۆریەتی ناپلیۆنە.(و-کوردی)

بیسەلمێنن کەئەم کالآیانەیان ئەمریکاییە نەك بەریتانی، لەڕاستیدا ئەمریکاییەکان مۆرو نیشانەی بازرگانی خۆیان لەکالآکانی بریتانیایی دەداو بەوجۆرە بازرگانی کردنە قازانجی زۆریان دەکرد،

ئینجا ناپلیۆن هەندێك یاساو ڕێسای گومرگی تری قانونی لەساڵی (1810)دا دەرکرد سەبارەت بەبازرگانی کردنی بەروبومەکانی شوێنە داگیرکراوەکانی خاکی ژێر دەسەلاتی فەرەنسا، لەدەرەوەی ئەوروپادا یەکجارەکی قەدەغەی کرد، ئیتر بەمە لەسەرتاسەری ئەوروپادا نارەزایی مونجاوی دەدایەوەو کڕی تورەیی لەناودڵی خەڵکدا پەنداوی دەدایەوە، ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد هەموو ئەوکالآیانەی دەستیان بەسەردا گیراوە لەگۆڕەپانە گشتییەکاندا ئاگری تێبەردەدەن، خەڵك بەمەلولی وبێدەنگ، بەپێی گێرانەوەی ئەوکەسانەی لەو ڕۆژگارەدا ژیاون، بەچاوی خۆیان دەیانبینی کەتۆپ تۆپ پارچە قوماشی نایاب وکشمیرو دۆلکەو کلێسەی شەکرو قاوەو کاکاو وقتوی چاو فەردە لۆکەو.. هیتریان دەهێناو بەبەرچاوی خەڵکەوە ئاگریان تێبەردەدا، دواتر ئەم بارودۆخە زۆر درێژەی نەکێشاو ئیتر تەنها ئەو کالآیانەیان دەسوتاند کەمۆرو نیشانەی بریتانیای پێوەبوو، ئەو کالآیانەی تریاندەگرت ودەیانبردە عەمبارەکانی دەوڵەت، نەیاندەسوتاند، ڕۆژنامەکانی بریتانیای بەهۆی کاریگەری ئەمە–یان بەلانی کەمەوە لەسەر ئەنجامی ئەو هەواڵانەی کەسەبارەت بەمە پێیان دەگەیشت بەمجۆرەیان دەنووسی وبلآودەکردەوە( قەیسەری ئیمپاتۆری ڕوسیا، عەقڵی خۆی لەدەستداوە.

ناپلیۆن گەیشتبۆ ئەو قەناعەتەی بەم کارەی ەتوانێت ڕێگا لەهاتنی ئەو کالآیانەبگرێت مەترسی بخاتەسەر ئەوانەش کەلەدەستی دووەم وسێیەم دەیکڕنەوە بۆ قازانج، هەندێك لەبرۆژازیەکانی ناو فەرەنساو ولآتانی ژێردەستەی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن توانیبویان قازانجێکی زۆربکەن، تەنانەت ئەمانە بەڕووکەش پشتگیریشیان لەگەمارۆ ئابووریەکەی سەر بریتانیا دەکرد، بەتایبەت کارخانەکانی ئاسن وکانزاکان زۆر ڕازی بوون، وەلێ خاوەن کارخانەکانی ڕستن وچنین، چونکە دروستکردنی قوماش بەبێ لۆکەو ڕەنگکردنیشی بەبێ خم نەدەکرا، بەلآم لەناو ئەو بازرگانانەی کەمیکیاج وشتی جوانکاریان دروستدەکرد(لۆکس) زیاتر نارەزاییان دەردەبڕی، چون کاتێ دوای ڕێککەوتننامەی ئاشتی ئامین، کەبەریتانیەکان ڕژانە ناو پاریس ودورپو گەوهەرو شتی جوانکاری پاریسیان زۆر کۆکردەوەو کڕیان وبردیانەوە بۆ بریتانیا، ئەمانە ئەو ڕۆژگارە خۆشەیان وەبیر خۆیان دەهێنایەوەو بەناسۆرییەوە سەیری ئەوشەڕە بێ کۆتاییەی ناپلیۆنیان دەکرد، هەروەها نارەزاییەکانی خەڵکی ئاسایش لەوەی کالآکانیان بەنرخی خەیاڵی دەکڕی، وەك قاوەو شەکرو تاد، لەپای ئەم بارودۆخەوەبوو کەقەیرانی ئابووری ساڵی(1811) ڕوویدا.

(4)

لەکۆتایی پایزی ساڵی(1811)دا هێواش هێواش دۆخی فرۆشتنی کالآ فەرەنسییەکان دابەزی، چونکە ئەمە بەخێرایی بلآوبۆوە کاریگەری زیاتری کردەسەر خەڵکی فەرەنسا، سنعەتگەرو بازرگانەکان بەئەدەبەوە سکالآیان دەکردو دەیانگوت گەمارۆدانی ئابووری سەربریتانیا تەنها زیان بەوڵاتە ناگەیەنێت، بەڵکو بۆخۆشیان زەرەردەکەن، هەروەها دەیانگوت مەوادی خامیان دەستناکەوێت وبەڕێز ئیمپراتۆریش بەوەبەرهێنانی گەلە ژێردەستەکانی، توانای کڕیاری کالآکانی هێناوەتەخوارێ، لەسەرتاسەری ئەوروپادا ئەوتەنگژە ئابوورییە مانگ بەمانگا فشاری زیاتردەهێنا، بۆ نموونە: لەدامەزراوەکانی ڕستن وچنیندا پێشەو قەیرانە ئابوورییە نزیکەی (12) هەزار کرێکار کاریان تێدادەکرد، بەلآم بەهۆی ئەو قەیرانەوە کرێکارەکانی بەرێژەی (50٪) کەمکرانەوە.



لەمانگی مارسی ساڵی (1811)دا ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد بڕی یەك ملیۆن ونیو فرانك یارمەتی خاوەن کارخانەکانی ئامێن بدرێت وکاڵاکانیش لەکارخانەکانی ڕوان و سن کانتن و کان بکڕدرێت، هەروەها یارمەتییەکی گەورەش درایە کارخانەکانی لیون، بەڵام هەموو ئەو یارمەتییانە دڵۆپەیەکبوون لەدەریایەك.

بەپشتبەستن بەوبەڵگەیەی کەنووسەری ئەم کتێبە لەئەرشیفی میللی فەرەنسا دەستی کەوتووەو میکانیزمی وسەرەکی ئەم تەنگژە ئابوورییە دیاری دەکات، لەهەموو ئەونووسینانە سەرنجڕاکێشترە کەدەربارەی هۆکارەکانی ئەم تەنگژە ئابوورییە نووسراون.

وەزیری ناوخۆی فەرەنسا لەبرواری (19/ی ئیبریلی ساڵی 1811)دا ئەم گوزارشەی بەناپلیۆن ڕاگەیاندووەکە: زۆرینەی کرێکارانی یەکە پیشەسازییەکان لەبێکارییدا دەناڵێنن وهەندێکیشیان کۆچیانکردوەو زۆریش بەتەمان کۆچبکەن، بێکاری و باری خراپی کارخانەکان ئەوەندە خراپبوو، ناپلیۆن ناچاربوو (15) ملیۆن فرانك بەوکارخانانە بدات، بۆ بوژانەوەی ئابووری وکەمکردنەوەی ڕێژەی بێکاری، خاوەن پلەوپایەکانی دەوڵەت غیرەتیان جوڵاو بەڕێوەبەری بانکی گشتی فەرەنسا لە(7/ی مایۆی ساڵی 1811)دا بەڕاشکاوی ڕاپۆرتێکی بۆ ئیمپراتۆر بەرزکردەوەو تێیدا ئاماژەی بەوەکردبوو وڵاتانی ژێر دەستەی فەرەنسا توشی قەیرانی کوشندەبوونەوەو کاڵاکانی فەرەنسا پێش داگیرکردنی ئەو وڵاتانە باشتر دەفرۆشران، ئەوکارخانانەی پاریسیش کەخەریکی دروستکردنی (لۆکس)ن [٢٣٢] مایەفوت بوون وکاڵاکانیان بۆ ساغ نابێتەوە، ناپلیۆن یارمەتی پارەی دەدا، بەڵام دەستی لەدرێژەدان بەگەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا شلنەدەکرد، کاڵاکانی بریتانیایی دەگیردران وقاچاغبوو، بازاڕی (بوکر) دەستی بەسەرداگیراو یەك کۆڵان کەپڕبوو لەشەکرو کاکاو وداودەرمان و.. هیتر، گوازرایەوە بۆ عەمبارەکانی دەوڵەت، ناپلیۆن جگەلەوەی ملیۆنەها فرانکی وەك دەستگیرۆیی یارمەتی دەدایە کارخانەکان، لەساڵی (1811)دا فەرمانێکی باشی بۆ خەزانەی دەوڵەت دەرکرد، کەقوماشی مخمەل لەکۆمپانیاکانی ڕستن و چینی لیون بکڕن بۆ پێداویستییەکانی پۆشاکی سەربازی، هەروەها فەرمانی بەهەموو شانشین و میرنشین و فەرمانڕەواکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی کرد قوماش لەکارخانەکانی لیون بکڕن، بەمکارەی توانی ڕێژەی کارخانەکانی قوماش کەلەمانگی یۆنیۆی سڵی (1811)دا ژمارەیان (5630) کارخانەبوو زیادبکرێن بۆ(8) هەزار کارخانە.

زستانی ئەوساڵە زۆر ساردو سۆڵەبوو، جموجۆڵی نائاسایی لەگەڕەکە کرێکار نشینەکانی پاریسدا وەجۆشهات، بێ گومان جاسوسانی دەوڵەت گوێیان لەهەموو قسەو ڕاو نیازەکانی کرێکاران نەدەبوو ونەشیاندەتوانی کرێکاران ناچاربکەن دەردی دڵی خۆیان هەڵەڕێژن، هەر چۆنێکبێت بارودۆخی ڕۆحی کرێکاران لەوساڵەدا لەبارنەبوو و وەك مێژوو نووسانی ئەو ڕۆژگارەو مێژوو نووسانی تازەش دەڵێن، کرێکاری کارخانەکان کێچیان کەوتبۆ کەوڵ ولەبیری ڕاپەڕین و شڵاخانەوەدابوون زۆرجار ناپلیۆن دەیگوت(تاکە کودەتای مەترسیدار شۆڕشی برسییەکانە– یان بەدەقی گوتەکەی، ڕاپەڕینی سك بەتاڵەکانە).

---

[٢٣٢] - کەلوپەلی ئارایش وجوانکاری،



شاتپال کەئەو ڕۆژگارە وەزیربووە لەیاداشتەکانیدا ئاوای نووسیوە(ناپلیۆن چەندین جار پێی دەگوتم ئەو کرێکارەی کەبێکارە هەمیشە ئەگەری ئەوەی هەیە فریوی ئاشوبگەرانبخوات ومن ئەو ترسەی کەلەراپەڕینی برسییەکانم هەیە زۆر لەوە زیاتر ڕوو بەڕووی سوپایەکی (200) هەزار کەسی ببمەوە.

هەرچەندە گوزارشتی مەترسیدار لەلایەن جاسوسان ودەسەلاتدارانی حکومەت سەبارەت بەراپەڕینی کرێکاران وخەڵك بۆ ناپلیۆن بەرزدەکرانەوە، بەڵام لەو ڕۆژگارەدا هیچ گێرەشێوێنێ و ڕاپەڕین دژبە ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن ڕوویندا، ئەگەر چی وەرگرتنی پەند لەتەنگژە ئابووریەکەی ساڵی (1811)بووە جێگای تێبینی، بەڵام ناپلیۆن بەپەلە ئەمەی بەشێوەیەك گۆڕی ولێکدایەوەکە بەبەرژەوەندی خۆی بشکێتەوەو دەیگوت: مادام گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا کاریگەری پەیداناکات، ئەو وڵاتە توشی هەرەسی ئابووری ناکاتەوە، ئەوا دەریا بەڕووی فەرنسییەکاندا ناکرێتەوەو باری بازرگانی وپیشەسازی فەرەنسا خراپتردەبێت وهەمیشە ئەگەری سەرهەڵدانەوەی تەنگژەیەکی ئابووریتر هەبوو، بۆیە دەبێت کاری گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا درێژە پێبدرێت هەتا ئەگەر بۆبە ئەنجامگەیاندنی ئەم کارە داگیرکردنی مۆسکۆش پێویستبێت، ئەوادەبێ مۆسکۆ داگیربکەین.

ناپلیۆن باش ئەوەی لەبیربوو کەخاوەن کارخانەکانی ئاوریشم، ڕستن و چنینی لیون، ئەو تەنگژە ئابووریەیان هەندێکی هۆکەیان دەگەڕاندەوە بۆ ئەو بڕیارەی ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا کەفەرمانی دابوو، تەعریفەی گومرگی تازەو زۆرتر بخەنەسەر ئەو کاڵایانەی لەفەرەنساوە دەهێندرێن، وەك پارچە قوماشی ئاوریشمی ومەخمەل وشتی جوانکاری و شەراب و...هتد، ناپلیۆن ئەم مەسەلەیەشی لەدوای ڕووداوی ئارفورت بەئیمپراتۆری ڕوسیا گوتبوو، بەڵام دواتر بەدرێژایی ساڵی (1811) لەبیری ئەوەدابوو ڕێگاچارەیەك بۆئەمە بدۆزێتەوەو یەکلایی بکرێتەوە، ئەم یەکسەرەکردنەش دەبوا لەمۆسکۆدا بکرێت.

ئایا ناپلیۆن چ بەرپەرچدانەوەیەکی لەبەرامبەر ئەو دۆخە خراپەی ئابووری ئیمپراتۆریەکەی نیشاندا؟ زەمینەی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری دەمێکبوو هاتبۆ ئاراو ناپلیۆن بەچاوی خۆی دەیبینی.

ئیمپراتۆری فلەرەنسییەکان لەو ڕۆژگارەدا ڕوو بەڕووی کێشەی مالی ببۆوە، کەسەرەتا لەهەڵاوسانی دراوەوەبوو کەسکەیان بەبێ پشتیوان لێدەدا، سەرئەنجام کەوتبۆ گێژاوی کودەتای سەرمایەدارانی گەورە، کەهەوڵیاندەدا بەڕێگای دانی قەرزی زۆر بەسودی گران وقازانجی زۆر، ئەمەش دەبووەهۆی بەتاڵبوونی خەزنەی دەوڵەت.

بارودۆخی ئێستای ناپلیۆن وەك ساڵی گرتنەدەستی دەسەلات لەفەرەنسا وابوو، بەڵام ئەو ئەوکات بەهۆی وەرگرتنی باجی زۆر لەوشوێنانەی لەژێر دەسەلاتیدابوون و وەرگرتنی ملیۆنەها دراو لەو وڵاتە تێشکاوانەی دەبوابیدەن و سەندنەوەی پارەی زۆری دزراو لەلایەن سەرمایەدارە گەورەکان، توانی بەسەر گرفتە ئابوورییەکاندا زاڵبێت، لەکۆتایی مانگی بێنایەری ساڵی (1806)دا ئەوکاتەی تازە ناپلیۆن لەشەڕی ئوسترلیتزوە بۆپاریس گەڕابۆوە، داوایکرد ڕاپۆرتێکی سەبارەت بەباری ئیداری وخەزنەی دەوڵەت پێبدەن ودوای پێداچوونەوە بەکاروبارە ئیدارییەکانی حکومەتی فەرەنسا، بۆی دەرکەوت کە(ئوڤرار)ی ملیۆنێری بەناوبانگ وسەرمایەداری چاوچنۆك، کۆمپانیایەکی بازرگانی بەناوی یەکێتی بازرگانان کەخۆی بەڕێوبەری بوو دروستکردووەو بەزنجیرەیەك ساختەکاری زیرەکانەو دەغەڵی ودەستبڕی ودزی کەبەڕووکەش بەڕێگای قانونی ئەنجام

درابوون، پارەیەکی زۆر لەخەزنەی دەوڵەت ڕاکێشێ وزیانێکی گەورەی پێبگەیێنێت، ناپلیۆن ئوڤرارو کارگێڕانی ئەو یێکێتییە بازرگانییەی بۆ کۆشکی توپلری بانگهێشتکرد، بێ ئەم لاولا پێی گوتن هەرچی لەم دواییانەدا لەخەزنەی دەولەتتان ڕفاندووە بیگەڕێننەوە، ئوڤرار زۆر هەوڵیدا ڕێگایان بدرێت مامەڵەی تازە- یان بەڵێندەرایێتی تازەیان لەلایەن دەوڵەتەوە پێبدرێت وئەمەش قازانجی زۆر دەکات بۆدەوڵەتی فەرەنسا، بەڵام ناپلیۆن پێی گوتن باشترین قازانج وەرگرتنی خەزانەی دەوڵەت ئەوەیە، تۆ وهاوکارەکانت لەقەڵاتی نسندا زیندانی بکرێن ودواتر ڕاکێشی بەردەم دادگایەکی گەتنتان بکەن، ئیتر ئوڤرارو هاوکارەکانی کەوتنەپاڕانەوەو مەرایی کردن وکلکەسوتەو پاش چەند ڕۆژێك ئەمانە (87)ملیۆن فرانکی زێڕیان بۆخەزنەی دەوڵەت هێناو بەبێ زیندانی ودادگایی کردن باجی خۆیاندا.

ناپلیۆن لەونامانەی کەبۆ براکەی جۆزێفی نووسیوە(دە دوازدە دزی باخەڵبڕمان ناچارکردن ئەوپارەی لەخەزنەی دەوڵەت دزیبویان بهێننەوە. [٢٣٣]

دراو کەوتبۆ بارێکی باشەوە، زێڕ بەئەندازەیەکی باش لەخەزنەی دەوڵەتداهەبوو، دیارە سیستمی ئاڵوێری کاروباری ئیداری لەهەموو بەشەکانی تری ژێر ڕکێفی دەسەڵاتدارێتی ئیمپراتۆری ناپلیۆن بەقازانجی فەرەنسا شکاندارابۆوە، لەپڕ کەلێنێکی گەورەی عاقیبەت خراپ لەپەیکەری گەورەی ئیمپراتۆریەتی فەرنسا کرایەوە، ناپلیۆن ئەزمونی لەقەیرانی ساڵی (1811) وەرگرتبوو و زوو پەی بەو ڕاستییەبردکە بەربەرەکانی کردنی یەك قەیرانی ئابووری گشتی چەند پرکێشەترە لەتەنگژەی هەڵاوسانی دراو، چەند کاریگەری خراپ دەکاتەسەر ئیمپراتۆریەتەکەی، ئەوکەلێنە گەورەیە نەوەرگرتنی باجی تازەو نەملیۆنەها فرانك کەلەگەرووی سەرمایەدارانی تالانکەر دەهێنرایەوەدەرێ و نەبوونی یەك ژمێریاری زیرەك-" نموونەیی: مەبەستی لەوەزیری ئابووری دەوڵەتە" نەیاندەتوانی چارەسەری ئەمەبکەن، قەیرانی ساڵی (1811) پێش هەمووشتێك تەنگژەی نەبوونی بازاڕی ساغکردنەوەی کالا پیشەسازییەکان بوو کەبەپلەی یەکەم سەرچاوە- یان بڕبڕەی ئابووری فەرەنسابوو، ئەوشاکارە جوانانەی گەوهەر سازانی پاریسی کێ، کەس نەبوو بیکڕێت؟ ئەو مۆبیلە جوان ونایابانەی کەلەکارخانەکاندا کەوتبوونەوە بەکێ بفرۆشن؟

ئەومیکیاج و شی لۆکسی، کەژیانی دانیشتوانی سن مارسوی لەسەربوو بۆکوێی بنێرن تابیفرۆشێت؟

ئەو هەموو جلوبەرگە مۆدەیەی کەکارخانەو ناوەندەکانی دروین وەبەریان هێنابوو بۆ کوێ بنێرن؟ چۆن دەیانتوانی نرخی قوماشی ئاوریشمی ومەخمەل لیون وکوتاڵی پرچینی سدان و...هیتد، بهێڵنەوەو فرۆشی نەبێت؟

هەموو ئەوشتە لوکسیانەی لەفەرنسادا دروستدەکرا بۆهەموو بازاڕەکانی دنیابوو وئێستاش بازاڕەکانی دنیا کالاکانی فەرنسایان لێساغ نابێتەوە-یان بەلانی کەمەوە ناتوانرێت بنێردرێت، چونکە بریتانیاو کیشوەری ئەمریکای سەرو وخوارو کەشتیوانانی دەوڵەمەندی دورگەکانی ئانتیل وماسکارەبینی، هەموویان دەستیان لەبازرگانی کردن لەگەڵ فەرەنسادا هەڵگرتبوو، لەخودی ئەورووپاشدا بارودۆخەکە نالەباربوو، هەموو ئەو وڵاتانەی لەشەڕدا دۆڕابوون وئەوانەش کەخۆیان دابۆ بەدەستەوەو لەژێر دەسەڵاتدارێتی ناپلیۆندابوون، چون دەبوا یاساو ڕێساکانی گەمارۆی سەر بریتانیایان جێبەجێکردبا، بۆیە

---

[٢٣٣]- لێرەدا بەمانای قوتدان- یان خواردنی شتێك دێت وهێنانەوەی، نەك گەڕاندنەوەی شتێك.



دراوەکەیان بەهای کڕینی لەدەستدابوو، کاتێ خاوەن زەوییە گەورەکانی ڕوسیا نەیاندەتوانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکەیان بەبریتانیا بفرۆشن، بەهای دراوی برتانیا زیادی کردبوو ولەهەمان کاتیشدا بەهای ڕۆبلی ڕوسی دابەزی بۆ(26) کۆپك، هەمان ئەم بەڵایە بەسەر ئەشرافەکانی پۆڵۆنیاو نەمساو ئیتالیاش هاتبوو، لەخاکی ئەڵمانیای خۆرئاواشدا تەنانەت سەرویشدا، فیودالەکان کەوتبوونە حاڵەتی شێوە هەژاری ئەمەش تەنها بەهۆی گەمارۆدانی ئابووری سەربریتانیا وەبوو، مەسەلەکە تەنها بەلەدەستدانی سامانی فیودالەکان نەبوو لەسایەی ڕژێمی ناپلیۆن، بەڵکو برژوازیە تازەکانیش کەبەهۆی بەرەوپێشچوون وگەورەبوونی سەرمایەدارانەوە دروستبوون درێژەیان بەپێشکەوتنەکانی خۆیاندەدا.

قاتی بوونی مەوادی خام گەیشتە ئاستێ تەنانەت لەساڵی(1811)دا زۆر کارخانە ناچاربوون ئاستی بەرهەمەکانیان زۆر کەم بکەنەوە، لەبەرامبەر ئەو هەڕەشانەی کەدیارکەوتبوو وبێ کاری وبرسییەتی لەگەڕەکە کرێکار نشینەکانی پایتەخت و لیون و ڕوان و ئەو ولایەتانەی شەرابیان بەرهەم دەهێنا زۆر زیادی کردبوو، ناپلیۆن ناچاربوو مۆڵەتی ئەوەبدات هەتا ئاستێك بڕگەو ڕێساکانی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا پێشێلبکەن.

بۆ نموونە: مۆڵەت درایە هەندێك کەس تاسنوورێکی دیاریکراو کاڵای بریتانی بهێنن بۆفەرەنسا بەمەرجێ بەقەت ئەوکاڵایانەی دەیانهێنن ئەوەندەش کاڵای فەرەنسی بەدەرەوە بفرۆشن.

ئەم مۆڵەتدانانە هەرچەندە کاربەدەستانی دەوڵەت بەناڕێکی تەواویان دەکردو گران لەسەرخاوەن مۆڵەت پێدراوەکان تەواو دەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆخەڵکی ئاسایی سودبەخش بوو، دانی ئەم جۆرە ئیمتیازانە ئەوەنیشاندەدات قەیرانی ئابووری ساڵانی (1810– 1811) چەند کاریگەریان کردۆتەسەر ناپلیۆن ونیگەرانی کردووە، ڕاستە مۆڵەتدان وئاڵوویریەکە سودی زۆری بۆ بریتانیانەبوو، بەڵام لەنەبوونی باشتربوو، ئەومۆڵەتدانانە نەیدەتوانی کاریگەری تەواوی لەسەر بەرەوپێشچوونی بازاڕەکانی فرۆشی کاڵای فەرەنساهەبێت.

ئیرادەی ناپلیۆنیش ئەوەبوو دەسەڵاتدارانی حکومەت ونەوانەی کۆشك وکارمەندانی خاوەن پلەوپایەش دەبێ باشترین و نایابترین جلوبەرگ بپۆشن و زوو زووش ئارایشی خۆیان بکەن وبگۆڕن و ...هتد، ئەم فەرمانانەی ئیمپراتۆریش نەیتوانی بازاڕێکی باش بۆ شتومەکی ئارایش دابین بکات، لەساڵی (1811)شدا وەك ساڵی (1806) کەجموجۆڵی بازاڕ لاوازبوو، بەڵام ئەمە زۆر درێژەی نەکێشا، ناپلیۆن ڕایگەیاند ئامانجی ئەوەنییە بازرگانەکان توشی نەهامەتی بکاتەوە، کاتێ وەزیری ناوخۆ یارمەتی ئەوکارخانانەی بەڕەسمی دەدا، ناپلیۆن داوای لەناوبراو دەکرد پسولەکانی خەرجکردنی ئەوپارانەی نیشانبدات وبیسەلمێنێت کەئەو یارمەتییەی داوەتە کارخانەکان، لەزستانی ساڵی (1811– بۆ 1812) قەیرانی ئابووری کەمکەم بەرەو باشبوون چوو، بەڵام ناپلیۆن دەیزانی هیچ لەمیکانیزمەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری لەناو نەبراون وماوەیەکیتر بەشێوەیەکی توندوتیژتر قەیرانی ئابووری سەرهەڵدەداتەوە، هەروەها دەشیزانی هۆکاری سەرەکی ئەم تەنگژە ئابووریانەش دەگەڕێتەوە بۆ گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا، بۆیە دەبوا پێش کۆتایی هێنان بەگەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا کارێکی کردبا بریتانیا چەکی دژایەتی کردنی فەرنسای دانابا، بەلای ئەو ئێستا بارشترین کات بوو بۆ زاڵبوون بەسەر بریتانیاداو پێویستە پەلەبکات ونەمەشی بەتاکە هۆکاری مانەوەی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی دەزانی، هەروەها لەوبڕوایەدابوو گەمارۆی ئابووری توانیویەتی ئابووری بریتانیا لاوازبکات ونەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاش پاشقول لێدەگرێت وفریوی دەدات



وبەدرێژای سنووری خۆرئاوای ڕوسیاو لەسنوورەکانی دەریایی نەمساو ئەڵمان و پـروس و پۆلۆنیـاو..، کـاڵای بریتانیـایی بەقاچاغ دەهێندرێت، ئەمەش دەبووە هۆی شکستپێهێنانی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیاو ئەو ئومێدە نـەدەما بریتانیـا بەچۆکدابێت.

هەواڵی ئەوە بەناپلیۆن دەگەیشت کەکاڵاکانی بریتانی بەڕێگای قاچاغ لەدەریای سەرووەوە نەك هەردەگاتە ئەو شوێنانەی لەژێر ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆندان، بەڵکو بۆ خودی فەرەنساش دەهێندرێت.

ناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی خۆی تەنانەت ئەوکاتانەی بەرەو ڤیێنناو بەرلین ومەدریدیش دەچوو بۆشەڕو شۆڕ، چاوێکی هەر بریبۆ لەندەن، بەڵام ئەمجارەیان وردەوردە چاوی بریە دوورترین پایتەختەکانی کیشوەری ئەورووپا،

ڕۆخەکانی سەر دەریایی کیشوەری ئەورووپا لەژێر دەسەڵاتدارێتی ئەو یۆنانییە ساختەیەی ئیمپراتۆری بیزانس، واتە: تزاری ڕوسیا.. ، واز لەشەڕکردنی بەم زوانەی لەگەڵ بریتانیادابێنێت وبچێت قرقراگەی ئەلکسەندەر بگرێت وناچـاری بکـات ئـەو بەڵێنانەی کەلەتیلیستدا دانی جێبەجێیان بکات؟ ئەم پرسیارە بوو کەناپلیۆن لەساڵی (1810) بەدواوە لەخۆی دەکرد.

هەر لەساڵی (1810) بەدواوە ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد کتێبـی سـەبارەت بەمێـژوو وتایبـەت مەندییـەکانی ڕوسـیای بـۆ وەربگێڕنە سەرزمانی فەرەنسی، لەو قسانەی کـەناپلیۆن جارجـارە دەری دەهاویـشتن، لەسـەربنەمای ئـەو زانیاریانـەبوو کەئەوانەی دەوروبەری بەهەڵەو کەموکوڕیەوە پێیان گوتبوو ودەردەکەوت نیازی وایە هێرشی یەکلایکەرەوەو بروسك ئاسا بکاتەسەر ڕوسیا لەمۆسکۆوە زەبری گەورەتر لەبرتانیا بوەشێنێت، گەیـشتنی سـوپای مـەزنی فەرەنـسا بەمۆسـکۆ، واتـا ملکەچکردنی تەواوی ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاو جێبەجێکردنی تەواوی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیاو سەرئەنجام سەرکەوتنی بەسەر بریتانیاداو کۆتایهاتن بەشەڕو قەیرانی ئابووری وبێکاری ودامەزراندنی ئیمپراتۆری جیهانی، دواجار قەیرانی ئابووری ساڵی (1811) ئیمپراتۆری فەرنسای گەیاندە ئەو بڕوایەی سەرەوە.

دواتر لەویتبسلدا لەسەرەتای لەشکرکێشی بۆسەر مۆسکۆ، کنت دارو، بەڕاشـکاوی بـەناپلیۆنی گـوت: ئـەم سـوپایەو زۆر لەوانەی لەدەوروبەری بەڕێزتدان، ئاکامی ئەو لەشکرکێشییە پردەردەسەرییەی سەر مۆسکۆ نازانن، چونکە لەبەرخاتری بوونی کاڵای بریتانی لەسەرخاکی ئیمپراتۆرێتی ڕوسیا هێرشی دەکرێتەسەر. وەلێ ئـەمجۆرە قـسانە بـەلای ناپلیۆنـەوە جێگـای قبوڵکردن نەبوون.

ئەو تەنها هۆکاری مانەوەی ئەو ئیمپراتۆریەتەی کەخۆی بنیاتی نابوو بەئیفلیجکردنی ئابووری بریتانیای دەزانی و بەدرێژەدان بەو بەرنامەی خۆی داڕشتبوو سەرکەوتووانەی دەبیی، ناپلیۆن هاوپەیمانییـەتی لەگـەڵ ڕوسـیادا بەسـت ئەمـەش لەبـەر ئەوەنەبوو ئەلکسەندەر نارەزایە لەداگیرکردنی پۆلۆنیاو پروس لەلایەن سوپای فەرەنساوە، بەڵکو لەبـەر ئـەوەبوو ڕوسـیا لەئایندەدا ئومێدی زۆری بەبریتانیا هەبوو، وەك چۆن بریتانیاش ئومێدەواری زۆری بەڕوسیا هەبوو، بەڵام ڕاستەوخۆ ناپلیۆن دەستی نەدەگەیشتە بریتانیا بۆیە دەیویست لەڕوسیای داباو سەرکوتی کردبا.

تارمایی لێکدانێکی چەکدارانەی تازەو سامناك وخوێناوی باڵی دەکێشاو گەورەدەبوو.



# پساندنی پەیوەندیی لەگەڵ ڕوسیادا (1811- 1812)

## (1)

دوای ئارفورت، بەچاودێری کردنی ڕووکەشی هاوپەیمانیەتی نێوان ڕوسیاو فەرنسا، ئەلکسەندەر وردەوردە لەڕەهەندی سیاسەتەکانی ناپلیۆن لایدا، زۆر لەمێژوو نوسان لەڕووی سیاسی وئابووری وکۆمەڵایەتی لەتێڕوانین لەئاینده، بەشی زۆریان زیاتر لەسەر سالآنی ئاشوب وناهەمواری هێرشی ناپلیۆنیان بۆسەر ڕوسیا نووسیوە لەساڵی(1812)دا، ئێمە دەبینین لەماوەی ئەوچوار ساڵە شەڕە ئاڵۆزەدا لەنێوان هەڵپێچە ئاکۆکییەکانی کۆمەڵایەتی هاتوونەتەپێش وکەسایەتییەکی وەك ئسپرانسکی سەری هەڵداوەو دواتر لەناوچووە. ئەمە شتێکی بەڵگە نەویستە لەوڕۆژگارەدا مەسەلەی ریفۆرمکردنی ئیداری ئیمپراتۆریەتی ڕوسی بەردەوام لەئارادابووە. تێشکانەکانی ئوسترلیتزو فریدلندو تیلیست ببوونە هۆکاری هاتنەپێشی ئەو ڕایانەی کەپێویستە چاکسازی بکرێت، بەلآم ئەو تێشە ئابڕو بەرانەی سالآنی (1805 و1807) بەچاوپۆشین لەڕیسوایش، ببوونەهۆی دروستبوونی هاوپەیمانییەتێکی سودمەندی نێوان داگیرکەری جیهان و ڕوسیا کەماوەیەك دوای ئەمە ڕوسیا خاکی بەرفراوانی فنلاندی خستەژێر دەسەلاتی خۆیەوە. بێگومان تزاری ڕوسیا هیچ هۆکارێکی تەنانەت لاوەکی و ڕووکەش وسەرتوێیشی بەپێویست نەدەزانی بۆچاکسازیکردن. لەو ڕۆژگارەدابوو کەئیسپرانسکی وەك کەسایەتییەك سەریهەڵدا، ئەم پیاوە ڕەندو ئەزموندارو ژیرو لێوەشاوەیە کەسێکی دووربین بوو، ناوبراو یەکێکیشبوو لەوکەسانەی لەگەڵ ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیادا چووبوو بۆئارفورت ولەوێدا بەتوندی سەرسامی ناپلیۆن ببوو.

ئیسپرانسکی گۆڕانکاری لەپێکهاتەی کڵێسای ئەرسیدۆکسییدا نەکرد، هەوڵیدا گۆڕانکاری لەسیستمی ئیداری دەوڵەتدا بکات، بەلآم ئەشراف وفیودالەکان دەنگی نارەزاییان دژبە تزارو ئسپرانسکی وەزیر بەرزکردەوە، لەگرتنەبەری ئەو سیاسەتە، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی هاوپەیمانییەتی نێوان ڕوسیاو فەرنسا درێژە نەکێشێت، لەکۆڕو کۆبوونەوەی ئەشرافەکاندا باس لەوەدەکرا، دابڕانی خاکی فنلاندا لەسویدو خستەسەر خاکی ڕوسیا بەفیتی ناپلیۆن کراوەو لەسەر داوای ئەو ڕوسیا ئەمەی ئەنجامداوە.

ئەوانە دەیانویست کەمکەم دوژمنکاری خۆیان بەباڵوێزی فەرەنسا لەڕوسیا نیشانبدەن، هەرچەندە ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا زیاتر مهرەبانی ونەرم و نیانی لەبەرامبەر کولنکوردا نیشاندەدا، بەلآم ئەشرافە تازەکانی پترسبورگ ومۆسکۆ بەئاشکرا دوژمنایەتی کردنی خۆیان لەبەرامبەر کولنکوری باڵوێزی فەرەنسا لەڕوسیا نیشاندەدا، سەرئەنجام لەکۆتایی ساڵی (1810)دا ئەلکسەندەر لەبەرامبەر ئەوهەڵمەتە پڕ تەوژمەدا دەستی شلکرد، بەپلەی یەك ئەلکسەندەر پەی بەوەبردبوو ئەمەکارێکە تێیدا بەهەڵەچووە، ئەوقسانەی ناپلیۆن گوتبووی ڕێگا خۆشدەکات پانتایی خاکی ڕوسیا بەرەو ئاسیاو خاکی تورکیا زیاددەکات. تەنها قسەی سەرزارەکی ولامسەللایی بوون. دواتر ناپلیۆن سوپاکەی لەپروسدا پاشەکشە پێنەکردو پۆڵۆنییەکانیشی وەك یاری بەکاردەهێنا بەئومێدی ئەوەی سەربەخۆییان وەربگرنەوە. ئەمانەش سەرتاپای سنووری ڕوسیایان دەخستەژێر مەترسییەوەو هەڕەشەبوون بۆسەری. جگەلەمانەش ئەگەری ئەوەش هەبوو خاکی لیتوانیاشی لەدەستبچێت، لەلایەکی ترەوە



ناڕەزاییەتی ناپلیۆن بوو لەوەی ڕوسیا تەواو کار بەگەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا ناکات. هەروەها خستنەسەری خاکی تازە بۆسەر ئیمپراتۆریەتی فەرنسا. ئەو هێزو توانایە زۆرەی ناپلیۆن خودبەخود هەڕەشەیەك بوو بۆسەر ڕوسیاو دوای ڕێککەوتننامەی تیلیست هەموو لایەك ئەلکسەندەری ڕوسیایان بەملکەچی فەرمانەکانی ناپلیۆن لەقەڵەمدەدا. گشت لایەك ئەو بەخشندەییە هیچەی کەناپلیۆن دابوویە ئەلکسەندەر، بەدانی شاری بیەلوستوکی پروسی و پارچە خاکێکی تری ئیمپراتۆریەتی نەمسایان کردبۆ گاڵتەجاڕی ودەیانگوت: شێوازی هەڵسوکەوتی ناپلیۆن لەگەڵ ئەلکسەندەری ڕوسیادا لەهەڵسوکەوتی باوك و باپیرانی ئیمپراتۆرەکانی جارانی ڕوسیادەچێت لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیاندا. کاتێ مەسەلەی دانی ئاناپاڤلوناو کەکچی فرانسوای ئیمپراتۆری نەمسا درایە ناپلیۆن، دەیانگوت هاوپەیمانییەتی نێوان ڕوسیاو فەرەنسا گۆڕاوە بۆهاوپەیمانییەتی نێوان نەمساو فەرەنساو جێگرەوەیەتی.

ئەو زانیاریانەی کەلەمانگی یێنایەری ساڵی (1811) بەدواوە هەن، ئەوە نیشاندەدەن نەك هەر باسی ئەگەری شەڕی نێوان فەرەنساو ڕوسیا دەکرا، بەڵکو بەئاشکرا ناپلیۆن نەخشەی بۆئەوە دادەڕشت. یەکێکیش لەو هۆکارانەی کەڕێگاخۆشکەربوو بۆئەمە ئەوەبوو نرخی کاڵاکانی فەرەنسا کەدەناردرانە ڕوسیا بەشێوەیەکی بەرچاو گومرگیان زیادکرابوو. ناپلیۆن دڵنیابوو لەوەی ڕوسیا ڕێگادەدات کاڵاکانی بریتانیا بێنەناو خاکی ڕوسیاوە.

ناپلیۆن ناڕەزایی خۆی بەڕەسمی بەئیمپراتۆری ڕوسیا ڕاگەیاندو داوایکرد کاربە ڕێساکانی گەمارۆدانی ئابووری سەربریتانیا بکرێت.

ئەلکسەندەریش دەیزانی شەڕ لەپێشەوەیەو ناتوانرێت خۆی لێلابدرێت، بۆیە کەوتەبیری ئەوەی هاوپەیمانان بۆخۆی پەیدابکات وپەیوەندی بەمارشاڵێکی ناپلیۆنەوەکرد کەفەرمانڕەوای سویدبوو وببووە دوژمنی گەورەکەی خۆی وبەنهێنی گفتوگۆیان دەکرد. لەپازدەی ئۆگۆستی ساڵی (1811)دەدا، لەیەك میوانداری ڕەسمی کەبەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی ناپلیۆنەوە ڕێکخرابوو، نوێنەران و باڵوێزی خاریجی و دەسەڵاتدارانی حکومی بەشداریانتێداکردبوو و داعوەتکرابوون. ناپلیۆن ڕوویکردە شازادە کوراکین، باڵوێزی ڕوسیا لەفەرنساو بەشێوەیەکی هەڕەشەئامێز گوتی: ئەلکسەندەر پەیمانەکانی خۆی سەبارەت بەگەمارۆدانی ئابووری سەربریتانیا شکاندووەو بەتوڕەییەوە لێی پرسی: ئەو گەورەی ئێوە بیر لەچی دەکاتەوە؟ دواتر پێشنیاری مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەکی بۆ کوراکین کرد، کەهەموو لێکتێکنەگەیشتنەکانی نێوان ڕوسیاو فەرەنسا وەلانرێن و ئەمە ئیمزابکات. پرنس کوراکین بەپەشۆکاوی وهەراسانی وەڵامی دایەوەو گوتی: من دەسەڵاتی ئەم کارەم نییە.

ناپلیۆن بەدەنگێکی بەرز گوتی: دەسەڵاتت نییە؟ زۆر باشە داوا لەگەورەکەتبکە، دەسەڵاتی ئەمەت بداتێ، من حەزم لەشەرکردن نییەو نامەوێت سەربەخۆیی پۆڵۆنیا بگێڕمەوە، بەڵام ئێوە دەتانەوێت میرنشینەکانی وارشۆ ودانتزیگ بخەنەسەر خاکی ڕوسیا، مادام نەخشە نهێنییەکانی ناو کۆشکی پاشایەتی ئێوە ڕوون وئاشکرانییە، ئەوا من هەردرێژە بەخۆ بەهێزکردن وچەسپاندنی سوپاکەم دەدەم لەخاکی ئەڵمانیادا. ناپلیۆن بێئەوەی گوێ بۆقسەکانی باڵوێزی ڕوسی بگرێت، کەدەیویست بۆی ڕوونبکاتەوەو پاساوی بەجێی بۆ بێنێتەوە. درێژەی بەقسەکانی خۆیدەدا، دوای ئەمە ئیتر کەس لەئەورووپادا نەبوو چاوەڕوانی شەڕێکی بەم نزیکانەی نێوان ڕوسیاو فەرەنسا نەکات.



ناپلیۆن وردەوردە سەرتاسەری خاکی ئەڵمانیای کۆری بۆ سەربازگەیەکی گەورەی ئامادە بۆهێرشکردن. هەروەها نەخشەی ئەوەشی دارشت بەزۆر هەردوو ئەوهێزەی کەبەرووکەش بێلایەن بوون بهێنێتەناو هاوپەیمانییەتەکەی خۆی. واتە: پروس ونەمسا، هەرچەندە پروس لەرووی سیاسییەوە ژێر دەستەی ناپلیۆن بوو، بەڵام دەبوا ئەم هاوپەیمانییە سەربازییە پێش هێرشکردنەسەر روسیا پێکبهێندرێت.

## (2)

دەوڵەتی پروس لەژێر زوڵم و زۆری ناپلیۆندا زۆری چێشتبوو، لەساڵانی سەرەتای داگیرکرانیدا، بەهۆی بەدیارکەوتنی شتاین وحزبی ریفۆرمخوازان، هەرچەندە رژێمی شانشینی تەواو لەپروسدا لانەبرابوو، بەڵام بنچینەی پایەکانی ئەو بەسەختی لەبەریەك ترازابوون ونەمەش وایکردبوو مەسەلەی چاکسازی بێتەپێش. ئەم نیشتمان پەروەرییە پرشەوق و شەیداییەی شتاین کەبەئاشکرا باسی شۆرشی ئیسپانیای دەکرد، ببووەجێگای سەرنجی دەسەڵاتدارانی حکومەتی فەرەنسا، چونکە یەکێك لەونامانەی ئەو بەرێکەوت کەوتبۆدەست پۆلیسی نهێنی ناپلیۆن، ئەمە گومانی لای ئیمپراتۆری فەرنسا دروستکردوو دەستبەجێ ناپلیۆن داوای لەفردریك ویلهلم کرد، شتاین لەوڵاتەکەی خۆی دەربکات، پاشای پروس بۆ نیشاندانی دڵسۆزی خۆی لەبەرامبەر ناپلیۆن، نەك هەر ئەوسیاسەتمەدارە تورەیەی لەوڵاتەکەی خۆی دەرکرد، بەڵکو دەستی بەسەر ملك وماڵەکەیشدا گرت.

مەسەلەی ریفۆرمکردن لەپروسدا دواکەوت، بەڵام ئەوەستا، شاژن هورستی وەزیری بەرگری وگنایزنوی مارشاڵ پروس و هاوەڵەکانیان بەوپەری جددی خەریکی رێکخستنەوەی سەربازی سوپای پروس بوون، بەپێی بریاری ناپلیۆن دەبوا سوپای پروس لە(42) هەزار سەرباز زیاتری نەبێت، بەڵام دەوڵەتی پروس بەپەنابردن بۆ چەندین فرتوفێڵی وەك کەمکردنەوەی خزمەتی سەربازی لەماوەیەکی کەمدا، ژمارەیەکی زۆری سەربازی مەشقپێکراوی[٢٣٤] سازکردن، بەمجۆرە پروس لەبەرامبەر فەرمانەکانی ناپلیۆندا ملکەچی دەکردو مەرایی وکلکەسوتەی دەکردوو وخۆی بەبچوکی نیشاندەدا، بەڵام لەژێرەوە خۆی بۆئایندە ئامادە دەکردو ئومێدەواری ئەوەبوو لەودۆخەی کەلەئەنجامی شەرە دۆراوەکانی(1806)و ئاشتی کردنی تیلیست تێی کەوتبوو رزگاربکات.

لەساڵی (1809)دا شەری نێوان نەمساو ناپلیۆن دەستی پێکرد، پروس هەوڵیدا خۆی لەدەست ستەمی دوژمن رزگاربکات. سەرهەنگ شیل بەسەربازەکانییەوە کوژراو لەلایەن دادگایەکی پروسیشەوە بریاری لەسێدارەدانی دەرچوو وبەفەرمانی ناپلیۆن گوللەبارانکرا، بۆیە پاشای پروس لەترسی ئەو تورەییەی ناپلیۆن لەبەرامبەر شیلداو لەناوبردنی ئەو پروس کەوتبۆ ترس ولەرزەوە، بەڵام دوای دووبارە تێکشکانەوەی سوپای نەمسا لەشەری ڤاگرامدا ملکەچ بوونی تەواوی نەمسا لەرێککەوتننامەی ئاشتی شونبرون، ئیتر پروس دووبارە ئومێدی لەدەستدایەوە.

---

[234] - لێرەدا مەبەست لەوەیە ئەوسەربازانەی کەمەشقدادەدران و دواتر لەخزمەتی سەربازییان لادەبردن ونەمانەش هەموو کاتێ بۆ خزمەتکردنەوەی سەربازی ئامادەبوون کەدەوڵەت داوای کردبانەوە(و-کوردی)

لەلایەکی ترەوە وادەهاتەبەرچاو ئەمسا تەواو کەوتۆتە گەل ڕەهەندی سیاسەتەکانی ناپلیۆن، بۆیە پروس ئیتر چاوەڕوانی یارمەتی لەکێ بکات ودڵ بەچی خۆشبکات؟ هەروەها ئەو دوو رووییەی دەوڵەتی ڕوسیاش کەگەیشتبۆ لوتکەو دوای شەڕی ئوسترلیتز، هێزی سەربازییەکەی بۆئەوە نەدەبوو پشتی پێببەسترێت، سەرەتای ساڵی (1810) پروپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوە گوایا ناپلیۆن بەتەمایە دەوڵەتی پروس بەبێ شەڕ لەناوبەرێت وتەنها بەدەرکردنی بڕیارێك پروس بەسەر ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیی و وستفالی وسارکسدا دابەشبکات و یەکێ لەمارشالەکانی-یان دەست نیشانکراوێکی خۆی لەجێگای ئەوانەدا دابنێت. کاتێ ناپلیۆن لەیۆنیۆی ساڵی(1810)دا بەدەرکردنی بڕیارێك دەوڵەتی هۆڵەندای خستەسەر خاکی فەرەنساو ئەو دەوڵەتەی بۆ(9) ولایەتی تازەی ئیمپراتۆریەتەکەی دابەشکرد. هەروەها شارەکانی هامبورگ و برل و لویسك و میرنشینی لاونبورگ و ڤاولدنبورك و ئارنبرگ و زۆر لەدەوڵەتی بچوکی تری خستنەسەر خاکی فەرەنسا. ئیتر پاشای پروس لەوەگەیشت کۆتایی فەرمانڕەواییەکەی لەنزیکبوونەوەدایە، تەنانەت سەربەخۆییەکەی ئەو تەنها شتێکی ڕواڵەتی بوو ودەیزانی ناپلیۆن لەتیلیستدا گوتبووی لەبەر خاتری ئیمپراتۆری ڕوسیا، دەوڵەتی پروس لەسەر نەخشەی ئەوروپا ناسڕێتەوە، بەڵام لەساڵانی(1810 – 1811)دا ئیتر پەیوەندی نێوان ناپلیۆن و تزار بەخێرایی بەرەو تاڵ وتاریکی دەچوو و مەسەلەی خاتروخوایش لەئارادانەمابوو. لەکۆتایی ساڵی (1810)دا ناپلیۆن بەبێ ئەوەی حساب بۆکەسبکات، شانشینی دوك ئولدنبورگی لەسەر تەخت وتاراجەکەی دەرپەڕاند، چونکە کوڕەکەی ئاکاترینا باولڤنای خوشکی ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیای خواستبوو، ئەو دەوڵەتەشی خستەسەر خاکی فەرەنسا.

پروس لەساڵانی (1810– 1811) خۆی لەبەردەم لەناوچووندا دەبینییەوە، فردریك ویلهلمی سێیەم هیچ کاتێ ئەوەندە چاونەترس و لەخۆ بووردوو نەبوو، هەرئەویش لەوچارەنوسە ڕەشە نەدەترسا، بەڵکو قەومی و ئازادیخوازەکانی ئەنجومەنی نهێنی توگندبوندیش، کەئەوکات دەستەیەك لەلاوانی بزۆزی ئەڵمان دەیانویست خۆیان لەزۆرو ستەمی ناپلیۆن ڕزگاربکەن وهەرچۆنێکبێت سەرفرازبن و یەك ئەڵمانیای تازەو ئازاد دروستبکەن دەترسان. توگندبوند کەرێکخراوێکی ناقانونی ئەڵمانی بوو، ئیتر دەنگی خۆی ڕانەدەگەیاندو هەرلەساڵی (1810)وە توشی مەینەتی وخۆبەدەستەوەدان هاتبۆوە، وادیاردەکەوت بەهیچ جۆرێ ئومێدی سەرفرازی نییە. یەکێك لەوەزیرەکانی پێشوو بەناوی هاردنبرگ کەجاران باوەڕی بەبەرەنگاری بوونەوە هەبوو وهەرلەبەر ئەمەش لەسەر داوای ناپلیۆن لەوەزارەتەکەی دەرکرا، بەڕەشی پەشیمانی خۆی ڕاگەیاندو لەنامەکەیدا کەدابوویە سن مارسان باڵوێزی فەرەنسا لەئەڵمانیاو لەرێگای ئەویشەوە بگاتەدەست ژنرال شارن هورست، ئاوای نووسیبوو ( ڕزگاربوونی ئێمە تەنها وابەستەبە خودی ناپلیۆنە) هەمان ناوبراو لەمانگی مایۆی ساڵی(1810)دا, ئەو داواکارییە شەرمەزاریەی بۆ نوێنەری[235] فەرەنسا نووسی (ئومێدەوارم بەرێزتان ئیمپراتۆری فەرەنسا ئەو ڕۆڵەی کەمن دەتوانم لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا بیگێڕم، فەرامۆشنەکات، چونکە ئەم مەسەلەیە لەبەخشندەیی بەرێزتاندا بەدی دەکرێت کەلەبەرامبەر پاشای ئێمەدا کردتان) ناپلیۆن هاردنبرگی بەخشی ورێگای بەفردریك ویلهلمدا ناوبراو بەسەرۆك وەزیران دابنێت، ئەم ڕووداوەلە(5/ی یۆنیۆی ساڵی (1810)دا ڕوویدا، لە(7/ی یۆنیۆ)دا، سەرۆك وەزیرانی تازەی پروس نامەیەکی لەمجۆرەی

235 - مەبەست لەناپلیۆنە کەنوێنەرایەتی گەل وخاکی فەرەنسای دەکرد.



خوارەوەی بۆ ناپلیۆن نوۆسی: بەڕێز بەدڵنیاییەوە بەوەی پروس جگەلەپەیڕەوکردنی شەرەفمەندانەی ڕەوشی ئێوە ناتوانرێت هەموو خاکەکەی بپارێزرێت و بیخاتەوە بەختیاری.. وەبەگرتنەبەرچاوی ئەوەی من گیانفیدایی وشانازی لەوەبالاترم نییە کەببمە جێگای ڕەزامەندی تۆ، بەوپەڕی ڕێزەوەحەزدەکەم بەردەوام ملکەچ وفەرمانکێش ونۆکەری بەڕێزتانبم.

بارون هاردنبرگ– سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی پاشایەتی پروس..)

باج لەکاتی خۆیدا دەدەرا، گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا بەتوندی جێبەجێکرا. پاشای پروس لەترساندا لەرزی گرتبوو لەبەردەم ناپلیۆندا لێوەلەرزەی لێهاتبوو، هاردنبرگ کلکەسوتەو مەرایی دەکردن وخۆی بەسوك وسەلیم نیشاندەدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناپلیۆن سەربازەکانی لەناو قەڵاتە سەربازییەکانی خاکی پروسدا لانەدەبردن وهیچ جۆرە بەڵێنێکی ئومێدبەخشی نەدەدان. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەیرنییەکە ناپلیۆن لەکاتی خۆئامادەکردنی بۆشەڕی ڕوسیا داوای یارمەتی سەربازی لەپروس کرد. سەرەتا پروس کەمێ خۆی گێلکرد، بەڵام بەیەك زەبرلێدانی ئیمپراتۆر یەکسەرە ملکەچ وسەر لەڕێگا بۆوە. ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەمجۆرەبوو: ناپلیۆن لە(14/ ی تۆڤەمبەری ساڵی (1811)دا فەرمانی بەمارشال داوو کرد، هەرکە ئاماژەی پێدا هێرشبکاتەسەر حکومەتی پروس وئەو وڵاتە داگیربکات.

لە(24/ی فبرایەری ساڵی 1812)دا بەڵێن نامەیەك لەپاریسدا مۆرکرا کەبەپێی ئەو بەڵێندارییە دەبوا ناپلیۆن هەرشەڕێکی کردبا–یان هاتباپێش دەوڵەتی پروس لایەنگیری ئەوبکات. ناپلیۆن دوای یەکلایکردنەوەی پروس یەکسەرە ڕوویکردە نەمسا، لەمەشیاندا زۆر زەحمەتی نەکێشاو سەرکەوتوو بوو. دەوڵەتی نەمسا دوای شەڕی ڤاگرام وئاشتی کردنەوەی شونبرون تەواو پەشۆکاوبوو. دوای بەهاوسەربوونی ناپلیۆن لەگەڵ کچی ئیمپراتۆری نەمسادا، مترنیخ وهەموو سیاسەتمەدارە دیارەکانیتر بەرژەوەندی نەمسایان لەوەدا دەدی پەیڕەوی سیاسەتەکانی ناپلیۆن بکەن، پێیانوابوو بەم ڕەوشەیان دەتوانن ئەو ولایەتە دابراوانەی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی نەمساوی بگێڕنەوەژێر ڕکێفی خۆیان، ناپلیۆن دەیتوانی لەهەموو لایەکەوە هێرش بکاتەسەر نەمسا، چونکە وڵاتانی ژێردەستی خۆیی وسەربە خۆییەکانی چواردەوری نەمسایان گرتبوو. ترس ولەرزی دەوڵەتی نەمسا لەزاوا تازەکەیان باڵی بەسەرداکێشابوون. ناپلیۆن دەیویست نەمساش وەك پروس ببێتە کۆیلەی فەرمانەکانی خۆی.

کاتێ لەساڵی(1811)دا شاژن لویز کوڕێکی بوو کەدەبووە جێگرەوەی باوکی، واتە: ناپلیۆن، لەڤێننادا بەوبۆنەوە ئاهەنگ گێڕدراو بۆئەو کوڕە وێنەیەکی نابەجێیان کێشابوو، ئەویش ئەوەبوو: شێوەی مریەمی پاکیزەیان بەسەروچاوی ماری لویز دروستکردبوو کەکوڕەکەی عیسای لەسەر شێوەو ئاکاری پاشایەکی لاوی ڕۆمی لەباوەشکردبوو ولەپشت سەریشییەوە خوا ساباۆتیان [٣٢٦] دروستکردبوو کەلەحاڵەتی فریندابوو بەنێوان هەوراندا و خوای ناوبراویشیان لەسەر شێوەو ئاکاری ناپلیۆن دروستکردبوو.

بەکورتی ئەم کردەوە دزێو وسوکەڵەیە، هەرچەندە شتێکی بێماناو نالەباربوو بۆ دووپاتکردنەوەی دەربڕینی وەفاداری لەبەرامبەر ئەو پاریسییەدا لەخۆرا نەبوو، هۆشوو بیری سیاسەتمەدارانی وەك مترنیخ کەئەمیان پێشەنگیان بوو، دەیانگوت:



سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن زۆر نامێنێتەوەو درێژە ناکێشێت، بەڵام لەساڵی (1812)دا باشترین سیاسەتمەداریان پێیانوابوو کەوتنەشەڕ لەگەڵ ناپلیۆندا کارێکی باش نییەو هەڵوەدایی لەدوایە.

بریتانیا هەر لەحاڵەتی جەنگدابوو لەگەڵ فەرەنسادا، بەڵام زۆرکات هەواڵی مایەپوچی وبێکاری وسەرهەڵدانی شۆڕشی هەرەشە ئامێزو.. هیتر، لەوێوە دەگەیشتن. بەگشتی ئەمەش ئەوەی نیشاندەدا دورگە ژێر دەستەکانی بریتانیا لەژێر فشاری ئابووریدا وردەوردە بەرەو ئەهامەتی دەچنەوە. بەگەیشتنی سوپای فەرەنسا بۆهەر ناوچەیەکی ئیسپانیا شوان و ڕەشو ڕووتەکانی ئەو هەرێمانە لەگەڵ سەربازەکانی داگیرکەردا دەستیان وەشاخ دەداو دەکەوتنەشەر، بەڵام دەوڵەتی نەمسا نەیدەویست شەڕی ئاوابکات ونەشی دەتوانی. سەبارەت بەڕوسیاش بەڕووکەش زۆر لەناپلیۆن بێ تواناتربوو، ئەودەوڵەتە لەتیلیستیشدا خیانەتی بەپروس کرد، ئێستاش ناچارە بەچاوپۆشی لەسەرئەنجامی ئەم کارەی هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ ناپلیۆندا بڕوات، بۆیەش کاتێ پروس لەمانگی فبرایەری ساڵی (1812)دا ناچاربوو هاوپەیمانیەتی لەگەڵ ناپلیۆندا ببەستێت، داوای لەئیمپراتۆریەتی نەمساش کرد بێتەگەڵ ئەم هاوپەیمانیەتییەو دەسەڵاتدارانی نەمساش بێ چەندوچوون بەو داواکاریەی ناپلیۆن ڕازیبوون.

لە(14/ی مارسی ساڵی (1811)دا پەیماننامەیەك لەنێوان فەرەنساو نەمسا لەپاریس مۆرکرا کەبەپێی ئەوپەیماننامەیە نەمسا دەبوا(30) هەزار سەربازی خۆی بخاتەژێر فەرمانی ناپلیۆن، هەروەها ئیمپراتۆری نەمسا بەڵێنی دابوو ولایەتەکانی مولداڤیاو والاشی کەڕوسیا داگیری کردبوون لەئیمپراتۆریەتی ڕوسیا بستێنێتەوە، ناپلیۆنش دەبوا ولایەتی گالیسی وەك پاداشت بداتە شانشینی نەمسا.

مەبەستی ناپلیۆن بەو هاوپەیمانییە لەگەڵ پروس ونەمسادا لەبەر خاتری بەهێزکردنی سوپای فەرەنسا نەبوو، بەڵکو بۆسەرقاڵکردنی بەشێك لەسوپای ڕوسیابوو لەبەشی سەروو وخوارووی (کوڤنو و یلناو ڤیتیسك) هەروەها (ئاسولنسك و مۆسکۆ) کەئامانجی سەرەکی ئەوبوون، (واتە: مۆسکۆ وئاسمولنسك) بۆ ئەم لەشکرکێشییە مەزنە دەبوا پروس (20) هەزار و نەمساش (30) هەزار سەربازیان خستباژێر فەرمانی ناپلیۆن، هەروەها پروس (20) هەزار تەن جۆ ڕەشکەو (40) هەزار تەن گەنم و زیاتر لە(40 ) هەزار سەر ماڵات و(70) ملیۆن بتڵ عەرەق بۆ سوپای فەرەنسا دابین بکات.

خۆسازدان بۆشەر لەسەرتای بەهاردا تەواو ببوو، وەك دەزانین بەروبوونی کشتوکاڵی بەگشتی ودانەوێڵە ئەوساڵە لەفەرنسادا خراپ وەبەرهاتبوو و وشکەساڵی بوو، ئەمەش گرانی لەگەڵخۆیدا هێنابوو وگومانی ئەوەشدەکرا کاربکاتەسەر هەموو گەلی فەرەنسا.

ئەمە بووەهۆی بەدواخستنی هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی ناپلیۆن بۆسەر ڕوسیا، بۆماوەی (2) مانگ، ئاڵوویر و گرانکردنی دانەوێڵە لەلایەن بازرگانەکان و عەمبارکردنی بووەهۆی شێوە ترسێك لەگرانی.

مارکس لەکتێبی بنەماڵەی پیرۆزدا ئاماژە بەمە دەکات و بەڕاستی باش شیکاری کردووە، ئەوکارو پیشەی قۆرخدانی دانەوێڵەو بەروبومە کشتوکاڵییەکان لەلایەن وردە بڕۆازییەکانی فەرنساوە، بووە هۆکاری ئەوەی هێرشکردنەسەر ڕوسیا بۆ (2) مانگ دوابکەوێت ونەمەش ببێتەهۆی سەرەتای لەبارچوون و لەکورتهێنانی ئیمپراتۆری فەرنسا.



پێویسته ئەوەشمان بیرنەچێت بەسەربازیگرتن لەماوەی شەش ساڵی دواییدا (دوای شەڕی ئوسترلیتز) بەناخۆشی بەئەنجام دەگەێندرا، ئەم جارەیان لەساڵی (1811)و سەرەتای ساڵی (1812) کەرەمسۆیی و فەرمان جێبەجێنەکردنی زۆر سەری هەڵدابوو لەلایەن خەڵکەوە، ئەوکەسانەی کەبەسەربازگیرابوون دەچوون بۆشەڕەکان، بەلام شەڕیان نەدەکردوو خۆیاندەشاردەوەو دەچوونە ناو دارستانەکان. گرفتەکانی ئابووری کەبەهۆی شەڕە بەردەوامەکان هاتبۆئارا، بەتایبەت شەڕە بێ کۆتاییەکانی دژبە شۆڕشگێڕە ئیسپانیاییەکان.

هەروەها ئەو باج وسەرانەی کەدەبوا گوندنشینەکان بیاندابا ببوە فشارێکی گران، گوندنشینە خاوەن زەوی و زارەکان وردەوردە ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕی لەوەی ئەو هەموو کرێکارە کرێ هەرزانانەیان بۆ سەربازی گرتوون وئەمانەیان لەکەڵك وەرگرتن لەکرێی کاری ئەوان بێبەشکردووە.

ناپلیۆن ناچاربوو مەفرەزەی سەربازی بنێرێتەناو ئەو جەنگەڵ وکێوانەی کەسەربازە تازە هەڵاتووەکان دەستگیربکەنەوەو بیانهێننەوە بەزۆر خزمەتی سەربازیان پێبکەن، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا، گرتنی سەربازی تازە ئەوەی ناپلیۆن مەزەندەی کردبوو پێش دەستپێکردنی شەڕی(1812) ئامادەکرابوون.

لەکۆتایی بەهاری ساڵی(1812)دا خۆسازکردنی سەربازی و سیاسی بۆ هێرشکردنەسەر ڕوسیا کەوتبۆ ئامادەسازی تەواوەوە، هەموو ئەورووپای [237] ژێر دەسەلاتی ناپلیۆن ئامادەبوو بۆشەڕکردن لەگەڵ ڕوسیادا بکەوێتەجووڵە، ناپلیۆن بڕیاریدابوو خاکی ئیسپانیا دابەشبکات، ئەوەبوو لەساڵی(1811)دا ولایەتی پڕ پیت و دەوڵەمەندی کاتالونی، کەسنعەتیترین ولایەتی ئیسپانیابوو، لەدەستی براکەی جۆزێف کەبەپاشای ئیسپانیای دانابوو دەرهێناو خستیەسەر خاکی فەرەنساو بەسەر چوار ولایەتی بچوکیدا دابەشکرد. بەم کارەی ناپلیۆن دەیویست سزای شۆڕشگێڕەکانی ئیسپانیا بدات، بەلام ئەم شۆڕشە هەم لەناو ولایەتی کاتالونی کەخرابۆسەر خاکی فەرەنساو هەم لەسەر خاکی ئیسپانیا کەبەناو سەربەخۆبوو وسوپای مەزن داگیری کردبوو، درێژەی بەشۆڕشکردنەکەیدا.

مارشالە لەپێشەکانی ناپلیۆن کەسانی وەك سوو و مارمون و سوشە، بەخۆیان ولەشکرێکی گەورەوە لەئیسپانیادا مابوونەوە. بەبۆچوونی ناپلیۆن ئەولەشکرە بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی پارتیزانەکانی ئیسپانیاو لەشکری بریتانیا کەلەژێر فەمرماندەیی ولینگتن دابوو ولەو شێوە دورگەیەدا شەڕیان دەکرد، بەس بوو.

بریتانیاییەکان لەپشت مەتەرێزەکانی خۆیانەوە لەبۆسەدابوون، بەلام لەوەنەدەچوو لەلایەنی ئەوەوە مەترسی بۆسەر ئیمپراتۆری فەرەنسا دروستببێت، چونکە جگەلەوەی بارودۆخی ناو بریتانیا نالەباربوو وقەیرانی بێکاری وفشارەکانی گەمارۆی ئابووری وپەیدابوونی کارخانەی گەورەی پیشەسازی تازە کەدەهاتنە شوێنە پیشەسازییەکان وکرێکارانی زیاتر لەسەر کارەکانیان لادەبرد. ناپلیۆن لەگرتنەبەری سیاسەتێکی ژیرانە بەوەی چەند ئیمتیازێکی بازرگانی دایە ئەمریکاییەکان، ئەمە بووەهۆی ئەوەی شەڕی نێوان بریتانیاو ئەمریکا هەڵایسێ، ئەم شەڕە لە(15/ی یۆنیۆی ساڵی(1812)،(9) ڕۆژ پێش گەیشتنی ناپلیۆن بۆسەر خاکی ڕوسیا، لەلایەن سەرۆك کۆماری ئەمریکاوە ڕاگەیندرا.

---

[237] - مەبەست لەفەرمانڕەوایانی ژێر دەسەلاتی ناپلیۆنە کەلەمیرنشین وپاشای دەوڵەتی بەناو سەربەخۆ وئیمپراتۆریەتی فەرنسابوو.

بێ گومان شەڕی نێوان بریتانیاو ئەمریکا بووەهۆی ئەوەی بریتانیا شەڕکردنی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی فەرەنسادا لاوازتربکات.

نیتر ناپلیۆن بەناسودەبوون لەمەترسییەکانی پشتییەوە بەرەو ڕوسیا کەوتە پێشڕەوی، لەم کاتەدا ناپلیۆن هێزێکی سەربازی ئەوەندە زۆری لەبەردەستدابوو پێشینەی نەبوو، جگەلەمەش دوژمنێکی لەپێشەوەبوو کەچەندین جار لەشەڕەکاندا تێکیشکاندبوو.

سیاسەتمەداران وێنای کارەساتیان دەکرد، بەڵام زۆرینەی ئەو سیاسەتمەدارانەی وەك مترنیخ وهاردبنرگ جۆزێف ودومستر، لەم بڕوایەدابوون ئەوکارەساتە شومە بەسەر ڕوسیادێت، تۆفانی تێشکان ومالوێرانی وابەسەر ڕوسیادادێت کەلەمێژووی ڕوسیادا هەرلەڕۆژگاری هێرشی دڕندانەی تاتارییەکان بەدواوە بەسەری نەهاتبێ.

سوپای فەرەنسا نزیکەی نیو ملیۆن بوو، دیارە ئەو (50) هەزار سەربازەی کەنەمساو پروس قەولیاندابوو بیخەنەژێر دەسەلاتی ناپلیۆن لەگەڵ ئەو ژمارەیەی سەرەوەدا هەژمارنەکراوە.

لەو ژمارەیەی سەرەوە نزیکەی (200) هەزار سەرباز هی دەوڵەتە ژێردەستەکانی ئیتالیاو رایلری و وستفالی و باویرو ورتمبرگ و بادو ساکس وهاوپەیمانیەتی رن و دوك نشینی گەورەو وارشۆ، بوون. هەروەها نزیکەی (90) هەزار سەربازی پۆلۆنیش لەسوپای مەزندا خزمەتیان دەکرد. جێگای خۆیەتی ئەمەش وەبیر بهێنینەوە کەبەلجیکاو هۆڵەنداو شارەکانی هاوپەیمانیەتی بازرگانی هانزە ئاتیك، بەشێکبوون لەخاکی فەرەنسا بۆیە ناومان نەبردوون. (ورد) ژنراڵێکی باوێری بوو، غیرەتی ئەوەی هێنا لەناپلیۆن بپرسێت، ئایا لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا باشتروانییە واز لەشەڕی ڕوسیا بهێنین؟ بەڵام ئیمپراتۆر لەوەڵامدا گوتی:(من هەتا سێ ساڵی تر دەبمە خاوەنی هەموو دنیا)

## (3)

لەکاتژمێر(6)ی سەرلەبەیانی (9/ی مایۆی ساڵی (1812)دا ناپلیۆن لەگەڵ شاژن ماری لویز لەکۆشکی سن کلو هاتەدەرێ، هەتا بچێتەگەل سوپاکەی کەزۆرینەی لەدەم ڕووباری ڤیستول جێگیربوو، ڕۆژی شازدەهەمی هەمان مانگ ئیمپراتۆر بەهاوەڵی پاشای ساکس لەڕۆژی پێشتر بەپەلە بەپیریەوە چوبوو گەیشتە درسد، هەموو پاشاو میرەکان لەپایتەختی ساکسدا کۆببونەوە هەتا ڕێزو دڵسۆزی بۆگەورەکەی خۆیان دەربڕن. لەناو ئەمانەدا فردریك ویلهلمی سێیەمیش بەدیدەکرا، فرانسوای ئیمپراتۆری نەمساش لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هاتبوون.

ناپلیۆن بۆماوەی پازدە ڕۆژ لەدرسدا مایەوەو هەموو ئەو پاشا میرانەی دەوروبەری گوێیان لەفەرمایشتەکانی ئەو دەگرت، هەموو ئەو پاشاو میرانە لەوکاتەی ناپلیۆن لەوێدابا کڵاوەکانیان [238] لەسەرسەریان لادەبرد، تەنانەت خەزوریشی [239] تەنها ناپلیۆن ئەوکڵاوە بچوکەی خۆی لەسەردا دەمایەوە، بەگشتی ناپلیۆن لەگەڵ هەمووان بەگفت ولفتبوو وهەندێکجار بەسەرزەنشت کردنی یەك دوانێکیان و ڕێنمایی کردنیان دڵخۆشی دەکردن ولەگەڵیاندا ڕوخۆشبوو، لەوکاتانەدا ئەمانە

---

238 - دیارە مەبەستی تاجی پاشایەتیە(و- کوردی).

239 - واتە: ئیمپراتۆری نەمسا (و- کوردی).



لەخۆشیاندا تریان لەخۆ چووبوو- یان هەندێك بەگاڵتە سەری بەسەریانەوە[240] دەنا- یان لەپەدەستی بەهێواشی لەپشت دەدان. ئیتر مەرایی و پێهەڵاگوتن و زیادپێوەنانی ئەمانە لەڕادەبەدەربوو، تەنانەت یەکێ لەوپاشایانە تەواو پێی لێهەڵگرت و پلەوپایەی خوایی دایە پاڵ ئیمپراتۆری فەرەنسا.

ناپلیۆن بەچاوی دەستوپێوەندی سەیری هەموو ئەو تاجدارو لێپرسراوانەی دەکرد کەلەدەوریدابوون و دەیزانی ئەمانە بەڕۆح لێی دەترسێن.

هەرچەندە ئەو باوەڕی بەڕاستگۆیی هیچ یەك لەمانە نەبوو، بەڵام بەهەڵسوکەوتی ئەمانە لەکۆشکی دروسدا هەرنەبا ئەوەی نیشاندەدا کەهەموو ئەمانە دڵنیان لەشەڕی دژ بەڕوسیایدا سەرکەوتوو دەبێت و ئەمەش شتێی دڵخۆشکەرەبوو، ئەم بۆچوونە لەهەموو شوێنێدا هەبوو کەناوبراو سەرکەوتوو دەبێت، تەنها بریتانیابوو کەبێنەوەی گوێ بەسوپای مەزن کەژمارەی (600) هەزاربوو چاوەڕوانی کاتی دەکردوو لەگۆشەنیگای وەرسوڕانی ڕۆژگارەوە دەیڕوانی، گوندنشین و شڕە پۆشەکانی ئیسپانیایی بەهەمان گوڕوتینی جارانیان دەجەنگان، ئەوکاتەی ئەو جەنگاوەرە دەستگیرکراوانەشیان بەدەستی بەستراو بۆ مەیدانی گوللەبارانکردن دەبردن، تفیان لەڕووی ئەفسەرەکانی ناپلیۆن دەکردو بەدلێرانەش لەبەردەم مەرگدا دەوەستان. تەنها ئیسپانیا و بریتانیابوون کە نوێنەری مەرایکەرو کلەسوتەکەریان لەبەزموڕەزمەکانی کۆشکی درسد دانەبوون[241]، هەموو دنیا لەو باوەڕەدابوو ناپلیۆن لەو شەڕەیدا بەسەر ڕوسیادا سەردەکەوێت.

سوپایەك بەو مەزنیەی خۆیەوە تیپ تیپ بەرەو شەڕێکی گەورە دەڕۆیشتن و سەرکردەیەکی لێوەشاوەی کارامەی وەك ناپلیۆنیش سەرافەتیکەریان بوو کەلەڕووی سوپاسالاری و ئەزمونی سەربازی سەرکردەییەوە لەئەلکسەندەری ماکادۆنی و ئانیباڵ و قەیسەری تێپەڕاندبوو، هەتا ساڵی (1812) چەند سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنابوون کەهیچ یەك لەوسەردارە مێژووییانەی ناومان بردن، ئەمەیان بەدەست نەهێناوە. هاوپەیمانییەتی کردنی ناپلیۆن لەگەڵ نەمساو پروسدا وورەی سوپاکەی ئەوی بەرزکردبۆوەو ترسی پشتیانی نەهێشتبوو. ڕوسیا سێ یەکی سوپای فەرەنسای ئامادەکردبوو وخەریکی جێگیرکردنی بوو لەبەرەکانی شەڕداو فەرماندە سەربازییەکانیشی ئەوانەبوون کەپێشتر چەند جارێك لەبەرامبەر سوپای فەرەنسادا تێکشکابوون. ناپلیۆن بۆخۆشی لەو بڕوایەدابوو ڕوسیا جگەلە شازادە بارگاتیون، هیچ فەرماندەیەکی سەربازی تری نییە، تەنانەت هەموو ئەورووپاش هەمان بۆ چوونیان هەبوو، بۆچوونەکانی ناپلیۆن لەوکاتانەدا گۆڕانکاریان بەسەرداهاتبوو وتەواو نەیاندەپێکا. ئەو لەئاسمولنسکدا شتێکی دەگوت وبەبینینی سوتانی مۆسکۆ لەپەنجەرەکانی کۆشکی کریملینیشەوە شتێکی تری دەگوت، لەکاتی پاشەکشە کردنیشدا شتێکی تر، بەڵام لەسەرەتای لەشکرکێشییەکەیدا لەوکاتەی لەدرسدەوە بەڕووباری نیمندا دەپەڕییەوە بیرۆکەی خەونێکی شیرینی بەخەیاڵدا دەهاتنەوە، ئەویش داگیرکردنی هندستان بوو، دەکەوتەوە نەخشەی ئەو یادانەی کەلەبەرواری(20/ی مایۆی ساڵی (1799)دا گەمارۆی عەکای دابوو ویەناچاری سوریای جێهێشت وگەڕایەوە میسر. لەو

---

[240] - مەبەست لەوەیە جوڵەیەکی گاڵەجوڵان هەیە کەوەك گاڵەشکێنە دەکرێت و زیاتر لەجوڵەی لاسایکردنەوی بەران دەچێت- یان بەکاڵە پاڵپێوەنان لەکاڵەسەرێکیت،ر ئەمە زیاتر بەگاڵتە دەکرێت ومانا شاراوەکەشی ئەوەیە دەتبەزێنم و ملکەچ بە.(و- کوردی).

[241] - لێرەدا نووسەر لەگەڵ ناوی بریتانیادا هێناوە، دیارە مەبەستی لەحکومەتی ئیسپانیانیە، بەڵکو گەلی ئیسپانیایە.(و- کوردی).

شوێنەی کەئەسکەندەری ماکادۆنی خۆگەیاندبۆ دورترین شوێن، واتە: ڕووباری گنگ لەهندستاندا، بۆ چ ئەم ناتوانێت دەستی بکاتە ئەوشوێنە؟

ئەم بیرۆکانەی لەسەردابوون و ناپلیۆن لەگەڵ یەکێك لەبرواپێکراوە نزیکەکانی خۆی بەناوی نارین باسی دەکرد. کاتێ مۆسکۆ کەوتە ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆن ئەگەر ڕوسیا تەواو تێکبشکێت وتزار داوای ئاشتی بکات– یان بەهۆی کودەتایەك ئیمپراتۆری ڕوسیا لەناوبچێت، ئەوکاتە کێ ڕێگردەبوو لەبەردەم ناپلیۆندا خۆی بگەیەنێتە ڕووباری گنگ؟

هەرئەوەندە بەس بوو شمشێری سوپای فەرەنسا بگاتە ڕووباری ناوبراو ئیتر بنچینەی حکومەتی کۆلۆنیالی بریتانیا نەدەماو لەناودەچوو، بەپێی نەخشەکانی کلێشەی ناپلیۆن دەبوا سوریاو میسر داگیرکرابان و ببونا پێگەیەك بۆ هێرشکردنەسەر هندستان، جێگای سەرنجە لێرەدا ئامازەش بەوەبکەین کەهەمان کنت دو نارینەی ناپلیۆن هەموو شتێکی خۆی لاباسدەکردو جێگای متمتنەی بوو ونەخشەکانی خۆی دوای سەرکەوتنی بەسەر ڕوسیادا بۆ باسدەکرد، لەلایەن ئیمپراتۆری فەرنساوە نێردرا بۆلای ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا کەئەوکات لەڤیلنابوو، بۆئەوەی دواین هەوڵی ئاشتی کردن پێشنیاری تزار بکات، نابرن دەیزانی ئەم هەوڵەی بێ هودەبیەو کەڵکی نییەو تەنها بۆ دواخستنی ئەگەری هێرشکردنی سوپای ڕوسیایە بۆسەر ڤێننا.

ئەو ماموریەتییەی ناوبراو بێ ئاکامبوو، چونکە ناپلیۆن بڕیاری لەشکرکێشی دابوو وسوپا (400) [242] هەزار سەربازییەکەی ئەو لەسەر خاکی پرۆسەوە بەرەو نیمن لەحاڵەتی ئامادەباشیدابوون و تەنها چاوەڕوانی فەرمانیان دەکرد تابچنە ناو خاکی ڕوسیاوە. ناپلیۆن لەدرسدەوە بەرەو پزنان چوو وچەند ڕۆژێکی لەوێدا بەسەربرد، ئەشرافەکانی پۆلۆنیا بەوپەڕی شادییەوە پێشوازیان لێکرد، چونکە ئومێدی ئەوەیان هەبوو سەربەخۆیی تەواوی خاکی پۆلۆنیای پێشوو بەدەستبهێننەوە– یان بەلانی کەمەوە لیتوانیاو بلاروسیا لەچنگ ڕوسیا دەربهێندرێتەوەو بخرێتەسەر خاکی پۆلۆنیای ئێستا، بەپلەی دووەمیش بۆئەوەبوو هیچیتر ناپلیۆن زەوییەکان دابەشنەکاتەوە بەبەرژەوەندی جوتیارەکان.

بەڵام ئیمپراتور کەزۆر بێئارام و تورەبوو وتەواو سەرگەرمی جەنگبوو، نەیتوانی لەو ئەشرافە شیکپۆش ونارایشتکراوانە ڕازیبێت، بۆیە کاتێ ئەو ئەشرافانە بەسەرۆکایەتی کورزڤسکی پاپای ئەسقەفی لە(28/ یۆنیۆ)دا هاتنەلای ناپلیۆن پێی گوتن: وامزانی ئێوە پۆستاڵی سەربازیتان لەپێ کردووەو ئامادەی شەڕکردنن و دەستتان لەسەردەسکی شمشێرەکانتانە وەك چۆن باپیرانتان لەکاتی هێرشکردنی تاتارییەکان و کازاخستانییەکاندا کردوویانە، چونکە ئێمە لەڕۆژگارێکدا دەژین پێویستە هەمیشە دەستمان لەسەر دەسکی شمشێرەکانمانبێت).

ناپلیۆن هیچ کاتێ لەکاتی شەڕدا گوێی بەئەزاکەت و ... نەداوە، ناپلیۆن لەپزنانەوە چووبۆ تورن ولەوێشەوە ڕۆیی بۆ دانتزیگ و چوار ڕۆژ لەوشارەدامایەوەو خەریکی ڕێکخستنی سەربازی بوو، ئینجا لەدانتزیگەوە چوو بۆ کونیکسبرگ وپێنج ڕۆژیش لەوێدامایەوەو کاتەکانی خۆی بەدەستەبەرکردنی خۆراك بۆسەربازەکانی بەسەربرد. لەڕۆژی(20/ی یۆنیۆ)دا گەیشتە گومبنی نن و(22/ی مانگیش خۆی گەیاندە لیتوانیاو لەشاری ڤیلکوفیسدا پەیامە بەناوبانگەکەی خۆی بۆ سوپاکەی بەمجۆرە دەرکرد: (سەربازەکان، شەڕی دووەمی پۆلۆنیا دەستی پێکردەوە، شەڕی یەکەم لەفریندلندو تیلیست دا کۆتایی پێهات، ڕوسیا سوێندی

---

242 - لەمەوبەر گوتمان کۆی گشتی سوپای فەرەنسا (600) هەزار سەربازە، لێرەشدا نووسراوە (400) هەزار سەرباز، دیارە مەبەست لەوەیە ئەو ژمارەی دووەم بۆ هێرشکردنەسەر خاکی ڕوسیا سازکراون، جگەلەو سوپایەی کە(200) هەزار سەربازی ترن و لەناو ئیمپراتۆریەکەی ناپلۆندایە.(و-کوردی).



خواردبوو هاوپەیمانی هەمیشەیی فەرەنسابێت و شەڕ لەدژی بریتانیا ڕابگەیەنێت، بەڵام ئەمڕۆ بەپێچەوانەوە دەجوڵێتەوەو هیچ پاساوێکیشی بۆئەم هەڵسوکەوتەی نییە، جگەلەوەی بۆ هەڵۆکانی فەرەنسی تانەوبەری ڕووباری ڕن پاشەکشەیانکرد، هاوپەیمانی فەرەنسا بەئەمانەتەوە ئەویان ڕزگارنەکرد، چارەڕەشی دامێنی ڕوسیای گرتوەو دەبێ چارەنوسی ئەو دیاری بکرێت، ئایا ڕوسەکان وێنای ئەوەدەکەن ئێمە هەرەسمان هێناوە؟ بۆ ئێمە هەمان سەربازەکانی شەڕی ئوسترلیتز نین؟ ڕوسیا ئێمە سەرپشککردووە کەلەنەنگی وشەڕ یەکێکیان هەڵبژێرین و گومانیش لەوەنییە ئێمە کامەیان هەڵدەبژێرین، کەواتە دەبێ بەرەوپێشبچین، لەڕووباری نیمن بپەڕنەوەو لەسەرخاکی ڕوسیادا بکەوینەشەڕ، شەڕی دووەمی پۆڵۆنیا شانازییە بۆ سوپای فەرەنسا، بەڵام ئەو ئاشتییەی دەکرێت، یەکلایکەرەوە دەبێت ونێتر نفوزی ڕوسیا کە(50) ساڵە دەست لەکاروبارەکانی ئەوروپا وەردەدات کۆتایی دێت) ئەو پەیامەی ناپلیۆن وەك ڕاگەیاندنی شەڕوابوو، دوو ڕۆژ دوای ئەمە لەشەوی(24/ی یۆنیۆی ساڵی (1812)دا، ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد سوپا لەڕووباری نیمن بپەڕێتەوە، (300) سواری سەربازی کەلەلەشکری سێزدەی پۆلۆنی بوون، یەکەمین سەربازبوون لەو ڕووبارە پەڕینەوە، ڕۆژانی دواتر سوپای بێ کۆتایی کەوتە پەڕینەوە، لە(24/ی ئەو مانگەدا هەموو سوپای ئیمپراتۆری فەرنسا پەڕیەوەو لەبەر ڕووبارەکە لەو دەشتاییە پانوبەرینەدا نەك هەر شەڕکەر تەنانەت ڕۆح لەبەرێکیان نەبینی، یەکێك لەو سەربازانەی کەدوای ئەو شەڕە بەزیندویی گیانی دەربردوو ئاوای دەگێڕێتەوە،(پێشمانەوە بیابانبوو خاکێکی ڕەنگ قاوەیی داپۆشراو بەگیایەکی زەرد باروی چڕ، لەئاسۆوە هەتا چاو تەتەری دەکرد دارستانبوو وئەم دیمەنەش ئیقبالێکی شومی دەگەیاند، بەڵام ناپلیۆن سەیری ئەم نیشانانەی نەدەکردو گوێی بەمەیمەنەتی خراپنەدەدا، چونکە لەحاڵەتی شەڕدابوو چوست و چالاك و دڵشادتر دەهاتەبەرچاو، ئێستا گەورەترین شەڕی لەپێشدایە وتەواوی کاتەکانی خۆی بۆئامادەکاری و ڕێکخستنی سوپاکەی تەرخانکردبوو، دوور نەبوو ئەمە دواین شەڕی ئەورووپاو یەکەم شەڕی ئاسیایی ئەوبێت، هەروەها ئەگەری ئەوەش هەبوو ناچاربێ ئەوساڵە شەڕەکە لەئاسمولنسکدا ڕاگرێت و شەڕی پیترسبورگ و موسکۆش بۆ ساڵی داهاتوو دابنێت، ناپلیۆن خۆشی پێشبینی ئەمەی کردبوو ولەگەڵ ناریندا باسی هندستان و کنگی دەکردو لەگەڵ مارشالەکانیشیدا باسی هۆردووی زستانەی دەکرد، لەئاسمولنسکدا ئەوکاتەی ناپلیۆن لەگەڵ مارشالەکان و کەسانی دەوروبەریدا بەسواری ئەسپەکەی بەدوای سەربازە ئەسپ سوارەکانی مارشال موڕادا دەڕۆیشت، بێئەوەی توشی هیچ تەنانەت شەڕێکی بچوکیش ببنەوە ڕاستەوخۆ بەرەو ڤیلنا دەڕۆیشتن.



# هێرشی ناپلیۆن بۆسەر ڕوسیا (1812)

## (1)

ناپلیۆن لەشەڕە یەك لەدوای یەکەکانی خۆیدا پشتی بەدوو بنەما بەستبوو،

یەکەم: کەسایەتی فەرماندەی سەربازی دوژمن.

دووەم: ئامادەباشی و پەرداخی دوژمن لەڕووی چۆنیایەتییەوە.

پێش هەموو شتێکیش تێبینی ئەم دوولایەنەی دەکرد کە: ئایا فەرماندەی گشتی سوپای دوژمن کەسێکی بەتوانایە؟ ئایا ئازادی ڕەهای هەیە لەکارو بڕیارە سەربازییەکاندا؟ وەك بڵێی ناپلیۆن لەم دوو مەسەلانەدا دەیتوانی وەلامدەرەوەی خۆی بێت و قەناعەت بکات، ڕوسەکان تەنها یەك ژنرالی لێوەشاوەیان هەبوو ئەویش باگراتیون بوو، بەلام ئەویان[243] هەر خەریکی کاری سەربازی هیچ و لاوەکی دەکرد.

فەرماندەیەکی سەربازی تریشیان هەبوو واتە بنیگسن و ئەم کەنەیدەتوانی شان لەشانی باگراتیون بدات وناپلیۆن نازناوی نالێوەشاوەیی لێنابوو.

بەمجۆرە ناپلیۆن گومانی لەکارامەیی باگراتیون نەبوو چونکە لەشەڕەکەی ئایلودا تەڕدەستی وبەتوانایی خۆی نیشاندابوو، سەبارەت بەکوتوزووفیش ناپلیۆن ئەو فەرماندە سەربازییە ڕوسەشی لەشەڕی ئوسترلیتزدا تێکشکاندبوو، بەلام هیچ کاتێ بەچاوی کینەلەدڵی سەیری نەدەکردو بەفەرماندەیەکی فێڵبازو خۆپارێز دەزانی، بەلام ئیتر کوتوزووف فەرماندەیی بالای سوپا نەبوو ولادرابوو، سەبارەت بەبارکلی دوتولی، فەرماندەی گشتی سوپای ڕوسیاو وەزیری بەرگری، ناپلیۆن هیچ بەلگەو زانیاری وردی لەسەر ئەوانە نەبوو بۆیە ئەمیشی هەروەك ژنرالەکانی تری هیچ لەباراندانەبووی سوپای ڕوسی سەیردەکردو ئەمەش ببووە جێگای دڵخۆشی لای ناپلیۆن، لەناو سوپای ڕوسیادا ستادی گشتی فەرماندەیی نەبوو وئەلکسەندەر ڕاستەوخۆ لێپرسراوی گشتی سوپابوو ودەستی لەهەموو کاروبارەکان وەردەدا.

ناپلیۆن لەگەڵ پێشڕەوی کردنی بەرەو ڤیلناو لەوێدل پێیان ڕاگەیاند ئیمپراتۆری ڕوسیا بۆدواجار بالاشفی ناردووە هەتا پێشنیاری ئاشتی بکات، ناپلیۆن بەگاڵتەجاڕیەوە گوتی:(ئەوانە چی دەکەن؟ پۆل پێشنیاری ئاشتی دەکات، بەلام ئارمفلد دژی ئەمەیە، بنیگسن دەخوێنێتەوەو بارکلیش کەوەزیری بەرگریە نازانێت چ بڕیارێکبدات، بەم شێوەیە هەموو کاتی ئەمانە بەفیڕۆ دەچێت).

ئەم بەشەی یاداشتەکانی بالاشف سەبارەت بەدانوستانەکانی لەگەڵ ناپلیۆندا تەواو ڕاستەو جێگای باوەڕپێکردنە، چونکە بەلگەنامەی تریش تائکید لەسەرئەمە دەکەنەوە، بەتێڕوانینی گشتی ڕاپۆرتەکەی ژنرال بالاشف وەزیری هێزەکانی ناوخۆیی ڕوسیا، بەتایبەت لەوبەشەی گوایا لەکاتی گفتوگۆکردنی لەگەڵ ناپلیۆندا ناوبراو ئاماژەی بەشەڕی ئیسپانیاو ڕووداوەکەی

---

[243] - ئەویان: مەبەست لەباگراتیونە (و-کوردی).



پولتادا، کردووه، پێویسته بەوریاییەوه تێی بڕوانین ( ئەو ڕاپۆرتەی بالاشف لەبەرگی چوارەمی مێژووی کونسولی و ئیمپراتۆری ) تی یر لەنوسخە ئەسڵیەکەیەوه وەری گرتووەو لەو کتێبەدا نووسیویەتی. هەروەها (تۆلیستۆ)ش وشە بەوشە هەمان بەڵگەنامەی لەکتێبەکەی بەناوی شەڕو ئاشتیدا نووسیوەتەوه) هۆی گومانکردنەکەشی ئەمەیە: وەزیری ناوخۆی ڕوسیا بەکەسێکی ڕاستگۆ نەناسراوەو دوورنیە ئەم قسانەی دواتر بۆ ڕاپۆرتەکەی خۆی زیادکردبێت. پێویستە مێژوو نووس هەمیشە بەوریاییەوە سەیری ئەم پاشکۆ و زیاد پێوەنانانەبێت، هرسلتی ئەڵمانی کتێبێکی هەیە بەناوی ( شتە هەڵبەستراوەکانی مێژوویی )و ئێستا لەبەردەستدایەو تایبەت بەشتە هەڵبەستراو وساختەکاریانەی مێژوویە، ئەو ڕستانەی کەهەرگیز نەگوتراون و هەڵبەستێنەرەکانیش دوای ڕۆیشتنیان دەکەونە بیری ئەوەی ئەگەر ئاواو ئامایان گوتبا باشترنەبوو، دوای ماوەیەك پروپاگەندەی ئەوەدەکەن گوایا ئەم قسانەیان کردوون.

دوای چوار ڕۆژ ڕۆیشتن بێ هیچ گرفتێك گەیشتە ڤیلنا لەلایەن ئەشرافەکانی ئەوشارەوە بەگەرمی پێشوازی لێکرا، چونکە بڕوای تەواویشی بەسوپاکەی بوو وبەرەسمیش نارازی بوونی بەئاشتی کردنی بەئالاشف ڕاگەیاند، ناپلیۆن(18/ ڕۆژ لەڤیلنادا مایەوەو مێژوو نووسان دواتر ئەم مانەوەی ئەویان بەیەکێك لەهەڵەکانی ناپلیۆن لەقەڵەمدا، بەڵام ناپلیۆن لەوێدا وەك چۆن لەدرسدیشدا چاوەڕوانی یەکە سەربازییە کۆمەکییە تازەکانی دەکرد کەلەڕێگادابوون بۆگەیشتن بەئەو، لە(685) هەزار سەربازی کەبۆشەڕکردن لەگەڵ ڕوسیادا لەژێر دەستی دابوون، ناچاربوو (235) هەزار سەرباز لەئەڵمانیاو فەرنسادا جێبێڵێت و تەنها فەرمانی پەڕینەوەی بۆسەر سنووری ڕوسیای بە(420) هەزار سەربازداو تازە لەتازە ئەو(420) هەزار سەربازانەش دەگەیشتنەجێ و دەچوونە سەرخاکی ڕوسیا.

لەڤیلنادابوو کەناپلیۆن هەستی بەپێشینییەکی نالەبارکرد، ئەسپەکان بەهۆی نەبوونی کاوجۆوە پۆلپۆل دەتۆپین و پێشهاتی تریش ڕوویاندەدا، پۆڵۆنییەکانی لیتوانیاو بلاڕوسیا هێزی تەواویان ئامادەنەکردبوو، وردەوردە ناپلیۆن کەموکورییەکانی ئەوکارەمەزنەی خەریکبوو دەستی بۆببات زانی و ئەو شتەش لەڕەوشی سیاسی ئەودا بەرپەرچ دانەوەی ڕاستەوخۆ ودەستبەجێی دەویست. بەپێچەوانەی چاوەڕوانی پۆلۆنییەکان لیتوانیای ئەخستەسەر پۆلۆنیاو بیلاروسیاشی بەبەشێك لەلیتوانیا دانەناو کردییە حکومەتێکی کاتی، هۆی کردنی ئەم کارەشی ئەوەبوو نەیدەویست شتێکبکات ببێتە ڕێگر لەبەردەم ئاشتی کردن لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕوسیادا، ئیتر لێرەودوا دووفاقەیی و تایبەتمەندی هەمەجۆر کەوتە نێوان نەخشەو پلانەکانی و کاریگەریان کردەسەر سەرئەنجامی شەڕەکەش، ناپلیۆن وێنای ئەوەی دەکرد سوپای ڕوسیا تێکدەشکێت و ئەلکسەندەریش ملکەچی فەرمانەکانی خۆی دەکات و ڕوسیاش دەبێتە دەوڵەتێك دەستنیشاندەی خۆی و بەکاری دەهێنێت بۆفشارهێنانی زیاتر بۆسەر بریتانیاو بەرفراوانکردنی دەسەڵاتەکەی بۆئاسیاش.

ناپلیۆن زانیاری تەواوی لەسەر مێژووی میللەتی ڕوسیا نەبوو، نەك هەر ناپلیۆن بەڵکو هیچ کەس لەئەوروپادا درکیان بەو ڕاستییە نەدەکردو پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد گەلی ڕوسیا لەبەرامبەر هێرشێکی بێ شەرمانەی دوژمن هەتا چ ئاستێك بەقارەمانانە بەرگری لەوڵاتەکەیان دەکەن، کەس وێنای ئەوەی نەدەکرد گوندنشینەکان چۆن وڵاتەکەی خۆیان کردبۆ ئاگربۆ لەناوبردنی دوژمن و بەهیچ جۆرێ سەریان بۆدوژمنی داگیرکەر نەوی نەدەکرد، ناپلیۆن هەموو ئەم ڕاستیانەی درەنگ درك پێکرد.



وردەوردە گرفتەکان سەریانهەڵدەداو ئەو بۆچوونەی سەرەتا ناپلیۆن هەیبوو نەماو وێنای تری بەخەیاڵدادەهاتن، ئەو بەوەی (420) هەزار سەربازی لەبەردەستدابوون، لە بەرامبەردا سوپای ڕوسەکان پێکهاتبوو لە(225) هەزار سەرباز. هەروەها ناپلیۆن دەیزانی سوپاکەی لەچەند یەکەیەك دروستبوون کەهەموویان بەیەکسانی جێگای بایەخ و پشتپێبەستن نین، دەیزانی جگەلەسوپای فەرنسا ناتوانرێت پشت بەوانیتر ببەسترێت، سوپای مەزن (355) هەزار سەربازی لەوڵاتانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری فەرنساو دەستینشانکراوەکانییەوە پێکهاتبوو وئەمانەش زۆربەیان بەرەگەز فەرەنسی نەبوون، چونکە ئەو سەربازانەی تازە بۆسەربازی گیرابوون جیاوازبوون لەگەڵ کۆنەسەربازە فەرەنسییەکان، هەروەها ناپلیۆن ئەو سەربازانەی نەمساشی لەگەڵخۆیدا هێنابوون کەهیچ ڕق وکینەیان لەڕوسیانەبوو بەپێچەوانەوە داخ لەدڵی سوپای فەرەنسا بوون و ئامادەنەبوون بەدڵ وگیان شەڕبکەن، ناپلیۆن مێژووی سەربازی بەباشی تێگەیشتبوو وخوێندبوویەوەو دەیزانی ئەو میللەتانەی پاشاکانی ئێرانی کۆن خستبوویانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان وخشاریاشاش کردبوونی بەسەرباز بۆئەوەی لەگەڵ یۆناندا بجەنگن، کەچی ئەوان بەدڵسۆزی ولەخۆبردووییە شەڕیان نەدەکرد، بەڵام ناپلیۆن کەمێ باوەڕی بەپۆڵۆنییەکان هەبوو، چونکە ئەمانە بۆسەربەخۆیی وەرگرتنی وڵاتەکەیان دەجەنگان، ناپلیۆن ئاگاداری ئەو بێسەرو بەرەییەی سوپای ڕوسیابوو، هەروەها لەڤیلنادا لەوە ئاگادارکرایەوە کەلەقەڵاتی دریسادا روسەکان بۆشەڕکردن نەماونەوەو بارکلی[244] لەوەترساوە سوپای فەرەنسا گەمارۆی ئەو قەڵاتە سەربازییە بدات وئەمەش ببێتەهۆی تێشکانی یەکجارەکی سوپای ڕوسیا، هەروەها ئەو زانیاریەشی پێگەیشتبوو سوپای ڕوسیا بەدووبەشی لێکجیا بەرەو قوڵاتی خاکی وڵاتەکەیان پاشەکشەدەکەن، پاشەکشەکردنی بەشی بارکلی لەلای ڤیتبسکەوە خراپترە لەبەشی باگراتیون کەبەئاراستەی مینسك لەپاشەکشەکردن دایە، ناپلیۆن بەزۆرینەی سوپاکەیەوە دوای سوپای بارکلی کەوت، بەڵام بارکلی پاشەکشەی خۆی خێراتر کردوو فەرمانی بەفەرماندەی لەشکری کۆتایی سوپاکەی کرد بۆدواخستنی سوپای فەرەنسا، شەڕبکات، ئوسترمانیش ئەو فەرمانەی لەڕۆژی(25و 26) یۆلیۆدا جێبەجێکردو لە ئاسترو ڤنودا ڕوو بەڕووی سوپای فەرەنسابۆوە.

کاتێ ناپلیۆن گەیشتە ڤیتبسك نەگەیشتەوە سوپاکەی بارکلی، چونکە ئەو بەخێرایی بەرەو ئاسولنسك هەڵاتبوو، لەووەختەدا مارشال داوو لەڤیلناوە بەرەو مینسك لەپێشڕەوی دابوو ولەلایەن ناپلیۆنەوە فەرمانی ئەوەی پێکرابوو ڕێگای پاشەکشەکردنی باگراتیون بگرێت وپێشنەوەی لەگەڵ هێزەکەی بارکلدا یەکبگرنەوە تەفرو تونایان بکات، بەڵام لەبەختی باگراتیون ژێروم بوناپارت برابچوکەکەی ناپلیۆن کەهیچ لێوەشاوەیی وتوانایەکی سەربازی نەبوو، وەك چۆن لەهیچ کارێکی تریشدا بەتوانااو لێوەشاوەنەبوو، بەیەکە سەربازییەکانییەوە زۆر درەنگ گەیشتبوو.

کاتێ لە(23/ی یۆلیۆ)دا لەخۆرئاوای موهلیفدا شەڕ لەنیوان داوو وباگراتیوندا ڕوویداو باگراتیون دوای چەند وردە شەڕێکی قارەمانانە توانی درێژە بەپاشەکشەکەی خۆی بەرەوئەسمولنسك بدات، بارکلی هەواڵی شەڕی موهلیفی بیست و زانی باگراتیون لەنوێ بیخفەوە لەڕووباری دنی پیر پەڕیوەتەوە، بڕیاریدا لەئوسولنسکدا لەگەڵ باگراتیوندا یەك بگرنەوەو لەڕێگای ڕودنیاوە بەرەو ئەوشارە ڕۆیشت، ناپلیۆن کەبەتەمابوو لەشاری ڤیتبسکدا شەڕێکی گەورە لەگەڵ بارکلیدا بکات و تێکیبکشێنێت، لەپڕ لەڕۆژی(28/ی یۆلیۆ)دا هەواڵی ئەوەیان پێگەیاند سوپای ڕوسیا بەرەو خۆرهەڵات زۆر دوورکەوتۆتەوە،

---

[244] - وەزیری بەرگری ڕوسیایە،(و- کوردی).



ئەمەبووەهۆی سەرسوڕمانی زۆری ئیمپراتۆری فەرەنسا، ئەو پێشبینی شەڕێکی وەك ئوسترلیتزی کردبوو لەڤیتبسکدا کەبەزەبرێکی کوشندە کۆتایی بەشەڕبێنێت لەبەرژەوەندی خۆی و ئەلکسەندەر ناچاربکات ئاشتی بکات [111] سەربازەکانی فەرەنسی بەهۆی ڕۆیشتنی زۆرو گەرماوە لێیان دەمردن سەربازە کۆنەکانیش بۆ دڵنەوایی و ورە بەرزکردنەوەی سەربازە تازەکان دەیانگوت ، گەرمای بیابانی میسر زۆر لەمە بەتین ترە ، لەوەڕو کلوجۆ بۆ وەڵاخەکان دەست نەدەکەوت سەربازە سوارەکان وەڵاخەکانیان تۆپیبوون ، نیشانەی پەرتەوازەبوون بەدیارکەوتبوو، سەربازەکان بە شێوەیەکی بێ پێشینە هەڵدەهاتن .سوپای فەرەنسا هەر بەدوای بارکلی و باگراتیون دەکەوتن کەهەریەکەیان بەلایەکدا پاشەکشەیان دەکردو بەرەو ئسمولنسك کە کەوتبۆ قوڵایی خاکەکەیان دەڕۆیشتن.

## (2)

ناپلیۆن ناچاربوو لەیەکە سەربازییەکانی بەشی خۆرهەڵاتی بەرەو ئسمولنسك بنێرێ بۆئەوەی ڕووبەڕووی لەشکری ڤیتگنشتاین ببنەوە لەڕێگای پترسبورگەوە بەرەو ڕووباری دوینا بچن، هەروەها ناچاربوو خەریکی ڕاوەدوونانی لەشکرێکی ڕوسیابێت، کەدوای ئاشتی کردنی ڕوسیا لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانیدا، لەبەرەی تورکیا گەڕابوونەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش ڕۆژێك پێش شەڕی ئسمونلکس، ناپلیۆن سوپایەکی پەرداخیتری لەسوپای ڕوسەکان لەدەستدابوو، دوای شەڕێکی لاوەکی لەکراسنوئەدا، لەشکری نەڤەروسکیش کەبەرگەی ئەو هەڵمەتە بەهێزانەی لەشکرەکانی نی و مورای گرتبوو و سێ لەسەرچواری لەشکرەکەی تێداچوبوو، ناپلیۆن نزیك دیوارەکانی ئسمولنسك بۆوە، باگراتیون فەرمانی بەژنرال رایفسکی کرد پێش بەسوپای فەرەنسا بگرێت، لەوشەڕانەی ڕوویدا لەشکری رایفکسی ئەوەندە بەدلێرانە شەڕیانکرد تەنانەت چی وای نەمابوو مارشال نی بەدیل بگیردرێت.

باگراتیون سووربوو لەسەر ئەوەی بێ شەڕکردنێکی گەورە لەگەڵ سوپای فەرەنسادا ئسمولنسك جێنەهێڵێت، بەڵام ئەم شەڕە گەورەیە ڕووینەدا، زۆرینەی سوپای ڕوسیا کەبەڕواڵت واینیشاندا بەرەو نسمولنسك دەچێت، بەڵام بەرەوخۆرهەڵات پاشەکشەی کرد، بارکلی هەرچەندە لەو بڕوایەدابوو شەڕکردن کەڵکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەنەبوو ئەوشارە بەبێ شەڕ جێبێڵێت.

لەسەعات شەشی بەیانی ڕۆژی (16) ئۆگوستدا ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد تۆپبارانی شاری ئسمولنسك بکەن وهێرشبکرێتەسەر ئەو شارەو داگیربکرێت، شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا کەهەتا کاتژمێر شەشی ئێوارە درێژەی کێشا، فەرەنسییەکان تائەوکاتە توانیان ئاوەدانییەکانی دەوری شار داگیربکەن، بەڵام نەیانتوانی بچنەناوەوەی شار، یەکە سەربازیەکانی ژێر فەرماندەی دوختوروف کونونی تسی، ئەوەندە بەقارەمانانە شەڕیانکرد بووەجێبێگای سەرسوڕمانی سوپای فەرەنسا، شەو کاتێ ناپلیۆن بانگهێشتی مارشال داووی کردو فەرمانی پێکرد سبەی هەرچۆنێکبێت ئەوشارە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، ناپلیۆن لەوبڕوایەدابوو هەموو سوپای ڕوسیا بەشداری لەشەڕی ئسمولنسکدا بکات، چونکە لەوەئاگادار کرابۆوە لەشکرەکانی بارکلی وباگراتیون یەکیانگرتۆتەوە، ئەم شەڕەش شەڕی کۆتایی ڕوسەکانەو پانتاییەکی زۆری خاکەکەی خۆیان جێهێشتووە هەتا



لەوێدا یەکلایی بکەنەوە، ڕۆژی(17/ی ئۆگۆست)یش روسەکان بەئازایانە شەڕیانکرد، سەربازە ڕوسەکان ئامادەنەبوون فەرمانی پاشەکشەکردن جێبەجێ بکەن، بۆیە فەرماندەکان بەپاڕانەوەو هەڕەشەکردن ناچاریانکردن پاشەکشەبکەن [210] ئەو ڕۆژەش شەڕێکی خوێناوی ڕوویداو بەفەرمانی ناپلیۆن تۆپ بارانکردنی ئەوشارە درێژەی کێشا، لەنیوە شەودا تەقینەوەیەکی گەورە ڕوویدان ئاگرو گڕێکی گەورە کەوتەوە. سوپای ڕوسیا ئاگریان لەباروتەکانیان بەردابوو وشاریشیان ئاگردابوو، بارکلی فەرمانی پاشەکشەکردنی دابوو، لەبەرەبەیاندا پێش سوپای فەرەنسا هەواڵی ئەوەیان گەیاند شار چۆڵکراوەو مارشال داوو بەبێ شەڕکردن چۆتەناو شاری ئسمولنسك، کۆڵانەکان پڕلەتەرمی مرۆڤ وکەلاکی ئەسپان بوو، کەتا ئەوکاتەش هەندێك لەشارەکە دەسوتاو دەنگوناڵەی بریندارەکان دەهات.

ناپلیۆن بەهێواشەکی بەناوشاردا گەڕاو فەرمانیدا ئاگرەکانی کەلێرەولەوێ دەستوتان بکوژێننەوەو برنیدارەکان کۆبکەنەوەو تەرمەکانیش بنێژن و لیستێکیش لەودەستکەوتانە بنووسن، بەڵام هەندێك لەوکەسانەی کەبەواقیعی ئەو ڕووداوەیان بینیبوو دەگێڕنەوە: ناپلیۆن لەگەڵ کەسدا نەدواوەو غەم وپەژارە دایگرتووە، کاتێ لەو گەڕانەی گەڕایەوە لەوخانووەی بۆ پشودانی ئەو سازکرابوو وشمشێرەکەی خستەسەر مێزەکەو گوتی: (شەڕی ساڵی 1812 کۆتایی هات ).

ناپلیۆن ناچاربوو لەوشارەدا بمێنێتەوەو بۆئەوەی پشتەوەی خۆی بەهێزبکات، واتە: لەپۆلۆنیاو لیتوانیاو بیلاروسیا. لەساڵی ( 1813)دا دووبارە پێشڕەوی بەرەو مۆسکۆ–یان پترسبورگ بکات، ناپلین ئاگای لەوکێشانە نەبوو کەبارکلی بەهۆی پاشەکشەکردنەکەیەوە توشی بووەتەوەو بەخائینی لەقەڵەمدراوەو دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی ڕوسی توشی سەرلێشێواوی خەجڵان بوونەوە، ناپلیۆن تەنها بیری لەوەدەکردەوە سوپای ڕوسیا ڕووبەڕووی شەڕێکی گەورەی لێکدەرکردن بکاتەوە بۆیە بەرەو مۆسکۆ کەوتەڕێ، چەند ناپلیۆن بەرەوخۆرهەڵات دەڕۆیشت کۆتایی هێنا–یان ئاشتی کردن–یان یەك ڕێککەوتنی سادەی سیاسی پڕکێشەتر بەدیاردەکەوت، ئیتر ناپلیۆن دوای شەڕی ئسمولنسك، ئیتر زۆر بیری لەتێشکاندنی ڕوسەکان نەدەکردەوەو بەلایەوە ئەوەندە سەخت نەبوو وزیاتر لەبیری ئەو بیرۆکەیەدابوو کەلەکاتی پەڕینەوەی لەڕووباری نیمن بەخەیاڵیداهات.

چەرمەسەریەکە تەنها لەوەدانەبوو سوپای ناپلیۆن بەهۆی پانتایی زۆری خاکی ڕوسیاوە توشی گرفتی هێنان وگەیاندنی ئازوقە ببۆوە–یان ئەو وردە شەڕۆکانەی کەلێرەولەوێ دەهاتنەپێش، بەڵکو گرفتی گەورەتر لەو گەرما تاقەت پڕوکێنەدابوو کەبەشێکی لێنەخۆشکردبوون وهەندێکی تریشیان لاکەی سەریاندەهات لەماندویی وشەکەتیدا، سەرەرای ئەمانەش ناپلیۆن وەك سەرەتا وێنای ئەوەی دەکرد سەربازەکانی ڕوسیا ناجەنگن، بەڵکو بەچاوی خۆی دەیبینی وەك شەڕی ئایلو دلێرانە شەڕدەکەن، هەرچەندە ئەم بۆچوونەی ناپلیۆن سەبارەت بەسەربازەکانی باگراتیون لەسەرتاوە بەوجۆرەنەبوو، چونکە لێوەشاوەیی فەرماندە سەربازییەکانی دەزانی وحسابی لەسەر کەسایەتی وتواناکانیان دەکرد، بۆنموونە: باوەڕی بەوەهێنابوو فەرماندە سەربازییەکانی وەك: رایفسکی و دوختوروف و نوچکوف و کونوفنی تسین و نوەروفسکی و پلاتوف ئەرکەکانی

[210] - نکاراند، لەساڵی (1938)دا کتێبێکی لەژێرناوی هێرشی ناپلیۆن بۆسەر ڕوسیا نووسیوەو لەوکتێبەدا باسی لەشەڕی قارەمانانەی روسەکان کردووە، (نووسەر).



خۆیان بەوپەڕی باشی جێبەجێکردووەو لەوانەیە مارشالە باشەکانی ئەو لەوکارەدا سەرکەوتوو نەبوبان وبەپوو زەردی هاتبانەوە، سەرئەنجام بارودۆخی شەڕەکە ناپلیۆن وفەرماندە سەربازییە بالاکانی دڵنیەگەرانکردبوو.

سوپای ڕوسیا بەپاشەکشە نەخشە بۆکێشراوە ڕێکو پێکەکەیان تەنها دەشتێکی چۆڵ وبەرفراوانیان لەدوای خۆیان جێدەهێشت، لەشاری سمولنسکدا ڕوسەکان ئاگریان لەهەموو شتێك بەردابوو وهیچ خۆراکێکیان نەهێشتبۆوە بەمەش دیاربوو دەیانویست بەبێ بەزەییانە لەگەڵ دوژمندا بجەنگن.

ناپلیۆن ئەوەی بەیادهاتەوە لەکاتی داگیرکردنی ڤێننادا ئیمپراتۆری نەمسا فەرمانی بەهاوڵاتیانی دابوو فەرمانەکانی ناپلیۆن موبەمو جێبەجێبکەن، هەروەها پاشای پرۆسیش بەهەمان شێوەو دوای ئەوەی هەڵاتبوو نامەیەکی بۆناردبوو وتێیدا باسی ئەوەی کردبوو هیوادارە بەڕێزی لەکۆشکی پوتسدامدا کاتی خۆش بەسەربەرێت.

بەلام ڕوسەکان گوندو ماڵ وکوخەکانی خۆیان جێدەهێشت ودانەوێڵەو خۆراکەکانیان دەسوتاندو شارو شارۆچکەکانیشیان گرتێبەردەدا، چونکە بارکلی و باگراتیون لەسەروی ئەوانیشەوە ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا ئەم شەڕەیان بەشەڕی مان ونەمان دەزانی.

ناپلیۆن لەو ڕۆژانەی لەسمولنسکدا بەسەربرد هەمیشە بێدەنگ ومات دەهاتەبەرچاو لەبیرکردنەوە دابوو، ئەو پێشنەوەی هەموو هێزەکەی خۆی کۆبکاتەوە فەرمانی بەمورادا بەیەکە سەربازییە سوارەکانییەوە دوای سوپای ڕوسیا بکەوێت کەلەپاشەکشەدایە، دوای مارشال مورا ناپلیۆن مارشال نی و داوۆشی خستنەڕێ، لەڕۆژانی(18و 19)ی ئۆگوستدا شەڕەکانی ڤالوتیناو گوراو لوبین ڕوویدا، دوای ئەمانەش بەهۆی نالێوەشاوەیی ژونۆ کەبۆ هێرشکردنەسەر سوپای بارکلی مانۆڕێکی هەڵەی کردبوو، بارکلی توانیبووی زیاتر درێژە بەپاشەکشەکەی خۆی بەرەوخۆرهەلات بدات. ئەم شەڕانە (7) هەزار سەربازی ڕوسی تێدابوونە قوربانی وزیانی گیانی سەربازەکانی فەرەنساش لەو ژمارەیە کەمتربوو.

ناپلیۆن لەشەوی(24/ی ئۆگوست)دا بەکاردەکەی خۆیەوە سمولنسکی جێهێشت وبەرەو دوروگۆبوژف کەوتەڕێ، لەهەر شوێنێکدا ڕوسەکان لەپاشەکشەکردنەکەیاندا دوادەکەوتن ناپلیۆن وێنای ئەوەی دەکرد ئەمە شەڕی گەورەیەو چەند جارێکیش لەشوێنەکانی وەك دوروکۆژ و ویازماو گژاتسکدا ڕوویدا، لێپرسراوی ستادی گشتی باگراتیون، بەنووسینی تورەیی ئامێزەوە ئاوا نامەی بۆ پیترسبورگ نووسی: جەنابی وەزیر، میوانەکەی خۆی ڕاستەوخۆ بۆ مۆسکۆ دەبات).

ترس وشپرزەییەکی گران باڵی بەسەر کۆمەڵگای ڕوسیادا دەکێشاو دەیانگوت: ئایا بەڕاستی هەموو شتێك لەدەستچوو؟ ئایا دەبێ وڵاتی ڕوسیا بەبێ شەڕ بدرێتەدەست دوژمن؟ ئایا ئەم بارکلیە ئەڵمانی نەژادە خیانەتی کردووە؟

خودی ئەلکسەندەریش پلانەکانی بارکلی بەهیچ دەزانی و بەدەنگی بڵند قسەکەی شازادە تومان پلاتوفی دەگێڕایەوە کەدوای پاشەکشەکردنی بەبارکلی وەزیری بەرگری لەڕووبەڕووی کومیسیاری دەوڵەتی بریتانیا بەوی گوتبوو:( سەیرم کە من جلی مەدەنیم لەبەرکردووە، چونکە دوای ئەو نەنگیە ئامادەنیم بەرگی سەربازی لەبەربکەم).

ئەلکسەندەر ڕۆژانێکی خراپی بەسەردەبردو کاربەدەستانی کۆشك شێلگیربوون، ترس وردەوردە زیادی دەکرد لەناو کۆڕی وردە برژوازییەکان وگوندنشینەکاندا قسەی ناشیرین و بوختان ئامێز بەئەلکسەندەرو ناپلیۆن دەگوتران.



دەمێکبوو لەمنبەرەکانەوە ناپلیۆنیان بەشەیتانی دژی مەسیح ناساندرابوو لەمەش خراتپر خەڵك لەقسەکردنی ڕۆژانەی خۆیاندا ناپلیۆنیان بەدوژمنی مەسیح ناودەبرد، ئێستا ئەو شەیتانە نزیکەی نیوەی خاکی ڕوسیای بەبێ هیچ بەرەنگاری و شەڕ داگیرکردووە، لەدەستدانی شاری ئسمولنسك ورەی زۆریانی بەردابوو، خەڵك لەمانگی یەکەمی شەڕدا دەیانگوت (تزارو براکەی کنستانتین، ئەوپیاوە سەرچڵەیەیان تووڕەکردووە).

بەڵام ئەوەی ئەوپیاوە زوو هەڵچووە ئامانجی بوو لەپشت پەردە شاراوەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەرلەیەکەمین ڕۆژەوە گڕی تۆڵەسەندنەوەو کینەسۆزی ودژایەتی کردنی داگیرکەر لەناودڵی میللەتی ڕوسیادا بڵێسەی هەڵسا، بەهۆی ئەوهەستکردنە بەستەمی دوژمن وردەوردە تەشەنەکردنی ئەمە بووەهۆی ئەوەی سوپای مەزنی ناپلیۆن لەناوبچێت، ترسی ئەشرافەکان زیاترو ئاگایانەترو ڕوونتربوو لەخەڵکی سادە، ئەوهەڕەشەی کەلەلایەن ناپلیۆنەوە لێیاندەکرا تەنها مەسەلەی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیانەبوو لەلایەن ڕوسیاوە، بەڵکو سەرنگونکردنی ڕژێمی فیودالی بوو.

گوایا لەڕاستیدا ناپلیۆن مەبەستی نەهێشتنی سیستمی فیودالی نەبووە، بەپێچەوانەوە هەر بەرهەڵستانەوەو ڕاپەڕینی جوتیارەکان دژبە فیودالەکان دەیانکرد، ناپلیۆن بەوپەڕی بێ بەزەییانە سەرکوتی دەکردن، هەرچۆنێکبێت بەلێکدانەوەی ئەلکسەندەرو ئەشرافەکا نەدەبا مۆسکۆ بەبێ شەڕ بۆ دوژمن جێبهێڵدرێت، ئەمە جگەلەوەی سەربازەکانی ڕوسیا هۆی پاشەکشەکردنەکەیان نەدەزانی.

کاتێ سوپای ڕوسیا لە(29/ی ئۆگوست)دا بە ڤوزایمیشچە گەیشتن فەرماندەیەکی تازەیان بۆدانرابوو، چونکە ئەلکسەندەر لەجێگای بارکلی کوتوزۆفی بەفەرماندەی گشتی سوپادانابوو، باگراتیونیش جێگای متمانەی وەگرتنی ئەوپلە باڵایەی نەبوو، چونکە ئەمیش وەك بارکلی ناوەکەی ڕوسی نەبوو، بەدڵنیاییەوە کوتوزۆف دەیزانی بارکلی لەسەرحەقە هەروەها دەشیزانی پێویستە بۆلەناو بردنی سوپای فەرەنسا هەمان نەخشەی بارکلی بگیردرێتەبەر ئەویش بەپاشەکشەکردنی بۆ ئەوەی شەڕەکە درێژە بخایەنێت وسوپای ناپلیۆن ماندو وشەکەت و بێ ئازوقەبێن وهەرەسی ڕۆحی بێنن، بەڵام کوتوزۆف ئەو ڕاستیەشی دەزانی بەهۆی شەرەف ئەو پلەوپایەیەیان داوەتێ، نابێ بەبێ شەڕ مۆسکۆ جێبێڵێت، بۆیە بڕیاریدا وەك چۆن لەشەڕی ئوسترلیتزدا بەبێ ئیرادەی خۆی وباوەڕبوون شەریکرد، ئاواش ئەمڕۆ شەڕێکی بێ هودەیی بکات، ئەم شەڕە کەلەڕووی سەربازییەوە بێ کەڵکبوو، بەڵام لەڕووی ورەی ڕۆحیەوە دەبوواکرابا، بەڕای ناپلیۆنیش کەهەواڵی لەسەر کارلابردنی بارکلی پێگەیشت ئیتر ڕوسەکان شەڕی یەکلایکەرەوە دەکەن، ئیمپراتۆری فەرەنسا لەبەرەبەیانی(14/ی سێپتەمبەردا فەرمانی بەمورا و نی کرد لەگژانسکەوە بەرەو گریدنە لەشکرەکانیان بخەنەڕێ، سوپای ڕوسیا وردەوردە پاشەکشەکردنەکەی هێواشکردبۆوەو وەستابوو ودەستیانکردبووبە مەتەرێزلێدان و خۆسازکردن بۆشەر، قایمترین شوێن بۆ سوپای ڕوسیا ئەو قەڵاتە سەربازییەبوو کەروسەکان لەگوندێکی بچوك بەناوی شورادینو دروستیانکردبوو، هەرکە ناپلیۆن گەیشتە گریدنەو یەکسەرە کەوتە سەیرکردن وشارەزایی بوون لەتۆپۆگرافیای ئەودەشتاییە پان وبەرینەی پێشیەوە کەسەربازەکانی تێیدا جێگیربیوون، دواتر هەواڵی ئەوەیان بەناپلیۆن ڕاگەیاند لەقەڵاتی سەربازی گوندی شوارۆینودا، هێزێکی گەورەی سوپای ڕوسیا جێگیربووە، لەدوورەوە هۆردووی سوپای ڕوسیا لەدەم چۆمی بچوکی کلوچا دیاربوون.



پێش قاوڵەکانی سوپای فەرەنسا ئێوارەی ڕۆژی(14/ی سێپتەمبەر) هەواڵی ئەوەیان بەستادی گشتی ئیمپراتۆری فەرەنسا ڕاگەیاندکە سوپای ڕوسیا لەدوورەوە دیارن وجێگیربوون وسەنگەریان لێداون، چونکە ناوی ئەو گوندەیان لەمانە پرسیبوو ئەمانیش نەیانزانیبوو وبەهەڵە تێی گەیشتبوون و گوتبویان گوندی بورودینو.

# (3)

شەڕی بورودینو زۆرجار بۆتەجێگای سەرنجی مێژوو نووس وپسپۆرانی بواری سەربازی و نووسەرو وێنەکێشە گەورەکان، چونکە چارەنوسی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن نەك هەر لەدەشتاییەکانی بورودینودا، بەڵکو لەرەوشی لەشکرکێشی ئەوبۆسەر ڕوسیا دیاریکرا، لەبەرئەوەی لەڕاستیدا شەڕی بورودینو سەرتایەکبوو کەپەردەی لەسەر نمایشێکی تراژیدی لابرد.

شەڕی ڕوسیا کۆتایی کارنەبوو، بەڵکو سەرەتایی بەدیارکەوتنی کۆتاییەکبوو کەتانەوکاتەش دووربوو، ئیتر ئەوساتەوەختە هاتەپێش کەناپلیۆن دەمێکبوو چاوەڕوانی دەکردو خەونی پێوەدەدی. لەوکاتەی لەوشوێنە نزیك دەبوونەوە کەبووەمەیدانی شەڕێکی گەورەو مەترسیدارترین لێکدانی مێژوویی وبەدرێژایی مێژوو پێشینەی نەبوو، ئەوسەربازانەی لەگەڵ ناپلیۆندابوون، سێ لەسەرچواری سوپاکەی بوو، کەسەرەتا هاتبوونە ناوخاکی ڕوسیا.

هەڵاتنی سەربازەکان و ناردنی سەرباز بۆ ڕێگرتن لەوسەربازە ڕوسیانەی لەبەرەی شەڕی تورکیا گەڕابوونەوەو دانانی چەندین یەکەی سەربازی بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی بڕیبوویی و دانانی چەند یەکەیەکی سەربازی لەشاری پترسبورگدا...

هەموو ئەمانە بوونەهۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی سەربازی سوپای فەرەنسا بەشێوەیەکی مەترسیدار، کاتێ ناپلیۆن گەیشتە نزیك قەڵاتی سەربازی ڕوسەکان لەگوندی شواردینو، تەنها (135) هەزار سەربازو (587) عەرەبانەی تۆپی لەگەڵدابوون، ڕوسەکان بەکە سەربازیەکانیان ڕێکخرابوون و ژمارەیان (103) هەزاربوو (640) عەرەبانەی تۆپ هەڵگریشیان هەبوو ونزیکەی (10) هەزار سەربازی بەرگری میلیشیان لەگەڵدابوون، تۆپخانەی ڕوسەکان لەتۆپخانەی سوپای فەرەنسی خراپترنەبوو ولەرووی ژمارەشەوە زیاتربوون، سوپای فەرەنسا زۆر ئەسپیان لێتۆپیبوون و بەزەحمەت توانیبویان ئەو تۆپخانەیان بکەبەنە ئەوشوێنە.

لەکاتی شەڕی بورودینودا ناپلیۆن ستادی گشتی سوپاکەی لەگوندی ڤالوەڤودا دانابوو، ئەو دڵنیابوو لەسەرکەوتنی و سەرەتای شەڕەکەش ئەو ئومێدی لەدڵی ئەودا کەمکردەوە، ناپلیۆن لەڕۆژی(5/ی سێپتەمبەر)دا فەرمانی هێرشکردنەسەر سەربازگەی شواردینوی دەرکرد.

دوای ئەوەی هێزەی مورا بەشێکی سەربازە سوارەکانی ڕوسیای تێکشکاندا تۆپخانەی فەرەنسییەکان دەستیکرد بەتۆپبارانکردن و ژنرال کمپانیش بەپێنج تیپی پیادەی سەربازی هێرشی کردەسەر سەربازگەی ڕوسەکان ودوای شەڕێکی گەورەی دەستەویەخە ئەو قەڵاتە سەربازییەی ڕوسیایان داگیرکرد، هەتا شەو درەنگانێك سەربازەکانی فەرەنسایی بەسەر سورمانەوە باسیان لەوەدەکرد لەکاتی چوونەناو ئەو سەربازگەوە تۆپخانەکانی سوپای ڕوسیا دەیانتوانی پاشەکشەبکەن وهەڵبێن، بەڵام لەبیری ئەوەی گیانی خۆیان ڕزگاربکەن ئەوەندە پیاوانە شەڕیاندەکرد هەموویان بەکوشتچوون.

لەبەرەبەیانی ڕۆژی(6/ی سێپتەمبەر)ەوە ناپلیۆن سواری ئەسپەکەی بوو وتائێوارە بەردەوام بەسەر سەربازەکانیدا دەگەڕاو لەوەدەترسا ڕوسەکانیش وەك پێشوو درێژە بەپاشەکشەکردنەکەیان بدەن وشەڕنەکەن، بەڵام ئەو ترسەی ئەو بێجێبوو،

کوتوزوف سوپاکەی لەپێگەیەکی کەمێ دووردا جێگیرکردبوو وبەتەمانەبوو پاشەکشەبکات، ناپلیۆن ئەوەندە لەدووبارە پاشەکشەکردنەوەی سوپای ڕوسیا دەترسا تەنانەت پێشنیارەکەی مارشال داوۆ شی ڕەتکردەوە کەبەناوبراوی گوت: باتێمە لەلای چەپی سوپای ڕوسەوە هەندێك هێزی خۆمان لەئوتیتساوە بنێرین بۆ ئەوەی نیوە گەمارۆی سوپای دوژمن بدەین، لەوەلامدا ناپلیۆن گوتی نا بائەم مانۆڕە نەبێتەهۆی ئەوەی دوژمن بترسێت ودووبارە درێژە بەپاشەکشە بدات...

ئامانجی ناپلیۆن تەنها ئەوەبوو خۆی بگەیەنێتە مۆسکۆ ولەوێشدا پێشنیاری ئاشتی بۆ ئەلکسەندەر بکات، ئەو زۆر حەزی لەداگیرکردنی مۆسکۆ بوو بۆیە نەیدەویست ئەو سەرکەوتنە بەبێ شەڕ دەستی بکەوێت.

ئەو ئامانجەی ناپلیۆن لەدڵی دابوو کەسوپای ڕوسیا لەبەریەك بەرێت وتەفروتونای بکات، واتە: لەبەردەم دەروازەکانی مۆسکۆدا شەڕێکی سەخت وچارەنوسسازبکات، نەك سوپاکەی کوتوزوف لەدەوروبەری مۆسکۆ لەڤیلادیمیرو ریازان و دوورتریش ڕاوەدوونێت. دروست هەرلەبەر ئەم هۆیەشبوو بارکلی و کوتوزوف نەیانویست ئەوشەڕەبکەن کەئارەزووی ناپلیۆن بوو، سەبارەت بەبارکلی کەلەتساراو ڤزایمیشەهەم بەدواوە کەوتبۆ ژێر فەرمانی کوتوزوف و ئەو ورتەی نەدەکرد. کوتوزوفیش نەیدەتوانی خۆی لەشەڕی مۆسکۆ لابدات وئەو لێپرسراویەتییە نەگرێتەئەستۆو پاشەکشەبکات و مۆسکۆ بەتەمای خوا جێبێڵێت و تەنها سوپا ڕزگاربکات سەری لێشێوابوو ومات و بێدەنگبوو، ڕۆژی دوای گرتنی شواردینو ناپلیۆن مارشالەکانی کۆکردەوەو نەخشەی شەڕی داهاتووی بۆ ڕوونکردنەوە.

سەربازە سادەکانی فەرەنسا وەك ناپلیۆن بەوردی سەیری هۆردووی ڕوسەکانیان دەکردو لەخۆیان دەپرسی: ئایا کوتوزوف هەڵنەهاتووە؟ بەلام یەکە سەربازییەکانی ڕوسیا جێگیربیوون ولەشوێنی خۆیان نەڕۆیشتن، شەوداهات، سەربازەکان نووخەوتن، چونکە دەیانزانی سبەی شەڕێکی سەختیان لەپێشەوەیە، ناپلیۆن بەوەی بەدرێژایی ڕۆژ ماندووببوو خەوی لێزڕابوو، بێهودە هەوڵیدەدا بێتاقەتییەکەی خۆی بشارێتەوە، کەئەوانەی دەوروبەری قسەیان لەگەڵدا دەکرد، تێبینی ئەویان دەکرد ناپلیۆن هۆشی لەوێدانییەو بیرلەشتێتر دەکاتەوەو دڵی لەشوێنێکیترە، بۆیە گوێی لەقسەکانی ئەوان نیە. ناپلیۆن شەو چەندجارێك لەخێمەکەی خۆی هاتەدەرێ و سەیری سوپای ڕوسیای دەکرد داخوا لەدوورە تروسکایی چراکانیان ماوەو نەڕۆیشتوون.

ئێستا خۆر پرشنگی نەدابوو کەناپلیۆن فەرمانی بەئوژن دوبوهارنەی ئتالیدا بەلەشکرەکەی خۆی هێرش بکاتەسەر گوندی بورودنیو کەکەوتبۆ بەشی چەپی سوپای ڕوسیا، دوا بەدوای ئەو فەرمانی بەموراو داوو و نی کرد هێرش بکەنەسەر ئەو سەنگەرانەی کەسوپای ڕوسیا لەناوەڕاستی پێشەوەی سوپاکەیان دروستایان کردبوون، لەدوولاوە هەڵمەتیان برد، تۆپەکانی سوپای فەرەنسا دەستیانکرد بەتۆپباران وبەجۆرێکیوا دەیانشریقاند تەنانەت ئەوسەربازانەی بەشداری شەڕەکانی ئایلوو ڤاگرامیشیان کردبوو گوێیان لەشراقەو ڕمبژنی وازۆرو بەهێزنەبیوو.

لەو ڕۆژە درێژی مانگی سێپتەمبەردا کەتا ئەوکاتەش هەوا گەرم بوو، کاتێ وردەوردە خۆر هەڵات و بەرەو ناوەڕاستی ئاسمان دەچۆوە، ناپلیۆن بەپێکەنینەوە گوتی ( ئەمە خۆری ئوسترلیتزە).

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە ئیمپراتۆری فەرەنسی ئاوا شادمانبوو، یەکە سەربازییەکانی فەرەنسا پێگە سەربازییەکانی سوپای ڕوسیایان داگیرکردبوو، بەلام بەرەبەری نیوەڕۆ هەواڵی ناخۆش بەستادی گشتی سەربازی فەرەنسا دەگەیشت کەخودی



ناپلیۆنیش لەوێدابوو، ئەویش ئەوەبوو ژنرال پلوزون، لەناو ئاوایی بورودنیودا لەکاتی تێکشکاندنی سەربازەکانی ڕوسیا لەناو ئەو گوندەدا کوژراوەو زۆریش لەیەکە سەربازییەکەی ئەو کوژراون. دوای ئەمە هەواڵهێنێکێتر هاتەناو ئەوستادەو پێی ڕاگەیاندن هێرشەکەی مارشال داوو سەر کەوتوویە، ماوەیەکی کەم دوای ئەمە هەواڵی ئەوە گەیشت لەشکری کمپانی سەربە هێزەکەی داوو کەوتۆتە ژێر تۆپبارانی دوژمن وکمپانی بەسەختی برنیداربووەو چەند ئەفسەرێکیش کوژراون، بەڵام لەوکاتەدا خۆشبەختانە مارشال داوو فریایان کەوتووەو تۆپخانەی دوژمنی تێکشکاندووەو ئەسپەکەی مارشال داووش پرینچکە تۆپێکی پێکەوتووەو تۆپیوەو داووش کەوتۆتە ژێر لاکی ئەسپەکەیی ولەهۆشخۆی چووە.

ئێستا ناپلیۆن فەرمانی سەبارەت بەمە دەرنەکردبوو کەهەواڵێکی تری پێگەیشت، ئەویش ئەوەبوو مارشال نی بەخۆیی وسێ لەشکرەوە هێرشی کردۆتەسەر سەنگەرەکانی پێشەوەی سوپای ڕوسیا کەنارنجۆك هاوێژەکان بەرگریان کردووە داگیری کردووەو ئێستا لەوێدا ماوەتەوە، بەڵام دوژمن هەر ماوەو تاوناتاوێك هێرشی دەکاتەسەر. سەربازێکیتر هەواڵی ئەمەی هێنا لەشکری نەوەروفسکی سەنگەرەکانی گرتونەتەوە، ماوەیەك دوای ئەمە هەواڵی ئەوە گەیشت دووبارە هێزەکانی مارشال نی سەنگەرەکانی خستونەتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

لەهەموو لایەکەوە هەواڵی ئەوەیان بەناپلیۆن ڕادەگەیاند ڕوسەکان بەزیاندانی زۆرەوە هەتا دەکوژرێن شەڕدەکەن، لەشکری رایفسکی کەزیانێکی گەورەی لەلەشکرەکەی کەوتبوو وقوربانی زۆری دابوو، بەڵام بەشەڕکردنی دلێرانەی وایکرد نی و مورا هێزەکانیان یەکبخەن بۆئەوەی بتوانن لەشکری رایفسکی ڕوسی تێکبشکێنن، دۆڵی سمنوفسکو ئەو ئاوەدانیەی ئەوێ چەند جارێك لەلایەن سوپای فەرەنساوە کۆنترۆلکراو دواتر سوپای ڕوسیا دەیگرتەوە.

سەرئەنجام مارشالەکان داوای ناردنی هێزی سەربازیان لەناپلیۆن کردو لەو بڕوایەدابوون ئەگەر دۆڵی ناوبراو گوندی سمنوفسکوئە لەدەست هێزەکانی ڕوس دەربێنن ئەواسەرکەوتنیان لەمشەڕەدا مسۆگەردەبێت.

بەڵام ناپلیۆن هێزی بۆنەناردن چونکە بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەوان ئەم پێی وابوو بەهۆی ئەوشەڕە دیزوارەی ڕوسەکان دەیکەن بەتەمانین پاشەکشەبکەن ودەست لەشەڕکردن هەڵگرن.

لەو شوێنەدا زیاتر لە (700) تۆپ کە (400) دانەیان هی سوپای فەرەنسابوون و (300) دانەشیان هی سوپای ڕوسیا، تێکرا لەشریقەیان دەداو گوولە تۆپیان دەهاویشتن، چەندجار سوپای هەردوولا کەوتنە شەڕی دەستەویەخەو تۆپەکانیش گوولەکانیان کەوەك باران دادەبارین لەهەردوو لایان دەکوشتن، ئەو ماشالانەی فەرەنسی کەبەشداری ئەو شەڕەیان کردبوو هەتا کۆتایی تەمەنیان ستایشی شەڕی دلێرانەی سەربازەکانی ڕوس دەکەن، لەشەڕی سمنوفسکوئەدا.

فەرنسییەکانیش لەڕووی دلاوەرییەوە لەڕوسەکان کەمترنەبوون، لێرەدابوو باگراتیون پێشنەوەی بکوژرێت کاتێ بینی نارنجۆك هاوێژەکانی سوپای فەرەنسا بەبێ تەقەکردن لەژێر گڕی تۆپەکانیدا هەڵمەت دێنن وبەنێزە شەڕدەکەن، بۆیە بەدەر لەئیرادەی خۆی هاواری کرد (ئافەرین ئافەرین بۆئیوە) چەند دەقیقەیەك دوای ئەمە شازادە باگراتیون، کەبەبۆچوونی ناپلیۆن باشترین سەرداری سەربازی ڕوسی بوو، بەخەستی بریندارببوو وگواستیانەوە پشتەوەی بەرەی شەڕ.

نیوەڕۆ هات، باری دەروونی ناپلۆن گۆڕانی بەسەرداهاتبوو، ئەو بێتاقەتیەی لەوەوەبوو ئەو لەبەرامبەر ئەو داخوازییە یەك لەدوای یەکانەی نی و مورا دا بەوەی هێزی گاردی خۆی بۆیارمەتی دانی ئەوان بنێرێت، بوو، نەك مەسەلەی سەرمابوون و



نەخۆشی، چونکە ئەو ئەمکارەی بەهەڵەدەزانی، ئەمەش لەبەر ئەوەنەبوو نەیویستبێ گاردەکەی خۆی شەڕ پێبکات، بەڵکو لەبەرئەوەبوو سوارە سەربازەکانی ڕوسیا، لەمانەش قازاخەکانی ئوڤاروۆ و پلاتۆف لەپڕ بەرەو لەشکری بوروودینو چووبوون وبەشداری شەڕیانکردبوو.

سەعات سێی پاشنیوەڕۆ ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد هێرشبکرێتەوە سەر تۆپخانەی رایۆسکی و دوای زنجیرەیەك هێرش توانرا کۆنتڕۆڵبکرێت، ناپلیۆن لەمارشالەکانی زیاتر دەیتوانی درك بەو زیانانەبکات کەلەهەموو لایەکەوە پێی دەگەیشت. بەرەبەرەی زەردوسوری ئێوارێ دووهەواڵی گرنگ بەناپلیۆن گەیشت، باگراتیون بەسەختی برینداربووەو هردوتوچکۆفیش کوژراوە.

لەشکری رایوسکی تێداچوو بوو، بەکورتی سوپای ڕوسیا دوای شەڕێکی ناهەموار خەریکی چۆڵکردنی سمنوفسکویە بوون، ناپلیۆن بەرەو ئەوێ چوو، ئەو بەماتی وبێدەنگی سەیری تەرمی سەربازەکان و لاشەی ئەسپە تۆپیوەکانی دەکردو لەبەرامبەر ئەو پرسیارانەی کەکەسانی دەوروبەری لێیاندەکردو تەنها خۆی دەیتوانی وەڵامیان بداتەوە هیچ قسەیەکی نەدەکرد، بۆ یەکەمجاربوو ناپلیۆن ئاوا بەغەمباری وماتی بکەوێتەبەرچاو.

بولێڵەکەی ئێوارە (300) تۆپی سوپای فەرەنسا لێکلێك تۆپبارانی سوپای ڕوسیایان دەکرد کەلەحاڵەتی پاشەکشەدابوون، بەڵام ئەم تۆپبارانکردنە ئەوکاریگەریەی نەبوو کەلێی چاوەڕوان دەکرا: سەربازەکان دەکوژران، بەڵام ئەوانیتر هەڵنەدەهاتن و پەرتەوازە نەدەبون.

ناپلیۆن گوتی(دیارە گوولە تۆپی تریان پێویستە، بێ دڵیان مەکەن ) ئەوقسەیە ئەوەی دەگەیاند تۆپبارانکردنەکەیان زیاتربکەن، ڕوسەکان لەگەڵ پاشەکشە کردنەکەیاندا بەرەنگاریشیان دەکردو بەمجۆرە درێژەی کێشا هەتا تاریك داهات. کاتێ کوتوزۆف، داوایکرد راپۆرتی زیانە گیانی وماددییەکانی بۆبهێنن، بینی نیوەی سوپاکەی لەو ڕۆژە شومەی(7/ی سێپتەمبەر)دا تێداچووە، بۆیە بڕیاریدا نیوەکەی تری ڕزگاربکات وبەبێ شەڕ دەست لەمۆسکۆش هەڵگرێت، لەگەڵ ئەمانەشدا ئەمەنەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی شەڕی بوروودینو بەسەرکەوتنی خۆی لەقەڵەمبدات، هەرچەندە لەڕووی ڕۆحیەوە وەی شێوە هەرەسی هێنابوو، لەڕاستیدا سەرکەوتنی مەعنەوی ئەو بێ چەندوچوون بوو، چونکە بەرووداوەکانی دواتر دەتوانرێت حوکمی ئەمە بکەین کەلەڕووی لێوەشاوەیی سەرکردایەتی کردنی سوپاوە سەرکەوتن زیاتر بەلای ڕوسەکانەوە بوو نەك فەرەنسییەکان.

شەو هەواڵی ئەوەیان بەناپلیۆن گەیاند(47) ژنراڵ کوژراو وبریندارن ودەیان هەزار سەربازیشی کوژراو بریندارن، کاتێ بەچاوی خۆی بینی هیچ یەك لەشەڕە گەورەکانی پێشووی لەڕووی بێبەزەیی و خوێن ڕێژییەوە تای شەڕی بوروودینو ناکەن، ئەو کەبەدرێژایی تەمەنی خۆی سەرکەوتنی واقیعی بەدەستهێنابوون، ئەوەی بۆدەرکەوت شەڕەکانی لودی و ریولی ومیسرو مارنگو ونوسترلیتز و فریدلندو ڤاگرام سەرکەوتن هەژماربکرێن ئەوادەبێ بۆئەم شەڕە ناوێکیتر بدۆزرێتەوە.پێناسەیەکیتری بۆبکرێت.

ناپلیۆن چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد سوپای ڕوسیا جارێکیتر لەمۆسکۆشدا شەڕبکات، ئەو هیچ هەواڵی ئەوستادی جەنگییەی نەبوو کەلەفیلی دا دروستکرابوو، بەڵام دوو ڕۆژ دوای شەڕی بوروودینو، بەپێی لێککدانەوەکانی خۆیی وشیکارکردنی پێشهات و ڕووداوەکان توانی بگاتە ئەوڕایەی ڕوسەکان بەبێ شەڕ مۆسکۆ بەدەستەوەدەدەن.

سەربازە سوارەکانی مورا پێ بەپێ بەدوای سوپای هەڵاتووی ڕوسیا دەکەوتن، ڕۆژی(9/ی سێپتەمبەر) ناپلیۆن گەیشتە موژائیستل و ڕۆژی دواتریش شازادە ئوژن بەخۆیی و لەشکرەکەیەوە گەیشتە روزا، بەرەبەیانی ڕۆژی(13/ی سێپتەمبەر)



ناپلیۆن وگاردە سەربازییەکەی گەیشتنە پوکلۆنایا گورا، ئەویش وەك ئەو کەسانەی دەوروبەری خۆی نەیتوانی، لەجوانی دیمەنەکانی ئەوشارە وەدەنگ نەیەێت، ئەوشارە بەرفراوانە لەبەرتیشکی هەتاودا دەدرەوشایەوەو بەلای ناپلیۆنەوە شوێنێکی گونجاوبوو بۆ پشودانی سەربازەکانی لەوشوێنەدا، هەروەها ئەوشارەش بەڵگەیەکی فشاربوو بۆسەر ئەلکسەندەر بۆئەوەی ناچاربیکات داوای ئاشتی کردن بکات، بەبینینی ئەو دیمەنە جوان و دڵگیرانەی ئەمشارە ویژدانی هەموو لایەکیان ئاسودەبۆوە.

## (4)

لەماوەی ڕۆژی(14/ی سێپتەمبەر)دا سوپای ڕوسیا هەرلە پاشەکشەدابوو وسەربازە سوارەکانی مورا بەدوایانەوەبوون و هەزاران سەرباز بەناو مۆسکۆدا تێپەڕین وبەرەو یازان درێژەیان بەپاشەکشەی خۆیاندا، میلورادڤیچ فەرماندەی لەشکری پێشەوەی ڕوسی بەڵێنی لەمورای وەرگرتبوو ڕێگایان پێبدات بەبێ شەڕ یەکە سەربازییەکانی ڕوسیا لەمۆسکۆ بچنەدەر، لەشکرەکەی رایفسکی ڕۆیشتن لەئاوەدانی بازوفسکا کەشەش کیلۆمەتر لەکولومناوە دووربوو هۆردوویان هەڵدا، لەهەمان یەکە سەربازییەکانی سوپای فەرەنسا بەناو شاری مۆسکۆدا تێپەڕین وچوون لەنزیك ئاوەدانی کاراچارڤدا هۆردوویان هەڵدا.

لە(16/ی سێپتەمبەر)دا سوپای کوتوزۆف مۆسکۆی بەتەواوەتی جێهێشت ولەڕێگای ریازانەوە درێژەی بەپاشەکشەکەی خۆیداو شەو لەنزیکی گوندی کولاکوڤایادا مایەوەو سبەیش بێنەوەی سوپای فەرەنسا هەستی پێبکات ئاراستەی پاشەکشەکەی خۆیان گۆڕی بۆلای ڕاست وئینجا بەسەر لێواری ڕووباری پاهزادا ڕۆیشتن ولەشوێنێکدا بەناوی کراسنایا پاهزا جێگیربوون، بەمجۆرە ڕێگای هاموشۆ وپەیوەندی نێوان سوپای فەرەنسا لەگەڵ ئسمولنسکدا گیرا.

لەسنووری دوروگومیلوڤسکی بەولاوە پروپاگەندەی سەیروسەمەرە بڵاوبۆوە، لەمانەش: گوایا مۆسکۆ چۆڵکراوەو هەموو دانیشتوانی ئەوشارە شاریان جێهێشتووە، بەپێچەوانەی بۆچوونی ناپلیۆن کەس نایەت کلیلی شاری بداتەدەست، دواتر ئەم پروپاگەندەیە ڕاستدەرچوو.

لەڕۆژی(15/ی سێپتەمبەر)دا، ناپلیۆن گەیشتە کۆشکی کریلمین، شەوێك پێشنەوە لەچەند شوێنێکی شاردا ئاگرکرابۆوە، بەڵام پێشبینی کردنی ئەوەی بۆسوتاندنی شار ئەوئاگر کراوەتەوە تائەوکاتەش تەواو مەعلومنەبوو.

بەیانی ڕۆژی(16/ی سێپتەمبەر) ئاگرەکە زیاتر تەشەنەی کرد، چونکە ڕۆژبوو ئاگرەکە زۆر دیارنەبوو، بەڵام کەشەوداهات، واتە شەوی(17/ی سێپتەمبەر) بەهۆی هەڵکردنی باوە کە(24) سەعاتی خایاند، ئاگرەکە پانتاییەکەی زیادیکردو گڕوکڵپەی هەڵسا، دەوروبەری کۆشکی کریلمین وبازاڕەکانی زامسکوڤریچەو سولیانکا سوتان، لەچەند شوێنێکیتری شاریشدا گڕی ئاگر دیاربوو کەشوێنەکانی خاپور بەزەوی دەکرد، کاتی هەواڵی ئاگرکەوتنەکەیان بەناپلیۆن ڕاگەیاند زۆر بەلایەوە گرنگنەبوو، بەڵام کەبەرەبەیانی(17/ی سێپتەمبەر) بەخەبەرهاتەوەو لەپەنجەرەکانی کۆشکی کریلمینەوە بینی دەریایەك لەئاگروگڕ شاری شێوەدا پۆشیوە (بەپێی گێڕانەوەی دکتۆر متێگیەو ئەوانی تری کەلەگەڵ ناپلیۆندابوون) ئیمپراتۆری فەرەنسی ڕەنگی پەڕیوەو دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ بەبێ دەنگی وماتی سەیری ئاگرەکەی کرد ،گوتی (چەند دیمەنێکی ترسناکە، ئەمە کاری خۆیانە، ڕوسەکان، بڕیارێکی سەیریان داوە، مرۆڤێکی سەیرن، ئەوانە گەلێکی هیچن).



لەو ماوەیەدا وردەوردە ئاگرەکە لەکۆشکی کریلمین نزیکدەبۆوەو بەشێك لەکۆشکەکە ئاگر گرتبووی، بەجۆرێك چوونەدەرەوە لەچەند دەروازەیەکی کۆشکەوە سەختببوو، چونکە لەهەموو لایەکەوە با پریشکە ئاگری دەهێنان، مارشالەکان تکایان لەناپلیۆن کرد دەستبەجێ بگوازێتەوە بۆ کۆشکی پترۆفسکویە، کەلەنزیك دەروازەی شاربوو، سەرەتا ناپلیۆن ڕازینەبوو، بەلام دواتر چوو، کاتێ لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەریدا لەکۆشکی کریلمین چوونەدەرێ، تۆفانێك ئاگرو دوکەڵیان بینی، یەکێ لەهاورێکانی ناپلیۆن دەگێڕیتەوەو دەڵێ ( ئێمە بەسەر زەویەکی ئاگر گرتوودا دەڕۆیشتین لەسەر سەرمانەوە ئاسمانێکی ئاگراوی و لەملاولاشمانەوە دیواری گڕگرتوو هەبوون).

ئەم ئاگرە بەدرێژایی ڕۆژانی(17و 18)ی سێپتەمبەر لەزیادبووندابوو، بەلام ئێوارەی ڕۆژی دووەم وردەوردە کەمبۆوە، چونکە باکە نەمابوو بارانیش باری.

لەملاولادا هەندێك خانوبەرەو بازاڕی نەسوتاو دیاربوون، بەلام بەبەراورد لەگەڵ شوێنە خاپووربووەکانی تری شاردا زۆر کەمبوون.

ناپلیۆن دڵنیابوو ئەم ئاگرە ڕوسەکان خۆیان کردویانەتەوە هەتا نەکەوێتەدەست سوپای فەرەنسا، بەوەی ڕوستوپچین هەموو کەلوپەلەکانی ئاگر کوژاندنەوەی لەگەڵ خۆیدا بردبوون ودانیشتوانانی ئەوکەسانەی کەبەمەشخەڵی ئاگرەوە گیرابوون، هەموو ئەمانە گەواهی ئەوەیاندەدا ڕوسەکان ئاگریان لەمۆسکۆ بەرداوە، وەك چۆن هەموولایەك ئەوەیان دەزانی کەڕوستوپچین خۆی بەوە هەڵدەکێشت دەستی هەبووە لەئاگرتێبەردانی مۆسکۆ ودەمێکیش دەستنەبوونی لەوکارە ڕادەگەیاندو بەرگری لەخۆی دەکرد، دواتریش خۆی وەك نمونەی نیشتمانپەروەر دەهێنایەوەو لافی بەمەوە لێدەدا.

بەڵکەنەویستە ئەوەی ئێمە دەمانەوێت لەم کتێبەدا ڕوونی بکەینەوە هۆکاری ئاگر کەوتنەوەکەیە، کەسەبارەت بەمە بۆچوونی زۆر نووسراون، بەلام مەبەستی ئێمە ئەوەیە ئەمەبخەینەڕوو کەڕەنگدانەوەی ئەو ئاگرە چەند کاریگەری لەسەر ڕۆحیەتی ناپلیۆن جێهێشت.

ناپلیۆن بەدرێژایی ئەو ماوەیە کەئاگرەکە کەوتەوەو دواتر کوژایەوە، دڵنیگەرانبوو، زۆرجار هەڵدەچوو ودەمری دەبوو وداخی دڵی خۆی بەوانەی دەوروبەری دەڕشت، جارجارەش چەند سەعاتێك بێدەنگ ومات دەمایەوە، بەلام ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان وزەو توانای خۆی لەدەست نەدابوو وهەر وره بەرزبوو، لەمۆسکۆ سەرافەتی ئیمپراتۆرییە بەرفراوانەکەی خۆی دەکرد، کاروباری ئیمپراتۆری وەك فەرماندەکردن ودانانی کەسانیتر لەشوێن لێپرسراوانی دەوڵەت ولەسەرکارلابردنی لێپرسراوان و..هیتری دەردەکرد.

لە مۆسکۆشەوە ئاگاداری کاروبارەکانی دەوڵەت وشتی تریشبوو، با نموونەیەکی سەیر لەمبارەیەوە بهێنینەوە: دەقی شانۆ نامەیەکی کۆمیدی (فرانسز) کەهەتا ئەمڕۆ وەك خۆی ماوەتەوە، لەکۆشکی کریملیندا ناپلیۆن ئیمزای لەسەرکردوو هەتا ئێستاش بەناوی (فەرمانی مۆسکۆ) ناودەبرێت وبەناوبانگە، بەلام غەمێکی گەورە هاتبۆپێش ئیمپراتۆر، ئەویش ئەوبوو پێویستە چیبکات؟

دیارە ئەوسوتانەی مۆسکۆ تەواوی خۆراك وکەلوپەلی ئەوی کەم نەکۆدبۆوەو عەمباری گەورە لەسوتان پارێزراو بوون، بەلام ئالیك وتفاقی ئەسپەکان بەزەحمەت گیردەکەوت و ئەوسەربازانەی بۆئەو مەبەستە لەمۆسکۆ دەچوونەدەرێ بەدەستی بەتاڵ



دەگەڕانەوە، هەندێك سەربازیش بەنهێنی هەڵدەهاتن و لەبەرچاو وندەبوون، بێسەروبەرەیی کەمێ سەری هەڵدابوو، بەپێی بۆچوونی هەندێك لەمارشال و ژنراڵەکان مانەوەو هۆروهەڵدان لەمۆسکۆ ودەورووبەریدا بەزستانیشدەکرا.

بەڵام پێشبینییە دروستکەی ناپلیۆن دەگوت: ئیمپراتۆریەتی بەرفراوانی ناتوانێ بەردەوامبێت وپێش بەهاوپەیمانەکانی ببەستێت وبتوانێت بۆماوەیەکی دوورو درێژ لەژێر ڕکێفی خۆیدا بهێڵێتەوە، لەدەشتاییە پڕ بەفرەکانی ڕوسیەدا بتوانێت زیاتر پێشڕەوی سەربازیبکات.

ئایا پێویستە هەربەدای سوپای ڕوسیا بکەوێت؟ کەبێ هەواڵ مابوون، خۆ کوتوزۆف دەیتوانی هەتا سیبیریاو تەنانەت بەولاوەتریش سوپاکەی پاشەکشەپێبکات.

ئیتر ئەسپەکانی سوپای فەرەنسا نەك سەدسەد، بەڵکو بەهەزار هەزار دەمردن، هەرچەندە بەهۆی دانانی سەربازگەی چاودێری بەدرێژایی ڕێگای خۆیان دانابوون وئەمەش کەمێ لەژمارەی سەربازانی سوپای مەزنی کەمکردبۆوە، بەڵام هێڵی گەڕانەوەو پەیوەندی لەگەڵیاندا ئاسایش نەمابوو، چونکە سوتانی مۆسکۆ و زۆر شارو شارۆچکەو گوندو ئاوەدانیتر ببووەهۆی ئەوەی ناپلیۆن هەتا کۆتایی تەمەنی خۆی ئەم شەڕە بەمەترسیدارترین شەڕ بزانێت، چونکە دوژمن سوربوو لەسەر ئەوەی هەتامردن بجەنگێت، تەنها یەك ڕێگاچارە مابوو ئەویش ئەوەبوو ناپلیۆن لەئەلکسەندەر بگەیەنێت دەیەوێت ڕێککەوتننامەیەکی ئاشتی شەرەفمەندانە لەگەڵ ئەودا مسۆگەربکات، ئیتر جگەلەمەی ئاشتی بکات ویەخۆیی و سوپاکەیەوە بگەڕێتەوە خۆی لەدەست ئەم دەردە سەرییە ڕزگار بکات ڕێگای تری لەپێش نەمابوون، ئەو حەزیدەکرد تەنها بەبەڵێندانی ئەلکسەندەر ڕازیبێت و تەنانەت ئیمتیازاتیشی بداتێ، بەڵام دوای ئەوەی ناپلیۆن بەنێردراوی ئەلکسەندەر (بالاشوفی گوتبوو ئاشتی بکات، ئیتر هیچ پەیوەندییەکی نەمابوو هەتا لەڕێگایەوە ئەم ئاشتی کردنە بگەیەنێت، ناپلیۆن سێ جار هەوڵیدا نیازی ئاشتی کردنی خۆی بەتزار بگەیەنێت)

توتلمین کەبەڕێوەبەری خانەی پەروەردەکردنی منداڵانبوو، تکای لەسوپای فەرەنسا کردبوو دەست بۆ ئەوخانەیە نەبەن و بیخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە، ناپلیۆن بانگهێشتی ئەوی کردو ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا کەوتە قسەو تورەیی وناڕەزایی خۆی لەئاگرتێبەردانی مۆسکۆ دەربڕی وئاماژەی بەدڕندەیی وتاوانباری ڕوستوپچین کردو دڵنیای کردەوە ئەو دانیشتوانەی لەم شارەدا ماونەوە نابێ هیچ ترس و لەرزێکیان لەسوپای فەرنسا هەبێت.

توتلمین داوای لەناپلیۆن کرد ڕێگای بدات بچێت هەواڵی سەلامەتی ئەم خانەیە بەشاژنی ڕوسیا بگەیەنێت، چونکە ناوبراو سەرۆکی فەخری ئەو دامەزراوەبووە، ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان نەك هەر ڕێگای ئەوەی پێدا، بەڵکو لەپڕ ئەم ڕستەیەشی بەسەر زاردامات و گوتی ( تکایە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم داوایەی من بنووسەو بڵێ من ئێستاش ڕێزم بۆئەو(تزار) هەیەو خوازیاری ئاشتی کردنم)

لەهەمان ڕۆژدا کە(18/ی سێپتمبەر)بوو ناپلیۆن فەرمانیدا ئەوکەسەی پەیامەکە دەگەیەنێتە ئەلکسەندەر ڕێگای لێنەگیردرێت بابڕوات، ناپلیۆن هیچ وەڵامێکی لەتزارەوە بۆنەهاتەوە، بەڵام بێ ئەوەی ئارام بگرێت بڕیاریدا جارێکیتر هەوڵبداتەوە.

یەکێك لەئەشرافە دەوڵەمەندەکانی ڕوسی بەناوی ئاپاکوڤلف، کەئەویش وەك توتلمین ناچاربببوو لەمۆسکۆدا بمێنێتەوەو هەڵنەیەت پەنای بۆسوپای فەرەنسا بردبوو کەیارمەتی بدەن و پارێزگاری لێبکەن، ئەو داواکارییەی ناوبراو گەێندرایە مارشال

مورنیە کەپێشتر لەپاریسدا ئاشنایەتیان لەگەڵ یەکداهەبوو، ئەویش ئەم خواستەی ئایاکوفلفی گەیاندە ناپلیۆن، هرتزن کەکوڕی ئایاکوفلفەو دواتر دەقی گفتوگۆکەی باوکی لەگەڵ ناپلیۆندا لەکتێبێکدا بڵاوکردۆتەوە بەناوی (یاداشت و ئەندێشەکان) ئاوای نووسیوە( ناپلیۆن توڕەیی خۆی سەبارەت بەروستوپچین کەئاگری لەمۆسکۆ بەرداوە دەربڕیوەو ئەوکارەی ئەوی بەدڕندانە لەقەڵەمداوە، دواتر باسی ئاشتی کردنی لەگەڵ تزاردا کردووەو ڕونی کردۆتەوە شەڕی ئەو لەگەڵ بریتانیادایە نەك لەگەڵ ڕوسیادا، ئینجا گوتویەتی ئەو پارێزگاری خانەی پەروەردەکردنی هەتیوانی کردووەو پارێزگاری لەکڵێسای ئاسومیسیونیش کردووەو گلەیشی لەئەلکسەندەر کردووە کەکەسانی خراپی لەدەورەن ونایەڵن ئاشتی بکات ولەنیازی ئاشتی خوازانەی ئەو تێبگات) ئینجا ناپلیۆن بۆچەند ساتێ بێدەنگبووەو دواتر پرسیویەتی (ئەگەر من نامەیەك بۆ ئەلکسەندەر بنووسم ئایا دەتوانم دڵنیابم ئەو نامەیە بەدەستی ئەودەگات ؟ ئەگەر وابێت من فەرماندەدەم خۆت وهەموو ئەوانەی لەگەڵیشتدان ڕێگاتان بدرێت.

لەوەڵامدا ئایاکوفلف گوتی: گەورەم من ئەمکارە بەئەنجام دەگەینم، بەڵام بەرپرسیاریەتی تر نا).

ناپلیۆن نامەیەکی بۆ ئەلکسەندەر نووسی و تێدا پێشنیاری ئاشتی کردبوو ودایەدەست ئایاکوفلف، ناوبراویش بەڵێنی بەئیمپراتۆری فەرەنسادا ئەوپەڕی توانای بخاتەگەڕ بۆگەیاندنی ئەونامەیە بەدەستی خودی تزار.

لەو نامەیەدا هەندێك رستە بەدی دەکرێن کەبەدوورن لەگوتەی هەمیشەیی ناپلیۆن: وەك : من لەگەڵ بەرێزتاندا بەهیچ کینەسۆزیەك نەجەنگاوم) وەك ئەوەی دوای ئەو هەموو شەڕە ناپلیۆن باوەڕی وابێ ناشێ کەس لەئەو داخ لەدڵ بێت، بەڵام ئەو مافی ئەوەی هەیە لەدەست کەسانی تر توڕەبێت!

ئەم نامەیەش وەڵامی نەدرایەوە، ئەم جارەیان بۆ سێیەمجارو دواجار کەوتە هەوڵی ئەوەی دوژمنەکەی بەئاشتی کردن ڕازیبکات.

لەڕۆژی (4/ی ئۆکتۆبەردا ناپلیۆن، مارکی دولریستون کەپێشتر باڵوێزی فەرنسابوو لەڕوسیادا پەیامێکی پێدانارد بۆ مۆردرووی کوتوزوف کەلەتاروتینودا بوون، پێشەو ناپلیۆن حەزیدەکرد ژنرال کولنکور دوك دوڤیانس، کەپێش لریستون باڵوێزی فەرەنسابوو لەڕوسیا، بۆئەم کارە بنێرێت، بەڵام ناوبراو بەبەهانەی ئەوەی کردنی ئەمکارە تەنها ئەوە دەگەیەنێت باری سوپای فەرەنسا بۆ روسەکان ڕوونبکاتەوەو داوای لەئیمپراتۆری فەرنساکرد ئەوکارەنەکات.

ناپلیۆن ڕانەهاتبوو کەس قسەی لەقسەدابکات وبەمە شێلگیردەبوو، بۆیە خراپ توڕەبوو، چونکە لریستونیش هەمان ڕای کولنکوری هەبوو، ناپلیۆن گفتوگۆکەی جێهێشت وگوتی ( من ئاشتیم دەوێت، ئاشتی، من بەشێوەیەکی ڕەها دەمەوێت ئاشتی بکەم، ئێوە تەنها چۆنیەتی [٣٤٧] من سەرفرازبکەن )

ئینجا فەرمانی بەلریستون کرد بێ دواکەوتن بەرەو مۆردووی سەربازی ڕوسەکان بچێت، گەیشتنی لریستون بەسەربازگەکانی پێشەوەی سوپای ڕوسیا، ببووەجێگای دڵخۆشی ستادی فەرمانداری ڕوسیا، تەنانەت خودی کوتوزۆف حەزیدەکرد بەرەو

---

[247] - لێرەدا مەبەستی لەکەسایەتی وێنەکەی خۆیەتی ونابەوێت لەکەداربێت، (و-کوردی).



پیری بچێت وگفتوگۆی سەبارەت بەئاشتی لەگەڵدابکات، بەڵام مەعلومبوو کەلەناو ستادەکەیدا کەسانی لەخۆی نیشتمان پەرستتر هەن وبەهۆی لەدەسچونی مۆسکۆ لەئەوزیاتر کاری تێکردبوون.

لەمانەش کەسانی وەك، ولیسون ، ڕاوێژکاری سەربازی بریتانیا هەبوو کەخزمەتی سوپای ڕوسیای دەکرد، هەروەها شازادە ڤینتـــــزین گـــــرودو دوك ئولـــــدنبورگ و زۆریـــــتر کەلەبەخیلیانـــــدا دوای گوتـــــوزۆف کـــــەوتبوون. بنیگسن کەزۆر ڕقی لەکەوتوزۆف دەبۆوەو کاتی خۆی ڕاپۆرتێکی بۆ تزار بەرزکردبۆەو تێیدا ئاماژەی بەوەکردبوو جێهێشتنی مۆسکۆ بەبێ کردنی شـەڕێکی گـەورە دروسـتنییە، ئەمانـە یـەکیان گرتبـوو و ویلسون بـەناوی گـەل وسـوپای ڕوسـیاوە بەنوێنەرایەتی-یان باشتروایە بڵێین بەهاندانی ئەمانەی لەسەرەوە ناومان بردن، چووەلای کوتوزۆف و بەتوڕەییەوە پێـی گوت: ئەگەر غیرەتت هەیەو خۆت بەپیاو دەزانی بچۆبەپیر لریستونەوەو دووبەدوو بکەونە گفتوگۆکردن، کوتوزۆف هەرکە گوێی لەم قسەیەبوو لەبڕیارەکەی پەشیمان بۆوە.

لەبارەگای ستادەکەی خۆیدا پێشوازی لەلریستون کردو پێی ڕاگەیاند دەسەڵاتی ئەوەی نییە گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵدا بکات وبەڵێنی ئەوەی بەلریستوندا ئەم پێشنیارەی ئەو بگەیەنێتە تزار.

دوای داگیرکردنی مۆسکۆ، چینی ئەرستۆکرات و فیودالەکانی ڕوسیا توشی دڵنیگەرانییەکی گەورەبوونەوەو بەئەلکسەندەریان ڕاگەیاندبوو کەمقۆمقۆو کەڵکەڵەی ئازادی نەك هەر تەنها لەناو جوتیارو زەحمەتکێشاندا دەبیستڕێت، بەڵکولـەناو خـودی سەربازەکانیشدا پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوەتەوە ئیمپراتۆری ڕوسیا بەنهێنی داوای لەناپلیۆن کردووە بێتەسەر خاکی ڕوسیا هـەتاجوتیارو زەحمەتکێشەکان ئازادبکـات [248] هـەتا لەپترسـبورگدا دەیـانگوت نـاپلیۆن کـوڕی کـاترینی دووەمـەو بـۆ وەرگرتنەوەی تەخت وتاراجی مەملەکەتی ڕوسیا هاتووە کەمیراتگرەوەی قانونی ئەمەیەو دوای ئەمە ناپلیۆن ئازادی دەداتە گوندنشینە جوتیارەکان.

ئێمە سەرچاوەی زۆرمان لەبەردەستدان کەشۆرش و ڕاپەڕینی زۆرو سەختکراون لەلایەن جوتیاران دژی کۆلات وفیـودال و ئەشرافەکان لەساڵی(1812)دا.

ناپلیۆن ماوەیەك کەوتە دوودڵییەوە، جارهەبوو فەرمانی دەردەکرد زانیاری لەسەر پوکاچیف بەدەستبهێنن، دواتر فەرمانی دەردەکرد گوتارو باسوخواسی ماندەرانەی دژ بەتزار بڵاوبکەنەوە-یـان لەنامەکانیـدا کـەبۆ زرکوڕەکـەوی [249] دەنووسـی دەیگوت: ئەگەر گوندنشینەکان لەدژی ئەلکسەندەر هانبدەن کارێکی باشە-یان دەچوو لەلەژنێکی فەرەنسی کەلەمۆسکۆدا دوکانی هەبوو بەناوی ئوبرشالمەی دەپیرسی بەڕای تۆ سەبارەت بەئازادکردنی کۆیلەکان ڕای چی؟ ئینجا وازی لەوبیرۆکەیە دەهێناو دەربارەی تاتاری وکازاخەکان دەیپرسی، بەمجۆرە ناپلیۆن فەرمانیدا بەسەرهات و ڕەوشی پوکاچڤی بۆباسبکەن بۆئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیکی کار لەسەر ئازادکردنی جوتیارو زەحمەتکێشەکانی دێهات بکـات وسـەرئەنجامی باشـی لێدەست بکەوێت.

---

248 - مەبەست لەڕزگاربوونی چینی چەوساوە لەدەست ئاغاو ملکدارەکان، بەتایبەت لەگوندەکاندا ، چونکە تزار لەئەربابە گەورەکان دەترسا، (و-فارسی).

249 - پەراوێزی پێشووتر.



جارجار مەسەلەی ئازادکردنی جوتیارو زەحمەتکێشان کەناپلیۆن کاری لەسەردەکرد وای لەئەشرافەکانی ڕوسیا دەکرد زۆر لەمەسەلەی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیاو ئاشتی نەکردن بترسێن، چونکە نومونەی ئەمەیان لەپروسدا بینیبوو و دەزانی، چون بەنەمانی ڕژێمی تزار کارەساتێك بەسەر ئەوانەدێت ئەوسەری دیارنەبێت.

ناپلیۆن یەك هەنگاویشی سەبارەت بەو نەخشەیەی دوایی هەڵنەهێنایەوە، بەڵام ئیمپراتۆری برژوازییەکانی ئەورووپاو دروستکردنی شۆڕش هەتا دژبە حکومەتی ڕوسیاش شتێکی شیاونەبوو، تەنانەت لەوکاتەدا دروستکردنی شۆڕشێکی ئاوا ئەگەری زۆری هەبوو بەهێزبێت، خۆنەگەر تەنها گرتنەبەری ئەم ڕێگایە مابایە بۆ تێکشکاندنی دوژمنەکەی، ناپلیۆن نەیدەکرد.

ماوەیەك ناپلیۆن بیرۆکەی ئەوەی هاتە کلێشەوە لەئۆکرانیاوە شۆڕشێك لەنێو تاتارییەکاندا هەڵایسێنێت، بەڵام هەموو ئەو بیرۆکانەی وەلانان، بۆچوونی ئەو مێژوو نووسانەی فەرنسا زۆر ڕاستە کەدەڵێن: ناپلیۆن بەئەمەکی بۆ هێشتنەوەی بنەماکانی پارێزگارانە کەلەناو خاکی سوتاوی ڕوسیاشدا دەبیاراست لەسەری دەڕۆیشت.

ئێدوارد دریو، خاوەنی کتێبێکی هەشت بەرگی ئەستورەو دەربارەی لێکۆڵینەوە لەسیاسەتی دەرەوەی ناپلیۆن نووسیویەتی ولەم دواییانەدا بڵاوبۆتەوە، لەم ڕووەوە دەڵێت: ناپلیۆن بیرۆکەی هاندانی تاتارصیەکانی کازاخستانی لەدڵدابوو، بۆیەش فەرمانیدا زانیاری لەسەر شۆڕشی قازاخستانی پوکاچیف بۆ کۆبکەنەوە، ئەو لەبوونی ... ئۆکراین بێناگانەبوو وبیری لەمازەپا دەکردەوە، بەڵام کردنی کودەتا لەڕوسیادا بەتێڕوانینی ئەو کارێکی مەترسیداربوو.[250]

ناپلیۆن ڕازی مەترسیداری ڕەوشەکانی بەبێ ترس لێی نەدەکۆڵیەوەو ئاکامەکانی دەزانین، ئەو بەرپاکەری شۆڕش نەبوو، بەڵکو کەسێکبوو شۆڕشی لەناوبردبوو. ئەو پیاوێکی زۆرداربوو هیچ کەسێك بەقەت ئەو حەزی بەدەسەلات ولەخۆبایی بوون نەدەکرد، ئەو نەفرەت ورقی لەشۆڕش و ڕاپەڕین دەبۆوەو دژی بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکان بوو، تەنانەت هەتائەو ئاستەی ئەگەر ئەوپەڕی تەنازولیشبکات لەبەرخاتری مانەوەی ئیمپراتۆریەکەی. لەو ڕۆژانەی ناپلیۆن لەکۆشکی پترۆفسکویەدا سەرگەرمی ئەوەبوو ئایا کۆیلەکان ئازادبکات، ورەی بەرزبۆوەو ئەو سەرکردە تەمەن (25) ساڵەی کەبزوتنەوەی دژە شۆڕشی تولولنی سەرکوتکردبوو، ئەو پیاوەی دۆستی ڕوبسپێربوو وناشنایی لەگەڵ ماکزیمیلیندا هەبوو، ئەم گرفتەی ئایا کۆیلەکان لەژێردەستی سالتیکوفەکانی[251] نێرینەیەدا بێت- یان مێینە، بڕیارێکی ئەوەندە گران نەبوو، ناپلیۆن باش دەیزانی ڕژێمی ڕوسیا زیاتر پەیوەندی بەکۆیلەکانەوەبوو بۆ پایەداری نەك خودی ڕژێمەکەو جیا لەهەریەك لەحکومەتەکانی تری ئەورووپای ژێر دەسەلاتداریەتی خۆی ناپلیۆن ڕەوەیەك جاسوسی هەبوون کەزانیاری لەسەر ئەو وڵاتە بۆ کۆبکەنەوە.

بەڵام ماوەیەکبوو ئەو سەرداره دیارنەدەکەوت لەسەر پێپلیکانەکانی کۆشکی پترۆفسکویەدا بێتەخوارێ وبچێتە سەرێ، ئەو لەناوکۆشدا کەوتبۆ بیرو خەیاڵی خۆیەوە. ناپلیۆن ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان وپاشای ئیتالیاو دەسەڵاتداری ڕەهای ئەورووپاو زاوای ئیمپراتۆری نەمسا، پیاوێکبوو زۆر کەسی ناردبوونە ژێر گیوتن، بۆ مل پەڕاندنیان و زۆریشی لەزیندانەکاندا ڕزاندبوون،

---

[250] - مازپا: ڕابەری کەمینەکانی قازاخی لەئۆکرانیا (1644-1709) ئەو پیاوەیان بەئەسپێکی سەرکەشەوە بەستۆتەوەو دواتر ئەسپەکەیان دەنگداوە هەتا ئاوبراو لەڕێکادا بمرێت. ئەسپەکەش ئاوبراوی بردووە بۆ ئۆکراین ولەوێدا قازاخیەکان ئەویان بەرابەری خۆیان هەڵبژاردووە، قازەبای یەکەم لەسوپای پتری یەکەمدا خزمەتی سەربازی کردووە، دواتر پەیوەندی بەشاری دوازدەوە کردووەو دوای تێشکانی ئەو لەپۆڵتاوادا بۆ تورکیا هەڵاتووە،.. (و- فارسی).

[251] - ئەمە ناوی ژێکبووە کەخاوەن زەویەکی زۆربووەو بۆتە نموونەو پەند هێنانەوە لەزۆر وستەمکردن لەبەرامبەر کۆلەکانیدا.(و- فارسی).

زۆریشی لەتاراوگەدا دیق پێکردبوون، ئێستا ئەمانە کەدژستی ماکزیمیلین وبراکەی روبسپیربوون وغیرەتی ئەوەیان هەبوو وەفاداری لەگەڵ ڕابەرو سەرکردەکانیاندابکەن ودەست بۆ تۆڵەسەندنەوەببەن.

بەرای هەندێك لەوانەی لەدەوری ناپلیۆن بوون دەرکردنی بریاری ئازادکردنی کۆیلەکان لەناو ئەو وڵاتانەی کەلەژێر ئیمپراتۆریەتی فەرەنسادایە بڵاوبێتەوە دەبێتەهۆی ئەوەی سوپا ڕوسیا کەزۆربەیان کۆیلەن وبەزەبری قەمچی ولێدان کراون بەسەرباز، بێ سەروبەرەیی تێبکەوێت وهەرنەبێ شۆرشێکی هاوشێوەی شۆرشی پوگاچف بەرپادەبێت، لەڕاستیدا (35-36) ساڵ پێش ئەوەی ناپلیۆن هێرشبکاتەسەر ڕوسیا لەو وڵاتەدا شۆرشێکی گوندنشینی خوێناوی تێدا بەرپابووەو هەرجارەی لایەکیش زاڵبوون بەسەر لاکەی تردداو زۆرجار شۆرشی گوندنشینەکان شاری گەورەو پانتایی خاکی بەرفراوانیان گرتوون و تەختی پاشایەتی تزاریان وەلەرزەهێناوە.

ناپلیۆن سەبارەت بەشۆرشی جوتیارانی ئەڵمانیا تەنها لەڕووی کتێب وبەڵگەنامەکانەوە زانیاری لەسەرهەبوون کەمێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆسێ سەد ساڵ لەمەوبەر، بەڵام ئێستا سەبارەت بەشۆرشی پوگاچف دەیتوانی زانیاری لەوکەسانە وەربگرێت کەلەژیاندامابوون وتەمەنیشیان زۆرنەبوو، جگەلەمانەش شێوەی ژیان وبنەماکانی ڕەوشی کاری گوندنشینەکانی ڕوسیا گۆرانی بەسەردا نەهاتبوو، لەجیاتی چیخا کەجوتیارو کۆیلەکانیان لەکاتی سزاداندا هەڵدەدایەسەر پۆلۆی گەشاوە، ئیسماعیلوف و کامنسکی پەیدابببوو کەژوورو خانووی تایبەتی ئەشکەنجەدانی ئەمانەبوو، بازارەکانی کۆیلەفرۆشی وەك بازاری سەردەمی کاترین، لەسەرتاپای ڕوسیاوە بۆکرینی کاتی کۆیلەکان دەهاتنە شوێنەکانی منچوگ نومگرودو منداڵیان لەباوەشی دایکوباوك دەردەهێنا بۆفرۆشتن، هەروەك جاران مابو وتەنها ئەوشوێنانە نۆژەن کرابوونەوە. تاکە جیاوازی کەهەبوو ئەوەبوو ئێستا سوپای فەرەنسا لەناوەراستی وڵاتدا جێگیربووەو ئەگەری ئەوەهەیە ببێتە پشتیوانێك بۆ شۆرشی کۆیلەکان، ئێستا دەتوانین بەی بەو ترس ولەرزە ببەین کەئەشرافەکانی ڕوسیا لەساڵی (1812) تێی کەوتبوون، ئێمە ئاماژەمان بەو تەقینەوانەی کەلێرەو لەوێ ڕوویدەدا وبێ توانایی دەسەڵاتدارانی ڕوسیا کرد، ئەوەش دەزانین کاتێ هەواڵی تێشکانی سوپای ڕوسیا لەبوردوینو وهاتنی سوپای ناپلیۆن بۆ مۆسکۆ وپترسبورگ بەتزار گەیشت، کەناوبراو هات بۆکڵێسای قازان چۆن ڕەنگی بزرکابوو وخەڵك چەند بەساردی پێشوازیان لێکرد، چ شتێکبووە هۆی ئەوەی دەستی ناپلیۆن بگرێت لەکردنی ئەمکارە؟ بۆ هەوڵی نەدا زۆرینەی گوندنشینەکان بکاتە لایەنگری خۆی؟
ئەگەر خودی ناپلیۆن هۆی ئەمە ڕوونبکاتەوە بۆچی ئێمە مێشکی خۆمان ئەزیەت بدەین؟ ( ناپلیۆن دواتر سەبارەت بەوە گوتویەتی: نەیتویستووە شۆرشی خەڵك بەرپابێت و بوروژێنێت، حەزی نەدەکرد هەلومەرجێك بێنێتەپێش بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەودا کەس پەیدانەبێت ) بەکورتی ئیمپراتۆری حکومەتی برژوازی تازەی سەرکوتکەر، لەگەڵ بوونی ئەوهەموو پێویستییەدا، خۆی بەنزیك دەزانی لەدەوڵەتی سیستمی فیودالی رومانوف، نەك بەهێزی گوندنشین و کۆیلەکان و ڕاپەرینی میللی، چونکە ئەزمونی تیلیست ئەوەی نیشاندابوو دەیتوانی ڕاستەوخۆ-یان پاش ماوەیەك ڕێککەوتنی ئاشتی بکات، بەڵام



ئەگەر ئەمەی کردبا، واتە: ئازادبوونی کۆیلەکانی ڕاگەیاندباو یاریدەی شۆڕشی گوندنشینی دابا، بەهیچ کلوجێك نەیدەتوانی گفتوگۆی ئاشتی دەستەبەربکات.

ئەو ڕۆژگارەی شۆڕشگێڕە برژوازییەکانی فەرەنسی لەماوەی هاوینی سالی (1789)دا لەڕاپەڕینی گوندنشینەکانی فەرەنسا دەترسان ولەبەهێزبوونی ئەمانە تۆقیبوون، بۆسەیرە ئەگەر لەسالی (1812)دا ئیمپراتۆری بـرژوازی ئامادەبێت ڕۆحـی پوگاشیی لەگۆڕنەنراو بهێنێتەوە دەرێ ؟

( 5 )

چونکە ناپلیۆن وازی لەبیرۆکەی هەلایساندنی شۆڕش لەنێوان گوندنشینەکانی ڕوسیادا هێنابوو ولەهەمان کاتدا کەوتبۆ بیری ئەوەی ستادەکەی خۆی ئەوزستانە لەمۆسکۆدا جێگیرنەکات، دەبوا زوو بڕیارێکی لەم بـارەوە دەرکردبـا، ئەمـەش تـەواو ڕوونبێۆوە کەئەلکسەندەر نایەوێت هیچ جۆرە ئاشتی وڕێککەوتننامەیەکی لەگەلدابکات.

ئایا هێرش بکاتەسەر پترسبورگ؟ ئەم بیرۆکەیە مێشکی ناپلیۆنی سەرقال کردبوو، دوای داگیرکردنی مۆسکۆ ترس ولەرز بالی بەسەر پترسبورگیشدا کێشابوو، خەلك کەلوپەلەکانی خۆیان دەپێچایەوەو لەوشـارە هەلدەهاتن، ماریـا فـدروفنا، دایکـی ئیمپراتۆری ڕوسیا کەڕق وکینەی لەهەموو کەس زیاتر لەبەرامبەر ناپلیۆندا لەدلدابوو، تەواو تۆقیبوو وحەزی دەکرد چ زووترە پەیمانی ئاشتی لەگەل ناپلیۆندا بکرێت، کنستانتینیش خوازیاری ئاشتی بوو، ئاراکچیفیش ئارەزووی ئاشتی کردنی هەبوو وهاتنی سوپای فەرەنساش بەرەو پترسبورگ زیاتر ئەمانەی سامناکتردەکرد، بەلام ئاشکرابوو کردنی ئەم کارە ئەستەمە.

ڕاستە سەربازەکانی فەرنسا لەمۆسکۆدا پشویاندابوو وتەیار کرابوونەوە، بەلام کێشەی کەمی ئەسـپەکان ببـووە لەمپـەرو تەنانەت هەندێك لەمارشالەکان پێشنیاری ئەوەیان کردبوو هەندێك لەتۆپەکان لەمۆسکۆدا بهێلنەوە، لەمۆسکۆدا کاو ئالیك دەست نەدەکەوت، جگەلەمانەش وورەی سوپای فەرەنسا ئەوەندە بەرزنەبوو بتوانن شەڕێکی دوورە دەستی گەورەیتر بکەن، بەلانی کەمەوە بەم زوانە.

ئەو وردە هێرشانەی کەسوپای ڕوسیا لەدەم ڕووباری چدنیشنا دەیکردەسەر لەشکرەکەی مارشال مورا، ناپلیۆنی ناچارکرد پەلەبکات لەبڕیاردانەکەی، ئەم شەڕەی دوایی سوپای کوتوزوف کردبوویەسەر لەشکری مارشال موراو ئەوی هەتا ئەوبەری ڕووباری ناوبراو پاشەکشە پێکردبوو وموراش لەناچاریدا لەشکرەکەی لەگوندی ئەمبەری ڕووبارەکە بەناوی ئاسپاس کوپلیادا جێگیرکردبوو، هەرچەندە ئەم شەڕە تێکهەلچوونێکی لاوەکی بوو، بەلام ئەمە ئەوەی نیشاندەدا تێکشکانی سـوپای ڕوسـیا لەبۆردونیودا ئەوە ناگەیەنێت هێزو توانای خۆی لەدەستدابێ.

سەرئەنجام ناپلیۆن بڕیاریدا، دوای ئەوەی لەشکرێکی (10) هـەزار کەسـی لـەژێر فـەرمانی مارشـال مورتیـە لەمۆسـکۆدا جێبهێشت، سوپاکەی تری لەڕێگا کۆنەکەی کالوکاوە خستەڕێ بۆئەوەی هێرش بکەنەسەر سوپاکەی کوتوزۆف.

ناپلیۆن دەیزانی سوپای ڕوسیا پشویداوەو ئامادەی شەڕکراوەتەوە، بەلام لەوماوەیەدا هێزی سەربازیش گەیشتبۆ سوپای فەرەنساو ئێستا نزیکەی (100) هەزار سەربازی لەدەستدایە کە(22) هەزاریان ئەفسەرو سەربازی گاردی خۆنی.

له(19/ی ئۆکتۆبەر)دا فەرمانی بەڕێکاکەوتنی سوپای دەرکرد، زۆر کەرەستەی گواستنەوەو عەرەبانەی پڕ لەشتومەك و خۆراك کەلەتالانکردنی مۆسکۆدا دەستیانکەوتبوو بەدوای سوپاکەی فەرەنسادا دەهات، بۆ سەروبەرەیی سوپا گەیشتبۆ ئاستێ تەنانەت مارشال داوو چاوپۆشی لەهەندێك فەرمانشکێنی سەربازەکانیش دەکرد کەشتی بەنرخیان دزیبوو وسەرپێچیشیان لەهەندێك وردە فەرمانکردبوو.

ئەسپ تەنانەت بۆ تۆپخانەکانیش کەمبوو بۆیە زۆربەی ئەو کەلوپەلانە درابوونە سەربازەکان هەتا هەڵیگرن، ئەوە بەسە کەبەپێی ئەو کەسانەی ئەمەیان بینیوە لەماوەی یەك ڕۆژ ڕۆیشتنی سوپای فەرەنسا کەلوپەلێکی یەکجار زۆر لەڕێگاکەیاندا جێمابوو کەسەربازە فەرەنسییەکان بەدزییەوە جێیان هێشتبوون بۆئەوەی بارەکەیان سوکبێت، ناپلیۆن زوو هەستی بەومەترسییەکرد ئەگەر دوژمن بەسەربازی ئەسپ سوار هێرشی لەپڕ بکاتەسەر سوپاکەی زەرەدوزیانێکی زۆری لێدەخات، چونکە سەربازەکانی بەبڕینی ڕێگاو هەڵگرتنی کەلوپەل ماندو وشەکەت دەبن وبوون، ئیتر سوپای فەرەنسا سوپاکەی جاران نەمابوو، بەڵام بەهۆی ترسی پاراستنی گیانی خۆی لەسەرخاکی ولاتێکی غەریبی هەر لەهەوڵی ئەوەدابوو چاودێری ڕێکخستنەوەو ڕێکوپێکی خۆی بکات ویەکێتی وپتەوی خۆی ڕابگرێت، هەرچەندە بەلای سەربازەکانی فەرنساوە ناپلیۆن هیچ لەگەورەیی وتوانای کەم نەببۆوە، بەڵام بەلای سەربازانی ولاتانی تری ژێر دەستەی ئیمپراتۆری فەرەنسا وانەبوو ودەیانزانی چەندە دەردە سەری وگرفتاریەکیان لەپێشەوەیە، بۆیە ئەمانە ڕێزو حسابیان لەدڵی خۆیاندا بۆناپلیۆن نەبوو هەتا ببێتە ڕێگر لەبەردەمیاندا، ناپلیۆن تەواو هەستی بەبێ سەروبەرەیی وکەرەمسۆیی زۆری لەسەربازەکانی دەکرد، بۆیە لەپڕ نەخشەکەی خۆی گۆڕی، واتە: بڕیاریدا هێرش نەکاتەسەر سوپاکەی کوتوزۆف، چونکە ئەگەر گریمان لەم شەڕەشدا سەرکەوتووبا، بەهەمان پێوانەی جێهێشتنی مۆسکۆ لەلایەن سوپای ڕوسیاوە گۆڕانکاری بەسەر ئەو پرسیارەدا نەدەهات کەبۆ چ ڕوسەکان پاشەکشەدەکەن وشەڕی یەکلایکەرەوە ناکەن؟ ئەو ئاگای لەو کاریگەریەبوو کەپاشەکشەکردنی سوپای ڕوسیا چ کاریگەری لەسەر ئەوروپا جێهێشتووەو زۆر لەمە دەترسا، بۆیە بڕیاریدا جادەکۆنەکەی کالوکارا جێبێڵێت وبەلای ڕاستدا بچێتەوەسەر جاددەی بوروڤسك ولەوێوە بەئاراستەی باشووری خۆرئاوا سوپاکەی بگەیەنێتە ئاسمولنسك.

هەتائەوکاتەش ناپلیۆن بیرۆکەی وازهێنانی لەشەڕ لەکەللەدانەبوو، پێی وابوو ئەگەر بەبێ تێکهەڵچوون وشەڕ لەڕێگای مالوئیارو سفیترەوە بەکالوگادا خۆی بگەیەنێتە ئاسمولنسك، ئەوا ئەگەری ئەوەی هەیە زستان لەیەکێك لەم دووشارە-یان لەڤێننادا بەسەربەرێت- یان دەست بۆ کارێکیتر ببات، بەڵام پێش هەموو شتێك دەبوا دەستی لەمۆسکۆ بەردابا.

لە(20/ی ئۆکتۆبەر)دا شەودرەنگان بڕیارێك لەلایەن ستادی گشتی سوپای فەرنساوە لەتروی تسکوئە دەرچوو، فەرمانێك بۆ مارشال مورتیە نێردرا کەکۆشکی کرملین بتەقێنێتەوەو دوای وێرانکردنی بەزوترین کات بەهەموو هێزەکەیەوە مۆسکۆ جێبێڵێت و پەیوەندی بەسوپای سەرەکیسەوە بکات.

ئەو فەرمانە تەواو جێبەجێنەکرا، بەهۆی بێ سەروبەرەیی وهەڵپەو شەپرێوی لەپاشەکشەکردن لەمۆسکۆ مارشال مورتیە نەیتوانی دروست ئەوفەرمانە جێبەجێبکات.

ناپلیۆن جارێکیان کەتاوانی ئەوەیان دابۆ پاڵ گوایا پیشگرۆی لەزینداندا خنکاندووە، لەوەڵامدا گوتبووی ( من هەرگیز دەستم بۆکاری بێ هودەیی نەبردووە) بەڵام فەرمانی وێرانکردنی کۆشکی کرملین تەواو کارێکی ملهورانەبوو وگوایا ئەمە وەڵامێکبووە

بۆ ئەو بێدەنگییەی تزار کەسێ جار داوای ئاشتی لێکردووەو وەڵامی نەبووە، بەمجۆرە سوپای فەرەنسا ڕێگا تازەکەی گرتەبەرو لەرۆژی(23/ی ئۆکتۆبەر)دا زۆربەی سوپای فەرنسا گەیشتە بوروسك ومالونیار وسلاوتز ولەلایەن لەشکری فەرەنساوە داگیرکرا.

کوتوزوف کەپەی بەنەخشەکەی ناپلیۆن بردبوو، بریاریدا شارێی کالوگارای لێبگرێت.

لەبەرەبەیانی ڕۆژی(24/ی ئۆکتۆبەر)دا، ژنرال دختورۆف ودوای ئەویش رایوسکی هێرشیانکردەسەر مالونیارو سلاوتز کەشەوی پێشتر لەلایەن سوپای فەرەنساوە داگیرکرابوو، بەهۆی کەڵەکەبوونی سوپاوە شەرێکی خوێناوی ڕوویدا کەهەتا خۆرناوابوون درێژەی کێشا، لەو شەڕەدا هەشتجار مالونیار وسلاوتز کەوتەدەست سوپای ڕوسیاو لێیان سێندرایەوەو سەرئەنجام دواتر لەدەست سوپای فەرنسادا مایەوە، بەڵام زیانی گەورە بەهەردوولا گەیشت، فەرەنسییەکان ( 5) هەزار سەربازیان لێکوژرابوون، لەو شارۆچکەدا کەدەسوتاو نیوەخاپووربوو وسەربازانی ڕوسی وفەرەنسی لەناو گڕی ئاگردا دەسوتان.

ڕۆژی دواتر ناپلیۆن دەیویست شارەزایی وتێبینی پێگەی سوپای ڕوسیا بکات ولەنزیك گوندی گرودنیا یەك دەستەسواری قازاخی هێرشیانکردەسەر سەربازەکانی دەوروبەری ناپلیۆن و دوای شەرێکی توند هێزەکانی تری گاردی ناپلیۆن بەهانایانەوە هاتن ورزگاریان کردن.

مەترسی گەورە کەوتەسەر ناپلیۆن، بەڵام ناوبراو بەدرێژایی ئەو ڕووداوە زەردەخەی دەهاتێ وهیچ نەشڵەژابوو، هەچەند هەموو لایەك ئەو سەربازانەی لەو ڕووداوەدا بەشداربوون ماوەیەکی دوورو درێژ دوای ئەمە بەگەرموگوڕی ومەترسیدارییەوە باسیاندەکرد، گوایا ئەو پێکەنین و زەردەخەنانەی ناپلیۆنیش لەپەشۆکاوی وخەجاڵەتیەوەبووە.

دوای ئەوەی ناپلیۆن بەوردی پێگەی سوپای ڕوسیای تێبینی کرد، لەگرودنیادا ستادێکی شەری پێکهێنا، بەرووکەش ئەوە مەعلومبوو ئەوشەڕە ئەوەی سەلماندبوو ئەگەر ناپلیۆن بیەوێت شەڕێکی تری یەکلایکەرەوەی وەك بورودینو بکات، ڕوسەکانیش جارێ نایانەوێ شەرێکی ئاوابکەنەوەو ئیمپراتۆری فەرەنسیش بەبێ کردنی شەرێکی گەورە بەزەحمەت دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە کالوگا، ستادی جەنگی بەکۆی گشتی ڕایان لەسەر ئەوەدەربڕی ڕوسیا نایەوێت شەڕی گەورەبکات، بۆیە بریاردرا بەزوترین کات ڕێگای ئاسمولنسك بگرنەوەبەر هەتا سوپای ڕوسیا تەواو ئەوشارەیان داگیرنەکردۆتەوەو ڕێگای پاشەکشەکردنی سوپای فەرەنسایان نەگرتووە.

سەرەتا ناپلیۆن دەیویست بەدەستەی جەنگی بڵێت دەبێ بەزۆر هەرچۆنێکبێت درێژە بەبرینی ڕێگابدات وبەرەو کالوگا بچێت. سەرئەنجام لەرۆژی(26/ی ئۆکتۆبەر)دا کەهەواڵی ئەوەیان بەناپلیۆن گەیاند گوایا سەربازەکانی ڕوسیا توانیویانە سەربازە سوارەکانی پونیانوفسکی لەشاری مدین بەدەربێنن، ئیتر ئیمپراتۆری فەرنسا بەدگومانی ودوودڵی نەماو خۆی یەکلایی کردەوە.

بەڵام کوتوزوف نەحەزی بەشەڕدەکردو نەدەشیویست لەگەڵ سوپای فەرنسادا بکەوێتە شەڕی گەورە، ئەو بریاریدابوو ئیتر فشار نەخاتەسەر سوپای فەرەنسا بۆئەوەی درێژە بەپاشەکشەکەیان بدەن، کاتێ کەسانی بێگانەی بریتانی وئەڵمانی کەبەئیرادەی ئیمپراتۆری ڕوسیا خرابوونە گەل ستادی فەرماندەی گشتی، بەردەوام ئەمانە سەرزەنیشتی کەتوزوفیان دەکرد



بەوەی خۆی لەشەڕ لاچەپەك دەكات وترسنۆكە، ئەویش لـەپڕ پەنجـەی لێرادەوەشـاندن وتێـی دەگەیانـدن کـەدەزانێت چ شتێکیان لەبن سەریەوەیەو بۆچ دەیانەوێت پێشوادەی خۆی شەڕی سەرەکی لەگەڵ ناپلیۆندابکات.

(6)

رۆژی(27/ی ئۆکتۆبەر) سوپای فەرەنسا لەپرۆفسکەوە لـەرێگای ورەئیـاو موژائیسـك و دووروگوفـەوە بـەرەو ئاسمولنـسك کەوتنەڕێ.

سەربازەکان بەرێچکەی دوورو درێژ کەوتبوونە ڕێ، ناپلۆن فەرمانیدا لەسەر ڕێگادا هەرچی گوندو ئـاوەدانی وشارۆچـکەی توشی دەبن بیسوتێنن، شایانی ئاماژە بۆکردنە لەموژائیسکەوە ئیتر ئاواییەك نەمابوو هەتا بیسوتێنن، چونکە هەموو ئەو ئاواییانە پێش شەڕی بورودینو بەشێوەیەکی دڕندانە خاپورکرابوون، شاری موژارئیسکیش تەنها وێرانەیەکی سوتاو مابۆوە، لەوکاتەی سوپای فەرەنسا بەمەیدانی شەڕی بورودینودا دەڕۆیشتن تائەو کاتەش لاشەی سەربازەکانی ڕوسیاو فەرەنسا لەوێدا کەوتبوون وکەس نەیدەتوانی بیانتێژێت لەبەر بۆگەن، ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد بەخێرایی برۆن چونکە دەیزانی بینینی ئەو دیمەنە ترسناکە کاردەکاتە سەر وورەی سەربازەکانی، بەتایبەت لەوەی پەیان بەوەبردبوو شەڕەکەیان شێوە دۆڕاندووە.

لە(30/ی ئۆکتۆبەر)دا کەگەیشتنە گژاتسك، سەرەتای سەرما پەیدابیوو، ئەمەش شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، بەپێی ئەو زانیاریانەی کەناپلیۆن لەسەر ئاووهەوای ڕوسیا دەستی کەوتبوو وەریگرتبوو ئەوبوو سەرما لەوناوچەیەدا هەتا کۆتاییەکانی مانگی دێسەمبەر زیاد ناکات، زستانی ساڵی (1812) زووهات و زۆر ساردیش بوو.

کوتوزۆف پێبەپێ بەدوای پاشەکشەکردنی سوپای دوژمندا دەهات، کازاخستانییەکان هێرشی لەپڕیان دەکردنەسەر سوپای فەرنسا، لەنزیك ڤیازمادا سەربازە سوارەکانی سوپای ڕوسیا هێرشیان کردەسەر سوپای فەرەنسا، بەلام کوتوزوف فەرمانیدا شەڕی بەرەیی وگەورە نەکەن.

بەتێڕوانینی ئەو کۆنە سەربازە خاوەن ئەزموونە تەنها ئامانج ئەوەبوو سوپای ناپلیۆن لەسەرخاکی ڕوسیا بچێتەدەرێ، بەلام بەپێی بۆچوونی پەناهندە فەرەنسییەکان و ئەڵمانییەکان، پاشەکشەکردنی ناپلیۆن سەرەتای لەناوچوونیەتی.

وردەوردە کەسـەرماو بەسـتەڵەك زیـادی دەکـردو ژمـارەی هەڵمەتـە پارتیزانـەکانی قـازاخ و فیگنـر، سـسلاوین و داودۆف دەکرانەسەر سوپای فەرەنسا، کاریگەری زۆری دەکردەسەر ڕۆحیەتیان، چون لە(6/ی نۆڤەمبەر)دا کەیـشتنە دووروگوبـوژ ژمارەی ئەو سەربازانەی دەیانتوانی چەك بەدەست بگرن وساغ بەتواناماینەوە تەنها (50) هەزار سەبازبوون.

ناپلیۆن بەرگەی هەموو چەرمەسەرییەکانی پاشەکشەکردنی گرت و وەك هەمیشە پیشەی خۆی هەوڵیدەدا وورەی سەربازەکانی بپارێزێت، چەند سەعاتێك داردەستێکی بەدەستەوەدەگرت وبەسـەر بـەفردا بـەپێ دەڕۆیـشت ودەکەوتـە گفتوگـۆ لەگـەڵ ئەوسەربازانەی کەلەدەوروپشتیدا دەبوون وپێیان دەگەیشت.

هەتا ئەوکاتەش خۆی لەسەر ئەوەساغ نەکردبۆوە دەخوا زستان لەئاسمولنسکدا بەسەربەرێت-یان لەشوێنێکی تردا، بەلام هەواڵێکی لەدووروگوبوژەوە پێگەیشت ئەمەش بووەهۆی ئەوەی ئاسمولنسك جێبێلێت.



لەڕاستیدا گەیشتنی ئەم هەواڵە شتێکی چاوەڕواننەکراوبوو وئەوەبوو ژنرال (ماله) کەیەکێکبوو لەکۆنە کۆماریخوازەکان و دەمێکبوو لەپاریس زیندانی کرابوو وناوبراو توانیبووی لەزیندان هەڵبێت وخۆی گەیاندبۆ یەکێك لەسەربازگەکانی پاریس و فەرمانێکی ساختەی گوایە لەپەرلەمانەوە دەرچووە بۆئەوان خوێندۆتەوەو گوتوویەتی ناپلیۆن لەڕوسیادا مردووەو پەرلەمان حکومەتی کۆماری ڕاگەیاندووەو دواتر وەزیری ناوخۆی دەستبەسەر کردوەو بەگوللەیەکی حەوت تیریش وەزیری بەرگری بریندارکراوە، ئەو نائارامی وشەڕو لێکدانە دووسەعاتی خایاندووەو سەرئەنجام ڕاستییەکە ئاشکرابووەو ناوبراویان دەستگیرکردووەو لەدادگایەکی سەربازیدا دادگایی کراوە ویەکسەرە گوللەبارانیان کردووە، تەنانەت ئەوانەی لەگەڵ ژنرال مالەشدابوون فەرمانی کوژرانیان بۆدەرکراوە، واتە: سەربازەکانی باوەڕیان بەوساختەکاریەی ماله هێنابوو.

ئەم ڕووداوە کاریگەری گەورەی کردەسەر ناپلیۆن وهەستیکرد بوونی لەپاریسدا زۆر پێویستە لەئسمولنمسکدا هەواڵی ئەوەیان بەناپلیۆن ڕاگەیاند کەچیچاگف بەخۆی ولەشکرەکەیەوە کەلەتورکیا گەڕاوەتەوە بەخێرایی بەرەو برەزینادێت، هەروەها ئەوەشی زانی شازادە ئاوژن لەکاتی پاشەکشەکردن و وردە شەڕەکانیدا زیانێکی زۆری لێکەوتووە، هەواڵی ئەوەشی پێگەیشت یەکە سەربازییەکانی ڤیتگنشتاین شاری ڤیتبسکیان خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئیتر نەدەبوا لەبیری مانەوەی لەئسمولنسکدابێت ودەبێ پێشئەوەی ڕوسەکان ڕێڕەوی برەزینا بگرن ئەو پێیداتێپەڕێت وسوپاکەی توشی مەترسی نەکاتەوە.

سەرما ڕۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد، لەکاتی ڕۆیشتن لەئسمولنسکەوە سەربازەکان ئەوەندە لەڕو لاوازبیبوون هەندێکیان کەدەکەوتن نەیاندەتوانی هەڵبستنەوەو لەسەرماندا ڕەق دەبوونەوە، ئەو ناوە پڕلە لاشەی سەربازانبوو، بەهۆی ساویلکەیی وبەدبەختیان کاتێ لەمۆسکۆوە هاتبوون جلوبەرگی زستانەیان نەپۆشیبوو، بۆیە بەناچاری سوپای فەرەنسا زۆرینەی تۆپخانەکەیان لەدوای خۆیان جێهێشت وسەربازە سوارەکانیش بێ وڵاخ مابوونەوە، چونکە ئەسپەکان وەك مێش لەسەرماندا دەتۆپین.

کۆی گشتی سوپای فەرەنسا لەڕوسیادا تەنها (36) هەزار کەس مابوو، ئینجا ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد هەموو عەرەبانەکانی جەنگی بسوتێنن وتەنها تۆپەکان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن، لەڕۆژی(16/ی نۆڤەمبەر)دا، سوپای ڕوسیا لەکراسنوئەدا هێرشیانکردبۆسەر لەشکری ئوژن دوبوهارنەو زیانی گەورەیان پێگەیاندبوو، سبەی شەڕێکیتر دەستی پێکردەوەو فەرەنسییەکان کەوتنە پاشەکشە، لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا نزیکەی (5) هەزار سەرباز کوژراو وبریندارببوون و ئەوانی تریش کە (9) هەزار سەربازبوون خۆیان دابوو بەدەستەوە، بەڵام ڕووداوەکەی کراسوئنە هەر بەمە نەوەستایەوە مارشال نی کەپەیوەندی بەهێزی سەرەکی سوپاوە نەمابوو زۆر زیانی لێکەوتبوو، لە(7) هەزار سەرباز تەنها سێ هەزار سەربازی بەدەستەوە مابوون) لەدەم ڕووباری دنیەپردا لەشکری کوتوزۆف تەنگەی پێهەڵچنبوو. مارشال نی توانیبووی نیوەشەو سەربازەکانی لەڕووبارەکە بپەڕێنێتەوە هەرچەندە هەندێکیانیشی ڵخنکابوون، مارشال نی وهەندێك لەپاشماوەی سەربازەکانی توانیان لەئورشادا خۆیان بگەیەننەوە ناپلیۆن، ئیمپراتۆری فەرەنسا بۆ پاراستنی ڕۆحیەت وڕێکخستنی سوپاکەی بەوپەڕی تواناوە هەوڵیدەدا، بەڵام تێبینی مینسکی نەکردبوو ولەدوبروڤکادا پۆلۆنییەکان کەموکوڕیان لەکارەکەیاندا کردبوو ودمبروڤسکی ژنرالی پۆلۆنییەکان کەفەرمانی پێکرابوو بەرەو بوریسوف پێشڕەوی بکات وباریدەی ژنرال



برونیکوسکی نەکردبوو وسەرئەنجام شاری مینسك لە(16/ی نۆڤەمبەر)دا کەوتبۆدەست لەشکری چیچاگف، لەوشارەدا خواردن وکەلوپەلێکی زۆر کەناپلیۆن پشتی پێئەستووربوو کەوتبۆدەست ڕوسەکان.

وردەوردە بەستەڵەکەکان دەتوانەوە، بارودۆخەکە ناهەمواربوو لەبەشی سەرووی ڕوباری دوریناوە لەشکری ڤیتگنشتاین بەرەو بەدەزینا دەهاتن، چیچاگفیش لەخوارئاوەوە لەپێشرەویدابوو و ڕۆژی(22ی نۆڤەمبەر) دوای ئەوەی دمبرومسکی دەرپەڕاند بۆخۆی چووە ناو شاری بوریسوف.

کاتێ ئەم هەواڵەیان بەناپلیۆن گەیاند ڕەنگی پەڕی، کازاخییەکانی گەڵ پلاتۆف ویەکە سەربازییەکانی ئارفولۆف کەلەپێش سوپای کوتوزو فوزو بوون ماوەی یەك دوو ڕۆژ ڕێیان مابوو بگەنە سوپای فەرەنسا، بۆیە مەترسی گەمارۆدانی سوپای فەرەنسا هاتبۆ ئاراوە.

ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد دەستبەجێ شوێنێکی پەرینەوەی تر لەسەر ڕوبارەکە دروستبکەن، شاری بوریسوف پردێکی جێگیری خۆی هەبوو وکاتێ سوپای فەرەنسا ئەوەی بیست سەربازەکانی ڕوسیا پێشتر ئەو پردەیان تەقاندۆتەوەو خراپیان کردووە. نائومێدی و ترس باڵی بەسەریاندا کێشا.

وەلێ ناپلیۆن زوو وەخۆکەوتو لەسەر بنەمای ئەو ڕاپۆرتەی ژەنەراڵ کوربینو بەرزی کردبۆوە، بڕیاریدا لەستودیانکادا پردێکی سەفەری دروستبکرێت، کەدەکەوێتە سەرووی شاری بوریسوف‌و سەربازەکانی پۆڵۆنی ئەو شوێنەیان دۆزیبۆوە کەشیوە گەروویەکی بەرتەسکبووەو دەتوانرێت لەوێوە لەڕووباری برەزینا بپەڕنەوە.

لەوشوێنەی ڕووباری برەزینادا پانتاییەکی کەمتر لە(25)مەترە، بەڵام هەردوو ئەم بەراوبەری ڕووبارەکە هەتا پانتاییەکی زۆر گلێکی زۆرو تەرایی زۆریشی تێدایە.

ناپلیۆن زۆر بەدانایانە لەشکری چیچاگفی فریودا بەوەی وای نیشاندا دەیەوێت لەبوریسوفەوە بەڕووباری برەزینا بپەڕێتەوە، لەڕۆژی(23ی نوڤەمبەر)دا مارشاڵ ئودینو کنت پالن کەفەرماندەی پێشەوەی سوپای چیچاگف بوو، لەبەرامبەر سوپای فەرەنسادا بەسەختی تێشکا، چیچاگف نزیکببۆوە لەلەشکری ڤیتگنشتاین کەبەخێرایی لەخۆرهەڵاتەوە دەهات، لەبەرەبەیانی ڕۆژی(26/ی نوڤەمبەر)دا ناپلیۆن خۆی گەیاندە ستودیانکا، ئەندازیارو شارەزاکانی پرد دروستکردن بەخێرایی دەستبەکاربوون، لەماوەیەکی کەمدا توانیان دوو ریز بەلەم بەیەکەوە ببەستنەوە بۆئەوبەر ڕووبارەکە، کەمێك دوای نیوەڕۆ یەکە سەربازەکانی ژێر فەرماندەی ئودینو دەستیانکرد بەپەڕینەوە، لەماوەی ڕۆژانی (26 و 27)ی نوڤەمبەردا پەڕینەوە درێژەی کێشا.

ئەو ڕوسانەی لەوبەرەدا جێگیربوون هەوڵیاندا هێرش بکەنەسەر سوپای فەرەنسا کەلەپەڕینەوەدابوون، بەڵام ئەوسەربازانە کەلەژێر فەرماندەیی ژەنەراڵ چاپلیتنردابوون، کەوتنە ژێر هەڵمەتی گاردی ئیمپراتۆری فەرەنساو بەتێشکاوی‌و پەرتەوازەیی هەڵاتن، ڤیتگنشتاین زۆر درەنگ گەیشتە مەیدانی شەڕ، چیچاگف لەلایەن ناپلیۆنەوە فریودرابوو وپاشماوەی سوپای فەرەنسا لەمەترسی ڕزگاریبوو، ژنراڵ ئاپوختین، کەیەکێکە لەمێژوو نووسەکانی سەربازی ڕوسی لەم بارەوە دەڵێت ( بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت پاساو بۆ نالێوەشاوەیی چیچاگف‌و ڤیتگنشتاین، بهێندرێتەوە بەوەی بۆچ ڕووبەڕووی ناپلیۆن نەبوونەوەو شەڕیان نەکرد.



سوپای فەرەنسا ئەوەی لەگەڵ ناپلیۆندابوون هەموویان پەڕیبوونەوە، لەپڕ نزیکەی (12) هەزار سەربازی چیچاو کەکازاخییەکان بەدوایانەوەبوون، بۆ پەڕینەوە لەپردەکە بەهروژم هاتن، ئەمانە کەتۆقیو وشڵەژاوبوون و بەبێ سەروبەریی رژانە بەردەم پردەکان بۆپەڕینەوە.

کوتوزوف لەلایەن کازاخییەکانەوە ئاگادارکرابۆوە کەناپلیۆن لەگەروی ستودیانکاوە خەریکی پەرینەوەیە، دەستبەجێ ئەم هەواڵەی بەچیچاگف راگەیاندبوو، لەوساتەوەختەدا ئەو پردەی خەریکبوو باقی تۆپخانەکەی فەرەنسای بەسەردا بپەڕێتەوە پسا، شارەزاو ئەندازیارەکان بەپەلە چاکیان کردەوە، بەڵام دووبارە لەلایەکیتری شکایەوە، ئەگەر چیچاگف کەسێکی کارامەبا ئەوا دەیتوانی زەبری گەورە لەسوپای فەرەنسا بوەشێنێت، بەڵام ئەو بەئەنقەست-یان بەهەڵە زۆر دەرەنگ گەیشت، کاتێ گەیشت سوپای سەرەکی فەرەنسا جگەلەو (12) هەزار سەربازەی جێمابوون و بەدەستی کازاخییەکان دیل و رەشەبکوژیکران، پەڕیبوونەوە.

هەرکە پەڕینەوە تەواوبوو ناپلیۆن فەرمانیدا ئەو پردانە بسوتێنن، خۆئەگەر ئەو پردانەیان نەسوتاندابا لەوانەبوو ئەو سەربازە جێماوانەی کازاخییەکان بەدوایانەوەبوون هەرنەبێ هەندێکیان خۆیان رزگارکردبا، بەڵام زەروریەتی سەربازی پێویستی بەوەدەکرد بۆئەوەی روسەکان کەڵکی لێوەرنەگرن و بەسەریدا بپەرنەوە، گیانی (12)هەزار سەربازی جێماوی فەرەنسی کاری نەکردەسەر بڕیاردانی ئیمپراتۆر، ناپلیۆن تەنها ئەوکەسانەی بەبەکەڵك دەزانی کەرێزو سیستمی سەربازی تێکنەدەن و ئەو کەسانەی خاوەخاو دەکەن و دوادەکەون جاکە بەهەرهۆیەکەوەبێت، بریندارین تەزیبن... هیتد، بەسەربازی نەدەزانین.

ناپلیۆن ئەوکاتانەی چاودێری سەردانی سەربازە بریندارەکانی دەکرد، تەنها بۆ ئەوەبوو ورەی سەربازە ساغەکان نەروخێت، هەموو پردەکانیان سوتاندن بەڕای ئیمپراتۆرو مارشاڵەکانی بەڕای زۆر لەمێژوو نووسەکۆن و تازەکانیش. پەرینەوەی سوپای فەرەنسا لەرووباری برەزینا، بەیەکێك لەشاکارە سەربازییەکانی ناپلیۆن لەقەڵەمدەدرێت، هەندێك لەمێژوو نووسانی سەربازی تریش ئەمە بەکەموکوڕی کردن لەلایەن چیچاگف و ڤیتگنشتاینەوە هەژماردەکەن، هەروەها هۆکارێکی تری ئەمەش دەگێرنەوەبۆ ئەو بێسەروبەرییەی کەئەلکسەندەری ئیمپراتۆری روسیا دەیکرد.. بۆ رونکردنەوەی ئەمەش: ئەلکسەندەر بەبێ ئەوەی مشوەرەت لەگەڵ کوتوزۆفدا بکات، لەپترسبۆرگەوە فەرمانی بۆ ژەنەراڵەکان دەرکردبوو گەمارۆی ناپلیۆن بدەن و کوتوزۆفیش ئەمەی بەکارێکی گەمژانە دەزانی، خارکەڤیچ مێژوو نووسی سەربازی رووسی لەساڵی(1894)دا لێکۆڵینەوەیەکی لەژێر ناوی برەزینا بڵاوکردەوەو لەو توێژینەوەدا دەگاتە ئەوئەنجامەی کوتوزوف نەیویستووە نەخشەکەی ئیمپراتۆری روسیا جێبەجێبکات و بۆ زوو گەیشتنی بەبرەزینا بەئەنقەست خاوەخاوی کردووە، دەنا هەموو ئامادەباشی و پێداویستی لەبەردەستدابووە. زۆر بەڵگەو نووسراوی ترمان لەبەردەستدان کەلەلایەن چیچاگف وئارمولف و دنیس داویدۆف و خودی کوتوزۆفیشەوە کەئێمە دەگەیەنێتە ئەو بۆچوونەی ناتوانرێت ئەو ڕایەی خارکەڤیچ بەهەڵە لەقەڵەمبدرێت، خارکەڤیچیش وەك ئاپوختین لەوبڕوایەدایە ترس و سامی زۆر لەناپلیۆن چیچلگف و ڤیت

گنشتاینی بەجۆرێ دەستەوەستان کردبوو تەنانەت ئەوەی دەبوابیکەن نەیانکرد، هەروەها خارکەڤیچ ئەو مانۆڕانەی کەناپلیۆن کردوونی زۆربە ژیرانەو سەرکەوتوانەی هەژماردەکات.



هەرچۆنێکبێت، سوپای فەرەنسا رزگاری بوو وبەرەو ڤیلنا درێژەی بەپاشەکشەکەیدا، بەڵام ئەو تەربوونەی کەبەهۆی پەرینەوە لەرووباری برەزینا بەشێوەیەکی کاتی روویدابوو گۆڕا بۆ سەرمایەکی بەهێز، پلەی سەرما گەیشتە (15) پلەی ژێر سفر، دواتر گەیشتە (26و 28 ) پلەی ژێر سفرو تاوناتاوێك دەدەو سەدسەد سەرباز دەکەوتنو لەسەرماندا دەمردن، ئەو سەربازانەی کەتوانای رۆیشتنیان مابوو خۆیان لەتەرمی ئەوانە لادەداو دووبارە ریزبەندییەکەی خۆیان دەگرتەوەو درێژەیان بەرێگابڕینەکەیان دەدا، ئەوانە بەدرێژایی ئەم پاشەکشەکردنە عاقیبەت خراپەیان، توشی سەرمای واسەخت نەبوون، کوتوزوف (1) کوتوزۆف پێبەپێ بەدوای سوپای فەرەنسا دەکەوت، سەربازەکانی ئەویش هەرچەندە جلوبەرگیان لەهی سەربازەکانی فەرەنسا باشتربوو، بەڵام بەدەست سەرماوە دەیانناڵاند.

لێرەدا ئەوەندە بەسە بڵێین کوتوزۆف هەر لەسەرەتای پاشەکشەی ناپلیۆن کەئەودوایکەوت رێژەی سەربازەکانی (97) هەزار کەسبوو، ئێستا تەنها (27) هەزار سەرباز ماون، لە( 662) تۆپ تەنها (237) دانە تۆپی ماون. پێویستە ئەمەشمان بیرنەچێت ترسی جددی ناپلیۆن ئەوەبوو رووبەڕووی سوپای کوتوزۆف بێتەوەو بەهەموو هێزەکەیەوە هێرشی بکاتەسەر. ڕاستە کازاخییەکان بەهێرشکردنە سەر بارو بنەو سوپای فەرەنسا گرفتی خستبۆ بەردەم پاشەکشەکردنی سوپای مەزن، بەڵام بەڵگەنەویستە کازاخییەکان نەیاندەتوانی بەشەڕکردنی جددی وبەرەیی رووبەڕووی سوپای فەرەنسا ببنەوە، ئەوانە لەکراسنوئەدا رۆڵێکی باشیان گێڕابوو، بەڵام سەبارەت بەپارتیزانەکان، فەرەنسییەکان کەمتر لەکازاخییەکان لێیان دەترسان، ئەوانە لەچەند دەستەیەکی هەمەجۆر پێکهاتبوون کەدارو دەستەکانی ( داویدۆف و فیگنرو دورۆخوف و سلاڤین و وادیولسکی و کوداشگ)و دو سێ کەسی تربوون، فەرەنسییەکان ئەمانەیان بەکەسانی رێکخراو مەترسیدار نەدەزانی و هیچ کاتێ دیلی ئەمانەیان لای خۆیان نەدەهێشتنەوەو یەکسەرە گوللەبارانیان دەکردن. پارتیزانەکانیش بەهەمان شێوە ڕایانوابوو ئەو دوژمنەی دەگیردرێت دەبێ گوللەباران بکرێت.

ڤیگنر لەهەموو سەردەستەی لایەنەکانی تری پارتیزانەکان خوێن ڕێژترو درندەتربوو، لەیاداشتانامەی فەرەنسییەکاندا ئاماژە بەپارتیزانەکان نەکراوە، بەڵام زۆر ناوی کازاخییەکانیان بردووەو تائکید لەسەر ئەوسوارانە کراوەتەوە کەلەپڕ هێرشیان کردۆتەسەر سوپای فەرنساو زیانی ئۆریان پێگەیاندوون ولەپڕ دیارنەماون و رۆیشتوون. پارتیزانەکان تەنها هێرشیان دەکردەسەر ئەویەکە سەربازیانەی کەلەحاڵەتی هەڵوەشانەوەو لەبەریەك ترازاندابوون وحاڵیان شڕبووە، لێرەدا ئەو وێنایەی کەپارتیزانی بەناوبانگ دنیس داویدۆف لەیەکێ لەشەڕەکاندا بینیویەتی دەخەینەڕوو( گاردی ئیمپراتۆرمان لێدیارکەوت کەناپلیۆن لەناوەڕاستییەوە لەسەر ئەسپەکەی دەڕۆیشت.. ئێمە یەکسەرە سواری ئەسپەکانمان بووین و لەسەر شارێگاکەدا پێگەی شەڕکردنمان گرت، کاتێ سەربازەکانی دوژمن ئەو هاتوهاوارو بێ سەروبەرەییەی ئێمەیان بینی تفەنگەکانیان ئامادەکردن ودرێژەیان بەڕۆیشتنەکەی خۆیاندا بەبێ ئەوەی هیچ بخەجڵێن وڕۆیشتنەکەیان خێراتربکەن، ئێمە هەوڵماندەدا بەحساب ترس بخەینە دڵی ئەوان، کەچی تەنانەت یەك سەربازیش لەناو ئەو ڕیزە دوورو درێژوو ڕێکەدا نەشڵەژاو بەئێمە پێدەکەنین، من هەرگیز هەیبەت و بوێری ئەو سەربازانەی کەتوشی چەندین گرفتاری وچەرمەسەری ببونەوە لەیاد ناکەم، لەوکاتەی بەتەقە کردنیان ئێمەیان بەرەو دواوە کشاندەوە بەڕمبازی و خۆهەڵسوڕانی ئێمە لەدەوریاندا پێدەکەنین ودرێژەیان بەڕۆیشتن دەداو ڕیزەکانیان تێکنەدەدا.



ئەوڕۆژە توانیمان ژنراڵێك و حەوسەد دیل بگرین و كەلوپەلی سەربازی زۆریشمان دەستبكەوێت، بەڵام كاردی ناپلیۆن بەسەد تۆپەوە بێ خەجلان وبێ باكی بەناوەڕاستی هێزەكەی ئێمەدا تێپەڕین (ناوبراو زیادی پێوەناوە) پێویستە لێرەدا ئەوە وەبیر بهێنینەوە كەلەو ڕۆژانەدا پارتیزانەكان لەگەڵ كازاخییەكاندا پێكەوەبوون وشەڕیان لەگەڵ سوپای فەرەنسادا دەكردو لێرەوە دەتوانین لەو ڕاستییە بگەین بۆ چ توانیومانە (700) سەربازی فەرەنسی بەدیلبگرن.

لێرەدا جێگای خۆیەتی دەربارەی شەڕی میللی ساڵی (1812) هەندێك شت بخەینەڕوو، شەڕی میللی لەڕوسیادا، بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی لەئیسپانیادا ڕوویدەدا هەندێك جیاوازی هەبوو، هەرچەندە لەڕووی توندو تیژی و بێ بەزەییەوە ئیسپانیای وەبیر ناپلیۆن دەهێنایەوە.

لەڕوسیادا توڕەیی خەڵك لەبەرامبەر داگیركەردا مانگ بۆمانگ زیاتردەبوو، لەسەرەتای شەڕدا گەلی ڕوسیا زۆر شتی دەبینی ودرك پێدەكرد، دوژمنێكی درندەو چاوچنۆك هاتۆتەسەر خاكی ڕوسیا، ئاواییەكان وێران دەكات ودانیشتوانەكەشی دادەپڵۆسێ، هەستیان بەو مەترسییە كردبوو نیشتمانەكەیان ئەكەری پارچەپارچەبوونی هەیە، تینوێتی تۆڵەسەندنەوە باڵی بەسەر میللەتدا كێشابوو، ئارەزووی تەمبێ كردنی دوژمنی داگیركەر وردەوردە هەموو گەلی ڕوسیای گرتەوە، گوندنشینەكان دەستەدەستە گروپیان پێكدەهێنان وسەربازە جێماو وشەكەتەكانیان بەدیل دەگرتن و دەیانكوشتن، هەركە سەرو كەللەی ئەوسەربازانەی فەرەنسا دەردەكەوت كەبۆ پەیداكردنی خواردن وتفاق دەچوونە ئەو ئاواییانە، ئەوا یەكسەرە خەڵكەكە لێیان وەدەستدەهاتن وشەڕیان لەگەڵدا دەكردن، ئەگەر هێزی فەرەنسییەكان زیاتربایە ئەوا گوندنشینەكان ئاگریان لەخواردن وتفاقەكانیان بەردەداو چنگیان وەلێرەوەاردەداو ئەمەش زەبری زۆری لەسوپای فەرەنسادەدا، لەڕوسیادا زۆرجار گوندنشینەكان بەشێوەیەكی ڕێكخراو دروستدەبوون وهێرشیان دەكردەسەر تیپە سەربازییە دابڕاو ودواكەوتووەكانی فەرەنسایی وكەمارۆیاندەدان وداوای خۆبەدەستەوەدانیان لێدەكردن، ئەمە بەتایبەت لەكاتی پاشەكشەكردنی سوپای مەزندا زۆرتر ڕوویدا، گوندنشینەكان بەوپەڕی شادییەوە ناونووسی خۆیان لەناوەندەكانی خۆبەخشی سەربازیدا دەنوسی وئەمانە دەبوونە ڕێنوێنی كەری سوپای ڕوسیاو زانیاریشیان بۆدەهێنان سەبارەت بەشوێنەكان وپێگەی سوپای دوژمن، گەلی ڕوسیا بەرگری كردنی لەنیشتمانەكەی لەهەموو شەڕەكاندا سەلماند ئەگەرچی تێشكانیش سەرئەنجامی بوو[252] فەرەنسییەكان بەچاوی خۆیان دەیانبینی وەك ئیسپانیا لەڕوسیاشدا توشی شەڕێكی میللی گەورەبوونەوە، ئەمەش بەومانایەی سوپای ناپلیۆن لەئیسپیانیادا بەدەست شەڕكەرانی میللییەوە گیریان خواردبوو ونیمچە تێكشكێندرابوون، ئێستاش لەڕوسیادا تووشی هەمان گرفت بوونەوە، بەڵام سوپای فەرەنسا لەڕوسیادا بەبارتەقای ئیسپانیا لەناونەچووە.

بۆیە كینەی میللەتی ڕوس بۆبەدەركردنی سوپای داگیركەر وردەوردە زیاتری دەكردو شێوازەكەی گۆڕا بۆ پەیوەندی كردن بەڕیزەكانی سوپاوە، بەپێی ئەو بەڵگانەی كەلەبەردەستدان لەساڵی (1812)دا كاتێ گوندنشینەكانی ولایەتی تامبوفیان بۆسەربازی بانگهێشتكرد ئەمانە لەخۆشیاندا سەمایاندەكرد، بەڵام ساڵانی پێشتر كەداوایان لەگوندنشینەكان دەكرد بچن بۆخزمەتی سەربازی بەكارێكی ناخۆش وپڕچەرمەسەرترین كاریاندەزانی، ئەو گوندنشینانە كاتێ دەچوون بۆ سەربازی

---

252 - مەبەست لەشەڕەكانی پێشووی ڕوسیایە لەگەڵ سوپای فەرەنسادا.(و- كوردی).



لەخۆشیاندا شاییان دەکردو لەشەڕە خوێناویەکاندا بەدلێرانە دەجەنگان وقارەمانانە گیانی خۆیان بەختدەکرد. دوای چۆڵکردنی مۆسکۆ لەلایەن سوپای فەرەنساوەو پاشەکشەکردنی سوپای مەزن هەندێك شت سەریهەڵدا کەبەشەڕی میللییان ناودەبرد، پارتیزانەکانی، ڤیگنر و داویدوف و سسلاوین و کوداشف و وادبولسکی و ئەوانیتر، هەموویان ئەفسەری سوپای ڕوسیابوون و لێپرسراویەتی ئەوەیان پێسپێردرابوو گروپی جەنگی پارتیزانی دروستبکەن، ئەو گروپانەش پێکهاتبوون لەکەسانی خۆبەخش وکازاخی وگوندنشین و... هتد.

(من[٢٥٣] سەبارەت بەم باسە لەکتێبەکەی ترم بەناوی هێرشی ناپلیۆن بۆسەر ڕوسیا، بەدرێژی باسم کردووە) لەدوای ڕووداوەکەی برەزیناوە سوپای فەرەنسا تەنها بەهۆی سەرمای بەهێزەوە توشی گرفتاری نەبۆوە، بەڵکو لەشکری پارتونوشی تێداچوو کەناپلیۆن فەرمانی پێکردبوو بۆ بەهەڵەدابردنی چیچاگڤ لەنزیك بوریسوفدا بمێنێتەوەو دوای ئەوەی کەوتەبەر هێرشی سوپای سەرەکی ڕوسیاو لەماوەی دوو ڕۆژدا نیوەی هێزەکەی کەپێکهاتبوو لە (4) هەزار سەرباز لەدەستداو سەرئەنجام ناچاربوو خۆی بەدەستەوەبدات.

لەڤیلنادا بەڕووکەش پاشماوەی سوپای فەرەنسا ڕزگاری ببوو، کاتێ سەربازەکانی فەرەنسا گەیشتنە نزیك ئەوشارەو کەوتبوونە حاڵێکی زۆر شڕەوەو هەموویان لەسەرمان وماندووییدا لەپێ کەوتبوون، تەنها چەند یەکەیەکی سەربازی مابوون کەئامادەباشی شەڕکردنیان تێدامابوو، لەنزیك ڤیلنادا مارشال نی و مارشال مزون بەسەختی سوپای ڕوسیایان تۆپباران کردو ئەمەش بووەهۆی ئەوەی سوپای ڕوسیا بۆچەند ڕۆژێك دوابکەوێت، کەسوپای فەرەنسا چووەناو ئەوشارە ئەگەری شەڕپێکدادان لەنێوان یەکە سەربازییەکانی خۆیاندامابوو، چونکە هەموویان لەپەناگاو خواردن دەگەڕان ودەستیانکرد بەتاڵان وبڕۆی ئەوشارە.

لە(10 بۆ 12 ) دیسەمبەردا سوپای فەرەنسا دەستی بەپاشەکشەکردن کردەوە بەرەو کۆڤن و هەتا ئەوکاتەش دەیتوانی ئەو کازاخیانەی هێرشی لەناکاویان دەکردنەسەر تێکبشکێنن.

ئێستا شەڕی مەترسیداری مۆسکۆ کۆتایی هات، لە (420) هەزار سەربازی جەنگی کەلەیۆلیۆی ساڵی (1812)دا هاتبوونە ناوخاکی ڕوسیاوە (150) هەزار سەربازی ژێردەستەی ئیمپراتۆری غەرەنساش کەلەدوای سوپای مەزنەوە هاتنەناو خاکی ڕوسیاو بەڕووباری نیەمندا پەڕینەوە، تەنها چەند یەکەیەکی سەربازی پەشرو بڵاو وشەکەت کەدەیانویست بەڕووباری نیەمندا بپەڕنەوە، هیچیتر نەمابۆوە.

ئەو یەکە سەربازیانەو ئەو سەربازانەی بەحساب بۆ پشتگیری سوپای مەزن مابوونەوە، توانرا (30) هەزار سەرباز کۆبکەنەوە، ئیتر سوپای مەزنی فەرەنسا ئەوەی تری هەموو کوژراو برینداروگومبوو ودیلبوون و بەپێ ئامارە سەرەتاییەکانی ئەوکات ژمارەی دیلەکان لەسەد هەزار سەربازی تێنەدەپەڕاند، ئەویتر لەمەیدانەکانی شەڕو لەسەرماو نەخۆشی وبرسییەتیدا تێداچووبوون.

---

[253] - من: نووسەری ئەم کتێبە (ئارلە)مەبەستی لەخۆیەتی . (و-کوردی).

هەفتەیەك پێشئەوەی سوپای مەزن لەسنووری خاکی ڕوسیا بچێتەدەر، واتە لە(6/ی دیسەمبەری ساڵی (1812)دا لەئاواییەکی بچوك بەناوی ئسمورگنی، ناپلیۆن کۆبونەوەیەکی لەگەڵ ستادی فەرماندەی گشتیدا کرد، واتە: کولنکور و دوروك و لوبو و یەك ئەفسەری پۆلۆنی بەناوی سنوڤیچ، سەرکردایەتی کردنی سوپای فەرنسای دایەدەست مارشال مورا، کاتێ ناپلیۆن هەواڵی گەڕانەوەی خۆی بۆپاریس بەمارشالەکانی ڕاگەیاند، ئەوان ویستیان بەڕێزەوە ناڕەزایی خۆیان لەم کارەی ئەو دەربڕن.

بەڵام ناپلیۆن بۆیانی ڕوونکردەوە کەئیتر سوپا لەمەترسیدا نەماوەو ئەوان بەلێوەشاوە دەزانێت بەبێ بوونی خۆی بتوانن سەربازەکان بگەیەننەوە سەرخاکی پروس کەهاوپەیمانمانە، هەروەها پێی گوتن بوونی ئەو لەپاریسدا زەرورییە، چونکە جگەلەخۆی کەسیتر ناتوانێت کاری پێکهێنانی سوپایەکی تازەی (300) هەزار سەربازی ئەنجامبدات بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن.

مارشالەکان بەهانەی ئەوەیان هێنایەوە گوایا لەوەدەترسن سوپا دوای بەرگەگرتنی ئەوهەموو سەنگەسارییە، بەهۆی نەبوونی ناپلیۆن بشلاخێنەوەو بێسەروبەرەیی وپەشێوی دروستببێت، چونکە تەنها بوونی ئیمپراتۆرە کەتاکو ئێستاش سەربازەکانی بەدڵسۆزی هێشتۆتەوە.

ناپلیۆن لەکاتی گفتوگۆکردنی لەگەڵ مارشالەکانیدا زۆربە هێمنی ونارامییەوە دەدوا، ئەوانە باش دەیانزانی جێهێشتنی سوپا لەلایەن ئیمپراتۆرەوە بەهیچ جۆرێك لەترسی گیانی خۆی نییە، جگەلەمەش ئیتر مەترسی نەماوە بۆسەر گیانی ئەو، هەروەها ئەوان چەندین جار بەچاوی خۆیان بینیویانە ناپلیۆن بێئەوەی نیوچاوانیشی هەڵقرچێنێت بەرەومەترسی مەرگ چووەو بۆتەوە.

ناپلۆن بەڕوو هەڵماڵاوی باسی ئەو شەڕەی دەکرد کەبۆخۆی کردبوویی وبۆخۆشی دۆڕاندبووی و ئاماژەی بەوهەڵانەی خۆی دەکرد کەلەو شەڕەدا کردبووی ودەیگوت: ڕووداوێکی دڵتەزێنبوو، ئاو وهەوای ئەم وڵاتە فریودەرانەیەو...، یان دەیگوت مانەوەم لەمۆسکۆدا شتێکی هەڵەبوو، ناپلیۆن بەڕەسمی بەمارشالەکانی گوت: هەواڵی سەفەرکردنم بۆپاریس بۆماوەیەك بەنهێنی بهێڵنەوەو باکەس نەزانێت، چونکە ئەمە جگەلەوەی کاری دەکردەسەر ڕۆحیەتی سەربازەکانی نەدەبوا هەواڵی تێشکان ولەناوچوونی سوپای مەزن بڵاوبێتەوە، هەروەها دەبوا لەبەرئەوەش چونکە ئیمپراتۆر بەبێ گاردی تایبەتی خۆی بەناو خاکی ئەڵمانیادا دەچێتەوە فەرنسا ئەمە ئاشکرا کرابا.

مارشالەکان هیچ گومانیان لەوەنەبوو ئیمپراتۆر بۆ دروستکردنی یەك سوپای گەورە دەگەڕێتەوە بۆپاریس وزوش ئەمکارە جێبەجێدەکات وئەو سوپا تازەیەش بۆ شەڕێکیتر سازدەکات، مارشالەکان هەتا سواری سەر ئەسکلی [254] سەر بەرفریانکردو بینیان لەگەڵ کولنکوردا سواربوون، ئەویان بەهەمان ئەندازە بەئارامی بینی کەچوار مانگ دواتر لەگەڵ سوپایەکی تازەدا بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئەورووپاییەکان بینیانەوە.

---

254 - کالیسکەی سەر بەفر- یان ئەسکلی، کەسەک وئاسك و بزن، رایدەکێشن.(و- کوردی).



دووباره سوپای فەرەنسای جێهێشتەوە، لەناو ئەو سوپایەدا کەسانێك هەبوون لەهەموو شەڕەکانی ناپلیۆندا بەشداریان کردبوو، لەیەکەم شەڕی سەرکەوتوانەی ئیتالیا هەتا شەڕەکانی ڕوسیا بەشداربوون وپێیانوابوو ئیتر هیچ کاتێ شەڕێکی تری وەك بورودینو ڕووناداتەوەو نابیننەوە، بەڵام ئەوانە شەڕی لایبزیان پێشبینی نەکردبوو.

ئەسکلێتەکە بەخێرایی بەسەربەفرە بەستەڵەکەکەدا دەڕۆیی ولەناو تەم ومژەکەدا لەبەرچاو ونبوو، ئەو پیاوەی لەگەڵ خۆیدابرد بڕیاریدابوو وسووربوو لەسەرئەوەی یەك بست لەوخاکانەی ژێر دەسەڵاتداریەتی خۆی بەبێ شەڕێکی مان و نەمان لەدەستنەدات ودەستی لێهەڵنەگرێت.

# ڕاپەڕینی ئەورووپای کۆیلە دژی ناپلیۆن شەڕی میللەتان وسەرەتای لەناوچوونی ئیمپراتۆری گەورە(1813)

(1)

ناپلیۆن سەرەتا بەگالیسکەی سەر بەفرو دواتر بەگالیسکەی کەژاوەیی لەماوەی دوازدە ڕۆژدا بەپۆلۆنیاو ئەلمانیادا تێپەڕی و لەبەرواری(18/ی دیسەمبەری ساڵی (1812)دا گەیشتەوە کۆشکی توپلری پاریس، ئەو ئاگاداری ئەو هەڕەشانە بوو کەلەو ڕۆژانەدا توشی ببۆوە، بۆیە بەشێوەیەکی نهێنی ئەم سەفەرەی ئەنجامدا، کولنکور کەهاوڕێی ناپلیۆن بوو، زۆر بەووریایی و لێهاتووییەوە هەڵسوکەوتی دەکردو بەردەوام وشیاربوو، ئیمپراتۆر لەگەڵ قسەکانیدا کەباسی ئەو شەڕەی دوایی بۆ دەکرد بەکولنکوری گوت: هەڵەی ئەو نەلەدیاریکردنی شەڕدابووەو نەلەپێگەی سیاسییەوە، بەڵکو لەشێوەی ئیدارەکردن و بەڕێوەبردنیدابووە، ئەگەر لەڤێتبسکدا مابایەوە ئەوا ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسی دەهات ودەکەوتە بەردەست وپێکانی.

ناپلیۆن لەقسەکانیدا وەك یاریزانێکی شەترەنج دەدواو وادەهاتەبەرچاو لەدۆڕانی دەستی یەکەمی ئەزمونی وەرگرتووەو دەستی دووەم هەردەبیاتەوە، ئەو هیچ هەستی بەتێشکاوی ولکەداربوونی کەسایەتی خۆی نەدەکرد، کاتێ خەریکی شەڕکردن وئامادەکاری بوو بۆشەڕ هەمیشە وەك کەسێکی دڵشادو بەسینگێکی فراوانەوە پشووی دەداو بێباك دەهاتەبەرچاو،

لەوکاتەوەی بەرەوفەرەنسا گەڕایەوە تەنها بیرو هۆشی ناپلیۆن لای ئەوەبوو، زەمینە بۆ شەڕی ئایندەی خۆشبکات، ئایا لەوکاتەدا جگەلەڕوسەکان بیری لەشەڕکردن لەگەڵ لایەنێکی تردا هەبوو؟ ئایا ئەورووپای مەینەتبار دەستی نەدەکرد بەڕاپەڕین و شۆڕش دژی ئەو؟ کام وڵاتی ئەورووپایی دەبێتە پێشەنگی یاخیبوون و شەڕکردن لەگەڵیدا؟ چەند مانگی دەوێت هەتا ئیمپراتۆری فەرەنسا دەتوانێت سوپایەکی تازە دروستبکاتەوە؟

لەدرێژەی ڕێگا برینەکەیدا ناپلیۆن لەوارشۆدا، بانگهێشتی وەزیرەکەی خۆیکرد، واتە: ئابەدوپرات کەبەپاشای ساکسی دانابوو ولەگفتوگۆکانیدا ناپلیۆن ئەم گوتە بەناوبانگەی خۆی دەگوت (لەوپەڕی شکۆمەندیەوە هەتا گاڵتەجاڕی کەهەنگاوێك زیاترنییە، لەئایندەدا ڕاستییەکان ڕووندەبنەوە) هەروەها درێژەی بەقسەکەی داو گوتی: بەم زوانە بەخۆم و سوپایەکی (300) هەزار کەسییەوە دەگەڕێمەوە کەنارەکانی ویستول و ڕوسەکان ئەو سەرکەوتنەی کەلەپای سروشتەوە دەستیانکەوت، بەگرانیان لەسەردەکەوێت، کێ هەیە لەژیانیدا تێشکانی نەبینیبێت؟

بەم قسەیەی ئەوەی دەگەیاند هیچ کەس تێشکانی وای نەبینیوە، وەك دەڵێن (ئەوەی سەربانەکەی پانتربێت بەفری زۆرتری لەسەردەکەوێت.

هەرچۆنێکبێت ئەم تێشکانە وابەزوویی تۆڵەی ناسێندرێتەوە، کاتێ ناپلیۆن وەك گوتمان گەیشتەوە پاریس هەستیکرد ڕۆحیەتی گەلی فەرەنسا ماتبووە، لەوبەیانەی ئیمپراتۆر بەشێوەیەکی ڕاستیانە باسی شەڕی ڕوسیای تێداکردبوو وبڵاوکرابۆوە، کاریگەری زۆری لەناو خەڵکدا جێهێشت و پرسەو ماتەمینی سەدانماڵی فەرەنسی بۆ ڕۆڵەو پیاوەکانیان و براکانیان باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا.



ڕۆژانی دواتر ناپلیۆن کۆبوونەوەی بەوەزیرەکانی خۆی کردوو بەتوندی کەوتە قسەو سەرزەنیشتی کردن وبەبێ ئاگاو هەوتی لەقەڵەمدان وئەوانی بەبەرپرس دانا لەڕوودانی مەسەلەیەکی وەك ژنرال مالەو داوای لێکردن ئاگایان لەڕەفتاری خۆیانبێت، بەلام سەبارەت بەشەڕی ڕوسیا ئاماژەیەکی کورتی پێکردو بەپێویستی نەزانی-درێژە بەقسەکانی بدات لەو ڕووەوە. خاوەن پلەو پایەکانی دەوڵەت بەهەمان کلکەسوتەو کرنوژبردن وپێهەلاگوتنـەوە پێشوازیان لـەناپلیۆن کـرد، لاسـەپد، سـەرۆکی پەرلەمان بەوپەڕی ڕێزەوە نۆکەریەتی خۆی دووپاتکردەوەو داوایکرد مەراسیمی دانانی تاجی ئیمپراتۆری لەسەر کوڕەکەی ناپلیۆن بەڕێوەبچێت کەئەوکات تەنها تەمەنی ساڵ ونیوێك بوو، ئەمەش وەك ناونیشانی(درێـژەدانی شانـشینی بنەماڵـەی بۆناپارتبێت) ئەندامانی پەرلەمان کەلەبەرامبەر ناپلیۆن کەلەسەر کورسی دانیشتبوو، کەوتبوونـە کرنـوژبردن. لەدرێـژەی قسەکانی ناپلیۆن، ئەوەدیارکەوت ئەو تائێستاش دەیەوێت ئاشتی لەگەڵ ڕوسیادا بکات، ئەو فەرمانەی بیرچوبۆوە کەبەژنرال ورتیەی کرد بەوەی کۆشکی کریملین بتەقێنێتەوە، بەڕای ناپلیۆن هەتا ئەوکاتەش ئەگەری ئەوەهەر هەبوو بەئاشتی کردنێکی هیچ بەهیچ ڕێککەوتن بکات، ناپلیۆن بەپەرلەمانی گوت (ئەو شەڕەی من لەگەڵ ڕوسیام هەیە شەڕی سیاسییە، من بەبێ هیچ کینەو ڕقێکەوە دەستم بەو-شەڕەکردووەو حەزدەکەم ڕوسیا لەو گرفتاریانە ڕزگاربکـەم کەبەدەستی خـۆی توشـی خـۆی کردوون.

مـن دەمتـوانی بـەئازادکردنی گوندنـشینەکان[255] زۆرینـەی خـەڵکی ڕوسـیا دژی دەوڵەتەکـەیان بینـەوەو شـەڕبکەن، زۆر لەگوندنشینەکان داوایان لەمن کرد ئەوکارە بکەم، بەلام خۆم لەڕاگەیاندنی ئەو بڕیارە بوارد کەئەگەری ئەوەی هەبوو مەرگی هەزاران خێزانی لێبکەوێتەوە)

لەڕاستیدا ڕووی دەمی قسەکانی ناپلیۆن لەڕێگای ئەندام پەرلەمانەکانیەوە لەگەڵ لێپرسراوانی گەورەی ڕوسیادابوو، بەپێی قسەی تزارەکانی دواتری ڕوسیا، واتە نیکۆلا پاولوڤیچ، برای ئەلکسەندەری یەکەم لەگەڵ خودی تزاری بووە، ناپلیۆن بەم قسانەی داوای لەئیمپراتۆری ڕوسی دەکرد سوپاسگوزاربن لەوەی ئەو دەستی بۆکاریێ نەبردووە کەهاوشێوەی ڕاپەڕینەکەی پرڤاچێف[256] بێت دژی ڕوسیا، هەروەها زانیویەتی ئەم جۆرە چەکەش بەدەستەوەیە دژبە دەسەلاتدارانی ڕوسیاو دەیتوانی بەکاری بهێنێت، هەموو ئەو کلکەسوتەی کارەبەدەسـتانی دەوڵـەتی فەرەنـساو ئـەو مانۆڕانـەی کـەناپلیۆن دەیکـردن بـۆ خۆلادانبوو لەڕاستییەکان و وەدیارکەوتنی ڕووداوەکان.

ئیمپراتۆری فەرەنسا دوو ئامانجی هەبوو: یەکەمیان دروستکردنی سوپایەکی تازە، دووەم دڵنیابێت لەیارمەتی یان تەنانەت لەبێلایەنی نەمساو پرووس.

ئامانجی یەکەمی بەزووی هاتەدی، ناپلیۆن ئەوکاتەی لەڕوسیادابوو فەرمانی بەحکومەتی فەرەنسی کردبـوو ئەوکەسـانەی ساڵێکیان ماوە بۆخزمەتی سەربازی بیگردرێن وبانگهێشت بکرێن و لەبەهاری ساڵی (1813)دا ئەو سەربازانە تەواو مەشقیان پێکرابوو، هەروەها لەساڵی (1812)شدا فەرمانی دروستکردنی لەشکری میللی دەرکردبوو وئێستاشی بەباش دەزانی ئەو

---

255 - مەبەست لەو کۆیلانەیە کەلەلایەن کۆلاکەکانی ڕوسیەوە کاریان پێدەکراو ئازادیان نەبوو، (و-کوردی).

256 - شۆڕشی کۆیلەکانبووە دژبە خاوەن زەوییەکان، بۆزانیاری زیاتر پەراوێزی پێشوو سەیربکە، (و-کوردی).



لەشکرە میللییە بەدەر لەویستی خۆیان بکاتەسەربازو لەگەڵ سوپایان بخات، هەرچەندە کاروپیشەی گاردی میللی پاراستنی ئارامی وئاسایش بوو لەناو پانتایی ئیمپراتۆری فەرنسادا، لەمانە نزیکەی (100) هەزار سەربازی پێکهێنا، هەروەها ناپلیۆن بەئەو سەبازانەی لەناو فەرنساو ئەڵمانیای ژێر ئیمپراتۆریەتەکەیدا بوون نزیکەی (250) هەزار سەربازی کۆکردەوەو لەگەڵ ئەو سەربازانەی کەلەشەڕی ڕوسیادا بەساغی مابونەوە دەیکردە نزیکەی (300) هەزار سەرباز.

لەسەر ئەم بنەمایە ئیمپراتۆری فەرنسا بەڕاستی دەیتوانی لەبەهاری ساڵی (1813)دا سوپایەکی نەك (300) هەزار، بەڵکو (400) بۆ(450) هەزاری پێکبێنێت، ناپلیۆن گومانی لەوەنەبوو دەتوانێت بەزووی سوپایەکی گەورە دروستبکاتەوە.

ئینجا ناپلیۆن هەر لەبەیانییەوە هەتا شێوان خەریکی دابینکردنی کەرەستەو پێداویستییەکانی سەربازی بوو، هەرلە دەستەبەرکردنی خواردن و کەلوپەلی سەربازی و هیتر... ، چونکە ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا خۆی لەوەڵامدانەوەی ئەو پەیامانەی ناپلیۆن کەبەتوتلمین و ئاپاکوفلف و لریستونی داناربوون، هەروەها بەوئاماژە ئاشتی خوازانەی کەناپلیۆن لەناو پەرلەمانی فەرنساشدا کردنی ئەلکسەندەر هیچ گرنگی پێنەدان و دەستپێشخەری ئاشتی نەکرد، ناپلیۆن بۆی مەعلومبوو دەبێ لەدەم ڕووباری ویستولیدا ڕووبەڕووی سوپای ڕوسیا بێتەوەو بەسەختی تێکیانبشکێنێت وسەرنگونیان بکات، ناپلیۆن دەیزانی زستانی ساڵی (1812) بەلای کوتوزوفیشەوە بەگرانی تەواوبووە، بەڵام هەتا ئەوکاتەش نەیدەزانی دوژمنەکەی لەماوەی دوومانگی کەبەدوای ئەوەوەبوو لەتاروتینەوە هەتا نیمن سێ لەسەرچواری سەربازەکانی تێداچوون، کەنزیکەی (100) هەزار کەس دەکات و سێ لەسەر چواری تۆپخانەکەشی لەدەستداوە.

ناپلیۆن بێ ئەوەی هەڵەکانی لەشکرکێشی بۆ ڕوسیا بکاتەوە دەیتوانی لەویستولیدا چاوەڕوانی ڕوسیابێت ولەوێدا تێکیانبشکێنێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەترسییەکی گەورە هەرلە ئارادامابوو، ئەویش ئەوەبوو ئایا ڕوسەکان هەر بەتەنها دەمێننەوە؟ لەدیسەمبەری ساڵی (1812)دا ژنراڵێکی پروسی بەناوی یورك کەلەژێر فرەماندەیی مارشال ماکدونالدابوو، لەپڕ چوو پەیوەندی بەسوپای ڕوسیاوەکرد.

ڕاستە فردریك ویلهلم زۆر لەناپلیۆن دەترساو بەزووی ئەوکارەی ژنراڵ یورکی مەحکومکرد، بەڵام ناپلیۆن ئەو ڕاستییەی دەزانی کەپاشای پروس کەوتۆتە هەلومەرجێکی خراپەوەو ئەگەر لایەنگری ڕوسەکان نەکات ئەوا ئەوان دەتوانن لەسەر تەختی پاشایەتی لایبەن، هەروەها ئەو مەترسییە سەبارەت بەوڵاتانی تری ژێردەسەلای خۆی لەئارادابوو.

ناپلیۆن ئەوەشی دەزانی ئەگەر پێی وابێ ئەو پروسانەی کەبەدەستی ئەو زەبرو زەنگیان خوادرووەو تەفروتونا کراون ئەگەر سوپای ڕوسیا بێتەسەر خاکەکەیان ئەوانیش بۆ وەرگرتنی ئازادی و ڕزگاربوونیان لەژێردەستەیی هەوڵنادەن، بۆچوونێکی گەمژانەیە،

کوتوزوف دژی درێژەپێدانی شەڕبوو، ئەم ناکۆکیەشی هەرلەبەر ئەوەنەبوو خوێنی سەربازانی ڕوسیا لەپێناو پروس و وڵاتانی تری ژێردەستەی فەرەنسادا نەڕێژێت، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو ئەو سوپایەکی کەم وماندووی بەدەستەوەمابوو وشەڕکردنی تازەی لەگەڵ ناپلیۆندا بەهەڵەو مەترسییەکی گەورە دەزانی، بەڵام تزار هەرگیز بەئاشتی کردن ڕازی نەبوو وپێی وابوو ئەگەر مۆڵەتی ئەوە بەناپلیۆن بدرێت وەسەرخۆی کەوێتەوە ئەوا ئەوروپا وەك پێشوو لەچنگ ئەودا دەمێنێتەوەو سەرئەنجام مەترسییەکەی سەر ڕوسیا هەر لەئارادا دەمێنێت،

ئەگەر سوپای ڕوسیا بتوانێت بچێتەسەر خاکی پروس ئەوا پاشاو خەڵکی ئەو وڵاتە ناچاردەبن چەك دژی فەرەنسا هەڵگرن، لەلایەکی ترەوە هەڵسوکەوتی نەمساش وایلێهاتبوو بەلای ناپلیۆنەوە خۆش نەدەهاتەبەرچاو، خەزوری ئەو ئیمپراتۆر فرانسواو مترنیخ کەئەوکاتە سیاسەتی ئەو وڵاتەی دادەڕشت لەگەڵ ڕوسەکاندا بەڵێن نامەیەکی بێ دەستوەردان لەکاروباری یەکتریان مۆرکردبوو، چونکە نەمسا هەرلەساڵی (1812)وە وەك هاوپەیمانی فەرەنساو لەحاڵەتی شێوە شەڕکردندابوو لەگەڵ ڕوسیادا، ئیمپراتۆری نەمسا بەهۆی ئەو خزمایەتیەی کەتازە لەگەڵ ناپلیۆندا هەیبوو ئەو هەلومەرجەی بەسەر زاوەکەیدادەهات پێشبینی کردبوو وئەگەری ئەوەی هەبوو لەئایندەیەکی نزیکدا لەدەست زۆرو ستەمی ناپلیۆن ڕزگارببێت،

لەو بارودۆخە دژوارەدا ئیمپراتۆری فەرەنسا ئەوەی وەبیرهاتەوە کەدوای داگیرکردنی شاری ڕۆما لەساڵی (1809)دا پاپی دەستبەسەرکردبوو وناردبووی بۆ سافۆن و دواتر لەساڵی (1812)دا فەرمانی دابوو پاپ بهێننە کۆشکی فونتن بلو و وای نیشاندابوو ئەو پاسەوانانەی لەدەوری پاپدان، تەنها بۆ ڕێزگرتن لەئەون ولەوکاتەش کەپاپ لەکۆشکی فونتن بلودا دەژیا هیچ نیشانەیەکی زیندانی کردنی ناوبراو مەعلوم نەبیبوو وپاپ لەو کۆشکەدا تەنها وەك میوانی ئیمپراتۆر سەیردەکراو بەس.

بۆیە پاپ هەمیشە نارەزایی خۆی لەوە دەردەبڕی بۆچی ناپلیۆن شاری ڕۆمای لەدەست ئەو دەرهێناوەو داویەتیە نەوەکەی خۆی و بۆ چ ئەوی زیندانی کردووە، لەبەر ئەم هۆیانە ناپلیۆن لە(19/ی یێنایەری ساڵی (1813)دا بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت چوو سەردانی پاپی کرد، دەبوا ناپلیۆن ئاشتی لەگەڵ کاسۆلیکەکاندا بکات کەهەر لەساڵی (1809)وە نارەزایی و پرتەو بۆڵەیان دژبە ناپلیۆن دەکرد، بەڵام ئەو چاوپێکەوتنە هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە، ناپلیۆن پاپی حەوتەمی ناچارکرد بەڵێن نامەیەکی جدی لەگەڵ مۆربکات ئینجا شاری ڕۆمای دەداتەوەدەست، ئەم بەڵێن نامەیە بەتێڕوانینی گشتی لەهەمان بەڵێن نامەی ساڵی (1802) دەچوو، ناپلیۆن حەزی لەئیمتیازدان نەبوو، جگەلەمەش ئەم کارەی پێخۆشنەبوو هەر لێشی نەدەزانی.

ئەو دەست لەشاندانەی لەمانگی یێنایەری ساڵی (1813)شدا لەگەڵ پاپداکردی ئەوەی بۆ ئاشکرابوو کەکاردینال دی پیترو ئامۆژگاری پاپ دەکات بۆیە ناپلیۆن بڕیاری دەرکرد کاردینالی ناوبراو دەستبەجێ دەستبەسەربکرێت و لەفونتن بلو دووربخرێتەوە.

لەڕۆژگاری دواتردا قسەیەکی سەرنجڕاکێش لەدەم ناپلیۆن دەرهاویژا سەبارەت بەم ئاشتی کردنە لەگەڵ پاپداو گوتی(لەئێستادا دەبێ ڕۆما ئازادبکرێت..) بەڵگەی بەردەست سەبارەت بەم گوتەیەی ناپلیۆن، لەسندوقەکاندا شاردرابۆوە هەتا سەرکەوتنی گەورە بەسەر دوژمندا لەکەنارەکانی ئەلب– یان ویستولدا ئەم دیکومێنتانە دەرنەهاتن، لەڕاستیدا بینیمان ناپلیۆن لەساڵی (1813)دا ساڵانی دواتریش بەوەی دەیویست سەرکەوتنی گەورە بەدەستبهێنێت، گفتوگۆو ئاشتیکردنی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەشتێکی زۆر دەزانی، ساڵەهای ساڵبوو بەخت یاوەری بوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شەڕی ساڵی (1812) بەبەراورد لەگەڵ ڕۆژگاری ژیانی سەربازی ناپلیۆن وشاکارە درەوشاوەکانی وەك داگیرکردنی تۆلۆن لەساڵی (1793)دا هەتا دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێکی مەزنی جیهانی، وەك خاڵێکی ڕەش[٥٧] وابوو لەڕووی پرشنگی ودرەوشاوەیی

سەرکەوتنەکانی پروس ئامادەی پەیمان شکێنی ببوو: پاشای پروس داوای لەناپلیۆن کرد سەربازگەکانی فەرەنسا لەچەند خاڵێکدا لابەرێت، هەروەها داوای(94) ملیۆن فرانکی دەکرد بۆخەرجی سەربازەکانی فەرەنسا لەپروسدا بدرێت، بەلام لەوەلامدا ئەم داخوازیانە ڕەتکرانەوە، بریتانیاش نەیدەتوانی داگیرکردنی ئیسپانیا لەلایەن فەرەنسییەکانەوە بەڕەسمی بناسێت، ناپلیۆن کەلە(14)ی فبرایەردا لەکۆبونەوەی ئەنجومەنی قانون گوزاریدابوو بەڕەسمی ڕایگەیاندبوو(بنەماڵەی پاشایەتی فەرەنسا حوکمڕانی ئیسپانیایان کردووەو لێرەودواش هەرحوکمی دەکەن).

مترنیخ [258] لەمانگی مارسدا پێشنیارێکی بۆ ناپلیۆن کردبوو ئەگەر ناوبراو بیەوێت ئاشتییەکی سەرتاسەری و هەمەلایەنە بکات ئەوا ئەو لەو زەمینەیەدا هەوڵەکانی دەخاتەگەڕ.

ناپلیۆن ئەم پێشنیارەشی ڕەتکردەوەو تاکەڕێگاچارە بەلای ئەوەوە سەرکەوتنێکی گەورەبوو لەکەنارەکانی ویستول و ئەمەش هەموو کێشەکان چارەسەردەکات،

ئەو لەڕاگەیاندنەکەی(14)ی فبرایەردا ئاماژەی بەوەکردبوو، هەموو خاکی ژێر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا دەبێ وەکو خۆی بمێنێتەوە، مترنیخ کەهەتا ئەوەکاتەش نەیدەویست لەگەڵ ناپلیۆندا پێهەڵبچێت، لەفێنْنادا بەئرتوی باڵوێزی فەرەنسای گوتبوو ئیمپراتۆرەکەتان بەم قسانەی ڕێگری دەکات لەبەردەم ئاشتیکردن لەگەڵ پروس و ڕوسیاو بریتانیادا.

ئەمسا هەمان وەلامی بۆ بریتانیاو ڕوسیا نارد، واتە: ئەو پەیامەی ناپلیۆن دەست لەبستێکی خاکی ئیمپراتۆریەتەکەی هەڵناگرێت وهیچ ئیمتیازێکیش نادات وتەنها شەڕ ئەمانە یەکلایی دەکاتەوە. سەرئەنجام پاشای پروس لایەنگری ئەسکەندەری کردو یەك هاوپەیمانیەتی لەگەڵدا بەست، ناپلیۆنیش لەبەرامبەردا بەیەك سەربازگیری تازە وەلامی دایەوە. ساکس و باوی یر و ورتمبۆرگ وباد، هەتا ئەوکاتەش سەرلەرێگای فەرمانەکانی ئەوبوون.

(□)

لەڕۆژی 15/ی ئیبریلی سالی (1813)دا ناپلیۆن لەئارفورتدا کەوتەگەل سوپاکەی و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕوس و پروسەکاندا، کەوتەڕێ. ئەم سوپا تازەیە بەشێوەیەکی زۆرباش تەیارکرابوو، بەدرێژایی ئەو ساڵە ناپلیۆن هەموو کاتەکانی خۆی بۆ پەرداخکردنی ئەو سوپایەو دانانی بودجە بۆی تەرخانکردبوو، ئەوەندە بودجە بۆ ئەو سوپایە دانرابوو هەر شتێکیان کەمبایە دەیانتوانی بەپارەی کاش بیکڕن و بارگرانی وەهراسانی دەوڵەتە ژێردەستەو هاوپەیمانەکانی فەرەنسا نەبن.

ناپلیۆن نزیکەی (200) هەزار سەربازی چەکدارو نزیکەی ئەو ژمارەیەی سەرەوەشی سەربازی ئیداری وکارەکانیتر هەبوو، دروست پێش شەڕ، کوتوزوف وەزیری بەرگری ڕوسیا مردبوو وسوپای ڕوسیاو پروس فەرماندەی جەنگیان نەبوو، لەسەرەتای شەڕەکاندا ناپلیۆن سەرکەوتنی بەدەستهێنان، ڕوسەکان لەویسنفلس کرانە دەرێ و شەڕەکانی دووەم و سێیەمیش لەهەمان مانگدا لەنزیك هەمان شارو لوتزندا ڕوویدا.

سەرکەوتنی ناپلیۆن لەو شەڕانەدا بێگەردو کامڵبوو، لەویسنفلسدا مارشال بیەیر کەلەنزیك ناپلیۆندابوو پرینچکی گوللە تۆپێکی بەسینگی کەوت ودەستەوبەجێ مرد، ناپلیۆن گوتی: مردن لەئێمە نزیك دەبێتەوە، لەبەرچاوی ناپلیۆن سەربازەکان

---

[258] - سیاسەتمەداری گەورەی نەمساوی وسەرۆکی حکومەت، واتە سەرۆك وەزیرانی ئەو وڵاتە.(و-کوردی).



تەرمی ئەو مارشالەیان لەشانێڵەکەی پێچاو لەمەیدانی شەڕیان دوورخستەوە، شەڕی لوتزن زۆر دیژوارو خوێناوی بوو، ناپلیۆن بەسواری ئەسپەکەی لەبەرەیەکی شەڕەوە بۆ بەرەیەکیتر دەچوو وئیدارەی بەرەکانی شەڕی دەکرد، ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاو فردریك ویلهلمی پاشای پروس لەنزیك مەیدانی شەڕەکەدابوون، بەلام شەڕو سەرافەتی بەرەکانی شەڕیان نەدەکرد، ڕوس و پروسەکان لەوکاتەی نزیکەی (20) هەزار سەربازیان لێکوژابوو پاشەکشەیان کردوو زیانەکانی سوپای فەرەنساش لەهی ئەوان کەمترنەبوو، دوای چەند ڕۆژێك ناپلیۆن درسدی داگیرکرد.

دوای شەڕی لوتزن، مترنیخ کەوتە نێوانێ هەتا ئاشتی لەنێوان ناپلیۆن و هاوپەمانانـدا بکات و هاوپەیمانیەتی نەمساش بەپارێزراوی بمێنێتەوە، شێوەی ئەو ئاشتی کردنەش بەمجۆرەی خوارەوەبوو:

دەبوا ناپلیۆن دەست لەگراندوشەو وارشۆو شارەکانی هانزە ئاتیك و ولایەتی ئایلیری هەلگرێت.

لەبەرامبەردا، بەشەکانی تری ئەورووپا، واتە: بەلجیکاو هەموو ئیتالیاو هۆلەنداو ولاتی وستفالیش لەژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسادا بمێننەوە،

ناپلیۆن ئەم پێشنیاری ئاشتی کردنەی ڕەتکردەوەو ژنرال بوبنای بۆکۆشکی ئیمپراتۆری نەمسا ناردوو پێی گوت (من پێویستم بەپێکهێنانی ئاشتی بەرپاکردنی تۆ نییە، تۆ دەتەوێت لەناوی قوڕاودا ماسی بگریت...)

بەگاڵتەجاڕیەوە گوتبووی بەعەترو گوڵاو ڕژاندن ناتوانرێت ولایەتەکان بخرێتەژێر دەست).

ئیتر نەمساوییەکان بەداواکردنی گەڕاندنەوەی ولایەتی ئایلیری بۆ ژێر دەسەلاتی خۆیان شێوە گرژیەکیان دروستکردبوو ودیارە دوای ئەمەش داوای میلان و توسکان دەکەنەوەو ئەوەندە بەجەرگو ئازابوون هەتا ئەوناچار بەشەڕکردن بکەنەوە، شەڕی یەکەم [359] بەئاشتی کردن کۆتایی هات، ئیمپراتۆری فەرەنسا بەم قسانەی ئەوەی بەدیاردەخست ئەگەر بیانەوێت ولایەتێك لەچنگ ئەو دەربێننەوە ئەوا دەبێ شمشێرەکەیان لەکالان ڕابکێشن.

لەبەرئەمە دووبارە ناپلیۆن بڕیاری دایەوە بۆهەمیشە شەڕبکاتەوەو هیچ لەدەستنەدات، لەهامبۆرگدا ڕاپەڕین دژبە ناپلیۆن دەستی پێکردبوو، ئیمپراتۆر ژنرال داووی بەفەرماندەی لەشکرێك نارد بۆشارەکانی هانزە ئاتیك بۆئەوەی سەرکوتی ئەوانەبکات کەدژی پۆلیس و پیاوانی گومرگ ببوونەوە، هۆی ئەو ڕاپەڕینەش ئەوەبوو پیاوانی گومرگی فەرەنسی بەگرتنەبەری توندوتیژی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا بازرگانەکانی ئەو شارانەیان توشی دەستەوەستانی کردبۆوە، ناپلیۆن فەرمانی بەژنرال داوو کرد هەندێك لەسیناتۆرەکانی هامبۆرگ و ڕابەرانی ڕاپەڕینەکەی دژی فەرەنساو چەند کەس لەئەفسەران گوللەباران بکات وئەو پێنج سەت کەسەی کەبەسەرپێچیکەر ناسراون سامانەکەیان دەستبەسەر بکات.

دواتر ناپلیۆن بەهاوەڵی سوارانی گاردەکەی خۆی لەدرسد چۆدەرێ هەتا خۆی بگەیەنێتە ئەو سوپایەی کەلەلای خۆرهەلاتەوە بەرەو بوتزن کەدەکەوتە کەناری ڕووباری شپزە، هێزی هاوپەیمانانیش بەفەرماندەیی ویتگنشتاین وبارکلی دوتولی و میلورادوڤیچ و بلوخر بوون وشەڕی بوتزن کەلە(20/ی مانگی مایودا دەستی پێکرد لەخۆرئاوای ڕۆژی دواتردا کۆتایی هات، ناپلیۆن مارشال نی ناردبوو هەتا لەخۆرهەلاتەوە دەوری سوپای دوژمن بدات، بەلام نی درەنگ گەیشتە ئەو شوێنەو هێزی هاوپەیمانان پاشەکشەیان کردبوو.

---

[359] - مەبەست لەشەڕی یەکەمی ناپلیۆنە لەگەل ئیمپراتۆریەتی نەمسادا، (و-کوردی).



ئەم شەڕەش وەك لێكدانەكەی لوتزن خوێناوی بوو، لەهەر دوولا سێ هەزار كەس كوژراو بریندار هەبوون، ئەمجارەشیان سەركەوتن بەنسیبی ناپلیۆن بوو وناوبراو دەیویست یەكسەرە بەرەو بەرلین بچێت وسوپای ڕوسیاو پروس تێكبشكێنێت، دوژمن بەقونەشەڕەوە پاشەكشەیان دەكردو مەسەلەی ڕاوە دوونانیان بەدوادەخست، لەڕۆژی(22/ی مایۆدا ناپلیۆن لەگورلیتزدا ڕووبەڕووی سوپای دوژمن بۆوەو لەوێشدا بەسەریاندا زاڵبوو.

لەبەرەبەری ئێوارەدا نزیك كۆتاییهاتن بەو شەڕە، دوروك لەناپلیۆن نزیكبۆوەو بۆچەند ساتێ لەگەڵیدا كەوتە قسەو ئینجا لێی دوركەوتەوەو بەپەژارەوە هاتەلای كولنكورو پێی گوت (دۆستی میهرەبانی من، ئیمپراتۆر دەبینی؟ ئەو ئێستا دوای ئەو نەهامەتیانە[260] سەركەوتنی بەدەست هێناوەتەوەو بەبۆچوونی من كاتی ئەوەهاتووە ئەزموون لەتێشكانەكانمان وەربگرین.. بەڵام دەبینی ئەو هیچ نەگۆڕاوە... و لەشەڕكردن تێرنابێت، ئاكامی ئەمە باش نابێت).

مارشال دوروك ئەجەلی هاتبوو، گوللەیەكی وێڵ بەر ئەودارەكەوت كەناپلیۆن لەنزیكییەوە ڕاوەستابوو، گوللەكە سەرساچمەی كردو گەڕایەوەو بەر دوروك كەوت... ، مارشال دوروك لەگیانەڵادا تەنها توانی ئەوە بەناپلیۆن بڵێت، هیوادارم لەئاشتی كردندا سەركەوتووبیت وپەیمانی ڕێككەوتن ببەستیت. ناپلیۆن لەوەڵامدا گوتی (خواحافیز هاوڕێ، ئێمە دووبارە یەكتر دەبینینەوە... لەوانەیە بەم زووانەش)

مەرگی پیاوێكی وەك دوروك، كەئیمپراتۆر خۆشی دەویست و پشتی پێدەبەست، كاریگەری زۆری كردەسەر ئەو ولەوكاتەی دوژمن تۆپبارانی ئەو شوێنەی دەكردو پرینچكی تۆپەكان لەملولای دەكەوتنەوە لەبن قەدی دارەكە دانیشت و ماوەیەك مات وغەمبار كەوتە بیروخەیاڵەوە، ناپلیۆن لەماوەی شەڕەكانی ساڵی (1813)دا زۆرجار گیانی خۆی دەخستە مەترسییەوە، بەتایبەت لەو شوێنانەدا كەپێویستی بەبوونی ئەویش نەبوو، ئەوكارەی كەپێشتر نەیدەكرد تەنها لەكاتی زۆر زەروریدا، چونكە ئەو لەو بڕوایەدابوو، مانی فەرماندەی سوپا شتێكی پێویستە بۆ درێژەدان بەشەڕو سەكەوتن.

تەنانەت بیرۆكەی ئەوە لای ئەوكەسانەی نزیك لەخۆیی و دەوروبەریشی هەستی پێدەكرا كەناپلیۆن لەناخیدا بێزارە لەگیانی خۆی ، بەڵام ئەم ئارەزووی بەمەرگەی بەنهێنی دەهێشتەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەی ڕوس و پروسەكان پاشەكشەیان دەكرد، بەتۆپ باران و تەقەكردنی زۆرەوە بەرەودواوە دەچوونەوە، گەرچی ناپلیۆن بێ باكانە بەناو بڵێسەی ئاگری تۆپ وگوللەكاندا گیانی خۆی توشی مەترسی دەكردەوە بێ ئەوەی پێویستبكات لەڕووی سەربازییەوە ناوبراو لەو شوێنانەدابێت، دوای شەڕی بوتزن وچەند ڕۆژێك ڕاوەدوونانی سوپای دوژمن، هەردوولا پێشنیاری ئەمسایان قبوڵكرد، لە(4/ی یۆلیۆی ساڵی (1813)دا پەیماننامەی ئاگربەستی پلیس ڤیتزیان مۆركرد، لەكاتی مۆركرنردنی ڕاگرتنی شەڕ نەهاوپەیمانان و نەناپلیۆنیش ڕازی نەبوون ڕاگرتنی ئاگربەست ببێتەهۆی ئاشتی كردنی یەكجارەكی.

هەرچەندە هەردووكلا لەسەر بنەمای پێشنیارەكەی میترنیخ ڕازیبوون نوێنەرانی خۆیان بۆ ئاشتی كردن بنێرن بۆ پراگ، هاوپەیمانان دەیانزانی دوای سەركەوتنی ناپلیۆن لەشەڕەكانی لوتزن و بوتزن هیچ جۆرە ئیمتیازێك نادات، بەڵام ئیمپراتۆری ڕوسیا تەنها لەبەرئەوە بەئاگربەست ڕازی ببوو، چونكە باركلی دوتولی بەرەسمی بەتزاری ڕاگەیاندبوو پێویستە دوای ئەو هەموو شەوڕوشۆڕانە سوپای ڕوسیا ڕێكبخرێتەوەو كەمێ پشووی بێتەوەبەر، ناپلیۆنیش هەرلەبەر ئەوە ڕازی ببوو ئاگربەست

---

[260] - مەبەست لەتێشكانی سوپای فەرەنسایە لەڕوسیادا.(و-كوردی).



قبوڵبکات، هەتا دەست بەسوپاکەیدا بێنێتەوەو ڕێکیبخاتەوە، ئیمپراتۆری فەرەنسا بەراگرتنی شەڕ توشی هەڵەیەکی گەورە بۆوە، چونکە بەبەرژەوەندی دوژمنەکانی شکایەوە.

هەروەها بووەهۆی ئەوەش نەمسا لەڕۆڵی کاری ئاشتی پێکردنیان بچێتەدەرێ و بەکەوێتەگەڵ هاوپەیمانان.

جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوەبکەین هاوپەیمانان تێبینی ئەوهەڵە گەورەیەی ناپلیۆنیان نەکردبوو، هەرەچند ساڵێك دوای ئەو مێژووە سەردارانی ڕوس وپروس وشانشینی سوید، پروپاگەندەی ئەوەیاندەکرد گوایا هەرلەسەرەتاوە هەستیان بەو هەڵە گەورەی ناپلیۆن کردووە کەبەئاگربەست ڕازیبووە، بالێرەدا ئەو بەڵگەیە بخەینەڕوو کەئەفسەرێك بەناوی ڤلادیمیر ئیڤانوێچ لومنشترن نووسیویەتی ودەڵێت (لەناو سوپای ڕوسیاو لەناو هاوپەیمانانـدا ئـەم ئاگربەستە بەگەورەترین بەدبەختی هەژماردەکەن ومەخابنی بۆ هەڵدەکێشن) یاداشتەکانی لوفنشترن یـەکێکن لـەو بەڵگەدروست وپڕبەهایانـەی کەسـەبارەت بەتاریخچەی شەڕی ساڵی (1813) نووسراون ویاداشت نووسە ڕوس وفەرەنسی و پروسی و نەمساوی و سویدییەکان بەسەهو ئەم هەموو درۆیەیان دەربارەی ئەمە نووسیوە.

بەمجۆرە پەیماننامەی ئاگربەست مۆرکرا، بەڵام ناپلیۆن دەیویست پەیمانی ئاشتی کردن بکات-یان هەموو شتێك- یان هیچ، ئەمە دروشمی ناپلیۆن بوو لەو ڕۆژانەدا کەشەڕی ساڵی (1813)ی دەستپێکردو هەر بەو دروشمەش درێژەی بەشەڕدا، هەتا لەسنت هیلینیشدا ئەوکاتەی کەئیمپراتۆر هەموو شتێکی لەدەستدا، تەنانەت ئازادی خۆشی، هیچ داخی بۆ ئەو بڕیارەی خۆی نەکێشا، چونکە بەبۆچوونی ئەو هیچ هەڵەیەك ڕووی نەدابوو وبەگاڵتەجارییەوە دەیگوت: ئەگەر بۆخۆی نەباو نەوەکەی بوایە[261] ئەوا دوای ئەوتێکشکانەی هەرلەسەر تەختی پاشایەتی خۆیدا دەمایەوە، زۆرجار ئەم قسەیەی دەکرد.

دوای ئەهامەتیەکەی شەڕی مۆسکۆ کەزۆربەی گەل فەرەنسای خستە پرسەوە، پاریس پێشوازی لەناپلیۆن کرد، وەك جاران هەموو ئیمپراتۆریەتەکەی هەر لەدەستدامابوو ئەمجارەشیان کەتەنها بەلەدەستدانی ئەو وڵاتانەی نەك ژێردەستە بەڵکو دەستنیشانی خۆی بوون وبەشێك نەبوون لەپانتایی ئیمپراتۆریەتیەکەی بگەڕابایەوە پاریس بەوپەڕی گەرمییەوە پێشوازیان لێدەکرد.

بەڵام ناپلیۆن دەیزانی دانی ئەم ئیمتیازانە دەبنەهۆی سەرکەوتنی سیاسی وئابووری بریتانیاو پیشەسازی فەرنسا لەبەرامبەر پیشەسازی بریتانیادا شکستدەخوات وقەیرانی ساڵی (1811) نەخۆشییەکی کوشندەبوو وبێکاری سەرهەڵدەدات وشۆڕشی سکە برسییەکان بەرپادەبێت کەلەگوللەش ناترسن، بەڵام برژوازیەتی فەرنسی کەئەو ڕابەری بەنێو بەوەفای شەڕی ئابووری بوو دژی بریتانیا ئیتر هیچ کەڵکی بۆ ئەوان نامێنێت،

ئیتر لێرەودوا برژوازیەتی فەرەنسا بەچ ئومێدێك ئامادەبێت مل بۆ ئەو زۆرو ستەمەی ئەو کەچبکات؟ خۆئەگەر بڕیاربێت بەجۆرێکی تریش فەمرانڕەوایی بکات، ئەوا نەخۆی حەزی دەکردو نەدەشی توانی، بۆیە لەبری ئەوەی بیرلەئاشتی کردن و

---

[261] - دوای تێشکانیش تەختی پاشایەتیان دەدایەوە ئەو بنەماڵە شانشینە، وەك لەمەوبەر لەشانشینەکانی پروس و نەمساو... زۆری تردا خوێندمانەوە، دوای داگیرکردنی ولایەتەکانیشیان تەخت وتاراجی پاشایەتیان دەدەرایەوە. لێرەدا ناپلیۆن مەبەستی لەوەیە، ئەگەر نەوەی خۆی واتە: بنەماڵەی پاشایەتی پشتاوپشتی مێژوویی دێرینی هەبوایە.(و- کوردی).



گەڕانەوەی بۆ پاریس بکاتەوە، کەڵکەڵەی ئەوەی لەبن کڵێشەی سەریدابوو شەڕێکی تازە لەکەنارەکانی ویستول و نیەمندا بکات.

لەدانیشتنەکانی ئاشتی پراگدا کەوەك گاڵتەجاڕی لێهاتبوو، داوایان لەفەرەنسا دەکرد دەست لەهامبورگ و ولایەتی ئایلیری و... هیتر هەڵگرێت، گەرچی ناپلیۆن لەولاوە لەخەیاڵی داگیرکرکردنی نیەمندابوو. ناپلیۆن وەك لەمەوبەر گوتمان پێی وابوو ئەم کێشانە تەنها بەلولەی گوللە تۆپەکان چارەسەردەکرێت، ئیمپراتۆری فەرەنسییەکان، هەموونوێنەرو باڵویزەکانی لەوڵاتانی تورکیاو ئێران و تورکیاو سوریا بانگهێشتکردنەوە کەپێش شەڕ نێردرابوون، سیاسەتی نەمسا بەجۆرێکبوو نەسەرکەوتوویی ناپلیۆنی بەسەر هاوپەیمانەکاندا پێخۆشبوو ونەپێچەوانەکەشی.

کاتێ مترنیخ گەیشتە درسد کەشوێنی حەوانەوەی ناپلیۆن بوو، لەڕۆژی(28/ی یونیودا چووە کۆشکی ئیمپراتۆرو کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا.

ناپلیۆن دەستی کرد بەهەڕەشکردن و بەڕاشکاوی بەمترنیخی گوت: نەمسا بەبەهانەی ناوبژیوانی کردن دەیەوێت شوێنێك لەریزی هاویەماناندا بۆخۆی بکاتەوە، هەروەها بەمترنیخی گوت: ڕوونتر بدوێ، ئایا دەتەوێت لەگەڵ مندا بجەنگیت؟ چونکە هیچ کاتێ مرۆڤ ئاشتی خوازنەبووە! هیچ کاتێ دەرس لەهەڵەکانیان وەرناگرن، ڕوس و پروسەکان بەو بازرگانییەی لەگەڵ بریتانیادا دەستیانداوەتێ وبەسەرکەوتنی زستانی ڕابردوو لەخۆیان بایی بوون وغیرەتی ئەوەیان پەیداکردووە شەڕ لەگەڵ مندابکەن، ئەوان تێکدەشکێنم، هەرچەندە پێچەوانەی ئەم قسەیەی منیان بەتۆ گوتوە.

کەواتە تۆش[262] هەمان چارەنووسی ئەوانت دەوێت؟ زۆر باشە، بەخزمەت ئێوەش دەگەم، مانگی ئۆکتۆبەری داهاتوو دەتبینمەوە لەڤیێننادا بیرت نەچێت باش.

مترنیخ، بەوپەڕی ڕێزەوە، بەڵام بەدەربڕینێکی چاونەترسانە گوتی: مەبەستی وڵاتی نەمسا ئەمەنییە، بەڵکو دەیەوێت ئاشتی بەرپابکات، ئینجا شێوەی دانووستانەکەی بۆشی کردەوەو گوتی: ئەگەر بەڕێزتان ڕازیبن ئایلیری و هامبورگ و برم و لوبك و گراندوشەو وارشۆ، لەپارێزەری هاوپەیمانیەتی ڕن، چاوپۆشی بکەن، ئەوا ئەو شوێنانەی تری ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەت هەرلەدەستخۆتدا دەمێنێتەوەو ئاشتی دەکرێت، ناپلیۆن توڕەبوو وگوتی: بەڵام من دەستی ئێوەم خوێندۆتەوەو[263] نیازی شاراوەی ئێوە دەزانم، ئێوەی نەمساوی هەموو ئیتالیاتان دەوێت، دۆستەکانی ئێوەش ڕوسەکان هەموو پۆلۆنیایان دەوێت، پروسەکان داوای ساکس دەکەن و بریتانیایەکانیش چاویان لەهۆڵەنداو بەلجیکاوەیەو ئەگەرمن ئەمڕۆ بەمانەی تۆگوتت ڕازیبم ئەوا سبەی دەبێ ئەو وڵاتانەی گوتم بەبێ خواویشتی خۆم بدەم، بەڵام بۆ دەستگەیشتنت بەم دانووستانە ئەوا دەبێ ملیۆنەها کەس بکەیتە سەربازو خوێنی چەندین نەوە بڕێژیت و ئەو دانووستانەش لەنزیك تەپکی مون[264]، لەگەڵ مندا مۆربکەیت).

---

[262] - مەبەستی لەدەوڵەتی نەمسایە، نەك خودی مترنیخ.(و-کوردی).

[263] - مەبەستی ناپلیۆن ئەوەیە لەنیازی دڵیان گەیشتووم، ئەو ڕستەیە وەك خوێندنەوەی ئیقباڵی دەست دەردەبڕێت، کەبە مانای ئەوەش دێت بڵێ دەزانم چیتان لەبن سەری دایە.(و- کوردی).

[264] - مون: تەپکێکە لە نزیك پاریس(و-فارسی).



مترنیخ لەوەلامدا گوتی کەس وێنای ئەوەناکات و ئەو ئاشتی کردنەی لەسەر ئەم بنەمایەبێت زۆر شەرەفمەندانەیەو جێگای شانازیە.

ئینجا ناپلیۆن ئەمقسەیەی کرد(دانی بچوکترین ئیمتیاز بەلای منـەوە نەنگیـە) هـەروەها درێـژەی بەقـسەکەی داو گـوتی: ئیمپراتۆرەکەی تۆ چـونکە بـەکوڕە پاشـایی لـەدایکبوون نـازانن ونـاتوانن درك بەهەسـتەکانی مـن بکـەن، ئەگـەر ئەمانـە تێکیشبشکێن دەگەڕێنەوە پایتەختەکانی خۆیان و تەخت و تاراجەکەیان هیچی لێکەم نابێتەوە، بەڵام من سەربازم پێویستم بەشکۆمەندی و سەرکەوتویی هەیەو ناتوانم بەسوك و ڕیسوایی بگەڕێمەوە ناو میللەتەکەی خۆم، دەبێ هەمیشە سەرکەوتوو سەربڵند بمێنمەوە) لەوەلامدا مترنیخ گوتی: ئەگەر وابێت ئەوا هیچ کاتێ شەڕ کۆتایی نایەت و بەهۆی ئەمەوە هەموو ئەورووپاو فەرەنسا وێران دەبێـت، کەواتـە پێویـستە ئاشـتی بکرێـت، هـەروەها درێـژەی بەقـسەکەی داو گـوتی: بـەڕێز مـن لێـرەدا سەربازەکانی ئێوەمان بینێ و زۆربەیان مێردمنـداڵ و کـاتی گرتنـی سـەربازیان نـەهاتووە، ئەگـەر ئەمانـە لەشـەڕەکاندا بەکوشتبچن ئایا دەتوانیت سەربازیتر بگریتەوە کەلەمانەش مێردمندالترن وجیلێ بچوکترن؟

مترنیخ لەیاداتشەکانیدا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێ ئەم قسەیەمکرد، ناپلیۆن ڕەنگی تێکچوو وکلاوەکەی لەسەری لابردوو بەزەویداداو نەڕاندی وگوتی (تۆ سەربازنیت، تۆ وەك من ڕۆحی سەربازیت نییە، تۆ لەهۆردووی سـەربازیدا نـەژیاویت، تـۆ ڕانەهاتووی لەسەر ئەوەی ڕۆحی کەسانیتر لەکاتی پێویستیشدا ڕۆحی خۆشت بەخت بکەیت، بوونی (200) هـەزار کـەس بەلای منەوە چییە) ناپلیۆن لەم توڕەبوونەیدا هەندێ قـسەی نابەجێـشی کـردون، ئینجـا درێـژەی زیـاتری پێـداو گـوتی: جگەلەمەش ئەو سەربازە فەرەنسییانەی کەتۆ لێرەدا لایەنگریان دەکەیت وبەقەت تۆ گلەییان لەمن هەیە، ڕاستە من (200) هەزار سەربازم لەڕوسیا لەدەستدا کە(100) هەزار کەسیان لەباشترین سەربازەکانی فەرەنسابوون و زۆر مخابنم بۆ ئەوانە هەیە.. بەڵێ بەلای منەوە زۆر جێگای داخە، بەڵام ئەوانیتر[٢٦٥] ئیتالیایی و ئەڵمانی و پۆلۆنی بوون).

لەوەلامدا مترنیخ گوتی: باشە، بەڵام بەڕێزتان باوەڕدەکەن کەئەمە بەڵگەنییە بۆ ئەوەی بتوانرێـت بـۆ کەسـێکی ئـەڵمانی بەنموونە بهێنیتەوە؟

دوای ئەو گفتوگۆکردنە ئەوە ئاشکرابوو ئەم سەردانەی مترنیخ هیچ ئاکامێکی نابێت، ناپلیۆن ئامـاژەی بـەوەکرد نەمـسا لەزۆری و بەهێزی سوپاکەی زیادی پێوەدەنێت، چونکە مترنیخ تکایکرد ناپلیۆن ڕێگای بدات مەرجـەکانی ئاشـتی کردنـی بۆباس بکات. ئیمپراتۆری فەرەنسا هاواری کردوو وگوتی: ئێی، تۆ سوری لەسەرئەوەی قانون فێری من بکەیت! زۆر باشە بەڕێز مترنیخ، بریتانیا چەند پارەی داوەتە ئێوە هەتا شەڕم لەگەڵدابکەن؟ باشە ئێـوە شـەڕتان دەوێـت خراحـافیز هـەتا چاوپەیەك کەوتنەوەمان لەڤیێننادا) ناپلیۆن بەم قسەیەی کەگوتی بریتانیا چەند پارەی داوەتە تۆ ویستی بەجۆرێك ئوژمنکاری خۆی ڕابگەیەنێت.

---

265 - مەبەستی ناپلیۆن ئەوەیە ئەو (200) هەار سەربازەی لەشەڕی ڕوسیادا تێداچوون تەنها (100) هەزاریان فەرەنسی بوون و باقیەکەی تر غیرە فەرەنسی بوون وجێگای داخ نین،(و- کوردی).



کاتێ مترنیخ لەلای ناپلیۆن ڕۆیشت وچووەدەرێ مارشال برتیە کەزۆر حەزی لەئاشتی کردن بوو وپێشنیارەکەی مترنیخی بەباش وشەرەفمەندانە دەزانی، لێی پرسی: سەرئەنجامی دانوستانەکان چی بوو؟ لەوەلامدا مترنیخ گوتی (سوێند دەخۆم گەورەکەی ئێوە عەقڵی خۆی لەدەستداوە).

ناپلیۆن پێشوەخت دەیزانی گفتوگۆکردنی پراگ هیچ ئەنجامێکی نابێت وحەزیشی نەدەکرد شەربگرێت و تەنها کاتی پێبەسەردەبرد، نوێنەرەکانی ڕوسیاو پروس و مترنیخیش لەچاوەڕوانیدا بێزاربوون، ئەمانە لە(12/ی یۆلیۆوە لەپراگدا ئامادەبوون، کەچی هیچ هەواڵی نمایندەی فەرەنسانەبوو، دوای گفتوگۆکردنەکەی مترنیخ لەگەڵ ناپلیۆندا دوودڵی نەمساوییەکان یەکلاکرایەوەو مترنیخ بەڕاشکاوی بەناربنی نوێنەری فەرەنسای گوت ئەگەر دانووستانی پراگ هەتا کۆتایی مانگی ئۆگۆست نەبەسترێت، ئەوا نەمسا دەچێتەگەل هێزی هاوپەیمانان.

بارودۆخی ئەورووپا لەشێواندابوو لەو ڕۆژانەدا هەواڵی شکست وناکامی سوپای فەرەنسا لەبەرەکانی شەڕی ئیسپانیادا هاتبۆئارا، بریتانیاو پارتیزانەکانی ئیسپانیا سوپای فەرەنسایان هەتاکێوەکانی پیرینە پاشەکشەپێکردبوو و ڤلینگتن لەڤیکتۆریادا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، ناپلیۆن بە کنت دوناربنی نوێنەری خۆی بۆ دانووستانی پراگ گوتبوو: چەند دەتوانیت کاری ئاشتی کردنەکە دوابخە هەتا ببێتەڕێگر لەبەردەم کۆنگرەکەدا، هەروەها چەند دەتوانیت ڕێگربە لەبەردەم بەستنی کۆنگەرەکەدا، هیچ جۆرە ئیمتیازێك نەدەیت، وەك هەمان پەندی دیپلۆماسی کەیۆنانیەکان دەڵێن: گیراوەکە ئازادنەکەی، پەیڕەوی ئەمانەبکە.

نارین و کولنکور و فوشە و ساواری و برتیەو هەموو مارشالەکان داوایان لەناپلیۆن کرد ئاشتی بکات، بەلام هەموو هەوڵی ئەمانە کەڵکی نەبوو، ساواری وەزیری ناوخۆ کەناپلیۆن نازناوی دوك دوروڤیگوی بەشانازییەوە لێنابوو، غیرەتی وەبەرخۆی هێناو بەئیمپراتۆری گوت: میللەت لەپای ئەوشەڕە یەك لەدوای یەکانە کول وکوتر بووەو ترسی ئەوەهەیە دژی ئیمپراتۆرە خۆسشەویستەکەیان ڕاپەڕن، لەوەلامدا ناپلیۆن بەوەزیری ناوبراوی گوت: بێدەنگبە دەست لەکاروبارێك وەرمەدە کەسەرت لێی دەرناچێت.

لە(10/ی ئۆگۆست)دا ئاگربەست کۆتایی هات و مترنیخ ڕایگەیاند نەمسا شەڕ لەدژی ناپلیۆن دەکات، شادی وخۆشی لەلەندەن و هۆردووە سەربازییەکانی پروس و ڕوسیا باڵی کێشا، ئیتر لەمە بەدواوە هێزی هاوپەیمانان لەسوپای فەرەنسا بەهێزتر دەهاتەبەرچاو.

( ∐ )

کۆتایی هاتنی شەڕی (1813) نزیکبۆوە، لەڕوسیاو پروس و نەمسادا خەریکی گرتنی سەربازی تازەبوون، خواردن و پێداویستی جەنگییان کۆدەکردەوەو هێزەکانی خۆیان زیادەکرد، بریتانیا کەبۆ جارێکیتر کیسەی دراوەکانی کردبۆوەو دریغی لەدانی زێڕوپارە نەدەکرد بەهاوپەیمانان، وەك چۆن بۆبەهێزکردنی ڤلینگتنیش لەئیسپانیادا دریغی نەکردبوو.

کۆی گشتی سەربازەکانی هاوپەیمانان گەیشتبۆ(850) هەزار، بەلام سوپای فەرەنسا کۆی گشتی (550) هەزار کەس بوو. شوارتز نبرگی نەمساوی کرابۆ فەرماندەی گشتی هەموو سوپای هاوپەیمانان، ناپلیۆن هیچ لەناوبراو نەدەترسا ڕوسەکان ئیتر کوتزوف و باگراتیونیان نەمابوون و وەك ساڵی (1812) حسابی بۆ ئەوانیتر نەدەکرد، بەڕای ئیمپراتۆری ڕوسیا ئەوانەی



شەڕی ئسمولنسك و بقرۆدینقیان كردبوو، تاڕادەیەك بەدلێری دەزانین، بەڵام ستادی فەرماندەی ڕوسیای بەگشتی بەهیچ لەقەڵەمدەدان، تزار هەتا ئەو ڕۆژەی مردیش هەمیشە ئەمەی دووبارە دەكردەوەو داخی ئەوەی هەبوو كەنەدەبوا لەمۆسكۆ پاشەكشەبكرێت و پێی وابوو هۆی تێكشكانی سوپای فەرەنسا، تەنها ساردوسۆڵی زستان بوو، نەك تاكتیكە سەربازییەكانی ڕوسیاو بەهێزی سوپاكەی، بەمجۆرە ئیمپراتۆری ڕوسیا سوپای ساڵی (1813)ی بەسوپایەكی بەتواناو لێهاتوو دەزانی و پێی لەسەربازی هەموو وڵاتانیتری هاوپەیمانان باشتربوو.

بەڵام سەبارەت بەپروسەكان ناپلیۆن وەك چۆن لەڕوس ونەمساوییەكان چاوی نەدەترسا لەئەمانیش بەهەمان شێوەبوو، بەڵام دەیزانی بەڕاسپاردەی برنادوت، كەلەساڵی (1813) بەدواوە خۆی بەپاشای سوید دانابوو ویەكێكبوو لەدوژمنەكانی ئەو، ئەلكسەندەری ڕوسیاو سەرۆكانی وڵاتانیتری هاوپەیمانان داوایان لەژنراڵ مورۆ ئەوسەركردە لێوەشاوەیەكردبووە یارمەتیان بدات.

ئەم ژنراڵە هەمان ئەو كەسەیە كەلەساڵی (1804)دا بەتاوانی دەستبوونی لەكودەتاكەی جورج كادودال و پیشگرو دا، دەستبەسەر كرابوو و دواتر دادگایكراو بەفەرمانی ناپلیۆن دورخرایەوە بۆ ئەمریكاو لەوكاتەوە لەوێدا دەژیا.

مورۆ كەدوژمنی سەرسەختی ناپلیۆن بوو، ڕێك لەوكاتەدا گەیشتە هۆردووی سەربازەكانی ڕوسیا كەتازە خەریكبوو وشەڕەستی پێدەكرد، یەكەم ئامۆژگاری كەمورۆ بەتزاری ڕوسیاو هاوپەیمانەكانی گوت، ئەوەبوو گوتی:(هەرگیز هێرش نەكەنەسەر ئەوبەرەی شەڕەی كەناپلیۆن لەگەڵدایە، بەڵكو تەنها هێرش بكەنەسەر ئەو قۆڵانەی كەمارشاڵەكانی فەرماندەیی دەكەن) لەگەڵ ئەمەشدا ویژدانی ئەوپیاوە، واتە: ژنراڵ مورۆ ئاسودە نەبوو، هەرچەندە ئەو بەهانەی ئەوەی هەبوو شەڕی دژی فەرەنسا ناكات، تەنها دوژمنی ناپلیۆنە.

شازادە ڕینین سەركردەیەكی ڕوسیەو بەچاوی خۆی ئەوەی بینیوە كە(كاتێ مورۆی چاوی بەسەربازێكی پیری دیلگیراوی فەرنسی كەوت، لەگەڵیدا كەوتەقسە، بەڵام ئەو سەربازە هەركە ئەو فەرماندەیەی ناسییەوەو زانی ڕۆژگارێك فەرماندەی لەشكری فەرنسابووەو ئێستا خزمەت بەدوژمنانی نیشتمانەكەی خۆی دەكات، چەند هەنگاوێك لەژنراڵ مورۆ دوركەوتەوەو هاواریكرد(بژی كۆماری) ئەو سەربازە پیرە فەرەنسییە ناوبراوی تەنها بەخائین دەهاتە بەچاو، بۆیە حەزی نەكرد لەگەڵ مورۆدا بكەوێتە قسە.

ئەلكسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا مورۆی خستەژێر چاودێری خۆیەوەو گرنگی بەنەخشەكەی ئەو دەدلو هیواداربوو ئەم پلانەی سەربگرێت، تزار پێی وابوو بوونی مورۆ بەپلەی یەك دەبێتەهۆی تاكە هاوڕكەبەری ناپلیۆن لەڕووی سەركردایەتی كردنی شەڕو دامەزراندن وتاكتیكەكانی شەڕو دەتوانێت لەبەرامبەر سوپای ناپلیۆندا بوەستێتەوە، دووەمیش بوونی ناوبراو لەناو سوپای هاوپەیماناندا دەبێتەهۆی گومان و دڵەڕاوكێ لەلای سەربازەكانی سوپای فەرنسا، چونكە مورۆ هەتا ئەو كاتەش كەسایەتی خۆی لەدەست نەدابوو و وەك سەربازێكی كارای كۆماریخواز مابۆوەو دەیانگوت: لەخۆڕا مورۆیان بەدەستبوون لەكودەتای كادودالدا تاوانباركردوو دادگایی كراو دووریان خستەوە بۆ تاراوگا، ئەلكسەندەر زۆر حەزیدەكرد ژنراڵ مورۆ لەجێگای شوارتز نبرگی فەرماندەی گشتی سوپای هاوپەیمانان دابنرێت، بەڵام خودی مورۆ پێشنیاری ئەوەیكرد ئیمپراتۆری ڕوسیا فەرماندەی



گشتی سوپای هاوپەیمانان بگرێتەدەست و بۆخۆشی ببێت بەسەرۆکی ستادی گشتی، بەکورتی لێپرسراویەتی گشتی هەموو سوپای هاوپەیمانان بەوشێوەیە وەربگرێت، بەڵام چارەنووس بەجۆرێکی تری هێنا.

یەکەم شەڕی گەورە شەڕی درسد بوو لە( 27/ی ئۆگۆستی ساڵی 1813)دا، لەوشەڕەدا ناپلیۆن بەیەکێ لەگەورەترین شاکارەکانی شەڕ گەیشت، سوپای هاوپەیمانان لەوشەڕەدا نزیکەی (25) هەزار کوژراو وبریندایان هەبوون، بەڵام زیانە گیانییەکانی سوپای فەرەنسا (10) هەزار سەربازبوو.

سوپای هاوپەیمانان کەوتە پاشەکشە، لەدوولاوە (1200) تۆپ بەردەوام شراقەی تۆپ هاویشتنیان دەهات لەگەرمەی شەڕدا کاتێ بەشی چەپی بەرەی شەڕی دوژمن شکستیهێناو ناپلیۆن لەناوەڕاستی تۆپخانەکەیدا پاوەستابوو وسەرپەرشتیاری تۆپەکانی دەکرد، لەپڕ چاوی بەتەپۆلکەی ڕونیکسا کەوت کەکۆمەڵێ لەسەربازانی دوژمن لەوێدان، خێرا فەرمانی بەتۆپچییەکانکرد لولەی تۆپەکانیان بۆلای ئەو تەپۆلکەیە وەرسوڕێنن و تۆپبارانی بکەن، لەناو ئەو دەستە سوارەدا ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیاو ژنرال مورۆی لەگەڵ دابوون کەبۆ یەکەم جاربوو ئەرکی فەرماندەیی گشتی سوپای هاوپەیمانانیان جێبەجێدەکرد، یەکێك لەو تۆپانەی ڕتڵی یەکەم کەبەفەرمانی ناپلیۆن هاوێژدان هەردوك قاچی ژنرال مورۆی پەڕاندبوو، ناوبراو چەند ڕۆژێك دواتر مرد.

لەهۆردووی سەربازی فەرەنسی و هاوپەیمانەکاندا ئەو ئەفسانەیە دەماودەمی دەکرد گوایا ناپلیۆن بەدووربین خائینی لەنێوان دوژمندا ناسیوەتەوەو بەگوللە تۆپێك کەبۆخۆی تەقاندوویەتی کوشتویەتی.

هەرچۆنێکبێت تێکشکانی هێزی هاوپەیمانان لەشەڕی درسددا زەبرێکی کوشندەبوو وکوژرانی ژنرال مورۆش کەباشترین سەرکردەی سوپای هاوپەیمانان بوو، زەبرێکی گەورەی لەورەو ڕۆحیەتی ئەوان وەشاند، سوپای هاوپەیمانان لەدرسددا تێکشکان بەرێگای هەمەجۆر بەرەو بەرزاییەکانی متالیك پاشەکشەیانکرد، ڕۆژانی دواتریش مارشالە فەرەنسییەکان، مارمون و ڤیکتۆرو موراو سن سیرو ژنرال ڤاندام، دوای سوپای هەڵاتووی هاوپەیمانان کەوتبوون وچەند هەزار سەربازێکی ڕوسی و پروسی و نەمساویان بەدیل گرتبوون، بەڵام ژنرال ڤاندام کەسەرمەستی سەرکەوتن بوو لەپێشڕەوانی سوپای فەرنسا دوورکەوتبۆوە، سوپای هاوپەیمانان لەڕۆژانی (29و30/ی ئۆگۆست)دا لەکولمدا هێرشیان کردبۆسەر لەشکرەکەی ئەو وتێکیانشکاندبوو وبۆخۆیی وچەند سەربازێتری بەدیلگیرابوون.

ئەم سەرکەوتنە لاوەکییە کەمێ ورەی وەبەر سوپای هاوپەیمانان هێنایەوە، خۆڕاگری وناشتی نەکردن هەتا لەحاڵەتی تێکشکانیشدا، یەکێك بوو لەو ئامۆژگاریانەی کەژنرال مورۆ پێش مردنی بەڕابەرانی وڵاتانی هاوپەیمانی گوتبوو، هاوپەیمانان دەیانزانی کارامەیی و لێوەشاوەیی سەربازی ناپلیۆن وەك خۆشی مابێتەوە ئەوا سەربازەکانی ئێستای کەمێردمنداڵی (18و 19) ساڵن، ناتوانن جێگای ئەو یەکە سەربازییە بەتوانایانەبگرنەوە کەلەگەڵ بۆناپارتدا لەمیسرو سوریادا جەنگاون وئەوروپایان خستۆتەژێر ڕکێفی خۆیان، هەتا ئەم سەربازانەی ئێستای ئیمپراتۆری فەرەنسا ناتوانن تۆزی ئەو سەربازە فەرەنسیانەش بکشێنن کەلەشەڕی مۆسکۆدا مەیدانەکانی شەڕیان پڕکردبوو لەتەرمی خۆیان، ناپلیۆن بۆخۆشی ئەم ڕاستیەی دەزانی و هەستی بەوەشکردبوو گرفتێکی تری لەپێشەوەیە، ئەویش ئەوەبوو بەپێی ئەو پەیڕەوەی کەخۆی کاری لەسەردەکرد دەبوا جەنگاوەر لەکات وشوێنی پێویستدا لەدوژمنەکەی بەهێزتربێت، بەڵام ئێستا هەموو شتێك وابەستەبە



شەڕی ساکسەوە بوو وبۆ خۆشی لەو ڕەوشە دەچۆدەرێ، داوو کەیەکێکبوو لەهەرێ فەرماندە سەربازییەکانی ئەو لەم کاتەدا لەکوێ بوو؟ لەهامبورگ سەرقاڵی گوللەبارانکردنی بازرگانانی سەرپێچی کەربوو لەبڕیارەکانی گەمارۆدانی ئابووری سەریەرتانیا، ئەو یەکە سەربازییە گەورەی سوارو پیادانەو ئەو تۆپخانە مەزنەی بۆ سەرکەوتنی ئایندەی ئەو پێویستبوون کوان؟ لەدانتزیگ و ئەڵمانیای سەرو وخوارووی ئیتالیاو ئیسپانیادا بوون، ئەگەر ئەو هێزانەی بانگهێشتکردبایە بۆئەو شەڕە ئەوا ئەو شوێنانەی ئەمانەی لێبوون و بەزۆر فەرمانڕەواییان دەکرد لەدەست دەچوون و پانتایی ئیمپراتۆرییە مەزنەکەی کەمدەبۆوە، خۆئەگەر بانگهێشتیشی نەکردبان بۆ ئەوشەڕەی پێشی کەهاوپەیمانان لەبەرامبەریدا بوون، دیسان توشی هەمان چارەنووس دەبۆوە، ئەو هاوپەیمانانەی کەدوای کوژرانی مورۆ سەرداری سەربازی شایستەو لێوەشاویان نەمابوو، بەڵام دوو ئەوەندەی سوپای ناپلیۆن ڕێژەیان زیاتربوو وپەرداخترببوون.

هەندێك گرفتی بێ ڕێگاچارە بیرو هۆشی ناپلیۆنیان داگیرکردبوو وخستبوویە ژێر فشار، ڕێگای بەرلین بەناهەموار دەهاتەبەرچاو، برنادوت بەسوپای سویدەوەو بولوبەش بەبەشێك لەسوپای پروسەوە کەزۆرینەیان سەربازی ئەو شوێنانەبوون کەلەژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریەتی فەرنسادابوون وەك سکس و باویاو ... هیتر، سوپای فەرنسایان لەوێدا پاشەکشە پێکردبوو. هەروەها ئەو سەربازانەی لەو وڵاتانەی ژێردەستی ئیمپراتۆریەتی فەرنسا لەگەڵ سوپای فەرنسادابوون جێگای پشتپێبەستێن نەبوون و ڕۆژ بەڕۆژ سەد سەد و... لەریزەکانی سوپای مەزن هەڵدەهاتن و ئامادەنەبوون خزمەتی نەخشە نامەعلومەکانی ناپلیۆن بکەن و شەڕ لەگەڵ هاونیشتمانییە ئەڵمانی نەژادەکانی خۆیاندابکەن.

لە(23/ی ئۆگۆست)دا لەناوچەی گروس بیرن، هێزی هاوپەیمانان هێرشیان کردبۆسەر لەشکری مارشال ئاودینو، مارشال ماکدونالدیش لە کاتسباخ دا شکستی خواردبوو، لە(14/ی سێپتەمبەر)دا مورا هێرشی کردەسەر بلوخرو تێکیشکاند، بەڵام نەیتوانی لەشکرەکەی لەناوبەرێت، لە(6/ی سێپتەمبەر)دا مارشال نی لەدنەویتزدا تێشکا، ئیتر لێرەودوا ناپلیۆن هیچ بڕوایەکی ئەوتۆی بەسەربازە ئەڵمانییەکان نەمابوو وبەسەربازی پشتپێبەستووی خۆی هەژمارنەدەکردن، چونکە مارشال نی تەنها لەبەر ئەوە تێشکابوو سەربازە بەنەژاد ئەڵمانییەکان لەبەرەی ئەو شەڕە هەلاتبوون، هەروەها ناپلیۆن لەژنراڵەکانی خۆشی ناڕازیبوو ولەو بارەوە لەبرواری(8/ی سێپتەمبەری ساڵی (1813)دا نامەیەك بۆ وەزیری بەرگری خۆی دەنووسێت و تێیدا دەڵێت (... بەڵام مارشال وئەفسەرەکان لەشەڕکردن ماندوو بوون، ئیتر ئەو گوڕوتینەیان نەماوە کەپێشتر پیاوی مەزنیان دروستدەکرد) هەروەها فەرمانی بەناوبراو کردبوو گرنگی بەقەڵاتی سەربازی ڕنانی بدات وبەهێزو تۆکمەی بکات و ڕێژەی کەسەکان وخواردنی تێدا دابنێت.

مانگی سێپتەمبەر بەبێ هیچ شەڕو ڕووداوێك بەسەرچوو، بەڵام ناپلیۆن وەك هاوپەیمانان حەزیدەکرد پێش هاتنی زستان شەڕێکی یەکلاکەرەوە بکات وهێزەکەی خۆی تاقی بکاتەوە، ڕاپەڕینی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی میللی هەموو ئەڵمانیای گرتبۆوە، دەستەی فیداییانی توگنبوندو ڕێکخراوە نیشتمانپەرستەکان وردەوردە دروستدەبوون ودەهاتنەڕوو، برۆا لاوەکان وخوێندکارانی پروسی و ساکسون و خوێندکارانی وڵاتانی گەل هاوپەیمانیەتی رن و وستفالی، بەئاشکرا ڕایاندەگەیاند حەزدەکەن لەدەست زۆرو ستەمی بێگانە ڕزگاریانبێت وکۆشش بۆئەمە دەکەن ودەست لەوخەباتە هەڵناگرن.



ناپلیۆن بەچالاکانە خۆی بۆ شەڕی پایز ئامادەدەکرد، بەلام پێشوەخت دەیزانی لەم شەڕەی پێشییەوە سەرکەوتوشبێت شەرکۆتایی نایەت، چونکە ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی هیچ جۆرە ئیمتیازێك بەهاوپەیمانان نەدات، هەروەها لەوەش گەیشت دوژمن بەکۆکردنەوەی سوپایەکی بەهێزو کەلوپەل سەربازی وئازوقەیەکی زۆر، نیازی وازهێنانی لەشەڕکردن نییەو تێکشکان قبوڵناکات، بۆیە ناپلیۆن ناچاربوو داوای (28) هەزار کەنجیتر بکات بۆخزمەتی سەربازی لەوشوێنانەی کەلەژێر دەسەلاتداریەتی ئیمپراتۆریەتەکەیدابوو، ئەو بانگهێشتکراوانە بۆخزمەتی سەربازی منداڵبوون و موویان لێنەهاتبوون.

پێشبینیەکەی مترنیخ وەڕاستگەڕا (دەروازەی سەربازخانەکان کەئەو سەربازە مێردمنداڵانە سەردانیان دەکردن بۆ ناونووسین پاش چەند ڕۆژێك داخران، چونکە ڕێژەکەی ناپلیۆن داوای کردبوو تەواوببوو، لەسەرەتای ڕۆژانی مانگی ئۆکتۆبەردا، سوپای هاوپەیمانان دەستیانکردبە مانۆر و وردە شەڕو پێکدادان لەهەندێك شوێنداو هێرشیان دەهێنا لەهەندێك جێگاشدا پاشەکشەیان دەکردو هەڵدەهاتن، لەو ڕۆژانەدا کەبۆ ناپلیۆن عاقیبەت خراپبوو، چالاکییەکانی ئەو کەسەرافەتی سوپای دەکردو هەر ڕۆژەی نەخشەیەکی بۆ دادەڕشتن، بەڕاستی تاقەت پڕوکێن بوو، لەو ماوەیەدا ڕوسەکان ولاتی شانشینی وستفالیان داگیرکردوو ژرومی پاشای ئەوێش هەلاتبوو، مەملەکەتی باوێر پەیمانیەتی شکاندو پەیوەندی بەهاوپەیمانانەوە کرد.

دەبوا ناپلیۆن هەرچی زووترە ئاگری یەك شەڕی گەورە بکاتەوەو سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، هۆی ئەم ڕاستییە شومەی لەخۆی دەپرسی، ئایا بۆچی ئەو ولاتانەی کەدەستنیشاندەی خۆنی پێشنەوەی سەرئەنجامی شەڕ بەدیارکەوێت خیانەتی پێدەکەن؟ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناپلیۆن پەی بەمانای ئەوەنەدەبرد، لە(16/ی ئۆکتۆبەری سالی (1813)دا لەدەشتایی لایپزیگدا گەورەترین شەڕی ناپلیۆن، کەلەو ڕۆژگارەدا لەئەڵمان ناویاننابوو شەڕی میللەتان، دەستی پێکرد. لەماوەی ڕۆژانی(16و 18و 19) ناپلیۆن ڕوو بەڕووی سوپاکانی ڕوس و پروس و نەمساو سوید بۆوەو لەلایپزدا جەنگا.

لەناو سوپای مەزندا سەربازی پۆلۆنی و ساکسونی و هۆڵەندی و ئیتالیایی و بەلجیکی و ئەڵمانی و ولاتانی هاوپەیمانیەتی ڕن، هەبوون . لەسەرتای شەڕدا، ناپلیۆن (155) هەزار سەربازو هاوپەیمانانیش (220) هەزار سەربازیان ناردنە بەرەکانی شەڕ بۆ لێکدان، هەتا نیوە شەویش هەردوولا بەخۆڕاگری مابوونەوەو تائەوکاتەش سەرکەوتوو دیارنەبوو، لەڕۆژی یەکەمدا سوپای مەزن (30) هەزار سەربازی بەکوشتچوو، بەلام ژمارەی سەربازە کوژراوەکانی هاوپەیمانان زیاتر لە(40) هەزار کەس بوو، هەموو چاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد سبەی چی ڕوودەدات، بەدرێژایی ئەوشەوە هێزی پشتگیری بۆ سوپای فەرنساو سوپای هاپەیمانان دەناردرا، بەجۆرێ ڕۆژی دووەم کۆی گشتی ئەو سوپایەی بۆ یاریدەدانی ناپلیۆن هاتبوون (15) هەزار سەربازبوون، بەلام سوپای هاوپەیمانان (110) هەزار سەرباز بەسەرکردایەتی برنادوت و بنیگسن پەیوەندیان پێوەکردبوون، لەسپێدەی بەیانیدا ناپلیۆن بەهاوەڵی مورا سەردانی مەیدانی شەڕی کردو ناوبراو گوتی: هەر لەدوای شەڕی بفرۆدینفوە شەڕی وا خوێناوی نەکراوە، لەبەیانی ڕۆژی(17/ی ئۆکتۆبەر)دا، ناپلیۆن بۆچەند خولەکێك کەوتە بیرو خەیاڵ وسەرئەنجام بڕیاریدا بمێنێتەوەو خۆڕاگری بکات، فەرمانیدا مرولت کەژنراڵێکی نەمساوی بوو ورۆژی پێشتر بەدیل گیرابوو بۆی بانگ بکەن، مرولت گوتی: دەزانی بەرێز ئێستا نەمسا حەزبە ئاشتیکردن دەکات وئەگەر ناپلیۆن بۆخێرو ئاشتی دنیاو فەرنسا، بەئاشتیکردن ڕازیبێت، ئەوا پەیمانی ئاشتیکردن ئەگەری هەیە.



بەدرێژایی ڕۆژی (17)[266] هەردوو لایەنی شەرکەر خەریکی کۆکردنەوەو تیمارکردنی بریندارەکان وتەداروکاتی سەربازی بوون.

ناپلیۆن دوای دوودڵیەکی زۆر بڕیاریدا بەڕێگای زاڵدا پاشەکشەبکات، بەڵام پێشنەوەی بواری هەبێت ئەو مانۆڕانەبکات، لەبەرەبەیانی ڕۆژی(18)دا شەڕدەستی پێکرد، هاوسەنگی شەڕەکە بەلای هاوپەیماناندا دەشکایەوە، ڕاستە دوو ڕۆژ پێش (40) هەزار سەربازیان لێکوژرابوو، بەڵام لەشکرێکی بەهێزی (110) هەزار سەربازیان بەهاناوە هاتبوو، بەجۆرێ کاتێ شەڕ دەستپێکرا ڕێژەی سەربازانی هاوپەیمانان دووبەرامبەر سوپای فەرەنسابوو، شەڕی ڕۆژی هەژدەهەم لەڕۆژی شازدەهەم خوێناویتر بوو، لەگەرمەی شەڕدا هەموو سەربازەکانی بەڕەگەز ساکسونی کەبەدەر لەئیرادەی خۆیان لەگەڵ سوپای فەرەنسادابوون ،هەڵگەڕانەوەو پەیوەندیان بەدوژمنەوە کردو لولەی تۆپەکانیان کەهەتا چەند ساتێکیش پێش ڕوو لەسوپای هاوپەیمانان بوو، وەرچەرخاندەوەو تۆپبارانی سوپای فەرەنسایان کردو شان بەشان لەگەڵ سوپای هاوپەیماناندا دژی ناپلیۆن کەوتنەشەڕ، لەگەڵ هاتنەپێشی ئەم ڕووداوەش ناپلیۆن هەر بەوورەی بەرزو دلێرانە درێژەی بەشەڕەکەدا.

کاتێ بەرەبەری خۆرئاوا شەڕەکە ڕاگیرا هەردوولا لەڕووبەڕووی یەکتریدا بەخۆڕاگری مابوونەوەو شەڕەکە یەکلایی نەبێوە، بەڵام لەشەڕی(18)لەسەر(19)ی ئۆکتۆبەردا ئەمە مەعلومبوو دوای ئەوەی زیانێکی زۆر بەسوپای فەرەنسا گەیشتبوو ساکسونییەکان خیانەتیان کردووە، ئیتر ناپلیۆن نەدەیتوانی خۆڕاگری لەبەرامبەر سوپای دوژمندا بکات، نەبڕیاری پاشەکشەش بدات.

پاشەکشەکردنەکە لەشەودا دەستی پێکردو بەدرێژایی(19/ی ئۆکتۆبەر) بەردەوام بوو ولەوماوەیەدا ناپلیۆن لایپزیگی جێهێشت و بەرەو خۆرئاوا چۆوە، شەڕ لەهەموو کاتێ خوێناویتر بوو، چونکە لەناو کۆڵانی شارو شارۆچکەو گوندو ئاوەدانییەکاندا لاشەی سەربازەکانی فەرەنسا کەلەپاشەکشەدابوون وەك لیژنەدار لەملاولادا کەوتبوون، ناپلیۆن فەرمانیدابوو پردەکان دوای خۆیان وێرانبکەن و بیانسوتێنن، بەڵام ئەندازیاران زوتر ئەوپردانەیان سوتاندبوون وئێستا (27) هەزار سەرباز مابوون بێن وبپەڕنەوە کەپردەکانیان گرتێبەردان، فەرماندەی لەشکری پۆڵۆنی مارشال پونیاتوفسکی بەبرینداری بەسواری ئەسپەکەی هاتبۆسەر ڕووباری ئەلسترو خنکابوو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بەدواداهتنی سوپای هاوپەیمانان ڕاگیرا.

ناپلیۆن بەخۆیی و سوپاکەیەوە بەرەو ڕووباری ڕن پاشەکشەیکرد، کۆی گشتی زیانەکانی سوپای فەرەنسا لەڕۆژانی(16 و 18و 19)ی ئۆکتۆبەردا بەلانی کەمەوە (45) هەزار سەربازبوو، سوپای هاوپەیمانانیش نزیکەی (60) هەزار سەربازیان لەدەستدابوو، چەند ڕۆژێك دوای شەڕی لایپزیگ ناڵەو هاواری سەربازە بریندارەکان و بۆگەنی لاشە کوژراوەکان دەهات و ئەوناوەی تەنیبۆوە، کەس نەبوو مەیدانی شەڕ لەوتەرمانە پاکبکاتەوە، پزیشك نەبوو فریای نرکەو ناڵەی بریندارەکان بکەوێت.

[266] - لەسەروە نووسراوە ڕۆژانی (16و 18و 19) شەڕبووە: مەبەست لەوەیە لەڕۆژی (17)ی مانگدا شەڕنەکراوە، بۆیە لەریزبەندی سەرەوەدا نەنووسراوە.(و- کوردی).

( )

ناپلیۆن لە لایپزیگەوە هەتا سنووری فەرەنسا، واتە: ئەو هێڵەی ڕن کەفەرنسای لەئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن جیادەکردەوە پاشەکشەی کرد، زۆر لەوێنەکێشان و هونەرمەندان ئیلهامیان لەڕووداوەکانی ساڵی (1814)و ئەم ساتەوەختە شومانەی ناپلیۆن وەرگرتووە، فلچە ئەفسوناوییەکەی دەستی مسونی[267] تابلۆکەی ئەو کەبۆ ناپلیۆنی کێشاوە لەحاڵەتێکدا نیشاندەدات سواری ئەسپەکەی بووەو بەهێواشی بەناو سەربازە کۆنەکانی خۆیدا دەڕوات وبەچاوە پڕخەمەکانییەوە لەسەیری شتێك دەکات کەسەربازەکانی بەچاو نایبینن.

لەکۆتایی مانگی ئۆکتۆبەرو سەرەتای مانگی نۆڤەمبەری ساڵی (1813)دا لەماوەی کۆتایی شەڕی ساکس وسەرەتای شەڕی فەرەنسا [268] نەك ئیمپراتۆریەتەکەی ژێردەستی ناپلیۆن، کینەی شەڕێکی جگەرسۆزانە لەناو دەروونی ناپلیۆندا قوڵپی دەدان، ئەو شەڕەی کەبەسەربازە کۆنەکانی دەورووبەری خۆی نەگوت: بەڵام لەچاوە مات وپڕ غەزەبەکانیەوە بەدیاردەکەوت، دەبوا ناپلیۆن بۆ یەکەمین جار هەستی بەوەکردبا ئیتر کۆشکی ئیمپراتۆریە مەزنەکەی لەحاڵەتی ڕماندایە، ئەو کەتیرەی کەبەزۆر بەوڵاتانی ژێردەسەڵاتی خۆیەوە خستبوو وبەزەبری ئاگرو ئاسن ملی بەو میللەتانە کەچ کردبوو وابەستە بەئیمپراتۆریەتەکەی بن، وردەوردە بەری دەداو دەکەوتە خوارێ، ئێستا مورا، مارشالە خۆشەویستەکەی، کەفەرماندەی سەربازە سوارەکان بوو وقارەمانی هەموو شەڕەکانی بوو وناپلیۆن بەپاشای ناپلی دانابوو، بەجێی دێڵێت و دەزانێت ئەم ڕۆیشتنەی لەبەر ئەوەیە خیانەتی لەگەڵدابکات، دەیزانی ئەو بەنهێنی لەگەڵ هاوپەماناندا ڕێککەوتووە هەتا پارێزگاری لەتەخت وتاراجی خۆی بکات، براکەی ناپلیۆنیش جۆزێف، بریتانی و شۆڕشییەکانی ئیسپانیا لەشێوەدورگەی ئایبریبیان دەرپەڕاندووە. براکەی کەشی ژدوم کەپاشای وستفالی بوو لە کاسل هەڵاتبوو، مارشال داووش لەهامبورگدا لەلایەن ڕوس و پروسەکانەوە گەمارۆ درابوو، دەسەڵاتی فەرەنسا بەسەر هۆڵەندادا کەم ببۆوە، بریتانیاو ڕوسیاو پروس و نەمسا هەر بەسنووری وڵاتی فەرەنساوە نەدەوەستانەوە، ئەو ئیمپراتۆرییە مەزنەی کەشاکاری ناپلیۆن بوو لەکۆتایی تەمەنی نزیکدەبۆوە، واتە لەهەموو لایەکییەوە لەڕووخاندابوو.

ناپلیۆن هەتا ئەوکاتەش (100) هەزار سەربازی هەبوون کەتەنها (40) هەزاریان دەیانتوانی شەڕبکەن، ئەوانیتر دەبوا مەشقیان پێکراباو بۆشەڕ سازکرابان، هەتا ئەوکاتەش سەربازی لەسەربازگەکانی هامبورگ و دانتزیك و چەند ناوچەیەکی تری ئەم لاولای ئەورووپادا مابوون ولەبەرامبەریدا بەوەفاداری مابوونەوە، کۆی گشتی سەربازەکانی نزیکە(150- بۆ180) هەزار سەربازی بەدەستەوەمابوو، ئەو سەربازە مێردمنداڵانەی کەلەساڵی (1813)دا بەسەربازگیرابوون بەپەلە لەسەربازگەکاندا مەشقیانپێدەکرا.

---

[267] - مسونیە(1815-1891) نیگارکێشێکی فەرەنسییە، زۆربەی تابلۆکانی لەسەر شەڕن، توانیویەتی وێنای حاڵەتی ڕۆحی ناپلیۆن لەو ساتەوەختانەدا بەرجەستەبکات.(و-فارسی).

[268] - مەبەست لەشەڕی سەرسنوورەکانی وڵاتی فەرەنسایە.(و-کوردی).



ناپلیۆن چەکی دانەدەناو هەربیری لای شەڕکردنیت ربوو وکاتێ بەمیهرەبانییەوە لەگەڵ مارشالەکانیدا دەدوا بۆنەوەبوو فەرمانی تازەیان بۆدەربکات، لەوکاتانەدابوو کەبڕیاریدا پاپ بگێڕدرێتەوە ڕۆم وفردینانی پاشای ئیسپانیاش کەپێنج ساڵبوو بەدەستبەسەری مابۆوە ڕێگای پێدا بگەڕێتەوە وڵاتەکەی.

لەناوچوونی (125) هەزار سەرباز لەشەڕی لایبزیگ لەنێوان هەردوو لایەنی شەڕداو پاشەکشەکردنی سوپای فەرەنسا دوای ئەم کوشتارە، دەبوا ناپلیۆن ئیتر لەوەبگات بەشەڕێکی گەورەو سەرکەوتن تێیدا ناتوانێت هەموو ئەو گرفتانەی سەریان لێداوە چارەسەربکات، ئیتر ناتوانێت بەسەر مترنیخدا بشیرێنێت و پێ بەزەویدابدات ولێی بپرسێت چەند پارەت لەبریتانیا وەرگرتووەو وڵاتی نەمسا هەراسان بکات ودانووستانەکانی ئاشتی کردن بەئەزرۆکی بێڵێتەوە.

بەڵام دوای شەڕی لایپزیك کەلەسنووری وڵاتی فەرەنسا نزیك دەبۆوەو یەکە سەربازییە بێ ژمارەکانی دوژمن دەم لەسەرپشت بەدواوەی بوون، دەبوا چاوی بەڕەوشە سیاسەکانی خۆیدا بخشاندبایەوە، ئێستا هەڕەشەی هێرشکردنی دوژمن بۆسەر فەرەنسا کەوتۆتە ئاراو مەسەلەی بەرگریکردن لەخاکی نیشتمان لەپێشدابوو،

ئیمپراتۆر پێشنەوەی بگاتە ڕن ناچاربوو لە(30/ی ئۆکتۆبەر) لەهانویدا ڕێگایەك بەناو سوپای هاوپەیمانانداندا بۆخۆی بکاتەوە کاتێ لە(2/ی نۆڤەمبەری سالی (1813)دا گەیشتە مایانس، تەنها (40) هەزار سەربازی ئامادە بۆ شەڕکردنی لەدەستدامابوون، ئەوانیتر هەموویان بریندارو نەخۆشبوون وسەربازی جەنگی نەبوون، بەڵام ناویان لەلیستی سەربازیدا هەرمابوو وئەمانە هەموویان ڕژانە شاری ئاوبراوەوە.

لەنیوەی مانگی نۆڤەمبەردا ناپلیۆن لەپاریسدابوو شەڕی سالی (1813) کۆتایی هاتبوو وشەڕی سالی (1814) دەستی پێکردبوو.

دەبوو فەرنسا پەی بەو ڕاستییە بردبا کەلەساڵی (1812)دەدا لەشەڕی مۆسکۆ نزیکەی نیو ملیۆن سەربازی تێداچووبوو ولەساڵی (1813)شدا سەد هەزار سەربازی کوژرابوون.

بەڵام شەڕ هەر بەردەوامبوو دەنگی تۆپەکان لەسەر سنووری فەرەنساوە دەبیستران، فەرەنسا توشی تەنگژەی ئابووری هاوشێوەی نیوەی یەکەمی ساڵی (1811) ببۆوە، بەڵام ئەمجارەیان بەیارمەتیدانی مالی دەوڵەت بۆ کەمکردنەوەی بێکاری چارەسەر نەدەکرا، بەهیچ کلۆجێك ئەگەری ڕزگاربوون لەوتەنگژە ئابوورییە نەبوو.

لەساڵی (1813) ئەوکاتەی ناپلیۆن لەئەڵمانیادا سەرگەرمی شەڕبوو، پۆلیسی فەرنسا کەمکەم هەستیان بەسەرهەڵدانی دیاردەیەك دەکرد کەلەساڵی (1811)شدا هەبوو وبەنهێنی لەڕاپۆرتەکانیاندا بۆ لێپرسراوانی باڵاتر لەخۆیان دەیانووسی کەبەم جۆرەی خوارەوەبوو:

کرێکارەکان لەگەڵ یەکتریدا فسکەفسك و مقۆمقۆیانە، بەئاشکرا ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕن وقسەی نابەجێ وزیادە ڕەوی دەکەن.

گەڕەکە کرێکار نشینەکانی پاریس کەڕۆژگارێکی زۆربوو لەژێر ستەم و زەبرو زەنگی حکومەتدا دەژیان، هەژدە ساڵبوو هەر لەساڵی (1795)وە هیچ ڕاپەڕین و خۆپیشاندانێکیان نەکردبوو، ئێستا وردەوردە بەهۆی فشاری زۆری بێکاری وهەژاری

هاواری نارەزاییان دەردەبڕن، هۆی ئەمە تەنها ئەوەنەبوو جاسوسەکان لەسەردەمی فوشەدا گەیشتبونە ئەوپەڕی توندوتیژی و بەهێزی و دواتریش لەسەردەمی سواری دوك دوشدا هەمان پەیڕەوکردنی پێشوو بەڕێوەدەچوو.

ئەوەنەبوو پۆلیسی نهێنی لەهەموو شوێنێکدا وەك مارومۆڵ بڵاوبیبوونەوەو مەفرەزەکانی ئاسایش شەو وڕۆژ دەگەڕان و دەچوونە گەڕەکە کرێکارەکانی سنت ئەنتوان و سن مارسو و کوی تامیل و شەقامی موفتار، هەروەها بەهۆی ئەوەش نەبوو چینی کرێکاری مەینەتبار ڕق وکینەی لەبەرامبەر حکومەتدا هەبوبێت، چونکە ناپلیۆن داهێنەری دەفتەرچەی کرێکاران بوو کەکرێکارانی بەشێوەیەکی ڕەها دەخستەژێر فەرمان و دەسەڵاتی خاوەن کارەکان، ئەوساڵانە باجی خوێنی دەویست و سەرەتا ئەم باجەی لەنێوان پیاوانی کامل و وریادا وەردەگرد، بەلام ئێستا مێردمنداڵی(18) ساڵە دەبات هەتا کوشتارگای سەد هەزار کەسی لەشوێنی دووردەستدا بەرپابکات، ناپلیۆن کرێکارانی لەهەموو ئامێرێکی بەرگریکردن لەمافەکانیان لەبەرامبەر خاوەن کارەکاندا بێبەش کردبوو.

بەلام ئێستا کەمەترسی دوژمنی دەرەکی وەك سەرەتای شۆش هەڕەشە لەسنوورەکانی فەرەنسا دەکات و داگیرکەران بەتەمان دووبارە دەسەڵاتداریەتی شانشینی بوربنەکان بهێننەوە سەرتەخت وتاراجی فەرنسا، گرژی و ترس باڵی بەسەر کرێکاراندا کێشا، تارمایی خوێناوی سەرکوتکەری خۆپەرست، کەلەزیادکردنی دەسەڵاتەکەی تێرنەدەبوو لەپڕ سڕایەوەو بەتێڕوانینی ئەوانە، ئەو ڕەوە ولاخە دەسەلات پەرست وخائینانی ئاوارە بەرەو فەرنسا لەگەڵ دوژمندا کەوتونەتە ڕێگاو لەگالیسکەکانی بیانیدا تێکخزاون و بیرلە دامەزراندنەوەی سیستمی کۆنی فەرمانڕەوایی دەکەنەوەو دەیانەوێت هەموو پاشماوەی شۆڕش ریشەکێشبکەن، چی بکەن؟ لەپشتی بەرەی شەڕی ناپلیۆنەوە دژی ئەو ڕاپەڕن وبەوکارەشیان مەسەلەی ملکەچکردنی فەرەنساو هاتنەوەسەر کاری بوربنەکان ئاسانبکەن ودوژمن زاڵبێت؟

چینی کرێکار لەکۆتایی ساڵی (1813)و سەرەتای ساڵی (1814)دا ڕانەپەڕین دژی ناپلیۆن، هەرچەندە بەدرێژایی فەرمانڕەوایەتی ناپلیۆن بەقەت ئەو ماوەیەی سەرەوە فشارو زۆریان لەسەر نەبوو.

بەلام شێوازی بیرکردنەوەی چینی برژوازی ڕێك بەپێچەوانەی ئەمەبوو، زۆربەی خاوەن کارخانەکان دەیانویست بەرگری لەناپلیۆن بکەن، چونکە ئەمانە لەهەموو کەس باشتر دەیانزانی بریتانیا چی دەوێت و چ دەکات، ئەگەر ناپلیۆن تێبشکێت ئەوا ڕکەبەرێ لەگەڵ کالاکانی بریتانیا چ لەناوخۆو دەرەوەدا چەەند دیژوار دەبێت، بازرگان وخاوەن بانکەکان و .. هیتر، دەمێکبوو لەحکومەتی سەرکوتکەری ناپلیۆن بێزاربیوون، ژمارەی بازاڕەکانی ناوخۆ ودەرەوە ڕۆژ بەڕۆژ لەکەمی دابوون، پارە هەبوو، بەلام لەبازاڕەکاندا زۆر کەس تێبیی ئەوەیان کردبوو، گرفت وناڕوونی ئاسۆکان زۆر لەبرژوازیەکانی خستبۆ دوودڵی ودەستەوەستانی، هەتا ئەوکاتەش ناپلیۆن دەیتوانی لەگوندەکاندا پەناگای یارمەتیدانی دەست بکەوێت، ئەو بەگرتنی سەربازی تازەو وەرگرتنی باج ویارمەتی لەگوندەکان هاوڵاتیانی بەخاکی سوتماك گەیاندبوو، گوندنشینەکان لەناپلیۆن زیاتر لەهێرشی بێگانان دەترسان، بەلای زۆربەی گوندنشینەکانەوە، بوربنەکان، واتە: هاتنەوەسەرکاری سیستمی شانشینی فیودیالی ودەستبەسەرداگرتنی زەوی و زارەکان لەلایەن فیودیالەکان وهاتنەوەی ئاغایەتی و خزمەتکاری، دانەوەی ملکەکانی کلێساو ماڵی ئەوکەسانەی لەسەردەمی شۆڕشدا بەهۆی لایەنگری شانشینی ئاوارەببوون، ترسان لەم دەستکەوتانەی بەوزەحمەتە زۆرە بەچنگکەوتبوون، ئەمە گوندنشینەکانی ناچاردەکرد ئاکامی هەڵەی سیاسەتە چەوتەکانی



دەرەکی ناپلیۆن قبوڵبکەن کەئێستا بەشێوەی لەشکرکێشی لەلایەن دوژمنانەوە هەڕەشە لەفەرنسا دەکات، جگەلەمانەش بەلای ئەوانەوە ناپلیۆن باشتربوو لەڕژێمی شانشینی پێشوو، توێژێکی کەم، بەڵام لەئەشرافەکانی کۆن وتازەبوون، ئەشرافە کۆنەکان هەتا ئەوکەسانەی کەخزمەتی ناپلیۆنیشیان دەکردو هەمیشە ئەمانە لەژێرەوە خۆیان لەبورینەکان نزیکدەکردەوە، بەڵام سەبارەت لەئەشرافەتازەکان واتە: مارشاڵ و میرنشین و کنتەکان [٦٩] بارونەکانی ئیمپراتۆری کەلەدەست گەورەکەیان زێڕیان وەرگرتبوو وچاودێریان دەکراو پارێزراوبوون، وەك پێشوو جێگای پشتپێبەستن نەمابوون وتینوی ئەوەبوون، ئیتر پاشماوەی تەمەنیان بەرابواردن ولەزەتوەرگرتن بەسەرببەن و ڕۆژگاری سەربازی وگیان فیداکاری بەڕابردوو بسپێرن.

ئیمپراتۆری فەرەنسا جارێکیان بەتوڕەییەوە گوتبووی (بەڕێزان، وەك دەبینم ئێوە ئیتر ناتانەوێت بجەنگن؟ برتیە دەیەوێت لەشانشینی خۆیدا بمێنێتەوە، گروبواش خەریکی ڕاوشکاربێت و ڕاپیش لەئوتێلە جوانەکەی پاریسیدا دانیشێت)

ڕاپ، بەشێوەیەکی مەیلەو ئاڵۆز وەڵامی دایەوەو گوتی (بەڵێ گەورەم من دانی پێدادەنێم... ئاخر من بەخۆشگوزەرانییەکانی پایەتەخت زۆرکەم ئاشنابووم) ژیان لەناو چادری سەربازی ولەمەترسی بەردەوامداو لەژێر بارانەی گوللەکان و ململانێ لەگەڵ مەرگدا) شەر کەسانی وەك ماکدوناڵد و نی و ئاوژەرو سباستیان و ڤیکتور و کولنکور و ساواری بەجۆرێك ماندوو وشەپرێو کردبوو، وردەوردە قسەو دەندەدەکانی ئلحەزانی وەك تالیران وفوشە کاری تێکردبوون و ئەمانە.

بارو دۆخی چین وتوێژە هەمەجۆرەکانی ئەوکاتی فەرەنسا بەمجۆرەبوو، دوای تێشکانی ناپلیۆن لەلایپزیکدا لەڕۆژانی (16 هەتا 19)ی ئۆکتۆبەری ساڵی (1813) واتە: جیا لەوسەرکەوتنانەی کەناپلیۆن بەشکۆمەندی دەگەڕایەوە پاریس ئەمجارەیان بۆ ئەوە گەڕایەوە پاریس تاهێزەکانی خۆی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێرشی دوژمنی ئاوسار لەسەرداماڵاو بۆسەر فەرنسا دووربخاتەوە.

( 5 )

(بابرۆیین لەباپیرە فرانتز بدەین) ئەمە ڕستەیەکبوو منداڵە سێ ساڵەکەی ناپلیۆن زوو زوو وەك توتی دووبارەی دەکردەوە، کاتێ ئیمپراتۆر گوێی لەم ڕستەیەدەبوو بەقاقا پێدەکەنی.

لەوکاتانەدا باپیرە فرانتز، کەسوپاکەی لەڕن نزیکدەبۆوە، ترس وگومانی ئەوەی هەبوو دوا ڕۆژێکی خراپ بێتەپێش، کەمترنیخی هۆشمەندیش سەبارەت بەم ڕایە لەگەڵ ئیمپراتۆردابوو.

بەدڵنیاییەوە ئەو دوودڵیە پەیوەندی بەخزمایەتی نێوان ئیمپراتۆری نەمساو ناپلیۆنی زاوایەوەنەبوو، کەکوڕەکەی ناپلیۆن بەمیراتگەرەوەی شانشینی فەرەنسا دانرابوو، هۆیەکیتری هەبوو کەدیپلۆماسیەتی نەمسای ناچاردەکرد بەتێڕوانینێکی جیا لەپروس و ڕوسیاو ئەڵمانیا سەیری ئاکامەکانی شەڕبکات، بەلای بریتانیاییەکانەوە ناپلیۆن ئاشتی نەکەرەو مەترسیدارو ئەو دوژمنێکە وڵاتی بریتانیا بەدرێژایی (15) سەدەی فەرمانڕەوایی خۆی ڕووبەڕووی نەبۆوە، مادام ناپلیۆن لەسەر کار لانەبراوە، ئەوا ئەستەمە ئاشتی لەنێوان فەرنساو بریتانیادا بکرێت، بەڵام تزاری ڕوسیا هەردەیویست تۆڵەی خۆی بکاتەوەو ناپلیۆنیشی

---

[269] - مەبەست بەگشتی لەوانەیە کەلەژێرسایەی ناپلیۆندا بونە خاوەنی ساعانی زۆر وپلەو پایەو ...تاد، (و-کوردی).



بەتاکەکەس دەزانی کەبتوانێت لەکاتی پێویستدا دەوڵەتی پۆڵۆنیا زیندوبکاتەوە، هەروەها تزار گومانیشی لەوەنەبوو ئەگەر ناپلیۆن لەسەر کورسی دەسەڵاتی فەرنسا بمێنێتەوە ئەوا بەبەسەرچوونی کات دەتوانێت هێزی گەورە دروستبکات وزەبری ترسناك لەدوژمنەکانی بوەشێنێت.

ئەم رایە لەهەموو کەس زیاتر کاری کردبۆسەر فردریك ویلهلمی سێیەم، پاشای نەمساو تزار ناوبراوی ناچارکردبوو لـەدژی ناپلیۆن بجەنگێت وبێتەناو هاوپەیمانیەتەکەیان، لەوکاتەوە هەتا کۆتایی شەڕی لایپزیك، ساتێ نەبوو ناوبراو ترسی ناپلیۆنی لەدڵ دەرچووبێ، ترسی فردریك ویلهلم بەجۆرێکبوو تەنانەت دوای ئەوەی هێزی هاوپەیمانان لەلوتزن و بـوتزن و درسـدا رویدا، ناوبراو بەشێوەیەکی پێکەنیناوی و هەڵسوکەوتێکی شپرزانە بەتزاری روسیای گوتبوو(بینیت دووبارە ئێمەی هـەتا ڤیستول، رەتاندەوە) ئەو ترسە زۆرو ئەفسانەییە لەناپلیۆن نەخۆشییەکبوو لەو رۆژانەدا بڵاوببۆوە، هەتا دوای ئەوەی ناپلیۆن هەموو ئەو خاکانەی لەدەستدا کەئیمپراتۆریەکەیان پێکهێنابوو وتەنها فەرنسای لاوازو بێ توانای لەچنگدامابوو، نـاپلیۆن ئەوکاتیش هەمان سام وترسی هەبوو وفردریك ویلهلمی سێیەمی پاشای پروس نەیـدەزانی ئەگـەر شـەڕتەواوبێت وسـوپای هاوپەیمانان بۆ وڵاتەکانی خۆیان بگەڕێنەوە، دەبێ ئەم چ فورێك بەسەرخۆیدابکات، چۆن هاوسێیەتی ناپلیۆن ناوێك بەرگە بگرێت؟ بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی بریتانیاو تزاری روسیاو فردریك ویلهلم، کەدەیانگوت ئەگـەر نـاپلیۆن لەسـەر کورسی دەسەڵاتی فەرەنسا بمێنێتەوە هەموو ئەو خوێنەی لەنێوان سالانی(1812-بۆ 1813) رژاوە بەهەدەر دەچێت، نەمسا پێی وابوو نابێ روسیا بەبێ پارسەنگی هێز بەسەر ئەوروپادا بمێنێتەوە، نەمسا دەیویست ناپلیۆن بێنەوەی ئیتر مەترسی لەسەر نەمسا بمێنێت، بەبەهێزی بمێنێتەوەو ئەگەر پێویستبکات وەك هاوپەیمانی بنەماڵەی هابسبورکەکان رێگر لەبەردەم روسیادا، مترنیخ و فرانسوای یەکەمی ئیمپراتۆری نەمسا جارێکیتر هەوڵیاندایەوە سازش لەگەڵ ناپلیۆندا بکرێتەوە، مترنیخ سەرکەوتوو بوو لەوهەوڵەیداو توانی بریتانیاو روسیاو پروس رازیبکات بەوەی بۆدواجار دانووستان لەگەڵ ناپلیۆندا بکرێت، بەم مەرجانەی خـوارەوە: نـاپلیۆن دەسـت لەهـەموو ئـەو خاکانـە هـەلگرێت تابـەئەمرۆ لەدەسـتی داون وفەرەنـساش بەکـەمێ جیـاوازی لەپەیماننامەی ساڵی (1801)ی لونەویل لەدەست ناپلیۆندا بمێنێتەوە. لەو رۆژانەدا سەرانی هاوپەیمانان لەفرانکفۆرتدابوون. مترنیخ، بانگهێشتی وەزیری پێشووی فەرەنسا کەلەفرانکفۆرتدا زیندانی کرابوو کردو بەئامادەبوونی لورد ئابردین نوێنەری برتانیاو نسلرودی نوێنەری روسیا کەبەوەکالەتی سەرۆك وەزیرانی پروسیش بـوو، ئـەو دیپلۆماسـیە فەرەنـسییەیان نـارد دەستبەجێ بچێتەلای ناپلیۆن و ئەم پێشنیارەی وڵاتانی هاوپەیمانی پێبگەیەنێت، پەیماننامەی ئاشتی لونەیول لەسەردەمی خۆیدا لەئەنجامی شەڕێکی سەرکەتوانەوە بەسترا، بۆیە بەلای ناپلیۆنەوە ئەو وڵاتە گەورەیەی کەلەساڵی (1801)دا دوای شەڕی مارنکو وهوهنلندن دایمەزراندبوو بۆی دەمایەوە. لەمەترسی و پەشێوی زۆرو ئەگەری هێرشکردنی هاوپەیمانان بۆسەر فەرنساو تێشکانەکانی سالانی (1812 و 1813) بەشێوەیەکی چارەڕواننەکراو دووبارە رێگای ئاشتی و دەرگای رزگاربوون بەرووی ناپلیۆندا کرایەوەو ئەو بەپاشای وڵاتێکی پلەیەك دەمایەوە.

سنت ئاینان [270] لە(14)ی نۆڤەمبەری ساڵی (1813)دا گەیشتە پاریس.

---

[270] - ئەو وەزیری پێشووی فەرەنسایە کەپێشنیاری ئاشتی لەلایەن هاوپەیمانانەوە بۆ ناپلیۆن هێناوە.(و- کوردی).



ناپلیۆن کەلەجوڵەو جۆش و خرۆشێکی بێ هەداداندابوو، بۆ پێکەوەنانی سوپایەکی تازە بۆشەڕ، سەرەتا نەیویست بڕیاربدات، بەڵام بەپێچەوانەی حەزی خۆی ڕازیبوو دانوستان بکات، ئەو لەوکاتەی لەژووی دەفتەری تایبەتی خۆیدا دەهات ودەچوو، لەبەر خۆیەوە بێ ئەوەی ڕووی لەکەسبێت دەیگوت: باشە، ڕاوەستن بۆم، سەبرکەن، بەم زووانە پەی بەوەدەبەن کەئەمن ونەسەربازەکانم پیشەکەی خۆمان فەرامۆشنەکردووە، ئێمەتان لەنێوان ڕووباری ڕن و ئالپدا شکستخواردووکردو بەخیانەتکردن شکستتانپێهێنابن، بەڵام ئیتر لەنێوان ڕن و پاریسدا خائین بونیان نییە)

ئەم قسەیەی ناپلیۆن بەهەموو فەرەنساو ئەورووپادا بڵاوبۆوە، ئەو کەسانەی کەناپلیۆنیان دەناسی بەو دانووستانە دڵخۆشنەبوون و پێیانوانەبوو ئاشتی بەرکەماڵبێت.

هەموو ڕۆژێك ڕیزی تازەی سەربازی تازە بەبەردەم ئیمپراتۆری فەرەنسادا تێدەپەڕین و بەرەو خۆرهەڵات بۆلای ڕن دەکەوتنەڕێ، کۆتایی تراژیدیای گەورە نزیکدەبۆوە.



# شەڕی فەرەنساو یەکەم دەست لەکارکێشانەوەی ناپلیۆن(1814)

( 1 )

لەساڵی (1814)شدا وەك ساڵی (1813) ناپلیۆن خۆی ئامادەی شەڕدەکرد لەگەڵ ئەورووپاداو جگەلە شەڕو پستبەستن بەهێزە چەکدارەکانی پشتی بەهیچیتر نەدەبەست، بەڵام تێبینی ئەوەی کردبوو دوای تێشکانی لایپزیگ وبەرەبەری هێرشکردنی هاوپەیمانان بۆسەر فەرنسا، ناتوانێت وەك مانگەکانی یۆلیۆ و ئۆگوستی ساڵی (1813) ڕەفتاریکات و کۆنگرەی براگ بەنەزۆکی بهێڵێتەوە.

لەوکاتانەدا ناپلیۆن ڕازیبوو هەموو ئەو شوێنانەی لەژێر ئیمپراتۆریەتەکەی دابوو لەدەستبدات جگەلەهاوپەیمانیەتی (رن) ئەو بۆیە پێشتر هەرەسی بەدانوستانەکان هێنا هەتا بەلێدانی یەك زەبری گورچکبڕ یەکلاییکاتەوەو هاوپەیمانان دەملەکوت بکات. بەدڵنیاییەوە ئەو پێشنیارانەی کەلەلایەن هاوپەیمانانەوە خرابوونە پێشی زۆر هیچ و کەمبوون، بەڵام دەیزانی هەموو چین وتوێژەکانی گەلی فەرنساو لێپرسراوانی باڵای سوپا لەشەڕ بێزار بوون.

بۆیە ئەو پێشنیارانەی لەلایەن سنت ئاینانەوە بۆی نێردرابوون بەڕاشکاوی ڕەتی نەکردنەوەو وای ڕاگەیاند خۆشی حەزی لە ئاشتی کردن بووەو نزیکەی دوو مانگ دوای ئەو پێشنیارەی ئاشتی کردنە، مەسەلەکەی خاوەخاو پێکردو ئومێدی ئەوەی هەبوو هاوپەیمانان چاوێك بەمەرجەکانی ئاشتیکردنەکەدا بخشێننەوەو بەوجۆرە بەرپرسیاریەتی هەڵایسانەوەی شەڕ دەکەوتە ئەستۆی هاوپەیمانان، ناپلیۆن دەیزانی جگەلەئەمسا هیچ وڵاتێکیتر نایەوێت ئەو لەسەر دەسەڵاتی حوکمڕانی فەرەنسا بمێنێتەوە، بەتایبەت بریتانیا، چون بەندەری ئانوس لەدەستی ناپلیۆندا دەمایەوە، ڕازی نەبوو. بەڵام ئێستا بەپێی ئەو پێشنیارانەی کەلەفرانکفۆرتەوە پێی دەگەیشتن، نەك هەر بەندەری ئانوس، بەڵکو هەموو بەلجیکاشی لەدەستدا دەمایەوە، ئاگاداری ئەوەشبوو چەند ئاشتی کردن لەگەڵ هاوپەیماناندا دوابخات ئەوەندە مەترسی ئەوەهەیە لرد کاسلری وەزیری دەرەوەی بریتانیا، ئەو ڕازیبوونەی کەئابردبن لەسەرەتای مانگی نۆڤەمبەردا لەژێرفشاری مترنیخ لەفرانکفۆرتدا دەنگی بۆدابوو پەشیمان بێتەوە، بۆیە دەبوا ناپلیۆن ئامادەباشی تەواوی نیشاندابا بەئاشتی کردنی وگرتنی سەربازیش بۆ شەرنییە، بەڵکو بۆ پاراستنی ئاسایش وئاشتی کردنە لەگەڵ هاوپەیماناندا، ناوبراو لە(19/ی دیسەمبەری ساڵی (1813)دا لەگوتەکەیدا بەم جۆرە دەڵێت: لەلای منەوە هیچ ڕێگریەك نییە بۆ ئاشتی کردن، من ئاگام لەهەست و حەزی گەلی فەرەنسایەو بەشداری ئەو هەستانەشیان دەکەم، چونکە هیچ فەرەنسییەك نییە ئارەزووی لەئاشتی کردنی شەڕەفمەندانەی نەبێت، بەداخەوەم لەوەی لەم میللەتە جوامێرە فیداکاری تازەم لێدەوێت، بەڵام چی بکەم ئەم فیداکارییە پێویستە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی، من ناچاربووم بەگرتنی سەربازی تازە سوپا بەهێزتر بکەم، گەلەکان تەنها بەبەهێزکردنی هێزەکانی خۆیان دەتوانن خۆیان لەئاسایشدا بهێڵنەوە)



بەم قسانەی مەعلومبوو ناپلیۆن دەیویست ئاشتی بکات، هەروەها لەدرێژەی گوتەکەیدا دەڵێت (... هەتا ئەوان، واتە ئەوەی ئاینده نەڵێن ئێمە ملمان بۆ لەدەستدانی گەورەترین بەرژەوەندیناو کردمانەقوربانی وئەو قانونانەی کەبریتانییەکان بەدرێژایی چوارسەدە نەیانتوانی بەسەر فەرەنسایدا بسەپێنن)

لەبێنایەری ساڵی (1814)دا سەد هەزار سەرباز نێدرانەناو سوپای فەرنسا بۆخزمەتکردن و بریاروابوو سەربازی تازەی تریش بگیردرێن.

ناپلیۆن سیناتۆرەکانی بۆهەموولایەکی وڵات ناردبوو هەتا هانی لێپرسراوانی ئەو شوێنانەبدەن بۆ کۆکردنەوەی سەربازی تازەو دانی باجی ئاسایی‌و نائاسایی بۆخەرجی سوپا.

لەمانگی بێنایەر بەدواوە سوپای دوژمن لەڕووباری ڕن پەڕیبوونەوەو بەرەو ولایەتەکانی ئالزاس و فرانش کنتە دەهاتن، لەلایەکی تریشەوە ڤلینگتنیش کێوەکانی پیرینەی بڕیبوو لەباشووری فەرەنساوە بەرەوپێشدەهات، ئیمپراتۆری فەرەنسا بەوسیناتۆرانەی کەبۆ ولایەتەکانی ناوخاکی فەرەنسای ناردبوون گوتبوو (من دان بەوەدادەنێم زۆر شەرمکردوون و لەشەڕیش ناترسم و نەخشەی ئەوەم لەپێشدابوو ئیمپراتۆریەتی جیهانی بۆ فەرەنسا دەستەبەربکەم، بەڵام بەهەڵەداچوو بووم، چونکە ئەم نەخشەیە لەگەڵ هێزی ژمارەی دانیشتوانی وڵاتدا نەدەگونجا، دەبوا هەموو میللەتمان بۆ سەربازی بانگهێشت کردباو منیش باوەڕم بەوەهەیە کەڕەوش و داب ونەریت ڕێگای ئەوەنادات هەموو میللەت ببێتە سەرباز...) ئەگەر سیناتۆرەکان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ناپلیۆندا بوێرابان زمانیان گێراباو وەقسەکەوتبان ئەوا دەیانگوت بەڕێز جگەلە ژن ومنداڵ و پیرەمێرد هەموو میللەتت کردووە بەسەرباز، هەروەها ئیمپراتۆر بەمجۆرە درێژەی بەقسەکەیدا (دەبێ من سزای ئەم گوناهەم بدەم، کەبەبەختی خۆم دەنازی ونەو باجەش ئەدەم، ئەوە من بووم هەڵەم کردوو دەبێ باجەکەشی بدەم، نەك فەرەنسا! فەرەنسا گوناهێ نییەو هەڵەیەکی نەکردووە، ئەو خوێنی خۆی بەخۆڕایی بەمن بەخشی ودرێغی لەهیچ فیداکاریەك نەکردووە لەبەرامبەرمدا...)

ناپلیۆن ئاشتی کردنی بەفیداکاریەکی شەخسی دەزانی ولەو بارەوە دەڵێت ( بەڵام من بۆخۆم تەنها ئەم شانازییە دەهێڵمەوە کەئازایەتی لەسەرووی توانای خۆمەوە نیشانبدەم و چاو لەو تەخت وتاراجە بپۆشم کەلەشێوەی نەبووەو ئەو بەرزەفڕیەی تەنها بەکۆششەکانی میللەت دەستەبەرکراوە، ئیتر من نامەوێت جارێکیتر داوای ئەو کۆششەی لێبکەمەوەو بیکەمە فیدای بەختیای خۆی)

ناپلیۆن لەم بارەوە بەدەگمەن قسەی بەڕاشکاوی دەکردن، ئەو باوەڕی کەمی بەسیناتۆرەکان هەبوو ویەکورتی بۆچوونی ئەو سەبارەت بەئەوان ئەوەبوو سیناتۆرەکان، نۆکەری ئەمڕۆ وخائینی بەیانین، ئیتر ناپلیۆن لەخیانەتکردنی تالیران گومانی نەمابوو، دوای شەڕی لایپزیك هەرکەلەمانگی نۆڤەمبەری ساڵی (1813)دا گەڕایەوە بۆ پاریس، لەکۆبونەوەیەکی گشتی بەرفراوانی حکومیدا لەبەردەم تالیراندا ڕاوەستاو بەسەریدا شیڕاندو گوتی: هاتووی لێرە چی بکەیت؟ من دەزانم لەبیری ئەوەدای کەمن نەبم، تۆ ببیتە سەرۆکی وڵات، ئاگات لەخۆتبێت بەڕێز کەس کەڵك لەرمانی هێزی من وەرناگرێت، من ئاگادارت دەکەمەوە، ئەگەر بەسەختیش نەخۆشبم ئەوا دەبێ تۆپێش من بمریت).

لەگەڵ ئەمانەشدا وەك ڕێویەك ماوەیەك غەم وپەژارە دایگرت، بەڵام ناپلیۆن تالیرانی لەسێدارەنەدا.



لەمانگی بێنایەری ساڵی (1814)دا، ناپلیۆن پێشنیاری ئەوەی بۆ تالیران کرد، لەگەڵ کولنکوردا وەك وەفدی فەرەنسا بۆ ئاشتیکردن بچێت وناوبراو ئەم داواکاریەی ناپلیۆنی ڕەتکردەوە، ناپلیۆن بەپەنجە راوەشاندن هەڕەشەی لەتالیرانکرد.

ناپلیۆن باوەڕی بەفوشەش نەبوو وتەنانەت بەمارشالەکانیشی تەنها باوەڕی بەسەربازەکانی هەبوو، بەڵام نەك بەو سەربازە مێرد منداڵانەی کەتازە هاتبوونە ناوسوپاوە، بەڵکو باوەڕەی بەسەربازە کۆنەکانی هەبوو، ئەو ناچاربوو سەربازەکانی لەبەرشلۆنەو ئیسپانیاو ئیتالیاو... بانگهێشت بکاتەوە، چونکە نەیدەویست بەڕاستی ئاشتی بکات.

لەلایەکیترەوە دوو مانگبوو مەسەلەی ئاشتیکردن بەبێ ئەنجام درێژبۆوەو هێزی هاوپەیمانان گەیشتبوونەسەر سنووری فەرەنساو دڵنیابوون لەوەی میللەتی فەرەنسا بێزارو شەکەتبوون لەشەڕ، سەربازە تازەکانیش بەدەستەدەستە ڕیزەکانی سوپای ناپلیۆنیان جێدەهێشت و هەڵدەهاتن، هاوپەیمانان خۆیان لەسەر ئەوە ساغکردبۆوە جگەلەسنووری کۆنی فەرەنسا کەبەپێی ڕێککەوتننامەی ساڵی (1790) دیاریکرابوو، هیچ شوێنێکیتر لەدەست ناپلیۆندا نەهێڵن، واتە: بەلجیکاو هۆڵەنداو ساووا بەشی چەپی ڕووباری ڕن کەلەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسادا داگیرکرابوون، لەدەست ئەوی بهێننەدەرێ، دیارە ئەمە لەپێشنیارەکانی ساڵی (1813)ش کەمتربوو، بەکورتی ئەمجارەیان هەموو لایەك هەتا کاسلری سەرۆك وەزیرانی بریتانیاش بەشەخسی خۆی هاتبۆناو ستادی گشتی هاوپەیمانان ولەسەر ئەمەڕازیبوو.

کۆنگرەی ئاشتیکردن لەشاتیون داو ،بەسترا، بەڵام دانوستانەکان ئاکامی نەبوو.

ناپلیۆن لەوەڵامی کولنکور، کەنوێنەری خۆی بوو لەو ڕێککەوتننامەیەدا، ئاوای بۆ ناپلیۆن نووسیبوو(قبوڵکردنی پێشنیارەکانی هاوپەیمانان، دواین ترووسکایی ئومێدە بۆ پاراستنی تەخت وتاراجی ئیمپراتۆری بەڕێزتان و ڕێگرە لەبەردەم گەڕانەوەی بوربنەکان.

لەوەڵامدا ناپلیۆن ئاوابۆ کولنکور دەنووسێتەوە(من لەو پێشنیارە شەرمەزاریەی کەبۆت ناردووم زۆر دڵگرانم وتەنها بەچاوپۆشین لەم ڕایەت کەسایەتی خۆم بەڵەداری دەبینم، تۆ هەرباسی بوربنەکان دەکەیت، من بینینی بوربنەکان لەفەرەنسادا لەبارودۆخێکی لوژیکدا بەباشتر دەزانم لەوەی نەنگی ئەم پێشنیارەی بۆتناردووم بەرگەبگرم).

شەڕ، بەڵێ تەنها دەبێ شەڕ چارەنووسی هەموو شتێك دیاریبکات.

بێنەوەی ئەو دانوستانە ئاکامی هەبێت نوێنەرەکان بڵاوەیان پێکردو لەهەمان کاتیشدا ناپلیۆن بەئومێدەوە خۆی بۆ شەڕی هاوپەیمانان ئامادەدەکرد.

لەشەوانی(24و25)ی بێنایەری ساڵی (1814)دا ناپلیۆن چووبۆ هۆڕدووی سەربازی وماری لویزی هاوسەری بەشانشین دانا و گوتی: ئەگەر مردم ئەوا کوڕە سێ ساڵەکەم لەسەر تەختی پاشایەتی دابنێ وئەمە ڕابگەێنەو دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتیش هەرلەدەست خۆیدابێت.

ناپلیۆن ئەوەندە ئەو کوڕەی خۆشدەویست، بەدرێژایی تەمەنی خۆی کەسی بەو ئەندازەیە خۆش نەویستبوو، ئەو کەسانەی کەئیمپراتۆریان باش دەناسی، لەوباوەڕە دانەبوون ناپلیۆن هەتا ئەو ئاستە هۆگری ڕۆڵەکەیبێت، کاتێ ئیمپراتۆری فەرەنسا لەژوورەکەی خۆیدا لەنزیك ئاگردانەکەدا خەریکی ئیش وکاردەبوو، منداڵەکەی دەهاتە تەك کورسییەکەی باوکی و ڕادەوەستا،



منڤال، کەکارەکەرێکی تایبەتی ناپلیۆن بووە، ئاوای دەگێڕێتەوە: منداڵەکە حەزی نەدەکرد لەو ژوورە بچێتەدەرێ و داوای لەباوکی دەکرد یاری لەگەڵدابکات، لەناو هەموو ئەوانەی لەکۆشکدابوون تەنها ئەو منداڵە یەك تۆز لەئیمپراتۆر نەدەترساو خۆی بەگەورەی تەواو دەزانی لەو ژوورەی ئیمپرایۆری تێدابوو.

ناپلیۆن بەدرێژایی ڕۆژی(24/ی یێنایەر هەرلەو ژوورەدا مایەوەو خەریکی نەخشەدانی شەڕو ڕێککردنی کارو بارەکانی سەربازی بوو وبەردەوام دەینووسی،

منداڵەکەی بەئەسپە دارینەکەی خۆیەوە هەرلای باوکی مابۆوە، چونکە ماوەیەکی زۆربوو باوکی سەرقاڵی کاغەزو نوسین بوو ونەیدەدواند، منداڵەکە ناچار لەباوکی نزیکبۆوەو شاقەلی کراسەکەی گرت و ڕایکێشا، ئیمپراتۆر کردیە باوەشی وچەند جارێکیش هەڵی هاویشت ودەیگرتەوە، پاشای بچوك دڵی خۆشبوو کەباوکی بەدەمیەوە پێدەکەنێت وماچی دەکات، شەو بردیان وخەواندیان، کاتژمێر سێی سەرلەبەیانی، ئەو کارەکەرەی ئەوشەوە لەژووری منداڵەکەی ناپلیۆندابوو بۆ چاودێری کردنی، لەپڕ چاوی بەناپلیۆن کەوت کەبەلەسەرخۆیی وماتەماتە دێتەژوورەکەو نەیزانی ئەم لەسەرجێگاکەی ڕاکشاوەو بەخەبەرە، ناپلیۆن لەتەك لانکەی منداڵەکەیدا ڕاوەستا، ناپلیۆن تاماوەیەکی زۆر لەمنداڵەکەی راماو دواتر چۆدەرێ و سواری ئەسپەکەی بوو وبەرەو هۆردووی سەربازی ڕۆیشت وئیتر دوای ئەمە ناپلیۆن هیچ کاتێ کوڕەکەی نەدیتەوە.

# ( 2 )

مەشقپێکردنی سەربازە تازەکان تەواونەببوو کەدەستکرایەوە بەگرتنی سەربازیتر بۆ خزمەت، ئیمپراتۆر ومارشالەکانی زیاتر لە(47) هەزار سەربازی ئامادەیان بۆشەڕ لەدەستدابوو، بەڵام هاوپەیمانان (230) هەزار سەربازی ئامادەی شەڕیان هەبوو ونزیکی هەمان ژمارەش سەرباز لەملاوە لەڕێگادابوون بۆگەیشتن بەوهێزەی هاوپەیمانان وپەیوەندی کردن پێیانەوە،

هەموو مارشالەکانی ناپلیۆن نائومێدبوون تەنانەت خودی مارشال (نی )یش، تەنها ناپلیۆن لەجۆش وخرۆشبوو ودەیویست دڵخۆشی خۆی بۆ ئەوان بگوازێتەوە.

ئەوکەسانەی بەچاوی خۆیان بینیویانەو لەو ڕۆژگارەدا ژیاون دەگێڕنەوە کەناپلیۆن چوست وچالاك دەهاتەبەرچاو، بەجۆرێك وەك بڵێی گەنج بوبێتەوە.

ناپلیۆن لەبەریەیانی گەیشتنی بەڤیتری، واتەلە(24/ی یێنایەر)دا، بەهەموو هێزەکەیەوە هێرشی کردەسەر بلوخرو لەسن دیزیەی دەرپەڕاند، دواتر هێرشی کردەسەر لەشکرێکی ڕوس وپروسەکان کەلەژێر فەرماندەی ئوستن ساکندا بوون ولە(3) ، یۆلیۆدا لەبرین سەرکەوتنی تازەی بەدەستهێنا، دوژمنەکانی سەبارەت بەم شەڕە بەتاڵخی ودیژواری باسی دەکەن، ئەو سەرکەوتنە وورەی سەربازەکانی فەرەنسای زۆر بەرزکردەوە.

بلوخر تێشکاو بەپەلەپروزاوان خۆی گەیاندە بارسوراوب کەزۆرینەی هێزەکەی شوارتز نبرگ لەوێدا جێگیرببوو، هاوپەیمانان لەنێوانی شومون و بارسوراویدا نزیکەی (122) هەزار سەربازیان هەبوو، ناپلیۆن کەمێ زیاتر لە (30) هەزار سەربازی لەگەڵدابوون وبڕیاریدا پاشەکشەنەکات وشەڕ لەوێدابکات.



شەڕی ڕوتیەر کەلەڕۆژی یەکەمی مانگی فبرایەردا ڕوویدا بەیانی زوو دەستی پێکردوو کاتژمێر (10)ی سەرلەبەیانی کۆتایی پێهات، دوای ئەمە بێنەوەی بەدوای ناپلیۆن بکەون، سوپای فەرەنسا بەنویدا تێپەڕی وسێیەم ڕۆژی مانگی فبرایەر گەیشتە تروا، بەوەی ناپلیۆن توانیبووی بەرەنگاری هێزێك بێتەوە کەچوارئەوەندەی سوپاکەی ئەوبوون وبەجۆرێك درەخشان وگرنگبوو تەنانەت فەرەنسابیەکان خۆیان بەسەرکەوتوو هەژماردەکرد، بەلاّم هەتا ئەوکاتەش باروبۆخەکە هەر مەترسیداربوو، چونکە هێزی یاردەدانی سوپای ناپلیۆن بەکەمی وخاو خلیچی دەگەیشت، مارشال نی و ماکدونالدو برتیەو مارمون، لەو بروایەدابوون تاکە ڕێگا بۆ ڕزگاربوونی تەخت وتاراجی ئیمپراتۆری دانیشتن بوو لەسەر مێزی گفتوگۆو دانوستان، بۆیە کاتێ کۆنگرەی ئاشتی شاتیون شکستیهێنا ئەمانە بەتەواوەتی نائومێدبوون.

بەلاّم وزەی خۆئامادەکردنی ناپلیۆن بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی مەترسی لەزیادبوندابوو.

مارشالەکانی هەرلە سالّی (1812) بەدواوە، تێبینی لەش داهێزراوی وماندووبوونیان لەناپلیۆندا بەدی کردبوو، بەلاّم لەمانگەکانی فبرایەرو مارس شتێکیان لەئەودا هەست پێدەکرد کەباوەڕیان نەدەکردو وادەهاتە بەرچاو هەمان ژنرال بۆناپارتی گەنج وقارەمانی شەڕەکانی ئیتالیاو میسرە، وەك بڵێی باری قورسی پازدە سالّی شەڕو شۆڕی ئیمپراتۆریە بەرفوانەکەی خۆی لەسەرشان لاچوبێت، ڕۆحیەتی مارشال و ژنرالەکانی بەهێزدەکردو ئەو وەزیرانەی کەلەپاریسیشدا مابوونەوە هێوری دەکردنەوە. لە(10/ی فبرایەر)دا هێرشی کردەسەر لەشکری ئولسوفیف کەلە ئامپوبردا مابۆوە، لەماوەیەکی کەمدا ئەوی تێکشکاند، ڕوسەکان(1500) سەربازیان لێکوژرابوو (3) هەزار سەربازیش کەخودی فەرماندەکەشیان لەگەڵدابوو بەدیل گیرابوون وپاشماوەی ئەو لەشکرەش هەریەکەو بەلایەکدا هەلاّتبوون.

شەو ناپلیۆن بەئەفسەرەکانی خۆی گوت (ئەگەر وەك ئەمڕۆ سبەی ئاوا بەخت یاوەرمبێت لەماوەی (15) ڕۆژی تردا دوژمن دەرەتێنمەوە سەر کەنارەکانی ڕووباری ڕن ولەوێشەوە بۆ ویستول وئەوەندەی ڕێگا بەبەرەوە نییە).

سبەی سوپای ناپلیۆن لەشامپوبرەوە بەرەو مولفیرای کەوتەڕێ کەسوپای ڕوسیاو پروس داگیری کردبوو، شەڕی مونفیرای لە(11/ی فبرایەر)دا دەستی پێکرد بەسەرکەوتنێکی درەوشاوەی تری ناپلیۆن کۆتایی هات، لەو(20) هەزار سەربازەی دوژمن (8) هەزاریان کوژران و زیانەکانی سوپای فەرەنساش تەنها هەزار سەربازبوو.

هێزی هاوپەیمانان بەخێرایی لەمەیدانی شەڕ پاشەکشەیانکردو ناپلیۆن یەکسەرە هێرشی کردەسەر شاتوتیری کە(18) هەزار سەربازی ڕوسی و هەزار سەربازی پروسی لەوێدابوون.

دواتر ناپلیۆن لەوشەڕانەدا چەکمەسەربازییە کۆنەکانی سەردەمی شەڕی ئیتالیای دۆزیوەتەوەو لەپێی کردبوونەوە. ڕەخنەگرانی سەربازی شەڕی سالّی (1814)ی فەرەنسا بەیەکێك لەدرەخشانترین شەڕەکانی ناپلیۆن هەژماردەکەن، کەلەو شەڕانەدا لێزانی سەرکردایەتیکردن ونەخشەی سەربازی ناپلیۆن لەوپەڕی وریایی دابوو وگەیشتۆتە لوتکە، شەڕی شاتوتیری لە(12/ی فبرایەر)دا کرا، ئەمیش شاکارێکی گەورەبوو بەسەرکەتنی سوپای فەرەنسا کۆتایی هات، ئەگەر مانۆڕێکی هەڵەنەکراباو مارشال ماکدونالد کەمێ زووتر گەیشتبا ئەوا دوژمن لەو ناوچەیەدا بەتەواوەتی لەناودەچوو.

لە(13/ی فبرایەر)دا لەشکری بلوخر شکستی لەمارمون هێناو پاشەکشەی پێکرد، بەلاّم ناپلیۆن لەو ڕۆژەدا فریای مارمون کەوت و دووبارە لەڤۆشاندا بلوخری تێکشکاندەوەو ئەو ژنرالە پروسییە لەو شەڕەدا (9) هەزار سەربازی بەکوشتچوو.



ناپلیۆن هەندێك سوپای پارمەتیدانی پێکەیشتبوو وسەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنی دەبەدەستدەهێنا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخەکە زۆر دیژواربوو، چونکە هێزی هاوپەیمانان ژمارەیان زۆر لەسوپاکەی ئەو زیاتربوو.

ئەم سەرکەوتنانەی سوپای فەرەنسا بەجۆرێ ترس ولەرزی خستەدڵی هاوپەیمانان کەشوارتز نبرگی فەرماندەی گشتی هێزی هاوپەیمانانی ناچارکرد یەکێك لەفەرماندە پلەبەرزەکانی ستادی سوپای ناردەلای ناپلیۆن و داوای ئاگربەستی کاتی لێکردبوو. دوو شەڕیتر لەمومانس و ڤلنڤوردا بەسەرکەوتنی سوپای فەرەنسا کۆتاییهات، هاوپەیمانانی بەو دەستپێشخەرییە چاوەڕوان نەکراوە ناچارکرد، ناپلیۆن بەگفتوگۆکردن لەگەڵ باکنت پار نوێنەری شوارتزنبرگ ڕازیبوو ، بەلام ئەونامەیەی ژنرالیکی نەمساوی هێنابووی وەریگرت و وەلامدانەوەکەشی وەدرەنگ گێڕا.

ناپلیۆن لەنامەیەکیدا کەبۆ کولنکوری نووسیبوو ئاوا دەڵێ: (من سی تا چل هەزار سەربازی دوژمنم بەدیل گرتووە، هەروەها (2) هەزار تۆپ وژمارەیەکی زۆریش لەژنرالم بەدیلگرتوون، هەروەها دەڵێت: ناتوانم ئاشتی لەگەڵ دوژمندا بکەم مەگەر بەومەرجەی فەرەنسا سنووری جوگرافیای خۆی هەرلەکێوەکانی ئالپ و ڕووباری ڕن و پیرینەوە پارێزراوبێت، لەو نامەیەدا ئاماژەش بەوەدەکات پێشنیاری ئاگربەستیشی ڕەتکردۆتەوە).

لەڕۆژی(18/ی فبرایەر)دا شەڕێکی گەورەیتر لەمونترودا ڕوویداو هێزەکانی هاوپەیمانان لەوشەڕەدا (3) هەزار سەربازیان لێکوژران و(4) هەزار سەربازیشیان لێبەدیلگیراو پاشەکشەیانکرد.

بەڕایی چاودێران و ئەوانەی یاداشتەکانیان لەو سەردەمەدا نووسیوەتەوە، تەنانەت بەبۆچوونی دوژمنەکانیشی، ناپلیۆن لەشەڕەکانی ساڵی (1814)دا لەوەدەچێت کۆتایی بەبارگرانی دەروونی ونەهامەتی ودڵەڕاوکێکانی هێنابێت و بەشێوەیەکی نائاسایی توانای خۆی نیشاندابێت، بەلام ئەو ژمارەیەکی کەمی سەربازهەبوون، مارشالەکانی بەتایبەت ڤیکتور وئوژە هەتا ئەوپەڕی بێزاربیبوون، یەك لەدوای یەك هەڵەی سەربازیان دەکردن، ناپلیۆن ئەفسەرە بالاکانی خۆی سەرزەنشت دەکرد، جارێکیان ڕووی دەمی کردۆتە ئوژەرو گوتویەتی (ئوژەرو چ بەلگەیەکی لاواز دەهێنیتەوە، من (80) هەزار سەربازی دوژمنم بەیەکە سەربازییە تازەکانم لەناوبرد لەکاتێکا ئەم سەربازانەم پۆشاکیشنین... ئەگەر ئەو شەست ساڵ تەمەنەت بۆتە بارگرانی بۆ فەرماندەیی کردن دەست لەسەربازی بکێشەوە)

یەکێك لەژنرالەکانی ناپلیۆن لەیادداشتەکانیدا نووسیویەتی (ناپلیۆن هەرگیز نەیدەویست لەوەبگات ئەوانەی ژێر فەرمانی ئەو ناپلیۆن نین).

شوارتز نبرگ ستادێکی جەنگی دروستکردو پێشنیارێکی خستەپێش ئیمپراتۆری ڕوسیاو پاشای پروس و ئیمپراتۆری نەمسا، بەوەی بۆجارێکیتر داوای ئاگربەست لەناپلیۆن بکرێتەوە، هەروەها ئەوکارەش بەشازادە لیختنشتاین کەسەرۆکی یەکێ لەبەناوبانگترین بنەماڵەکانی پاشایەتی نەمسابوون بسپێردرێت و ناوبراو بۆئەو مەبەستە بنێردرێت بۆلای ناپلیۆن.

دیاربوو هاوپەیمانان تەواو سەغڵەت ببوون وهەندێك لەمانە حەزیاندەکرد هەرچی زوترە سازش لەگەڵ ناپلیۆندا بکرێت و ئاشتی بکرێت وکۆتایی بەشەڕبێت.



ناپلیۆن ڕازی بوو پێشوازی لەنێردراوەکەی هاوپەیمانان بکات، لیختنشتاینیش بەهێمنی و زەردەخەنەوە بەناپلیۆنی گوت دڵنیات دەکەمەوە هاوپەیمانان دەیانەوێت ئاشتی بەرکەماڵبێت وحەزیش ناکەن بنەماڵەی بوربنەکان بێتەوە سەرتەختی پاشایەتی فەرەنسا.

ئەم دانوسانەش هیچ ئاکامێکی نەبوو، ناپلیۆن کەلەوپەڕ لوتکەی سەرکەوتنەکانیدابوو وبەبۆچوونی خۆی نیوەی سوپای دوژمنی لەناوبردووەو زەبری گەورەی لەدوژمنانی داوە، زۆر بەخۆی دەنازی.

لەپاریسدا تالیران و هاودەستەکانی دەمێکبوو بەنهێنی پەیوەندی چالاك و زەمینەسازیان کردبوو بۆ گێڕانەوەی بوربنەکان، لەگەڵ هاوپەیمانانیدا ڕێککەوتنبوون. هاوپەیمانان تێڕوانینی خۆپارێزەرانەیان سەبارەت بەبوربنەکان هەبوو تەنانەت سەرسەختترینیان کەئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیابوو تەنها بەوە ڕازیبوو بنەماڵەی بوربنەکان هەربینە شانشینی ڕۆم بەمەرجێك ناپلیۆن دەستبکێشێتەوە، بەڵام ئێستا ئیتر باس لەدەست لەکارکشانەوەی ناپلیۆن ناکەن.

ئێمە دەزانین یەکێ لەکۆنە ئەشرافەکانی فەرنسی بەناوی بارون گوهری بەڕەگەز ترواییی، داواکاریەکی لەلایەن بوربنەکانەوە گەیاندۆتە تزاری ڕوسی، ئیمپراتۆریش لەوەڵامدا گوتویەتی هەتائێستاش هاوپەیمانان سەبارەت بەدانانەوەی بنەماڵەی بوربنییەکان لەسەر تەخت وتاراجی فەرەنسا لەجێگای ناپلیۆندا هیچ بڕیارێکیان نەداوە، هەروەها پێی گوتبوون دەست بۆ ئەو جۆرەکارانە مەبەن جارێ ، چەند ڕۆژێ دوای ئەمە کاتێ ناپلیۆن هاتەتروا- گوهر دەستگیرکراو لەدادگایەکی سەربازیدا فەرمانی لەسێدارەدانی دەرکراو گوللەبارانیانکرد.

دواتر ئەلکسەندەر زۆر سەری لەوەسوڕمابوو بۆ چ لەهیچ یەك لەگوندەکانی فەرنسادا گوندنشینەکان تامەزرۆ ودڵخۆشنین بەوەی لەژێر ستەم و زۆری ناپلیۆن ڕزگاریانبێت، بەپێچەوانەوە، لەولایەتەکانی وۆ لورن و ئۆرادا گوندنشینەکان شەڕیان کردووەو ڕق وکینەی خۆیان لەبەرامبەر هێزی هاوپەیمانان (داگیرکەر) دەربڕیوە،

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دڕندەیی وتاڵان و بڕۆی سەربازانی هاوپەیمانان دەیانکردو ترسی گوندنیشنە فەرەنسیەکانیش لەهاتنەوە سەرکاری شانشینی بوربنەکان، کەلەناو گالیسکەی دوژمناندابوون وبەرەو فەرەنسا دەهاتن بەنیازی گرتنەوە دەستی تەخت وتاراج بوو، ناپلیۆن زوو درکی بەمەکردو بۆ مارشالەکانی نووسی (پێویستە دووبارە چەکمەکان لەپێ بکاتەوەو نەخشەکانی ساڵی (1793) بگرێتەوەبەر).

لەگەڵ هەموو ئەمانەش کەهێزی هاوپەیمانان تێشکان لەدوای تێشکانیان بەخۆیانەوە دەبینی، بەڵام مەیدانی شەڕیان چۆڵنەکرد، چونکە بەرژەوەندی زۆر لەوشەڕەدا هەبوون، ئەم سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکانەی ناپلیۆن کەواچاوەڕواندەکرا سوپاکەی لەناوچووە هاوپەیمانانی بەوە ناچاردەکرد بیرلەوە بکەنەوە بۆچ ئەوپیاوە کەبەسەرکردەیەکی جیهانی دێتەبەرچاو لەسەر تەختی پاشایەتی بمێنێتەوەو جارێکیتر خۆی بەهێزبکاتەوەو لەماوەی دووسێ ساڵیتردا ئیترکەس ناتوانێت ڕوو بەڕووی بێتەوەو شەڕی ئەوبکات؟

لەسەرەتای مانگی مارسدا، ئیمپراتۆری فەرەنسا توانیبووی زیاترلە(75) هەزار سەرباز کۆبکاتەوەو ناپلیۆن (40) هەزار سەربازی بۆ ڕاوەدوونانی لەشکری شوارتزینرگ دانابوو کەلەحاڵەتی پاشەکشەکردندابوو وبۆخۆیی و (35) هەزار سەربازەکەی تریشی خەریکی بەدواکەوتن وتێکشکاندنی لەشکری بلوخر بوو، بلوخر بەهۆی ئەو هەڵەیەی کەحاکم سواسون کردبووی و



شاری بەدەستەوەدابوو، لەلەناوچوونی تەواو ڕزگاری ببوو، بەڵام بلوخر بەوەی کەوتبۆ داوی ناڕەزاییەوە نەیتوانیبوو خۆی لەوشەڕەی پێشی ببوێت، چونکە ناپلیۆن لە(7/ی مارس)دا گەیشتە سەری و توانی تێکیبشکێنێت، بلوخر دوای ئەوەی زیانێکی قورسی لێکەوت، ناچارچوو پەنای بردەبەر شاری لۆن وچەند ناپلیۆن هەوڵیدا نەیتوانی لەوێی بەدەربنێت، لەڕۆژانی(9و 10)ی مارسدا هێزەکەی بلوخر لەوشارەدا کەمێ پشوویدا.

لەناوەڕاستی مانگی مارسدا نوێنەری هاوپەیمانان پەیمانێکی تازەیان لەناوخۆیاندا مۆرکردو بەپێی ئەو پەیمانە بڕیاردرا دەبێ سنووری مەرزەکانی فەرەنسا بەپێی ڕێککەوتننامەی ساڵی (1792)بێت وهۆڵەنداو ئیتالیاو ئیسپانیاو سویسراو هەموو میرنشینەکانی ئەڵمانیا لەچنگ ناپلیۆن دەربهێندرێتەوەو هەتا ئەمە جێبەجێ نەکرێت دەست لەچەك وشەڕکردن هەڵنەگرن، هەروەها ڕوس و پروس و نەمساش دەبوا هەریەکەیان (150) هەزار سەربازیتر ئامادەبکەن و بریتانیاش پەیمانی دابوو مادام شەڕ درێژەی هەیە دەبێت هەموو ساڵێ (5) ملیۆن لیرەی ئسترلینی وەك یارمەتی بەهاوپەیمانان بدات.

هاوپەیمانان نەیاندەزانی تەنانەت پێشبینی ئەوەشیان نەدەکرد چۆن لەو باروبۆخەدا کەناپلیۆن لەسەرکەوتنی یەك لەدوای یەکی پرشنگداردایە باس لەسنوورە کۆنەکانی فەرەنسا بکرێت وناوبراو بەمە ڕازیدەبێت.

لەو ڕۆژانەی دوایدا مارشاڵەکانی سوپای مەزن یەك لەدوای یەك وردە تێشکانیان بەخۆیانەوە دەبینی، لەخۆرئاوادا [271] ڤلینگتن وسەربازەکانی بریتانیا، دوای ئەوەی لەشکری مارشال سوو مارشال سوشەیان پاشەکشە پێکردبوو، لەبەرەیەکی تریشدا شوارتز نبرکیش بەسەر لەشکرەکانی ماکدونالدو ئودینودا زاڵببوو وکەواندبوونیە پاشەکشەکردن.

ناپلیۆن دوای شەڕی لۆن، بێنەوەی پشووی کەمیش بەسوپاکەی بدات، هێرشی کردەسەر لەشکری کنت سن پری کەسەربازێکی ئاوارەی فەرەنسی بوو لەسوپای ڕوسیاو پروسدا خزمەتی دەکردو شاری ڕنسی داگیرکردبوو، شەڕی ڕنس بەتێکشکانی تەواوی لەشکرەکانی ڕوسیاو پروس لەو شارەداو کوژرانی سن پری کۆتایی هات.

بەڵام لەو ساتەوەختە بەدواوە هاوپەیمانان بڕیاریاندا ئیتر سازش لەگەڵ ناپلیۆندا نەکەن وناپلیۆنیش لەدەستدانی تەخت و تاراجی خۆی پێ باشتربوو لەگێڕانەوەی سنووری فەرەنسای نەخشەی پێشووی، هەرچەندە ئەم سەرکەوتنە تازانەش نەیاندەتوانی گۆڕانکاری لەباروبۆخەکەدا بکەن.

کاتێ کولنکور بەفەرمانی ناپلیۆن نێردرابوو بۆ دانووستانی شاتیون، بەنوێنەرانی ڕوسیاو پروس و نەمساو بریتانیای ڕاگەیاندبوو ئیمپراتۆری فەرەنسا دەست لەبستێکی خاکی ئیمپراتۆریەکەی هەڵناگرێت وبەوجۆرە دانووستانەکە کۆتایی هاتبوو، لە(17/ی مارسدا، کنت دۆتبرول، نێردراوی تالیران و لایەنگری بوربۆنەکان لەپشت بەرەکانی شەڕەوە لەپاریسەوە گەیشتە هۆردووی هاوپەیمانان و ڕاستەوخۆ چووەلای تزاری ڕوسیا.

ئەو نێردراوە پەیامێکی بۆ ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا هێنابوو کەبەڕای تالیران لەبری ئەوەی هاوپەیمانان خەریکی لێدانی هێزەکەی ناپلیۆنبن باشتروایە لەلایەکی ترەوە بەرەو پاریس بێن، هەروەها دڵنیای دەکردنەوە لەپاریسدا چاوەڕوانیانەو هەرکەئەوان گەیشتنە پاریس ڕووخانی حکومەتی ئیمپراتۆری فەرەنسا ڕادەگەیەنێت و ئەگەری هاتنەوەسەرکاری

---

[271] - لەخۆرئاوادا مەبەست لەبەرەی شەڕی ئیسپانیایە.(و- کوردی).



بوربنەکانیش دیتەوەناراو کنت دوپروڤوانس کەماوەیەکی دووردرێژە بەناوی لویسی هەژدەهەم لەچاوەڕوانیدایە، دێتەوەسەر تەخت وتاراجی پاشایەتی فەرەنسا.

بەڵام ڤیترول کەپەی بەوەدەبرد ئەلکسەندەر بەجددی دەیەوێت ناپلیۆن نەمێنێت، بەڵام بەهیچ جۆرێك بەباشی نەدەزانی هاوپەیمانان دەست لەکاروباری جێنشینی دوای ناپلیۆن وەربدەن، تەنانەت ئیمپراتۆری ڕوسیا بەرقەراربوونی کۆماری لەفەرنسادا بەباش دەزانی، بۆیە ناوبراو بەو هەڵوێستەی ئەلکسەندەر سەرسامبوو وواقی وڕما، بەجۆرێ نەیدەتوانی باوەڕبکات، دوای گفتوگۆکردن بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە لەبەرخۆیەوە گوتی (ئەی خوایە ئیشەکەی ئێمە چۆن وەرسوڕایەوە).
بەو بڕیارە معلومەی ئەلکسەندەر کەپێی وابوو ئەگەر هاوپەیمانان ڕژێمی پێشوو، واتە: شانشینی بنەماڵەی بوربنەکان بهێننەوە سەرتەختی پاشایەتی فەرنسا وردەوردە دوژمنەکانیان زیاددەبن، چونکە دەبوا گەلی فەرنسا سەرپشك نەکەن لەنێوان هەڵبژاردنی ناپلیۆنی هەیمشە سەرکەوتوو وبنەماڵەی بوربنەکان، بەڵکو دەبوا لەنێوان ناپلیۆن و کۆماریدا گەلی فەرنسا سەرپشکبکەن، ئەم بیرۆکە ژیرانەیە لەمێشکی ڤیترولدابوو کەکەسێکی پەناهندەبوو لەناو دەرباری ڕوسیادا دەژیاو حەزی دەکرد تزار لایەنگری هێشتنەوەی فەرەنسا بەکۆماری بکات، هەرچەندە تزار بڕوای وابوو کەسانی وەك بنەماڵەی بوربنەکان و ڤیترولەکان هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆ لەسەر ڕای گشتی گەلی فەرنسا جێنامێڵن وتێناگەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی ئەو سەرنجەی تالیرانی کرد کەبەڕێگای ڤیترول بۆی ناردبوو، چونکە ڤیترول جگەلەپەیامەکەشی نووسراوێکی بێ ئیمزاشی لەلایەن تالیرانەوە هێنابوو کەبەئەنقەست بەدەستوخەتێکی زۆر ناشیرین نووسرابوو وتالیران بەم کارەی گیانی خۆی خستبۆ مەترسییەوە، چونکە ئەگەری ئەوەهەبوو ڤیترول لەلایەن پۆلیسەکانی ناپلیۆنەوە دەستگیربکرێت و بەهۆی ناشیرینی ئەو نووسراوەش پەی بەوکەسە ببەن کەنووسیویەتی، لەو نامەیەدا تالیران پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو هاوپەیمانان ڕاستەوخۆ هێرشبکەنەسەر پاریس وناپلیۆن کەهەتا ئەوکاتەش تێکنەشکابوو لەبەرەی شەڕدا پشتگوێ بخەن وخافڵگیری بکەن. خائن وترسنۆکێکی وەك تالیران کەسێکبوو گیانی خۆی بخاتەمەترسییەوە، ئەو ئاگای لەو بێسەروبەرەیی و ناڕێکیەی کەلەپاریس ولەناو سوپاو حکومەتدا هەبوو تەواو زانیاری هەبوو ودەیزانی.

لە(20/ی مارس)دا شەڕی ئارسی سوراوب لەنێوان ناپلیۆن وهاوپەیمانان بەفەرماندەیی شوارتز نبرگ ڕوویدا، لەوکاتەدا ناپلیۆن (30) هەزار سەربازی بەدەستەوەبوو، شوارتز نبرگیش سەرەتا (40) هەزار سەربازی ڕەوانەی مەیدانی شەڕکردو هەتا کۆتایی شەڕەکە ژمارەی سەربازەکانی زیادکرد، هەتا گەیاندیە(90) هەزار سەرباز.

هەرچەندە ناپلیۆن بەتەمای سەرکەوتن بوو لەڕاستیدا لەچەند بەرەیەکی شەڕدا سوپای دوژمنی تێکشکاندو پاشەکشەی پیکردن، بەڵام هەتا ئەوساتەوەختەش ئەنجامی شەڕەکە مەعلوم نەبوو، ناپلیۆن دوای شوارتز نبرگ نەکەت کەکەوتبۆ پاشەکشە، بەڵکو فەرمانیدا هەموو پردەکانی سەر ڕووبارنی ئوب بتەقێننەوە، لەم شەڕەدا (3) هەزار سەربازی فەرەنساو (9) هەزار سەربازی هاوپەیمانان بەکوشت چوون، بەڵام ئەمجارەشیان ناپلیۆن نەیتوانی سوپای دوژمن تەواو تێکبشکێنێت، هاوپەیمانان سەریان لەسەرهەڵدانی شەڕێکی میللی دژ بەئەوان سوڕمابوو کەزیاتر لەڕاپەڕینەکانی شۆڕشی کۆماری دەچوو دژی بنەماڵەی پاشایەتی بوربنەکان..



هەرکاتێ ڕوسیاو فردریك ویلهلم و فرانسواو شوارتزنبرگ و مترنیخ، ئەو گفتوگۆیەی نێوان ژنرال سباستیان و ناپلیۆنیان بیست، دڵیان ئاسودەدەبوو وناهێکیان پێدادەهاتەوە، ناپلیۆن لەناوبراوی پرسیبوو (باشە، ژنرال ڕاتچیە لەبەرامبەر ئەم هەلومەرجەی ئەمڕۆدا ؟) لەوەڵامدا گوتبووی بەڕێز بێگومان سەرچاوەو شتی ترمان لەدەستدایە کەئێمە ئاگامان لەبوونی ئەمانە نییە.

ناپلیۆن گوتبووی: کەرەستەی تری من هەرئەوەیە کەدەبیبینی من هیچ ڕەوشێکیترم لەبەردەستدانییە هەتا بیگرمە بەر.

ژنرال سباستیان لەوەڵامدا گوتبووی: ئەی بۆچی بەڕێزتان بیرلەهەڵسان و هاندانی میللەت ناکەنەوە دژی سوپای بێگانە؟

ناپلیۆن لەوەڵامدا گوتبووی: ئەمە سەودایەکی کرچ و کاڵە کەیادداشتەکانی شۆڕشی فەرنساو شەڕەکانی ئیسپانیایە وەبیرت هاتوونەوە، هەڵسان وبەرەنگاری کردنی میللەتێك کەسەرەتا نەجیبزادەو ڕۆحانییەکانی لەناوبردوو دواتر من خۆم ئەو شۆڕشەم لەناوبرد... ؟).

ناپلیۆن هەلومەرجەکەی بەڕوونی دەبینی، ئەو کە بەوپەڕی توندی هەموو یادگاری و ئادگارێکی شۆڕشی لەبەین بردبوو هەتا بچوکترین ئەندێشەی شۆڕشی نەهێشتبوو ئیتر ئێستا ناتوانێت، ئەگەر حەزیشبکات داوای یارمەتی لەوجۆرەبکات و بەدەستیەوەبێت.

ئەم گفتوگۆیەی ناپلیۆن لەگەڵ ژنرال سبارستیاندا سێ ڕۆژ دوای گفتوگۆکەی نێوان ڤیترول وتزاری ڕوسیابوو.

ئیمپراتۆری فەرەنسا ڕاپەڕینی میللەتی فەرەنسای وەك شۆڕشی ساڵی (1792) بەشتێکی بێ بنەماو خەیاڵی دەزانی و ئیمپراتۆری ڕوسیاش کەدوژمنی سەرسەختی ئەوبوو دەیویست بەپارێزگاری کردنی لەکۆماری هەموو ڕێگایەك لەناپلیۆن بگرێت وبەهەرجۆرە پشتبەستنێکی بەگەلی فەرەنسا بەدگومان ونائومێد بکات.

(3)

دوای شەڕی ئارسی سوراوب، ناپلیۆن هەوڵیدا خۆی بگەیەنێتە هێڵی پشتەوەی دوژمن و پەیوەندی نێوان پێشەوەی سوپای هاوپەیمانان و ڕێگای پاریدەدانیان بپچڕێت، بەڵام هاوپەیمانان دوابڕیاریاندابوو بەرەو پاریسش بکەونە پێشڕەوی، بەونامانەی ماری لویز وساواری وەزیری ناوخۆ بۆ ناپلیۆنیان ناردبوو کەوتبۆ دەست کازاخیەکان وگەیاندرابۆ تزاری ڕوسیا، ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا لەوەدڵنیابوو ورەی خەڵکی پاریس بەجۆرێکە چاوەڕوانی هیچ جۆرە بەرەنگاریەکی لێناکرێت وبەگەیشتنی سوپای هاوپەیمانان بۆ پاریس سەرئەنجامی شەڕ مەعلومدەبێت و ڕووخانی حەتمی ناپلیۆن دێتەئارا.

هاوپەیمانان ئەم بۆچوونەیان لەژێر کاریگەری ئامۆژگاری پیاوێك بەناوی پۆزو دی بورکو قبولکرد کەخەڵکی کرس بوو وماوەیەکی زۆر بوو کینەی لەدڵی خۆی گرتبوو ڕقی لەناپلیۆن دەبۆوە، بۆیەش ئەلکسەندەر ناوبراوی کردبۆ یەکێك لەوکەسانەی کەلێی نزیکبوون. هەواڵی ئەوەش بەهۆردووی هاوپەیمانان گەیشت ناپلیۆن دەیەوێت پشتەوەی سوپای هاوپەیمانان بگرێت، پۆزو دی بورکو بەئەوانی گوت: یەکلایکەرەوەی شەڕ لەپاریسدایە، مادام ئێوە بیرلەوە دەکەنەوە ڕووبەڕووی ناپلیۆن ببنەوەو شەڕبکەن ئەوا شکستدەهێنن، چونکە ناپلیۆن لەئێوە باشتر دەجەنگێت، سەربازەکانی ئەو هەرچەندە ناڕازیشن بەڵام بەهۆی ئەنگێزەی شانازی کردنەوە هەتا دوا دڵۆپەی خوێنیان شەڕدەکەن، هێزی سەربازی ناپلیۆن



تاوەکو ئێستاش خاوەن توانایە، هەروەها کازامەیی ولێزانی سەرکردایەتیکردنی سوپای ناپلیۆن لەهی ئێوە باشترە، بەلام هێزی سیاسی ئەو تەواو لەبەریەکچووە، ئەمڕۆ ڕۆژگار گۆڕاوە، سەرکوتکردنی سەربازی کەلەبەرەبەیانی ڕۆژی شۆڕشەوە وەك یەك نعمەتی خوایی پێشوازی لێدەکرا، دواتر بەهۆی ئەو ئاکامە خراپانەی لێی کەوتەوە، مەحکوم بەنەمانەو هیچ شوێنێکی لەناو دڵ و مێشکی خەلکدانەماوە... پێویستە ئەوشەڕە لەڕێگای سیاسییەوە کۆتایی پێبهێندرێت نەك لەڕێگای سەربازییەوە، هەرئەوەندە سوپای سوپای فەرەنسا کەلێنی تێکەوت، ئەگەر ئێوە بتوانن لەوکاتەدا ئەو هەلە بقۆزنەوەو خۆتان بگەیەننە پاریس ئەمەش بەسە بۆ سەرنگونکردنی دێوەکەو[272] لەو حالەتەدا ئەو شمشێرەی ناتوانرێت لێی بستێندرێت دەشکێت)

پوزو دی بورکو، دڵنیابوو لەوەی میللەت بۆربنەکانی بیرچۆتەوەو ئەم رایەی خۆشی بەسەرانی هاوپەیمانان گوتبوو، هەرچەندە ئەوانیش گەیشتبوونە ئەو بروایەو پێیانوابوو دوای رووخانی ناپلیۆن گێڕانەوەی شانشینی بوربنەکان شتێکی نەگونجاوە، هەروەها ئەلکسەندەر پێی باشنەبوو تەنانەت کۆماریش نەمێنێت وبەمە دەیتوانی بۆ هەمیشە خۆی لەشەڕی ناپلیۆن ڕزگاربکات.

هاوپەیمانان بڕیاریاندا خۆیان بخەنە مەترسییەوەو بەکەلك وەرگرتن لەدووری ناپلیۆن لەپاریس، هێرش بکەنەسەر پایتەختی فەرەنساو داگیریبکەن، هەروەها کەلکیش لەخیانەتکردنی هەندێك کاربەدەستی حکومی وەربگرن کەئامادەبوون پێش هاتنەوەی ناپلیۆن پاریس بەدەستەوەبدەن، لەسەر ڕێگای پاریس تەنها مارشال مارمون و مارشال مورتیەو ژنرال پاکتودو ژنرال ئامە بەرگریان دەکرد، کەکۆی گشتی هێزەکەیان پێکهاتبوو لە(25) هەزار سەرباز، ناپلیۆنیش بەهێزە سەرەکییەکەیەوە بەرەو خۆرهەلات چووبوو.

هێزی هاوپەیمانان لە(25/ی مارس)دا لەشوێنێك بەناوی لافرشامپنوار سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، هەردوو لەشکری مارشالەکانیان پاشەکشە پێکردوو هێزی هاپەیمانان کەپێکهاتبوو لە(100) هەزار سەرباز لەپاریس نزیکبوونەوە،

لە(29/ی مانگی مارسدا ماری لویز لەگەڵ کوڕەکەیدا پاریسی جێهێشت وچوو بۆ بلو.

فەرنسییەکان بۆ بەرگریکردن لەپاریس تەنها (40) هەزار کەسیان لەدەستدابوو، ترس و لەرز باڵی بەسەر پاریسدا کێشاو ورەی یەکە سەربازییەکان تەواو دابەزیبوو، ئەلکسەندەر دەیویست دەست لەخوێنرێژی خەڵکی پاریس بپارێزێت و بەڕوکەش خۆی بەجوامێرنیشاندەدا، لەقسەکانیدا کەلەگەڵ مسیو ئورلفدا دەیکرد، گوتی (ئەگەر پاریس بێبەشبکرێت لەپێشەواو مەزنەکانی خۆی خۆی ڕاناگرێت و من باوەڕی تەواوم بەمەهەیە) هەروەها دەسەلاتی تەواوی بەئەوداو گوتی ئەگەر دەزانی پاریس بێ شەڕکردن خۆی دەدات بەدەستە، ئەوا بێ وەدەنگخستن ئەوکارە بکات و شەڕ ڕابگرێت.

بۆچەند سەعاتێك شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا کەلەوشەڕەدا هاوپەیمانان (9) هەزار سەربازیان بەکوشتچوون کە (6) هەزاریان سەربازی ڕوسی بوون، بەلام سەرئەنجام مارشال مارمون لەلایەك لەترسی تێکشکان ولەلایەکیش بەهۆی چوونەبن کلێشەی تالیران، مارشال مارمون کاتژمێر (5)ی ئێوارە خۆیدا بەدەستەوە، کاتێ ناپلیۆن ئەم هەواڵەی پێگەیشت ئەو لەنێوان سن دیزیەو بارسوراویدا خەریکی شەڕکردن بوو.

---

[272] - دێوەکە:مەبەست لەناپلیۆنە،(و -کوردی).



کەلە(27/ی مارس)دا ئەم هەواڵەیان پێڕاگەیاند گوتی ( ئەمە یەکەم جوڵەی شەترەنجی زۆر جوانەو هەرگیز پێموانەبوو فەرماندەی گشتی هاوپەیمانان ئاواجوان یاری بکات).

ئەمە ئەوەدەگەیەنێت لەسەرکردایەتی کردنی سوپادا کارایە.

ناپلیۆن بەخۆیی وسوپاکەیەوە بەرەو پاریس کەوتەڕێ، لەشەوی(30/ی مارس)دا گەیشتە فونتن بلو وپێیان ڕاگەیاند پاریس داگیرکراوە، ناپلیۆن وەك هەمیشە چوست وچالاك بوو وەرکە ئەم هەواڵەی بیست چارەگە سەعاتێك بێدەەنگ ومات کەوتە بیرو خەیاڵ و دواتر نەخشە تازەکەی خۆی بەکولنکور و مارشالەکانی گوت. بڕیاردرا کولنکور بچێت بۆ پاریس ولەوێدا داوای ئاشتی بکات بەپێی ئەو مەرجانەی کەلەشاتیوندا پێشنیارکرابوون و دواتر بەهێنانەوەی بڕوبەهانەی جۆرلو جۆر بۆماوەی سێ ڕۆژ لەهاموشۆی نێوان پاریس وفونتن بلودابێت، هەتا لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا ناپلیۆن هەموو هێزەکانی لەناوچەی سن دیزیەدا کۆبکاتەوەو دواتر هاوپەیمانان لەپاریس دەرپەڕێنن.

کولنکور بەمینگێکەوە پرسی، ئایا ناکرێت یەك پێشنیاری ئاشتی کردنی دوور لەتەکتیکی سەربازی لەگەڵ هاوپەیمانانـدا بخرێتەڕوو؟

ئیمپراتۆری فەرەنسا قسەکەی پێبڕی و بەدەنگێکی کەمێ بەرزو گۆڕاو گوتی: نا، نا، ئیدی نەنگی بەسە! من ئاشتی شەرمەزاری بکەرم ؟ قبوڵنییە! لێرەدا شەرەف و شکۆمەندی فەرەنسا لەئارادایەو تەنها شمشێر دەتوانێت ئەمە ڕۆشن و یەکلایی بکاتەوە.

کولنکور یەکسەرە بەرەو پاریس کەوتەڕێ و ناپلیۆن کەوتەوە هەوڵو کۆششی سازکردنی سوپا بۆشەڕو لەوبڕوایەدابوو بۆ سێ چوار ڕۆژێتر تەواو کاروبارەکانی سوپا ڕێکبخاتەوەو سوپاکەی باخاتە حاڵەتی ئامادەباشی.

ئەەی بەلای ناپلیۆنەوە گرنگبوو ئەوەبوو لەوماوەی سێ چوار ڕۆژەدا هاوپەیمانان دەستپێشخەری سیاسی نەکەن و ئەمە ببێتەهۆی لەقکردن وگومان دروستکردن لەڕای گشتیداو ببێتەجێگای سەرنجی دانیشتوانی پاریس، بۆیە بەڕووکەش بەمەرجی ئەو ئاشتییە ڕازیبووکە دووهەفتە لەمەوبەر بەنەنگی دەزانی و قبوڵی نەکردبوو.

بەڵام تازە لەکار ترازابوو، لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی بەخۆشی وشادییەوە پێشوازی سەرانی هاوپەیمانانیان کردبوو خەڵکیش بەبێ بەرگری ودەستەوەستان وملکەچ مابونەوەو بەڕواڵەت بەدیاردەکەوت خەڵك بەهەموو حکومەتێك ڕازیبێت کەلەلایەن هاوپەیمانانەوە بەسەریاندا بسەپێندرێت.

سەرانی ولاتە هاوپەیمانەکان ڕایانگەیاند نایانەوێت ئاشتی لەگەڵ ناپلیۆندا بکەن، بەڵکو ئەوان ئەوحکومەتە بەڕەسمی دەناسن کەگەلی فەرنسا بۆخۆیان هەڵی بژێرن، بۆیە گفتوگۆکردنی ئاشتی کولنکور لەگەڵ هاوپەیمانانـدا وەلانراو ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیا بەکولنکوری گوت: فەرەنسا ناپلیۆنی ناوێت وبەدەستیەوە شەکەت وماندوو بووە.

شوارتزنبرگ بەدەنگێکی ناساز گوتی: ناپلیۆن ماوەی(18) ساڵە دنیای شێواندووەو بەبوونی ئەو کەس اتوانێت بەجلو بەرگەکانی [٢٧٣] خۆیدا بڕوانێت و بیانبینێت.

---

[273] - دیارە لەزمانی کوردیدا لەبری ئەو ڕستەیە، دەکوترێت کەس بواری ئەوەی نیە دەست بەخۆیدا بێنێتەوەو وەخۆی ڕابکات- یان کردویەتی بەشێرەبەدۆ(و- کوردی).



ئێمە چەند جارێك پێشنیاری ئاشتیمان بۆکردو ئیمپراتۆریەکەیشمان لەدەستدا هێشتەوە، بەڵام ئەو نەیویست هیچ ئیمتیازێك بدات، ولێ ئێستا زۆر وەدرەنگ گەڕاوە بۆ ئەو مەبەستە، شوارتز نبرگ ئەو قسانەی دەکردو بێئاگابوو لەوەی ناپلیۆن تاوەکو ئێستاش نایەوێت بەجددی ئاشتی بکات وکولنکوریشی تەنها بۆئەوە ناردووە هەتا دووسێ ڕۆژ بواری ئەوەی دەبێت سوپاکەی کۆبکاتەوە،

کەکولنکور گەڕایەوە لای ناپلیۆن بینی بارودۆخەکە بەم جۆرەی خوارەوەی لێهاتووە: یەکە سەربازییەکان وردەوردە دەگەیشتنەوە ناپلیۆن وناوبراو لەچاوەڕوانی ئەوەدابوو هەتا(5/ی مانگی ئیبریل (70) هەزار سەرباز کۆبکاتەوەو هێرشیان پێبکاتەسەر پاریس.

لەڕۆژی(4/ی ئیبریل)دا ناپلیۆن بەسەر سەربازەکانیدا گەڕاو لەگوتەیەکیدا بۆ سەربازەکانی بەم جۆرە دوا (سەربازان، دوژمن بەخافڵاندمان توانیویەتی پاریس بخاتەژێر دەسەلاتی خۆیەوەو داگیری بکات، پێویستە دوژمن لەپاریس وەدەرنێین، فەرەنسییە تۆکەرو پەناهندەکان کەئێمە لەمەوبەر بەزەیمان پێدادەهاتنەوە لەگەڵ دوژمناندا کلکیان تێکبەستووەو بەرژەوەندی هاوپەیمانیان لەگەڵ بریتانیادا پەیداکردوەو پەرچەمی سپیان هەڵداوە، تف لەو ترسنۆکانە، ئەوانە دەبێ باجی ئەو خیانەتەی خۆیانبدەن، وەرن باسوێندبخۆین بەوەی- یان سەربکەوین وتۆڵەی ئەو سوکایەتییە بکەینەوە کەبەنیشتمانەکەمان و شمشێرەکەمان کراوە-یان بمرین.

سەربازەکان هەموویان بەیەك دەنگ هاواریانکرد (ئێمە سوێند دەخۆین)

بەڵام کاتێ ناپلیۆن گەڕایەوە خێمەکەی خۆی ورەیەکی دابەزیوی سەیری بینی (مارشالەکان واتە ئودینو و نی و ماکدونالدو برتیەو دوك دو باسانو، بەڕاوەستاوی لەچاوەڕوانی ئەودابوون و ناپلیۆن هاتە نزیکیان و کەس نەوێرا نوقەبکات، پاش کەمێ ناپلیۆن داوای لێکردن ڕای خۆیان دەربڕن ئینجا هەموو کەوتنە قسەو گوتیان ئومێدی سەکەوتن نییە، چونکە هەموو خەڵکی پاریس لەوە زەندەقیانچووە ئیمپراتۆر [274] لەخۆئامادەکردنی بۆ هێرشکردنەسەر هاوپەیمانان لەپاریسدا هەموو هاوڵاتیانی پایتەخت تێدابچن، ئەمەش بەهۆی ئەوەی هاوپەیمانان لەتۆڵەی سوتاندنی مۆسکۆدا ئاگر لەپاریس بەربدەن.

ناپلیۆن گوتی(بڕۆنەدەرێ، من دواتر بانگتان دەکەمەوەو نەخشەکەی خۆمتان پێدەڵێم) تەنها کولنکورو برتیەو دوك دو باسانوی لای خۆی هێشتنەوە، ئینجا بەتوڕەییەوە نارەزایی لەسستی و بێ ئەمەکی مارشالەکانی دەربڕی وپاش ماوەیەك ناپلیۆن ڕایگەیاندکە لەبەرژەوەندی پاشای بچوك [275] ئەو دەست لەکار دەکێشێتەوەو فەرمانڕەوایی پاشایەتی دەداتە دەست ئیمپراتریس ماری لویز [276] ئەگەر هاوپەیمانان بەم مەرجە ڕازیبن ئەوا شەڕ کۆتایدێت، ناپلیۆن کولنکوری بەومەرجە ڕەوانەی پاریس کردەوە، هەتا جارێکیتر بکەوێتەوە گفتوگۆ لەگەڵ هاوپەیمانانندا، ئینجا بۆخۆی ئەو ڕاگەیاندنەی کەخۆی نووسیبووی وبەمجۆرەی خوارەوەبوو خوێندەوە،(چونکە هاوپەیمانان دەڵێن ناپلیۆن گرفتە لەبەردەم ئاشتی لەئەورووپادا، ئێستا ئیمپراتۆر ناپلیۆن کەلەسەر بەڵێنی خۆیەتی ڕایدەگەیەنێت ئامادەیە لەبەرخاتری ئاشتی و نیشتمانەکەی خۆی

[274] مەبەستیان لەخۆیەتی کەقسەی بۆ دەکەن، واتە: ناپلیۆن،(و-کوردی).

[275] - مەبەست لەکوڕی ناپلیۆنە،(و-کوردی).

[276] - هاوسەرەکەی ناپلیۆنە،(و-کوردی).



بۆکوڕەکەی وهاوسەرەکەی تەختی پاشایەتی فەرنسا چۆڵبکات وفەرەنساش جێبهێڵێت وهەتا دەست لەگیانی خۆشی بشوات، مارشالەکان بەخرۆشەوە پشتگیری ئەمەیانکرد، دوای ئەوەی ئیمپراتۆر جارێکیتر ئەو قەباڵەی خوێندەوە قەڵەمەکەی بەدەستەوە گرت وپێشنەوەی ئیمزای بکات گوتی (ئێی، ئاه، باوەڕم پێبکەن، وەرن باسبەینێ زوو وەڕێ بکەوین، من دەزانم دووبارە ئەوان، هاپەیمانان تێکدەشکێنمەوە) وەلێ مارشالەکان بێدەنگیان هەڵبژاردو هیچیان لایەنگری ئەم قسەیان نەکرد.

ناپلیۆن نامەکەی ئیمزاکردو دایەدەست لیژنەیەك کەپێکهاتبوون لەکولنکورو نی و ماکدونالدو ئەوانەش بەزوویی بەرەو پاریس کوتنەڕێ، لەو ماوەیەدا زۆرشت لەپاریسدا ڕوویدابوو، تالیران بەپەلەهەندێك لەئەندام پەرلەمانەکانی کەپێشتر جێگای تمانەی بوون کۆکردبۆوەو ڕووخانی بنەماڵەی بۆناپارت وگەڕانەوەی بنەماڵەی بوربنەکانی خستبۆ دەنگدانەوەو ئەمەی بەناوی پەرلەمانەوە ڕاگەیاندبوو، لەمەش خراپتر مارمونیش خیانەتی لەناپلیۆن کردبوو ولەگەڵ یەکە سەربازییەکانی خۆیدا بەرەو فرسای پاشەکشەی کردبوو وپەیوەندی بەتالیران کەسەرۆکایەتی حکومەتی کاتی دەکرد کردبوو.

سەرەتا تزاری ڕوسی دوو دڵبوو ودواتر نەئەو ونەفرانسوای ئیمپراتۆری نەمسا لاریان لەهاتنەسەر تەختی پاشایەتی پاشای بچوك واتە: کوڕی ناپلیۆن نەبوو، بەڵام لایەنگرانی بنەماڵەی بوربنەکان کەلەچواردەوری سەرانی هاوپەیماناندابوون سووربوون لەسەر ئەوی ئەو پێشنیارەی ناپلیۆن ڕەتبکرێتەوە.

کەوتنەگومانی هاوپەیمانان بەبیستنی خیانتکردنەکەی مارمون ئەمەی یەکلاکردەوە، پەیمانشکێن زۆرینەی هێزی سەربازی فەرەنسای لەژێر فەرماندەیی مارموندا بوو و ئەمە بووەهۆی ئەوەی ڕێگربێت لەبەردەم ئەوەی ناپلیۆن هێرشبکاتەسەر پاریس–یان ئەو مەترسییەی کەمترکردەوە، بۆیە هاوپەیمانان بڕیاریاندا دەسەلات بدەنەوە دەست بنەماڵەی شانشینی پێشوو، واتە: بۆربنەکان، لەوکاتەی کولنکور دەیویست لەلای ئەلکسەندەری ڕوسیا بڕوات، ناوبراو پێی گوت (گەورەکەی خۆت ڕازیبکە بەوەی تەسلیمی چارەنووسی خۆیبێت، ئینجا ڕێزو ستایشی خۆی لەبەرامبەر ئەوپیاوە گەورەیەدا نیشاندلو درێژەی بەقسەکەی داو گوتی: ئەوەی پێویستبێت بۆ پاراستنی شەرەف وکەسایەتی ئەو دەیکەین)

سەرانی هاوپەیمانان پێشنەوەی کولنکور بڕوات تکایان لێکرد ناپلیۆن بەوە ڕازیبکات بەبێ هیچ مەرجێك دەست لەپاشایەتی بکێشێتەوەو بەڵێنیاندا هەموو نازناو وشکۆمەندی ئەو بپارێزن و دورگەی ئەلبیش وەك شانشینی بەئەوی ببەخشن و داوایانلێکرد هەرچی زووترە سەنەدی دەست لەکار کشانەوەکەی ئیمزابکات.

هاوپەیمانان و لایەنگرانی شانشینی بوربنەکان ولەسەروی هەموشیانەوە تالیران بوو، چونکە تالیران بەئاشکرا کەوتبۆ گەل ئەوان لەسەرهەڵدانی شەڕێکی ناوخۆش دەترسان، ئەو سەربازانەی کەهەتا ئەوکاتەش بەئەمەکبوون لەبەرامبەر ناپلیۆندلو خۆشیان دەویست و ڕاگەیاندنی دەستلەکارکێشانەوەی ناپلیۆن بەڕەسمی دەیتوانی لەئەگەری ئەوشەڕە بیانپارێزێت.

ئەو بڕیارەی پەرلەمان دەنگی بۆدابوو لای خەڵك هیچ بەهایەکی نەبوو، چونکە ئەندام پەرلەمانەکان وەك نۆکەری ناپلیۆن سەیردەکران وبەبێ هیچ دوودڵی و بێ شەرمانە خیانەتیان بەگەورەکەی خۆیانکرد، هەتا خزمەتی بێگانەبکەن. مارشال نی لەوکاتەی کەقسەی لەگەڵ ئەلکسەندەردا کردبوو، بەدەنگێکی بەرز گوتبووی (ئەم ئەندام پەرلەمانە قوڕبەسەرانە ئەگەر یەك تۆز دژی هەوەسی شەڕانگێزی ناپلیۆن بووبانەوەو ناکۆکی خۆیان نیشاندابا ئەوا ئێمە ئەمڕۆ توشی ئەم نەهامەتییە



نەدەبوینەوە، ئەم ئەندام پەرلەمانە بەدبەختانە کەهەمیشە سوربوون لەسەر ئەوەی ملکەچی ئیرادەی کەسێکبن کەئەمڕۆ پێی دەڵێن سەرکوتکەر، مافی ئەوەیاننییە چۆن دەنگی خۆیان بەرز دەکەنەوە؟

ئەوانە ئەو کاتانەی دەبوا قسەبکەن لەرزو تایان گرتبوو، بەڵام ئێستا هەموو لایەك پێیان دەڵێن بێدەنگبن چۆن ڕێگا بەخۆیان دەدەن قسەبکەن ؟)

تەنها بەدەرچوونی یەك وشە لەدەمی ناپلیۆنەوە ئەویش بەبەڵێ، دەیتوانی کۆتایی بەو باروِدۆخە دیژوارە بێنێت و ئەوکۆتەی کەسەربازو ئەفسەرو کارمەندەکان وەك پەیمان لەگەردنیاندابوو ئازادبکات. هەموو فەرنسییەکان و خودی هاوپەیمانانیش سەبارەت بەمە ڕایانوابوو.

## (4)

ئێوارەی ڕۆژی(5/ی ئیبریل) کولنکورو نی و ملکدونالد لەپاریسەوە گەڕانەوە بۆ فونتن بلو ودوای ئەوی باسی گفتوگۆی دانووستانەکەیان بۆ ناپلیۆن گێڕایەوە کەوتنە پاڕانەوە لەناوبراو کەبەمە ڕازیبێت، ناپلیۆن گوتی: ئێستاش سەربازم لەدەستدان و ئەوانە بەئەمەکن لەئاست مندا، لەکۆتایی قسەکەیدا گوتی: هەرچۆنێکبێت سبەی دەیبینن... بەئومێدی دیدار هەتا بەیانی.

دوای ئەوەی ئەوانە لەلای ڕۆیشتن دووبارە بەدوای کولنکوردیدا ناردەوەو کەوتە قسەکردن لەگەڵیدا، پاش دەمەتەقێیەکی دوور ودرێژ ناپلیۆن گوتی (ئای کولنکور، ئاخ، لەدەست ئەوجۆرە مرۆڤانە... مارشالەکانی من شەرم دەکەن ڕێگای مارشال مارمون بگرنەبەر، چونکە دوارِۆژ بەترسنۆك وخائین باس دەکرێن، بەڵام لەناو دڵی خۆیاندا دەڵێن بۆ ڕێگاماندا ئەوهاوڕێیەمان بکەوێتە نازو نعمەت ودەسەڵاتەوە، حەزدەکەن وەك ئەو بێ ئەوەی کەسایەتیان لکەداربێت بکەونەگەل دەوڵەتی شانشینی بوربنەکان وهەمان پلەوپایەو ئیمتیازیان هەبێت.

ناپلیۆن زۆر باسی مارمونی دەکرد کەلەباروِدۆخێکی زۆر ناسکدا خیانەتی لەگەڵداکردبوو (بەدبەختە نازانێت چ چارەنووسێك لەچاوەڕوانیدایە، ئەو بەدناوبوو، باوەڕدەکەی ئیتر من بیرلەخۆم ناکەمەوە، چونکە ڕۆژگاری من بەسەرچوو-یان لەبەرەسەرچوندایە، لەلایەکی ترەوە ئەوانەی لەدەست دەسەڵاتداریەتی من بێزارن چەند شادمانن و تامەزرۆن خۆیان بخەنە بەردامێی کەسانیتر؟ من بیر لەفەرەنسا دەکەمەوە.. ، ئای ئەگەر ئەو گەمژانە ئێمەیان جێنەهێشتا، من لەماوەی چوار سەعاتدا کۆشکی مەزنی خۆم دروستدەکردەوە، چونکە باوەڕبکە هاوپەیمانان لەکاتی ڕوو بەڕووبونەوە لەگەڵ مندا تێکدەشکانەوەو خۆیان لەپاریسدا ڕاندەگرت، ئەگەر ویستباشیان بۆ ڕزگاربوونیان لەم مەترسییە لەپاریس هەڵاتبان ئەوا ئیتر جارێکیتر نەدەهاتنەوە سەرخاکی پاریس.

ئەو مارمونە خاك بەسەرە بووەبەربەست هەتا ئێمە بگەینە ئەو ئامانجە درەخشانە، بەدڵنیاییەوە کەشەڕەکە درێژەی کێشابا ئەوا کەرەستەی وامان دەستدەکەوت زەبری کوشندە لەدوژمن بدات، ئێستا من هەواڵی ئەوەیان پێگەیاندووم کەلەهەموو شوێنەکاندا جوتیارانی لورن و شامپانی و بورگونی، هێرشدەکەنەسەر یەکە سەربازییە جێماوەکانی دوژمن و سەریان دەبڕن، ئەوانە هۆکاری ئاشتی دەرەکین وئەنگێزەی شەڕی ناوخۆن، دەبینی هەتا ساڵێکیتر چ بەسەر وڵات دێنن، هەرچۆنێکبێت



شتێ بۆ وڵات پێویسته جگەلەشەخسی من وناوەکەم، وێنای من، شمشێری من ، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ترسنانەوە، پێویسته تەسلیمبم، ئێستا بانگی مارشاڵەکانم دەکەم و تۆ دەبینی کاتێ کەپێمگوتن ئێوە لەسەر گەردانی باپڕگارتانبێت و ڕێگاتان پێدەدەم بێئەوەی کەسایەتیتان لەنگبێت ڕێگای مارشاڵ مامون بگرنەبەر، چەند دڵخۆش دەبن).

ئەوە شەوە ئەوەی ناپلیۆن لەدڵی دابوو بۆ کولنکوری هەڵەڕشت، ئەوەی بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست دیاربوو ئەوەبوو وڵات توشی شەکەتییەکی بێ پێشینەببۆوەو ئیتر بەرگەی ئەم حوکمە خوێناویەی ناپلیۆنی نەدەگرت کەسەمای مەرگی هەمیشەو کوژرانی بەکۆمەڵ وتێداچوون وفیداکاری چەند نەوەیەکی لەپادابوو، ئەمەش لەبەرخاتر ئامانجێك کەدەستکەیشتن پێی ئەستەمبوو، ناپلیۆن لەساڵی (1814)دا بەئاشکرا ڕایگەیاندبوو (من دەمەوێت ئیمپراتۆریەتی جیهان بۆ فەرنسا دەستەبەر بکەم) لەوکاتەدا نەیدەزانی نەوەکانی ئایندە یەك قوتابخانەی مێژووی نیشتمانپەرستانە دروستدەکەن و لەوەدەکۆڵنەوە بیسەلمێنن کەناپلیۆن بەدرێژایی تەمەنی خۆی هێرشی نەکردۆتەسەر کەس جگەلەبەرگریکردن لەخۆی، دەستی بۆ هیچ کارێکیتر نەبردووە، داگیرکردنی میلان و مۆسکۆ و بەرلین و مەدریدیش تەنها بۆ بەرگریکردن بووە لەسنووری جوگرافیایی فەرەنسا، تەنانەت خودی ناپلیۆنیش ئەم بۆچوونەی بەخەیاڵدانەدەهات. ناپلیۆن بۆناپارت ئاگاداری لیستی شەڕەکانی نەبوو وئەو لیسیتانەی لەم دواییانەدا بەهۆی ئالپرمنیەوە دوای گەڕان و بەدواداچونێکی زۆر لەئەرشیفی ڕەسمی کەلەزۆر سەرچاوەوە دەستی کەوتوون ئاشکراکراوە، بەپێی ئامارەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ژمارەی ئەو فەرەنسیانەی لەشەڕەکاندا بەکوشتچوون و گومبوون لەملیۆنێك تێناپەڕێت،(471) هەزار کوژراو کەبەڕەسمی تۆمارکراون (530) هەزار کەسیش بێسەروشوێن، ئەو کەسانەی کەبەخەستیش برینداربوون وئەوانەی کەبەنەخۆشیش مردوون لەم ئامارەی سەرەوەدا هەژمارنەکراون.

ئەو توێژینەوەو ئامارانەی مینە هی هەموو ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن نییە، تەنها هی خاکی فەرەنسایە، واتە: سنووری جوگرافیایی فەرەنسای پێش ڕووخانی ڕژێمی شانشینی بوربنەکان، هەروەها هەموو شەڕەکانی ناپلیۆنیش، لەوئامارەدا هەژمارنەکراوەو تەنها بریتییە لەشەڕەکانی ساڵی (1800) بەدواوە.

ناپلیۆن هیچ کاتێك نەیدەتوانی ئاوا بەڕۆشتنی تێبگات کەلە(24) ملیۆن هاوڵاتی فەرەنسا، زیاتر لەملیۆنێك کەس بەهۆی شەڕەکانی ئەوەوە لەناوچوون، ئەو تەنها ئەوەی دەبینی گوندەکانی فەرەنسا بەهۆی سەربازگیری یەك لەدوای یەکی ئەو بەرەو چۆڵی دەچنەوە، جارجارەش هەوڵیدەدا ئارامیان بکاتەوەو نیشانیانبدات کەسەربازانی وڵاتانی دەستنیشاندەی خۆی-یان هاوپەیمانانی بوون بەبەشێك لەسوپاکەی خۆی کەئەڵمانی و سویسری و ئیتالی و بەلجیکی و هۆڵەندی و پۆلۆنی و ئایلیری و... هیترن و شان بەشانی سەربازەکانی فەرنسی دەجەنگن.

بەلام لەناوچوونی سێ چوار ملیۆن بێگانە کەلەریزی سوپاکەی ناپلیۆندا دەجەنگێن شتێکی بێبەهاو هیچ بوو بۆ لەناو چوونی یەك ملیۆن فەرەنسایی، ملیۆنەها لەدوژمن کوژراو بریندار و گومبوو بەلای ناپلیۆنەوە نرخی نەبوو کەناوبراو زەحمەتی ئەوە وەبەرخۆی بنێت ناویان بێنێت و بیریان لێبکاتەوە.

بەدرێژایی ئەو شەوە کەناپلیۆن بەقەدەم لێدان و بیرکردنەوە بەسەری برد، بەلیستی کارەکانی خۆیدا چۆوەو بەئامادەبوونی کولنکرو سەرئەنجام گەیشتە ئەو ڕایەو گوتی (فەرەنسا گۆشەگیربووەو گیانی وڵاتی گەیاندۆتە لێوارەکانی مەرگ)



بوربنەکان ئەوەندە بەنرخنین و زۆریش حوکرانی ناکەن، بەلام لەوکاتەدا ئەو خالەدەهاتەپێش ئایا جگەلەئەو کێ بەدەردی حوکرانی ولات دەخوات؟ ناپلیۆن ئەو شەوە نەخەوت، بەرەبەیانی رۆژی شەشی ئیبریل، ئیمپراتۆر بانگهێشتی مارشالەکانی کردو پێی گوتن: بەرێزان، پشوتان درێژبێت ئیتر لێرەودوا ئەئێوە خوێنرێژی دەکەن و نەسوپاش، من سادەو ساکارانە بەبێ هیچ مەرجێك دەست لەکار دەکێشمەوە، حەزدەکەم بۆخاتری ئێوەو بنەمالەکەم کورەکەم بەجێنشینی خۆم دابنێم، دلنیام ئەو رێگاچارەیە زیاتر بۆئێوە بەسودە ئینجا بۆمن، چونکە ئێوە لەسایەی حکومەتێکدا کاردەکەن کەلەگەڵ بیرو بەرژەوەندییەکانتاندا دەهاتەوە، بەلام یەك رووداوی نابەجێ و چاوەڕواننەکراو بووەهۆی ئەوەی شکست بەو هەولەی من بێنێت بۆدەستەبەرکردنی ئەو پێگەیە بۆئێوە، ئەگەر پەیمانشکێنی مارمون نەبوایە ئەوا ئێوە دەتانتوانی ئەو ئیمتیازاتانەتان دەستکەوتبا، تەنانەت دەمانتوانی جارێکیتر فەرەنسا بخەینەوەسەرپێ، بەلام هەلومەرجێکیتر هاتەپێش ... من تەسلیمی چارەنووسی خۆم بووم، ئێوەش تەسلیمی چارەنووسی خۆتانبن، درێژە بەژیانی خۆتان بدەن لەسەربازگەکانی بنەمالەی شانشینی بوربنەکانداو بەئەمەکەوە خزمەتبکەن، ئێوە حەزتاندەکرد پشوبدەن، ئیتر لێرەودوا بحەسێنەوە، بەلام بەداخەوە، خوا بکات پێشبینیەکانی من هەلەبن، ئێمە نەوەیەك نەبووین بۆ پشوودان دروستکرابین تەنها وەرەقەیەکی دەرهێناو ئەم رستانەی بۆ مارشالەکان خوێندەوە: چونکە هاوپەیمانان دەلێن تەنها ناپلیۆن رێگرە لەبەردەم ئاشتی ئەورووپادا، ئێستاش ئیمپراتۆر ناپلیۆن کەخاوەنی قسەو بەلێنەکانی خۆیەتی، رایدەگەیەنێت خۆیی و میراتگرەوەکەی چاوپۆشی لەتەخت وتاراجی فەرەنساو ئیتالیا دەکات ودرێغی لەهیچ فیدارکاریەکیش ناکات لەپێناو فەرەنسادا).

دواتر چووە سەرکورسی پشت مێزەکەیی و وەرەقەکەی ئیمزاکرد.

مارشالەکان واقیان ورمابوو ودەستی ناپلیۆنیان ماچ کردوو بەهەمان مەرایی وپێهەلاگوتنی کەبەدرێژایی رۆژگاری دەسەلاتداریەتی ناپلیۆن دەیانکرد کەوتنە دووان.

دەستبەجێ کولنکور بەهاوەلی دوو مارشالیتر کەوتنەرێ و ئەو نامەی وازهێنان لەتەختی پاشایەتی ناپلیۆنیان بۆ پاریس برد، ئەلکسەندەر و هاوپەیمانان بەوپەڕی پەشۆکاویەوە چاوەڕوانی سەرئەنجامی کارەکەیان دەکرد.

ئەلکسەندەر تانکیدی لەسەر ئەوەکردەوە دەبێ دورگەی ئالپ ببێتە شانشینی رەهای ناپلیۆن، کورەکەیی و هاوسەرەکەشی ماری لویز، دەبێ لەئیتالیادا میرنشینیەکیان بدرێتێ، هەموو شتێك کۆتایی پێهاتبوو.

## ( 5 )

لەوساتەوەختەدا جارێکیتر ناپلیۆن کەوتەوە ئەوخەیالەی کەلەشەرەکانی سالی (1814)دا زۆرجار بیری لێدەکردەوە، ئەو شەرانەی لەرووی سەرکردایەتی کردنی فەرماندەیی سوپاوە زۆر درەخشاوەو شاکاربوون، بەلام لەراستیدا هەولێکی بێ هودەبیانەی ناکامبوون.

لەسالی (1813)دا مارشال و ژنرال و پاسەوانەکانی تەنانەت سەربازەکانیش تێبینی ئەوەیانکردبوو ناپلیۆن بێسلکردنەوە گیانی خۆی لەشەرەکاندا دەخاتە مەترسییەوە.



وەك لەمەوبەر ئاماژەمانپێکرد، لەساڵی (1813)دا دوای مەرگی دوروك، ئیمپراتۆر ماوەیەك بێدەنگ لەتەك قەدی دارەکەدانیشت و کەوتە بیروخەیاڵ و نارنجۆك هاوێژەکانی دەوری لەشەڕ پاوەستان، لەساڵی (1814)دا زیاتر ئەوکارەی ناپلیۆن دەکەوتەبەرچاو ئیتر کەس لەلێکدانەوەی ئەمە بەهەڵەدانەدەچوو، بەتایبەت لەشەڕەکەی ئارسی سوراویدا.

لە(20/ی مارس)دا کاتێ ناپلیۆن بەرەو خاڵێکی سەربازی سەخت دەڕۆیشت، چەند دەقیقەیەك پێشتر ناپلیۆن فەرمانی بەسەربازەکانی دابوو ئەوشوێنە چۆڵبکەن و پاشەکشەی پێکردبوون، ژنرال ئاکسلمان بەرەو ناپلیۆن ڕایکرد هەتا ئاگاداری بکات، بەڵام مارشال سباستیان بەئەوی گوت (لێی گەڕێ، بۆ نابینی ئەو بەئەنقەست ئەوکارە دەکات؟ دەیەوێت کۆتایی بەژیانی خۆی بهێنێت) بەڵام نەگوللە تفەنگەکان و نەگوللە تۆپەکان ونەنارنجۆکەکان کاریان [٣٧٧] بەئەو نەبوو، ناپلیۆن بەردەوام خۆکوژی بەکارێکی نەفس نزمی و ترسنۆکی لەقەڵەمدەدا، بەڵام لەشەڕی ئارسی سوراویدا چەند جارێك خۆی لەگێلی دەداو بێ ئەوی بەڕووکەش ئەوەی بوێت بەدوای مەرگدا دەگەڕا. لە(11/ی ئیبریلی ساڵی (1814)دا پێنج ڕۆژ دوای دەست لەکارکشانەوەکەی ناپلیۆن، لەوکاتەی خەریکی تەداروکاتی خۆسازکردنبوون بۆچوون بۆ دورگەی ئالپ، ناپلیۆن لەکولنکور جیابۆوە کەئەوماوە دووروودرێژە هەمیشە لەگەڵ ئەودابوو وچووە باڵەخانە تایبەتییەکەی خۆی، بەوجۆرەی دواتر ئاشکرابوو، هەموو پێداویستییەکانی شەڕی شەخسی خۆی جێهێشتبوون وئەو شوشەی کەتلیاکی تێدابوو لەفونتێ بلودا هەوڵی خۆکوژی دابوو، هەموو ئەوتلیاکەی لەناو ئەوشوشەدابیوو خواردبوویەوە.

ئەمە ئازارێکی زۆری ئەویدا، کولنکور بەهۆی ئەوبارودۆخە ناهەموارە پێشبینی لەمجۆرەی کردبوون، بۆیە بەپەلە چووە ژوورەکەی ناپلیۆن وکەبینی وایزانی توشی نەخۆشییەکی کوشندەبووەو ویستی بەدوای پزیشکدا بچێت.

بەڵام ناپلیۆن تکای لێکرد بانگی کەس نەکات، تەنانەت وەك فەرمانیش پێی گوت: هیچ هەوڵێ مەدەو بەملاولادا مەچۆ.

ئازارەکەی ئەوەندە زیادیکرد کولنکور ڕایکردوو چوو دکتۆر ئیڤانی بەخەبەر هێنایەوە، ئەم پزیشکە هەمان ئەوکەسەبوو کەئەو شوشە تلیاکەی دوای شەڕی مالوایارو سلافتز دابۆ ناپلیۆن، پزیشکەکە هەرکە شوشەکەی بینی لەسەر مێزەکە دەستبەجێ زانی مەسەلەکەچییە.

ناپلیۆن گلەیی کرد کەئەو ماددەیە بەهێزنەبووەو فەرمانی بەدکتۆرەکە کرد ماددەیەکی ژەهراوی بەهێزتری بۆ بێنێت و بیداتێ.

دکتۆر ئیڤان لەژوورەکە چۆدەرێ و سوێندی خوارد جارێکیتر ئاوانی ئاوا نەکاتەوە.

ئازارکێشانەکەی ناپلیۆن چەند سەعاتێك درێژەی کێشا، چونکە دەرمانی دژە ژەهراوی بوونی نەدەخواردو بەڕەسمی داوایکرد ئەم ڕووداوە لەهەموو لایەك بشارنەوەو باسی نەکرێت، دوای ئێش و ژانێکی زۆر ئەم چەند وشەیەی لەدەمەوە هاتن (مەرگ چەند دیژوارەو لەمەیدانی شەڕیشدا مەرگ چەند ئاسانە، ئاە ، بۆ چ من لەشەڕی ئارسی سوراویدا نەکوژرام)

ئەو ژەهرە کوشندەنەبوو، ئیتر لێرەودوا ناپلیۆن هەرگیز هەوڵی خۆکوژی نەدایەوە، خۆسازکردن بۆ سەفەرەکە تەواوبیوو، بەپێی ئەو مەرجانەی لەگەڵ هاوپەیماناندا لەسەری ڕێککەوتنبوون، ئیمپراتۆر دەیتوانی یەك تیپ لەسەربازە کۆنەکانی لەگەڵخۆیدا ببات بۆ دورگەی ئالپ.



له(30/ی ئیبریلی سالّی (1814)دا هەموو شتێك ئامادەكرابوو ئەو گالیسكانەی كەدەبوا ئیمپراتۆرو هەندێ لەكەسە نزیكەكانی و باڵوێزەكانی ولاّتانی هاوپەیمانان بەهاوەڵی لەگەڵ ناپلیۆندا بچن بۆ دورگەی ئالپ، لەتەك دیوارەكانی كۆشكدا بەریز وەستابوون.

ناپلیۆن ویستی ماڵئاوایی لەگاردە تایبەتییەكەی خۆی بكات، سەربازانی گاردەكەی لەحەساری كۆشكدا بەریز راوەستابوون، ئێرە هەمان ئەوحەسارە بەرفراوانەبوو كەگەشتیاران بەباشی ئاشناییان لەگەڵ فونتن بلودا هەبوو وبەحەوشەی ماڵئاوایی ناسراوە.

لەریزی پێشەوە گاردە كۆنەكەی خۆیی و مارشال و ژنرال و ئەفسەرەكان لەحاڵەتی ئامادەباشیدابوون ولەریزی دووەمیشدا سەربازانی گاردی تازەی لاو وەستابوون.

كاتێ ئیمپراتۆر بەدیاركەوت سەربازە ئالاّ بەدەستەكە ئالاّكەی لەبەردەم ئەودا نەوی كرد، ناپلیۆن بەدەنگێكی بەرز گوتی(ئەی سەربازانی گاردی كۆن، من ماڵئاواییتان لێدەكەم، بیست ساڵە من ئێوەم بەسەر رێگای شانازی وشەرەفدا بردووە، ئێوەش لەم رۆژانەو لەرۆژگاری شكۆمەندی مندا نمونەی دلاوەری و بەئەمەكی بوون، بەبوونی پیاوی وەك ئێوە شكستمان نەدەهێنا... بەلاّم جەنگینمان دەبێتەهۆی هەلایسانی شەڕی ناوخۆی فەرەنسا، بۆیە ئێمە بەرژەوەندی خۆمان بەقوربانی نیشتامن كردو لێرە دەڕۆین، ئێوە ئەی دۆستانی من، درێژە بەخزمەتكردنی فەرەنسا بدەن... خواحافیز رۆڵەكانم، حەزمدەكرد یەك بەیەك ئێوە لەباوەشبگرم، بەلانی كەمەوە باناڵاكەتان ماچ بكەم..)

ئیتر نەیتوانی لەمەزیاتر بدوێت، چونكە قورگی بەكوڵی سۆزو غوربەتگیرا، ئامێزی بەسەربازە ئالاّ بەدەستەكەداكردوو ماچی كرد، ئینجا ئالاّكەی دەستی ماچ كرد، دواتر بەخێرایی رۆیی و سواری گالیسكەكەبوو، گالیسكەكان بەنێوان هاواری بژی ئیمپراتۆردا رۆیشتن، زۆر لەنارنجۆك هاوێژەكان وەك منداڵ دەگریان.

رۆژنامەكانی بریتانی كەئەم رووداوەیان بلاّوكردبۆوە، بەمجۆرەیان نووسیبوو (گەورەترین شاكاری مێژووی جیهان كۆتایی پێهات، ناپلیۆن ماڵئاوایی لەگاردەكەی خۆی كرد)

بەلاّم لەراستیدا ئەوشاكارە بیست ساڵەیەی كەلەمانگی دێسەمبەری سالّی (1793) لەتولوندا دەستی پێكردو لەئیبریلی سالّی (1814) لەفونتن بلودا هێشتا كۆتایی نەهاتبوو، ناپلیۆن لەماوەی ئەو بیست ساڵەدا دنیای راهێنابوو بەوەی سەریان لەهیچ لەكارەكانی نەسوڕمێت، چارەنووسابوو جارێكیتر هەموو لایەك توشی واق ورمان و سەرسامی بكاتەوە.



# فەرمانڕەوایی سەد ڕۆژە (1815)

( 1 )

پێشەوەی باسی سەیرترین ڕووداوی ڕۆژگاری ژیانی ناپلیۆن بکەین، سەرەتا پێویستە ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەین. ئیمپراتۆر لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنی بەدورگەی ئالپ بێ گومان هیچ جۆرە نەخشەیەکی نەبوو، کۆتایی بەژیانی سیاسی خۆی هێنابوو، وەك بەڵێنی دابوو ودەیویست مێژووی فەرمانڕەوایەتییەکەی خۆی بنووسێتەوە– یان بەلانی کەمەوە لەماوەی ئەوشەش مانگەی لەو دورگەیەدابوو واوێنادەکرا، ئەو لەوماوەیەدا پیاوێکی گفتولفت خۆش و ئارامبوو.

لەوکاتەی بەولایەتەکانی خۆرئاوای فەرەنسادا تێپەڕین، لایەنگرانی ڕژێمی شانشینی بووربنەکان خۆپیشاندانێکی دژیە ئەویان لەسەر ڕێگاکەیدا سازکردبوو، هەتا لەیەك دوو شوێندا مەترسیشیان بۆسەر گیانی هەبوو، سەرئەنجام لەڕۆژی(3/ی مانگی مایۆی سالی (1814)دا گەیشتە دورگەی ئالپ.

ناپلیۆن کەوتبۆ ناوپانتایی خاکێکی بچوك و دورەدەست و لەنێوان خەلکێکی بێگانە کەپێشوازییەکی گەرمیان لەفەرمانڕەوا تازەیانکرد.

لەبەهاری سالی (1811)دا دروست سێ ساڵ پێش، ناپلیۆن بانگهێشتی ژنرال (ردا)ی کرد بۆ کۆشکی تویلری ، چونکە ئەو ژنراله بەڕێزەوە وێرابووی بڵێت لەشکرکێشی مەکەسەر ڕوسیا، ناپلیۆن لەوەلامدا گوتبووی: من هەتا سێ ساڵیتر فەرمانڕەوایی دنیادەکەم).

ئێستا ڕێك دوای سێ ساڵە کەئیمپراتۆرییە مەزنەکەی هەرەسی هێناوە.

ناپلیۆن تەنها حوکمڕانی دورگەیەکی دەکرد کەپانتاییەکەی( 223) کیلۆمەتر چوارگۆشەبوو وسێ شارۆچکەو چەندین گوندی تێدابوون، کەکۆی گشتی دانیشتوانی چەند هەزار کەسێکبوون. چارەنوسی ناپلیۆن بۆ نزیك زادگاکەی چووبۆوە، چونکە دورگەی ئالپ لەدورگەی کرسەوە نزیکبوو، ئەم دورگەیە هەتا مانگی ئیبریلی سالی (1814) لەژێر دەسەلاتی دوك تسکانی دەستنیشاندەی ناپلیۆندابوو وهاوپەیمانان دابوویانە ناپلیۆن.

ناپلیۆن بانگهێشتی دانیشتوانی مەملەکەتەکەی دەکردوو پێشوازی لێدەکردن و بەڕووکەش وادیاربوو بەتەمایە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەوێدا بمێنێتەوە.

کەس وکارەکانی لەمانەش دایکی ناپلیۆن لیتیسیاو خوشکەکەی پرنس پولین بورگز، چەند جارێك بۆسەردانیکردنی هاتنە ئەو دورگەیەو ماوەیەك لەوێدا لای دەمانەوە، کنتس والوسکاش کەناپلیۆن لەپۆلۆنیادا پەیوەندی زۆر نزیکی لەگەلدابوو وهەتا کۆتایی تەمەنی خۆی ناپلیۆنی خۆشویست، سەردانی ئیمپراتۆری کرد، بەلام ماری لویز کەباسی خیانەتکردنی ژن و مێردی ئەویاندەکردو ئەوەیان بیرچووبۆوە کاتێك ناپلیۆن لەسالی (1810) بڕیاریدا ناوبراو بکات بەهاوسەری خۆی و خوازبێنیان کرد، نەناپلیۆن بەپێویستی زانی لەماری بپرسێت داخوا ڕازییە نەکەس وکارەکەی ئیمپراتۆری نەمساش،

لێرەدا ئەوەبەسە ئەو نامەیە بخەینەڕوو کەماری لویز بۆ ئوفنی نووسیوە، کەیەکێکبووە لەوکەسە نزیکانەی ناویرلو (لەو ڕۆژەوەی ناپلیۆن ژنەکەی خۆی تەلاقداوە)، من زۆرجار گوڤاری فرانکفۆرت سەیردەکەم بۆ ئەوەی ناوی هاوسەرە تازەکەی ناپلیۆنی تێدا بەدی بکەم، دانی پێدادەنێم ئەم دواکەوتنە لەنیشانەکردنی هاوسەرییەتی ناپلیۆن ئەواو منی دڵنیگەران کردووە، من چارەنووسی خۆم دەدەمە دەست خواوەند...، بەلام ئەگەر بەختی خراپی من وابێنێت ئەوا ئامادەم بەختەوەری خۆم بکەمە قوربانی بۆنیشتمان).

لەسەر ئەم بنەمایە ماری لویز هاوسەربوونی لەگەڵ ئیمپراتۆری فەرەنسادا بەهەڕشەو نابەدڵی دەزانی، بەدڵنیاییەوە رووخانی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن بەلای ئەوەوە ڕزگاربوون بووە لەدەسەلاتی ڕەهای شووەکەی، هاوسەری یەکەمی ناپلیۆنی کەمێردی یەکەمی لەکانی دڵییەوە خۆشی دەویست، نەهات بۆدیدەنی ناپلیۆن، جوزفین چەند هەفتەیەك دوای گەیشتنی ئیمپراتۆر بەدورگەی ئالب، لە(29/ی مانگی مایۆی سالی (1814)دا لەمالمزون مردبوو.

هەوالی مەرگی جوزفین هەتا چەند هەفتەیەك ناپلیۆنی توشی غەمگینی وبێدەنگییەکی قوڵکرد، چەند مانگێك بەو شێوەیە بەئارامی بەسەرچوو، ناپلیۆن تۆزقاڵێ باسی هەست و ڕازەکانی خۆی نەدەکرد، زۆر کاتی بەبیرکردنەوەو خەیالات بەسەردەبرد.

لەپایزی سالی (1814) بەتایبەت لەمانگی نۆڤەمبەر بەدواوە ناپلیۆن وردەوردە گرنگی بەهەوالەکانی فەرەنسادەدا کەسەبارەت بەکۆنگرەی ڤێننابوو، راپۆرتەکان کەم نەبوون، لەپیومبینو کەنزیکترین بەندەری ئیتالیایی بوو دوازدە کیلۆمەتر لەدورگەی ئالپەوە دووربوو لەخودی فەرەنساشەوە ڕاستەوخۆ هەوالەکان بەئیمپراتۆر دەگەیشتن، کەبریتی بوون لەوەی بنەمالەی بوربنەکان هەرکەچوونەوە سەرتەخت و تاراج ودەسەلاتیان گرتۆتەدەست، هەلسوکەوتی زۆر بێسەرەوبەرەو گەمژانەیان کردووە، زۆر لەوەزیاترە لێیان چاوەڕواندەکرا.

تالیران کەخیانەتی بەناپلیۆن کردبوو لەهەموویان ژیرتربوو وبۆ گەڕانەوەی بوربنەکان بۆسەرتەختی پاشایەتی فەرەنسا زۆر هاوکاری کردبوون، جارێك سەبارەت بەمانە گوتبووی (ئەمانە نەهیچیان بیرچۆتەوەو نەهیچیش فێربوون)ی ئەلکسەندەری یەکەمیش بۆ کولنکور هەمان شتی دەربڕیبوو وگوتبووی بوربنەکان نەچاکبوون ونەچاکیشدەبن.

خودی لویسی هەژدەهەم کەپیرەمێردێکی نەخۆشبوو، کەسێکی مەیلەو ژیربوو، بەلام براکەی کنت دارتواو کوڕەکەی میر دانگولم ومیر دوبری و هەموو ئەو دارو دەستەیەی لەگەڵ بوربنەکاندا گەڕابوونەوە، بەجۆرێ ڕەفتاریاندەکرد وەك بڵێی هەرگیز شۆڕش ڕووی نەدابێت وناپلیۆن بوونی نەبوبێت، ئەوانە بەلەخۆباییانەوە دەیانگوت پێویستە ڕابردوو فەرامۆش بکرێت ولەگوناهەکانی فەرەنسا ببورن بەمەرجێك باجی گوناهەکانیان بدەن وبگەڕێنەوە بۆلای دینداری و ڕەوشی پێشوو، لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو دەبەنگانە پێیانباشبوو ئەو دامەزراوانەی بەدەستی ناپلیۆن دروستکرابوون بهێڵنەوە، بۆیەش شێوەی سیستمی پارێزگاکان و وەزارەتخانەو دەزگای پۆلیس وسیستمی مال و قانونەکانی ناپلیۆن و داگاکان و بەکورتی هەموو کارەکانی دەولەت کەناپلیۆن دایناببوون وەك خۆی هێشتیاننەوە، تەنانەت دامودەزگاکانی ئیداری و پێکهاتەی سوپاو زانکۆ



وخوێندن و خوێندنی باڵاو هەموو دامەزراوەکانی دەوڵەتیان وەك خۆی هێشتەوە، تەنها بەو جیاوازیەی لەبری بوونی ئیمپراتۆرێکی ڕاهبەر لەوحکومەتەدا یەك شانشینی مەشروتەی [٣٧٨] هەبوو.

پاشای فەرەنسا لەژێر فشاری هاوپەیمانەکاندا بەتایبەت سووربوونی تزاری ڕوسیا، بەوەڕازیبوو وبڕیاری مەشروتەی دەرکرد، چونکە تزاری ئیمپراتۆری ڕوسیا دڵنیابوو لەوەی بوربنەکان بەبێ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی قانونی ناتوانن درێژە بەمانەوەی خۆیانبدەن.

ئەوانەی لایەنگری گێڕانەوەی سیستمی پێشووبوون، زۆر بەمبڕیارە هەراسان و توڕەبوون ودیانگوت زۆردار سالەهای سال بەلەخۆڕازییەوە پاشایەتی بکات، بەڵام دەسەڵاتی پاشای شەرعی کەلەژێر چاودێری خوادایە سنووردارکرێت؟

جگەلەمەش زۆرکەسیتر لەمە ناڕازیبوون و هەرلەڕۆژانی سەرەتایی گەڕانەوەی بوربنەکان بۆسەر تەختی پاشایەتی، ئەمانە هەمیشە هاواریاندەکرد زەوییەکانیان کەلەسەردەمی شۆڕشدا دەستیان بەسەرداگیرابوو وبەهەراج بەخەڵکی فرۆشرابوونەوە، دەبێ بۆیان بگێڕدرێتەوە، حاشا هەڵنەگرە کەس پەیدانەدەبوو غیرەتی ئەوەی هەبێت دەست بۆنەوکارە ببات.

بەڵام هەرکردنی ئەم قسانە بەسبوو بۆئەوەی جوتیارە گوندنشینەکان هەراسانبن و پەشێویان بکەوێتەناو.

ڕۆحانییەکان کەلایەنگری خاوەن زەوییە کۆنەکان بوون، لەسەر مەبەرەکان ئامۆژگاری ئەوانەیان دەکرد کەمڵك ومالی لەسەردەمی رژێمی پێشوودا بەهەرزان کڕیویانە بیدنەوە خاوەنەکانیان، چونکە ئەگەرە ئەوکارەنەکەن دەکەونەبەر نەفرەتی خواوەندو دەیانگوت وەك جزابل [٣٧٩]، گوناهباردەبن دەبنەخۆراکی سەگی دڕندە.

ئەشرافەکانی کەتازە گەڕابوونەوە تائەوپەڕی بێشەرمی ڕەفتاریان دەکرد، جوتیارەکان بەناحەقی لەدادگاکاندا لێدان و تێهەڵدانیان دەخوارد. ئەو دەستەیەی دەرباری لویسی هەژدەهەمیش کەلەهەموویان ژیرتربوون، ئەو ڕووداوانەی لەگوندەکاندا ڕوویدەدا بەنائومێدی تەواو سەیریان دەکردو دەیانزانی زەوی وزار ستاندنەوە لەجوتیارەکان چەند گوندنشینەکانی بێزارو توڕەکردوە، بەڵام ئەمانە هیچیان لەدەست نەدەهات.

چینی بۆرژوا هەر لەیەکەم ڕۆژی ڕووخانی ئیمپراتۆرییەوە بەشێوەیەکی گشتی هەستیان بەئاسودەیی کردبوو، چونکە بەئومێدی ئەوەبوون کۆتایی بەشەڕو سەربازگیری بهێندرێت (لەو ساڵانەی دوایی حوکمڕانی ئیمپراتۆر چونکە ناپلیۆن ببوە کەسێکی ناپاب وخۆشەویست، بۆرژوازەکان نەیاندەتوانی لەبری چوونی کوڕەکانیان بۆسەربازی یەکێکیتر بەپارەبکڕن و بۆسەربازی لەبری ڕۆڵەکانیان بینێرن) لەوانەشە بۆرژواکان لەبەرخاتری ژیانەوەی جموجۆڵی بازرگانی وادڵیان بەو باروبۆخە تازەیە خۆشبوبێت، هەروەها خودی بۆرژوازی گەورەی پیشەسازی لەساڵانی (1813 و1814) بەدواوە ئیتر مانەوەی ئیمپراتۆری بەمەرجی کرانەوەو بەرەوپێشچوونی خۆی نەدەزانی.

ئێستا چەند مانگێك لەڕووخانی ئیمپراتۆری و شکاندنی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا تێنەپەڕیبوو کەهاواری ناڕەزایەتی لەلایەن بۆرژوازی بازرگانی و پیشەسازی بەرزبۆوە، چونکە دەوڵەتی بوربنەکان لەسەرەتادا تەنانەت نەوێران بیریش لەوەبکنەوە یەك تەعریفەی گومرگی لەبەرامبەر بریتانیادا دابنێن کەهاوپەیمانبوو بۆ ڕووخاندنی ناپلیۆن، ئەوانەی لەناو چینی

---

[278] - حکومەتێك کەپشتیبەستێت بەقانون، ولاتێکی شانشینی کەپەرلەمانی هەبێت ونوێنەرانی میللەت چاودێری کاروبارەکانی دەوڵەت بکەن، (و-فارسی).

[279] - پاشای ئیسرائیلەو دایکی ئاتالی کەبەفەرمانی جیهو فڕێدرایە بەردەم سەگی هارو خواردیان.(سەدەی نۆیەمی پێشزاین)(و- فارسی).



برژوازیدا دەمێکبوو لایەنگری هاتنەوەسەرکاری بوربنەکانیان دەکرد، ئەو هەستی لایەنگریە تەنها لەناو رۆشنبیرەکان و ئەو کەسانەداهەبوو کەکاری سەربەخۆیان هەبوو، واتە: ئیشی ئازادیان لەدەستدابوو، وەك پارێزەرانی دادگاو پزیشك و رۆژنامەنووسان و... هتد.

دەرکردنی فەرمانی مەشروتیەت کەلویسی هەژدەهەم دەریکرد، لەسەرکوتکردنە ئاگرینەکەی ناپلیۆن باشتربوو، بەلای ئەوانەی سەرەوە بەرەکەتێکی گەورەبوو، ژمارەی رۆژنامەی بچوك و دەرکردنی کتێب زۆر ببوو، شتێك کەلەسەردەمی ناپلیۆندا جێگای وێناکردنیش نەبوو، بەلام ئەم توێژەی رۆشنبیرانە، ئەم قوتابی و نووسەران و فەیلەسوفانی کەبەرۆژگاری رۆشنگەری بەناوبانگە، لەقوتابخانەکانیاندا ئازادی بیروباوەڕ فێرکرابوون.

ماوەیەك دوای ئەوە نفوزی ڕۆحانییەکان لەدەربارو دامەزراوە ئیدارییەکان ژیانی کۆمەلایەتی تووڕەو بێزارکردبوو، ئازارو ئەشکەنجەو دژایەتی کردنی هەموو ئەوشتانەی بۆنی بیرۆکەی ڤۆلتێری لێدەهات لەهەموو لایەکی ولاتەوە دەستی پێکردبوو، کۆنەپەرستەکان لەهەموو شوێنێکدا بەتایبەت لەشارۆچکەکاندا زۆر کارمەندی تازە لەلایەن رۆحانییەکانەوە دادەمەزرێندران) بوربنەکان و لایەنگرەکانیان، مانگ بەمانگ پێگەی خۆیان لەقتردەکرد.

ئەوانە نەیاندەتوانی دەستورو رێنماییەکانی کەناپلیۆن دایڕشتبوون بگۆڕن، خەریکی پروپاگەندەو بلاوکردنەوەی نووسینی سوکایەتی ئامێزو گالتەکردن بەبرژواکان و جوتیارەکان بوون وهەڕەشەو گورەشەکانی ئەمانە باروبۆخی سیاسی ولاتی ناجێگیرکردبوو، بەتایبەت گوندنشینەکان. لەلایەکی ترەوە زۆر لەئەفسەرانی سوپا پێیانوابوو بوربنەکان بەلایەکن ولەدەرەوە بەسەریاندا سەپێندراوەو دەبێ هەرچۆنێکبێت بەرگەبگرن، وردەوردە شەل وشکەستەو بەشداربوانی شەڕی بێ ئاکامی روسیا، باسی یاداشتە ناخۆشەکانی خۆیان نەدەکردو هەر لایەنە خۆشەکانیان بۆیەکتری دەگێڕایەوەو بەڕای ئەمانە ناپلیۆن تەنها قارەمانی ناودارەو سەردارێکی مەزنەو فەرمانڕەوای نیوەی دنیابوو، ئەو سەربازانە ئەویان هەربەهەمان هاوڕێی دەستەی نارنجۆك هاوێژان سەیردەکردو ئەو هەرتاکێك ئەمانەی بەناوی خۆیانەوە بانگ دەکردن و ئەوانی بەئاستی گیانی بەگیانی خۆشەدەویست، ئەو سەربازانە هەتا ئەوکاتەش وایان بیردەکردەوە ناپلیۆن ئەوانی خۆشدەوێت، چونکە بۆخۆیان ئەویان خۆشدەویست، ئیمپراتۆر توانیبووی ئەوجۆرە وێناکردنە بەشێوەیەکی ڕەندانە لەناو دڵ ومێشکی ئەواندا جێبکاتەوە.

ئەفسەرەکان بەبارتەقای سەربازەکان ڕقیان لەبوربنەکان نەدەبۆوە، چونکە بەڕاستی هەندێك لەمانە بەتەواوەتی لەشەڕو شۆڕ بێزاربببوون وحەزیان بەپشوداندەکرد، وەلێ چون بوربنەکان باوەڕی تەواویان بەو ئەوفسەرەانەبوو وئەو ڕێزە زۆرەشیان پێویست نەبوو وبەجارێك نیوەی ئەفسەرەکانیان بەنیوە موچە خانەنشین کردن، ئەو ئەفسەرانەی لەسوپاشدا مابوونەوەو ئەفسەرە گەنجە تازە ئەشرافەکانی کەبەپلەی بەرزتر دامەزرابوون وفەرمانیان بەسەردادەکردن بێزار ببوون ونەفرەتیان لەبوربنەکان دەکرد.

گۆڕینی ئالا سێ ڕەنگەکەی سەربازی لەلایەن بۆربنەکانەوە بەئالای سپی، ببووەجێگای تووڕەیی و گرژی لای ڕوسیا.

ئەم ئالا سپییە بەلای سەربازەکانی ناپلیۆنەوە وەك ئالای هەلاتووانی کلۆچ کردووی خائین سەیردەکراو لەوکاتانەدا دەبوا دژی دەستدرێژییەکانی بیانی بوەستابانەوەو تێکیانتێکشکاندبان، ئێستا ئەو خۆفرۆشانەی دژە شۆڕش لەژێر سایەی نێزەی ڕوس و پروس و نەمساوییەکان گەڕاونەتەوەو زۆر ستەم لەگوندنشینەکان دەکەن ودەیانەوێت زەوی وزارەکان لەگوندنشینەکان



بستێننەوە، وردەوردە لەنێو گوندنشین وسەربازگەو هەموو توێژەکانی کۆمەڵگادا ئەوپرسیارە دەکراو دەیانگوت:( ناپلیۆن لەکوێیە، کەی دەگەڕێتەوە؟ ناپلیۆن ئەمەو زۆر شتی تری دەزانی، لەڕێگای ئیتالیاوە هەروەها بەئاسانی لەڕێگای ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانەوە هەواڵەکانی وابەستەبە کاروبارەکانی کۆنگرەی ڤیێننای دەزانی وبێدەگەیشت وهەوڵو کۆششی هاوپەیمانان کەدەیانویست ئەو پانتاییە زۆرەی ئیمپڕاتۆریەتەکەی ناپلیۆن بەسەرخۆیاندا دابەشبکەن دووبەرەکیو وکێشمەکێشمی لەنێوان هاوپەیمانانی پێشوودا دروستکردبوو.

بریتانیاو نەمسا لەسەر ساکس و پۆلۆنیا کەوتبوونە ناکۆکی لەگەڵ ڕووسیاو پروسدا، ئەو یەکێتییە پتەوەی لەساڵی (1814)دا کۆتایی بەئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن هێنابوو ئیتربوونی نەمابوو...

لەمانگی دیسەمبەری ساڵی (1814)دا کاتێك ناپلیۆن لەکۆشکەکەی خۆیدا لەپورتوفراژۆی-ناوەڕاستی دورگەی ئالپ دابوو پیاسەی دەکرد، چاوی بەنارنجۆك هاوێژێکی کۆنی خۆی کەوت کەیەکێکبوو لەسەربازەکانی گاردی خۆیی ولەلایەن هاوپەیمانانەوە ڕێگای پێدرابوو لەگەڵ ئیمپراتۆردا بچێت بۆ دورگەی ئالپ، ناپلیۆن لێی پرسی (ها، کۆنە سەربازی تەمبەڵ ؟

سەربازەکە گوتی: نا، گەورەم تەوەزەلنیم، بەڵام هەمیشەش دڵخۆشنیم.

ناپلیۆن گوتی: خەتای خۆتە، پێویستە کاتەکانی خۆت هەرچۆنێکبێت بەخۆشی بەسەربەریت.

دواتر سکەیەکی زێڕی خستەدەستی ئەو سەربازەو لەبەرخۆیەوە گوتی: ئەم دۆخە بەردەوام ئاوا بەسەرناچێت.

ئەم قسانەی ناپلیۆن لەبەرخۆیەوە دەیگوتن ئایا کەس گوێ بیستیان دەبوو؟ کێ دەزانێت مترنیخ و لویسی هەژدەهەم و سەرۆك وەزیرانی بریتانیا، لەبوونی ناپلیۆن لەنزیك ڕۆخەکانی فەرەنسا زۆر دڵنیگەران بوون، مۆزمۆزی ئەوەهەبوو ناوبراو (ناپلیۆن) بۆ شوێنێکی دووتر بنێرن، ناپلیۆن لەودورگە بچوکەشدا بەمەترسیدار سەیردەکرا، پروپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوە گوایا دەیانەوێت چەند پیاوکوژێك بۆلەناوبردنی ناپلیۆن بۆ دورگەی ئالپ ڕەوانەبکەن، چەند بورینەکان لەفەرەنسادا هەڵسوکەوتی خراپ ونابەجێیانکردبا، زیاتر سەرانی هاوپەیمانانیانی دڵنیگەرانتر دەکرد، بەڵام وردەوردە هەواڵی خۆش لەدورگەی ئالپەوە دەگەیشت بەپێچەوانەی ئەو پروپاگەندانەبوون کەببونە جێگای ترس وگومان دروستکردن لای هاوپەیمانان و بوربنەکان (دەیانگوت ئیمپراتۆر زۆربەی کاتەکانی لەکۆشکەکەیدایە، تەواو ئارامەو تەسلیمی چارەنووسی خۆی بووەو هەردەم لەگەڵ لمپلی نوێنەری بریتانیادا گفتوگۆی خۆشدەکات ویەئەو دەڵێت: ئیتر لەمەودوا ئەم دورگە بچوکەی بۆتە جێگای سەرنج و ژیانی لەوێدا پێخۆشەو چاوی لەهیچی ترنییە، لەشەوی(7/ی مارسی ساڵی (1815)دا خوان وئاهەنگێك لەدەرباری نەمسادا بۆسەرانی ئەورووپاو نوێنەرانی وڵاتان سازکرابوو، ئەو ئاهەنگە لەوپەڕی خۆشی و شادیدابوو کەلەپڕ میوانەکان بینیان لەدەوروبەری ئیمپراتۆر فرانسوادا هەڵسوکەوتی نائاسایی دەهاتەبەرچاو، کەسانی دەربار بەپەشۆکاوی بەپلیکانەکانی کۆشکدا دەچوونە خوارێ و وەك ئەوەی ئاگر لەکۆشك بەربوبێت وبیانەوێت ڕابیکەیەنن، ئەم هەواڵە لەماوەی چاوتروکانێکدا دەمبەدەم بەهەموو کۆشکدا بڵاوبۆوەو هەموویان لەترساندا ناچاربوون بەسەرسامییەوە کۆڕی سەماو شادی جێبهێڵن، پەیام هێنەکە ڕایگەیاندبوو ناپلیۆن دورگەی ئالپی جێهێشتووەو لەدەم ڕۆخی دەریای فەرەنسا دابەزیوەو ئێستا یەکسەرە بەبێ چەك بەرەو پاریس کەوتۆتەڕێ.



( 2 )

لەهـەمان ڕۆژە سـەرەتاییەکانی مـانگی فبرایـەری سـاڵی (1815)دا نـاپلیۆن بیرۆکـەی زیندوکردنـەوەی ئیمپراتۆریەتەکـەی لەکڵێشەی دابوو ویەکەسیشی نەگوتبوو چۆن ئەو قەناعەتەو پلانی بۆ دارشتووەو بڕیاری لەسەرداوە.

لەوانەیە پێشتریش ئەو لەو بڕوایەدابووبێت نەك هەر سەربازەکانی گاردی تایبەتی خۆی، بەڵکو هەموو سەربازەکانی سـوپای فەرنسا لەبەرامبەر ئەودا بەبەئەمەکی ماونەوە، ئەو مارشاڵانەش کەلەسـاڵی (1814) دەسـت لەکارکشانەوەی ئـەویان وەك شتێکی پێویست سەیردەکرد. هەروەها ئەو مارشاڵانەی تری وەك داوو ژنراڵەکانی وەك ئالکسمان و ئەوئەفسەرانەی کەبەنیوە موچە خانەنشینکراون و ڕق وکینەیان لەبەرامبەر بوربنەکاندا لەدڵگرتووەو ئاگاداری بێزاری سەربازەکانن.

هەورەها لەوە دڵنیابێوە ئەو مارشاڵانەی تینوی پشودانبوون ولەشەڕە بەردەوامـەکانی ئـەو بێزاربـوون و بەمـەیلی خۆیـان خزمەتی بوربنەکانیان دەکرد، ئێستا لەپاشا لویسی هەژدەهەم و براکەیی و برازاکانی ناڕازین و تووڕەن.

ئاگای لەحاڵی گوندنشینەکانیشبوو کەهەراسان وبێزاربوون.

هەواڵێك گەیشت و ڕووداوکـان خێرابـوون، لـەنیوەی مـانگی فبرایـەردا نـاپلیۆن چـاوی بەکارمەنـدێکی گـەنج کـەوت بـەناوی دوشابولون، کەبۆ دورگەی ئالپ هاتبوو ولەلایەن ( مارە)ی وەزیری کاروبـاری دەرەوەی پێـشوی ئیمپراتۆریـەتی ناپلیۆنـەوە نێردرابوو، ناوبراو ئەو گەنجەی ناردبوو هـەواڵی ئـەوە بـەناپلیۆن بگەیـەنێت هـەموو گـەلی فەرەنـسا لەدەسـت زۆرو سـتەمی بوربنەکان بێزاربوون و باروداۆخەکە ئاسایی نییەو هەموو سوپاش یەك کەس بەفەرماندەی خۆیان دەزانن ئەویش ناپلیۆنە.

ئەم ڕاپۆرتە زۆر گرنگبوو کەلەلایەن مارەی نیشتەجێی پاریسەوە بەناپلیۆن گەیشت، ناپلیۆن پێش گەیشتنی ئەم پەیامـەش ئاگاداری زۆر شتبوو.

هەرچۆنێکبێت دوای ئەم هەواڵە ئیمپراتۆر دوا بڕیاری خۆیدا.

لەو ڕۆژانەدا لیتیسیای دایکی ناپلیۆن لای کوڕەکەی بوو، ئەوخاتوونـە ژنێکـی ژیربـوو و وورەیـەکی بـەهێزو پیاوانـەی هـەبوو وناپلیۆن لەهەموو بنەماڵەکەیان زیاتر ڕێزی لەئەو دەگرت، بۆیەپێش هەموو کەس ئەونەخشەیەی خۆی لای دایکـی باسـکردو سەرەتا گوتی: ( من ناتوانم لەم دورگەیەدا بمرم وتەمەنم لەئاسایش و ئارامیدا بەسەربەرم و ئەمـەش لەگـەڵ سروشـتی منـدا نایەتەوە، سوپا پێویستی بەمنەو پێموایە هەرکەمنیان بینی بەرەو پیرمـەوەدێن، بێگومـان لەوانەیـە لـەڕێگادا توشـی شـتی چاوەڕواننەکراو ببمەوە، لەوانەیە ڕووبەڕووی ئەفسەرێك ببمـەوە کـەبۆ بوربنـەکان بـەوەفابێت ونەیـەڵێت سـەربازەکان زەوق شادی خۆیان لەبینینی من دەربـبڕن ولـەماوەی چـەند سـەعاتێکدا بکـوژرێم، بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا ئـەم کۆتاییـە باشـترە لەمانەوەی زۆرم لەم دورگەیەداو خۆبەدەستەوەدانم بۆئەو ئایندەیەی لەچاوەڕوانی مندایە، بۆیـە دەمـەوێت بـڕۆم وجـارێکیتر بەختی خۆم تاقی بکەمەوە، ڕای تۆ چییە دایکە ؟).

لیتیسیا بەم پرسیارە چاوەڕواننەکراوە تەواو شڵەژاو نەیوانی دەستبەجێ وەڵامی بداتـەوەو تـەنها گـوتی: لێمگـەڕێ باچـەند ساتێ بیری لێبکەمەوە، دوایە ڕای خۆمت پێدەڵێم ) دوای بێدەنگییەکی دووور درێژ گوتی: کوڕم، بـڕۆ بـەدوای چارەنووسـی خۆتبکەوە، لەوانەیە هەوڵەکەت ناکامی لەدوابێت ودواتر نامرادبیت وئینجا مەرگت بێتەپێش، بەڵام هەرچۆنێکبێت تۆ ناتوانیت



لێرەدا بمێنێتەوەو من ئەمە بەچاوی خۆم دەبینم، هەروەها ئومێدەوارم ئەوخوایەی کەتۆی لەناو ئەوهەموو شەڕانەدا پاراستووە جارێکیتریش پارێزگاریت لێبکات؟ ئینجا لیتیسیا تونْد ناپلیۆنی کوڕی بەباوەشی خۆیەوە گوشی.

ناپلیۆن ماوەیەك دوای ئەم قسانە لەگەڵ دایکیدا بانگهێشتی ئەو ژنرالانەی کرد کەلەگەڵیدا هاتبوون بۆ دورگەی ئالْب، واتە دورئو و برتران و کامبرون، ئەم دوو ژنرالانەی دوایی بەوپەڕی خۆشی وشادییەوە ئەم هەواڵەیان پەسەندکرد، بەلاّم دورئو کەگومانی لەسەرکەوتنی ئەمەبوو بەناپلیۆنی گوت: خۆ گەورەم ئیتر خەیاڵی ئەوەت نییە بەسەر کوتکەرانە فەرمانڕەوایی بکەیت ونیازی شەڕکردنی ترت نییە؟

ناپلیۆن گوتی: بەپێچەوانەوە دەمەوێت لەفەرنسییەکان گەلێکی ئازاد دروستبکەم، ئەمە بەرنامەی سیاسی تازەی ئیمپراتۆر بوو، خۆئەگەر نەشیویستبا جێبەجێبکات، ئەوا بەلانی کەمەوە لەڕووی تاکتیکییەوە کارەکەی خۆی بەودروشم و پروپاگەندەیە دەستپێدەکرد، ناپلیۆن فەرمان ورێنماییەکانی خۆی بەئەوانە ڕاگەیاندو گوتی: ( پێتان وانەبێت بمەوێت فەرەنسا بەزۆری چەك ڕزگاربکەم، بەڵکو دەمەوێت لەوێدا وەدیارکەومەوەو لەکەشتی دابەزم و ئامانجەکانم ئاشکرابکەو مافی خۆی لەبەدەستکەوتنەوەی تەخت و تاراجی ئیمپراتۆری دەستبکەوێتەوەو بهێنەوە دەستی.

باوەڕی ئەو بەکەسایەتی وڕێزی خۆی زۆربوو کەوێنای ئەوەی دەکرد بەبێ کێشەو هەر لەیەکەم دەرکەوتنیەوە بەبێ هیچ ڕێگرییەك دەچێتەوە پاریس، بۆیەنەبوونی هێزی سەربازی نەببووە لەمپەڕ لەبەردەم ڕێگاکەیدا بۆئەگەری ئەوەی کەگەڕاشەوە شەڕ خاکی فەرەنساو ڕوو بەڕووبوونەوەی لەگەڵ سەربازانداو دەستگیرنەکرێت، هەندێك سەربازو چەکی لەگەڵخۆیدا بردن کەبریتی بوون لە (600) سەربازی نارنجۆك هاوێژو تفەنگداری گاردی تایبەتی خۆی وسەد سەربازی سوار کەهەموویان (824) کەس بوون وئەم سەربازانەش بۆ پاراستنی گیانی ناپلیۆن لەسەرەتای گەیشتنی بەخاکی فەرەنسا بەسبوون ولەوێ بەولاوە توشی مەترسی نەدەبۆوە.

تیپێکی سەربازی کەپێکهاتبوولە (300) کەس و سەریە لەشکری (35) بوو، پێشتر وەك سەربازگەیەك لەو دورگەیەدا دامەزرابوون لەژێر دەسەڵاتی ناپلیۆندابوون.

کۆی گشتی ئەو سەربازانەی دەیانتوانی بجەنگن (1100) سەربازبوون و ناپلیۆن بڕیاریدا هەموو ئەمانە لەگەڵخۆیدا ببات، هەموو ئەو کارانەی بۆ خۆسازدان دەکران بەنهێنی بەڕێوەدەچوون وناپلیۆن فەرمانی بەسێ ژنرالەکەی کردبوو هەموو شتێك هەتا ڕۆژی(24/ی فبرایەر) ئامادەبکەن.

لەپاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا هەموو ئەو (1100) سەربازە بەڕێ کەوتن و چوون لەبەندەری دوگەکەدا سواری کەشتی بوون، هیچ یەك لەوسەربازانە نەیانـدەزانی بۆکوێ دەچن ومەبەست لەوکەشتی سواربوونەیان چییە! چونکە لەلایەن هیچ لێپرسراوێکی بالاّی سەربازییەوە هیچیان پێنەگوترابوو، بەلاّم هەموو ئەو سەربازانە پێش سواربوونیان لەکەشتییەکان پێشبینیان کردبوو، بۆیە هەرکە ئیمپراتۆریان بینی لەگەڵ سێ ژنرال وچەندین ئەفسەری گاردی تایبەتی خۆیدا بۆ بەندەرەکە هاتن، بەهاتوهاواری شادی وخۆشییەوە پێشوازیان لەئەوکرد.

لیتیسیای دایکی ناپلیۆن، کەهاتبوو ماڵئاوایی لەکوڕەکەی بکات، بەنائومێدیانە لێی دەڕوانی.



کاتێ هەموویان سواربوون کەشتییەکان لەسەعات (7)ی ئێوارەدا چارۆکەکانیان هەڵداو بەیاریدەی ئەوە شنەبایەی لەوکاتەدا دەهات بەرەو خۆرهەڵات دورکەوتنەوە، کەشتییە تیژڕەوە جەنگییەکانی بریتانیاو کەشتییەکانی هێزی سەربازی پاشای فەرەنسا کەبەردەوام لەونزیکانە لەگەڕاندابوون، یەکەم ئەگەری مەترسی بوون کەناپلیۆن لەگەڵیاندا توشی شەڕبێتەوە.

لەڕێگادا یەك کەشتی جەنگی فەرەنسی بەتەك کەشتییەکانی ناپلیۆندا تێپەڕی ویەکێك لەئەفسەرەکانی سەر ئەو کەشتییە بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد ( ئەو پیاوە مەزنە چۆنە ؟).

لێپرسراوی کەشتییەکەی ناپلیۆن لەوەڵامدا گوتی: ( زۆر باشە ) شەڕ ڕووینەدا، چونکە سەربازەکانی ناپلیۆن خۆیان پەنادابوو ودیارنەبوون وسەرنشینانی کەشتییەکانی پاشای فەرەنسا هیچیان نەبینی جێگای سەرنجبێت، خۆشبەختانە کەشتییە جەنگییەکانی بریتانیاش لەکەشتییەکانی ناپلیۆن هەڵنەهەنگوتن، ڕێگای دەریا سێ ڕۆژی خایاند، چونکە ئەو بایەی لەباشورەوە دەهات کەم بێوە، لە سەعات ( 3)ی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی یەکەمی مانگی مارسی ساڵی (1815)دا هێزەکانی ناپلیۆن گەیشتنە ناوی کەنداوی ژوان ولەنزیك تەنگەبەری ئانتیبدا دابەزین، سەرەتا ئیمپراتۆر دابەزی ودواتر فەرمانیدا سەربازەکانیش دەستبکەن بەدابەزین، سەربازەکانی سەربازگەی گومرگی ئەوشوێنە بەپەلە بەرەوپێشهاتن و هەر کەئیمپراتۆریان بینی کڵاوەکانیان وەك نیشانەی سەلام جوڵاندو لەخۆشیاندا دەستیانکرد بەقریوەو شادی دەربڕین.

ناپلیۆن کامبرونی لەگەڵ چەند سەربازێکدا بۆ کان نارد، هەتا ئازوقەو پێداویستی دەستەبەربکات، دەستەوبەجێ ئازوقە سازکراو ناپلیۆن بەخۆیی وئەوهێزە کەمەیەوە بەرەو سەروو کەوتەڕێ و ئەوچوار عەرەبانە تۆپەی کەلەپورتوفراژۆوە لەگەڵخۆیدا هێنابوونی لەوێدا جێی هێشتن.

بڕیاریدابوو لەڕێگای شاخەکانەوە لەپشت ناوچەی دوفینەوە بەرەوپێش بڕوات، لەگراسدا بانگەوازێکی بۆ سوپای گەلی فەرنسا بەچاپگەیاند، گراس و کان بەبێ شەڕ کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆن، دواتر بێنەوەی خاوەخاوبکات لەڕێگای گوندی سرنونەوە درێژەی بەپێشڕەویەکەیداو بەدینی و گاپدا، بەرەو گرەنوبل ڕۆیشت.

فەرماندەی سەربازگەی گرەنوبل بڕیاری شەڕکردنی دابوو، بەڵام سەربازەکان گوتبوویان هیچ هێزێك لەدنیادا ناتوانێت ناچارمانبکات ڕووی چەکەکانمان بکەینە ئیمپراتۆر، دیاربوو ترس وپەشێوی باڵی بەسەر بۆرژوازیەتی گرەنوبلدا کێشابوو، هەندێك لەئەشرافەکانی شار چووبونەلای دەسەڵاتدارانی شارو داوایان لێکردبوون شەڕبکەن، بەشێکیشیان پێشتر تێیانقوچاندبوو.

لەڕۆژی(17/ی مارس)دا چەند یەکەیەکی سەربازی کەلەپایتەختەوە نێردرابوون بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ ناپلیۆندا گەیشتنە شاری گرەنوبل، ئەم هێزە بریتی بوون لە(2) تیپی پیادەو تۆپخانەیەك و یەك تیپی سەربازی سوار.

وردەوردە ئیمپراتۆر لەشار نزیکدەبۆوە ئەوساتەوەختە پڕ تەنگژەو ناهەموارە نزیکدەبۆوە، بەدڵنیاییەوە شەڕکردن لەگەڵ ئەوهێزە زۆرەی دوژمن لەئارادانەبوو، یەکە سەربازییەکانی پاشای فەرەنسا، دەیانتوانی لەدوورەوە ناپلیۆن و ئەوانەی دەوروبەری بەدووربین ببینن وتێکیانبشکێنن وکەسێکیشیان لێنەکوژرێت، چونکە ناپلیۆن یەك تۆپیشی بەدەستەوە نەبوو بۆ پەرپەرچ دانەوەی ئەوان.



بەرەبەیانی ڕۆژی(7/ی مارس) ناپلیۆن گەیشتە لامور، لەدوورەوە ئەو لەشکرەی کەلەدەوروبەری ڕێگاکەدا دامەزرابوون ئامادەی ئەوەبوون پردی پنگو بتەقێننەوە، دیاربوون.

ناپلیۆن ماوەیەکی دوورو درێژ بەدووربین سەیری ئەو هێزەی کرد کەدژی ئەو دامەزرابوون، ئینجا فەرمانی بەسەربازەکانی خۆیدا تفەنگەکانیان لەبن هەنگڵی چەپیان بگرن وبالولەکەیان لەلای خوارێبێت وبکەونەڕێ، بۆخۆشی لەپێشەوەی هەموویان بەرەو لولەی تفەنگەکانی سوپای دوژمن کەوتەڕێ، فەرماندەی سەربازەکانی سەیرێکی سەربازەکانی کردو دواتر تەماشایەکی جێگرەکەی کردوو وگوتی ( بەو سەربازانەی هەرکە ئەو پیاوەیان بینی کەوتنە لەرزین و وەك مردوو ڕەنگیان پەڕی، چۆن دەتوانرێت شەڕبکرێت؟) ئینجا لێپرسراوی ئەوهێزە فەرمانی بەسەربازەکانی کرد بکەونە پاشەکشە، بەڵام نەیانتوانی بەرەو دواوە بکشێنەوە، چونکە ناپلیۆن پێشتر فەرمانی بە (50) سەربازی سواری خۆی کردبوو ڕێگای پشتەوەیان لێبگرن، سەربازە سوارەکانی ناپلیۆن هاواریان دەکردو دەیانگوت (هاوڕێیان، تەقەمەکەن، ئەوە ئیمپراتۆرە کەبەرەو ڕووتاندێت).

لێپرسراوی سوپای دوژمن فەرمانی بەڕاوەستاندا ئینجا ناپلیۆن بەرەوپێشهات، سەربازەکان لەجوڵە کەوتن و وەك سینگی داکوتراویان لێهات وبەسەرسامییەوە سەیری ئیمپراتۆریان دەکرد کەبە باڵتۆ بۆرەکەیی وکولاوە بچوکەکەیەوە بەرەو ئەوان هەنگاوی دەنان، لەنێوان ئەو بێدەنگییەدا دەنگێك بەرزبۆوەو گوتی (ئەی سەربازانی تیپی پێنجەم من ئیمپراتۆری ئێوەم، دەمناسنەوە؟).

لەپڕ تێکڕا سەربازەکان هاواریانکردو گوتیان بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ.

ناپلیۆن یەخەی کراسەکەی کردەوەو سینگی بەڕووتی نیشانی سەربازەکان داو گوتی ( ئەگەر لەنێوان ئێوەدا سەربازێك هەیەو دەیەوێت گوللە بەئیمپراتۆرەکەی خۆیەوەبنێت ئەوە سینگی منە) بینەرانی ئەم ڕووداوە کەهەتا کۆتایی تەمەنی خۆیان ئەو هاواری شادی وخۆشییەی سەربازەکانیان بیرناچێتەوە کەچۆن ڕیزەکانی خۆیان تێکداو بەرەو ئیمپراتۆر ڕۆیشتن.

هەموویان لەدەوری ئیمپراتۆر کۆبوونەوەو دەست وقاچی ئەویان ماچدەکرد، لەوکاتەی کەوتبوونە خۆشی وشادیەکی زۆرەوە هەندێکیان کوڵیان هەڵسابوو دەگریان، دوای ئەمە بەزەحمەت هێورکرانەوەو دواتر ڕیزەکەی خۆیان گرتەوەو بەرەو گرەنوبل کەوتنەڕێ، هەموو ئەو یەکە سەربازیانەی کەبۆ شەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا لەگرەنوبلدابوون یەك لەدوای یەك هاتنەگەڵ هێزەکەی ناپلیۆن.

سەرهەنگ لابەدوایر فەرماندەی یەکێك لەتیپە سەربازیەکانی کەلە(7/ی مارس)دا هاتبوون بۆ گرەنوبل، بەنیازی شەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا، یەکە سەربازیەکەی خۆی لەمەیدانی گەورەی شاردا کۆکردەوەو بەرەو پیری ناپلیۆن چوون، ناوبراو تەنانەت ئاگای لەوەشنەبوو لەلاموردا ڕووی دابوو. ناپلیۆن بەهێزەکەیەوە بەوجوتیارە داس و تفەنگە کۆنە بەدەستانەی کەلەگەڵی کەوتبوون گەیشتە گرەنوبل، کرێکارانی عەرەبانە دروستکەر یەکێك لەدەروازەکانی شاریان دەرپەڕاندبوو هەتا ڕێگای هاتنەناوەوەی هێزەکەی ناپلیۆن کراوەبێت.

لێپرسراوانی پایەبەرزی شار هاتنەخزمەت ناپلیۆن، ناپلیۆن لەگەڵ پێشوازیکردن لەمانە دەیگوت: بڕیارمداوە ئازادی و ئاشتی بەمیللەت بدەم، دانیشی یەوەدادەنا کەلەپێشوودا شەیدای مەزنی و بەرفراوانکردنی پانتایی خاکی فەرەنسابووە، بەڵام لێرە



بەدواوە سیاسەتێکیتر دەگرێتەبەر بەتایبەت تائکیدی لەسەرئەوە دەکردەوە ئەو ئارەزوەی لەڕابردوودا هەیبووەو ویستویەتی فەرمانڕەوایی هەموو گەلانی دنیابکات وبۆ فەرەنسای دەستەبەربکات بیبەخشن.

هەروەها سووربوو لەسەر ئـەوەی گوندنـشینەکان لەدەست زوڵمی بوورینـەکان و لایـەنگرەکانیان ڕزگاربکـات وئـەو زەوی و زارانەی لێیانستێنراوە بۆیان بگەڕێنێتەوە، هەروەها تائکیدی لەسـەر ئەوەشـدەکردەوە ئـەو حکومەتـەی بۆخـۆی دروسـتی کردووە بگۆڕێت وبیکاتە شانشینێکی قانونی ودەوڵەتێکی ڕاستەقینە دابمەزرێنێت کەتێیدا نوێنەرانی میللەت ڕۆڵیـان هـەبێت لەکارو بارەکاندا.

هەموو ئەوکەسانەی پەیوەندیان بەناپلیۆنەوە دەکرد بەبێ هیچ کۆت وبەندیك لێیان دەبـورد، چـونکە دەیگـوت مـن بۆخـۆی لەوکاتەی بڕیاری بەرکەناربوونی خۆم ڕاگەیاند بەلایەنگرانی خۆم گوت خزمەت بەبوورینەکان بکـەن لـەپێناو فەرەنـسادا بۆیـە لەشکاندنی سوێندی بەئەمەکیان بۆ ئیمپراتۆر دەیبەخشێن..

بەڵام سەبارەت بەبوورینەکان ئەوان ئەوەیان نیشاندابوو کەلەگەڵ فەرنسای تازەدا ناگونجاون.

ناپلیۆن دوای ئەوەی چاوی بەویەکە سەربازیانە کەوت کەلەگرەنوبلدا پەیوەندیان پێوەکردبوو ولەشەش تیپ ویەك تۆپخانەی باش پێکهاتبوو، یەکسەرە بەرەو لیون کەوتەڕێ.

نوێنەرانی گوندەکان لەهەموو لایەکەوە بۆ پێشوازی ناپلیۆن دەهاتن، سوپایەك کەپێکهاتبوو لە (7) هەزار سەربازی جەنگی و(30) تۆپ لەپێش ئیمپراتۆرەوە دەڕۆیشتن، ئیمپراتۆر جارێکیتر خۆی بەفەرمانڕەوای فەرەنـسا دەزانیـەوە، ئـیتر لێـرەدوا دەیتوانی ڕوو بەڕووی سوپای پاشای فەرەنسا ببێتەوە، بەڵام ناپلیۆن هەرێی وابوو پێویست بەتەقانـدنی دەراغـی گوللـەی تفەنگی سەربازێکیش ناکات.

جگەلەمەش خۆی سەربازانی پاشا بونیان نیەو بونیشیان نەبووە، چونکە سەربازەکان هەمووی لەسوپای خۆیدابوون.

سوپای ناپلیۆن بەهۆی پێشهاتێکی نالەبارو بەختی ڕەش ماوەی یازدە مانگ لەژێر ئاڵای سپیدا مانەوە کەبـەئاڵای بێگانـان سەیردەکرا.

نزیکەی (3 –بۆ 4) هەزار گوندنشین لەگـەڵ نـاپلیۆن کـەوتبوون ولەهـەموو لایەکیـشەوە دەستەدەسـتە هـیتر دەهاتنەگـەل ئەمانە، گوندنشینەکان بۆ ڕەگەڵکەوتن گوند بۆگوند دەستەیەکی تازەتر دەهاتنەجێگای ئەو دێهاتیانەی پێشووتر کەوتبوونە گەڵێ، دەهاتن خواردن وکەلوپەلیان دەهێناو ئامادەیی وخزمەتکردنی خۆیانیان بەناپلیۆن ڕادەگەیاند.

تەنانەت خودی ناپلیۆنیش کەباوەڕی تەواوی بەئەستێرەی بەختی هەبوو، پێشبینی ئەمەی نەکردبوو، ئـیتر گومـانی ئـەوەی نەمابوو تاچەند ڕۆژێکیتر دەگاتە پاریس، چونکە کەس نەدەیتوانی پێشی پێبگرێت ؟ دەروازە داخـراوی شـارەکان بەڕوویـدا دەکەوتنە سەرپشت ودەکرانەوە.

بـەمجۆرە نـاپلیۆن وەك کەسـێکی سـەرکەوتوو لەشـەڕ بـەرەو لیـون دەچـوو، لەگـەڵ ئەمانەشـدا لـەڕێگادا فـەرمانی تـازەی دەردەکردن، نێردراوی بەملاولادا دەنـاردن، هەواڵـەکانی پێدەگەیـشتن، فەرمانـدەی تـازەی بۆیەکـە سـەربازییەکان دادەنـاو کارمەندی تازەی بۆ خزمەتدادەنان.



لەئێوارەی ڕۆژی(5/ی مارس)دا، هەواڵی دابەزینی ناپلیۆن بۆ سەر خاکی فەرەنسا بەهۆی تەلگرافەوە بەلویسی هەژدەهەم ڕاگەیێندرا، هەتا ئەوکاتەش خەڵکی پاریس هیچ هەواڵێکیان سەبارەت بەڕووداوەکان نەبوو وپاشا فەمانی دەرکرد کەس ئەوهەواڵە بڵاونەکاتەوە.

تەنها لەڕۆژی(7/ی مارس)دا ڕۆژنامەکان توانیان ئەم هەواڵە بڵابکەنەوە، کاری گەری ئەو هەواڵە یەکجار زۆربوو، سەرەتا سەریان لەوە سوڕمابوو چۆن ناپلیۆن توانیویەتی لەدورگەی ئالبەوە بێتەسەر خاکی فەرنساو خۆی لەچنگ هەردوو هێزی دەریایی بریتانیاو فەرنسا قوتاربکات کەپاسەوانی ئەو دورگەو دەریای سپیان لەئەستۆدابووە؟

هەروەها خەڵك پرسیاری ئەوەیان دەکرد ئەی دواتر چۆن دوای ئەوەی خۆی گەیاندۆتە ڕۆخەکانی خاکی سەردەریای فەرەنسا، بەوهێزە کەمەیەوە ڕانەوەستاوە.

دەوڵەت پێی وابوو چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە زۆر درێژە ناکێشێت و ئەو پیاوەن، عەقڵی خۆی لەدەستداوە، چونکە دەستبردن بۆ کارێکی ئاوا تەنها کاری کەسێکی شێتە.

وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا دامودەزگاکانی ئاسایشی دەوڵەت هەستیان بەڕاستییەکی مەترسیدارکردبوو کەشۆڕشییەکان و ژاکوبنەکان و بێ دینەکان وپاشماوەکانی شۆڕشی مەزن، دەمێکبوو بەدەستە دەستە ناسرابوون و لەژێر چاودێریدابوون، بەئاشکرا شادمانی خۆیان دەردەبڕی لەگەڕانەوەی پیاوە سەرکوتکەرەکەی شۆڕشی مەزنی لەناوبردبوو، کەساڵەهای ساڵ خەریکی گەڕان وراوەدونانی لایەنگرانی شۆڕشبوو.

سەرەتای دەربڕینی شادمانی خەڵك چ هەواڵێکی ئەوتۆ دڵخۆشکەر نەبیسترابوو، گوێبیستی ڕووداوەکانی گرەنوبل و گوتەکەی ناپلیۆن نەببون کەباسی ئازادی بێ کۆت و بەندی کردبوو.

لەو ڕۆژانەدا بەتایبەت برژوازیە گەورەکانی پاریس و ئەشرافەکان تەواو دڵنیگەران ببوون، پێش هەموویان برژوازیەکان لەسەرهەڵدانی شەڕێکی تازەو ڕاوەستانی ئاڵوگۆڕو بازرگانی دەترسان، ئازادیخوازانی مەشروتە خواز لەسەرکەوتنی ناپلیۆن وگەڕانەوەی ئیمپراتۆریەتی سەربازی دەترسان، چونکە ئەمانە ئومێدی ئەوەیان هەبوو لەسایەی حکومەتی مەشروتەی بوربنەکانەوە دەستیان بەمەبگات، بەڵام لایەنگرانی سیستمی شانشینی، بەتایبەت ئەو ئاوارانەی لەساڵی (1814)دا لەگەڵ بوربنەکاندا گەڕابوونەوە، سامێکی مەرگبار باڵی بەسەردا کێشابوون، ئەوانە تەواو عەقڵی خۆیان لەدەستدابوو لەترسێکی زۆردا دەژیان وچاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد سەریشیان تێدابچێت، دێوەکەی[280] دێوەکەی دورگەی کرس، چی لەمانە دەکرد؟

تاریمایی خوێنی میردانگێن هاتبۆ بەرچاوی بوربنەکان ودەست و پێوەندەکانیان بەرچەستەببوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لویسی هەژدەهەم نەیدەویست، باوەڕبکات مەترسییەکی جددی هەڕەشەی لێدەکات.

هەواڵ دوای هەواڵ دەگەیشت کەناپلیۆن لەڕێگای ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو گرەنوبل دێت، ئێستا ڕووداوەکان بەتەواوی بەلێپرسراوانی دەوڵەت نەگەیشتبوون، بەڵام دەیانزانی سەربازەکان جێگای پشتپێبەستن نین، مارشاڵ و ژنراڵەکان زۆریان لەخزمەتی سەربازیدا مابوونەوە، ئەگەری ئەوەشهەبوو ئەفسەرەکان نەکەونە گەل ناپلیۆن، بەڵام سەربازەکانی سەربازگەکانی

---

[280] -مەبەست لەناپلیۆنە.(و-کوردی).



پاریس شادی وخۆشی خۆیان نەدەشاردەوە. پاشا بڕیاریدا کەسێك بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی ناپلیۆن بنێرن کەدوای ئیمپراتـۆر لەناو سوپادا لەهەموو کەس زیاتر بەناوبانگەو خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزە، ئەو پیاوەش مارشال نی بوو، نی بەڕووکـەش پەیوەندی پتەوی لەگەڵ بوربنەکاندا هەبوو وئەو یەکێکبوو لەوکەسانەی لەساڵی (1814)دا دەستلەکار کێشانەوەی ناپلیۆنی بێسڵێنەوە پەسەندکردبوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناپلیۆن داری مارشاڵی دابۆ ئەو و وەك نازناوی شانازی میری پێدەگوت، جگەلەمانەش نی بەلای سەربازەکانەوە جێگای شانازی بوو کەناپلیۆن ناوی نابوو، ئازای ئازاکان.

هەرکاتێ ئەم پیاوە ڕازیبا فەرماندەیی سوپا بگرێتەدەست، لەوانەبوو سەربازان ملیان بۆ فەرمانەکان دابا، هەتا ئەگەر دژی ناپلیۆنیشبیان.

مارشال نی بۆخزمەت پاشا بانگهێشتکرا، نی دژی ئەو ڕەفتارەی ناپلیۆن بوو وپێی وابوو دەبێتـەهۆی ئەگبـەتی وئەهامـەتی فەرەنسا، ئەو شمشێر وەشێنە پڕجۆش وخرۆشـە ئـەم سـەربازە تووڕەیـە، تەسـلیمی پاڕانـەوەو تکـا دووبارەکـانی پاشـاو دەربارییەکان بوو وگوتی ( گەورەم هیوادارم بتوانم ناپلیۆن لەناو یەك قەفەزی ئاسندا بهێنمە خزمەت تۆ ) پێشنەوەی مارشال نی بکەوێتەڕێ بۆشەڕکردن لەگەڵ ناپلیۆندا هەواڵی ناخۆش بەبوربنەکان گەیشت.

سەربازەکان بێ ئەوەی شەڕبکەن دەستەدەستە خۆیان تەسلیمی ناپلیۆن کـردوەو وڵات ولایـەت بەولایـەت و شاربەشـار بـێ ئەوەی هیچ بەرگری بکەن دەکەونە بەرپێی ئیمپراتۆرو خۆیـان بەدەسـتەوە دەدەن و زۆرشـتیتر باسـدەکرا کەهـەموو لایـەك وێنایان نەدەکرد... دەبوا بەهەر نرخێك با لیونیان لەدەست نەچوبا، چونکە لیون لەڕووی دەوڵەمەندی ژمارەی دانیـشتوان‌و گرنگی سیاسییەوە لەدوای پاریس دەهات.

کنت دارتـوای بـرای پاشـا کـەپڕوپوچ تـرین کەسـی بنەماڵـەی بۆربۆنـەکان بـوو، بـەو ئومێدەی ئـەوەی بتوانێـت کرێکـارانی کارخانەکانی ڕستن‌و چنینی لیون ناچاربکات دژی ناپلیۆن ببنەوە، چوو بۆ ئەوشارە.

مارشاڵ ماکدۆناڵد، کەبنەماڵەی پاشا بەبارتەقای مارشال نی متمانەیان پێبوو، ئەویشیان بەفەرماندەیی چەند لەشکرێك نارد بۆ لیۆن، ماکدۆنالد پردەکانی گرتن‌و چەندکاری بەرگری کردنی تری کردو پێـی باشـبوو بـۆ ناسـاندنی کنت دارتـوا، لەگـەڵ ناوبراودا بچێت بۆ بەسەرەوە گەرانی سەربازەکانی تەداروکی، لەو نمایشەدا ناوبراو بەدەرکەوت وخێرا یەکێك لەژەنەراڵـەکان بەپرتاوی هاتەلای مارشاڵ نی و گوتی: بۆ سەلامەتی گیانی کنت دارتو باشتروایە ناوبراو هەرچی زووترە لێرە دووربخەینەوە، مارشـال نـی گـوێی بـەم ئاگادارکردنـەوە نـەداو لەگـەڵ کنـت دارتـودا چـووەناو سـەربازەکان‌و گوتەیـەکی بۆسـەربازەکان پێشکەشکردوو لەقسەکانیدا ئاماژەی بەوەکرد ئەگەر نـاپلیۆن سـەربکەوێت دووبـارە شـەڕ دژی ئـەورووپا دەسـتپێدەکاتەوەو فەرەنسا دەکەوێتەوە ژێر هەڕەشە، ئینجا داوای لەسەربازەکانکرد پێشوازی لـەکنت دارتـوا نوێنـەی پاشـا بکـەن‌و بـەزەوق‌و شادییەوە بڵێن بژی پاشاو بەمجۆرە وەفاداری خۆتان بۆ بوربنەکان دوپاتبکەنەوە.

بەبێدەنگییەکی مەرگبارەوە گوێ لەوگوتەیەی ماکدۆناڵد گیرا.

کنت دارتوا کەتوشی ترس‌و سەرسامی ببوو بەپەلـەپڕوزاوان ئـەو شـوێنەی جێهێشت‌و هەڵاتـەوە بـۆ پـاریس، ماکدۆناڵـد بـۆ کاروباری بەرگری کردنی سەربازی لەلیۆندا مایەوە، سەربازەکان وەڕەس‌و بێزاربوون‌و دژبەئیرادەی خۆیـان کاریـان دەکـرد. یەکێك لەسەربازەکان لەمارشاڵ ماکدۆناڵد نزیکبۆوەو گوتی ( بەڕێز مارشاڵ، هەموو ئەوکارانە دروستن، بەڵام حەقبوو دەست



لەبورینەکان شلبکەیتو بکەویتە گەل ئێمە، تۆ دەبەینەلای ئیمپراتۆرو ئەو بەبینینی تۆ زۆر خۆشحالدەبێت. ماکدۆناڵد، وەلامی ئەو سەربازەی نەدایەوە.

هاواری گوندنشینەکان کەلەئاوایی گی یوتی یر دا بەرز بێووەو دەیانگوت بژی ئیمپراتۆریەت بمرن ئەشرافەمان. نیشانەی نزیکبوونەوەی پێش سوپایانی ناپلیۆنی نیشاندەدا کەبەرەو شاری لوێن دێن.

وردەوردە پێشەنگی سەربازە سوارەکانی ناپلیۆن دەگەیشتنە شار، هەتا ئەوکاتەش مالدوناڵد بیری لەشەرکردن دەکردەوەو چووەناو یەکە سەربازییەکانی، بەلام سەربازە سوارەکانی ئەو کەلەپیشەوەی شکرەکە بوون هەرکەچاویان بەسەربازە زنهار پۆشەکانی ناپلیۆن کەوت هاواریانکردوو گوتیان: بژی ئیمپراتۆرو بەرەوپیریان چوون، لەساتیکدا هەموو سەربازەکانی مارشال ماکدوناڵد تێکەلاوی سەربازەکانی ئیمپراتور بوونو یەك یەکێتیان پێکهێنا.

ماکدو ناڵد لەترسی ئەوەی نەبێتە دیلی دەستی سەربازەکانی خۆی لەومەیدانە خۆی دوور خستەوەو بەسواری ئەسپەکەی بەدەشتاییەکەدا هەلات. نیو سەعات دوای ئەوە ناپلیۆن گەیشتەناو شارو بێئەوەی هیچ تەقەیەك بکرێت شار خۆیدا بەدوستەوە.

ئەو رۆژە(10)ی مارس بوو (9) رۆژ بەسەر دابەزینی ناپلیۆن لەسەر خەلیجی ژوان تێپەڕیبوو.

بەرەبەیانی رۆژی یازدەی مارس، ناپلیۆن بەتایبەتی چوو سەردانی ئەوسەربازانەی کرد کەهەژدی بۆ پشتگیری سوپاکەی لەلیۆدا ناردبوونی.

فلوری دوشابولون کەلەهەموو شوێنێکدا لەگەل ناپلیۆن بوو، ئاوای نووسیبووە(هەموو پردو ژێرنواو کۆلانو شەقەتمەکان پڕببوون لەژنو منالو پیرەمێردی رەشو روت، خەلك خۆیان بەزینی ئەسپەکەیانەوە دەنووساندو دەچوونە سەر شوێنی بەرز هەتا ناپلیۆن ببینن و دەست لەجلوبەرگەکانی بخشێنن، رۆژانێکی راستەقینەی میللەت دروستببوو).

ناپلیۆن بەو هەموو وبروایەی کەبەخۆی بوو، بەپشت بەستن بەوقسانەی دەیکردن، هەرگیز چاوەڕوانی سەرکەوتنی ئاوای نەدەکرد.

ناپلیۆن لەکاتی چارپێکەوتنی دەسەلاتدارانی حکومی لەلیودا هەمان ئەوقسانەی دوبارە کردنەوە کەلەگرەنیول وشوێنەکانیتردا کردبوونی.

(لەناو خۆدا کاریۆ ئازادی فەرەنسا دەکەم، لەرووی دەرەکیشەوە ئاشتی کردن، هەتا بنەماکانی شۆرشی مەزن جێگیرتر بێت، ناپلیۆن تێبینی ئەوەی کردبوو رۆژگار گۆراوەو ئیتر لێرەودوا دەبێت تەنها بەفەرەنسا قەناعەت بکاتو بیرۆکەی دنیا خستنە ژێر دەسەلاتییەوە لەسەری بەدەرنی) لەلیواندا بریاری هەلوەشاندنەوەی ئەنجومەنی پاریسو نوێنەرانی هەلوەشاندەوە، ئەو قانونەی کەبەپێی ئەو بورینەکانی بەرەسمیو دەستوری ناساندبوو، مۆرکردو هەموو ئەوقانونو رێساپانەی کەبەبریاری بۆرینەکان لەدادگادانددا پەیرەودەکرا پوچەلی کردنەوەو قازی تازەی دانان، بەلام زۆریەی پارێزگارەکان کەبۆرینەکان لەسالی(1814)دا نەیانتوانیبوو بیانگۆرن وەك خۆی دایانەوەو نەیگۆرین، لەلیۆندا بەنەهێشتنی دەسەلاتی بورینەکانو لابردنی قانونی بنچینەیی ئەمانە، بەرەسمی توانای کەوتەدەست، دواتر بەخۆییو (15) هەزار کەسەوە بەرەو پاریس کەوتەرێ، ناپلیۆن لەکاتی دابەزینی لەکەنداوی ژوان قسەیەکی کردبوو لێرەشدا هەمان قسەی دووبارە کردەوە و گوتی



(هەلۆکە بەئالای سپی رەنگی میللییەوە لەبورجیکی زەنگی کلێساوەدەچێت بۆ بورجێکیتر هەتا بگاتە قوللەی زەنگەکانی نتردام).

ناپلیۆن بەبێ هیچ روو بەروبونەوەو شەر درێژەی بەرۆیشتنەکەی خۆیداو بەماکون و هەموو ئەو گوندانەی دەهاتنەسەر رێگای بەرەو شالون تێپەری، بەلام پێش گەیشتنی بەشالون دەبوا رووبەرووی مارشال نی بێتەوەو شەری یەکلاکەرەوەی لەگەلدابکات، ناپلیۆن نی باش دەناسیو دڵچاکی ئەوی خۆشدەویست، بەلام شیوازی بیرکەتنەوەکانی بەپەسەند نەدەزانی، ناپلیۆن کارامەی نی لەشەرەکاندا بینیبوو، سەرکێشیەکانی ئەوی لەگوللەبارانکردنی (سنوو سکوئە) و مۆسکۆدا بەبیرکەوتەوە وهیچ کات لیوەشاوەی ئەوی لەفەرماندەیی کردنی پێشەوەی سوپای مەزن لەکاتی پاشەکشە کردنی مۆسکۆدا بیرنەدەچۆوە، کەچوونەدەرەوەی لەماکون، هەوالی ئەویان بەناپلیۆن راگەیاندکە مارشال نی لەلون لوسونیەدا جێگیربووەو دەیەوێت پێشی پێبگرێت، ناپلیون هیچ لەوەنەدەترسا لەگەل ئەودا بکەوێتە شەڕ، ئەویە (15) هەزارسەربازەوە زۆرجار لەژیانی خۆیدا شەری لەگەل دوژمندا کردبوو. بەلام لێرەدا نەیدەویست خوێنرێژی روویدات، چونکە بەلای ئەوەوە ئەوە زۆر گرنگبوو بەبێ ئەوەی کەس بەکوشتبچێت فەرمان رەوای ولات بگرێتەدەستو بەمەش باشترین ئیمتیازی بۆ بەرەوپێشبردنی کارەکەی خۆی بەپێویست دەزانی.

نی، کەلەرۆژی (12/ی مارس)دا بەخۆیو چوار لەشکرەوە گەیشتبۆ لۆن و لوسونیە، چاوەروانی هاتنی سەربازیتری دەکرد کەلەلایەن پاشاوە لوسیی هەژدەهەم بۆیارمەتی دانی بنێردرێت، ناو براو لەوکاتانەدا پیی وابوو بەپێی وبڕدانی خۆی هەلسوکەوت دەکات، چونکە تاکەرێگای رزگاربوونی فەرەنسای بەلاچونی ئیمپراتۆری دەزانی.

ناپلیۆن لەکاتی راگەیاندنی دەست لەکارکێشانەوەی خۆیدا رێگای بەمارشانەکان دابوو خزمەتی بوربنەکان بکەن، ئیستاش ناپلیۆن بەلێنی خۆی لەگەل هاوپەیمانانداا شکاندو دوورگەی ئالپی جێهێشتوەو دەیویست جارێکیتر لەسەرتەختی پاشایەتی فەرەنسا دابنیشێتەوە، شەرێکیتری دژ ئەورووپا دابگیرسێنێتەوە. نی تەواو باوری بەوەهەبوو کەحەقیەتی لەدژی ناپلیۆن بجەنگێت ودەیزانی ئیتر لویسی هەژدەهەم هەموو ئومێدێکی بەوەوتەواو باوری پێی کردوەو پیشتی پێبەستووە، بەلام سەربازەکانی نی کەئەویان خۆشویست وتوشی دوودلیو بێدەنگێکی قوڵبوونەوە، نی لەگوتەیەکیدا کەبۆ سەربازەکانی گوت، گوتی: من بەدرێژای تەمەنی خۆم بێ درێغیکردن گیان لەسەردەست خزمەتی ئیمپراتۆریەتم کردووە، بەلام ئیستا بۆخۆتان دەبینن گەرانەوەی ئیمپراتۆر زیانی گەورە بەفەرەنسا ئەگەیەنێت، لەمەوشیان گرنگتر شەرکردن لەگەل هەموو ولاتانی ئەورووپادا، ئەو ولاتانەی کەبەهیچ کلۆجێك رازینین ناپلیۆن بێتەوەسەر کورسی دەسەلات، ئەو سەربازانەی کەبەبروو بەهانەی هەمەجۆرە نایانەوێت شەربکەن ئازادنو دەتوانن ریزەکانی سوپا جێبهێڵن، منیش بەوسەربازانەی کەدەمێننەوە رووبەرووی ناپلیۆن دەبمەوە.

ئەفسەرو سەربازەکان هەموویان بێدەنگبوون، نی بەکرژیو تورەییەوە گەرایەوەلای ستادەکەی خۆی و لەشەوی(13)لەسەر(14)ی مانگی مارسدا مارشال نی- یان لەخەو هەلساندو هەوالی ئەوەیان پێراگەیاند ئەو تۆپخانەی چاوەروانی دەکرد لەپاریسەوە بۆیارمەتی بنێردرێت، لەرێگادا هەلگەرانەوەو پەیوەندبان بەناپلیۆنەوە کردووە، لەبەرەبەیانی رۆژی(14/)ی مارسەوە هەتا پاش نیوەرۆش لێکلێك هەوالی هەمەجۆرە دەگەیشتو دەیانگوت شارەکان راپەریونو



داروده‌سته‌كانی حكومه‌تی پاشایان وه‌ده‌رناون وپێشوازیان له‌حكومه‌تی ناپلیۆن كردووه‌و ئیستا ئیمپراتۆریش به‌ره‌و لیون لوسونیه كه‌وتۆته‌ڕێ. له‌ناو جه‌نجاڵی ئه‌و هه‌واڵو په‌شێویه‌دا كه‌ڕۆحی مارشالانی جه‌نجالكردبوو وتوشی مه‌ینه‌تو په‌ژاره‌ی كردبۆوه، سه‌ربازه‌كانیش نه‌یاده‌ویست له‌گه‌ڵیاندابدوێن نه‌ئاماده‌شبوون وه‌ڵام بده‌نه‌وه، ته‌ته‌رێك گه‌یشته جێ وئه‌م په‌یامه‌ی دایه ده‌ستی نی( پێی بڵێ من ئیستاش خۆشمده‌وێت وه‌ك ئه‌وشه‌ره‌ی له‌به‌ره‌به‌یانی مۆسكۆ كرا، له‌باوه‌شیده‌گرم)

گومان و دوودڵی نی كۆتای پێهات: فه‌رمانی به‌لێپرسراوانی یه‌كه سه‌ربازییه‌كان كرد، ده‌سته‌وبه‌جێ سه‌ربازه‌كانیان كۆبكه‌نه‌وه، ئینجا بۆخۆی چووه به‌رده‌م سه‌ربازه‌كانی وشمشێره‌كه‌ی راكێشاو به‌ده‌نگێكی به‌رز هاواریكرد وگوتی: سه‌ربازان، بوربنه‌كان بۆهه‌میشه كۆتاییانهات ئه‌و بنه‌ماڵه قانونیه‌ی كه‌فه‌ره‌نسا بۆخۆی هه‌ڵیبژاردبوو ده‌گه‌ڕێته‌وه‌سه‌ر ته‌خت‌وتاراجی فه‌ره‌نسا... لێره‌ودوا پاشایه‌تی كردنی وڵاته‌جوانه‌كه‌ی ئێمه تایبه‌ت به‌ئیمپراتۆریه‌تی ناپلیۆن رابه‌ری خۆشه‌ویستی ئێمه‌ی ده‌وێت ! هاواری بژی ناپلیۆن بژی مارشاڵ نی، ده‌نگی ئه‌وی تێراونكرد، ده‌ستبه‌جێ ئه‌و ئه‌فسه‌رانه‌ی لایه‌نگری بوربنه‌كان بوون رۆیشتن‌و یه‌كێكیشیان شمشێره‌كه‌ی شكاندو مارشال، نییش رێگای پێ نه‌گرتن، ئه‌فسه‌رێك له‌مانه روویكرده مارشال نی وقسه‌یه‌كی شێوه سه‌رزه‌نشتی به‌مارشال نی گوت: ئه‌ویش له‌وه‌ڵامدا گوتی(به‌رای ئێوه ده‌توانرێت چ بكرێت؟ ئایا من ده‌توانم به‌م دوو ده‌ستانه‌م ده‌ریای جۆش وخرۆشكردوو هێوربكه‌مه‌وه؟ ئه‌وه‌ی سه‌یربوو ئه‌وه‌بوو دوای ئه‌وه‌ی نی بریاری گه‌رانه‌وه‌ی بۆگه‌ل ناپلیۆندا به‌وردی‌و لێزانانه‌وه هه‌موو فه‌رمانه‌كانی ناپلیۆنی موویه‌موو جێبه‌جێكردن، چونكه ناپلیۆن پێش نی شه‌رناكات ئه‌م فه‌رمانانه‌ی ناردبوو، چون ئه‌و هه‌ستی ده‌كرد، نی لوله‌ی تفه‌نگه‌كانی له‌وناكات.

له‌پاریس هه‌واڵی هاتنی ناپلیۆن بۆ لیون وشه‌رنه‌كردنی مارشال نی له‌یه‌ك كاتدا بڵاوبۆوه، هه‌ڵاتن ئه‌مه یه‌كه‌م بیرۆكه‌بوو كه‌بوربنه‌كان بیریان لێده‌كرده‌وه، هه‌ڵاتن پێشنه‌وه‌ی مه‌رگ میوانیانبێت، وه‌ك ته‌رمه‌كه‌ی میردانگین له‌خه‌نده‌كه‌كه‌ی ونسندا بۆگه‌ن بكه‌ن، په‌شۆكاوی ته‌واو باڵی به‌سه‌ر ده‌رباردا كێشابوو، لویسی هه‌ژده‌هه‌م سه‌ره‌تا دژی هه‌ڵاتن بوو، له‌ده‌ستدانه‌وه‌ی تاج وته‌ختی پاشایه‌تی به‌نه‌نگییه‌كی گه‌وره ده‌زانی.

به‌ڵام ئایا ده‌یانتوانی چ كارێكیتر بكه‌ن؟ ده‌ربار له‌سه‌ر دانانی پلانێك رێككه‌وتن، ئه‌ویش ئه‌وه‌بوو پاشا سواری گالسكه‌كه‌ی بێت وهه‌موو پیاوه خاوه‌ن پله‌وپایه‌كان وبنه‌ماڵه‌ی پاشاو رۆحانییه‌كان، شار جێبهێڵن وله‌پشت ده‌روازه‌ی شاره‌وه، هه‌موو ئه‌مانه راوه‌ستن وچاوه‌ڕوانی زۆرداربكه‌ن كه‌به‌ره‌و پاریس كه‌وتۆته‌ڕێ، كاتێ سته‌م كار پاشای قانونی لویسی هه‌ژده‌هه‌می بینی كه‌به‌ڕاستی خاوه‌نی ته‌خت وتاراجی فه‌ره‌نسایه، خه‌جاڵه‌تی له‌خۆی ده‌كێشێت وده‌گه‌ڕێته‌وه[281] هه‌موو ئه‌وانه‌ی له‌ترساندا رۆحیان چووبوو له‌وكاتانه‌دا ته‌نها عه‌قڵیان به‌و بیرۆكه گه‌مژانه ده‌شكا.

بڵاوكراوه‌كانی ده‌وڵه‌ت سه‌ره‌تا رووداوه‌كانیان به‌هه‌ڵبه‌ستراو ودرۆ له‌ڕۆژنامه‌كاندا بلاوده‌كرده‌وه، ئینجا كه‌وتنه‌سه‌ر راستی گوتن وچیتر نه‌ده‌كرا خۆیان له‌راستییه‌كان گێل بكه‌ن، تێروانینی ئه‌وان له‌وپێشڕه‌ویه‌ی ناپلیۆن به‌چه‌ند نازناوێك بڵاویان ده‌كرده‌وه‌و ئاماژه‌یان به‌هاتنی پێ به‌پێی ئه‌و ده‌كردو به‌مجۆره‌ی خواره‌وه له‌ڕۆژنامه‌و بڵاوكراوه‌كاندا رایان ده‌گه‌یاند.

جاری یه‌كه‌م : ( ماری ئاوی كرس به‌ناو ده‌ریادا خۆی گه‌یانده وشكانی)

---

[281] - ئه‌مه پلانێكی كۆنه‌و پاشا سوڵتان حسینی پێشتر كردویه‌تی،(و- فارسی).



جاری دووەم : ( زەبەلاحەکە بەرەو گراس دێت)

جاری سێیەم : ( ستەمکار گەیشتە گرەنوبل)

جاری چوارەم : ( بۆناپارت لیونی داگیرکرد)

جاری پێنجەم : ( ناپلیۆن گەیشتە نزیک فونتن بلو)

جاری شەشەم : ( پارس شاری بەوەفای بەرێزی ئەمڕۆ لەچاوەڕوانی ئەو بەرێزەدایە).

هەموو ئەم نازناو نووسینە ئەدەبیانە یەك لەدوای یەك لەرۆژنامەکاندا بڵاودەبوونەوە، هەتا ئەوکاتەش تروسکایی ئومێدێك مابوو کەئەم تۆفانە دامرکێنێتەوە.

دەسەڵاتدارانی پاریس دەیانزانی ناپلیۆن هیچ دەربەستی گیانی خۆیی نییەو ئاگاداری خۆی ناکات، بۆ نموونە: لەکاتی گرتنی شاری لیوندا ناوبراو لەپێشەوەی سوپاکەیدابووەو هاتۆتە ناو ئەوشارە، لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر بکرێت بەیەك لێدانی چەقۆ لەناوبراو، بنەماڵەی بوربنەکان ڕزگاریاندەبێت.

ئەوانەی ئەم ڕووداوانەیان بینیوە دەڵێن لەپاریسدا بەنهێنی بەکرێگیراوانی دەوڵەت بەناو خەڵکیدا دەگەڕان هەتا ژاك کلمان[282] پیاوێکی تازە بدۆزنەوە، بەڵێن وپەیمان لەگەڵ کەسێکدا ببەستن ئامادەبێت ناپلیۆن بکوژێت، بەئاشکرا بەڵێنی پاشای گەورەیان بڵاودەکردەوەو دەیانگوت کردنی ئەمکارە نابێتەهۆی بانگهێشتکردنی ئەوکەسە لەلایەن دادگاوە.

چونکە لەکۆنگرەی ڤییننادا ناپلیۆن بەدوژمنی مرۆڤایەتی ودزو بەدەر لەپاراستنی قانون ڕاگەێندراوە.

بەڵام بەماوەی ئەوچەند ڕۆژەی بەدەستیانەوە مابوو نەیانتوانی ژاك کلمانیکیان دەستبکەوێت.

لەشەوی(19- لەسەر20/ی مانگی مارس)دا ناپلیۆن لەگەڵ پێشەنگی لەشکرەکەیدا گەیشتە فونتن بلو، لەشەوی(19/ی مارس)یشدا پاشاو بنەماڵەکەی لەپاریس چوونەدەرێ و بەرەوسنووری بەلجیکا هەڵاتن، کاتژمێر (9)ی شەوی(20/ی مارسی سالی 8151) ناپلیۆن گەیشتە پاریس.

خەڵکێکی زۆر لەتویلریدا چاوەڕوانی بوون، کاتێ هاواری خۆشی ئەوخەڵکانەی لەگەڵ گالیسکەکەی ناپلیۆندابوون بیستڕا ئەوانەی دەوروبەری کۆشکی تویلریش تێکڕا جمان وبەپیر گالیسکەکەی ناپلیۆنەوە چوون.

ئەوگالیسکەیە کەلەهەموو لایەکەوە چواردەوری گیرابوو نەیدەتوانی درێژە بەرێشتنەکەی خۆی بدات، سوارە پاسەوانەکانی ئیمپراتۆر نەیاندەتوانی ئەو خەڵکە لەگالیسکەکە وەتەکێنن، ئەو پاسەوانانە دواتر دەیانگێڕایەوە کە( خەڵك هاواری دەکرد، دەگریان، خۆیان دەخستەبەرپێی ئەو ئەسپانەی گالیسکەکەیان ڕادەکێشا، ئامادەنەبوون گوێ لەقسەی کەس بگرن) ئەو خەڵکە زۆرە بەرەو گالیسکەکە ورۆژمیان هێناو پاسەوانەکان بەزۆر ناپلیۆنیان لەگالیسکەکە دەرهێناو بەسەر شانان و بەپلیکانەکاندا سەریان خستوو بردیانە قاتی دووەم دایاننا.

لەبەرەبەیانی گەورەترین سەرکەوتندا لەگەڕانەوە لەسەرکەوتنە بێهاوتاکانی ناپلیۆن، تابە ئەوکاتەش خەڵکی پاریس ئاوابە زەوق وخۆشییەوە پێشوازیان لەناپلیۆن نەکردبوو، دواتر یەکێك لەلایەنگرانی ڕژێمی شانشینی گوتبووی، ئەوەی خەڵك کردی

---

[282] - کەشیش دوومی نیکن (1567)لەسالی (1589)دا هنری سێیەمی پاشای فەرەنسای کوشت وسوارانی کاردی پاشاش دەستبەجێ ناوبراویان لەوێدا کوشتەوە.(نووسەر).



نموونەی دیمەنێکی بت پەرستانەبوو) بەهەزار زەحمەت توانیان خەڵك لەناو كۆشكدابەدەرنێن، ناپلیۆن خۆی لەژووری دەفتەری کاری کۆنەکەیدا بینیەوە کە(24) سەعات پێشتر لویسی هەژدەهەم بەپەلەپرووزاوان لەوژووره چوویۆدەرێ وهەڵاتبوو، دەستبەجێ ناپلیۆن دەستی کردەوە بەرێکخستنەوەی کاروبارەکانی دەوڵەت کەبەسەریەکدا کەڵەکەتره ببوون. شتێکی ناواقیعی ببووە واقیع، ناپلیۆن بەبێ لەشکر بەبێ تەقاندنی یەك دەراغ گوللەتفەنگ، بەبێ شەڕێکی کەم، بەماوەی 19- رۆژ لەسەر دەریای سپییەوە گەیشتەوە پاریس وبوربنەکانی دەرپەڕاندبوو ودووبارە فەرمانڕەوایی دەکردەوە.

بەڵام ئەو بۆخۆی لەهەموو کەس باشتر دەیزانی ئەم جارەشیان ئاشتی لەگەڵخۆیدا بۆفەرەنسا نەهێناوە، بەڵکو شەڕی بۆ هێناون و ئەورووپاش کەبەگەڕانەوەی لەنکاوی ئەو واقیان وڕمابوو، ئەم جارەشیان هەرچیان لەدەستهاتبا بۆ دەستگیرکردنی ناپلیۆن درێغیان نەدەکردو هێزەکانیان کۆدەکردەوە.

( 4 )

ناپلیۆن لەسەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵاتداریەتی تازەی، وەك گرەنوبل و لیون لەپاریسدا دووپاتی قسەکانی کردنەوە، بەرەسمی بەڵێنی دابوو ئازادی بەفەرەنساداتو ئاشتی دەرەکیش دەستەبەربکاتو بەراشکاوی لەبەریەم هەموو لایەکدا دانی بەوەدانا کەفەرمانرەوای کردنی یەکەمی نەئازادی تێدابوو نەئاشتیش. ناپلیۆن بەشەیداییەوە باسی ئازادی وئاشتی دەکرد، ئەمە بەلای دانیشتوانی ئەورووپا وفەرەنسا وەك ئەوەوابوو کەسێك باس لەگرێکی سارد-یان ساردییەکی سوتێنەر بکات.

ناپلیۆن بەو ژیرییە نائاساییەی خۆی کەتێبینی ئەمەی کردبوو، ئەگەر لەم چەند رۆژەی تەختوتاراجی فەرەنسای بەدەستەوە گرتۆتەوە لەبەرئەوەنییە میللەت شەیدای ئازادی بێ سنووروو ئاشتی هەیشەبن کەئەو بەڵێنی لەسەردابوو، چونکە بوربنەکان ئاشتی دەرەکیان لەبارنەبردبوو، بەڵکو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆئەو بەڵێنەی کەبەزۆرینەی خەڵکی داوە، واتە: چینی جوتیارو گوندنشینەکان، بەگەواهی فلوری دوشابلون، ناپلیۆن لەشەوی(20/ی مارسی ساڵی 1815)دا، واتە: شەوی گەرانەوەی بۆ کۆشکی تۆبلری، چەند جارێك دووپاتی کردبۆوە کە(میللەتێکی بێهاوتا منیان هێنایە پاریس، ئەوخاوەن پلەو سەربازنەبوون ئەمکارەیانکرد من قەرزداری میللەتو سوپام، گوندنشینەکان هاواریاندەکرد: بژی ئیمپراتۆر بمرن ئەشرافەکان مەرگ بۆ کەشیشەکان، ئەوانە شاربۆ شار لەگەڵمداهاتن ولەوکاتەی نەشیاندەزانی زیاترێن دەستەیەکی تازەی گوندنشینتر لەبری ئەوان رەگەڵم دەکەوتن، هەتا گەیاندمیانە پاریس، دوای پرۆڤانسییەکان دوفنەکان وئینجا لیونەکان و بورگینییەکان یەك لەدوای یەك بەهاوەڵی لەگەڵمدا هاتن. ئەوکەسانەی ئەم هەموو دۆستانەیان بۆمن پەیدا کرد خودی بوربنەکان بوون....)

ناپلیۆن بەمجۆرە باسی رێپێوانە مەزنەکەی دەکرد.

رازیکردنی گوندنشینەکان بەتێڕوانینی نسبی ئاسانبوو، ناپلیۆن بەلای ئەوانەوە نیشانەی لەناوبردنی فیودیالی ومافی مڵکداریەتی زەوی وزارەکانی گوندەکانبوو زەمانەتبوو، بەڕاستی گوندنشینەکان حەزساندەکرد ئیتر شەڕ دروست نەبێتەوە وگرتنی هاوڵاتیان بۆ خزمەتی سەربازی نەمێنێت.

کاتێ ناپلیۆن باسی رەوشی گرتنەبەری سیاسەتەکانی داهاتووی خۆی دەکرد، بەوپەڕی وردییەوە گوێیان لێدەگرد، بەڵام مەسەلەکە ئاشتی وئازادی بەتەنها لەگرێدانەبوو، ناپلیۆن تێبینی ئەوەی کردبوو دوای (11) مانگی حوکمرانی بوربنەکان



لەژێر حکومەتی مەشروتەدا بەڕێوەچووەو لەوماوەیەدا بڵاوکراوەکان شێوە ئازادبوون وئێستاش برژوازیەت چاوەڕوانی ئەمە لەئەودەکات، بەلانی کەمەوە ئازادیان بۆ فەراهەمبکرێت، ئەو دەبوا بەزوترین کات ئەوبەرنامەی کەلەڕێگای هاتنی بۆ پاریس ڕایگەیاندبوو بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، لەگرەنوبلدا گوتبووی (هاتووم هەتا فەرەنسا لەپیسی بورینەکان پاکبکەمەوە) لەلیونیشدا ڕایگەیاندبوو کە( من زادەی شۆڕشم) هەروەها گوتبووشی (من هاتوومەوە هەتا فەرەنسییەکان لەوکۆلاوە بۆگەنە ڕزگاربکەم کەکەشیشان وئەشرافەکان دەیانەوێت گەلی فەرەنسای تێدا نغرۆبکەن... پێویستە ئەوانە ئاگایان لەڕەفتاری خۆیانبێت من نەخشەکانیان پوچەڵ دەکەمەوە)

لەشارۆچکەکاندا زۆرنامە لەلایەن ژاکوبنە سەرکوتکراوەکانی فەرمانڕەوایی یەکەمی ناپلیۆنەوە بۆ ئیمپراتۆر نێدران، ئەوانە لەنامەکانیاندا بەقارەمان، ناویان بەقارەمانی شۆڕش بردبوو کەتوانیویەتی ئەشراف وکەشیش وبورینەکان جارێکیتر تێکبشکێنێتەوە.

لەتولوزدا ڕۆژێك هەتا ئێوارێ هاوڵاتیان پەیکەرێکی ناپلیۆنیان بەگوتنەوەی سرودی مارسەیز، بەکۆڵان وشەقامەکانی شاردا گێڕابوو وهاواریانکردبوو، ئەشرافەکان بەچەقۆ بکوژن، هەروەها لەشارو شارۆچکەکانەوە نامە بۆمارشال داوو نێردرابوون ( کەناوبراو دوای هاتنەوەی ناپلیۆن وگرتنەوە دەستی دەسەڵات بەوەزیری بەرگری دانرابوو) داوایان لێکردبوو وەك ساڵی (1793) حکومەتێکی تۆقێنەرو تیرۆر دابمەزرێننەوە.

ناپلیۆن ڕۆحی میللەتی زیاتر ناسی و هەرلەشەوی(20/ی مارس)دا بەکنت مولەی گوت:(من ڕق وکینەی خەڵك لەبەرامبەر کەشیش وئەشرافەکاندا، وەك سەرەتای شۆڕش دەبینم) بەڵام وەك ساڵی ( 1812) کەلەکۆشکی کریملیندابوو ولەوە دەترسا لەشۆڕشی گوندنشینەکانی ڕوسیا داوای یارمەتی بکات، ئەمڕۆش لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدانییە پشت بەشۆڕشی گوندنشینەکان ودامەزراندنی حکومەتی تۆقاندو تیرۆر ببەستێت وبیهێنێتەوە ئاراو پەنای بۆببات، وەك چۆن لەڕوسیادا داوای لەکەسێکی وەك پوگاچێڤ نەکرد یارمەتی بدات، ئاواش لێرەدا داوای لەکەسێکی وەك مارا نەکرد بۆهاوکاری و ئەمەش بەڕێکەوت نەبوو.

ئەو چینەی کەیاریدەدەری بوو بۆلەناوبردنی شۆڕش وهاتنەسەرکاری، چینی برژوازی گەورەبوو وناپلیۆن درکی بەپێداویستی ئەو دەکردو ببووە پاڵپشتی ودەبوا بەرژەوەندییەکانیان بپارێزێت.

هەربەو شێوەی لەساڵی (1812)دا لەشەڕی نێوان خۆیی ودوژمنەکەی ئەلکسەندەری ئیمپراتۆری ڕوسیادا زیاتر پشتی بەچینی برژوا بەست، نەك توێژی جوتیارو گوندنشینەکانی ڕوسیا.

لەساڵی (1815)شدا بۆ جێگیرکردن و بەهێزکردنی پێگەی خۆیی نەیدەویست داوای یارمەتی لەشۆڕش [٢٨٣] یارمەتی وەرگرێت، ناپلیۆن بەبنیامین کنستانی نوێنەری [٢٨٤] دیاری چینی برژوازی گەورەی ئەو ڕۆژگارەی گوت (من نامەوێت پاشای شۆرشی گوندنشینیبم)

[283] - لێرەدا مەبەست لەلایەنگرانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسایە.(و-کوردی).

[284] - بەمانای دیارترینی گروپ ولایەنێك: ئەمیشیان دیارترین بیرمەندی چینی برژوابووە لەفەرنسای ئەوکات.



ناپلیۆن پاش ماوەیەك بانگهێشتی بنیامین کنستانی کردو لەگەڵ ئەودا دەربارەی چاکسازی ئازادیخوازانـەی دامـەزراوەکانی کرد، بەجۆرێ هەم چینی بۆرژوازی ڕازیبن وهـەم ئـارەزووی نـاپلیۆن بەدەسـتەبەرکردنی ئـازادی بێتـەدی ولەهـەمان کاتیـشدا ژاکوبنەکان کەسەریان قوتکردبۆوە بەئارامی بهێڵێتەوە.

ناپلیۆن درکی بەوەکردبوو لەم بارودۆخە نامەموارە پڕ تەنگژەیەدا، تەنها یەك بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی دەتوانێت کەڵکی بۆنەو هەبێت، نەك خستنەڕووی ڕووکەشی مەشروتەخوازی بەچەمکی یەك ئازادی خوازی میانڕەو.

ناپلیۆن بۆ خۆشی لەبیرەوەرییەکانی سالانی (1815)دا دەڵێت (سیستمی بەرگری من هیچ نەبوو، چونکە ئەو کەرەستانەی بەدەستمەوەبوون هاوتا نەبوون لەگەڵ ئەو مەترسییە گەورەیەدا، دەبوا شۆڕشم تازەکردبایەوەو دوبارە گرنگیم پێدابایـەوە، هەتا کەڵکم لەهەموو ئەو توانایانە وەرگرتبا کەشۆڕش هێنابوونی، دەبوا هەموولایەن وخاوەن باوەڕەکانم وەجۆش وخـرۆش هێنابایەوە، هەتا کەڵکم لەجوڵەو کارە هەرەمەکییەکانی ئەوان وەرگرتبا، من بەبێ پەنابردن بەمکارانە نەمدەتوانی فەرەنسا ڕزگاربکەم)

ژومینی مێژوو نووسی بەناوبانگی بواری سەربازی لەم خاڵەدا کۆکە لەگەڵ ناپلیۆن، ناپلیۆن لەزیندوکردنەوی شۆڕشی سـاڵی (1793)، کەخاوەنی هێزێکی گەورەی شاراوەبوون، چاوپۆشی کرد، لەبری ئـەوە فـەرمانی دەرکـرد بینیـامین کنـستانی بـۆ بدۆزنەوە کەخۆی شاردبۆوە.

ئەم نووسەرە سیاسـییەو بیرمەنـدی ئـازادیخوازان، بۆیـەخۆی حەشـاردابۆوە، چـونکە ڕۆژێـك پێـشهاتنی نـاپلیۆن بۆپـاریس مەقالەیەکی بڵاوکردبۆوەو تێیدا نووسیبوو، گەڕانەوەی ئیمپراتۆر کارەساتێکی گەورەیە بۆ میللەتی فەرەنساو ناپلیۆنی وەك نیرون، لەقەڵەمدابوو.

بینیامین کنستان، بەترس ولەرزەوە چووە خزمـەت (نـیرون) کاتـێ زانـی نـەك هـەر گوللـەباران ناکرێـت، بـەڵکو پێـشنیاری ئەوەشی بۆدەکرێت دەستبەجێ خەریکی نووسینەوەی دەستوری بنچینەیی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسابێت ودەسـتبەکاربێت، زۆر خۆشحاڵبوو، کنستان لەڕۆژی (6/ی ئیبریل)دا چووە خزمەت ئیمپراتۆرو لەڕۆژی (23)ی هەمان مانگدا قانونی بنچینەیی ئیمپراتۆری لەژێر ئەم ناوە سەیرەدا ئامادەکردبوو، (پاشکۆی دەستوری ئیمپراتۆری) بەمجۆرە ناپلیۆن دەیویست پەیوەندی لەنێوان فەرمانڕەوایی یەکەم ودووەمی دروستبکات.

بەڵام سەبارەت بەکنستان، هەمان قانونی بنـچینەیی لویـسی هەژدەهـەمی هێنـابوو وتـەنها هەنـدێك زیـاتر گرنگـی بەلایـەنی ئازادیخوازانەدابوو، مەرجەکانی خۆپاڵاوتن ودەنگدان بەشێوەیەکی بەرچاو سانا کرابـوو، بەومانایـەی، بـۆ خۆپـاڵاوتن دەبـوا ئەوکەسە وەك بڕیارەکانی جاران پاڵێوراوێکی دەوڵەمەندبا.

ئازادی بڵاوکراوەکانیش کەمێ دەستکراوەتر کرابوون، سانسۆری بڵاوکراوەکان کەلەپێشوودا کاری پێدەکرا نەهێڵدرابوو ونیتر لێکۆڵینەوەو لێپێچینەوە لەزیادەڕۆکانی بڵاوکراوەکان خرابۆ بەردەم دەسەڵاتەکانی دادگا، لەسەرووی ئەنجومەنی پـەرلەمان، ئەنجومەنێکیتر دروستکرابوو بەناوی ئەنجومەنی پیران کەئەندامەکانی ئەمانە لەلایەن ئیمپراتۆرەوە دەستنیـشاندەکران وبـۆ ماوەیی بوو، ئەو بڕیارو قانونانەی دەردەکران دەبوا لەلایەن هەردوو ئەنجومەنی سەرەوە پەسەندکرابان ودواتر خرابانەبەردەم ئیمپراتۆر هەتا ئیمزایبکات.



ناپلیۆن ئەم کلێشەی دانانی دەستوری قبولکردوو لە(23/ی ئیبریل)دا ئیمزای کرد.

ناپلیۆن زۆر کێشەی لەگەڵ نووسینەوەی دەستورەکە نەبوو لەلایەن بنیامین لنستانەوە تەنها دەیویست مەسەلەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکانی دوابخات هەتا مەسەلەی شەڕوگرژی یەکلایی دەبێتەوە، چونکە لەکاتی سەرکەوتنی بەسەر شەڕو کێشەکانی تردا، بۆخۆی دەیزانی چ لەکنستانو هەردوو ئەنجومەنەکە دەکات، ئەم قانونی بنچینەییەش هەریۆ هێورکردنەوەی رای گشتی بوو.

بەلام برژوازی ئازادیخواز بەهیچ کلۆجێ باوەری بەئازدیخوازی ناپلیۆن نەبوو وهەمیشە داوای لەئیمپراتۆر دەکرد پەلەبکات لەدروستکردنی پەرلەمانو ئەنجومەنی پیران.

ناپلیۆن دوای چاکسازیکردنی لەچەند برگەیەکدا سەرەنجام لە(25/ی مانگی مایۆ) بریاریدا رۆژی کردنەوەی ئەنجومەنێت، هەروەها لەپاشکۆی ئەمەدا بریاردرا لەو رۆژەدا قانونی بنچینەیی بخرێتەبەردەم رای گشتیو مەراسیمی دانانی ئالا بەکاردی میللی لەبەردەم تەلاری پەرلەماندا دابنرێتو ئاهەنگ بگێردرێت.

ئەنجامی ڕای گشتی (1552450) لەگەڵ بوونو(4800) کەسیش دژی یاسای بنچینەیی نوێ بوون. بەلام ڕێورەسمی دانی ئالا بەکاردی میللی. کەزۆر بەشکۆ ودلگیرانەبوو لەبری(26/ی مایۆ) لەیەکەم رۆژی مانگی یۆلیۆدا بەڕێوەچوو.

ئەنجومەنی نوێنەران کەتازە هەڵبژێردرابوو ئەو ئەنجومەنی یاسادانانەی ناپلیۆن بۆخۆی دروستی کردبوو. لەهەمان رۆژدا کرایەوە. ئیستا (10) رۆژ بەسەر کاری پەرلەماندا تێنەپەریبوو کەناپلیۆن نارەزایی خۆی لەبەرامبەریاندا راگەیاندو تورەیی خۆی دەربری، ناپلیۆن رازینەبوو بچوکترین ناکۆکیو نارەزایی لەبەرامبەر دەسەلاتەکەیو کردارەکانیدابینێتو سنووری دەسەلاتەکانی دیاری بکرێن. ئەنجومەنی نوێنەران کەسێکی تێدابوو بەناوی لانژوینە، کەکابرایەکی ئازادیخوازی میانرەو بوو وناپلیۆن کەمێ دڵی بەئەوخۆشبوو وکردبووی بەسەرۆکی پەرلەمان، لانژوینە، ناپلیۆنی پێ باشتربوو لەبۆربنەکان. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتور تورەبوو ولەوگوتەیەی کەلەئەنجومەنی یاسادانانیدا خوێندەوە گوتی ( نابێ ئێمە وەك یۆنانییەکانی رۆژگاری ئیمپراتۆریەتی رۆم بچین، کاتێ ممنجەنیقەکانی دوژمن دیوارەکانی شاریان دەکوتا، ئەوانە خەریکی قسەو دەمەتەقێ بوون) ناپلیۆن بەم قسەییەی دیویست ئاماژە بەهاوپەیمانان بکات کەلەهەموو لایەکەوە لەسەر سنوورەکانی فەرەنسا خۆیان جێگردەکرد.

ناپلیۆن لەرۆژی(11/ی یونیو)دا گوتەیەکی بۆ پەرلەمان خوێندەوەو لەرۆژی دواتردا پەیوەندی بەسوپاکەوە کرد، هەتا دواین شەری گەورەی خۆی لەگەڵ ئەوروپادابکات، کاتێ رۆیشتن دەیزانی کەسانی وای جێهێشتوون جێگای متمانەی تەواو نین، ئەم نادڵنیایەش زیاتر لەنوێنەرانی پەرلەمان لەوکەسەبوو کەوەزارەتی ناوخۆی پێسپێردرابوو، رۆژێك پێشهاتنەوەی ناپلیۆن بۆ پاریس، جوزیف فوشە، بەئەنقەست تورەیی بوربنەکانی لەبەرامبەر خۆیدا هەڵساندبوو وبەو ئۆینە ساختەکارییە توانیبوی بەگەیشتنەوەی ناپلیۆن بۆ پاریس پۆیستی وەزارەتەکەی خۆی پێبدرێتەوە.

ناپلیۆن گومانی لەوەنەبوو فوشە هەموو فرتوفێڵو ساختەکاریو خیانەتێکی لێدەوەشێتەوە، بەلام یەکەم ویلایەتی واندە بەشێوە تێکەوتیوو وفوشەش لەهەموو کەس باشتر دەیزانی چۆن سەرکوتی ئەمانەبکات، جگەلەمەش ناپلیۆن خرابیوونی پەیوەندی نێوان بوربنەکانو فوشەی لەبەرچاودەگرت، لەگەڵ ئەمانەشدا ناپلیۆن بەنهێنی کەسێکی دانا بۆئەوەی چاودێری



هەڵسوکەوتی فوشەبکات، ناپلیۆن بۆ پێهەڵسانی ئەمکارە فلوری دوشابولونی هەڵبژارد، جارێکیان فلوری دوشابولون، مامەڵەیەکی نهێنی نێوان فوشەو مترنیخی لاشاشکرابوو بەئیمپراتۆری راگەیاند، هەرچەندە فوشە بەزمان لووسی ودیپلوماسیانە توانی خۆی لەوگێژاوەی تێکەوتبوو رزگاربکات، لەدرێژەی قسەکانی ناپلیۆن کەسەبارەت بەمە لەگەڵ فوشەیدا دەکرد، ئیمپراتۆر گوتی ( فوشە، تۆخائینی وسەرئەنجامیش هەربۆخۆم لەسێدارەت دەدەم) وەزوری ناوخۆ بەهۆی ئەوەی سالانێکی دوورو درێژبوو خزمەتی ناپلیۆنی کردبوو ولەگەڵ ئەم هەڵچون و تورەیانەی ئەو راهاتبوو، لەوڵامدا دوای ئەوەی کرنوشی مەزنیەتی بۆکرد، گوتی (من لەم بارەوە لەگەڵ رای بەرێزتاندا نیم) بەلام چارەنەبوو ئەگەر ناپلیۆن بەسەر هاوپەیمانانـدا سەرکەوتبا، ئەوا پەرلەمان تەواو سەری بۆنەوی دەکردو فوشە بەوەفاداری دەمایەوەو ترسی نەدەما، جگەلەم رێگایە گرنگنەبوو کێ ئیمپراتۆر بەخاك دەسپێرێت، واتە: نوێنەرانی ئازادیخواز ئەمکارەیان دەکرد-یان وزیرە خائینەکان.

ناپلیۆن دڵی بەداوو خۆشبوو کەوەك وەزیری بەرگری لەپاریسدا مابۆوە، هەروەها بەکرنوش ئەو کۆنە کۆماریخوازەی بەدرێژایی ئەو رۆژگارە رازی نەبوو خزمەتی ناپلیۆن بکاتو بەپێی خۆی هاتبوو خزمەتی خۆی بەئیمپراتۆر راگەیاندبوو، چونکە بوربنەکان لەخراپی بەخراپتر دەزانی.

ناپلیۆن دڵنیابوو لەوەی گەرەکە کرێکار نشینەکانی پاریس کەلەبەهاری ساڵی(1814) برسیتربوون، وەك چۆن لەسالانی (1813و1814)دا رانەپەڕیبوون وئیستاش شۆڕشو راپەرین ناکەن هۆکەشی دەگەڕێتەوەبۆ ئەوەی کارنویان ناردبوو بۆلای ئیمپراتۆر هەتاخزمەتی خۆیانی پێ رابگەیەنێت، ژاکوبنەکانی ناچارکردبوو لەکاتی دابەزینی ناپلیۆن لەکەنداوی ژوان سەلامی بۆبکەن، ئەو دەیزانی کارنوەکانو ژاکوبنەکان بەوچاوە سەیری ناکەن کەگەڕاوەتەوەسەر تەختوتاراجی خۆی بۆ ئەوەی بەرگری لەدەسەلاتەکەی خۆیبکات، بەڵکو وایان سەیردەکرد سەرداری سوپای فەرەنسایەو کوری شۆڕشەو بەرگری لەخاکی ولات دەکات لەبەرامبەر دەستێوەردانەکانی دەرکیو هاتنەوە سەرکاری بوربنەکان. ئەم سەرکردەیە لەبەرچاوی هەموو جیهان، چ دۆستو چ دوژمن، قارەمانی بێ هاوتای هونەری شەرکردن بوو وبەوانبیژترین سەرداری هەموو سەدەو رۆژگارەکانەو مامۆستای بێ نەزیری تاکتیکی شەرو سەرکردایەتیکردنی سوپایە. ولاتی فەرەنساو هەموو ئەوروپا کەلەبەرامبەر ئەودا ڕاستبوونەوە دەستەوەستان مابوونەوە.

( 5 )

ئەم جەنگە کەدوایین شەری ناپلیۆنە هەمیشە بۆتەجێگای گفتوگۆو مشتومرو سەرچاوەیەکی بەرفراوانو گەورەبووە بۆ لێکۆڵەرەوەو بیرمەندو ئەدیبەکانو هەمووشیان بەتوێژینەوە لەزنجیرەیەك رووداوی شوم گەیشتونەتە ئەو رایەی کەسەرکەوتنی تەواو لەچنگ ناپلیۆن چۆتەدەرێ.

لەرووی پۆلێنکردنو شیکارکردنی زانستیو ریالیزمی مەسەلەکە تەنها بەلای رخنەگرانی سەربازییەوە جێگای سرنج نەبوو، هەتا ئەگەر ئەمە بەبێ هیچ چەندوچون کەناپلیۆن توشی هیچ روداوێکی نەبووبایەو لەشەری واتەلۆشدا سەرکەوتوبا سەرئەنجام هەروای لێدەهاتەوە، واتە: ئیمپراتۆری مەحکوم بەنەمانبوو، چونکە ئەوروپا تازە دەستی بەبەرەوپێشچونو بەهێزکردنی خۆی بوو وناپلیۆنیش هەموو هێزو تواناو کەرەستەی سەربازی خۆی لەدەستدابوو. لەو(198) هەزار سەربازەی



ئیمپراتۆر لە(10/ی یولیۆ)دا هەبیوو زیاتر لەسێ یەکی لەشوێنە جۆراوجۆرەکانی فەرەنسادا دانرابوو، ئەوناچاربوو نزیکەی(45)هەزار سەرباز بۆ هەرپێشهاتێك لەواندەدا جێبهێڵێت، بۆئەو شەڕەی کەلەپێشییەوەبوو، ناپلیۆن تەنها دەیتوانی (128)هەزار سەربازو(344) تۆپو پێنج لەشکری میللیو ژمارەیەك لەسەربازانی سوار بەکاربهێنێت.

(200) هەزار سەربازیتر کەپێکهاتبوون لەبەشی ئیداری وکادیری سەربازی خەڵکی مەدەنی کەنیوەیان بەجلی مەدەنییەوە بوون وچەکیشیان پێنەبوو، بخاتەسەر هێزەکەی.

ئەگەر شەڕەکە درێژەی کێشابا ناپلیۆن دەیتوانی لەژێر کارامەیی ولێوەشاوەیی وەزیری بەرگری داوودا (240) هەزار کەسیتر بۆسەربازی بگرێت و بۆ بەرەکانی شەڕیان بنێرێت، بەڵام لەلایەکیترەوە هاوپەیمانان بەیەکجار (300) هەزار سەربازیان ناردە مەیدانی شەڕو بڕیاروابوو لەپایزیشدا (300) هەزار سەربازی تریش ئامادەبکەن، چۆن دەتوانرا درێژە بەشەڕەکە بدرێت هەرچەندە ئەگەر لەسەرەتادا ناپلیۆن سەرکەوتنی لاوەکیشی بەدەستهێنابا؟

ڕوس و بریتانی و نەمساوی و پروسەکان بەتەمای ئەوەبوون بەگشتی نزیکەی یەك ملیۆن سەرباز ئامادەی شەڕبکەن، هاوپەیمانان بڕیاری کۆتاییاندابوو بەوەی کاری ناپلیۆن یەکلایی بکەنەوە.

دوای بەسەرچوونی ساتەوەختە تۆقێنەرە[285] دڵساردکەرەوەکان، هەموو وڵاتانی هاوپەیمانانی بەتوانای بەشداربوو لەکۆنگرەی ڤییەننادا دەستیاندایە جموجۆڵ وخۆسازدانی بێپێشینە.

هەموو ئەو هەوڵانەی ناپلیۆنیش بەمەبەستی دروستکردنی پەیوەندی ودانووستانی تاکلایەنانە لەگەڵ هەریەك لەدەوڵەتانی هاوپەیمانان توشی ناکامی بۆوەو سەری نەگرت، ناپلیۆن دوژمنی مرۆڤایەتی وکەسێکی بەدەر لەقانون ڕاگەێندرابوو. ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بەوەبکەین فەرنسا دوای شەڕی واترلو، جگەلەسوپای وڵاتانی پلەدوو لەڕووی هێزەوە، لەلایەن (230) هەزار سەربازی نەمساوی و (250) هەزار سەربازی ڕوسی و (310) هەزار سەربازی پروسی و (100) هەزار سەربازی بریتانییەوە داگیرکرا، ئەم سوپایەش دوای هەواڵی دابەزینی ناپلیۆن لەکەنداوی ژوان ئامادەکرابوون، جگەلەو ڕق وکینەی کەئەلکسەندەرو فرانسواو فردریك ویلهلم ومترنیخ و کاستلر، لەناپلیۆنی زۆردارو هەمیشە سەرکەوتوویان هەڵگرتبوو وئەو ترسەی خستبۆ دڵیانەوە، ببووەهۆی سەرهەڵدانی ڕەوش و بزوتنەوە ئازادیخوازەکان لەئەوروپادا، کەناپلیۆن دوای گەڕانەوەی بۆسەر کورسی دەسەڵات ڕایگەیاندبوون.

بەتێڕوانینی دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ئەورووپایی ئەو دەستەسڕە سورەی مارا لەسەری دەبەست ترسناکتربوو لەوتاجە زێڕینەی ناپلیۆن دەینایەسەرسەری لەساڵی (1815) دا، بەڕای ئەوانە دەیانگوت ناپلیۆن دەیەوێت مارا زیندوبکاتەوە واتەهەمان ڕەفتاریکات کەمارا دەیکرد، ناپلیۆن ئەوکارەی نەکرد، چونکە بۆخۆی زیاتر لەمەدەترسا، بەڵام لەڤییەنناو لەندەن و بەرلین و پیترسبورگدا تۆقین لەم بۆچوونە بێ بنەمایە ڕق وکینەیەکی بێبەزەییانەی خستبۆ دڵی هاوپەیمانان لەبەرامبەر ناپلیۆندا.

کاتێ ناپلیۆن چووەناو سوپاکەی بەوپەڕی جۆش وخرۆشەوە پێشوازیان لێکرد، هەواڵگرانی بریتانی نەیاندەتوانی لەسەر سامیان خۆیان ببوێرن و لەڕاپۆرتەکانیاندا کەبۆ ڤلینگتنیان دەنارد، دەیانووسی: پەرستنی ناپلیۆن لەلایەن سەربازەکانییەوە

---

[285] - مەبەست لەوهەواڵە کورچك بڕەیەیە کەناپلیۆن جارێکیتر فەرمانڕەوایەتی فەرەنسای گرتۆتەوەدەست وهاوپەیمانانی سەرسامکردبوو.(و-کوردی).



گەیشتۆتە ئاستێکی ناماعقول، ئەم گوزارشتانە لەگەڵ گوزارشتی ئەوکەسانەی بۆ زانیاری وەرگرتنی حاڵەتی رۆحی گەلی فەرنسادا لەگەڵ یەکتریدا دەهاتنەوەو لێکدەچوون، لەگەڵ ئەمانەشدا نەڤلینگتن ونەجاسوسەکان نەیاندەزانی چ نیگەرانی و بێ باوەڕی سەربازەکان لەبەرامبەر ژنراڵ و مارشالەکانیاندا هەیە، سەربازەکان لەبیریان مابوو کەچۆن مارشالەکان لەساڵی (1814)دا خیانەتیان لەبەرامبەر ئیمپراتۆردا کردبوو، ئەم سەربازانە ئەوەندە باوەڕیان بەئیمپراتۆر هەبوو حەزیاندەکرد وارەفتار لەگەڵ خائینانداکات کەپێشتر ئەنجومەنی کنوانسیونەکان لەگەڵ ئەو ژنراڵانەیاندا دەکرد کەگومانیان لێیان هەبوون، واتە: ئەو خائینانەی کەجلی بریقەدارو دوگمەی زێڕکفتیان لەبەردابوو، گیوتین دانێت بۆ ملپەڕاندیان، وەلێ ناپلیۆن ئەمکارەی نەکرد، مارشال و ژنرالەکان لەپلەوپایەکەی خۆیاندامانەوە.

هاتنی ناپلیۆن ورەی سەربازەکانی بەرزکردەوە، سەربازەکان لەوە دڵنیابوون ئیتر مارشال و ژنرالەکان دەکەونە ژێر چاودێری وترس لەوەنەما دەستەیەك بتوانن خیانەتبکەن.

سوپای بریتانیا و پروسەکان زووتر لەهێزەکانی تری هاوپەیمانان هاتبوونە گۆڕەپانی شەڕەکە، فەرەنسییەکان پەلاماریاندان، نەمساوییەکان بەپەلە بەرەو ڕووباری ڕن دەهاتن،لەمارسی ساڵی (1815) واتە: ڕێك لەو ڕۆژەی ناپلیۆن گەیتشەوە پاریس، مورا کەلەساڵی (1814)دا لەلایەن ناپلیۆنەوە بەپاشای ناپۆلی دانرابوو ولەکۆنگرەی ڤییێنناشدا ئەو بەشێوە ڕەسمی بەپاشای ئەومەملەکەتە ناساندرابوو، مور هەرکەبیستی ناپلیۆن گەڕاوەتەوە یەکسەرە پەیوەندی پێوەکردەوەو شەڕی دژی نەمساوییەکانی ڕاگەیاند، بەڵام پێشنەوەی ناپلیۆن لەدژی هاوپەیمانان بکەوێتەشەڕ مۆر شکستی خوارد، ئیتر ناپلیۆن نەیدەتوانی پشت بەوهاوپیەمانەی خۆی ببەستێت وپێش لەبەشێکی هێرشی هاوپەیمانان بگرێت، بۆیە دەبوا پێشهەموو شتێك ناپلیۆن پروس و بریتانییەکانی تێکشکاندبا– یان بەلانی کەمەوە پاشەکشەی پێکردبان.

ڤلینگتن بەهێزە سەربازییە بریتانیەکەی خۆیەوە لەبروکسل دابوو، بلوخریش بەهێزە سەربازیەکەی خۆیەوە لەدەم ڕووبارەکانی سامبرو موزی نێوان شارلروا ولیژ دابوو.

لە(14/ی یۆنیۆ)دا ناپلیۆن بەهێرشکردەسەر بەلجیکا شەڕەکەی دەستپێکرد، ئەو بەخێرایی خۆیگەیاندە هێزەکانی بلوخرو ڤلینگتن، فەرەنسییەکان شارلوایان داگیرکردو ڕێڕەوی سامبریان داخست، بەلام باڵی لای ڕاستی بەرەی شەڕ ماوەیەك دواکەوت وباش بەرەو پێشنەچوو، چونکە ژنرال بورمون کەلایەنگری ڕژێمی شانشینی بوربنەکان بوو ودەمێکبوو لەلای سەربازەکانەوە بەچاوی گومان سەیردەکرا، هەڵاتبوو وپەیوەندی بەپروسەکانەوە کردبوو، بلوخر ڕازی نەبوو پێشوازی لەژنرال بورمون بکات وەتا وەڵامی بۆئەو ژنراڵە خائینەش ناردبوو کەئەو بەچاوی (ناپاکی سەگ) سەیردەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕووداوەی بەئیقبالێکی باش زانی، کاتێ هەواڵی خیانەتکردنی بورمونی واندەیی یان [286] بەناپلیۆن ڕاگەیاند گوتی (سپیەکان هەمیشە سپی دەبن) [287] لە(15/ی یۆنیۆ)دا ناپلیۆن فەرمانی بەمارشال نی دابوو ئاوەدانی کاتربرا، کەکەوتۆتەسەر شاڕێگای بروکسل داگیربکات، هەتا جموجۆڵی سەربازەکانی بریتانیا سنووردارپکەن، بەڵام نی خاوەخاوەی کرد، لەکردنی ئەمکارە سستبوو لە(14/ی یۆنیۆ)دا ناپلیۆن لەنزیك لیینین شەڕێکی سەختی لەگەڵ بلوخردا کردو بەسەریداسەرکەوت، لەوشەڕەدا بلوخر نزیکەی (30) هەزار سەربازو ناپلیۆنیش (11) هەزار سەربازی لێبەکوشت چوون،

---

[286] - مەبەست لەناوچەیەکە لەفەرنساو بورمونی خەڵکی ئەوێیە.(و-کوردی).

[287] - مەبەستی ناپلیۆن لەلایەنگرانی سیستمی شانشینی بوربنەکانە کەئاڵاکەیان بەرەنگی سپیە.(و-کوردی).



بەڵام ناپلیۆن لەم سەرکەوتنەی خۆی ڕازی نەبوو وەدەیگوت ئەگەر مارشال نی خاوخلیچکی نەکردبا لەگرتنی شارێی بروکسل، ئەوا تەواو سوپای پروسی لەبەین دەبرد، بلوخر کەتێکشکابوو بەرەو شوێنێکی نادیار پاشەکشەیکرد.

ڕۆژی(17)هەم ناپلیۆن پشووی سەربازەکانیدا، ڕەخنەگرانی سەربازی بەوەسەرزەنشتی ناپلیۆن دەکەن وەڵێن نەدەبا لەڕۆژێکی ئاوادا بواری سوپای بلوخری دابا یەکە سەربازییە پەرتەوازەکانی کۆبکاتەوەو ڕێکیان بخاتەوە، نزیکەی بەرەبەری نیوەڕۆیە ناپلیۆن نزیکەی (34) هەزار سەربازی جیاکردەوەو فەرمانی بەمارشال گروشی کرد بەوهێزەوە دوای بلوخر بکەوێت وتەفرو تونای بکات، هەندێك لەسەربازە سوارەکانی سوپای فەرەنسا هەوڵیاندا ئەوسەربازە بریتانیاییانەی ڕۆژی پێشتر لەنزیك کاتربرادا شەڕیانکردبوو، تێکبشکێنن، بەڵام بارانی زۆر سێلاو قوڕولیتەی هێنابۆسەر شارێگاکەو ڕێگاکەی شێوە نەهێشتبوو.

ناپلیۆن بەزۆرینەی هێزەکەیەوە کەوتەوەگەڵ هێزەکەی مارشال نی و یەکسەرە بەرەو سەرو، واتە: بۆلای بروکسل کەوتەڕێ، بەڵام ڤلینگتن بەخۆیی وسوپاکەیەوە لەدەم دەشتاییەکانی مون سن ژان کەکەوتبۆ خۆرئاوای واترلو بەری بەڕێگای سوپای فەرەنسا گرتبوو نەیەت بۆ بروکسل.

ڤلینگتن لەو تەختاییە پێدەشت وبەرزانەدا بەنیازی ئەوە خۆی تێدا جێگیرکردبوو بۆئەوەی هەرچۆنێکبێت، خۆی ڕابگرێت هەتا بلوخر دوای تێشکان وپاشەکشەکردنەکەی بەهانایەوەبێت.

جاسوسەکان یەك لەدوای یەك هەواڵی ئەوەیان بۆسوپای بریتانیان دەگەیاند هەرچەندە ڕێگاکان قوڕو لیتە پڕی کردوونەوە، بەڵام ناپلیۆن درێژە بەهاتنەکەی خۆی هەردەدات بەرەو مون سن ژان. لەسەرەتای سەعاتەکانی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی(17/ی یۆنیۆ)دا ڤلینگتن گەیشتە ئەوڕایەی ئەگەر بتوانێت هەتا گەیشتنی هێزەکەی بلوخر خۆی ڕاگرێت، ئەوا سەرکەوتنیان مسۆگەردەبێت، دەنا سوپای بریتانیا تێدادەچێت، هەمان پاش نیوەڕۆ ژنرال گنایزناو، سەرۆکی ستادی سوپای بلوخر پەیامێکی بۆ ڤلینگتن ناردبوو کەسوپای پروس هەر کەوەسەرخۆی کەوتەوە بەخێرایی پەیوەست بەسوپای بریتانیا دەبێتەوە.

ئێوارە ناپلیۆن لەودەشتاییە نزیکدەبۆوە، بەجۆرێ لەدوورەوە لەنێوان تەمومژەکەدا سوپای بریتانیا وەدیارکەوتبوو وەدەبینرا.

( 6 )

لەبەیانی ڕۆژی(17/ی یۆنیۆ)دا هەردوولا خۆیان لەبەرامبەر یەکتریدادیەوە، ناپلیۆن نزیکەی (72) هەزار سەربازی لەگەڵدابوو وڤلینگتنیش (70) هەزار سەرباز.

هەردوولایان چاوەڕوانی هاتنی هێزی یاریدەربوون، لەم چاوەڕوانییەدا ناپلیۆن بەتەمای گروشی بوو پێی بگاتەوە کەنزیکەی (33) هەزار سەربازی لەگەڵدابوون، بریتانییەکانیش چاوەڕوانی بلوخربوون کەدەبوا بە(40 –بۆ50) هەزار سەربازی پاشماوەی تێشکانی شەڕی لێنینی لەگەڵدابێت.

ناپلیۆن هەمان شەو دامەزراندن وڕێکخستنی سوپاکەی کردبوو بۆشەڕ، بەڵام نەیتوانی لەسپێدەی بەرەبەیاندا دەست بەشەڕەکەبکات، چونکە باران بەجۆرێ زەوی تەڕکردبوو بڵاوکردنەوەی سەربازە سوارەکان بۆئەملاولای بەرەی شەڕ گرفت



بوو، ئیمپراتۆر پرشنگی بەیان سەردانی یەکە سەربازییەکانی کردوو بەسەریانەوە گەڕا، سەربازەکان بەبینینی ناپلیۆن شادومانبوون وناپلیۆنیش دڵی بەمەخۆشبوو، چونکە لەئوسترلیتزەوە شەوق وزەوقی ئاوا بەجۆشی لەسەربازەکانی نەبینیبوو، ئەم بەسەرکەڕانە کەدوا بەسەرەوەگەڕانی ناپلیۆن بوو، کاریگەری لەسەرخۆیی وهەموو ئەو کەسانەجێهێشت کەلەوێدابوون وهەرگیز بیرناچێتەوە.

ناپلیۆن ناوەندی ستادی سوپاکەی لەکێڵگەی کابۆ دانا، لەکاتژمێر(30ر1) دەقیقەی نیوەڕۆدا، زەوی کەمێ وشکبۆوەو فەرمانی دەستکردن بەشەڕی دەرکرد،(84) تۆپ گڕی دۆزەخی خۆیان بەرەو باڵی چەپی سوپای بریتانیا دەستپێکردو هێرش لەژێر فەرماندەی مارشال نی دا دەستی پێکردو لەهەمان کاتیشدا لەشکرێکی تری سوپای فەرەنسا هێرشیان کردەسەر بەشی لای ڕاستی سوپای بریتانیاو قەڵاتی سەربازی ئوگومن و ڕوو بەڕووی بەرگریکردنێکی سەختبوونەوە، چونکە ئەو قەڵاتە سەختبوو، هێرشکردنەسەر بەشی لای چەپی سوپای بریتانیا بەردەوامبوو، ئەمشەڕە خوێناویە سەعات ونیوێکی خایاند، ناپلیۆن لەپڕ چاوی بەلەشکرێك کەوت کەلەخۆرهەڵاتی شاپل سن لامبرەوە دەهاتن، ئەوسەرەتا پێی وابوو گروشیە، چونکە چەند جارێك ڕۆژێ پێشترو شەویش پەیمای بۆناردبوو هەرچی زووترەبێت، کاتێ ناپلیۆن زانی ئەوانە سوپای پروسین نەپەشۆکا، چونکە بیری لەوەدەکردەوە ئەگەر پروسەکانێ ئەوا گروشیش کەبەدوای ئەمانەوەبوو بەم زوانە دەگاتە جێوو هاوسەنگی هێزەکان لاسەنگ نابێت.

بەڵام ئەوکەسە بلوخر بوو کەبەمانۆڕە سەربازییە زیرەکەکانی توانیبووی خۆی لەچنگ گروشی ڕزگاربکات وبەهانای سوپای بریتانیاوەبێت، ئەگەر ناپلیۆن سەرکەوتووبا بەزەبرێکی بروسك ئاسا لەسوپای بریتانیا، ئەوا هاتنی مارشال گروشی سەرکەوتنی یەکجارەکی مسۆگەردەکرد.

ناپلیۆن هەندێك لەسەربازانی سواری بۆشەڕکردن لەگەڵ هێزەکەی بلوخردا ناردو فەرمانی بەمارشال نی دا درێژە بەهێرشەکەی بدات بۆسەر ناوجەرگەی سوپای بریتانیا، شەڕێکی سامناك ڕوویداو بریتانییەکان چەندجار هێرشی بەرپەرچ دانەوەیان دەکردو بەخۆڕاگرانە شەڕیاندەکرد، سوپای فەرنسا زیانی زۆری لێکەوت، لەشکری شمشێر وەشێنی سواری ئیسکتلەندەیی خۆیان کێشایەناو هێرشبەرانی سوپای فەرەنساو زۆریان کەلوپاچەکردن.

هەرکە ناپلیۆن ئەم پاشەکشەیەی بینی خۆی گەیاندە سەربەرزاییەك ولەشکری سوارە زنهار پۆشەکانی میلو کەچەند هەزار کەسێك دەبوون ناردبۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ئیسکتلەندەییە سوارە شمشێر وەشێنانەوەو بەتێداچوونی تیپێکی سەربازی توانرا پاشەکشە بەئیسکتلەندییەکانی ناو سوپای بریتانیابکەن.

ئەم هێرشکردنەسەر باڵی چەپی بەرەی شەڕ دەرئەنجامی باشی نەبوو، چونکە سەربازەکان بەسەختی شەڕیاندەکردو نەدەبەزین، بۆیە ناپلیۆن نەخشەی شەڕەکەی گۆڕی وفەرمانیدا هێرش بکرێتەسەر بەشی لای ڕاستی بەرەی شەڕو ناوەڕاستی سوپای دوژمن، لەکاتژمێر(30ر3) دەقیقەی پاش نیوەڕۆدا کێڵگەی هرسنت کەوتەژێر دەسەڵاتی لەشکری ئارلون، بەڵام بەهۆی ئەوەی هێزی تەواوی لەدەستدانەمابوو نەیتوانی پارێزگاری لەوسەرکەوتنەی بکات.

ناپلیۆن کەئەمەی بینی چل تیپی لەسوارانی میلو ولوفەوردەنوەتی خستەژێر فەرماندەیی مارشال نی وفەرمانی پێکرد سوپای بریتانیا لەنێوان هوگومن و هرسنتدا تێکبشکێنێت، سەرئەنجام قەڵاتی سەربازی هوگومن کەوتەدەست فەرەنسییەکان.



لەکاتی هێرشکردنیدا سەربازە پیادەکانی فەرنسا کەوتنەبەر هەڵمەتی تۆپەکانی بریتانیا، ڤلینگتن گومانی ئەوەی دەکرد هەموو شتێك لەدەستچوو، ئەمە تەنها ڕای ئەونەبوو، بەڵکو هەموو ستادی سوپاش ئەوڕایەیان هەبوو، ورەی ئەوسەرکردە سەربازییەی بریتانی بەقسەکانیدات ئاشکرایە کەحاڵیان شڕبووە، کاتێ هەواڵی ئەوەیان پێدەگەیاند لەهەندێك شوێنی بەرەی شەڕدا ناتوانرێت چیتر خۆڕابگیردرێت، ئەو دوای ئەوەی هەموو هێزی یەدەگی خۆی بۆمەیدانی شەڕ ناردبوو گوتی: کەواتە دەبێ هەموومان لەم شوێنەی خۆماندا بەکوشت بچین! ئیتر من هێزی فریاکەوتنم نییە.

ئەگەر تادواکەسمان بکوژرێین دەبێ هەتا بلوخرمان دەگاتێ خۆڕاگرین ودەست لەبەرەنگاری شلنەکەین).

بەڵام ناپلیۆن ئومێدی بەگەیشتنی سوپای پیادە نەمابوو، چونکە جگەلەسەربازە سوارەکان کەهەتا ئەوکاتەش تەواو نەچووبوونە ناوشەڕەکە هیچ سوپای پیادەی یەدەگی بەدەستەوەنەمابوو هەتاشەڕی پێبکات، بۆیە(37) تیپی سەربازی سواری کلرمانی ناردبۆ شەڕکردن.

شەوداهات وسەرئەنجام ئیمپراتۆر گاردی تایبەتی خۆشی ناردەناو شەڕەکەو ڕاستەوخۆ بۆخۆی فەرماندەیی دەکردن.

لەوساتەوەختانەدا هاتوهوت و ژاوەژاو قاڕو قریوە دەستی پێکردو وسوپای تفەنگ بەدەست دەستیانکرد بەتەقە لەبەشی لای ڕاستی بەرەی سوپای فەرەنسییەکان، ئەوانە سوپای بلوخریوون کە بە(30) هەزار سەربازی جەنگیەوە هاتبوونەناو مەیدانی شەڕ، ئیتر ناپلیۆن دڵنیابوو مارشال گروش نایەت، گاردەکەی ئیمپراتۆر درێژەی بەشەڕەکەی دەدا، پاش ماوەیەك ترس وەك شەپۆلێکی گێژەڵوکە باڵی بەسەر فەرەنسییەکاندا کێشا، سەربازە سوارەکانی پروسی هێرشیانکردەسەر گاردی ئیمپراتۆرو لەدوولاوە خستیانەژێر گڕی گوللەبارانکردن، لەوکاتەشدا بلوخر بەخۆیی وپاشماوەی سوپاکەیەوە بەرەو کێڵگەی بل ئالیانس دەچوو کەگاردەکەی ناپلیۆن ئەوێیان چۆڵکردبوو، هەتا ڕێگای پاشەکشەکردنیان لێبگرێت، کاتژمێر(8ر30) دەقیقەی شەوبوو بەڵام کەمێ ڕووناکایی هەرمابوو، ڤلینگتن کەبەدرێژایی ئەو ڕۆژە بەرگەی شاڵاوی هێزە بەهێزەکانی سوپای فەرەنسای گرتبوو، فەرمانی بەهەموو یەکە سەربازییەکانی کرد، هێرش بکەنەسەر دوژمن.

هیچ هەواڵی مارشال گروشی نەبوو وناپلیۆن هەتا دواساتەکان بێهودە لەچاوەڕوانیدابوو، کۆتایی کاری فەرنسا نزیکببۆوە، گاردی ئیمپراتۆری کەبەبێ ئومێدانە دەجەنگاو کەوتبۆ ناوفشاری بەهێزی دوژمنەوە.

ناپلیۆن لەگەڵ تیپێکی نارنجۆك هاوێژدا خەریکی پاشەکشەکردن بوو، شەڕکردنی سەختی گاردی ئیمپراتۆری بەرەوپێشچوونی سوپای هاوپەیمانانی وەدرەنگ دەگێڕا، سەرجەنگ هالکتی بریتانی هاواری لەتفەنگ بەدەستەکانی گاردی ئیمپراتۆری کرد کەلەژێر فەرمانی ژنرال کامبرونداوون وچواردەوریان گیرابوو ودەیگوت ( ئەی فەرەنسییە ئازاکان، خۆتان بەدەستەوەبدەن).

بەڵام سوارانی گاردی ئیمپراتۆری مردنیان لەخۆتەسلیمکردن پێباشتربوو، کامبرون بەجنێو وەڵامی ئەوپێشنیارەی دوژمنی دایەوە.

لەخاڵەکانی تری بەرەی شەڕدا، بەتایبەت لەپلانسوادا کەلەوێدا لەشکری لوبو شەڕی دەکرد، فەرەنسییەکان بەرگریان دەکرد، بەڵام لەبەرامبەر هێرشی پروسەکان کەتازە هاتبوونە مەیدانی شەڕ تێشکان و بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆشیان تەنها هەڵاتن ڕێگاچارەبوو.



ئەوشەوە توانرا هەندێك لەسەربازە هەڵاتووەکانی فەرەنسا کۆبکرێنەوەو دووبارە بۆسبەی ئامادەی شەڕبکرێنەوە، وەلێ پروسەکان بەدرێژایی شەو خەریکی بەدواکەوتنی سەربازە پەرتەوازەو هەڵاتووەکانی سوپای فەرنسابوون.

( 7 )

(25) هەزار سەربازی فەرنسی و (22) هەزار سەربازی هاوپەیمانان بەکوژراوی وبریندار لەمەیدانی شەڕدا جێمابوون.

پاشەکشەکردنی سوپای فەرنسا کەهەموو تۆپخانەی خۆی لەدەستدابوو و نزیکبوونەوەی سەدان هەزار سەربازی نەمساوی و ڕوسی لەمەرزەکانی فەرەنسا، ناپلیۆنی بەشێوەیەکی جدی خستبۆ تەنگژەیەکی دژوارەوە، لەوکاتەی ئیمپراتۆر لەمەیدانی شەڕی واترلو دووردەکەوتەوە، گەیشتە ئەو قەناعەتەی ڕۆژگاری خوێنینی سوپاگیری کۆتایی پێهات، ئایا گروش بەو وەدواکەوتنەی کەبووەهۆی لەناوچوونی سوپای فەرەنسا خیانەتی کرد– یان ڕێگاکەی لێهەڵەببوو؟ ئایا مارشال نی لەکاتی هێرشکردنی سەربازە سوارەکانی سوپای فەرەنسا بۆسەر سوپای بریتانیا وەك یەك جوامێرو قارەمان ڕەفتاری کردبوو– یان وەك شتێتێك؟

ئایا حەقوابوو ناپلیۆن هەتا نیوەڕۆ ڕاوەستاباو هێرشی کردبا سەر سوپای بەرتانیا–یان دەبوا پێشنەوەی بلوخر بگاتە مەیدانی شەڕەکە ناپلیۆن لەبەرەبەیانەوە هێرشی کردباسەر سوپای بریتانیایی و تێکیشکاندبان؟

ئەم پرسیارانەو سەدان پرسیاری تر بۆماوەی سەد ساڵ مێشکی مێژوو نووسانی سەرقاڵکردبوو وببووەجێگای سەرنجی کەسانی هاوچەرخی شەڕی واترلوش، بەڵام پێویستە ئەوەوەبیر بهێنینەوە ناپلیۆن لەوساتەوەختانەدا گرنگی ئەوتۆی بەمانە نەدەدا، ئەو بەڕووکەش ئارام دیاربوو وبەدرێژایی ڕێگای نێوان واترلو وپاریس غەرقی بیرکردنەوەی قوڵی خۆی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێکی لەدەستدابوو ونیتر ئومێدی گەڕانەوەی هیچی بۆخۆی نەمابوو، ڕەنگ ڕوو وسپۆرتی لەڕۆژی دواتری شەڕی لایپزیگ جوانتردەهاتە بەرچاو، ناپلیۆن بۆخۆشی دوای شەڕی واترلو گوتبووی ( خەتای من نییە کەوڵاتە زلهێزەکانی ئەورووپا شەڕانگێزن لەگەڵماندا، بەڵکو ئەمە خەتای شۆڕشە، ئەوانە هەمیشە من بەنوێنەری شۆڕش و پیاوی لایەنگری شۆڕش سەیردەکەن).

چەند ناپلیۆن لەزۆر لایەنەوە لەبنەماکانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا بەدووربا، لایەنگرانی ئازادی بیری نەوەکانی دواتر ئەوەبوو کەناوبراو وابەستە بەشۆڕش بووەو ئەمەش لەسەرتاسەری ئەورووپادا هەروا سەیردەکرا، لێرەدا ئەوە بەسە خۆشی هرتزل، بخەینەڕوو کەلەو تابلۆیەدا ڤلینگتن وبلوخری کێشاوە کەلەمەیدانی شەڕی واترلودا پیرۆزبایی لەیەکتری دەکەن).

(ناپلیۆن تەنگەی بەمیللەتەکان هەڵچنیبوو، ترس ولەرزی خستبۆ ناودڵی ئەمانە، هەتا زەبروەشاندن بەزەبر وەشاندن وەڵام بدەنەوە، بۆیە ئەمانە بەڕق وکینەیەکی بێ بەزەییان بۆ ڕزگارکردنی خۆیان لەدەست کۆیلەیەتی وپاراستنی بەرژەوەندی ئاغاکانیان دەجەنگان.

سەرکوتکردنی سەربازی بووە جێگرەوەی سەرکوتکردنی قۆناغی فیودیالی، من لەبەرامبەر ئەو تابلۆیەی هرتزلدا ناتوانم بێ لێکدانەوەی بەسەریدا تێپەڕم.



هەرجارەی بۆماوەیەکی زۆر لەو تابلۆیە خورد دەبمەوە لەرزێك دامدەگرێت، ڤلینگتن وبلوخر بەوپەڕی شادییەوە سلاو لەیەکتری دەکەن، بۆچ خۆش و دلشاد نەبن؟ ئەمانە ڕەوڕەوەی مێژوویان لەسەر شارێگاکەی خۆی لاداو خستیانە گۆلاوێکی بۆگەنەوەو بەدەرهێنانەوەی ئەو بۆماوەی نیوسەدە ئەگەری نییە.. سپێدەی بەیانی بوو، ئەوروپا لەخەوداببوو، بێئەوەی بزانن چارەنووس گۆڕاوە).

هرتزل خودی ناپلیۆنی بەوە تاوانباردەکرد کەگەلانی ئەوروپای بەزۆرو ستەمی خۆی گەیاندۆتە لێوارەکانی مەرگ.

ناپلیۆن لەبەرامبەر ئەم بۆچوونانەدا هەمیشە بێدەنگی هەلدەبژارد.

بەلام حکومەتە شمولی و ڕەهاییەکانی ئەشرافی وفیودیالەکان کەچەندجارێك لەسەردەستی ئەو تێشکابوون، تۆلەی خۆیان هەتا ئاستێکی زۆر لەشەڕی واترلودا کردبۆوە.

شایانی باسە دوای واترلو ناپلیۆن باسی شەڕە شاکارەکانی خۆی نەدەکردوو واترلوشی وەك واقیعێك وبەس سەیردەکرد، وەك ئەوەی بۆخۆی قارەمانی ئەو داستانانە نەبوبێت.

گۆڕانکاری لەپڕ هاتبۆ ئارا، دوای گەڕانەوەی ئیمپراتۆر لەشەڕی واترلو بۆپاریس، ئیتر بۆتەخت وتاراج ململانێی نەدەکرد، بەلکو چاوی لەهەموو پێگەکانی خۆی پۆشی، ئەمەش لەبەرئەوەنا کەتواناو ئیرادەی خۆی لەدەستدابێ، بەلکو بێ گومان لەبەرئەوەبوو گەیشتبۆ ئەوقەناعەتەی ئەوکارانەی کەباش- یان خراپ ئەنجامیداون، گەیشتونەتە کۆتایی.

سێ مانگ پێشتر، واتە: لەمارسی سالی (1815)دا کارێکی کردبوو، کەکەس بەدرێژایی مێژوو نەیکردبوو، چونکە ئەوکاتە باوەڕی تەواوی بەخۆی هەبوو وباوەڕی بەئەستێرەی بەختی مابوو.

بەلام ئیستا ئەو ئەستێرەیە بۆهەمیشە کوژایەوە، دوای شەڕی واترلو هیچ کاتێك بەقەت شەوی (11)ی ئیبریلی سالی(1814) دلتەنگ نەبوو وپەژارە داینەگرتبوو، ئیمپراتۆری فەرنسا ئیتر تەنها چاوەڕوانی ئەوەبوو ببینێت ئاراستەی ڕووداوەکان چی لێبەسەردەهێنن وبڕیاریدابوو لەمەودوا دەست لەچارەنووسی دیاریکراوی خۆی وەرنەدات، هەرکە گەیشتەوە پاریس لە(21)ی یۆنیۆ)دا، بانگهێشتی وەزیرەکانی کرد، کارنو پێشنیاری ئەوەیکرد داوا لەپەرلەمان بکرێت، دیکتاتۆریەتی ناپلیۆن ڕابگەیێندرێت، داوو-ش پێشنیاری ئەوەیکرد ئەنجومەنی نوێنەران هەلبوەشێندرێتەوەو کاری پەرلەمانیش بۆماوەیەك هەلپەسێردرێت، ناپلیۆن ئەم پێشنیارەی ڕەتکردەوە، ئینجا ئەنجومەنی نوێنەران کۆبوونەوەی کردو لەسەر پێشنیاری لافایت، کەجارێکیتر لەسەر ڕووداوە مێژوویەکان دیارکەوتەوە، ڕاگەیێندرا حکومەتی مەشروتە بۆ هەمیشە لەفەرنسادا بمێنێتەوە، دوای تێپەڕبوونی چەند سالێ ناپلیۆن گوتبووی تەنها ئاماژەیەکی ئەو بەسبووە هەتا خەلك ئەندامانی پەرلەمان کەلوپاچەبکەن.

هەندێك لەنوێنەران کەهەتا کاتی گوتنی ئەم گوتەیە زیندووبوون، ئەمەیان بەڕاست دەگێڕایەوەو تۆبالیان بۆ دەکێشا، ناپلیۆن دەبوا لەبەرامبەر کەسێکی وەك لافایتدا، مارایەکی دروستکردبا، لەبەرامبەر ئەو ئازادیخوازانەی دەیانویست سالی (1789) زیندووبکەنەوە، بەلام ناپلیۆن لەپێش شەڕی واترلو نەدواتریش نەیدەویست ئەم ڕێگاچارەیە بگرێتەبەر وپەنابۆ ئەمەبیات.



بەڕۆژانی(21و 22و 23)ی یۆنیۆدا، هەواڵی یەك لەدوای یـەكی سـەیر لەگەڕەكـە كرێكـار نـشینەكانی پاریـسەوە دەبیـسترا، خەڵكێك زۆر كۆدەبوونـەوەو بـەبانگ هاواریانـدەكرد ئیمپراتـۆر دەسـت لـەكار بكێـشێتەوەو دەبـێ شـەڕی چـەكداریش دژیـە داگیركەران بكەین، بەدرێژایی ڕۆژی(21/ی یۆنیۆ)و ڕۆژی دواتریش كۆمەڵێكی زۆر لەدانیشتوانی گەڕەكەكانی سـنت ئـەنتوان وسن مارسل وتامپل، ڕێپێوانیان دەكردوو هاواریاندەكرد، بژی ئیمپراتۆر، بمرێ ئەنجومەنی نوێنەران.

یان مەرگ —یان ئیمپراتۆر! دەست لەكار نەكێشێتەوە! ئیمپراتۆر! خەڵكینە چەك هەڵگرن، بمرن خائینان).

بەڵام ناپلیۆن ئیتر نەیدەویست فەرمانڕەوایی بكات، لەپاریسدا ناوەندەكانی ئیداری سـەخت دڵنیگـەران بـوون، ئەنـدامانی ژووری بازرگانی وخاوەن بانكەكان ) كۆبوونەوەی مەشورەتیاندەكرد، تـرس ولـەرزێكی زۆر بـاڵی بەسـەر بۆرسـەدا كێـشابوو، ناپلیۆن دەیتوانی بەڕۆشنی ببینێت كەبرژوازیـەت دەسـتی لێهەڵدەگرێت وخـەریكی وەلانانیـەتی، ئـیتر بۆنەوچـینە كـەڵكی نەماوەو تەنانەت مەترسیداریشە.

ئەو كەبەدرێژایی دەسەڵاتداریەتی خۆی پـشتی بەوچـینە بەسـتبوو، ئێـستا دەیبینـێ ئەوچـینە خیانـەتیان لەگەڵداكردو بـۆ هەمیشە لەبەرخاتری ئەوچینە چاوپۆشی لەشەڕكردن پۆشی.

لە(22/ی یۆنیۆ)دا جارێكیتر لەبەرژەوەندی كوڕەكەی كەلەبەهاری ساڵی (1814)وە لەگـەڵ دایكیـدا لای بـاپیرەی فرانـسوا ئیمپراتۆری نەمسابوو، دەستی لەفەرمانڕەوایی فەرەنسا كێشایەوە، بـەڵام ئـەمجارەیان نەیـدەزانی داخـوا وڵاتـانی ئـەورووپا ئامادەن دەست لەبورینەكان هەڵگرن، لەبەرخاتری كوڕەكەی—یان نا.

لەوكاتەدا كۆمەڵێك خەڵكی زۆر لەدەوری كۆشكی ئیلیزێ، كەناپلیۆن لەوێدا نیـشتەجێ بـوو، كۆببوونـەوەو هاواریانـدەكرد (دەست لەكار نەكێشێتەوە، بژی ئیمپراتۆر) گەورەیی ولەخۆڕۆشی ئەو خۆپیشاندانانە بەئاستێكبوو برژوازی پایتـەخت تـەواو نیگەران ببوو ولەوەدەترسان دووبارە ئاگری شۆڕش هەڵگیرسێتەوە، ئارمایی شۆڕش لەوەش خراپتر ئەوشۆڕشەی كەناپلیۆنی كردە دیكتاتۆری ڕەها، بیروهۆشی برژوازیەتی جەنجاڵەتكردبوو.

ئێستا هەواڵی دەست لەكار كشانەوەی ناپلیۆن بڵاونەببۆوە كەسودی ملكداری وەرگرتن زیادیكرد، برژوازییەكان هاتنی ڕوس و بریتـانی و نەمـساوی و پروسـیان پێباشـتربوو لەهاتنـەناو بـواری سیاسـی ودەسـەڵاتی كرێكـارانی دەوری شـار [288] كەلـە خۆرناوابوونی ڕۆژی(22/ی یۆنیۆ)دا ئاشكرابوو ناپلیۆن بۆ مالمزون چووەو دەست لەكار كشانەوەی ئـەو پاشـگەزبوونەوەی نییە، ئیتر وردەوردە خەڵكەكە بڵاوەیانلێكرد.

ئەو چالاكی وگورج وگۆڵی و خۆپیشاندانانەی كرێكارەكان دەیانكرد هۆكەی زیاتر ئەوەبوو لەكەژی هاویندا هەزاران كرێكـاری بینا، كەلەشارۆچكەكانەوە بۆكاشی كردنی شەقامەكان و بەردتاشی و دیواردانان و ئاسنگەری ودرتاشی.. هیتر، دەهـاتن بـۆ پاریس، لەگەڵ خەڵكی زەحمەتكێشی پایتەختدا زیاتردەبوون، ئەم كرێكارانـە كرێكارەكـانی پاریـسیان خۆشدەویـستن بۆیـە ئەمانە كەهەم كرێكاربوون وهەم گوندنشینیش، دوو ئەوەندە ڕقیان لەبورینەكانی دەبۆوەو لەبوونی ناپلیۆن ئـەوەیان بـەدی

[288] - نووسەر لێرەدا دوومەبەستی هەیە، یەكێكیان ئەهاتنەوەسەركاری چەپەكان، كەبەكۆمۆنەی پاریس ناسراون، ئەوی تریشیان مەبەستی لەكرتنەدەسەڵاتی لایەنەكانی تری شۆڕشە كەمیكانیزمی شۆڕشی مەزنی فەرنسابوون، بەتایەت لەوەی كرێكارەكان دەیانویست لەبەرامبەر هێرشی بێكانان بۆسەرفەرەنسا بەركریبكەن.(و- فارسی).



دەکرد کەکەسێکە پارێزگاری لەئەوان دەکات لەمەترسی هاتنەوەی بوربۆنەکان بۆسەر کورسی دەسەڵات، ئەمانە نەیاندەتوانی تۆتکەبگرن وچاویان بەرینایی نەدەدا ناپلیۆن دەست لەفەرمانڕەوایی کردن بکێشێتەوە.

ئەوانە دەڕژانەسەر جادەکان وئەو کەسانەی جلوبەرگی جوانیان لەبەردابوو گومانی ئەوەیان لێدەکرا ئەشرافبن، بەئەنقەست دایان دەگژانێ، ئەمەش تەنها بەبەهانەی ئەوەی لەگەڵ میللەتدانین و هاوارناکەن بڵێن (دژی دەست لەکار کشانەوەی ئیمپراتۆرین).

یەکێك لەوکەسانەی پێش ڕۆژانی(23 و24 و25)ی یۆنیۆ لەپاریسدابووە ڕووداوەکانی بینیوەو ئاوای نووسیوە (هەرگیز میللەت، ئەو میللەتەی کەباجی دەرامەتی دەداو شەڕی دەکرد، هەتا ئەو ئەندازەیە حۆشەویستیان بۆ ئیمپراتۆر دەرنەبڕیبوو).

ئیمپراتۆر لە(28/ی یۆنیۆ)دا لەمالمزونەوە بەتەمای ڕۆیشتن بۆ ڕۆخەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی وەڕێ کەوت، بەونیازەی یەکێك لەوکەشتیانەی کەلەبەندەری ڕوشفوردابوون سواربێت وبۆ ئەمریکا بچێت، بەفەرمانی وەزیری دەریایی فەرەنسا دووکەشتی بۆئەو مەبەستە ئامادەکرابوون، کاتێ ناپلیۆن سەعات(8/ی بەیانی ڕۆژی(3/ی یۆنیۆ) گەیشتە بەندەری ڕوشفور، کەشتییەکان ئامادەی هەڵدانی چارۆکەکانیان بوون، بەڵام چوونەدەر لەبەندەرەکە نەدەکرا، چونکە دەستەیەك لەهێزی دەریایی بریتانیا تەنگەبەری بەندەرەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو.

ناپلیۆن چاوەڕوانی کێشاو بەئاشکرا دیاربوو دەیەوێت کات بەسەربەرێت، بەبڕوای ئەوەی ڕۆمانسی ساڵانی (1830) شاکاری پرشانازی ناپلیۆن تەنها قوربانیەکی کەمی مابوو، ئەگەر لەناو مێشکی خەڵکدا وێنای پرومتەیەکی [289] تازەی بەزنجیر بەبەردەوە بەستراو بۆهەمیشە لەناو هۆشیاندا نەمابایەوە، ئەوا ئەفسانەی ئیمپراتۆری ناپلیۆن، تەواو پرشکۆ نەدەمایەوە).

ناپلیۆن بۆخۆی پەی بەوڕاستییە بردبووکە نەیدەویست بەکۆتاییەکیتر شاکارە ئەفسانەکەی خۆی کۆتایی پێبێنێت ،هەرچۆنێکبێت دواتر ئیمپراتۆر نەیتوانی پاساوێکی قانع پێکەرانە بۆئەو هەڵوێستەی خۆی بێنێتەوە، پێشناریان بۆئەوکرد بەیەك کەشتی بچوك بەنهێنی سەفەرەکەی بکات، بەڵام ئەو بەمە ڕازینەبوو، بوونی ئەو لەڕوشفوردا ئاشکرابوو، ڕۆژانە هەزاران کەس لەبەر پەنجەرەکانەوە دروشمیان دەگوتن وهاوارییاندەکرد بژی ئیمپراتۆر، سەرئەنجام لەڕۆژی(8/ی یۆلیۆ)دا سواری کەشتییەکبوو وکەشتییەکە لەبەندەرەکە چۆدەرێ، بەڵام زۆری نەبرد کەشتییەکە ناچاربوو لەدورگەی ئاکسدا لەنگەربگرێت، چونکە هێزی دەریایی بەرتانیا هەموو ڕێگاکانی چوونەوەسەر ئۆقیانووسیان گرتبوو.

ناپلیۆن دابەزی وهەموو خەڵکی ئەوێ ناسیان، مەلەوان وماسی گرو هەموو خەڵکی ئەوشوێنە بەرەولای کەشتییەکەی ناپلیۆن هاتن، سەربازەکانی سەربازگەی ئەو دورگەیە تکایان لەئیمپراتۆرکرد سەردانیان بکات وناپلیۆن بەڕازی بوونی بەتکای ئەمانە سەربازەکانی نغرۆی شادیکرد، ناپلیۆن چاوی بەوپێگەو شوێنە سەربازییە کەوت کەپێشتر بەفەرمانی خۆی لەو دورگەیەدا دانرابوون، کاتێ گەڕایەوە ناوکەشتییەکە ئەوەیان پێراگەیاند کەدەسەڵاتدارانی حکومی لەپاریسدا پەیامێکیان ناردبوو وتێیدا

---

[289] - پرومتە: خوایەکی ئەفسانەیی، کلتوری یۆنانییەو لەلایەن زیۆسی خوای خواکانەوە سزادراوەو بەدەست وپێ زنجیرکراوی لەسەر کێوەکانی قەوقازدا بەتاشە بەردێکەوە بەستراوەتەوە.. بۆزانیاری زیاتر، سەیری کتێبی ئەفسانەی خواکان بکە.(و-کوردی).



ئاگاداریان کردبوونەوە هەتا هێزی دەریایی بریتانیا لەوناوەدابێت ئەو کەشتییەی ئیمپراتۆری لەسەرە نابێ بکەوێتەجوڵە، بەڵام بریتانییەکان لەکەنداوەکەدا گەشتیان دەکردو ئامادەی شەڕبوون.

لەگەڵ ناپلیۆندا دوك دورۆڤیگو (ساواری )و مونتولون و مارشال برتران و لاسکاز ودەستەیەك ئەفسەریتر هەبوون و ئەمانە هەتا سەرئێسکان لەبەرامبەر ئیمپراتۆردا بەوەفابوون، ناپلیۆن بڕیاریدا ساواری و لاسکاز بۆ گفتوگۆکردن لەگەل بریتانییەکان سەبارەت بەوەی ئایا ڕێگادەدەن ئیمپراتۆر بەکەشتی بڕوات بۆئەمریکا– یان نا، نارد؟

ئەم نێردراوانە لەلایەن لێپرسراوی دەریاوانەکانی بریتانی بەناوی میتلند پێشوازیان لێکراو ناوبراو بەوەڵامدانەوەیەکی بەڕێزەوە گوتی ( ئەگەر حکومەتی بریتانیا ڕێگابدات ناپلیۆن بڕوات بۆئەمریکا، گرێنتی چی هەیە بەوەی پاش ماوەیەك ناوبراو ناگەڕێتەوەو شەڕی خوێناوی جارێکیتر لەگەڵ ئەوروپادا ناکاتەوە؟

ساواری لەوەڵامدا گوتی: دەست لەکارکێشانەوەی ساڵی (1814 )ی ئیمپراتۆر جیاوازە لەگەڵ ئەمەی دواییدا، چونکە ئەم جارەیان ئیمپراتۆر بەمەیلی خۆی دەستی لەدەسەڵات هەڵگرتووە، دەنا دەیتوانی دوای شەڕی واترلوش هەرلەسەر کورسی دەسەڵات بمێنێتەوەو درێژەش بەشەڕبدات، بەڵام ئەو ئەمجارەیان دەستی لەدەسەڵاتداریەتی هەڵدەگرێتو خەریکی ژیانی تایبەتی خۆی دەبێت، میتلند گوتی: ئەگەر وابێ بۆچ ناپلیۆن داوای پەناهەدەی لەبریتانیا ناکات؟ لەکۆتای گفتوگۆکەدا، نوێنەرەکانی ناپلیۆن نەیانتوانی بچوکترین بەڵێن وەربگرێن، تەنانەت سەبارەت بەوەی داخۆ حکومەتی بریتانیا ناپلیۆن وەك دیلی شەڕ سەیردەکات–یان نا،بەڵێ هیچیان وەگیرنەکەوت.

کاتێ ئەمانە گەڕانەوە کەشتییەکەی ناپلیۆن ئەفسەری دوو تیپی دەریایی فەرەنسا ئەمەیان زانی ئەگەری ئەوەهەیە ئیمپراتۆر بەدیلی بکەوێتەدەست بریتانییەکان بەمە تورەبوونو بەژاوەژاو کەوتەڕێ.

لێپرسراوی هێزە دەریایەکەی فەرەنسا پونە، بەژەنراڵ دوموتولوونی گوت: من لەگەڵ ئەفسەرو سەربازەکانی خۆمدا مەشوەرتم کردووەو بەناوی ئەوانەوە قسەلەگەڵ تۆدادەکەم: دوای ئەم قسانە بلانەکەی خۆی بۆناوبراو باسکردو گوتی: کەشتییەکەی من (مدوز)نیوە شەو بچێت کەشتی بلروفونی بریتانی غافل أبکاتو بەگژیدا بچێت، ئەمکارە دەبێتەهۆی ئەوەی بریتانییەکان بۆماوەی دووسەعات سەرقاڵی شەربن، ئاشکرایە کەکەشتی مدوز تێدادەچێت، بەڵام ئەوماوەیە بەسە بۆ رەتبوونی کەشتی سال کەئیمپراتۆرتێدا دەبێتو کەشتییە جەنگییەکانی بریتانیا (میتلند)و پێی گوت ناپلیۆن بڕیاریداوە چارەنووسی خۆی بەدەستی بریتانییەکان بسپێرێت.

میتلند گوتی: دڵنیاتان دەکەمەوە بێ ئەوەی هیچ بەرپرسیارێك کەلەئەستۆی خۆم دەگرم لەناو کەشتییەکەی خۆمدا بەوپەری ڕێزەوە پێشوازی لێدەکەمو شکۆمەندی وەمەزنی ئەو دەپارێزم. لە(15/ی یۆلۆی ساڵی 1815)دا ناپلیۆن سواری کەشتی چارۆکەداری دیاریکراو بوو، هەتا خۆی بگەیەنێتە کەشتی بلوروفونی بریتانیا، ئەوجارێکیتر جلە جوانەکانی خۆی کەجلی یەك رەنگی تفەنگی بەدەستەکانی گاردی تایبەت خۆی بوون، لەبەرکردوو کڵاوە بچۆلە بەناوبانگەکەشی نایەسەری، لێپرسراوی کەشییە چارۆکەدارەکە لەپێشەوەی سەربازەکانی دەریایی فەرەنسا کەبەرێزەوە وەستابوون هاواریکرد بژی ئیمپراتۆر) دواتر هاتەپێش وخۆی بەئیمپراتۆر ناساندو چاوەروانی دەتوانێت بەتەنگەبەری کەنداوەکە تێپەرێتو ماوەیەکی زۆریش لەتەنگەبەری کەنداوەکە دوور دەکەوێتەوە، چونکە بەلەمە جەنگییەکانی تری بریتانی نەیدەتوانی روو بەرووی کەشتیەکی



وەك سال ببێتەوەو تەنها دەیانتوانی کەمی وەدوای بخەن، ئەفسەرانی کەشتی مدوز گوتیان ئامادەین گیانی خۆمان لەپێناو دەریازبوونی ئیمپراتۆر بەختبکەین. کاتێ ئەم پێشنیارەیان بەناپلیۆن گوت: بەمونتولونی گوت: ئامادەنیم قوربانییەکی ئاوا بۆدەربازبوونم قبوڵبکەم، چونکە ئەو ئیمپراتۆر نەماوەو ناشێ یەك کەشتی جەنگی فەرەنسی بکات بەقوربانی رزگاربوونی کەسێکی ئاسایی، ئینجا ناپلیۆن کەشتی سالی جێ هێشتو لەدورگەی ئاکسدا دابەزی، چەند ئەفسەرێکی گەنج ئەوەیان گرتەئەستۆ بەبەلەمێکی جەنگی بچوك ئیمپراتۆر بگەیەنێتە شوێنی مەبەست.

بەلآ ئیمپراتۆر سەبارەت بەچارەنووسی خۆی دوابریاری دابوو، لاسکاز چووەلای لێپرسراوی فەرماندەی کەشتییەکەو بریاری ناپلیۆنی پێگوت.

کەشتی چارۆکەداری دیاریکراو بەسەر ئاوەکەدا رۆیشتو لەتەك کەشتی بلروفونی بریتانیادا لەنگەریگرت.

میتلند لەنزیك پەیژەی دەروازەی کەشتییەکەدا بەسەلام کردنی سەربازی توندەوە پێشوازی لەئیمپراتۆرکرد. هەر کەناپلیۆن پێی نایەسەر تەختایی کەشتییەکەی بریتانیای بینی هەموو سەربازەکانی بەریز راوەستاون ومیتلیند هەموو ئەفسەرەکانی خۆی بەئیمپراتۆر ناساند، ئینجا ناپلیۆن چووە باشترین ژووری کەشتییەکە کەمیتلیند بۆئەوی رازاندبۆوە، ئیستا بەهێزترینو سەرسەختترینو ترسناکترین دوژمنی کەبریتانیا بەدرێژایی مێژووی خۆی توشی نەبووە، کەوتبۆ چنگی.



# سـنت هێلین (1815- 1821)

( 1 )

لەسەرەتای سەدەی(16)دا یەکێك لەجیهان گەراکانی پورتوگالی، کەدوای واسکۆدۆگاما خەریکی دۆزینەوەی تازەبوو لەخوارو ئۆقینانووسی ئەتلەسی، دوورگەیەکی بچوکی لە(15٫5)ی هێڵی پانی خوارووی دۆزیەوە کەدانیشتوانی تێدانەبوون.

ئەم دۆزینەوە لە(21/ی مانگی مایۆی سالی 1501)دابوو چونکە ئەو رۆژە لەسالنامەی کلیسادا بەناوی سنت هێلینەو ناوی یەکێك لەقدیسەکانە، ناوی ئەو دورگەیان نا سنت هێلین، ئەو دورگەیە لەسەدەی هەڤدەمەمدا کەوتەژێر دەسەلاتی هۆلەندییەکان، بەلام بریتانییەکان لەسالی(1673)دا بۆهەمیشە داگیریانکردو کۆمپانیای بریتانی هندی خۆرهەلاتی ئەم دورگەیەی کردە پایەگای نێوان بریتانیاو هیندستان، کاتێ دەولەتی بریتانیا زانی ناپلیۆن خۆی تەسلیمی کەشتی بلوروفون کردووەو بۆتە پەناهەندە، بریاریدا بۆئەو دورگەیەی بنێرێت، نزیکترین خاکی سەردەریای ئەفریقا (200) کیلومەتر دوورە رۆیشتن لەبریتانیاوە بۆ دورگەی سنت هێلین ئەوکاتە دوومانگو نیوی دەخایاند، ئەو پێگە جوگرافییە بووەهۆی ئەوەی حکومەتی بریتانیا بریاربدات ناپلیۆن بۆ ئەوێ دووربخاتەوە، چونکە بەتایبەت دوای سەد رۆژ حوکم کردنەکەی جاری دووەمی ناپلیۆن، لەوەدەترسا نابراو شاکارە جەنگییەکەی خۆی تۆمار بکاتەوە.

بەدیارکەوتنەوەی سەرلەنوێی ئەو لەفەرەنسادا، ئەگەری ئەوەی هەبوو ئیمپراتۆریەت زیندوبکاتەوەو شەرێکی تازە لەئەوروپادا بەرپابکات، دورگەی سنت هێلین بەوەی لەناوەراستی ئوقیانووسدا بوو وزۆر دووربوو لەئەورووپا، ئەگەری گەرانەوەی ناپلیۆنی لەئارادا نەهێشت. شاعیرانی رۆمانسی مێژوو نووسە نووسەرە نیشتمان پەرستەکانی فەرەنسایی، پێیانوایە بۆیە بریتانیا ئەو دورگەیەی بۆناپلیۆن دیاریکرد هەتا زیندانییەکەی خۆی زوتر بکوژێت، بەلام ئەم گوتانە راستنین، ئاو وهەوای سنت هێلین زۆر سازگارە، پلەی گەرمی لەکەشی هاویندا دەگاتە(24)و پلەی سەرماش (18) پلەیە. ئەمرۆ لەودورگەیەدا لێرەواری کەم دەکەونەبەرچاو، بەلام سەدەیەك لەمەوبەر جەنگەڵ لێرەدا زۆرو چربووە. ئاوی خواردنەوەی سنت هێلین زولاڵ و تەندروستە، خاکەکەی تێر ئاودەبێت وپرە لەگژوگیای زۆرو بەرز، رووبەری ئەو دورگەیە (122)کم چوار گۆشەیە، تاشە بەردی نوکتیژی سەوزباوی لەرۆخەکاندا هەیەو دەڵێی لەناوەراستی ئوقیانووسدا سەریان دەرهێناوە، چەند کەسێکی دیاریکراو لەگەڵ ناپلیۆندا نێردراون بۆ سنت هێلین ، چونکە بریتانیا داواکاری زۆر لەو کەسانەی ویستبویان لەگەڵ ناپلیۆندابن رەتکردبۆوە. هاوەڵەکانی ئیمپراتۆر بریتی بوون لە: مارشال برتران و هاوسەرەکەی، ژنرال کنت دومونتولون وهاوسەرەکەی، ژەنەراڵ گورگو ولاسکاس و کورەکەی وپێش خزمەتە تایبەتیەکەی ناپلیۆن مارشان و چەند دەستو پێوەندێکیتر کەلەناویاندا کەسێکی کرسی هەبوو بەناوی سانتینی. سەرەتا خانوێکی کەمێ بەرتەنگو تارێکیان دایە ناپلیۆن، بەلام پاش ماوەیك بۆخانویەکی گەورەو بەرفراوانیان گواستەوە کەکەوتبۆ بەشی باشووری دورگەو پێی دەگوترا لانگ وود.

هەتا مانگی ئەبریلی ساڵی(1816) ئەو دورگەیە لەژێر ئیدارەی دەریاوانی کوکبرندابوو، بەڵام لەمانگی ئبریلی ساڵی(1816) بەدواوە هەتا مردنی ناپلیۆن، کەسێك بەناوی هودسن لاو، بووبە حاکمی ئەو دورگەیە.

لاو سەربازێکی تورەو بیرکورت بوو ولەدنیا لەهەمووشتێك زیاتر لەزیندانییەکانی دەترسا. هەستی بەلێپرسراوێتی زۆر دەکردو بەترس ولەرزەوە رۆژگاری بەسەردەبرد، لەوەی نەکا ناپلیۆن هەڵبێت، زۆرجار بەو فەرمانانەی کەدەدرانە حاکمی ئەو دورگەیە.

ناپلیۆن تەواو ئازادی هەبوو لەوەی بەپێ- یان بەسواری بەدورگەکەدا بگەرێتو پێشوازی لەمیوانەکانی بکات.

لەسەرتادا ناپلیۆن پەیوەندی پاشی لەگەڵ هودسن لاودا نەبوو وبەگشتی لەمەنزلگاکەی خۆیدا پێشوازی لەئەو نەدەکردوو بۆ داعوەتەکانی ئەو نەدەچوو کەبۆ ئەمی سازدەکرد، چونکە هودس لاو، ناپلیۆنی بەژنراڵ بۆناپارت ناودەبرد.

لەو دورگەیەدا نوێنەرانی ولاتانی وەك روسیاو نەمساو فەرەنسا هەبوون، ناپلیۆن لەماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لەزۆر خەڵکی هەمەرەگەز دەکرد کەدەچوون بۆ هندوستان وئەفریقاو بەپێچەوانەش، کە ئەوانە لەسنت هێلیندا لایاندەدا، یەك تیپی سەربازی بۆ پارێزگاری کردن لەدورگەکە نێردرابو بۆ جیمزتاون کەتەنها شارۆچکەیەکی بچوکی سنت هێلین بوو وکەمێك لەلانگ وودەوە دووربوو، جێگای ئامادەبۆکردنە سەربازانی بریتانی نەك هەرتەنها بەچاوی رێزەوە سەیری ناپلیۆنیان دەکرد، بەڵکو زۆرجار هەستی پرخرۆشی خۆیان لەبەرامبەر ئەودا دەردەبری، بۆنموونە: سەربازەکان دەستەگوڵیان بەدیاری بۆ ناپلیۆن دەناردو لەبەر ئەوانەی دەورووبەری ناپلیۆن دەپارانەوە رێگایان بدەن ئمپیراتۆر ببینن، ئەو ئەفسەرانەی لەبەرخاتری چاودێریکردنی ناپلیۆن ناچاربببوون ساڵانێکی دوورو درێژ لەو دورگەیەدا بمێننەوە، دواتر کاتێ باسیان لەزیندانکراوەکەی خۆیاندەکرد بێ ئیرادەی خۆیان هاودەردی وخۆشەویستی خۆیان بۆ ناپلیۆن دەردەبری، ئەم بارودۆخە نەیدەتوانی نەبێتەجێگای سەرنجی نوێنەرانی ئەورووپایی کەبۆ چاودێری کردنی حاڵی ناپلیۆن لەو دورگەیەدا بوون، کنت بالمن، نوێنەری ئیمپراتۆری روسیا، لەم بارەوە دەڵێت (لەهەموو شتێك سەیرتر ئەوەیە ئەوپیاوە زیندانیەی لەتەخت وتاراج بێبەشکرابوو وچواردەورەی پاسەوان بوون، نفوزێکی زۆر بەهێزی هەبوو وکاریگەری دەکردەسەر ئەوکەسانەی بۆسەردانی دەچوون، کەفەرەنسییەکان دەیانبینی هەڵدەلەرزین وخزمەتکردن بەئەویان بەشەرەفێکی گەورە دەزانی و شانازیان پێوەدەکرد، بریتانییەکان بەکرنوژبردن و رێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدادەکرد، هەتا ئەو کەسانەی کەچاودێریکەری ئەویشن هەوڵدەدەن ببنەجێگای سۆزو بەزەیی ئەو ویەك قسە لەدەمی ئەوەوە ببیستن، کەس غیرەتی ئەوەی نەبوو خۆی بەهاوتاو هاوشانی ئەو لەقەڵەمبدات).

لەدەربارە بچوکەکەی ناپلیۆندا هەمیشە ئەوانەی لەگەڵیدا هاتبوون بۆ سنت هێلین لەنێوان خۆیاندا گێرەو کێشەیان هەبوو و وەك ئەوەی لەپاریس لەکۆشکی تویلری دابن، ئای و ئۆنیان لەدژی یەکتری دەنایەوە.

لاس کازو ومونتولون و گورگو و برتران، ناپلیۆنیان دەپەرست و ئەویان بەخوای خۆیان دەزانی و ئیرەییان لەبەرامبەر یەکتریدادەبوو، هەتا وایلێهات، گورگو لەگەڵ مونتولومدا پێکهەڵپرژان و تورەبوونی ناپلیۆن توانی کۆتایی بەم پێکهەڵچوونەی ئەم دوانەبێنێت.



سێ ساڵ دوای ئەمە ناپلیۆن بەبەهانەی هەمەجۆر لەڕاستیدا بۆئەوەی لەدەست کلکەسوتەو ستایشی لەرادەبەدەرو هەڵسوکەوتی نابەجێ و بێزارکەر، گورگوی بۆ پاریس گێڕایەوەو ناچاریشبوو لاسکاز لەخۆی دووربخاتەوە، لەساڵی (1818)دا هودسن لاوی حوکمڕانی دورگەکە لاس کازی ناچارکرد سنت هیلین جێبێڵێت،

لاسکاز یاداشتەکانی خۆی لەگەڵ ناپلیۆندا دەنووسییەوەو زۆرجار ئیمپراتۆر بۆی ڕاست دەکردەوەو بەوجۆرە لاسکاز بیرەوەرییەکانی لەسنت هێلیندا نووسینەوە.

ئەم یاداشتانە سەرنج ڕاکێشترین بەڵگەن کەلەبەر دەستدامابن، کاتێ لاسکاز ناچارکرا ئەو دورگەیە جێبێڵێت، ئیتر ناپلیۆن نەیتوانی کەسێکی تری وەك ئەو شارەزاو خوێندەواری دەستبەکەوێت، بۆیەش زانیاری ئێمە دەربارەی دواین ساڵانی تەمەنی ئیمپراتۆر زۆرکەمە.

ئەو هەراسانکردنانەی هودسن لاو، بەتایبەت بەوەی ناپلیۆن ڕێگای نەدەدا حاکمی دورگەکە بێتە ماڵەکەیی و ئاو وهەوای سنت هێلین وسنووورداری خەرجی ڕۆژانەی بژێوی، ببوونەهۆی غەمبارییەکی قوڵی ناپلیۆن و ئیمپراتۆر نەیدەدرکاندن، بەڵام بەسیمایەوە دیاربوون و دەربارییەکانی هەستیانپێکردبوو.

( 2 )

ئەوەی ناپلیۆنی هەراسانکردبوو بێکاری بوو، ئەو زۆر کتێبی دەخوێندنەوە، بەپێیان دەگەڕاو بەسواری ئەسپ گەشتی دەکردو یاداشتەکانی خۆی بەلاسکاز دەنووسییەوە، بەڵام بەلای ئەوەوە کەجاران (15) تەنانەت زۆرجار (18) سەعات کاری دەکرد، ئەم بێکارییەی ئێستای بەرگەنەدەگرت، ئەو حاڵەتی ڕۆحی خۆی بەیان نەدەکردن ودەیویست خۆی بەئاسودەو خۆشحاڵ ودەمبەپێکەنین نیشانی ئەو کەسانەی دەورووبەری بدات، زۆرجاریش ئەو مەلولی وغەمانەی خۆی بەریادەدان و ئەو باروبۆخە تازەیەی تێی کەوتبوو بەشکۆمەندییەوە بەرگەدەگرت، لەوکاروانە دوورو درێژەی خۆی هەرلەسواربوونی لەکەشتی جەنگی نورسمبرلندی بریتانییەوە، ناپلیۆن دەستی بەنووسینەوەی یاداشتەکانی کرد، هەتا ئەوکاتەی لاسکازیش لەدورگەی سنت هێلین بەدەرخرا هەرئەو بۆی دەنووسینەوە، گفتوگۆکانی لەگەڵ لاسکازو مونولون و گورگو، ئەو یاداشتانەن کەلەژێر ناونیشانی (نامەکانی کاپ) نووسراونەتەوەو ناپلیۆن چاوی پێداخشاندوونەوەو دواتر لاسکاز بەفەرمانی ئیمپراتۆر بڵاویکردبوونە، تاکە سەرچاوەن کەڕاستییە مێژووییەکان بەجۆرێك نیشانی ئێمەدەدەن کەناپلیۆن ویستویەتی ئەم ڕاستییانە بگەنەدەست نەوەکانی ئایندە.

هەموو ئەو بیرەوەرییانەی وابەستەبە گوتەکانی ناپلیۆنن ئەو یادداشتانەی کەدەتوانرێت بۆ ئەمانە ببنەجێگای ئیعتبار بۆ مێژووی ئەفسانەیی ناپلیۆن بەهرەی لێهەڵێنجرێت[٢٩٠] بێ بەهان، بەڵام بۆناسینی تایبەتمەندییەکانی خودی ناپلیۆن و مێژوو وفەرمانڕەوایی ئەو بەڵگەی بەبەهاو جێگای متمانەی تەواو زۆر کەمن،

---

[290] -مەبەستی نووسەر لەیاداشتەکانی لاسکازو مونتولون و گورگو وئانتومارشی پزیشکە تایبەتییەکەی ناپلیۆنە کەلەفەرەنساوە لەگەڵیدا هاتبوو بۆ دورگەی سنت هێلین وهەروەها ئومری پزیشکی تایبەتی ناپلیۆن.



ئەفسانەی ناپلیۆن کەدواتر ڕۆڵێکی تاریخی چالاك بگێڕێت، بووەجێگای سەرنج وسەرسامی و بیروهۆشی شاعیرو نووسەرو هونەرمەندو سیاسەتمەدارانی بۆ ئەوکەسایەتییە مەزنە مێژووییە سەرقاڵکردووە، کەلەناویاندا کەسانی بەناوبانگ و دیاری وەك: ڤیکتۆر هۆگۆ و هاندری هاینەرو گۆتەو پوشکین و لێرمین تۆف و بلزاك و میکیوڤیچ و زۆری تر هەن، ئەو کەسایەتییەی دوای شەڕی ینا، بەڕای هیگڵ (ڕۆحی جیهانی) ناونراو بووە میکانیزمی پێشەنگی دیاری مێژووی مرۆڤایەتی و ئەو ئەفسانەیە لەسنت هێلیندا گیرسابۆوە، بەلام ئێمە لەم کتێبەماندا تەنها باس لەخودی ناپلیۆن وەك واقیعمان کردووەو خۆمان لەقەرەی مێژووی ئەفسانەکانی ناپلیۆن نەداوەو کارمان بەمەنییە، بۆیە زانیاری کەممان دەستکەوتووە سەبارەت بەئیمپراتۆر لەوکاتانەی لەدورگەی سنت هێلیندا ژیاوە.

خوا شتی دروست و ڕوون دەڵێت و بەندە بەوەفاکانی دەینووسنەوە، پەرستن و عشق و شکۆمەندی مەزهەبی ئەو هەستانەنین کەبەکەڵکی شیکارو لێکدانەوەو ڕەخنەلێگرتن بێن.

ناپلیۆن هەرچی بەدەوروبەرەکانی خۆی دەگوت وبەرووکەش ڕووی دەمی لەوانەبوو، بەلام بۆ نەوەکانی ئایندە دەدواو بۆ تۆمارکردنی بوو لەناو مێژوودا، ئایا لەوکاتانەدا دەیتوانی دڵنیابێت لەوەی ڕۆڵەکانی ئەو بۆشانشینی فەرەنسا دانراون؟ ئێمە نازانین، بەلام ئەو لەگەڵ ئەوانەدا کەلێی نزیکبوون بەجۆرێك گفتولفتی دەکرد وەك ئەوەی پێشبینی ئەوەی کردبێت، هەتا جارێکیان بەڕاشکاوی گوتی: کوڕەکەم فەرمانڕەوایی دەکات.

هەموو ئەو تێبینیە بێ ژمارانەو لێکدانەوە نووسراوەکان کەسەبارەت بەشەڕەکانی ئەو وکارامەیی و سەرداریەتی مەزنی ئەو نووسراون جێگای سەرنجن. لەهەریەك لەگوتەکانی ئەو دەتوانین پەی بەوەبەرین ناوبراو شارەزاو لێزانی گەورەی بواری سەربازی بووەو عاشقی پیشەکەی خۆی بووە، بۆخۆی دەڵێت: شەڕ هونەرێکی سەیرە، من لەشەست شەڕی گەورەدا بەشداریمکردووە، بەلام دڵنیاتان دەکەمەوە لەو شەڕانەدا شتێك زیاتر فێرنەبووم لەوەی لەیەکەم شەڕدا دەمزانی.

ناپلیۆن ڕێزی تایبەتی بۆ(تورن و کندە)[291] دادەنا، بێگومان خۆی بالاتر لەهەموو سەردارانی سەردەمەکانی ڕابردوو دادەنا، هەرچەندە هیچ کاتێ ئەمەی بەڕاشکاوی دەرنەبڕیووە.

بەتایبەت لەشەڕەکانی ئوسترلیتزو مۆسکو وڤاگرام وشەڕەکانی ئیتالیا(1796 –1797)و پێش دوایین شەڕی لەساڵی(1814)دا، زۆر بەخۆی دەنازی و تێکشکاندنی سوپای نەمسای لەڤاگرام بەیەکێك لەشاکارە گەورەکانی شەڕی خۆی لەقەڵەمدەدا،

بەگوتەی ناپلیۆن ئەگەر تورن و کند، لەشەڕی ڤاگرامدا بەشداریانکردبا، ئەوا هەروەك ئەو دەیانتوانی پەی بەوەبەرن کلیلی سەرکەوتن لەکوێدایە، درێژەی بەقسەکەی داوەو گوتویەتی (بەلام سیزارو [292] ئانیبال [293] سەرەودەریان لەمە دەرنەدەکرد) هەروەها دەیگوت: ئەگەر لەشەڕەکاندا (تورن) لەتەکمابا دەبوومە فەرمانڕەوای جیهان.

---

291 - دوو فەرماندەی سەربازی بەناوبانگی سەردەمی لویسی چواردەبوون،(و- فارسی).

292 --سەرکردەیەکی سەربازی بەناوبانگەو پێشتر لەم کتێبەدا ئاماژەی بۆکراوە،(و- کوردی).

293 -مەبەست لەقەیسەری ئیمپراتۆری ڕۆمیە،(و- کوردی).



بەڕای ئەو باشترین سوپا ئەوەیە هەموو ئەفسەرێك بزانێت شوێنی دیاریکراوی خۆی کوێیەو دەبێ چیبکات، جارێکیان مەخابنی بۆئەوە خواست وگوتی: بۆ لەشەڕی مۆسکۆ-یان لەکریملیندا نەکوژرام، بەڵام زۆرجار کەباس دەهاتەسەر شەڕەکان دەیگوت: خۆزگە لەدرسد- یان لەمەش باشتر لەشەڕی واترلودا کوژرابام، بەلەخۆڕازی و لوتبەرزییەوە باسی حکومەتە سەد ڕۆژییەکەی کەلەکەنداوی ژوانەوە دابەزی و(عەشقی میللەت) دوای شەڕی واترلوی دەکردو شانازی گەورەی بەمەوە دەکرد.

هەمیشە داخی ئەوەی بوو بۆچ میسری جێهێشت ودوای گەمارۆدانی سوپای تورك لەعکای سوریادا (1799) پاشەکشەی کرد، بەڕای خۆی دەبوا لەخۆرهەڵاتدا مابایەوەو سعودیەو هندوستانی داگیردباو ببوا ئیمپراتۆری خۆرهەڵات نەك خۆرئاوا، تانکیدی لەسەر ئەوەدەکردەوە ئەگەر عکای داگیرکردبا، ئەوادەستی دەگەیشتە قستەنتینیەو هندوستانیش، هەروەها ئەمەی دووبارە دەکردەوە: کەسێك میسری لەدەستدابێت ئەوادەبێتە خاوەنی هندوستانیش، سەبارەت بەدەسەڵاتداریەتی بریتانیاش بەسەر هندوستاندا دەیگوت: کۆمەڵێ سەربازم بەسە هەتاخۆم بگەیەنمە هندوستان وبریتانیا لەو وڵاتە دەربەڕێنم.

زۆر باسی واترلوی دەکردو پێی وابوو ئەگەر پێشهاتە چاوەڕواننەکراوەکان نەبان- یان ئەگەر کەسانی وەك بسیرو لان (کەلەشەڕەکانی پێشودا کوژرابوون- یان مورای لەگەڵیدابا، سەرئەنجامی شەڕەکە ئاوانەدەبوو وەك هاتەپێش.

بەتایبەت ئەو شتەی ئازاری پێوەدەکێشاو غەمی لێدەخوارد ئەوەبوو بریتانیا لەم شەڕەی کۆتاییدا سەرکەوتبوو.

هێرشکردنەسەر ئیسپانیاو ڕوسیا هەڵەی گەورەی ئەوبوون و بۆخۆی ئەم دوو هەڵەی دەزانین، بەڵام چاوپۆشی لێدەکردن و دەیگوت: ناڵێکتێکگەیشتن وایلێکرد لەشکرکێشی بۆسەر مۆسکۆبکات، لەهەمان کاتیشدا نوکلی لەبەرپرسیاریەتی خۆی نەدەکرد.

ناپلیۆن پێی وابوو ئەوکاتەی گەیشتە درسد لەساڵی (1812)داو پێیان ڕاگەیاند برنادوتی پاشای سوید بەنیازنییە لەشەڕکردنی لەگەڵ ڕوسیادا یارمەتی ئەوبدات، هەروەها هەواڵی ئەوەشی پێگەیشت پاشای عوسمانی لەگەڵ ڕوسیادا پەیمانی ئاشتی مۆرکردووە، دەبوا یەکسەرە وازی لەهێرشکردنەسەر ڕوسیا هێنابا، تەنانەت ئەوکاتەی مۆسکۆشی داگیرکرد باشتروابوو دەستبەجێ ئەوشارەی جێهێشتباو درێژەی بەهێرشکردنەسەر کوتوزوف داباو سوپای ڕوسیای لەناوبردبا.

ناپلیۆن دەیگوت: ئەم شەڕە شومە لەگەڵ ڕوسیادا بەهۆی ناڵێکتێکگەیشتنەوە بوو وئەو نەهامەتییە هەموو سەربازەکانی منی کەمابوشن تاڵیوارەکانی مەرگ ڕاکێشکرد، دواتر بووەهۆی ئەوەی وڵاتانی دنیا یەك ڕیزبن دژی من... ئایا ئەمە بۆخۆی موعجیزەیەك نەبوو کەمن توانیم بۆماوەیەکی دوورو درێژ لەبەرامبەر ئەم هەموو کارەساتانەدا خۆم ڕاگرم و دووبارە بەسەر هەموو کێشەکاندا سەربکەومەوەو لەجاران بەهێزتر بمێنمەوە؟

بەوەش سەرزەنشتی خۆی دەکرد، بۆچی دوای شەڕی تیلیست یەکجاری دەوڵەتی پروسی لەسەرتەختی ڕووداوەکانی ڕۆژگار نەسریەوە، دانیی بەوەشدانا، لەساڵی(1809)دا ویستویەتی دەوڵەتی نەمسا لەسەر نەخشەی سیاسی بسڕێتەوەو وەدەرنێت، بەڵام نەهامەتی ئەو لەئاسلیگ بووە لەمپەر لەبەردەم کردنی ئەمکارەدا، چونکە بەهێشتنەوەی ئەویەشە قوربانییەکی زۆری لەدەستخۆیدا، نەمسا توانیبوو درێژە بەبوونی خۆی بداتەوەو بژێتەوە. زۆرجار باسی کوژرانی میر دانگینی دەکرد، بەبێ ئەوەی کەمێ پەشیمانیش دەربڕێت، بەپێچەوانەوە دەیگوت ئەگەر ئەمکارە جارێکیتر بێتەوەپێش دووبارە دەیکاتەوە.

پێویستە لێرەدا ئەوەبیر بهێندرێتەوەکە ناپلیۆن نزیکەی (20) ساڵ ئەورووپای خستە شەرێکی خوێناوی گەرەو بۆ



تاکەجارێکیش توشی غەمگینی نەبۆوە؛ چونکە ئەو تینوی سەرکەوتن بوو وبەتایبەت شەیدای بەڕادەبەدەری بۆشەر تەواو بیرو هۆشی داگیرکردبوو، بتسی بالکام، ئەو کچۆڵە منداڵەی کەرۆڵەی بەلێندەرێکی بریتانی بوو لەسنت هێلیندا نیشتەجێبوون و ببووەجێگای سۆزو خۆشەویستی ناپلیۆن. ناپلیۆن حەزیدەکرد وانەی فێربوونی زمانی فەرەنسی پێبڵێتو ئەوکچۆڵەیە زۆر دەهات بۆماڵی ناپلیۆن و ڕێگای پێدراوبوو چەند بیەوێت لەگەڵ ئیمپراتۆر قسەبکات، کاتێ ئەو کچۆڵە تەواو لەگەڵ ناپلیۆندا ئاشنایەتی پەیداکردو لێی سامەرستووبوو، ڕۆژێکیان بتسی بالکام لەگەڵ دەستە خوشکێکی هاوتەمی خۆیدا هاتبوون بۆسەردانی ناپلیۆن و لەئەوی پرسیبوو: ئایا ئەمە ڕاستە کەئێمە [294] لەبریتانیادا بیستومانەو دەڵێن ناپلیۆن مرۆڤان دەخوات؟

ئیمپراتۆر بەقاقا پێکەنی ولەوەڵامی ئەو دوو منداڵەدا گوتی: بەڵێ مرۆڤ دەخوات، تەنها خواردنی گۆشتی مرۆیە، ئەم قسەیە بووەجێگای دڵخۆشی ناپلیۆن، چونکە گەورەکان ئەویان ناونابوو دێوەکەی کرس، منداڵان ئەم قسەیان بەمانا ڕاستەقینەکەی وەرگرتبوو وبەمرۆڤ خۆریان دەزانی، ئەم دەمێکبوو ئەو وشەی دێوی کرسی بیستبوو، بەڵام ئەوکات تەنها بەهەڵتەکاندنی شانەکانی بەتوڕەییەوە وەڵامی دەدایەوە.

دوای تەلاقدانی جوزفین وکوژرانی لان، لەشەڕی ئاسلینگ ومەرگی دووروك لەگورلیتز، تەنها یەك کەس مابوو کەناپلیۆن خۆشی دەویست، ئەویش کوڕەکەی کەلەگەڵ دایکیدا (ماری لوین) لەلای باپیرەی ئیمپراتۆری نەمسا، لەڤێنناداببوو.

ناپلیۆن پێی وابوو کوڕەکەی بەپاشای فەرەنسا دادەنرێت، چونکە لێرەودوا لەفەرەنسادا دەبێ تەنها پشتبە چینی ناوەڕاست و خوارێی میللەت ببەسترێت، دەبێ حکومەت کۆماریبێت– یان شانشینی قانون گوزاری، ئەو بنەماڵانەی کەلەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە ببوونەجێگای قبوڵکردن، تەنها بنەماڵەی بۆناپارتەکان بوو کەبەئیرادەی میللەت هەڵبژێردرابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا بەهەمان نالەباری کەلەساڵی (1815)دا ڕێگای بەخۆی نەدابوو، بەڕابەرێتی یەك ڕاپەڕینی گەورەی جەماوەری دژی بورینەکان وئەشراف و پیاوانی ئایینی بوەستێتەوە، لەسنت هێلینیشدا ئەم ڕەفتارەی خۆی هەربەڕاست دەزانی.

ئەمەش جۆرە دووفاقەییەکی دروستدەکرد کەلەتێگەیشتنی نادروستەوە سەرچاوەی گرتبوو (حکومەتی ڕەهای ناپلیۆن حکومەتی چین و توێژەکانی میللەت نەبوو، بەڵکو حکومەتی بۆرژوازی بوو و بۆ کوڕەکەشی خەونی بەوەوە دەدی پشتبە زۆرینەی خەڵکی حەمەتکێش نەبەستێت وپارێزەری بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازیەت بێت، دوای شەڕی واترلو کاتێ لافاوی کرێکاران چواردەوری کۆشکەکەی ئەویانگرتبوو لەپاریسداو داوایاندەکرد ئیمپراتۆر لەسەر تەختی دەسەڵاتی فەرەنسا بمێنێتەوە، ناپلیۆن گوتی: ئەمانە چ باوەڕێکیان بەمن هەیە؟ من ئەوانم بەهەژاری هاتنەدەست و بەهەژاریشم جێهێشتن).

لەوکاتەدا کنت دومو بەمونتولونی گوتبوو، ئەگەر دەیەوێت کەڵك لەڕق وکینەلەدڵی شۆڕشییەکانی خەڵك وەربگرێت دژبە ئەشراف و ڕۆحانییەکان، ئەوا بەخۆیی و دوو ملیۆن جوتیارەوە دێت بۆ پاریس، بەڵام ناپلیۆن حەزینەدەکرد ببێتە پێشەوای چینێکی زەحمەتکێش، چونکە بەبیرکردنەوە لەمەش هەراسان دەبوو.

---

[294] – واتە: بتسی بالکام ودەستە خوشکەکەی.



ناپلیۆن هەتا نزیك كۆتاییەكانی تەمەنی خۆی هەروا دەربارەی ئەم مەسەلەیە بیری دەكردەوە، بەڵام لەكۆتایی تەمەنیدا، لەژێر كاریگەری ئەو هەواڵانەی لەڕۆژنامەكانی ئەورووپاو بەشێوەی سەرزارەكی پێی دەگەیشتن وئاگاداری شۆڕش و ڕاپەڕینەكانی قوتابیانی ئازادیخوازی زانكۆكانی بۆوە، ئیمپراتۆر لەپڕ بەرەی خۆی گواستنەوەو لەساڵی (1819)دا وەبیر هەمان مونولونی هێنایەوەو ئەوەی هەتا ئەوكاتە گوتبووی ناكۆكبوو لەگەڵ ئەم گوتەیەی خوارەوەیدا (من دەبوا ئیمپراتۆریەتی خۆم لەسەربنەمای ژاكوبنەكان دابمەزراندبا) شۆڕشی ژاكوبنی گرگانێكبوو بەهۆی ئەوەوە داتوانرا پروس هەڵبوەشێندرێتەوە، بەڕای ناپلیۆن، دوای سەركەوتنی شۆڕش لەو وڵاتەدا، پروس دەكەوتەژێر دەسەڵاتی ئەو ودواتر ئەورووپاش، واتە: بەچەك وهێزی ژاكوبینیسم، پروس وئەورووپای دەكەوتەچنگ، لەڕاستیدا هەركاتێ ناپلیۆن باسی سەرهەڵدانی شۆرش دەهاتەپێش بیری بۆ ژاكوبینەكان دەچوو، واتە: لەوردە برژوازی ونەیدەتوانی بیرلەیەك شۆڕشی كۆمەلایەتی بكاتەوە، زۆرجاریش شۆڕشگێڕانی ژاكوبنی وەك ركەبەر دەهاتنەبەرچاو وبەهەڵەی خۆی دەستی یارمەتی ژاكوبنەكانی ڕەتدەكردەوە.

( 3 )

ئەمە دواین گفتوگۆكردنی ناپلیۆن بوو لەگەڵ مونتولون و ئەوانەی دەوروبەری كەلەڕۆژی(10/ی مارسی ساڵی (1819)دا كرا، ئیتر لەوكاتە بەدواوە هەواڵ دەربارەی ناپلیۆن كەم ببونەوەو بەسەقەتی و نالەباری دەگەیشتنە ئەورووپا، لاسكاز لەوێدا نەمابوو، چونكە هودسن لاو ئەوی لەدورگەی سنت هێلین دەركردبوو، گرگوش ئیمپراتۆر ناردبوویەوە بۆ ئەورووپا، ئومرای پزیشكی ئێرلەندی تایبەتی ناپلیۆنیش هەتا ماوەیەك لای ئەو مایەوە، بەڵام چونكە ئەوكاری جاسوسی لەسەر ناپلیۆن دەكردو ئەوەی لەلانگ وود[٢٩٥]دا ڕوویدا بۆ فەرمانڕەوای دورگەكە، هودسن لاوی بریتانی. پاش ماوەیەك بانگهێشتیان كردەوە، یەكێكیتر لەوانەی لەدەوری ئیمپراتۆر مابوونەوە، ئانتومارشی بەناو پزیشك ونەخوێندەواری یاداشت نووسەرەوەیەكی درۆزن بوو، كەبنەماڵەی ئەویان لەئەورووپاوە بۆ چاودێری كردنی ئیمپراتۆر ناردبوو وسەرئەنجام ناپلیۆن تەواو لێی پەست بوو وڕێگای نەدا بێتە ماڵەكەیەوە.

برتران و مونتولون و چەند خزمەتكارێكیتر لەوماوەی ئەو دوو ساڵەی دوای لەدەوری ناپلیۆندا مابوونەوە، لەساڵی (1819) بەدواوە ئیمپراتۆر وردەوردە دەردەكەی گرانتردەبوو، لەساڵی (1820) نەخۆشییەكەی توندتربوو ولەسەرتای ساڵی (1821)دا پزیشكی بریتانی تایبەتی ناپلیۆن، دكتۆر ئارنولد، نەخۆشییەكەی ناپلیۆنی بەخراپ ڕاگەیاند، بەڵام ڕۆژانی دواتر وردەوردە ئیمپراتۆر دەهاتەوە سەرخۆی، بەجۆرێك لەوماوەیەدا ناپلیۆن بۆگەڕان لەماڵەوە دەچۆ دەرێ، لەكۆتایی ساڵی (1820)دا ماندوبوونی زۆرتر لەسیمای ئەودا بەدی دەكرا، دەستی دەكرد بەقسەكردن ولەپڕ قسەكانی خۆی دەبڕین ودەكەوتە خەیاڵاتی قوڵ و ڕامانەوە، وردەوردە قسەكردنی كەمبۆوە، ئێستا هەتا كۆتایی ساڵی (1820) بیرەوەری ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی بەكنت دو مونتولون وپێشتریش بە لاسكاز نووسیبۆوە، یاداشتەكانی كەلای لاسكاز بوون و بەدووبەرگی

---

295 - واتە: ئەو شارۆچكە بچوكەی دورگەی سنت هێلینی كەناپلیۆن لەنزیكیدا دەژیاو ماڵەكەی لەوێدابوو.



ئەستور لەساڵی (1847)دا بەچاپگەیێندران، هەروەها نووسینەکانی مونتولونیش کەبە (8) بەرگ بەچاپگەیێندران، ئەمە جگەلەو دووبەرگەی کەمونتولون سەبارەت بەژیانی ئیمپراتۆر لەسنت هێلیندا بڵاویکردنەوە.

لەکۆتایی ساڵی (1820)دا ناپلیۆن گەڕانی بەگالیسکە تەرك کردو ئەسپ سواریشی پێشتر وازلێهێنـابوو، لـەمانگی مارسی ساڵی ( 1821)دا دەردەکەی ناپلیۆن ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ئازاری دەدا، پێشتر ناپلیۆن پێشبینی ئەوەی کردبوو توشی نەخۆشی شێرپەنجەبووە، چونکە ئەو نەخۆشییە لەبنەماڵەکەی ئەواندا هەیەو باوکی شارل بۆناپارت بەهەمان نەخۆشی لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا مردووە.

شایانی باسە لەماوەی ئـەم پـازدە، بیـست سـاڵەی دوایـدا لـەکۆڤارە پزیـشکییەکانی فەرەنـسی و ئەڵمانیـدا بڵاوکراوەتـەوە کەناپلیۆن بەنەخۆشی سەرەتان نەمردووە، بەڵکو ئەو دەردەی ئەو بەتایبەت لەشـوێنە گەرمەکانـدا هەیـەو ئـەو ڤایرۆسـەش لەکاتی لاویەتیدا، لەڕۆژگاری داگیرکردنی میسر چۆتەناو لەشی و دواتر کەگەڕاوەتەوە شوێنە گەرمەکان دووبارە ئەو ڤایرۆسە سەری هەڵداوەتەوە.

لە(5)ی مانگی ئیبریلدا، دکتۆر ئارنولد بەهاودەمانی ناپلیۆنی گوت: حاڵی ئەو زۆرخراپە، کاتێ ئێشی کەمێ ئارام دەبۆوە، ناپلیۆن دەیویست ورەو دڵبەهێزی بداتە ئەوانەی دەورووبەری وگاڵتەی بەنەخۆشییەکەی خۆی دەکردوو دەیگوت (سەرەتانی هەمان واترلویە کەهاتۆتە ناو هەناوی منەوە).

لە(13)ی ئیبریلدا فەرمانی بەمونتولون کرد وەسێت نامەکەی بۆ بنووسێت ولە(15)ی ئبریلـدا بۆخـۆی ئـەو وەسـێتنامەیەی پاکنووس کردوو ئیمازی خۆی لێدا، ئەم چەند دێڕەی وەسـێتنامەکەی لەسـەر کێلـی گۆڕەکـەی کەلەکڵێـسای ئانوالیـد دایـە هەڵکەندراوە(هیوادارم تەرمەکەم لەلێوار ڕووباری سن بنێژن، لەنێو گەلی فەرنسادا کەئەوەندەم خۆشدەویستن).

ئەو لەو وەسێتنامەیەدا، مارمون و ئۆژەرو تالیران و لافایتی بەخائین ناوبردوون، کەیارمەتی دوژمنیان داوە هەتا سەربکەون. مەبەسـت لەخیانـەتی ئـۆژەرو، ئـەو کێـشە سـەختەبوو کەلەسـاڵی (1814)دا لەگـەڵ ناپلیۆنـدا هـەیبوو، مەبەسـتیش لەخیانەتکردنەکەی لافایت، ناکۆکی ئەوبوو لەگەڵ شەخسی ناپلیۆندا، لەبڕیاری پەرلەمانی ساڵی (1815)، سەرئەنجام ئـەم دوو بۆچوونەی ناپلیۆن دواتر لەلایەن سەختترین لایەنگرانی ئیمپراتـۆر نـەبووەجێگای قبـوڵکردن، بـەڵام خیانـەتی تـالیران و مارمون مێژوو سەلماندی، هەموو گوتەکانی ناو وەسێتنامەکە بەڕوێکدان، کەبەخشندەیی لەبەرامبەر زۆرکەسدا کردووە، (500) هەزار فرانکی بەخشییە برتران، مارشانی پێشخزمەتیشی (400) هەزار فرانك وهەریەك لـەو کەسـانەی کەلەدورگـەی سنت هێلیندا خزمەتیان کردبوو (100) هەزار فرانکی بۆ دیاریکردبوون، هەروەها هەرەیك لەلاسکازو ئەو ژنرالانەی لەپاریسدا مابونەوەو خاوەن پلەوپایە بەرزەکانی مابوون(100) هەزار فرانکی بەخشی. بەڵام بەشی زۆری میراتەکەی کەنزیکەی (200) ملیۆن فرانك بوو، بەسەر دووبەشدا دابەشکردو بەخشییە ئـەو سـەربازانەی کەلـەژێر ئـاڵای ئـەودا شـەڕیانکردبوو، نیوەکـەی تریشی بەخشییە ئەو خێزانانەی بەهۆی لەشکرکێشییەکانی ساڵانی (1814) و(1815) زیانیان لێکەوتبوو، لەوەسێتنامەکەدا چەند ڕستەیەکیش دەربارەی بریتانیاو شەخسی هودسن لاو نووسرابوون (مـن پێشوەخت بەدەسـتی حکومـەتی ئەشـرافی بریتانیاو جەلادی بەکرێگیراوی ئەو کوژراوم، زۆر نابات میللەتی بریتانیا تۆڵەی من دەستێننەوە).



لەپاشکۆی وەسێتنامەکەیدا ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات بەوەی هیچ کاتێ لەڕووی فەرەنسادا چەك هەڵنەگرێت وەهەمیشە لەبیربێت کەیەك ئازادەی فەرەنسییە، لەوکاتەی وەسێتنامەکەی بۆ دەنووسرایەوەو بۆخۆی دواتر پاکنووسی دەکردەوە، ڕۆحیەتێکی تەواو ئارامی هەبوو وئاسایی بوو، سێ ڕۆژ دوای ئەمە دووبارە نامەیەکی بەمونتولون نووسییەوەو گوتی:(پێویستە دوای مردنی بدرێتە حاکمی دورگەکەو لەونامەیەدا داوای لەبریتانیەکان کردبوو ڕێگای دەستوپێوەندو هاوەڵەکانی بدەن بگەڕێنەوە ئەورووپا) لەشەوی(21/ی ئیبریلدا، کاتژمێر (4)ی بەیانی، لەپڕ ناپلیۆن بڕیاریدا نەخشەی تازەی گاردی میللی بەمونتولون بنووسێتەوە، هەتا بۆ بەرگریکردن لەخاکی نیشتمان لەبەرامبەر دوژمناندا کەڵکی لێوەربگیردرێت، لە(2/ی مانگی مایۆدا، دکتۆر ئارنولدو دکتۆر شۆرت و دکتۆر مایکلس، بەوکەسانەی دەوروبەری ناپلیۆنیان ڕاگەیاند کەمردنی ئیمپراتۆر نزیکبۆتەوە، ئازارەکان بەجۆرێ زیادیانکردبوو لەشەوی(5/ی مایۆدا، ناپلیۆن لەحاڵەتێکی مەیلەو وڕێنەیدا تونـد خۆی بەمونتولونەوە نووساندو بەفشارێکی زۆرەوە بەباوەشی خۆیەوە گوشی و پێکەوە لەسەر تەختی خەوە بەربوونەوەو لەسەر تەختایی ژوورەکە پێچی دەدان، جارێکیتر خستیانەوەسەر تەختی خەوەکەیی، بەڵام ئیتر لەجوڵەکەوت و چەند سەعاتێك بێدەنگ وچاو بەمۆلەق مایەوە، بەڵام هیچ نەیدەناڵاند، ئاوەڵ و دەست وپێوەندەکانی ناپلیۆن هەندێکیان لەپشت سەرین و هەندێکیشیان لەدەم شیپانەی دەرگاکەدا مەلول و دەستەوەستان لەبەرامبەر ئەو پیاوەی کەلەگیانەلادابوو ڕاوەستابوون، ئەو لێوەکانی دەجولاندن، بەڵام کەس لەقسەکانی تێنەدەگەیشت، چونکە لەو ڕۆژەدا باوبۆرانێکی زۆرو تۆفانێکی مەترسیدار لەو دورگەیەدا هەڵی کردبوو ودرەختەکانی لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەقەندو چەندماڵێکی وێرانکردبوون و لانگ وودی هەڵەڕژاو و وێران کردبوو، هودسن لاو و ئەفسەرانی سەربازگە بریتانیاییەکە هەرکە زانیان ئیمپراتۆر لەحاڵەتی گیانکێشاندایە، بەپەلە هاتنە ماڵەکەی ئەو ولەژوورەکانی تەنیشت ژووری ناپلیۆن بەچاوەڕوانی مانەوە، دواین قسەی ناپلیۆن کەبەلای ئەوانەی لەلای بوون تێی گەیشتن ئەوەبوو گوتی(فەرەنسا ... بەسوپایەك ...) لەشەوی(5/ی مانگی مایۆی ساڵی (1821)دا ناپلیۆن گیانی سپارد، مارشانی خزمەتکاری تایبەتی ناپلیۆن، بەگریانەوە چوو ئەو شانێڵە کۆنەی هێنا کەناپلیۆن لە(14/ی یۆنیۆی ساڵی (1800)دا لەمارانگو لەبەری کردبوو وبەسەر تەمری ناپلیۆنی هەڵکێشا، حاکمی دورگەکەو ئەفسەرەکانی هاتنە ژوورەکەو لەبەرامبەر تەرمەکەدا سەری ڕێزیان دانەواند، ئینجا برتران و مونتولون، ڕێگای بەکۆمیسرەکانی وڵاتانی ئەورووپایی دا بێنەژورێ، ئەوانە لەو ڕۆژەوەی هاتبوون بۆ دورگەی سنت هێلین یەکەم جاریانبوو بێنە ماڵی ناپلیۆن، چونکە ئیمپراتۆر ڕازی نەبوو سەردانی بکەن.

چوار ڕۆژ دواتر، ئەوتابوتەی تەرمی ئیمپراتۆری تێدابوو هەڵیانگرت هەتا بیبەن بینێژن، لەو مەراسیمەدا هەموو کاربەدەستانی دەوڵەت و دانیشتوانی سنت هێلینیش بەشداربوون، کاتێ تابوتەکەیان بۆناو گۆڕەکە دادەهێشتەخوارێ لەپڕ یەك ڕێز تۆپ لەقرمژیاندا.

بریتانییەکان بوون لەبەرامبەر ئیمپراتۆری کۆچ کردوودا ئەرکی ڕێزی سەربازیان جێبەجێکرد.



# ســەر ئـەنـجـام

( 1 )

ئەو دیاردە مێژووییەی ناونراوە بۆناپارت ومارکسیستە کلاسیکییەکان بەوردی لێیان کۆڵیوەتەوە، ئەو بەهاو پێوانانەی دەستیانکەوتووە تەواوکەری یەکترین و وابەستەو هەماهەنگن لەگەڵ خودی ناپلیۆنی یەکەمدا.

ئەمانەلەشرۆڤەکردنەوەی مەسەلەی بۆناپارتیسم، ڕۆژگاری ناپلیۆنی یەکەم وناپلیۆنی سێیەمیان لەبەرچاوگرتووەو بەڕاستی ئەوەیان دیاریکردووە کەبنەماو ڕەوشی ئەوسیستمە سیاسییە هەمان خودی ئیمپراتۆری فەرەنسییەکانە، بەڵام لەوکاتەی ناپلیۆنی یەکەم بەمەبەستی جێگیرکردنی بنچینەی دیکتاتۆریەکەی کەپشتبەستبووبە سەرمایەدار تەنها دژی ژاکوبنەکان نەبوو، بەڵکو دژی لایەنگرانی سیستمی شانشینی کۆنیش بوو، بەڵام ناپلیۆنی سێیەم ئیمپراتۆریەکەی خۆی لەسەر بنەمای، چەمکی شەڕی بـرژوازی، بەتایبەت سەرمایەداری گەورە– لەبەرامبەر چینی کرێکارو مەیلی دیموکراسی وردە بـرژوازی دامەزراند، پێشئەوەی لەم کتێبانەماندا بێینەسەر باسی ڕۆڵی بۆناپرتیسم لەڕۆژگاری ناپلیۆنی یەکەمدا، سەرەتا پێویستە ڕۆڵی ناپلیۆنی یەکەم لەچارەنووسی شۆرشی برژوازی فەرنسا ڕوونبکەینەوە کەلەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا گێڕای.

مێژوو نووسە برژوازییە کۆن وتازەکان پروپاگەندەی ئەوە دەکەن ناپلیۆن کاری شۆڕشی بەئەنجام گەیاند، بەدڵنیاییەوە وانییە، ئەوەی شۆڕشی بۆ کراوەنەوەو بەرەوپێشچوونی ئابوری برژوازی گەورە کردبووی، ناپلیۆنی خستییە دەستی خۆیی وقازانجی پێبەخشی، بەڵام تۆفانی شۆڕشی خامۆشکردەوە، لەسەرئەم بنەمایە، ناتوانرێت ئەو وەك کەسێکی واسەیربکرێت کەتەواوکەری شۆڕش بوبێت، بەڵام بەحەق دەتوانرێت ئەوبە لەناوبەری شۆڕشی مەزنی فەرەنسا بزانرێت.

دیکتاتۆریەتی ناپلیۆن کەکۆتایی بەشۆڕش هێناو پێش هەمووشتێك بۆزاڵبوونی سەرمایەداری گەورە بەسەر پیشەکاران و وردە برژوازییەکانی دەستمایەکەم وچینی زەحمەتکێش بوو، کەلەسالانی (1789) و(1794) ڕۆڵێکی گەورەی شۆڕشی گێڕابوو، لەهەمان کاتیشدا گوندنیشنە خاوەن زەوییەکان، کەناپلیۆن بەرگری لەبەرژەوەندی ئەمانەدەکرد لەبەرامبەر مەترسی گەڕانەوەی فیودیالەکان، دیکتاتۆریەکەی ئەوی بەهێزترو خۆڕاگرتر کردبوو.

ناپلیۆن کەژاکوبنەکانی گوللەباران دەکردو بۆخۆی ببووە فەرمانڕەوایی ڕەها، کۆمارەکانی هاوسێ و دەوروبەری فەرنسای دەگۆڕی بۆدەوڵەتی شانشینی وبەسەر خوشك وبراو زاواو ژنرالەکانی خۆیدا دابەش دەکردن وبەپاشای ئەو شوێنانەی دەدانان، ئەم بەڵگە مێژووییانە بەهیچ شێوەیەك بچوکترین پەیوەندی بەوەوەنییە ئەوپیاوە[٢٩٦] تەواوکەری شۆڕش بوبێت، ئەمە ڕاستییەکە کەتەنها وتەنها ئایدیالیسمی درۆزن دەتوانێت خەریکی ئەم کارەبێت وئاوا ساغی بکاتەوە،

[296] - مەبەست لەناپلیۆنە.(و- کوردی).



نەهێشتنی دیموکراسی وژیاندنەوەی بەهێزترین ڕووی بەهێزی تاکەکەس، بەمەبەستی بەرگریکردن لەبەرژەوەندی چینی سەرمایەداری و زاڵی بەسەر هەموو ئەورووپادا، ڕەوشی کاری سەرەکی بۆناپارتی یەکەمەو نوکلی کردن لەم ڕاستییە جگەلەوەی چاوپۆشینە لەڕووداوەکانی مێژوویی بەمەبەستی تۆباڵکێشان وچەسپاندنی ئەفسانەی ناپلیۆنی هیچی ترنییەو ئەو ئەفسانەیەی کەلەڕابردوودا کاریگەری زۆرخراپی هەبووەو لەڕاستیدا بۆ گومڕاکردنی هەندێك خەڵکی نابەرپرس و خولیایانی بەناو داهێنەران بووە، بەتایبەت لەساڵی (1830) بەدواوە، هەمیشە خزمەتی بەئامانجی کۆنەپەرستانەو ڕەوشی کۆمەڵایەتی وسیاسی ئەوان کردووە.

لەهەمان کاتیشدا نوکلی کردن لەتوانای نائاسایی ئەو زەبەلاحە مێژووییە ناکرێت و نابێ چاوپۆشی لە هۆش ونێرادەی گەورەو مەزنی بکرێت وئەمە شتێکی ناماعقولە.

خوێنەر لێرەودوا ئەو بەها زۆرانەی شتی بەڵگەنەویست و دۆکۆمێنتێن کەمارکس و ئەنگڵس باسیان لەلێزانی و کارامەیی سەربازی ناپلیۆن کردووەو کاریگەری خستنەژێر دەسەڵاتی ئەورووپای فویدیال، دەخرێتەبەرچاو، ئەو کەسانەی کەدەیانەوێت زیاتر زانیاری لەم بارەوە بەدەست بێنن دەتوانن نووسراوەکانی مارکس و ئەنگڵس سەیربکەن.

ئەم دووکەسە بەبێ لایەنی تەواو تەنها باسیان لەڕۆڵی بەرەوپێشبردنی مێژووی مرۆڤایەتی ناپلیۆن نەکردووە، بەڵکو ئەو ڕۆڵەی کەئەویش گێڕاویەتی لەبنیاتنانی قوتابخانەی بۆناپارتیسمی کۆنەپەرستانەو ئازادی سیاسی لەفەرنسادا سەرکوتکردەوە، دەخەنەڕوو، مارکس و ئیجلس لەڕۆژگاری ئیمپراتۆریەتی دووەمدا ژیاون، بەڵام بێگومان پێویستیان بەو ئەزمونە تاڵەنەبووە، هەتا پەی بەوڕاستییە ببەن کەبۆناپارتیسم، وەك سیستمی سیاسی ناوخۆ ودەرەکی لەهاتنەکایەی ئەو هەلومەرجەی بەهۆی کرانەوەو بەرەوپێشچوونی خێرای سەرمایەداری لەسەدەی نۆزدەهەمدا، جگەلە یەك ڕژێمی[297] کۆنەپەرستی هیچی تر نەبووە، ئەگەر پەنای بۆ زۆرو ستەم وفریودانی هەمیشەیی خەڵك لەبری پێویستی بەشەڕانگێزی سەربازی، نەیدەتوانی پارێزگاری لەخۆی بکات وبیمێنێتەوە.

( 2 )

لەڕووی سیاسەدی دەرکییەوە، ئارەزووی بەرفراوانکردنی خاکی فەرەنساو ئیمپریالیستی سەرچاوەگرتوو لەپاراستنی بەرژەوەندی برژوازی گەورەی فەرەنسا، ناپلیۆنی دژی ئەورووپا ڕاستکردەوە ئەو دنیا نیوە فیودیالەی کەلەحاڵەتی پارچە پارچەبوون وئەماندابوو، توانی لەبەرامبەر هێرشە سەرەتاییەکانی سەردارێکی گەورەی وەك ئەودا خۆی ڕاگرێت.

لەهەمان کاتدا ئەو ستەمەی ناپلیۆن لەگەڵە ژێردەستەکانی دەکرد، بووەهۆی ئەوەی شەپۆلێك ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی میللی دروستبکات و ئەو زەبرانەی لەڕێگای لێدانی ئابووری خۆیەوە لەئابووری بریتانیای وەشاند، ڕۆحی شۆڕشگێڕانەی لەناو چینی کرێکاری بریتانیدا بەشێوەیەکی بەردەوام و بەربەرەکانیانە بەئاگاهێنایەوە، بنەمای تیۆری وپراکتیکی ناپلیۆن لەشەڕەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا بۆ لاسەنگکردنی ڕژێمە شانشین و میرو تیرەییە سەرکوتکەرەکانی کەلەسەر بنەمای سرواژبوون وجێهێشت، ئەم بنەمایانە زادەی شۆڕشی برژوازی بوون، چونکە شۆڕش فاکتەری بەدەست هێنابوون و ناپلیۆن

[297] - مەبەست لەرژێمی ناپلیۆنی یەکەم نییە، بەڵکو ئەوانەی دواترە.(و-کوردی).



بەلێوەشاوەیی خۆی توانی کەڵك لەمانە وەربگرێت، ئەمە ناپلیۆن نەبوو بەڵکو شۆڕش بوو کەچالاکی کۆدەستەی خەڵك وتاکتیکی سازدانی بەرفراوان وکراوەو هاوتا لەگەڵ کەڵك وەرگرتن لەڕێکخراوی شیاو وگونجاو لەگەڵ مەزنی سوپایەکی ڕێکخراوی سەربازی وجارجارەش شێوازی سەربازگیری تازەی فەراهەم وپێویست دروستدەکرد.

بەلام تەنها ناپلیۆن بوو کەنیشانیدا چۆن وبە چ ڕێگایەك کەڵك لەم هەموو هۆکارانە وەربگرێت: ئەنگلس: تائکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە تەنها ناپلیۆن توانیویەتی ئەزموونی ئەوەی هەبێت کەپێویستە چۆن ئەم هەموو گۆڕانکاریانە درك پێبکات وکەڵکیان لێوەربگرێت وئەمانە هەموویان لەگەڵ یەکتریدا هەماهەنگ بکات، ئەو لەوکاتەدا پێش بوارەکانیتر لەڕووی جەنگییەوە توانای خۆی خستەڕوو ولێوشاوەیی بێ هاوتایی خۆی نیشاندا، بەڕای فردریك ئەنگلس: ناپلیۆن هەم لەسەردارانی سەرکردەی سەربازی ، پێش خۆیی وهەم لەو ژنرالانەی کەلەقوتابخانەکەی ئەودابوون، کەهەوڵیانداوە لاسایی ئەوبکەنەوە، بالاتربووە(بەهای هەمیشەیی ناپلیۆن لەوەدایە توانی ڕاستترین ڕێگای تاکتیکی وستراتیژی بەکەڵك وەرگرتن لەڕێژەیەکی زۆری سەرباز کەسەرهەڵدانی ئەمانە بەشێکبوون لەهێزی شۆڕشی مەزن، وەربگرێت.

ئەو ئەم تاکتیك وستراتیژییانەی ئەوەندە بەتەڕدەستی بەئەنجام دەگەیاندن، تەنانەت لەم هونەرەدا هیچ کەس لەفەرماندەو سوپا سالارانی جەنگی نەیاندەتوانی تۆزیشی بشکێنن وتەنها هەوڵیاندەدا بۆسەرکەوتوویی شەڕەکانی خۆیان لاسایی ئەوبکەنەوە، سەبارەت بەو کامڵبوونەوی کەناپلیۆن بەهونەری جەنگی بەخشی، فردریك ئەنگلس دووهۆکار بەمیکانیزکی سەرەکی ڕەوشی ئەو دادەنێت، کەبریتین لە: یەکەم ڕێکخستنی تەواوی کەرەستەی هێرش، واتە: سەربازو ئەسپ وتۆپ، دووەمیش لێزانی جوڵاندنی ئەم ناوەندە هێرشبەرە).

فردریك ئەنگلس: ناپلیۆن بەسەردارێکی زۆر گەورە دەزانێت، هەتا لەو شەڕانەی کەتێشیاندا سەرکەوتوو نەبووە(لەنێوان شەڕە بەرگرییەکان و شەڕە ڕاستەوخۆکاندا کەلەنێوان شەڕە بەرگریەکانی ناپلیۆندا پێویستە دوو نموونە لەدووشەڕی سەرسوڕهێنەری ئەو بهێنینەوە، یەکێکیان شەڕی سالی (1814) کەبووەهۆی دوورخستنەوەی ئەو بۆ دورگەی ئالپ و شەڕی (1815) کەبەتێشکانی واترلو وخۆبەدەستەوەدانی پاریس کۆتاییهات.

لەماوەی ئەو دوو شەڕە سەرسوڕهێنەرانەدا، ناپلیۆن بەئامانجی بەرگریکردن شەڕی دەکرد، لەهەر شوێنێك ولەهەر هەل بۆ ڕەخسانێکدا هێرشی دەکردەسەر دوژمنەکانی هەرچەندە لەڕووی ژمارەی سەربازیشەوە لەدوژمنەکانی لاوازتربوو، بەلام دەیزانی چۆن خۆی لەئەوان بەهێزتر نیشانبدات، بەزۆریش لەوشوێنەی کەهێرشی بۆدەکرد تێیدا سەرکەوتوودەبوو) لەم دوو شەڕەی سەرەوەدا، واتە: شەڕەکانی سالانی (1814) و(1815) ناپلیۆن بەهۆکاری کەپەیوەندی بەنەخشەکانی شەڕو بەڕێوەبردنەکانی نەبوو وتێشکانەکانی بەهۆی زۆری ژمارەی سەربازەکانی هاوپەیمانانی ئەورووپایی وبێ توانایی میللەتەوە بوو کەنزیکەی چارەکە سەدەیەك بوو بەهۆی شەڕەوە شەکەتببوو وئیتر نەیدەتوانی لەبەرامبەر هێرشی دنیا کەدژبەو چەکدار ببوو بەرەنگاری بکات وخۆی ڕاگرێت، فردریك ئەنگلس دەڵێت (شەڕی ئوسترلیتز بەڕاستی یەکێکە لەسەرکەوتنە مەزنەکانی ناپلیۆن وبەلگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ لێوەشاوەیی سەربازی بێ هاوتای ئەو، چونکە ڕاستە هەڵەی هاوپەیمانان بووەهۆی گومانانەوە لەتێشکانیان، بەلام ناپلیۆن بەو تێڕوانینە وردبینانەی هەیبوو توانی هەڵەی فەرماندە سەربازییەکانی دوژمن هەستپێبکات وچاوەڕوانیکرد هەتا لەکاتی پێویستدا زەبری گورجکپڕی خۆی بەسەختی بوەشێنێت و بەخێرایی بروسك ئاسا



کەمەری دوژمنی پساندو ئەوەی نیشاندا کە بالآترە لەهەرجۆرە پێهەلآگوتن وستایشێك. ئوسترلیتز نمونەی بێ هاوتای فەرماندەیی کردنی سوپابوو بۆ لەشکرکێشی سەرشارو هەتا شەڕیش بوونی بمێنێت بیر ناچێتەوە).

ناپلیۆن بۆخۆی دەلێت: (لەئەورووپادا سەردارانی سەربازی باش زۆرن، بەلآم ئەمانە زۆر شت لێکدەدەنەوە، من ئێستا تەنها یەك شت دەبینم، ئەویش ئەوەیە ئەوسەربازە زۆرانەی دوژمنن کەهەولدەدەم لەناویان بەرم).

ناپلیۆن لەکەلك وەرگرتن لەسەرکەوتنەکانی وهونەری شرۆڤەکردنی تەواوی سوپای دوژمن ودواتر ڕەتاندن دوای تێشکانیان، کەسێکی بێ هاوتابوو، کنت بورك فون مارتنبورگ: مێژوو نووسی سەربازی پروسی ونووسەری کتێبێکی بەناوبانگ دەربارەی ناپلیۆن دەلێت (لە 3/ی دیسەمبەری سالی (1805)دا واتە ڕۆژێك دوای شەڕی ئوسترلیتز، ناپلیۆن بەم ڕستەیە فەرمانی بەمارشال (سو) کرد(هەموو ڕێگاکانی ڕاوەدوونانی دوژمنی تێکشکاو بەهێزێکی تەواوەوە-ئەنجام بدە) ناپلیۆن لەڕۆژگاری خۆیدا لەهونەری سەرکردایەتی کردنی سوپاو ناچارکردنی، چ لەکاتی سازدانی بۆ شەڕو چ لەمەیدانی شەڕدا کەسێکی بێنەزیربووە.

باشترین مێژوو نووس و پسپۆڕانی بواری ستراتیژی سەربازی کەسەبارەت بەناپلیۆن لێکۆلینەوەیان کردوەو بەدواداچونی تایبەتیان ئەنجامداوە، تەنانەت ئەوانەی کەبەرێکەوتیش شتێکیان لەسەرئەو نووسیوە، هەموویان لەو بروایەدان ناپلیۆن کەلکی لەو تواناو کەرەستە تازانە وەرگرتوە کەشۆڕشی فەرەنسا دروستی کردبوو وئەمانەی پێکەوە گونجاندوەو بەر لێوەشاوی خۆی توانیویەتی ببێت بەگەورەترین تیۆرستی سەرکردایەتی کردنی شەرەکان کەلەشۆڕشەوە سەرچاوەی گرتبوو. شەری خەلك، شەر بەکەرەستەو کەلوپەلی هەمەجۆر کەتەنها لەتوانای یەك دەولەتی بڕژاوازیدایە، بەکەلك وەرگرتن لەسەرچاوەیەکانی ماددی و مرۆی. هەتا رۆژگاری ناپلیۆن ئەمانە نەهاتبوونە پێش لەئەورووپادا، سەربازانی زۆری ژێر فەرماندەی ناپلیۆن، بەکورتی ئەو لەساتەوەختی دیاریکراوی شوێنی خۆیدا، هەمیشە خۆی لەدوژمن بەهێزتر نیشان دەدا. ناپلیۆن شارەزای نەخشەی جوگرافیایی لەهەموو کەس تەنانەت لەسەرۆکی ستادی سوپاکەی خۆشی، واتە: برتیە کەبیرمەندو ماموستای نەخشە کاری سەربازی بوو، زیاتر دەزانی، هەروەها لەم بوارەشدا لەهەموو سەردارانی بەناوبانگی مێژووی پێش خۆی باشتربوو، بەلآم لەگەل ئەمەشدا هیچ کاتێ پابەندنەدەبوو بەنەخشەکان و پلانەکانی دەگێران ودەچوەمەیدانی شەڕو بەگوتارەکانی خۆی سەربازەکانی جۆش و فرۆش دەهێنان وفەرمانی دەرکرد ڕیزی سەربازەکانی وەجولە دەخست. دووبارە لەمەشیاندا کەس نەیتوانی شان لەشانی بدات. فەرمانەکانی سەبارەت بەبنچینەی جێگیرکردنی سەربازی تۆپخانەو بەجولەخستنی سەربازی خاوەنی بەرزترین پلەی هونەری سەربازی لەشکر کێشی بوو، بێجگە لەئەسکەندەری مەکدۆنی لەوانەیە هیچ کەس لەسەربازە جەنگییە بەناوبانگەکانی مێژوو وەك ناپلیۆن لەو دۆخەدا سەرکەوتو نەبوبێت، ئەو تەنها توانای یەك فەرماندەی شكو مەندی وزالی نەبوو، بەلکو دەسەلآتداریەتی دەولەمەنترین وپرپیترین ناوچەی دنیای دەکرد.

سیزار، کەسەرەتا وەك لێپرسراوی فەرماندەی گشتی سوپا دەجەنگی و پەرلەمان دەسەلآتداریەتی حکومەتی لەدەست دابوو، بۆیە هیچ کاتێ سیزار نەیتوانی لەیەك کاتدا فەرمانرەوای رۆم وفەرماندەی گشتی سوپابێت.

ئانیبال: سەرکردەیەکبوو ملکەچی یەك پەرلەمانی مایەپوچی دەسیسەبازی کۆماری سوتخۆربوو، تورن وکندە: ناچاربوون ملکەچی هەوەس وبریارەکانی دەرباری فەرەنسی بن.



سڤۆرۆف، سەرەتا سەر بەکاسرین بوو وزۆر لەگەڵیدا باشبوو، دواتر بوو سەربە پلی یەکەم، کەپاشایەکی نیمچە شێتبوو، دواتر لەژێر چاودێری نەمسادا ئەرکەکانی ئەنجامدەدان، گوستاو ئادولف وشارلی دوازدەهەمو فریدریك ویلهیلمی دووەمیش راستە پاشای خۆبەزلزان بوون، بەڵام سەرچاوەکانی ماددیو مرۆیی ئەو وڵاتە بچوکانەی کەلەژێر دەسەڵاتی خۆیاندابوون زۆر کەمیان لێوەردەگرتن، ناپلیۆن تەنها لەشەرە سەرەتاییەکاندا (تولونو ئیتالیاو میسرو سوریا)دا حکومەتێکی لەسەروی دەسەڵاتی خۆیەوە هەبوو ولەوکاتانەشدا زۆر گوێ رایەڵی بڕیارەکانی ئەو حکومەتە نەمابوو، بەڵام لەساڵی (1799) بەدواوە بووە فەرمانڕەوای رەهای فەرەنساو ئەو کەڕاستەوخۆ وناڕاستەوخۆ لەژێر فەرمانی ئەودابوونو هەندێك لەو دەوڵەتانەش کەلەپێشکەوتوترین باری ئابووریدابوون لەکیشوەری ئەوروپادا: لەمانەش بێجگەلەفەرەنسا، هۆڵەنداو ناوچەی رنانی ئەڵمانیا بوون. دوای رووداوەکەی(18ی برومر)، ناپلیۆن (15) ساڵی تەواو وەك یەك فەرمانرەوایی لەخۆرازی و زاڵ فەرمانرەوایی کرد. بەڵام سیزار دوای پەرینەوەی لەروبیکن، تەنها ماوەی (5) ساڵ بوو فەرمانڕەوایی رەهای رۆمی کرد، لەم ماوەیەش دوو ساڵی یەکەم هەرخەریکی شەری ناوخۆبوو کەهێزی ئیمپراتۆری لاوازدەکرد. ناپلیۆن کاتێ باسی فەرماندەی لێوەشاوەی دەکردو دەیگوت: دەبێت سەرداری مەزن وەك چوارگۆشە وابێت بەپانیو بەرزی یەکسان، مەبەستی ئەو لەپانی، واتە: خاوەنی کەسیەتییەکی بەرزو غیرەتو توانای بریاردانە، بەرزیش مەبەستی لەبیرتیژیو وریاییو... شتی تر بوو، هەروەها دەیگوت: ئەگەر کەسایەتی لەژیری ئەوزیاتربێت، دەچێتە ئەو شوێنە دورانەی کەنەدەبا بچێت، واتە بۆئەو شوێنە ڕاکێشدەبێت، بەڵام کەژیری لەکەسایەتی زیاتربێت غیرەت وکارامەیی ئەوەی نابێت نەخشەکانی بخاتە حاڵەتی جێبەجێکردنەوە.

یەککرتویی فەرماندەیی بەشتێکی پێویست دەزانی و پێی وابوو ئەگەر وانەبێت سوپا پێشوەخت مەحکوم بەتێشکانە، بەڕای ئەو یەك فەرماندەی خراپ لەدوو فەرماندەی باش باشترە، ئەو بۆخۆشی جگەلەکاتی گەمارۆدانی تولون لەساڵی (1793)دا، هیچ کاتێ لەشەڕەکانیدا هاوبەشی لەفەرماندەیدا نەکردووەو نەبووە، وەك سەرەتا ناچارنەبووە فەرمانی کەسانی باڵاتر لەخۆی جێبەجێبکات، لێرەدا باس لەهەندێك لەخەسڵەتە تایبەتییەکانی ئەو دەکەین.

ناپلیۆن ئەو گرنگییەی بەچەکی سارد نەدەدا کەکەسانێتر لەسەردەمی سۆرۆڤ بەدواوە گرنگیان پێدەدا، هەرچەندە خودی سۆرۆڤیش نوکلی لەگرنگی تۆپخانە نەدەکرد، ئیمپراتۆر لەیەکێك لەنووسینەکانیدا باسی دامەزراوەیی شەڕ دەکات دەڵێت (لەم ڕۆژگارەماندا تەنها ئاگری گڕی تۆپ، تفەنگ، دەتوانێت شەڕ یەکلایی بکاتەوە، نەك لێکدانی دەستی[٢٩٨] ناپلیۆن لەشەڕە سەرتاییەکاندا سەربازە تفەنگ بەدەستەکانی بەڕیز دەخستەپێش تۆپەکانەوەو لەژێر گڕی تۆپەکاندا سەربازەکان بەرەوپێشدەچوون وهەمیشە ئامۆژگاری ژنرال ومارشالەکانی بەوەدەکرد تەنها ئەوسەربازانە فێری پێشڕەوی وتەقەکردن نەکەن، بەڵکو دەبێ فێری ئەوەشیان بکەن گوللە بەخەسارنەدەن وئاراستەی سینگی دوژمنی بکەن، بەڵام ئامانجی ناپلیۆن ئەوەنەبوو بۆماوەیەکی دوورو درێژ سەربازەکانی لەوێدا بێڵێتەوە چونکە ئەگەری ئەوەهەبوو سەربازەکان لەژێر گڕی تۆپەکانی دوژمن کەئاراستەی تۆپخانەکانی ئەمان دەکرایەوە ورەی خۆیان بەربدەن وئەمەش ببێتەهۆی تێشکانیان.

---



ناپلیۆن پێی وابوو دەبێ تۆپەکان بەوپەڕی توندوتیژی وخێرایی بکەونەکار چونکە تەنها کاریگەری ئەوگرە دەتوانێت ئەنجامی یەکلایکەرەوەی شەر بەدیاربخات، تۆپ لەشەڕەکانی ناپلیۆندا ڕۆڵی سەرەکی ویەکلایکەرەوەیان هەبوو، بۆنموونە لەفردلندا تۆپەگەورەکەی ستارمون توانی پارێزگاری لەیەکە سەربازییەکەی ژنرال ڤیکتۆر بکات و بێ سەروبەرەیی بخاتەناو ڕیزەکانی سوپای ڕوسیاو ناچاری بکات بەپاشەکشەو ئەو پاشەکشەکردنەش بووەهۆی زیانلێکەوتنێکی زۆر، شایانی باسە ناپلیۆن لەساڵی (1807) بەدواوە زیاتر کاتەکانی بۆیەك تاکتیکی سەربازی تازە تەرخانکردبوو بۆیە دواتر لەشەڕەکانیدا شێوازی تاکتیکەکانی گۆڕانیان بەسەرداهاتبوو، بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەی کەناپلیۆن گرنگی بەقەڵات [299] جێگیربوون وژمارەی سەربازانی دوژمن نەداوە، ئەو داوای لەمارشاڵ وژنراڵەکانی دەکرد درك بەوخاڵەبکەن تێشکانی دوژمن هەربەگرتنی قەڵاتە سەربازەکانی دوژمن دەستەبەر نابێت، بەڵکو بەلەناوبردنی سوپاکەیەتی لەمەیدانی شەڕدا، -

لەساڵی (1805)دا تێبینی ئەوەیکرد بەگرتنی قەڵاتی ئولم، نیوەی سوپای نەمسای لەناوبرد بەوەی نیوەی هێزەکەی خۆی بۆگرتنی ئەوقەڵاتە تەرخانکرد، ناپلیۆن دەیگوت نابێ دەست بۆهیچ شەڕێك ببرێت کەپێشتر تەواو خۆی بۆساز نەکرابێت، بەڵام کاتێ جەنگ دەستی پێکرد دەبێ بەهەموو هێزێکەوە شەڕبکرێت وداهێنان لەکردنەکەیدا بکرێت،

لەکۆتایی شەڕی ئایلوی مانگی فبرایەری ساڵی (1807)دا سوپای مەزنی فەرەنساش وەك سوپای ڕوسیا زیانێکی زۆریان لێکەوتبوو، تەنانەت زۆر تیپی سەربازی لەنیوەش کەمتریان مابوون، شەو ناپلیۆن چووە چادرەکەی خۆیەوەو نامەیەکی بۆمارشاڵ دوروك [300] نووسی ولەدەقی نامەکەدا دانی بەتێشکانی خۆشی لەم شەڕەدا نابوو، بەڵام ڕۆژی دواتر هەر کەسپێدەدەمی ئەوبەیانییە ڕەنگپەڕیوە زستانییەیدا، ئاشکرابوو بنیگسن فەرماندەی سوپای ڕوسیا، نەك هەر پاشەکشەی کردووە، بەڵکو چەند فرسەخێکیش لەمەیدانی شەڕ دووركەوتۆتەوە، بۆیە ئەم شەڕە بەسەرکەوتنی ناپلیۆن کۆتایهات، بنیگسن شەڕی نەکردبوو وترس باڵی بەسەر ئەودا کێشابوو، کەلەبەرامبەر دوژمنە سەرسەختەکەیدا بێتەمەیدانی شەڕو درێژە بەجەنگێن بدات وبەمەش سەرکەوتنی بۆ ناپلیۆن مسۆگەرکردبوو، بەڵام لەمەیدانی شەڕدا لەتەك هەرسێ تەرمی کەوتووی سەربازی ڕوسیدا، دوو تەرمی سوپای مەزن کەوتبوون، کارامەیی ولێهاتوویی لەڕابەریکردنی جەنگ، بۆدیاریکردنی مەیدانی شەڕەکە، لەدیاریکردنی ساتەوەختی شەڕکردنەکەدا، لەیەکەم کاری تاکتیکی کەسەرەتای هەموو شەڕێکە، دەبێ ئەمانە هەمیشە لەدەست فەرماندەی باڵادا بمێننەوە، بەڵام ناپلیۆن لەگەڵ ئەمانەشدا لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕدا فەرمانی بەمارشاڵەکانی دەکردو گرنگی بەوردەکاری و ڕوونکردنەوەکانی ئەو فەرمانانەی نەدەدا کەئەوکات ئەمە لەبواری سەربازی وڵاتانی ڕوسیاو پروس ونەمسادا گرنگی پێدەدرا، ناپلیۆن تەنها فەرمانی بەگرتنی ئامانجە سەربازییەکان دەداو وردەکاری وشێوەی گرتنی ئەو پێگانەی بۆ مارشاڵ و ژنراڵەکان جێدەهێشت، ناپلیۆن لەنێوان شەڕەکاندا وەك دڵ ومێشکی سوپا دەمایەوە، مارشاڵەکانی دوای ئەنجامدانی فەرمانەکانی ئەو، پەیوەندیان پێوەدەکردو ئاگاداری بەرەوپێشچوونەکانی سەربازیان دەکردەوە، داوای هێزی یاریدەدەریان لێدەکردو پرس و ڕایان بەئەو دەکرد لەپێشهاتەکانی بەرەی شەڕو چۆنییەتی.

---

[299] - مەبەست لەقەڵاتی سەربازییە.(و-کوردی).

[300] -مارشاڵێکی خۆیەتی ویەکێکبووە لەدۆستە نزیکەکانی.(و-کوردی).



پێنج مانگ دوای شەڕی ئوسترلیتز، کوتوزوف ڕاپۆرتێکی بۆ ئیمراتۆری ڕوسیا بەرزکردبۆوەو تێیدا گوتبووی (سوپای مەزنی فەرەنسا لەڕێگای ئیمپراتۆرەوە ڕابەری دەکراو ئەو سوپایە ئامادەبوو وەك یەك یەکەی سەربازی بچوك لەدەست فەرماندەکەی خۆیدابێت وهەموو فەرمانەکانی جێبەجێبکات).

دیژوارترین شت هەم بەلای هاوچەرخەکانی ڕۆژگاری ناپلیۆن و هەم بەلای نەوەکانی دواترەوە، ئەوەبوو لەوەبگەن چۆن ئیمپراتۆر ئەم ڕۆڵی ڕابەری کردنەی لەدەست خۆیدا هێشتبۆوە بێ ئەوەی دەستپێشخەری ولێزانی مارشاڵ و ژنرالەکانی وەلابنێت، بێ گومان لێرەدا مەبەستمان لەدەستپێشخەری وکارفەرمانی لاوەکی ئەفسەرەکانیەتی، چونکە جێبەجێکردنی هەر نەخشەیەك لەژێر فەرمانی ڕەهای ئەودابوو وئەمەش مارشال و ژنرالەکانی لەسەرئەوە ڕاهێنابوو ولەهەر کاتێکی پێویستدا کەئیمپراتۆر دورەدەستبا مارشال و ژنرالەکانی بڕیارو کاری خۆیان بەڕێوەدەبردوو مشوریان دەخوارد، ئەمانەش ژمارەیان کەمبوو وتەنها چەند کەسێکی وەك: داو وماسناو ئوژرو بوون، بەلام ئەوانیتر [301] دەیانتوانی هەتا سنوورێکی دیاریکراو ڕاستەوخۆ دەست بۆ دەستپێشخەری وفەرماندەرکردن ببەن، ئەوکاتەی ناپلیۆن لەساڵی (1814)دا لەدەوروبەری پاریسدا دەجەنگا، نەك هەرئەو(300) هەزار سەربازە خاوەن ئەزمونەی لەگەڵدانەبوون، کەلەساڵی (1808) بەدواوە هەندێکیان کوژرابوون وهەندێکیشیان لەئیسپانیادا توشی هەمان چارەنووس ببونەوە، تەنانەت زۆر لەسوپاییە کارامەو کۆنەکانی لەپادگاکانی شارەکانی ئەڵمانیاو چەند ناوچەیەکی ئیتالیادابوون.

ماسنا دەمێکبوو خەریکی شەڕی بێ کەڵکی ئیسپانیابوو، داوو لەهامبورگدا گەمارۆ درابوو، مورا بۆ پەیوەست بوونی بەناپلیۆن لەناپلی نەهاتەدەرێ، ئەمانە هەموویان لەو شەڕەی پاریسدا لەگەڵ سوپای مەزندا نەبوون، ناپلیۆن باشترین سەربازو ئەفسەری خۆی بەچوارلای ئیمپراتۆریە بەرفراوانەکەیدا پەرت وبڵاو کردبوونەوەو لەوساتەوەختانەی کەچارەنووسی دیاریدەکرا زۆر لەمانە لەتەکیانەبوون.

دیارە تێشکانی یەکجارەکی ناپلیۆن لەسالانی (1814) و(1815) هۆکاری سەرەکیان ئەمانەنەبوون، بەلام دەتوانرێت بەهۆکار هەژماربکرێت .

هەتا ئەوکاتەی ئەوانە لەگەڵ ناپلیۆندابوون وسوپای مەزن دابەش نەببوو بەسەر دوویەشدا کەبەشێکیان لەئیسپانیای دوورەدەستدا شلۆق ببوون، ئەو [302] سەرکەوتن و تێکشکاندنی دوژمن بەهۆی جێبەجێکارانی [303] شایستەوە دەستەبەردەکران.

ژومینی: بەو لێکۆلینەوە وردانەی کەسەبارەت بەشەڕەکانی ناپلیۆن ئەنجامی داون دەڵێت(ئەوە خودی ناپلیۆن بوو، ئەوەی سەلماندبوو شەپڕێوکردنی دوژمن لەکاتێکا مانای دەبێت کەلەیەکەم جارەوە دەستتبگاتە پشتی دوژمنو پەیوەندییەکانی پشتییەوە نەهێڵیتوو لەجاری دووەمیشدا کەشەرو پێداداان دەستی پێکرد ئەوانەی مانۆرەکەیان ئەنجامداوە بەشداری

---

[301] - مەبەست لەژنرال و مارشالەکانی تری سوپای مەزنە،(و- کوردی).

[302] -واتە: ناپلیۆن بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی بەفەرمانڕەوای ڕەهای هەموو ئەوروپا دەزانی و واهەستی دەکرد ئەوروپای لەچنگ دایە، بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی بەرابەری هەمیشەیی ئەوروپا هەژماردەکرد. (و-کوردی).

[303] - مەبەست لەئەفسەرە شارەزاو بەتوانا کۆنەکانی سوپای مەزنی فەرەنسایە،(و-کوردی).



شەریکەن) لیکۆڵەوەیەکیتری شەڕەکانی ناپلیۆن بەناوی فۆن بۆڵلوف باوڕتەواوی بەنەخشەی سەربازی ناپلیۆن هەبوو وەدەڵێت: مانۆری وەرسوڕانەوە بۆپشتی دوژمن دەبێ نەخشەی باشی پێشڕەیکردنی لەشکری لەگەڵدابێت).

ناپلیۆن پێی وابوو ئەگەر ئەو ئەفسەرەی فەرمانی پشتەوەگرتنی سوپای دوژمنی پێسپێردراوە، بەزووی ئەنجامی بدات ئەوا ڕوو بەڕووی بەرپەرچدانەوەی دوژمن دەبێتەوە.

ئەو مارشالانەی لەقوتابخانەکەی ئەودا فێرکرابوون، ئەم مانۆڕانەیان بەخێرایی و وردی وەهەمیشە سەرکەوتوانە ئەنجامدەدان.

ئەگەر دوژمن لەناو قەڵاتێك– یان شوێنێکی ئاسێدا گەمارۆدراباو خۆیان نەدابا بەدەستەوە، ناپلیۆن فەرمانی هێرشکردنی دەردەکردو لەکاتی سەرکەوتنیشدا بەزەیی بەدوژمندا نەدەهاتەوە، لەساڵی (1806)دا کاتێ بلوخر هەوڵیدەدا لەکۆڵانەکانی شاری لوبدا شەڕبکات، فەرەنسییەکان تاڵان و بڕۆی ئەوشارەیان کردوو سەربازەکانی دوژمنیان دەرپەڕاندوو زۆرلە هاوڵاتیانی ئەوشارەشیان کەلوپاچەکردن.

لەشەڕەکانی ناپلیۆندا نموونەی بێڕەحمی ئاوا زۆر بەدی دەکرێت، لەیۆلیۆی ساڵی (1799)دا کەیەك لەشکری (12) هەزار سەربازی عوسمانی لەمیسر دابەزی وچووە ناوقەڵاتی سەربازی ئەبوقیر، ناپلیۆن هەستیکرد لەمپەرێکی گەورە لەپشتییەوە ڕاستبۆتەوەو کاری داگیرکردنی میسر کەتا ئەوکاتەش تەواو نەببوو وتوشی مەترسی دەکاتەوە، چونکە تورکەکان بەشێوەیەکی باش جێگیرببوون وبەگەمارۆدان زەفەریان پێنەدەبرا، هەروەها ئەگەری ئەوەش هەبوو بریتانیا لەڕێگای دەریاییەوە یارمەتی ئەمانەبدات، بۆیە ناپلیۆن بڕیاریدا هەرچۆنێکبێت ئەوقەڵاتە بەزوویی داگیربکرێت وبکەوێتە دەستی، لەڕۆژی (25)ی مانگی یۆلیۆی ساڵی (1799)دا سەعات دووی شەو فەرمانی گرتنی قەڵاتەکەی دەرکرد، سەرەتا لان دواتر مورا چوونەناو قەڵاتەکەو بەدوایاندا زۆرینەی هێزەکە چوونەناوی، سەربازەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی لەناو قەڵاتەکەدا کوتولەتکران، دوو ڕۆژ دوای ئەم سەرکەوتنە ناپلیۆن ئاوای نووسیوە(ئەم شەڕە یەکێکبوو لەوجەنگە جوانانەی کەتابەئەمڕۆ بینیومە، ئەو سەربازە گەمارۆدراوانەی دوژمن یەکێکیان بەزیندوویی ڕزگاریان نەبوو).

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سوپای فەرەنساش زیانی لێکەوت وناپلیۆن تەنها لەکاتی نەبوونی ڕێگاچارەیتر فەرمانی بۆگرتنی قەڵاتە سەربازیەکان وهێرشکردنەسەریانی دەردەکرد، ناپلیۆن ڕێزی لەئازایەتی تاکە کەسەکانی دوژمنیش دەگرت، بەڵام پێی وانەبوو سوارەکانی شانشینی میسر کەدژی ئەو دەجەنگان– یان قازاغەکانی ڕوسی کەبەشێوەیەکی پەرت وبڵاو لێرەو لەوێ شەڕیان دەکرد، بتوانن لەبەرامبەر سوپایەکی ڕێکخراوی گەورەی ئەورووپایدا خۆیان ڕابگرن، دەیگوت: ڕاستە ئەمانە لەوانەیە لەشەڕی لاوەکی ولابەلاییدا وردە سەرکەوتن بەدەست بهێنن، بەڵام تەنها سوپای ڕێکخراوی مەشقپێکراو دەتوانێت شەڕەکان یەکلایی بکاتەوە، ئەمە ڕاستییەکبوو هەمیشە دووبارەی دەکردەوە، هونەری فەرماندەیی بەڕای ناپلیۆن لەوەدایە.

یەکەم: بتوانێت سەربازی زۆر کۆبکەیتەوەو چەکداریان بکەیت وبەخێرایی مەشقیاندادەیت، هەتا لەمانە سوپایەکی مەزن دروستبکەیت.

دووەمیش: کارێکبکەی لەوکاتەی کەدەتەوێت زەبرێکی گورچکبڕ بوەشێنیت، ئەمانەت لەشوێنی پێویستدا لەدەستدابن.

سێیەمیش: لەوکاتەی زانیت سەرکەوتن نزیکبۆتەوە تیپە سەربازییەکانی کەلەدەستداماون نەیانێریتە ناوشەڕەکەو هەروەك یەدەك بمێننەوە.



چوارەم: دوای جێگیرکردن ودامەزراندنی سوپاکەت خۆت لەشەڕکردن نەبوێریت: یان دوای بخەیت، بەڵکو هەوڵبدەیت هەرچی زووترە، شەڕەکە یەکلایی بکەیتەوە، بەمەرجێ ئومێدی سەرکەوتنت هەبێت.

پێنجەم: هەوڵبدەیت شوێنە لاوازەکانی دوژمن بزانیت وزەبر لەوشوێنە بوەشێنیت.

هەروەها دەڵێت: بەخت وڕێکەوت ڕۆڵی بەرچاودەگێڕن لەشەڕەکاندا، بەلام ڕۆڵی گەورەترو کاریگەرتر فەرماندە دەیگێڕێت ئەویش بەلێزانی و وشیاری ئەو لەنەخشەو پلانەکانی شەڕدا.

جارێکیان ئیمپراتۆر گوتبووی: ئەوشتانەی کەبەلای کەسانی ترەوە، تەواو چاوەڕوان نەکراوە، بونەوەرێکی غەیبی نییە کەڕێنوێنیم بکەن بەوەی دەبێ چ بڵێین وپێویستە چی بکەین، تەنها بیری من وتوانای خەیاڵی منە ئەمانەدەکات)

ئەسکەندەری مەکدۆنی وسیزارو ئانیبال وگوستاو ئادولف، بەوەنەبوونە کەسانی مەزن کەبەخت یاوەریان بوبێت، بەڵکو ئەوانە لەبەر ئەوە پیاوانی مەزن بوون چونکە زانیویانە چۆنچۆنی بەخت وئیقبال بخەنەژێر فەرمانی خۆیانەوە.

ئەم قسەیەی ناپلیۆن لەکۆتاییەکانی ژیانیدا گوتویەتی: ناوبراو لەشەڕەکانی ساڵی (1814) و(1815)شدا بەهەمان لێزانی وکارامەیی جارانی شەڕی دەکرد، بەلام چونکە لەو ڕۆژانەدا وای بیردەکردەوە کەکاتی ڕۆژگار بەسەرچوونی هاتووە، بۆیە شکستی لەشەڕی واترلوشدا خوارد، هەرچەندە ئەگەر سوپای پروس فریای سوپای بریتانیا نەکەوتبا بەدڵنیاییەوە تێکیدەشکاندو لەناوی دەبرد.

دوای ماوەیەکی زۆر کاتێ لەگەڵ لاس کاز دا باسی شەڕی واترلوی دەکرد، گوتبووی باوەڕی پێشووی خۆی لەدەستدابوو، لەم لەدەستدانەی باوەڕبوون بەخۆی پێش هەموو شتێك لەسەرەنجامی هەڵە سیاسییەکانی خۆیەوەبوو، ئامانجی سیاسی گەورەو نائاسایی ئەو کەدەیویست دنیا داگیربکات، ئەوی لەسەر ڕەوشی گشتی لەشکرکێشی وشەڕ لادا.

بۆنەمەش بانومونەیەك بهێنینەوە(چۆن دەتوانرێت لەوپانتاییە گەورەی ئیمپراتۆریەکەیەوە بەداگیرکردنی خاکی زۆری ڕوسیاو پاراستنی هێڵی پەیوەندی لەگەڵ مۆسکۆدا بپارێزرێت وئاسایش بێت؟ لەو بارودۆخەدا ناپلیۆن چۆن دەیتوانی هێزی پێویست بۆ شەڕەکانی مۆسکۆ کەبەمەبەستی داگیرکردنی ڕوسیابوو پەیدابکات؟ چۆن دەیتوانی خۆی بەبەهێز نیشانبدات؟ دەبوا چی کردبا لەوکاتانەی کەهەم لەئیسپانیادا سەرکەوتوو بوو وهەم لەنێوانی ئسمولنسك ومۆسکۆشدا؟ ناپلیۆن هەمیشە هەوڵیدەدا لەڕەوشی سەربازی خۆی لانەدات وبەردەوام هێڵی پەیوەندی خۆی سەخت بپارێزێت، بەپەیڕەوکردنی ئەو بنەمایەبوو کەبەدرێژایی لەشکرکێشییەکەی بۆسەر ڕوسیاو دانانی هێزێکی زۆری لەو ڕێگایەدا بووەهۆی کەمبوونەوەی سوپاکەیی ولەکۆی گشتی (420) هەزار لەساڵی (1812)دا کاتێ چۆسەرخاکی ڕوسیا بەنیازی داگیرکردنی تەنها (363) هەزار سەربازی لەگەڵدامابوون، ئەوانی تری بۆ پاراستنی ئەملاو لاکانی خۆی بەدرێژایی ئەو پانتاییە دوورو درێژە لەوڕێگایەدا نیشتەجێ کردبوون.

کەگەیشتە ڤیتیسك ژمارەی سەربازەکانی بۆ(229) هەزار سەرباز کەمبۆوە، لەنزیك ئاسمولنسکیش ژمارەی سەربازەکانی کەمبۆوە بۆ(185) هەزار، دوای داگیرکردنی ئاسمولنسك ودانانی سەربازگە لەوشارەدا بە(156) هەزار سەربازەوە بەرەو گژاتسك چوو وبە(135) هەزار سەربازەوە گەیشتە بفرۆدینف، کەگەیشتیشە مۆسکۆ تەنها (95) هەزار سەربازی لەگەڵدا مابوون.

ئەم کەمبوونەوە زۆرەی سوپای مەزن بەهۆی کوژرانیان لەلایەن دوژمن ونەخۆشی وسەرماوە نەبوو، بەڵکو بەرفراوانکردن ودانانی زۆری سوپا لەرێگادابوو، کەبەشێکی زۆری سوپای مەزنی کەمکردبۆوە، لەم ژمارانەی سەرەوەدا (220) هەزار سەربازی کەناپلیۆن بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەتەکەی لەخاکی خۆرهەڵاتیدا جێی هێشتبوون، هەژمارنەکراون، هەروەها جگەلەو(200) هەزار سەربازەشی لەئیسپانیادا شەریاندەکرد.

ناپلیۆن بە لاس کازی دەگوت (لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەندێك ساتەوەخت دێنەپێش، فەرماندە ناچارە کەرەستەی جەنگی خۆی بسوتێنێت وهەموو هێزەکەی سازو جێگیربکات بۆئەوەی زەبری گەورە لەدوژمن بدات وبەلێدانێکی بروسك ئاسا هێزەکەی لەناوبەرێت، بۆ دەستگەیشتنیش بەوئامانجە دەبێ جارجارە ئەوهێزانەی کەلەسەر رێگای گەرانەوە دانراون توشی مەترسی بکاتەوە) هەروەها دەیگوت: لەشەری سالی (1805 )دا کاتێ لەمۆراویادا تێوەگلاین پروس ئامادەبوو هێرشبکاتەسەر من وپاشەکردنیش بۆئەمان نەدەکرا، بەلام من لەئوسترلیتزدا سەرکەوتم ... و دەشمبینی ئەمسا خۆی ئامادەی شەردەکات هەتا هێرشبکاتەسەر هێڵی پەیوەندی پشتەوەم وهانی ئیسپانیاشی دەدا لەکێوەکانی پیرینەوە فەرەنسا داگیربکات، بەلام من لەمیاندا سەرکەتنم بەدەست هێنا، لەسالی (1809) شتەکە لەمانەش مەترسیدارتربوو، بەلام من لەشەری ڤاگرامیشدا سەرکەتووبووم) هەروەها دەڵێت: پێویستە بەقوڵی بیرلەهەر شەرێك بکرێتەوەو لەوشەرانەش کەشانسی سەرکەوتن بوونی هەیە، ئەو ناکۆکبوو لەگەڵ ئەو رایانەی دەیانگوت: شەرەکانی جەنگیزخان وتیموری لەنگ، تەنها شەری هەرەمەکی و بێسەروبەرە بوون ولەم بارەوە ناپلیۆن بەمۆتۆتۆلۆنی گوت(شەرەکانی جەنگیزخان وتەیموری لەنگ تەولو لەگەڵ رەوشی سەربازیدا رێك بوونە، لەسەر بنەمای سەربازیکراون و لەگەڵ هێزە سەربازییەکانیاندا گونجاوبووە).

ئەمرۆ دەبینین مێژوو نووسانی تازەی خۆرهەڵاتناس تەواو لەوبروایەدان ناپلیۆن سەبارەت بەشێوازی داگیرکردنەکانی ئەمانە لەسەر حەقبووە، زۆرجار ناپلیۆن ئەوەی دووبارە کردۆتەوە کەهونەری جەنگ لەوەدایە فەرماندە بزانێت چۆنچۆنی لەکات وشوێنی پێویستدا سوپاکەی لەشوێنێکدا جێگیربکات ودوژمن هەستی پێنەکات، کاتێ: گوهیە، بەرێوەبەری دیرکتوار بۆ پێهەڵگوتن بەو سەبارەت بەوەی لەشەرەکانی سالی (1796)و (1797) بەهێزێکی کەمەوە توانیویەتی دوژمنێکی لەخۆی بەهێزتر تێکبشکێنێت.

ناپلیۆن لەوەڵامدا گوتبووی: شتێکی وانەبوو، بەڵکو تەنها هەوڵمدا بروسك ئاسا هەڵمەت بکەمەسەر سوپا پەرتوبڵاوەکەی دوژمن وئەمانەم بەشبەش ویەك لەدوای یەك تێشکاندن، هۆی سەرکەوتنی ئەو لەوشەرانەدا ئەوەبووە، ناپلیۆن هەرجارەی هێرشی کردۆتەسەر بەشێکی سوپای دوژمن، دەنا بەبەراورد سوپای دوژمن لەهی ئەو زیاتربوون، ئەمەشوای نیشانداوە بەهێزە.

ناپلیۆن سەرنجی تایبەتی لەسەر رۆحیەتی سەربازەکانی هەبوو ، بەجۆرێ سزادانی بەدەنی سەربازان کە شۆرش ئەمەی نەهێشت ئەو تەواو پشتگیری ئەمەی دەکردو سەرزەنشتی بریتانیەکانی دەکرد بەوەی چۆن دڵیاندێت شەللاق لە سەربازەکانی خۆیان بدەن، هەر سەبارەت بەمە ناپلیۆن دەڵێت ( کاتێ سەربازێك بەشەللاق ئەتکی حورمەتی کرا ئیتر ئەوەندە شەیدای شکۆمەندی نابێت و هەستی شەرەف و شانازی کردنی ئەو سەربازە ئەوەندە نامێنێت کەلەبەردەم هاوەڵەکانیدا فەلاقەدراوە ؟).. من لەجیاتی ئەللاق دەمەوێت سەبازەکانم بەهاندان بەجۆش و خرۆشیان بهێنم و لە خۆرازیەتیان زیادبکەم ... من دوای



هەموو شەڕێك ئەفسەرو سەربازەكانم كۆدەكردنەوەو پێم دەگوتن كام لەئێوەشەڕی قارەمانانەو لە خۆبوردوانەی كردووە ؟ناپلیۆن ئەو سەربازانەی دلێریان لەشەڕەكەدا نواندبوو ، ئەوانەی خوێندەوار بوون پلەكانی بەرزدەكردنەوە ، ئەوانەش كە نەخوێندەواربوون – مۆڵەتی دەدانێ ڕۆژی ( 5) سەعات وانەی خوێندەواری بخوێنن ، چونكە ئەمانە فێری خوێندنەوەو نووسین دەبون بەرە بەرە پلەكانی ئەمانەی بەرزدەكردەوە ،

دیارە كەمتەرخەمی و سەركێشی كردنی سەربازەكانی بە گوللەبارانكردن سزادەدان ، بەڵام زیاتر پشتی بە پاداشت دان بەستبوو، واتە: زیاتر پاداشتی بەلاوە گرنگتربوو لەسزادان.

پاداشتەكانی ئەو بریتیبوو لەدانی پارەو پلەو نیشانەی ئازایەتی، بەدەستكراوەیی لەگەڵ سەربازەكانیدا دەجوڵایەوە، لە(14/ی مانگی فلوریال[304] ساڵی (1801) لەوكاتەی لەكۆبونەوەی شۆرای دەوڵەتدا باس لەدانانی نیشانەیەكی ئازایەتی دەكرا، ناپلیۆن بەدەنگێكی بەرز گوتی(گومانت هەیە كەدەتوانرێت سەربازان بەپارچە پارچەكردن ولێكدابڕان بۆشەڕ ناچاربكەیت، نەخێر ئەمە تەنها بۆ ڕۆشنبیرەكان دەشێ ئەویش لەناو ژووری كارەكەی خۆیاندا، پێویستە شانازی و پاداشت وئیمتیاز بدرێتە سەربازەكان، بۆیە سوپای كۆماری بەئەنجامدانی كاری گەورە سەركەوتو بووە، چونكە لەڕۆڵەی جوتیارو زەحمەتكێشەكان پێكاتووە، نەك لەدەستەیەك كەسی ڕەزیلی بێكارە.

لەبەرئەوەی ئەفسەری تازە جێگای ئەفەسەرە كۆنەكانیان گرتبۆوەو هەموشیان شەرەفمەندبوون...) بەم جۆرە ناپلیۆن لەو بەرزەوەندیانەی كەشۆڕش فەراهەمی كردبوون لەزانایی وئاگاییەوە سەركەتوانە بەكاری دەهێنان ولەبەرژەوەندی خۆی دەیشكاندنەوەو لەسەر دەستی ئەو دەبوا مێژووی سەربازی سەرئەنجام وئاراستێكی تری بۆ پێشینە بێنێتەپێش.

ئەولەناو خودی خۆیدا لەسەر ئارمانجێك دەڕۆیشت گرنگترین وبێ هاوتاترین خەسڵەتی پێویستبوو بۆیەك فەرماندە، ئەویش بریتیبوو لەیەك ئیرادەی ئاسنین وپتەوی ڕەقێتی ڕۆح وئازایەتییەكی تایبەت كەمەبەست لەمە ئەوشەڕانەی ناپلیۆن نین لەوكاتەی شەڕی پردی ئاركول كەئالای بەدەستێكییەوەبوو وشەڕیشی دەكرد– یان چەند سەعاتێك لەسەر گۆڕستانی ئایلو لەژێر بلێسەی تۆپەكانی دوژمندا مایەوە، بەڵكو مەبەست لەكەمكردنەوەی گەورەترین لێپرسراویەتی سەرشان و بوێری بریاردانە، سەركەوتوو ئەوكەسە نییە كەپلانی شەڕدادەڕێژێت– یان ڕێگاچارەیەكی پێویستی دۆزینێتەوە، بەڵكو كەسێكە كەلێپرسراویەتی جێبەجێكردنەكەی گرتۆتە ئەستۆ، بەڕای هەموو ڕەخنەگرانی بواری سەربازی ناودار، ناپلیۆن وەك كەسێكی سەركەوتوو لەشەڕەكانداو هەم وەك لەشكركێشی وفەرمانداریەتی سوپا، واتە: هونەری ڕێگای زاڵبون بەسەر دوژمنداو هەم وەك سیاسەدمەدارێك، واتە: سەپاندنی ئیرادەی خۆی بەسەر دوژمنی تێكشكاودا، پیاوێكی گەورەبوو، ناچاركردنی دوژمنیش بەئیرادەی خۆی تەنها بەو مانایەنا ڕۆحیەت وبەرەنگاریەكی بگرێتەوە، بەڵكو ناچاركردنی دوژمن بەو دانووستانانەی ئاشتی كەخۆی ئارەزوومەندیان بوو، واتە: وەك ئەو دەیویست، ئەم سێ خەسڵەتە لەئەودا بەشێوەیەكی تەواو تێكەڵاوی یەكتری ببوون وهەماهەنگی تەواویان هەبوو، لەهەموو شەڕەكاندا هەركەدوژمن تێكدەشكا، فەرمانی بەمارشاڵ موراو لەشكری سەربازە سوارەكانی ئەو دەكرد بۆ لەناوبردنی دوژمنی هەڵاتوو دەستبەكاربن ودوایان بكەون وبیانكوژن،

---

[304] - ساڵنامەی شۆڕشی مەزنی فەرنسایە، كەدەكاتە مانگی فبرایەر(و- كوردی).



موراش درێژەی بەبەدواکەوتن وکوشتنی دوژمنی هەڵاتوەدا هەتا سەرکەوتنەکانی مەیدانی شەڕبێن بەسەرکەوتن لەجەنگداو ئەم بەدوا کەوتنەش هەتاپشت مێزەکانی دانووستان ومۆرکردنی ڕێککەوتن نامەکان درێژەی دەکێشا.

ناپلیۆن لەسەرتای هەموو شەڕێکدا هەوڵیدەدا بەوەشاندنی یەك دوو زەبری کوشندە دوژمن ناچاربکات بۆ ئاشتی کردن.

ئەم خاڵە وای لەکلاوس ویتز کرد، چەمکی هونەری ڕابەرایەتی کردنی شەڕ کەبەلای ناپلیۆنەوە پەسەندە، پێناسەبکات و ئەوەش بەدیاردەیەکی تەواو تازەی مێژوویی بزانێت کەجەنگی گەیاندۆتە کاملیونی ڕەها.

کلاوس ویتز دەنووسێت (... لەڕۆژگاری ناپلیۆن بۆناپارت بەدواوە، سەرەتا لەلایەکییەوە دواتر لەدوولاوە، شەڕ بۆتە کاری هەموو تاکەکەسەکانی میللەت، بەو مانایەی سەرەتادا بەلای فەرەنسییەکانەوە بۆشەڕکردن لەدژی داگیرکەرانی بیانی ودواتریش بۆئەو میللەتانەی کەلەبەرامبەر زیادە ڕەویەکانی ناپلیۆندا ناچاربوون بەرگری لەخۆیان بکەن، ئیتر لەوکاتە بەدواوە جەنگ شێوازێکی تری وەرگرت- یان بەمانایەکی باشتر، بەچۆنیەتی بنچینەیی وکامڵبونی تەواوی خۆی نزیکتر بۆوە، ئەو هەوڵوکۆششانەی لەپێناو ڕاهبەی جەنگیدا دەکرا، بەهۆی زیادبوونی کەرەستەکانی وکرانەوەو واڵابوونی چاوپێداخشانە بەرفراوانەکان وگرتنەبەری ڕێگای تازە، حەزو ئارەزووی سەرکەوتن وبیرۆکەکانی ئەو بەشێوەیەکی توندو تیژتر هاتەپێش، (وێرانکردنی تەواوی دوژمن بوویە ئامانج لەکارە سەربازییەکاندا، ڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ دوژمنداو دانووستان بۆ ئاشتی کردن لەبەرامبەر دوژمنی تێشکاودا بووەشتێکی نابەجێ ونەشیاو، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو هەڵسەنگاندنە وردەی کلاوس ویتز دەربارەی ڕاهیەری جەنگی ناپلیۆن کردوویەتی، لەگەڵ ئەم خاڵە بنەڕەتییەدا کامل وتەواودەبێت کەئەو سەردارە مەزنە بەهۆی بەرفراوانی ئامانجە سیاسییەکانی جەنگ وبەهێزیەکەی دووجۆر شەڕی دەگرتەوە.

شەڕی دەستدرێژی وشەڕی بەرگری، بەڵام ناپلیۆن بەکێشانی خەت لەنێوان ئەو دووانەدا ڕازی نەبوو وتەنها بەپێی تایبەتمەندییەکانی شەڕە جۆراوجۆرەکانی کەلەبارودۆخی سیاسی وهێزی سەربازی بوون ڕای خۆی دەردەبڕی).

ناپلیۆن سەبارەت بەتێبینیەکانی خۆی لەسەر کتێبەکەی ژنرال ڕوین، کەلەساڵی (1816)دا بلاوکرابۆوە، ئاوا دەڵێت (هەموو شەڕێکی دەستدرێژیکارانە شەڕی هێرشبەرانەیە ... هەر جەنگێکیش لەسەر بنەمای هونەری ڕەهبەری بێت بەنەخشە بۆکێشراو هەژماردەکرێت، شەڕی بەرگری جیاوازی لەگەڵ شەڕی دەستدرێژکاری دانییە، چونکە جەنگی دەستدرێژکاری هەرچەندە بەمەبەستی سنووربڕین وداگیرکردنی خاکی دوژمن بێت لەگەڵ شەڕی بەرگریدا ناکۆکنییە).

ناپلیۆن دوای ئەوەی ڕای خۆی لەسەر سەرەگەورەکانی سەردارانی جیهانی دەردەبڕێت، سەبارەت بەبنەماو سیستمی هونەری سەربازی ئەوان، ئەویش وەك هەموو فەرماندە مەزنەکان، ئەوەی بەلایەوە گرنگە لەدوژمن بسرەوێنێت ولەناوی ببات، باوەڕی کلاس ویتز دەربارەی ناپلیۆن کەلەسەرەوە باسمانکرد ڕای تایبەتی خۆیەتی ولەکتێبەکانی کەسانی تردا نییە، بۆ نموونە: ژومینی، باسی نەکردووە، جێگای ئامازە بۆکردنە فردریك ئەنگڵس لەگەڵ ئەوەشدا کەکتێبەکەی کلاوس ویتزی بەشتێکی بڕیەها لەقەڵەمداوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا توێژینەوەی لەکتێبەکەی ژومینی کردووە کەسەبارەت بەناپلیۆن نووسیویەتی ونەمەی دوایی پێ لۆژیکتربووە، بۆ نموونە: ئەوەی [305] بۆ جوزف ڤیدمایری نووسیوە دەخەینەڕوو (بەتێبینی کردنی

---

[305] - مەبەست لەفردریك ئەنگلسە، کەنامەی بۆ جوزف ڤیدمایر نووسیوە، لە(12/ی ئیبریلی ساڵی (1853)دا)و-فارسی).



هەمەلایەنەیی، ژومینی، باشترین مێژوو نووسی شەڕەکانی ناپلیۆنە، جگەلەچەند باس وتوێژینەوەی کەمی پرپەهای خودی کلاوس ویتز، بەهیچ جۆرێك کتێبەکەی ئەو بەلای منەوە پەسەندنییە.

( 3 )

ناپلیۆن نەفرەتی لەژاکوبنەکان دەکرد، لەبەرئەوەی ئەوانە دەیانویست بەری سەرکەوتنی شۆڕشی مەزن وابەستەو دابەشی چینی پرولیتاریای بکەن، بۆیە زۆر توندوتیژو بێ بەزەیی بوو لەبەرامبەریاندا،

پارێزگاریکردن لەهەرجۆرە خاوەنداریەتی، لەمانەش پاراستنی مڵك لەدەست گوندنشینەکاندا کەلەسەردەمی شۆڕشدا درابوویانێ، بەردی بناغەی سیاسەدی ناوخۆی ناپلیۆن بوو.

ئەگەرچی بەپێی گوتەی مارکس کەلەکتێبی خێزانی پیرۆزدا دەڵێت: ناپلیۆن هەوڵیدەدا بەرژەوەندی توێژە هەمەجۆرەکانی برژوازی وابەستەبە بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆریەتییەکەی خۆی بکات).

واتە: کرێکارانی پاریس ولیون و ئامین و روان بۆسەر ئەو هەڕەشەیەکی گەورەبوون وتاکە رێگای بەرگریش لەبەرامبەر ئەمانەدا، دروستکردنی پۆلیسی چاودێری ویەکەی سەربازی بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ وهەوالگرو... بوون کەفوشەی وەزیری ناوخۆ بەژیرییەکی زۆرەوە دروستی کردبوو، ناپلیۆن زۆر هەوڵیدەدا لەبەرامبەر شەپۆلی زۆری بێکاری ساڵی (1811)دا هەزاران کرێکاری سەرگەردان و برسی کردبوو، خۆی ڕاگرێت، بەگەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیاو دانانی یاساو رێسای کاری لەهەموو وڵاتانی ناو ئیمپراتۆریەکەی توانی چارەسەرێك بدۆزێتەوەو خۆی لەم تەنگژەیە قوتاربکات، بازاڕی بۆ فرۆشتنی کاڵاکانی فەرنسی دابینکردو مەوادی خامی بۆ پیشەسازییەکانی فەرەنسا بەنرخی هەرزان دەستەبەرکرد.

ئەنگیزەی سەرەکی سیاسەدی ئابووری ناپلیۆن دەستەبەرکردنی بازاڕی باشبوو بۆ پیشەسازییەکانی فەرنسا لەدنیاداو وەدەرنان وبێبەشکردنی پیشەسازو کاڵاکانی بریتانیابوو لەبازارەکاندا[306] ئەمە دوو میکانیزمی یەککگرتووبوون ... بەڵام لەرووی پەیوەندی کرێکاران بەخاوەن کارخانەکانەوە، ناپلیۆن نەك هەر بەدانانی قانونەکانی وەك شاپلیە، کەبچوکترین مانگرتنی بەناقانونی لەقەڵەمدەداو تەواو پشتگیری خاوەن سەرمایەکانی دەکرد، بەڵکو بەدروستکردنی دەفتەرچەی کرێکاری زیاتر پێداگری لەئازارو ئەشکەنجەدانی زەحمەتکێشان کرد، بەڵام لەبەرچی لەئاستەنگترین ساتەوەختەکاندا کرێکاران دژبە ئیمپراتۆر ڕانەپەڕین؟ بۆچی دادگاکانی بوربنەکان کەلەساڵانی (1816 و1817 و1818 و1819 و1820 و1821) کەدووبارە پێکهێندرابوونەوە، لەپاریس وشارەکانی تری فەرنسادا کرێکارانیان دەگرتن ومەحکوم بەزیندانیان دەکردن لەسەر ئەوەی دروشمی بژی ئیمپراتۆریان گوتۆتەوە؟

من لێرەدا هەوڵمداوە وەڵامی ئەمە بدەمەوە، زەحمەتکێشانی شارو شارۆچکەکان بەحوکمی غەریزەیی لەوەگەیشتبوون سیستمی برژوازی بەرهەمهێن شۆڕش کەئیمپراتۆر نوێنەری بوو، لەگەڵ هەموو کەموکورییەکانیدا لەسیستمی کۆن ودارزیوی شانشینی، واتە شانشینی بوربنەکان باشترە، کەلەگەڵ لەشکری هاوپەیماناندا گەڕابونەوە سەرخاکی فەرەنسا،

---

306 - مەبەست لەبازارەکانی ساغکردنەوەی کاڵای بریتانیە لەپاتایی ئیمپراتۆریەکەی ناپلیۆندا،(و- کوردی) .



یاداشتی خۆشی ڕۆژانی پرشانازی شۆڕشی مەزن هەتا ئەوکاتەش لەناو دڵی کرێکاران وزەحمەتکێشاندا مابۆوەو ڕۆژگاری حکومەتی سەد ڕۆژی ئیمپراتۆر کەهەموو پێی دڵخۆشبوون وبەڕاستی زەحمەتکێشان لەگەڕانەوەی بوربنەکان هەراسانببوون ودەترسان.

ئەگەر لەبەرامبەر هەڕەشەی گەڕانەوەی سیستمی کۆنی شانشینی بوربنەکاندا ئەوە بەڕاستبزانین کەناپلیۆن نوێنەری سەردەمی نوێی پیشەسازی ولەدیدی ئابووریش بەگشتی کرانەوەو بەرەوپێشبەری ئەوە، لەجێگای خۆی دایەتی، دەبێ ئەوەش بڵێین سەرکەوتنەکانی ئەو لەهەرەسپێهێنی ڕژێمە ئەوروپاییە فیودیالەکان یەك ڕۆڵی شۆڕشگێڕانەی هەبووە.

دامەزرێنەرانی فەلسەفەی زانستی دیالکتیك: بەهایەکی گەورەیان بۆکارەکانی ناپلیۆن داناوەو چەند جارێك ئاماژەیان بۆ کردووەو دەڵێن (... ناپلیۆن ئیمپراتۆریە موقەدەسەکەی ڕۆم وئەڵمانی لەناوبردو ژمارەی وڵاتە بچوکەکانی ئەڵمانی نەژادی کەمکردەوەو دەوڵەتی گەورەتری دروستکردن.

لەو وڵاتانەی کەکەوتبوونەژێر پانتایی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەکەی یاساو ڕێساکانی خۆی کەلەسەر بناغەی یەکسانی و دادپەروەری... هتد، دامەزرابوون لەجێگای قانونە کۆنەپەرستییەکانی ئەواندا دانا.

بەڕای ئەنگلیس (جوتیاران وچینی برژوازی ئەڵمان لەتێڕوانینیان لەناپلیۆن بەهەڵەداچووبوون، ئەوانە لەگرانبونی شەکرو قاوەو توتن، ناڕازیبوون نەیاندەزانی گەمارۆدانی ئابووری سەر بریتانیا، دەبێتە هۆکاری سەرکی بەرەوپێشچوونی پیشەسازی ئەڵمانی ... جگەلەمانەش نەیاندەتوانی درك بەمەزنی دەستپێشخەرییەکانی ناپلیۆن بکەن ولەپلانەکانی ئەو بگەن وقسەی نابەجێیان بەناپلیۆن دەگوت، چونکە ڕۆڵەکانیان بۆشەڕکردن لەدژی ئەشراف وسەرمایەدارانی بریتانی دەبات، بەڵام ستایشی بریتانیایان دەکرد کەلەڕاستیدا ئەوهۆکاری هەلایسانی ئەوشەڕەبوو، ڕژێمی تیرۆرو تۆقاندن لەفەرەنسادا کاری خۆی کردبوو وناپلیۆن لەوڵاتەکانی تردا بەشێوازی شەڕ درێژەی پێدەدا، بۆ ئەڵمانیاش بەتایبەت ئەم ڕژێمەی تیرۆر وتۆقاندن زۆر زەروری بوو...).

هەروەها لەو واتارانەی کەلەسەر باکوتینی نووسیوە، لە(14/ی فبرایەری ساڵی (1849)دا بەمجۆرەی خوارەوە لەم بارەوە نووسراوە(لەمێژوودا هیچ کارێك بەبێ توندوتیژی یەك ئیرادەی ئاسنین نەسەپێندراوە، ئەگەر ئەسکەندەری مەکدۆنی و سیزارو ناپلیۆن بەپێودانی ئەوکەسانە پێوەربکەین کەبەهەستی بێهودەیی ولاوازی خود لایەنگرانیان بۆخۆیان دەستەبەر کردبوون. دەبێ مێژوو چۆن با؟

سەبارەت بەبێتوانایی هاوبەشی هێزەکانی سەربازی شەڕی خۆرهەلاتی ساڵانی (1853-1854) دەگوترێت ئیرادەی ناپلیۆن زۆر مرۆڤدۆستانەتر بووە کەلەنەزانی کردەوەو هەڵەکانی ئەوە نائامادەباشەکانی دواتر بووە.

سەبارەت بەگەمارۆدانی سباستوپول، نووسیویانە، لەڕاستیدا ناپلیۆنی مەزن، ئەو جەللادە ملیۆنەها مرۆڤی بەڕەفتارو بڕیارەکانی وجوڵە بروسك ئاساکانی لەبەرێوەبردنی شەڕدا کردوونە قوربانی، بەڵام بەپێوانە لەگەڵ پیاوانی سیاسی و کەللەپوچی بێئیرادەو بێپلان کەڕابەرایەتی شەڕی ڕوسیایان دەکرد، نومونەیەکی کاملی مرۆ دۆستانەبووە...).

ئەنگلس بێ ئەوەی بیەوێت ڕۆڵی داگیرکردنەکانی ناپلیۆن لەئەوروپادا لەبەرچاو نەگرێت ونوکلی لێبکات، ئاماژە بەم خاڵەش دەکات کەناپلیۆن لەکۆتاییەکانی حکومەتەکەیدا بەرەبەرە بۆ دەسەلاتداری پشتبەستوویە قانونەکانی ئیلاهی دەگۆڕدرا..



گەورەترین هەڵەی ئەو ئەوەبوو کچی بنەماڵەی شانشینی دژە شۆڕشی نەمسای کردە هاوسەری، ئەو لەبری ئەوەی هەموو شوێنەواری ئەورووپای کۆن نەهێڵێت وبۆخۆی ببێتە پێشەنگی بێ رکەبەر کەچی هەوڵیدەدا دەربارەکەی خۆی وەك دەرباری وڵاتانی شانشینی تری ئەورووپا لێبکات، بەڕای ئەنگلس ئەوەی سەرئەنجام بووەهۆی ئەوەی لەناوی ببات ئەوەبوو ملی بۆ شانشینی بۆماوەییدا.

هۆی تێشکانی هەموو وڵاتە شانشینەکانی ئەورووپا بەدەستی ناپلیۆن لەسەرئەنجامی شەڕی گەورەوە ڕوویداو سەرئەنجام هێزەکەی خۆشی بەفەلاکەتدا، ئەورووپا کەلەڕووی ئابوورییەوە دواکەوتوتربوو لەفەرەنسای ناپلیۆنی، لەبەرامبەردا بریتانیا هەبوو لەوبوارەدا زۆر لەفەرنسا پێشکەوتووتر بوو، چونکە زاڵبوویەسەر دەریاکانی دنیادا ئەگەری ئەوەنەبوو بەڕێگای لەشکرکێشی بتوانرێت ناپلیۆن زەبری لێبوەشێنێت.

ناپلیۆن هەرزووزانی ئەم دوژمنە لەهەموو دوژمنەکانیتر مەترسیدارترە، چونکە دەستی بەدەریا نەدەگەیشت بڕیاریدا ئەو لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەچۆك دابێنێت (واتە: سوریاو میسر) لەمەشیاندا سەرکەوتوو نەبوو، ئینجا کەوتە بیری ئەوەی هۆردرووی دەریایی پولونی سازبکات بەڵکوبەمە دوژمنەکەی لەلەندەندا گۆشەگیربکات، هیچ یەك لەم دووانە ئاکامی باشیان نەبوو، دواتر هەوڵیدا بازاڕەکانی بریتانیا لەسەرتاسەری ئەورووپادا لەدەست ئەودەربێنێت، نەیتوانی ئەم کارەش بکات بەزیاترکردنی کاڵاکانی فەرەنسی وچاکتر لەڕووی چەندایەتی وچۆنیایەتی وهەرزانییەوە بکات، چونکە ئەمکارە نەدەکرا، ناچار پەنای بردەبەر شەڕو تفەنگی سەربازەکانی گومرگ، بۆلەناو بردنی بریتانیا تەنها ئەوە بەس نەبوو پیشەسازی وبازاڕی کاڵا ساغکردنەوەکانی لەناوبەرێت، دەبوا بازرگانی کردنەکەشی ئیفلیجکردبا، دەبوا زیان بەناوەندە بازرگانییەکانی بگەیەنێت وەدەریاوانی ئەو لەباریبەرێت وهاوردەی خاکە ژێر دەستەکانی بریتانیا بگەێنێتە ئاستی سفر.

بۆ جێبەجێکردن وکاملبونی گەمارۆی ئابووری سەر بریتانیا دەبوا سەرتاسەری ئەورووپا بەتایبەت ڕوسیا بەدانیشتوانە زۆرەکەیەوە ملکەچی ئیرادەی خۆی کردبا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەمانای دەسەڵاتداریەتی جیهان بوو کەناپلیۆن دوای سەرکەوتنی لەشەڕی ئوسترلیتز لەژێر ناوی ئیمپراتۆریەتی خۆرئاوا، پروپاگەندەی بۆدەکردو دوای شەڕی تیلیست وردەوردە نیازی خۆی ئاشکرا دەکرد.

ئەو بەوجۆرە بیرکردنەوەی، بەم ڕێگایە نەیدەتوانی جگەلەچارەنووسی لەناوچوونی هیچیتر وەدەستبهێنێت، سەرئەنجامیش بینیمان لەبەینچوو.

( 4 )

هەموو ئەو هەوڵە باوانەی لەپێناو ئەوەی ناپلیۆن وەك یەك بوونەوەری پاکیزەو بێ کەموکوڕی وهەڵە بناسێندرێت و پروپاگەندەی ئەوەی بۆبکرێت ئەو فریشتەبووەو تەنها بۆ بەرژەوەندی وخێروخۆشی مرۆڤەکانی سەرزەوی هاتووە، تەواو شتی بێهودەیی و بێمانان.



چونکە ناپلیۆن خۆی بەو تەپە دڵانەی ویژدانییەوە پەرێشان نەدەکرد، ئەو بەڕاستی وبەدڵسۆزانە خۆی بۆ پاراستنی بەرژەوەندی فەرەنسا تەرخانکردبوو، وێردی سەرزمانی ئەو هەمیشە مەزنی فەرەنساو بەرژەوەندی فەرەنساو ئاسایشی فەرنساو بەکورتی هەموو شتێك فەرەنسابوو.

پێشتر ئاماژەمان پێکرد کەناپلیۆن ناوی فەرنسای دەهێنا، مەبەستی لەکام چینی گەل فەرەنسابوو، ئەو هەمیشە بەناوهێنانی وشەی فەرەنسا مەبەستی لەسەرمایەداری گەورەو هەتا ئاستێکیش کۆلاکەکان بوو، بەڵام ئەگەر لایەنی رەوشتی–یان موڕالیستی ئەمە وەلانێین ولایەنی فکری بخەینەبەرچاو، ئەوا دەتوانین گوتەیەکی لۆرد روزبەری بریتانی کەسەبارەت بەناپلیۆن گوتویەتی درك پێبکەین (ناپلیۆن، سنوورەی نێوان هۆش وبرەو وتوانای مرۆیی هەتا بێکۆتایی بەرەو دواوە بردەوە)

برتانییەکی تر بەناوی، پرۆفیسۆر هێلیندروز، کەهیچ شکاندنەوەو لایەنگرانەی بەلای ناپلیۆندا نییە، دەربارەی ئەو دەڵێت (ناپلیۆن لەساتەوەختێکدا دەربارەی چارەنووسی سەرتاسەری ئەورووپا بڕیاریدەداو بۆ دەستگەیشتنیش بەو ئامانجەی خۆی بەئیرادەی بێ کەموکوڕییەوە هاوتا دەکرد)

بێ رەحمی ئەوبەهۆی هەوەسەوە نەبوو، ئەو بەیەك چاو سەیری مرۆڤی دەکردو تەنها وەك کەرەستەیەکی بەردەست بۆ دەستەبەرکردنی ئامانج سەیری دەکردن.

بیرو هۆشی لەهەموو شتەکاندا لەوەئاگاداری دەکردەوە کەهەتا دەکرێت بەبێ ستەم و زۆرداری لەئامانجەکەی نزیکبێتەوە.
ئەگەر زانیبای بارودۆخەکە بواری ئەمە دەدات ئەوکارەی دەکرد، ئامانجە سەرەکییەکانی کەدوای شەری تیلیست و ڤاگرام گرتبوونییەپێش وهەموو ئەو خەونانەش نەدەهاتنەدی، بەڵام هزری بەتوانای ئەو بۆگەیشتن بەوئامانجانە لەزۆر ڕێگاوە بەبەکە رستەی چاوەڕوان نەکراو دایدەهێنان وبەرەوپێشی دەبردن.

خاڵە سەرەکییەکانی لەبەرچاو دەگرتن ولایەنە لاوەکییەکانیشی بەوردی شرۆڤەدەکردن وپەی بەلایەنەکانیشی دەبرد، ئەم بەپێچەوانەی ئەو پەندە پێشینە بەناوبانگە، دەیتوانی لەکاتی شەڕدا درەختەکانیش ببینێت و لق و پەلو پۆپ و چڵ و گەڵاکانیشیان لێك جیابکاتەوە، هەستکردن بەبەهێزی و شکۆمەندی و مەزنی ئەوهەوەسانەبوون کەبەسەر ڕۆحی ئەودا زاڵببوون وبەڕای ئەو بەهێزی باڵاترە لەشانازی.

لێکدانەوەو هەمیشە سەرگەرمی بەکارو بەردەوام ڕوانین بەگومانەوەو تورەیی، هێڵە سەرکییەکانی خەسڵەتی ناپلیۆن بوون.
ناپلیۆن باش پەی بەوڕاستییەبردبووکە بنەما سەرەکییەکانی وەجوڵەخستنی مرۆڤ ترس وبەرژەوەندی پارێزیە، نەك عشق، لەم بۆچوونەشیدا سەربازانی لەم هاوکێشەیە بەدەردەنا.

ڕۆژێکیان لەناو دەربارەکەی خۆیدا ئەم پرسیارەی کردو گوتی(ئەگەر بمرم ئەورووپا چۆن هەواڵی مەرگی من وەردەگرن؟) دەربارییەکان گوتیان پرسەدادەنێن ودڵگران...

ناپلیۆن قسەی بەمانە بڕی وگوتی: ئەوروپا پشوی ئیسراحەت هەڵدەکێشێت.

ناپلیۆن ئەوەشی باشدەزانی سەربازەکانی زۆریان خۆشدەوێت، بەڵام ئەو بەئەندازەی سەربازەکانی خۆشی نەدەویستن، کەچی تەواو پێیان پشتبەستوو بوو لەمەرگیش نەدەترسا.



کاتێ دوای مردنی تەرمەکەیان دەشت، جگەلە جێبرینی سەرە نێزەی ڕۆژگاری شەڕی تۆلۆن شوێن برینی ئەو گوللەی کەلەساڵی (1809) لەراتیسبون بەقاچی کەوتبوو، زۆر جێبرینی سارێژبوو لەسەر لەشی ناپلیۆن دەبینران کەکەس بچوکترین زانیاری لەسەر ئەمانە نەبوو، ئیمپراتۆر لەکاتی شەڕەکاندا بۆئەوەی سەربازەکانی ورەبەرنەدەن، برینداربوونەکانی خۆی بەنهێنی دەهێشتنەوەو جگەلەو کەسانەی زۆر لێوەی نزیکبوون وبۆیان تەداوی دەکرد، کەسیتر نەیدەزانی، ناپلیۆن بەمانەشی دەگوت لای کەس باسی ئەم برینداریەم نەکەن.

سەبارەت بەو شانازیانەی دوای مەرگی بەناوەکەیەوە دەکران هیچ گومانی نەبوو، باسکردن وگێڕانەوەی ژیانی خۆی بەشتێکی نائاسایی دەزانی وپێش هەموو شتێکیش بەسەرئەنجامی ڕێکەوتی لەقەلەمدەدا کەبەهۆی هەلومەرجی دەگمەنەوە هەر هەزار ساڵ یەك جار ڕوودەدات.

ڕۆژێکیان لەسنت هێلین ناپلیۆن بە لاس کازی گوت (ڕاستی ئەم ژیانەی من ڕۆمانێکی سەرسام هێنەرە).

ناپەیدابوونی ئەو لەسەر ڕووداوەکانی ئەوروپا لەگەڵ هاوچەرخەکانیدا کاریگەری جێهێشت، وەك بڵێی تۆفانێکی توڕەو بەهێز سەردەمانێکی زۆر هەموو شوێنێکی کوتابێت و وێران کردبێت و ئێستا نیشتبێتەوە، لەئەوروپای ئەوکاتدا،

پێش هاتنەسەرکاری ناپلیۆن، پێشکەوتنی ئابووری وکۆمەلایەتی، پایەی حکومەتە کۆنەپەرستەکانی کەچەندین سەدەبوو پارێزگاریان لەفیودیالی دەکرد، هێنابووە لەرزەو بنچینەی دامەزراوەکانی قەزایی وئیداری هێنانە ئاراو ئەو حکومەتانەی کەبەڕووکەش شکۆمەند دیاربوون ولەناوەوەشدا کرمێ بیوون ودارزیبوون، لەباربرد.

ناپلیۆن لەسەرتۆپی پێشەنگی ئەو تۆفانەدابوو کەبەرەو ئەوروپا هەڵی کردبوو وسێلاوی هێنابوو، ئەو ئەم حکومەتە کرمێ بووانەی وێران ولەناوبردن. هەرچەندە ئەودیوارە لەرزۆکانە بەبێ بوونی ناپلیۆنیش هەرهەرەسیان دەهێنا، بەلام ناپلیۆن لەڕووخانەکەیانی خێراترکرد،

ناپلیۆن پەیامە مێژووییەکەی خۆی بەداناییەکی بێهاوتا جێبەجێکردو ئەوکارە سەخت وگرانەی بەئاسانی ئەنجامدا.

دوای ناپلیۆنیش هەندێك لەوحکومەتە شانشینیانە هەتا ماوەیەك توانیان خۆیان ڕابگرن لەئەوروپای خۆرئاوادا، بەلام جگەلە چەند دانەیەکیان، هەموویان وەك ئەو لاشەوابوون بەزۆر خرابنەسەر پێوو ڕاگیرابن، کودەتای ساڵی (1830) لەفەرەنساو شۆڕشی (1848) لەئەڵمانیاو نەمساش کاری ماشتنی ئەم زبڵ وزاڵە مێژووییەی ڕاماشت.

بۆ لابردنی سرواژیش لەڕوسیادا، یەکەم هەنگاو هەتا ساڵی (1861) نەنرایەوەو ئەمەش بەبەرپەرچدانەوەی توند لەلایەن ئەشرافەکانەوە ڕوو بەڕوو بۆوە.

ئەشرافەکانی ڕوسی بێ پەروا بەئومێدی ئەوەبوون بێئەوەی هیچ ئیمتیازێك لەدەستبدەن کەبەهۆی بارودۆخی نالەبارەوە لەدەستیاندابوو، دووبارە وەدەستبهێننەوە، بەلانی کەمەوە لابردنی بڕیارەکانی سرواژ لەبەرژەوەندی خۆیان چاکسازی تێدابکەن ولەمەشدا سەرکەوتنیان کەم تازۆر بەدەستهێنا.

پێویستە ئەوە وەبیربهێنینەوە ناپلیۆن بۆئاسانکاری شەڕەکەی لەگەڵ ئەوروپای فیودیالیداو سەرکەوتن بەسەریدا هەرچی توانای هەبوو خستبوویە گەڕ، کۆنە فەرماندەی[307] ڕۆژگاری شۆڕش، زیاتر لەپێستی ئیمپراتۆری فەرنسادا دیاردەکەوت، دواتر وەك پاشایەکی ڕەهای

---

[307] - مەبەست لەناپلیۆنە کەلەسەردەمی حکومەتی ژاکوبنەکاندا ئەفسەربوو.(و- کوردی).



دەسەلاتداری دنیاو گومانیشی لەئازادکردنی میللەتانی دنیا لەدەست فیودیالیزم نیشاندەدا، وەك چۆن لەسالآنی (1807–بۆ 1812) لەپۆلۆنیا بۆ ئەوەی زەوی بەئەوان بدات جوتیارەکانی ئازادکردن، لەڕاستیدا ڕێگایدا ڕژێمی سرواژ لەجێگاکەی خۆیدا بمێنێتەوە، لەسالی (1812)دا لەڕوسیادا ئەم کارەشی نەکرد، ئەو تەنها کاری بۆئەوە دەکرد ئیرادەی ئاسنینی خۆی بەسەر میللەت و دەولەتەکاندا بسەپێنێت و بۆملکەچکردن بۆخۆی، لەوکاتانەدابوو کەئەورووپا تێکڕا یەکدەست دژی ئازاردەری دنیا، ناپلیۆن، ڕاست بوونەوە.

لەسالآ،ی (1813 –1814) تەنها ئەشراف و پاشماوەکانی فیودیالی نەبوون کەدەیانویست خۆیان لەچنگ زۆرو ستەمی ناپلیۆن ڕزگاربکەن، بەلکو برژوازی ولاتەژێر دەستەکانیش بەهۆی دەسەلاتداریەتی ناپلیۆنەوە لەپێشکەوتن دواکەوتبوون حەزیاندەکرد لەدەست کۆت وبەندی دیلی ئەو ڕزگاریانبێت، ئاگاین لەو وەبەرهێنانە بێ بەزەییانەی ناپلیۆن کەبۆ خزمەتی برژوازی فەرەنسا دەیکرد.

لەڕاستیدا کاتێ ڕاپەڕینی میللی بواری خەلکیدا خۆیان لەدەست ستەمی ناپلیۆن ڕزگاربکەن، بەری ئەو سەرکەوتنە بەنسیب چینی برژوازی نەبوو، بەلکو بەقازانجی میرو شانشین و ئەشرافەکان شکایەوە لەو ڕۆژگارەدا، بۆیەش لەو ڕۆژانەدا برژوازی ئەورووپا لاوازبوو ویەکخستنەوەیەکی دروستی نەبوو.

هەمان ئەو چینەی کۆمەلگای ئەورووپایی کەپێشتر، ناوی هاوشاری لەناپلیۆن نابوو وکنسولی یەکەمی دەگەیاندە گەیاندە کەشکانی ئاسمان و بەقارەمانی ئازادی بەخشی شۆڕشی دەزانی– یان بەلانی کەمەوە وەك هەموو توێژەکانی تری کۆمەلگا لەبەرواری(18/ی برومدەوە هەتا ڕاگەیاندنی ئیمپراتۆری، وایان لێدەڕوانی.

لەسالانی(1813 و1814 و1815)دا چینی برژوازی، بەرپەرەکانی ناپلیۆنیان دەکردو دژی وەستابونەوە، سیاسەتە ئابوورییەکانی ناپلیۆن لەولآتانی دەستنیشانکراوی خۆیدا هەرئاوا دەتوانرا دابنرێن، ئەو هەتا کۆتایی تەمەنی خۆی حەزی نەکرد ئەم مەسەلەیە درك پێبکات، تەنانەت نەشیدەتوانی درکی پێبکات، پەیکەری زێڕینی ئیمپراتۆر، کەتاجی شانازی لەسەر سەرداناوەو داری دەسەلاتداریەتی لەدەستێکدایەو بەدەستکەی تریشی گۆیەکی سپیەو لەناوەندی شاری پاریس لەسەر چەند پایەیەکی بەرز داناوەو چوار دەوریان پڕکردووە لەوتۆپانە کەلەدوژمنیان گیراون.

ئەو ئەو ڕاستییەمان نیشاندەدات کەناپلیۆن لەسەردەمی ژیانی خۆیدا چەندە خەونی بەزالبوونی بەسەر ئەورووپاو ئەگەر شیابا ئاسیاش دیوە، ویستویەتی دەسەلاتی دنیا بگرێتەدەست وئیمپراتۆری جیهانی دروستبکات، بەلام ئیمپراتۆری جیهانی دارمار شوێنەوارەکانی "نۆزدە کلتورو ناونیشان" ناپلیۆن تەنها ئەو بەشەی هەتا ماوەیەکی دوورودرێژ مایەوە، کەزەمینەی ئەو پێش وەدیارکەوتنی ناپلیۆن، فەراهەمکرابوو، ئەمەش بەپشت بەستن بەمێژوو، هۆکاری دیاریکردنی ئەو سەرهەلدانەی ناپلیۆنیش، بەباری بەرەوپێشچوونی کۆمەلگاو پێشکەوتنی زانستی (پیشەسازییەوە دەبەستێتەوە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەنگیزە قولەکانی ئابووری وکۆمەلایەتی.

سیمای ناپلیۆن بۆ هەمیشە لەناو هۆشی مرۆڤدا نەخشەی هەیە، ئەم یادە بەلای کەسانێکەوە، تارماییە (ئاتیلاو تەیموری لەنگ وجەنگیزخان وەبیریان دێنێتەوە، بەلای هەندێك کەسانی تریشەوە ئەسکەندەری مەکدۆنی و سیزاری ڕۆمیان وەبیردێنێتەوە) بەلام چەندە لێکۆلینەوەی مێژوویی زیاتر بەرەوپێشبچێت، ڕەسەنایەتی بێهاوتاو کەسایەتی پڕنهێنی ئامێزی ئەو [308] گەشتر دێتەبەرچاو ودەدرەوشێتەوە.

---

[308] – مەبەستی نووسەر لەناپلیۆن بۆناپارتە.(و-کوردی).



# مێژوو نووسانی ناپلیۆن

دەربارەی ناپلیۆن مێژووی زۆرو هەمەچەشن نووسراون کەکۆی گشتیان قەبارەیەکی گەورەپێکدێنێت، بۆ ئەو خوێنەرانەی دەیانەوێت زانیاری لەسەر ناپلیۆن وەدەستبهێنن، دەتوانن سەیری کتێبەکانی کیرشاینن، بکەن کەلەژێر ناونیشانی (ناپلیۆنی یەکەم)ەو نوێترین وکاملترین نووسین دەربارەی ناپلیۆنی تێدایە، ئەمە جگەلەوەی چەندەها وتاری لەخۆگرتوون.

زۆربەی ئەو نووسینانەی لەسەر ناپلیۆن نووسراون، لەساڵە سەرتاییەکانی دوای مردنی ئەو تەنها شتی وەك پێهەڵگوتنی نیشتمان پەروەرانەنین وئەمانەش لێشاوێك کتێبن ونووسینی سەرپێی ومێژوویی ساختەو داخ لەدڵانەن وبەقەڵەمەکەی لایەنگرانی شانشینی ( بوربنەکان ) نووسراون.

بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو هەڵمەتە هێرش ئامێزە، یاداشتەکانی دوشس دابرانتس و شاپتال و کتێبی سی کازو سەدان نووسینی ستایشی تر دەستکرا بەبڵاوکردنەوەیان و بەرەبەرە بەلاهاوسەنگبوونەوەی ئەم نووسینانە، کەلەگەڵ و دژ دەنووسران، یەکەمین نووسین بلاوبوونەوە کەبەشێوازێکی وردو راست لێکۆڵینەوەیان لەمێژووی ناپلیۆن دەکرد، لەنێوان نووسینەکانی سەرەتاییدا یەکێك لەوکتێبانەی بەشێوەیەکی ژیرانەو دروست مێژووی ئیمپراتۆری فەرنسای نووسیبۆوە کتێبە بەناوبانگە(20) بەرگییەکەی ئادولف تیەپر، بوو بەناونیشانی (مێژووی کنسولی یەکەم وئیمپراتۆری) باسکردن و شیکارکردنی ئەو لەسەرشەڕەکانی ناپلیۆن تابەئەمڕۆش گرنگی خۆیان ماوە، بەڵام ئەم کتێبە بەهستی نیشتمان پەرستانەی زیادەڕۆیانە نووسراوەو پێی وایە لەهەموو ئەوشەڕانەی ناپلیۆن کردوونی لەسەر حەقبووە، دواتر بەئادولف تیەپر- یان دەگوت (مێژوو نووسی سەرکەوتنەکان) چونکە ڕەوشی گشتی ئەو نووسینە بەشێوەیەکی بەرفراوان بەلەجۆشوخرۆشی ڕووداوە مێژووییەکان دەخاتەڕوو، جگەلەمانەش ناوبراو لێکۆلینەوە مێژووییەکانی خۆی تەنها لەبوارەکانی سیاسیو دیبلۆماسیو سەربازیدایەو بێئاگایە لەبواری ئابووریو تەنانەت پێی وایە بۆتێگەیشتن لەمێژوو بواری ئابووری پێویست بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا کتێبەکەی ئەو کاریگەرییەکی زۆری هەبوو.

کتێبێکی گەورەیتر کە والترسکات، نووسەری بەناوبانگی بریتانی سەبارەت بەژیانی ناپلیۆن نووسیویەتی، یەکێکە لەکتێبە سەرەتاییە گرنگەکان و بەشێوەیەکی ئاسانو سادە نووسراوەو زۆریش درەخشانە، ڕۆماننووسی بەناوبانگ ئەم نووسینەی بۆخەڵکی ئینگلیزی زمان نووسیوەو پشتبەستبووە بەرۆحی نیشتمانپەرستانەی بریتانیو دژی ناپلیۆن نووسراوە.

ئەم کتێبە پشتی بەبەڵگەی لاوازو سەرپێی بەستووەو بەشێوەیەکی گشتی ئەوکتێبە بەهۆی ئەستوری زۆریەوە تەنها دەتوانرێت بەیەك نووسینی گاڵتەجاری سەرگەرمکەرانە هەژماربکرێت. کتێبی ناوبراو لەبریتانیاو وڵاتانیتردا سەرکەوتنی بەدەستهێناو بۆ هەموو زمانەکانی ئەورووپایی وەرگێردرا.

لەنێوی سەدەی نۆزدەدا(ئەفسانەی ناپلیۆنی) بەجۆرێك زاڵبوو، کەنووسینەکەی والترسکانیان بەکفر سەیردەکرد.

نووسەری ئسکاتلەندی کتێبەکەی خۆی وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ بایرۆنی شاعیری گەورەی بریتانی نووسی، کەلەساڵی (1822) واتە: دووساڵ پێش مردنی خۆی بلاوبۆوەو باسی لەسەرکەوتنەکانی ناپلیۆن وستایشدەکردو دەڵێت: پێشنەوەی



ئیمپراتۆر ناپلیۆن بێته دنیا، ئیمپراتۆرەکانی بەدوای گالسکەکانی خۆیدا راکێشا، والترسکات کەکسێکی رۆماننووسی پارێزەر بوو ناپلیۆنی لەوە نەدەبەخشی زەبری کوشندەی لەمیرو پاشاو ئەشرافەکان وەشاندبوو.

دوای ئەوەی هیگلی فەیلەسوفی بەناوبانگ داکۆکییەکی سەیری لەسەر ئەو کتێبەکرد: دەڵێت لە(13/ی ئۆکتۆبەری سالی 1806) واتە: رۆژێك پێش شەری ینا، کاتێ ئەو شارە لەلایەن سوپای فەرەنساوە داگیرکرا، هیگڵ لەنامەیەکدا بۆ ناونیشانی تیت هامرە نووسیویەتی (من ئیمپراتۆر، ئەو رۆحی دنیایەم بینی کەبەمەبەستی ناسینی شار بێرەدا تێپەری) ئەو فەیلەسوفە بەناوبانگە کەپێشتر ناپلیۆنی وەك بەلایەکی ئاسمانی دەبینی، دوای خوێندنەوەی کتێبی والترسکات، کەشۆرشی فەرەنساو ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆنی وەك کەشیشی شارۆچکەیەك داکۆکی کردبوو و نووسیبوی (خواوەند شۆرشی فەرەنساو ناپلیۆنی بۆ سزادانی گوناهەکانی فەرەنساو ئەوروپا ناردووە) بەمەش فەیلەسوفە ئەڵمانییەکەی واتە: هیگلی تورەکردبوو ولەولامی والتەرسکاتدا دەڵێت: ئەگەر دادپەروەری خوایی ئاوا داکۆکی بکات ئەوانەوە دەگەیەنێت، شۆرش شتێکی دادپەروەرانەو پێویستبوو وبەهیچ جۆرێ لایەنی ستەمو تەمبێ کردنی نەبووە.

لەکۆتایی تێبینییەکانی خۆیدا هیگڵ دەڵێت: والترسکات پیاوێکی عەقڵ سوکە.

لەورۆژانەدا بەپشتبەستن بەبەڵگەکانی وابەستەبە ناپلیۆن بەشێوەیەکی بێ پێشینە نووسینو کتێب بڵاودەکرانەوەو یاداشتنامەی تازە دەربارەی رۆژگاری ناپلیۆن یەك لەدوای یەك بڵاودەبوونەوە، دەوڵەتی فەرەنسا، فەرمانە سەربازییەکانو فەرمانە ئیدارییەکانو ئەونامانەی کەبەدەستی ناپیلۆن نووسرابوون بە(32) بەرگی ئەستور بڵاوکردەوەو دوای ئەمەش بەڵگەو شتی تریش نووسران کەباسی لەشکرکێشییەکانی ناپلیۆنو جەنگەکانیو کارەکانی قانون دانانی وسیاسیو ئیداری ئەو لەفەرەنساو ئەلمانیاو ئتالیادا، یەك لەدوای یەك بڵاوکرانەوە.

قوتابخانەی[309] رۆمانسیش لەبواری مێژوو نووسیدا وەك بوارەکانیتر رەوشێکی تایبەت بەخۆی بۆ قارەمان پەروەری گرتەبەرو رۆڵی رابەری لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بۆ کەسانی قارەمان خستەروو، کتێبەکەی تۆماس کارلایل، لەژێر ناونیشانی (قارەمانو مەزهەبی قارەمان پەرستی لەمێژوودا) ناوبانگێکی زۆری پەیداکردو ئەو نووسینەی کەدەربارەی ناپلیۆن بوو کاریگەرییەکی زۆری هەبوو و زیانێکی زۆری بەخشی، چونکە ئەگەر کەسانی مێژوو نووس بەقارەمان پەرست لەقەڵەم بدرێن ئەوا ئەوکەسە جگەلەناپلیۆن کەسیتر نییە.

یەکەم بەرپەرچدانەوەی جددی دژبەم بۆچوونە نالەبارە، کتێبێکی سەرهەنگ شاراس بوو کەدەربارەی جەنگی سالی (1815) نووسیبووی ولەسالی(1858)دا لەبرۆکسل چاپکرا.

شاراسی بەبنەچە فەرەنسی دوژمنی ناپلیۆنو ناپلیۆنخوازی بوو ویەکێکبوو لەو پەناهندانەی کەلەبەلجیکا نیشتەجێ ببوو.

مارکس دەربارەی ئەو لەسالی(1849)دا: نووسی کەئەو پیاوە[310].( گڕی ئاگری پووەو مەزهەبی ناپلیۆنی کردەوە) (ئەدگار کینە)ش دەستی کرد بەدژایەتی کردنی ئەفسانەی ناپلیۆنیو هەوڵیدا ئەوەنیشانبدات بیرۆکەی دروستکردنی ئیمپراتۆری

---

[309] - قوتابخانە: لێرەدا مەبەست لەرێبازی رۆمانتیکیە،(و-کوردی).

[310] - ئەو پیاوە: مەبەست لەسەرهەنگ شاراس-ە.(و-کوردی).



مەزن، بەلای فەرەنسییەکانەوە شتێکی نامۆیەو لەئیتالیاوە سەرچاوەی گرتووەو لەناو ناخی هەموو پیاوانی سیاسەتمەدرای گەورەدا بوونی هەیە.

مێژووی ناپلیۆن بەپێنج بەرگ لەنووسینی (پیرلانفرە لەساڵی(1867)دا بڵاوبۆوەو یازدەجار چاپکرایەوەو ناوەڕۆکی کتێبەکە رۆحی یاخیبوونو دوژمنایەتی کردنی ناپلیۆن لەخۆدەگرێت، نەك تاکە سەرچاوەیەکە دژی قوتابخانەی قارەمانی نووسرابێت، بەڵکە نارەزایی دەربرینە دژی مەزهەبی ناپلیۆن نووسی، دوو بەرگی ئەو کتێبە لەسەردەمی ئیمپراتۆری دووەمدا نووسراونو بڵاوکراونەوە.

پیرلانفرە: رقی لەهەردوو ناپلیۆن[311] بۆتەوە، بەتێروانینی ئەو ناپلیۆن قارەمانێك بووە، خۆپەرستو ئازاردەری میللەتانو ئازادی لەناوبردووەو زۆرداربووەو خوێنی مرۆڤەکانی دەرشت. لانفری خۆی بەلەسەر حەق دەزانی بەوەی دژی جۆشو خرۆشی زیادەڕەوی مێژوو نووسی ناپلیۆنو ستایشی ئەو بوو، بەڵام ئەویش دوچاری هەمان ئەو هەڵانەبۆوە کەئەو ناکۆکبوو لەگەڵیاندا، بەومانایەی دەربارەی رۆڵی مێژوویی ناپلیۆن لەهەموو زەمینەکاندا زیادی پێوەدەناو ئەمەشی بەنیگەتیڤ هەژماردەکرد، نەك پۆزەتیڤ، لەرووی شێوازیشەوە هەروەك ناکۆکەکانی توشی خۆشباوەڕی و زیادپێوەنان بۆوەو لەچوارچێوەی نووسینی زانستیانە دەچۆدەرێ.

دوای رووخانی ئیمپراتۆری دووەم، ئاراستەیەکی تازە لەبورای مێژوو نووسی ناپلیۆنی پەیدابوو کەبەلای ئێمەوە زۆر جێگای سەرنجە.

لەهەمان ساڵانی سەرەتایی کۆماری سیهەم کەهەتا ئەوکاتەش هەرەشەی گەرانەوەی بۆناپارتیسم بۆسەر کورسی دەسەڵات لەئارادا مابوو، مێژوو نووسانی کۆماریخواز، دژبە ئەفسانەی ناپلیۆنی کتێبەکەی (ژۆنگ یوکێك)بوو لەم کتێبانە، لەلایەکی ترەوە پێویستە ئاماژە بەو کاریگەرییە مەزنەی کتێبەکەی (هیپولیت تن) بکەین بەناونیشانی(بنەما هاوچەرخەکانی فەرەنسا) بەتایبەت بەرگی پێنجەمی.

ئەم مێژوو نووسە کۆنەپەرستە، لەژێر کاریگەری راستەوخۆی ترسو ئەوکینەی لەکۆمۆنەی ساڵی(1871)ی فەرەنسای هەبوو، دروستی پیاوەگەورەکانی رۆژگاری شۆرشی گۆرییوو وبەوشێوە هەڵگەراوەییە لەسەریاندوابوو. ناپلیۆنی بەمیراتگرەوەد درێژەدەری توندوتیژیو جەلادی سەردارانی ئیتالیای سەدەکانی (14و15و16) لەقەڵەمدابوو کەئەوانە بۆخاترشەر ژیاون. ئەو بەهیچ جۆرێ سەرزەنشتی ناپلیۆنی بەوەنەدەکرد بۆچی شۆرشی لەباربردبوو، کۆماری نەهێشت.

لەنێوان ساڵانی(1870– بۆ1880) کتێبی(ئەورووپاو شۆرشی فەرەنسا)کەلەنووسینی (ئالبر سورل) بوو، دەستی کرد بەبڵاوبوونەوەو لەساڵی (1900)دا تەواوبوو وچواربەرگی کۆتایی ئەوکتێبە تایبەتکرابوو بەناپلیۆن.

سورل، کتێبەکەی دوای شەری(1870– 1871) نووسیوە، شەیدایی زۆری نیشتمان پەرستی ئەو ئیلهام بەخشی ئەوەو هەتا بەئەمرۆش زاڵەبەسەر مێژوو نووسی فەرەنساداو بەوەی گوایا فەرەنسا هێرشی نەکردۆتەسەر کەس، بەڵکو هەمیشە

311 -هەردوو ناپلیۆن: مەبەست ناپلیۆن بۆناپارتو ناپلیۆنی دووەمە.(و-کوردی).



بەرگری لەسنووره ئاساییەکانی خۆی کردووه، واته: ئالپ و رەن، شەرەکانی ناپلیۆنیش کەبەروکەش دەستدرێژکاریانە بوون لەراستیدا بەمەبەستی بەرگریکردن لەفەرەنسا کراون.

ئالبر سورل، کەسێکی سیاسەتمەداربووەو زەوقی ئەدەبی باشی هەبووەو بەپشتبەستن بەلێکۆلینەوەو بەدواداچوونەکانی مێژوویی‌و لیزانی‌و زیرەکییەکی تایبەتی هەبووەو کەلکی لەهزری سیاسەتمەدارانی دەورووبەری وەرگرتووه، هەتا ئەم نووسینە ناقۆلاو داماڵاو لەراستی، وەك راستی بسەلمێنێت وبیخاتەروو، لەگەڵ ئەمانەشدا، کتێبەکەی ئەو هەندێك راستی مێژووی گرنگی ناپلیۆنی رۆشن کردۆتەوەو خوێنەر دەتوانێت کەلکی لێوەربگرێت.

یەکێکیتر لەهەوڵەتازەکان بۆ زیندوکردنەوەی ئەفسانەی ناپلیۆنی‌و بەخشندەیی درۆنامێزو خستنەرووی ناپلیۆن بەنیوه خوا لەلایەن (ئارتور لویس)ەوه نووسراوه کەلەسالی(1894)دا بلاوبۆوه. لەو کتێبەیدا قارەمانەکەی خۆی، ناپلیۆنی بەنەبەرد ناوبردووه، باسکردنی رەوشت بەرزی لەناپلیۆن ومهرەبانی جیهان، ئەو پیاوه ئازایەی بەدڵساف‌و مرۆڤدۆست‌و خێرخواو ئاشتی خوازه هەژمارکلردووه) بەزۆر لە(650) لاپەرەی ئەو مێژوو نووسە ستایشکارەدا جێی کراوەتەوەو تێی قرینجاوه..)

بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا ستایشە زیادپێوەنراوە پێکەنیناوییەکان‌و دروستکردنی شتی درۆ و بۆهەڵخراوی کتێبەکەی ئارتور لویس لەسەرئاشتی کۆبو کۆمەڵی رۆشنبیران‌و خەڵکی کەم خوێندەوار، سەرکەوتنێکی زۆری بەدەستهێنا.

مێژوو نووسێکیتر بەناوی فردریك ماسون، دوای بلاوبونەوەی کتێبەکەی ئارتور، بەهۆی ئەوستایشەوه کەبۆ ئەوکراو بەدرێژایی سالانی(1890 بۆ1900) چەندین کتێب دەربارەی ناپلیۆن‌و ئیمپراتۆریەتەکەیی‌و بنەماڵەکەیی‌و دەربارو سوپاکەی بلاوبوونەوه.

لێکۆڵینەوەی ئەم مێژوو نووسەش( ماسون) کەلەئەرشیفەوه کۆیکردبۆوەو زۆر دوور درێژه، بەرۆجێکی بت پەرستی‌و ستایشکارانە نووسیبووی، ئەو خاڵەوابەستەکانی بەراستی رووداوەکانی بەروونی خستبۆ روو، بەلام فردریك ماسون نەیتوانیوه بەتێروانینێکی گشتی‌و تێوریەکی زانستیانە بینووسێت.

لەماسون جددیتر ئالبر واندالی قوتابی‌و درێژه پێدەری بەئەمەکی رێگای سورلە. ئەم پیاوه لەسالانی(1890 بۆ 1897) کەلوتکەی پەیوەندی نیوان روسیاو فەرەنسابوو، لەژێر ناونیشانی(ناپلیۆن‌و ئەلکسەندەر) یەك لەدوای یەك سێ بەرگی ئەم کتێبەی بلاوکردەوه، لەو لێکۆڵینەوەی خۆیدا باسی شەرەکانی فەرەنساو روسیاو هاوپەیمانێتی فەرەنساو روسیای لەسەردەمی ناپلیۆندا کردبوو ولەناوەرۆکدا هەمان راو بۆچوونی سورل پشتگیری کردبوو، بەومانایەی ناپلیۆن بەشەرکردنی لەگەڵ روسیاو هەموشەرەکانی تریش گوناهکارنییە، گومان لەوەنییە(واندال)یش نەیتوانیوه راستی مەسەلەکان بەباشی ببینێت، هەتا لەدووەم کتێبیشیدا بەناوی(سەرهەڵدانی بۆناپارت) کەپێنج ساڵ دوای کتێبی یەکەمی واته لەسالی(1902)دا بلاوبۆوه، واندال بەسەلیقەی تایبەتی خۆی (بەرای خۆی لەرووی ئەدەبیەوه لەسورل و تەنانەت هەموو کەس باشتر دەنووسێت)



مێژووی کورتی_18/ی برومری شێکردۆتەوەو وای بۆچووە ناپلیۆن نەبەرپرسە لەهاتنەسەرکاری رژێمی سەرکوتکەری دوایی تانەمانەکەی و [312] نەلێپرسراویشە لەبەرامبەر رووداوەکانی پێش و دوای(18/ی برومر) شێوازی نووسینی ئەوکتێبە ئەوەندە بەشەیدایی و تامەزرۆیی بۆ ناپلیۆن نووسراوە، کەلەکتێبی مێژوو نووسانی پێشەو پێشینەی نییە.

بەلام بەرەوانکردنی رووداوەکان کەبەزیرەکیەکی تایبەت باسی کردووەو وەنیویەتیەوە، تابلۆیەکی تەواو زیندوی لەرەوش و رووخانی دیرکتوار بەرجەستەکردوەو ئەمەش خوێندنەوەی ئەو کتێبەی بەکەلککردوە.

دوای (10) سال لەلەچاپدرانی کتێبی یەکەمی، ئەم دووکتێبە ئەستورەی ناوبراو کە(540و600) لاپەرەبوون(18)جار چاپکرایەوە.

شەری یەکەمی جیهانی (1914–1918)و سالانی دوای ئەوشەرە کاریگەریەکی زۆری کردەسەر مێژوو نووسی ناپلیۆنی، هەلچوون و قلپی رۆحی نیشتمان پەرستی توندرەوی بووەهۆی بلاوبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لەنامیلکەو کتێبی ئەکادیمی و سادە، دەربارەی ژیان و شەرەکانی ناپلیۆن، لەمانەش دەتوانن ئاماژە بەکتێبەکەی (ئیدوارد دریڤ)بکەین کەسەرنووسەری گۆڤاری (لێکۆلینەوەکان لەسەر ناپلیۆن) بکەین.

دریڤ بەرهەمی نووسەرەکانی پێشوی بەئاستێکی زۆر کامل راستکردۆتەوە، بۆیە نیشتمان پەرستی توندرەو وزیاد رۆیی بێسنووری کۆنەپەرستانە بەنووسینەکانییەوە دیارە.

بەگشتی پەرچەکرداری برژوازی دوای رێکەوتننامەی ڤێرسای، دووبارە گرنگی بەوکتێبانە درایەوە کەسەبارەت بەکارەکانی ناپلیۆن و چەمکی مێژوویی ئەو نوسراون.

لەنێوان هەموو ئەوکتێبانەدا من ناوی چەند کتێبێك دێنم لەوانەیە لەرووی باشیی و دیکۆمینتیەوە جێگای سەرنجبن. لەمانەش کتێبەکەی (لویس مادلن) کەدووبەرگەو بەناوی ناپلیۆنەوەیە–یان کتێبێکی تری هەمان نووسەر لەژێر ناونیشانی (کنسول و ئیمپراتۆری) سالی (1933) بلاوبۆتەوە.

هەروەها کتێبە دوو بەرگییەکەی (بنویل)یش کەلەژێر ناونیشانی ناپلیۆندایە لەسالی(1933) بلاوبۆتەوەو جێگای سەرنجن، بەلام کتێبە لێکۆلینەوەکەی (نوبر)ی کەتایبەتە بەدورگەی سنت هێلین و لەسالی(1935)دا بلاوبۆتەوە، سەرچاوەیەکی بەپێزە بۆ مێژووی دواین سالەکانی ناپلیۆن.

هەروەها کتێبە گەورەکەی (ئەدوارد دریڤ)ی لەژێر ناونیشانی (ناپلیۆنی مەزن) جێگای وەبیرهێنانەوەیە وئەو کتێبە لەسالی(1930)دا بلاوبۆتەوەو زۆر شتی سەبارەت بەناپلیۆن تێدایەو لەرووی پشتبەستنی بەبەلگەکان زۆر لەکتێبەکانی بنویل و مادلن باشترە. مادلن لەسالی(1936)دا کتێبێکی گەورەی تری لەژێر ناونیشانی(مێژووی کنسول و ئیمپراتۆری) بە(12)بەرگ بەچاپگەیاندو لەو کتێبەیدا بەئاوازێکی زۆر تامەزرۆیانەو بەرێزو شکۆمەندییەوە باسی ناپلیۆن دەکات.

ئالبر منیە، بەهۆی لێکۆلینەوەو بەدواچوونەکانی دەربارەی(18/ی برومر) بەناوبانگەو ئەم کتێبەی لەسالی(1928)دا بلاوکردەوە، لەسالی(1934)یشدا کتێبێکی تازەی لەژێر ناوی (لەگەل– یان دژی ناپلیۆن) بلاوکردەوە، ئەو لەوکتێبەیدا دوای

---

[312] -مەبەست لەژاکوبنەکانە(و- کوردی).



ئەوەی بەدرێژی باسی ئەوەیکردوە کەدوژمنانی ناپلیۆن دەتوانن دژبە ئەو چی بڵێن- یان گوتویانە، خەریکی پێهەڵگوتنی ئیمپراتۆردەبێت بەوچاکانەی کەلەگەڵ فەرەنسایداکردووەو سەرەنجام لەبەرژەوەندی ناپلیۆن دەیشکێنێتەوە.سەرهەڵدانی ئەو نووسینە نیشانەی داشکانە بەلای ستایشکردندا، کەئەومێژ ئەو رەوشە زاڵەبەسەر مێژوو نووسانی ناپلیۆنی. بەلام ئەو کتێبەی لەهەموو کتێبەکانیتر واقیعی و زانستیانەیە، کتێبەکەی (لوفەور)ە کەلەساڵی(1932)دا بەناوی (میللەتان و شارستانیەت)ە. بەدرێژایی یەك سەدە مێژوو نووسانی ناپلیۆنی لەفەرەنسادا بەمجۆرەبوو، من لێرەدا چەند کتێبی گرنگم وەبیرهێنانەوە کەکاریگەری گەورەیان لەسەرەرای گشتی جێهێشت.

بەلام مێژوو نووسی ناپلیۆنی لەولاتانی تری ئەوروپاییدا، لەتێروانینی گستی هەمان رێگایان گرتۆتەبەر کەلەفەرەنسادا کرابوو، لێرەدا ناوی فۆرنیەو کیرشایزنی مێژوو نووسی بەناوبانگی سویسری دەهێنم. وەك لەمەوبەر گوتمان باشترین مێژوونووسی ناپلیۆنییەو کتێبەکەی لەساڵی(1934)داتەواوکردووە.

گەورەیی ئەم دوو نووسینە، جێگای بەراورد پێکردن نییە، کیرشایزن، لەکتێبە ئەستورە نۆ بەرگییەکەی خۆیدا، بەوپەری وریایی وسەرشارییەوە دەربارەی مەسەلەکان دواوەو هەربەرگێکیش لەکتێبەکەی دوو ئەوەندەی بەرگی کتێبێکی فورنیەیە، ئەم دوو کتێبە هەردووکیان لەولاتانی ئەڵمانی نەژاددا نووسراونەتەوەو هەردووکیشیان بەشێوەیەکی زانستی بۆگەیشتن بەراستییەکان نووسراون‌و بەبێ لایەنانە مەسەلەکان خراونە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە.

بریتانیەکانیش زۆر کتێبی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونیان لەسەر مێژووی ناپلیۆن نووسیوە. خوێنەرانی ولاتی شۆڤیەتیش دەتوانن کەلك لەبەرگی یەکەم‌و دووەمی کتێبی(مێژووی سەدەی نۆزدەهەم)وەربگرن کەلەنووسینی لاویس‌و رمبو، یەو لەساڵی(1938)دا بەچاپکەیاندراوە. سەبارەت بەمێژووی ئابووری سەردەمی ناپلیۆنیش کتێبی کەم لەو روانگەوە بلاوکراوەتەوە، جگەلەکتێبی (پل دارمستر) کەسەبارەت بەگەمارۆی خاکی لەئەوروپاو فەرەنسادا هەیەو کتێبێکی (رۆلف) لەژێر ناونیشانی (سیاسەتی داگیرکارو ناپلیۆن)نیش لەبەردەستدایە، تازەترین کتێب کەلەنووسینی (سنتویان)ە هەر لەم بارەوەیە، هەروەها کتێبی (هەکشری بیرمەند)ی سویدیش بەچاپکەیەندراوە. هەروەها چەند لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئابووریتر سەبارەت بەمێژووی ئابووری سەردەمی ئیمپراتۆری ناپلیۆن بلاوبوونەوە. ئابووری ئیتالیا لەسەردەمی دەسەلاتداریتی ناپلیۆندا، بەپشتبەستن بەبەڵگەی بلاونەبۆوەو هەبوو لەئەرشیفەکانی میلان‌و شارەکانی تری ئیتالیادا، بنچینەوی لێکۆڵیەوەی من بووە لەکتێبی (گەمارۆی خاکی لەئیتالیا) (پاریس- 1928) (1)، لەکۆتایی ساڵی (1936)دا کتێبی (لویس ویلا)، لەژێرناوی (شۆرش و ئیمپراتۆری) بلاوبۆوە، بەناونیشانی بەرگی دووەمی ناپلیۆنە. ئەم نووسینە بەشێوەی لێکدانەوەو رەخنەگرانەو واقیع بینانەیە. بەتێروانینێکی گشتی‌و بەکەڵك، ئەوەی سەبارەت بەروونکردنەوەی مێژووی ناپلیۆن نووسراوە، باسی کردووە، بەلام (ویلا) زانیاری لەسەر ئەو ولاتانە کەم بووە کەلەژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەکەی ناپلیۆندابوون. هەروەها شێوەی نووسینەکەی ئاوا بەکورتی بۆ تێز، نامەی دکتۆرا نووسیبا باشتربوو، بەلام لەرووی دیکۆمینتییەوە کامڵە. سەرنج و وردبینی لەمێژووی ناپلیۆن، لەتێروانینی زانستیانەوە بووەهۆی ئەوەی چاوبەزۆر بۆچوون‌و تێوری باودا بخشێندرێتەوە کەبەرووکەش دروستبوون، بەلام لەسەربنەمای ئامانج‌و رەفتاری ناپلیۆن دارێژراون. کردنی ئەمکارە پێش هەمووشتێك پێویستە بەپشتبەستن بەبەڵگەی بلاونەکراوە ئەنجامبدرێت، کەلەئەرشیفەکانی تایبەت



بەئابووری رۆژگاری ئیمپراتۆریدا هەن.لەم رووەوە ئەوەی وابەستە بەپرۆسە کتێبێکی بەناوبانگی فرانتس مهرینگە لەژێر ناوی (بەشێك لەمێژووی پرۆس)و بەرگی یەکەمی لەسەدەکانی ناوەراستەوە هەتاشەری ینای لەخۆگرتووە، بەرگی دووەمیش لەشەری تیلسیتەوە هەتا دروستکردنی ئیمپراتۆریە، ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیە لەسەر بنەمای مارکسیستی و کتێبەکە زۆر بەبەهاوزیندووە، چاپی تەواوی ئەم لەساڵی(1930)دا تەواوبووە، لەبەرگی یەکەم لەلاپەری (1- هەتا 128)و لەبەرگی دووەمیش لەلاپەرە(292 بۆ 380)ی تایبەتکراوە بۆ مێژووی پرۆس لەسەردەمی ناپلیۆندا. ئەم کتێبە لەرووی ئەدەبیەوە بەشێوەیەکی زۆر دلگیر وسەرنجراکێش نووسراوە. نووسەر لەم کتێبەدا نوکی قەڵەمەکەی خۆی ئاراستەی داهێنانی نیشتمان پەرستەکان کردووەو بەردەوام بوون لەسەر جۆشدانی نیشتمان پەرستی پرۆس و رۆحی سەرکوتکەرانەی بنەماڵەی هوهانزولرنی وەدیار خستووەو وەك ئەنگلس پێی وایە دەسەڵاتداریەتی ناپلیۆنی بەسەر ئەڵمانیادا بەپێشکەوتنی تاریخی ئەو وڵاتە لەقەڵەم داوە، کتێبی (مهرینگ) یەکێکە لەو نووسینە دەگمەنە بێهاوتایانەی مارکسیستی کەتابەئەمرۆش سەبارەت بەسەردەمی ناپلیۆن نووسرابێت. هەروەها دەتوانین ئاماژە بەچەند لاپەرەیەکی کتێبی شولتز بکەین کەدەربارەی ناپلیۆن لەژێر ناونیشانی(بەئاگرو خوێن) بڵاوی کردۆتەوە.

هەروەها کتێبێکی (لاوفنبرك)ش هەیە لەژێر ناوی (هامبۆرگ لەرۆژگاری داگیرکەرانی فەرەنسی) بەڵام دەربارەی ئەم شارە بەشێوەیەکی گشتی بارودۆخی ئابووری ئەڵمانیا لەرۆژگاری دەسەڵاتداریەتی ناپلیۆندا، دەتوانین ناوی کتێبی لێکۆڵینەوەی ئەرشیفی بڵاونەکراوەی هەردوو ئەو نووسەرەی سەرەوە بکەین کەلەژێر ناونیشانی(پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان فەرەنساو ئەڵمانیا لەسەردەمی ناپلیۆن)دا بکەین.هۆی ناراستەوخۆی ئەوەی دانیشتوانی ئەورووپاو ئەمریکا ئارەزوی خوێندنەوەی نووسینی مێژوو نووسەکانی سۆڤیەت، لەلێکۆڵینەوەکانی لەسەر ناپلیۆن دەکەن و بۆتەجێگای سەرنجیان.

چەندجار وەرگێرانی ئەم کتێبە [313] بۆ زمانە بیانییەکان، بەهۆی لێکدانەو وشیکردنەوەو لێکۆڵینەوەو رخنەکانیەتی کەلەسەر ئەمە رەنگی داوەتەوە، ئەم کتێبە لەبریتانیاوئەمریکاوفەرەنساو سویدو نەرویج و ئیتالیادا تەرجەمە بکرێت و زوو زوو چاپدەکرێتەوە.

کۆتایی

[313] - تارلە: مەبەستی لەکتێبێکی تری خۆیەتی بەو ناونیشانە.(و-کوردی).

ئەو پیاوەی من دەمەوێت ژیانی باسبکەم و کەسایەتی ئەو نیشانبدەم، یەکێکە لە سەرسوڕهێنەرترین دیاردەکانی مێژووی جیهان و سەریرنییە دەربارەی ئەوکتێبی بێژمار نووسرابن و بنووسن وپێویستیشە هەر بنووسن.




نێوەندی ئارام بۆ چاپ و بلاوکردنەوە